# ئینسکلۆپیدیای



# وەڵامی گومانەکان



## مەوسوعەی (بیان الإسلام) بەکوردی



## گومانەکان سەبارەت بە قورئان

**بەرگی یەکەم**





وەرگێڕانی: نەرمین مستەفا

# ئینسکلۆپیدیای

# وەڵامی گومانەکان

مەوسوعەی (بیان الاسلام) بە کوردی

بە سەرپەرشتی

ڕێکخراوی عادیلە خانم

لە لایەن کۆمەڵێك وەرگێڕەوە وەرگێڕراوەتە سەر زمانی شیرینی کوردی

بەشی یەکەم

بەرگی یەکەم

گومانەکان سەبارەت بە قورئان

وەرگێڕانی بەرگی یەکەم

نەرمین موستەفا

ساڵی١٤٣٨ی کۆچی موحەممەدی

بەرانبەر بە ٢٠١٨ی زایینی عیسایی




**ئینسكلۆپیدیای وەڵامی گومانەكان**

**مەوسوعەی (بیان الإسلام) بەكوردی**

**نوسینی: لیژنەیەك**

**وەرگێڕانی: نەرمین مستەفا**

**تیراژ : ١٠٠٠ دانە**

**چاپ: یەكەم - ٢٠١٨**

**دیزاین : ناوەندی ڕێنوێن**




07501269689
07701932749


hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com


سلێمانی - بازاری ئاویەریك- نهۆمی یەكەم
بەرامبەر كاسـەوەڵ - دوكانی ژمارە (٦٦)



**لە بەڕێوبەرایەتی گشتیی كتێبخانە گشتییەكان**
**ژمارەی سپاردنی ( ١٠٢٨)ی ساڵی (٢٠١٨)ی پێدراوە**

# ناوەرۆك


| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|
| پێشەکی ڕێکخراوی عادیلەخانم | ٩ |
| پێشەکی وەرگێڕ | ١٥ |
| پێشەکی: سەرپەرشتیاری گشتی ( موسوعه بيان الاسلام...) | ١٦ |
| ئاین و مرۆڤ | ١٦ |
| ئیسلام خەڵك بۆ گفتوگۆ بانگ ئەکات.. لەبری پێکدادان. | ٣٢ |
| ئیسلام لەگەڵ جگە لە خۆی: | ٣٥ |
| پێشەکییەکی گشتی بۆ بەشی قورئان لە زانیارینامەکە | ٧٢ |
| شەڕ لە دژی قورئان: | ٧٢ |
| بەرنامەی قورئان بۆ وەڵامدانەوەی نەیارانی: | ٨٦ |
| یاساکانی قورئان و گفتوگۆی نەیارەکانی: | ٩٠ |
| تەوەری یەکەم<br>چەند گومان و بوختانێك سەبارەت بە خوای گەورە | ١٣٧ |
| گومانی یەکەم: بانگەشەکردن بەوەی خوا (جل جلاله)منداڵی هەیە | ١٣٨ |
| گومانی دووەم: بانگەشەی ئەوەی کەفریشتەکان کچانی خوان | ١٤٨ |
| گومانی سێیەم... | ١٦٥ |
| گومانی چوارەم: بانگەشەکردن بۆئەوەی کەلەنێوان خوداو جنۆکەدا خزمایەتی هەیە | ١٧٨ |
| گومانی پێنجەم: نکولی کردن لەتەنیایی و پەروەردگاریتی خودا | ١٨١ |
| گومانی شەشەم: بانگەشە کردن بۆ ئەوەی کە خودا(جل جلاله)مەسیحی کوڕی مەریەمە | ٢٠٩ |
| گومانی حەوتەم.... | ٢٢٣ |
| گومانی هەشتەم... | ٢٥٣ |
| گومانی نۆیەم: بانگەشەی خوایەتی گوێرەکە | ٢٦٤ |
| گومانی دەیەم.... | ٢٨١ |

| | |
|---|---|
| ٢٨٧ | گومانی یازدە.... |
| ٣٠٠ | گومانی دوازدە... |
| ٣١٣ | گومانی سیازدە: بوختانکردن بەوەی خوا فەرمان بە خراپە نەکات |
| ٣٢٤ | گومانی چواردە.... |
| ٣٣٢ | گومانی پازدە... |
| ٣٣٨ | گومانی شازدە... |
| ٣٤٤ | گومانی حەڤدە... |
| ٣٥١ | تەوەری دووەم<br>گومان دروست کردن دەربارەی قورئانی پیرۆز |
| ٣٥٢ | گومانی هەژدە... |
| ٣٥٩ | گومانی نۆزدە... |
| ٣٦٥ | گومانی بیست.... |
| ٣٧٨ | گومانی بیست و یەك... |
| ٣٨٧ | گومانی بیست و دوو... |
| ٣٩٤ | گومانی بیست و سێ: بانگەشەکردن بەوەی کە قورئان هەڵبەستراوی موحەممەد خۆیەتی |
| ٤٢٧ | گومانی بیست و چوار... |
| ٤٣٢ | گومانی بیست و پێنج... |
| ٤٤٦ | گومانی بیست و شەش... |
| ٤٥٢ | گومانی بیست وحەوت: بانگەشەکردن بە توانای هێنانی هاوشێوەی قورئان |
| ٤٦٠ | گومانی بیست وهەشت... |
| ٤٦٧ | تەوەری سێیەم<br>گومانە پەیوەندی دارەکان بە یاسادانان و فەرمانەکانیەوە |
| ٤٦٨ | گومانی بیست و نۆ: بانگەشە کردن بەوەی کە فرۆشتن وەك ڕیبایە |
| ٥١٢ | گومانی سی... |
| ٥٣٦ | گومانی سی ویەك: نارەزای گۆڕینی قیبلە |
| ٥٥٣ | گومانی سی و دوو... |

| | |
|---|---|
| گومامی سی و سێ... | ٥٥٧ |
| گومانی سی وچوار... | ٥٦٨ |
| گومانی سی و پێنج... | ٥٧٧ |
| تەوەری چوارەم<br>کۆمەڵێك بانگەشەی جاهیلیەت | ٥٨٣ |
| گومانی سی و شەش: بانگەشە کردن بەوەی منداڵ هۆکاری هەژاری و نەداری باوانە | ٥٨٤ |
| گومانی سی و حەوت.... | ٥٩١ |
| تەوەری پێنجەم<br>ئەو گومانانەی پەیوەندیان بە کوفرو ئیمانەوە هەیە. | ٥٩٩ |
| گومانی سی و هەشت | ٦٠٠ |
| گومانی سی و نۆ... | ٦٠٣ |
| گومانی چل... | ٦١٣ |
| سەرچاوەکان | ٦٢٠ |

## پێشەکی ڕێکخراوی عادیلەخانم بۆ چاپە کوردیەکەی

## بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

**الحمد لله و الصلاة و السلام على رسوله الامين و على اله واصحابه اجمعين:**

خوێنەرانی بەڕێزی ئەم زنجیرە کتێبە هەندێ سەرنج و زانیاری هەیە بە پێویستی ئەزانین کە ئێوەی بەڕێزی لێ ئاگادار بکەین:

یەکەم: ئەم مەوسوعەمان بۆچی هەڵبژارد تا وەریبگێڕین بۆ زمانی کوردی؟

دووەم: چۆن ئەم پرۆژەی وەرگێڕانەمان خستە بواری جێبەجێکردنەوە؟

سێیەم: چۆن خەمی چاپکردنی ئەم مەوسوعەیەمان چارەسەر کرد؟

چوارەم: سەرنجمان لەسەر وەرگێڕانەکان چییە؟

پێنجەم: داوامان لە ئێوەی خوێنەر چیە؟

**یەکەم/ ئەم مەوسوعەمان بۆچی هەڵبژارد تا وەریبگێڕین بۆ زمانی کوردی؟**

ئێمە لە ڕێکخراوی عادیلە خانم.. کە ڕێکخراوێکی سەربەخۆیە بۆ پەروەردە و گەشەپێدان.. بە حوکمی ئەوەی وەك هەموو موسڵمانێك لە کۆڕ و سیمینار و وتارەکانماندا ڕووبەڕووی زۆر پرسیار و گومان ئەبووینەوەو زۆر جار پێویستمان بە سەرچاوەیەکی دەوڵەمەند ئەبوو تا وەڵامی زانستی زۆربەی ئەو گومانانەی تێدا بێت، ئەم (مەوسوعەی بەیان)ەش لە بابەتی خۆیدا دەوڵەمەندترین سەرچاوەیە تائێستە بینیبێتمان و خوێنەر تا ڕادەیەکی زۆر بێ منەت ئەکات لە کتێب و سەرچاوەی تر، بۆیە بڕیارمان هاتە سەر ئەوەی کە تیمێکی بۆ دروست بکەین لە خوشکانی ڕێکخراو و ناوی خوای لێ بهێنین و دەست بە وەرگێڕانی بکەین.

جا لەبەر ئەوەی مەوسوعەکە بیست و چوار بەرگی قەبارە گەورە بوو، ئیرادەیەکی گەورەی ئەویست کە بڕیار لە تەرجەمەکردنی بدەین، بۆیە سەرەتا ڕامان وابوو کە کورتەی ئەو وەڵامانە وەربگێڕین لەبەر دوو هۆ: خەرجی و تێچوونی چاپکردنی..

دووەم: زەحمەتی پەیداکردنی وەرگێڕی خۆبەخش و بەتوانا... بەڵام خوا ڕاست ئەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٦٩ ﴾ (العنكبوت)، ئەوانەی لە پێناوی ئێمەداو بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئێمە هەوڵ و کۆششیان کردووە و خۆیان ماندوو کردووە، سوێند بەخوا بەڕاستی ئەوانە ڕێنموویی دەکەین بۆ هەموو ڕێگەیەکی چاك و دروستی خۆمان (کە بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئێمەی لەدوایە)، بێگومان خوای پەروەردگار هەمیشە لەگەڵ چاکەکارانە.

جا وەك هاتنەدی ئەو بەڵێنە خودایيە، هیواشمان وایە لەناو ئێمەدا کەسانێك هەبن شایستەی ئەو بەهرەیەبن بۆیە کارەکەمان هەنگاو بە هەنگاو بۆ ئاسان ئەبوو، بەو ڕادەیەی کارەکە بەوە گەیشت کەبڕیار بدەین هەموو مەوسوعەکە وەربگێڕینە سەر زمانی کوردی و پشت بە خوا ببەستین و چەندی کرد بە نسیبمان کەمتەرخەمی نەکەین و لەگەڵیدا بڕۆین.

**دووەم/ چۆن ئەم پرۆژەی وەرگێڕانەمان خستە بواری جێبەجێکردنەوە؟**

چەند دانیشتنێکمان بۆ ئەو مەبەستە کرد و گروپەکەمان بۆ وەرگێڕانی مەوسوعەکە دیاریکرد، و هەریەکەو بەشی خۆی وەرگرت کە ڕەچاوی حەز و تا ڕادەیەك پسپۆڕیمان کرد لە ئەو دابەشکردنانەدا، پرۆژەکە کەوتە بواری جێبەجێکردن و دەست بە وەرگێڕان کرا، کە هەندێ لە بانگخوازانی ئینستتیوتی بانگخوازان بە پرۆژەکەیان زانی پاش دەستخۆشیکردن لێمان ئامادەیی هاوکاریان دەربڕی بۆ کارەکەمان، ئێمەش بە سوپاسەوە پێشوازی ئەو هاوکاریەمان کرد، دوو بانگخوازی بەڕێزی ئینستتیوتی بانگخوازان بەناوی دکتۆر کەریم ئەحمەد و ئەندازیار عوسمان یارمەتی زۆریان داین بە سەرپەرشتی کردنی کۆبونەوەکان و وەرگێران، هەوڵەکانیان بەرز ئەنرخێنین و دان بەوەدا ئەنێین کەخزمەتیان بە پرۆژەکە کرد و مایەی گوڕو تین بوون بۆی، کە ئەوەش شتێکی پێویست بوو بۆ ئەو سەرەتایە.

پاش ئەمە هەوڵی ئەوەمان دا کە مۆڵەتی فەرمی لە خاوەنە ئەسڵیەکەی (مەوسوعەی بەیان) وەربگرین وەك بابەتێکی ئەخلاقی و بابەتێکی یاساییش، بۆ ئەمەش مامۆستایەکی بەڕێزی زانکۆمان راسپارد کە بەو کارە هەڵبسێت و مۆڵەتی وەرگێرانی مەوسوعەکەمان بۆ وەربگرێت، ئەویش ماڵی ئاوەدان بێت کارەکەی ئەنجام دا، کە لەم چاپەدا بۆ زیاتر ئەمانەتپارێزی ئەو مۆڵەتە بلاْوئەکەینەوە..

دوای ئەمانە(خوای بالآدەستی موعین) لە چەند لاوە نووسەر و وەرگێڕی تری بە توانای لە دەوری پرۆژەکەمان کۆکردەوە، بەتایبەت ڕێزی زۆرمان هەیە بۆ تۆڕی (دەروازەی چاکە بۆ بانگەواز و هۆشیاری کۆمەلآیەتی) کە کۆمەڵێك مامۆستایانی بەڕێزی زانکۆی سلیمانی و زانکۆی کۆیەیان ئاگادار کردبویەوە لە پرۆژەکە و داوایان لێ کردبوون لە پرۆژەکەدا بەشدار بن، ئەوانیش زۆر لەخۆبوردوانە هاتن بەدەم پرۆژەکەوە، ئیتر ڕۆژ بە ڕۆژ خوای پەروەردگار ئاسانکاری بۆ ئەکردین لێی بەزیاد بێت، لە دانیشتنە یەکەمینەکانماندا، بەرێزانی مامۆستایانی زانکۆو خوشکانی رێکخراو ئامادەبوون بۆیە سەر لە نوێ هەوڵی دابەشکردنەوەی کتێبەکانمان دایەوە وەك بەهێزکردنێك بۆ پرۆژەکە.

هەندێ لەمپەر و کێشەمان بۆ هاتە پێش، بەلآم سوپاس بۆ خوا سەرئەکەوتین بەسەریاندا.

بۆ نمونە کاتێ دەزگای ڕێنوین داوای ئەوەیکرد کە ئەبێت جەڵدی یەکەم پەخشبکرێ پێش ئەوانیتر و خوشکێکی بەڕێزمان کە بەڵێنی وەرگێرانی جەلدی یەکەمی مەوسوعەکەی پێدابن و دەستی پێکردبوو بەلآم ئەو خوشکە لەبەر سەرقاڵی زۆر و زۆری ژمارەی لاپەرەکانی ئەو بەشە لەکاتی دیاریکراودا تەواو نەئەبوو بۆیە داوامان لێکرد هاوکاری بکرێت، دوو نووسەری بەڕێزیش ئامادەییان دەربڕی کە ئەرکی تەواوکردنی بگرنە ئەستۆ، خوا پاداشتیان بداتەوە وەك پێویست بەو کارە هەستان و نەیانهێڵا پرۆژەکە رابوەستێت.

**سێیەم/ چۆن خەمی چاپکردنی ئەم مەوسوعەیەمان چارەسەر کرد؟**

بۆ لە چاپدانی ئەم پرۆژە گەورەیە جگە لە رەحمی خوا هیچی ترمان شك نەئەبرد، بڕیارمان وابوو کە هەر خۆمان باری قورسی خەرجی لەچاپدانیشی بخەینە سەرشانی خۆمان، چەند خوشکێکی بەڕێز هەندێ ئومێدیان پێدابوین، بەڵام کە خوای گەورە ئەو چەند نووسەر و وەرگێرەی لێ کۆکردینەوە، خستینیە خولیای ئەوەی کە بۆ لەچاپدانەکەشی هەوڵێك بدەین و هاوکاری بۆ بدۆزینەوە، ئەوە بوو (سەنتەری بەڕێزی ناوەندی ڕێنوین) ئامادەییان دەربڕی کە ئەرکی لە چاپدانی ئەم مەوسوعەیە بگرنە ئەستۆی خۆیان..خوا هاوکار و هاریکاریان بێت.

**چوارەم/ سەرنجمان لەسەر وەرگێڕانەکان چییە؟**

بە شتێکی پێویستی ئەزانین کە هەندێ سەرنجی خێرا بدەین لەسەر ئەم بەرگە تا خوێنەرە بەڕێزەکانمان بەرچاو روون بن:

١-ئەم بەرگە چوار نووسەری بەڕێز بەشدارن تێیدا، ئەوەش لای هەموو کەسێك زانراوە ئەوەیە هەر نووسەرێك شێوازی خۆی هەیە لە نووسین، یان لە وەرگێڕاندا، بۆیە ئەوە سروشتیە کە جیاوازی ببینی لە نووسینەکاندا.

٢-لە نووسینەکەدا ئەوە ئەبینی کە هەندێ -بۆ نمونە- بۆ مانای(وجوه ابطال الشبه) نووسیویەتی(شێوازەکانی هەڵوەشاندنەوەی گومانەکە)، هەندێ وتوویەتی(ڕێگەکانی پووچەڵکردنەوەی گومانەکە)، هەندێکی تر بە جۆرێکی تر مانایان کردووە، ئێمە نەمانوویست ئەوانە یەك بخەین بۆ ئەوەی پارێزگاری لە تایبەتمەندی هەر نووسەرێك بکرێت.

٣-بۆ مانای مەوسوعەکە هەندێ رای جیاواز هەبوو لە ناوماندا، یەکێك ئەیووت: با ناوی بنێین(دەریای زانیاری)، یەکێ بڕوای وابوو(زانیارینامە) گونجاوترە، هەندێکیتر

بەجوانی ئەزانی(ئینسکلۆپیدیای ئیسلام) بکرێتە ناونیشان، هەندێکیش ئەوەی بە گونجاو و جوان ئەزانی کە هەر بە ناوەکەی خۆیەوە بێت و بووترێت (مەوسوعەی بەیانی ئیسلام بە کوردی)، ئەوەبوو لە کۆتاییدا ئەمەی کۆتاییمان هەڵبژارد بۆ ناوی مەوسوعەکە.

**پێنجەم/ داوامان لە ئێوەی خوێنەر چیە؟**

ئێمە بڕوامان وایە تەنیا کاری خوا بێ هەڵە و پەڵەیە، بۆیە لامان نە سەیرە و نە شۆکە کە هەڵە لەم پرۆژەیەماندا بدۆزنەوە، هەڵە لەم وەرگێڕانەدا ببین، بەلاَم ئەوە لامان سەیر و شۆکە کە لەو هەلاَنە ئاگادارمان نەکەنەوە، بە دیاری بۆمانی نەنێرنەوە، ئێمە بڕوامان زۆر بەو حیکمەتە گەورەی ئیمامی عومەر(ﷺ) هەیەکە ئەفەرمویَ:(رحم الله من اهدى الينا عيوبنا) ڕەحمەتی خوا لەوکەسەی کە عەیبەکانمان بە دیاری بۆ ئەهێنێتەوە.. ئێمەش بەڵێنی ئەوە ئەدەین کە بۆ چاپی داهاتوو، یان بۆ چاپی بەرگەکانی تر سوودیان لیَ ببینین و پێڕەویان لیَ بکەین ئەگەر زانستی بن و جێگەی قەناعەت بێت.

پەروەردگار!

سۆزت بڕژە بەسەر ئەو کەسانەدا کە کەموکورتییەکانی ناو ئەم کتێبەمان بە دیاری بۆ ئەنێرنەوە تا ئێمەش بیخەینە سەر چاومان و لە چاپەکانی دواتردا نووسینەکەی پێدەولەمەندترو بەهێزتر بکەین.

پەروەردگار!

زاتی پاکت ئاگای لەوە هەیە کە لەم سەرزەمینەدا کۆمەڵێك دڵ هەن لەسەر خۆشەویستی تۆو پەرستنی تۆ کۆبوونەتەوەو پەیمانی ئەوەیان داوە بە تۆ کە ئەم پەیامە ئاسمانیەی تۆ سەربخەن، دەی دڵەکانی ئێمەش لەگەڵ ئەو دلاَنەدا گریَ بدە ! و پەیوەندیەکانیان توندو تۆڵتر بکە ! بەردەوامییش بدە بەو خۆشەویستییەی کە ناشتووتە لەناویاندا، شارەزایان بکەو ڕێگەیان ڕۆشنبکە ! بەو نوورەی خۆت -کە هەرگیز ناکوژێتەوە- پڕیان بکەو ئەو دلاَنەی لەو سنگانەدان گوشادیان بکە بە ئیمان بەخۆت و بە

پێغەمبەرو بە پەیامەکەت! وایان لێبکە کە پشت هەر بە تۆ ببەستن بۆ کاروبارەکانی دین و کاروبارەکانی دونیاش.. هەر تۆ باشترین پشتیوان و باشترین سەرخەری.

یەکەم ڕۆژی ساڵی ٢٠١٨ی زایینی عیسایی

بەرانبەر

١٣ی ڕەبیعی دووەمی ساڵی١٤٣٨ی کۆچیی موحەممەدی



# پێشەکی وەرگێڕ

سوپاس و ستایش بۆ خودای بالآدەست و میهرەبان، ئەو خودایەی هیچ کارێک بەبێ ویستی ئەو ناگاتە ئەنجام، درودو سلآو بۆ سەر گیانی پێغەمبەری ئیسلام و یارویاوەرانی تا ڕۆژی دوایی، زۆر خۆم بە خۆشحالْ دەزانم کە بەشداری وەها پرۆژەیەکی گرنگ و فراوانم کردووە بەهیوای ئەوەی بێتە خێرێکی نەبڕاوە بۆمان، هەروەها ببێتە سەرچاوەیەکی بەهێز و دەوڵەمەند بۆ کۆمەڵگەی کوردی موسوڵمان، مەبەستی سەرەکیمان لە بیرکردنەوە و بە پراکتیک کردنی ئەم پرۆژەیە لەوەدا بوو کە ئەم ساتەوەختەی ئێمە بریاری وەها کارێکی گرانمان دا لە کۆمەڵگەی کوردیدا بە داخەوە جۆرەها گومان وروژێنراوە چەندەها ڕێگای بۆ گیراوەتەبەر بۆ تێکدان و شڵەژاندنی بیر و هۆشی تاکی ولآتەکەم، لە لایەکی ترەوە ئەو نەوەی کە ئێستا ئەو گومانانەدەدرێت بەگوێیاندا ڕێژەیەکی کەمیان شارەزاییان لەزمانی عەرەبیدا هەیە کە پەنای بۆ بەرن بۆ خۆ ڕۆشنبیرکردن و وەلآمدانەوە و ڕوبەڕوبوونەوەی ئەو گومانانە، بۆ بەئەنجام گەیاندنی وەها پرۆژەیەك زۆر پێویست و لەجێی خۆیدا بوو کە کاری وەرگێڕانی بۆ ئەنجام بدرێ، بێگومان پرۆژەیەکی ئاوەها فراوان پێویستی بە چەندەها خەڵکی بەتوانا و شارەزاهەیە کە بچنە ژێر باری تا دەیگەیەننە کۆتای، بەخۆشحاڵیەوە کۆمەڵێك مامۆستای بەڕێز لە خوشکان و برایان هاوخەم و دەستبارمان بوون لەکارەکەدا، بەنیسبەت بەرگی یەکەمی موسوعەکەوە کە بەندە وەرم گێڕاوە زۆر سوپاس و نزای خێرم هەیە بۆ ئەو بەڕێزانەی هاوکرییان کردوم لە خوشکان و برایان و هاوژینی ئازیزم، داواکارم لە خودای گەورە تەرازووی چاکەکانیانی پێ قورس بکات، بەڕێزان گومان لەوەدا نیە دەکرێ هەرکارێك بە ڕێژەی جیاواز کەم وکورتی تێدابێت، بۆیە بە گەورەیی خۆتان لە کەم و کورتییەکانمان بە ئاگامان بهێننەوە بە خستنە ڕویان و بە دەوڵەمەند کردنی کارەکەمان بە پێشنیارەکانتان....

وەرگێڕ: نەرمین مستەفا حمەخان

٢٩ی ڕەبیعی یەکەم ٢٠١٨/١/١٦

# پێشەکی

## سەرپەرشتیاری گشتی ( موسوعە بیان الاسلام...)

پرۆفیسۆر موحەممەد داوود

## ئاین و مرۆڤ

بەناوی خوای میهرەبان، سوپاس بۆ خاوەنی هەموو جیهان، درود وسەلام لەسەر پێغەمبەر و سەروەرمان موحەممەدی نێرراو بە رەحمەت بۆ هەموو جیهان لە پاشان:

رونکردنەوەی راستییەکان بە بەڵگەی رەوان ولۆژیك ئەرکیکی پیرۆزە کە زانایان‌و خاوەن بیرەکان ئەیگرنە ئەستۆ بۆ ئەوەی گفتوگۆی ئەرێنی لە نێوان بۆچون و بیرورا جیاوازەکان بەردەوام بێت، هەروەها بۆ بەهێزکردنی مەودای خۆشەویستی و برایەتی و پێکەوەژیان لە نێوان خاوەن ئایینە جیاوازەکان‌و دیاریکردنی خاڵی هاوبەشی مرۆڤەکان کە ئایینە ئاسمانییەکان هەموویان لەو خاڵانەدا یەکیانگرتۆتەوە.

لێکۆڵەرەکان هەمویان ئەو راستییە گرنگە دوپات ئەکەنەوە کە ئایینە ئاسمانییەکان لە چەند بابەتێکدا هاوبەشن لە گرنگترینیان:

**ئاین رێنوێنی مرۆڤ ئەکات:**

ئاین بۆ رێنمونیکردنی عەقڵ ودڵی مرۆڤەکان هاتوە، یارمەتیەکە لە دروستکارەوە بۆ دروستکراو، بۆئەوەی راستی ژیانی خۆی و ژیانی دروستکراوەکانی چواردەوری بزانێت، بۆ ئەوەی پلە و رۆڵی لەم ژیانەدا بزانێت، ئاگاداربێت لەوەی دوای ژیانی ئەم دونیایە ژیانێکیتری نەبڕاوە هەیە کە تۆڵە و پاداشت و دادگەری لەنێوان دروستکراوەکان لەوێدا بەرقەرار ئەبێت.

مەبەستەکانی شەریعەت باشترین نمونەیە لەسەر ئەو قسانە، ئیسلام زۆر سورە لەسەر: پاراستنی نەفس بەدانانی تۆڵەسەندنەوە، پاراستنی ئاین بە دانانی سزای

مورتەد، پاراستنی عەقڵ بە حەرامکردنی مادە هۆشبەرەکان، پاراستنی وەچە بە دانانی سزای زینا، پاراستنی ماڵو سامان بە دانانی سزای دزی، بۆ پاراستنی هەمویشیان تۆڵەی حیرابەی داناوە.

ئایینەکان هاتوون بۆ ئەوەی خەڵکی ڕێنمونی بکەن بۆ لای ڕەوشتە بەرزەکان و پەیوەندییە پڕ میهرەکان، وەك لە قورئاندا هاتووە و خوا ئەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَسۡخَرۡ قَوۡمٞ مِّن قَوۡمٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُونُواْ خَيۡرٗا مِّنۡهُمۡ وَلَا نِسَآءٞ مِّن نِّسَآءٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُنَّ خَيۡرٗا مِّنۡهُنَّۖ وَلَا تَلۡمِزُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَلَا تَنَابَزُواْ بِٱلۡأَلۡقَٰبِۖ بِئۡسَ ٱلِٱسۡمُ ٱلۡفُسُوقُ بَعۡدَ ٱلۡإِيمَٰنِۚ وَمَن لَّمۡ يَتُبۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿١١﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱجۡتَنِبُواْ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعۡضَ ٱلظَّنِّ إِثۡمٞۖ وَلَا تَجَسَّسُواْ وَلَا يَغۡتَب بَّعۡضُكُم بَعۡضًاۚ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمۡ أَن يَأۡكُلَ لَحۡمَ أَخِيهِ مَيۡتٗا فَكَرِهۡتُمُوهُۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٞ رَّحِيمٞ ﴿١٢﴾ ﴾ ( الحجرات)

ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ! هیچ کەس و هیچ هۆزێك گاڵتە بەکەس و هۆزێکی تر نەکات و زەلیلی نەکات، چونکە لەوانەیە ئەوان چاکتر بن لەمان، ژنانیش با گاڵتە بەیەك نەکەن و یەکتر زەلیل نەکەن، چونکەلەوانەیە ئەمان لەوان چاکتر بن، سووکایەتی بەخۆتان مەکەن و یەکتری عەیبدار مەکەن (چونکە سووکایەتی بەیەکتر سووکایەتی یە بەخۆتان)، هەروەها ناوو ناتۆرەی ناشیرین بۆ یەکتر دامەتاشن، ئای کەچەند ناشیرینە ناوو ناتۆرەی خراپ لەدوای باوەڕهێنان و موسڵمان بوون، ئەوەش تەوبەی نەکردبێت و پەشیمان نەبووبێتەووە لەگوناهەکانی، جا ئەو جۆرە کەسانە هەر ستەمکارن .

لە پەڕاوی پیرۆزیشدا هاتووە:( لەمنەوە فێربن، من خاکی و دڵ نەرمم، ئینجا دەروونتان ئارام ئەبێت ) متی ١١ـ٢٩.

**ئایین هێزی ئەرێنییە لە ژیاندا:**

ئـاین هێزێکـی ئەرێنییـە هـانی مـرۆڤ ئـەدات بۆئـەوەی واتـای بـوون و ئـاوەدانی لـە سەرزەوی بەدیبهێنێ و بژێوی ژیانی دابین بکات" لە مـادی وەك خـۆراك، مەعنـەویش کـە دۆزینەوەی نادیارو ئالۆزەکانە و فراوانکردنی ئاسۆی بـیری مروڤایـەتی تێرکردنـی حـەزی زانست و زانیاری لەهەموو بوارەکانی ژیان.

ئایین لـە دڵ و عـەقڵ و ئاکـاری مرۆڤـدا گۆڕانکـاری دروسـت دەکـات، ئاینـداری لـە خاوێنی و خۆشەویستی و لیبوردەیی و ڕێکخراوەیی ژیانی دیندارەکەدا ڕەنـگ ئەداتـەوە، لـە پاراسـتنی مـافی بەرانبـەر و هەسـتی یەکسـانبونی مرۆڤایەتیـدا دەردەکـەوێت، ئـاین هاوسەنگی لەژیانی خەڵکیدا دابینکرد کاتێك لە تاریکی دەریهێنان بۆ ڕووناکی، لـە مـردن بۆ ژیان، خوا ئەفـەرموێت:﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا شَيَاطِينَ الْإِنسِ وَالْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ الْقَوْلِ غُرُورًا وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ ﴿١١٢﴾ ﴾. ( الانعـام)، هــەر بـەو شـێوەیە (کێشـمە کێشـی ئیمانـداران و خوانەناسـان بەردەوامـە) جـا بـۆ هــەموو پێغەمبەرێك (بۆ ئیماندارانیش) دوژمنێکمان لە شەیتانەکانی ئادەمیزاد و پەری سازاندوە، کـە بــەردەوام قســەی زل و ڕازاوە دەدەن بــەگوێی یەکـداو (خۆیـان و خــەڵکی) پــێ سەرگەردان و گومڕا دەکەن، خۆ ئەگـەر پـەروەردگارت بیویسـتایە (نەیانـدەتوانی) شـتی وابکەن، دە وازیان لێ بهێنە لەگەڵ ئەو درۆو دەلەسەیەی کـە هـەڵی دەبەسـتن (بـۆ کـوێ دەچن، لە دەست سزای خوایی ڕزگار نابن

ئاینداری ڕاستەقینە دەرهێنانی مرۆڤە لەهەموو ئاکـارە خراپـەکان بـۆ چاکەکان و لـە تارکییەکان بۆ ڕووناکی وەك ئەفـەرموێ:﴿ كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ إِلَيْكَ لِتُخْرِجَ النَّاسَ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ بِإِذْنِ رَبِّهِمْ إِلَىٰ صِرَاطِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ ﴿١﴾ ﴾ (ابـراهیم)، ئـەم قورئانـە کتێبێکـە دامانبەزاندووە بۆت ئەی موحەممەد! تا خەڵکی لە تاریکیەکانی (بێ بـاوەڕی و نـەزانی و

سەرلێشـێواوی) دەربهێنێت، بـەرەو نـوورو ڕێبـازی ڕۆشـنایی ئیمـان، بەویسـتی پەروەردگاریان، تا دەگەنە ڕێبازی ڕاستی خوای باڵادەست و شایستەی سوپاسگوزاری.

هەر لێرەوە ئیسلام دینداری و ڕەوشت بەرزی بەیەکەوە گرێداوە، ئیمان تـەنها وشـە نییە کە بەزمان بووترێ و بەس بەڵکو بەرزبوونـەوەی ڕۆحـە بـۆ بـەرزترینی ڕەوشتەکان. خوای گەورە ئەفەرموێ:﴿ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلۡمِسۡكِينِ ﴿٣﴾ ﴾ (الماعون)، هـانی کەسیش نادات تا خواردن و خۆراك ببەخشێت بە هەژارو نەداران..

پەرستشـەکان کاریگـەری زۆری هەیـە لەسـەر هەڵسـوکەوتی مـرۆڤ. خـوای گـەورە ئەفـــــەرموێ:﴿ ٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَۖ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۗ وَلَذِكۡرُ ٱللَّهِ أَكۡبَرُۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تَصۡنَعُونَ ﴿٤٥﴾ ﴾ (العنكبوت)

ئەی پێغەمبـەر! ئـەوەی بـۆت ڕەوانـە دەکرێـت لـە قورئـان بیخوێنـەرەوە و نوێـژیش بەچاکی ئەنجام بدە، چـونکە بەڕاسـتی نوێـژ بەرهەڵسـتی لـە گونـاهو تـاوان و نادروسـتی دەکات، بێگومان یادی خوا لە هەموو شـت گـەورەتر و بـەنرخترە ( کـە دەبێـت لـە کـاتی نوێژو کاتی تریشدا بیر و هۆشی ئیماندار، دابگرێت ) و خوا خۆی زانایـە بـە هـەموو ئـەو کـار و کردەوانـەی کـە ئـەنجامی دەدەن. و پێغەمبـەریش ئەفـەرموێ:{ هەرکـەس واز لەدرۆکردن و کارکردن بەدرۆ نـەهێنێ ئـەوا خـوا ئاتـاجی ئـەوە نییـە کـە واز لـەخواردن و خواردنەوەکەی بهێنێ}[1]

ئەمـە ئـەو چـەمکەیە هـەموو ئاینـەکانی ئاسمـانی دوپـاتی ئەکەنـەوە، لەپـەڕاوی پیرۆزیشدا هاتووە:{خۆشبەختی بۆ هەژارەکان چونکە بـەهرەی ئاسمانـەکان بـۆ ئەوانـە، خۆشبەختی بۆ دڵتەنگەکان چونکە دڵنەوایی ئەکرێن، خۆشحاڵی بۆ نەرمونیانەکان چونکە

---

١- صحيح البخاري{بشرح فتح الباري} كتاب الصوم باب من لم يدع قول الزور والعمل به في الصوم{١/ ١٣٩} رقم ١٩٠٣

ئـەوان میراتــی زەوی ئەبــەن، خۆشـحاڵی بـۆ تینوبرسـیەکانی چـاکە چـونکە تێـر ئـەبن، خۆشحاڵی بۆ میهرەبانەکان چونکە ئەوان بەر بەزەیی ئەکەون، خۆشبەحاڵی خـاوەن دڵـە پاکـەکان چـونکە خـوا ئـەبینن، خۆشـحاڵی بـۆ ئەوانـەی ئاشـتەوایی دروسـت ئەکـەن .. خۆشبەختی بۆ لانەوازان} (متی ٣:٥ـ ١٠).

ئایینداری خۆشەویستی وئەوینداریە، نەرمی ولێبوردەییە، ئاییندار بەرەو بەزەیی زیاتر کیش ئەکات، لە قورئاندا هاتووە:

﴿ فَٱسۡتَجَابَ لَهُمۡ رَبُّهُمۡ أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٖ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰۖ بَعۡضُكُم مِّنۢ بَعۡضٖۖ فَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَأُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِمۡ وَأُوذُواْ فِي سَبِيلِي وَقَٰتَلُواْ وَقُتِلُواْ لَأُكَفِّرَنَّ عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡ وَلَأُدۡخِلَنَّهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ ثَوَابٗا مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسۡنُ ٱلثَّوَابِ ١٩٥ ﴾ (ال عمران).

(کاتێك ئیمانداران بەم شێوەیە نزایان کرد، کە پەروەردگاری ئازیزیان فێریان دەکات) بێگومــان ئــەو زاتــە دوعاکانیــان لێوەردەگرێــت (بــە هانــاو هاواریانــەوە دەچـێت بۆیـە دەفەرموێت): بەڕاستی من هەوڵ و کۆشش و کـارو کـردەوەی هـیچ کـام لـە ئێـوە بەزایـە نادەم، چ نێرینە و پیاوتـان، چ مێینــە و ئافرەتتـان (چـونکە) هاوکـاری یـەکتر بـوون (لـە چاکەو چاکەکاریدا)، جا ئەوانەی کۆچیان کـردو لـە شـوێنەواری خۆیـان دەربـەدەرکران و ئازارو ئەشکەنجەدران لە پێنـاوی منـدا و جـەنگان و شـەهیدکران، بەڕاسـتی سـوێند بێـت چاوپۆشــی دەکــەم لــە هەڵــەو گوناهــەکانیان و دەیانخەمــە باخــەکانی بەهەشــتەوە کــە چەندەها ڕووبار بەژێر درەختەکانیداو بەردەم کۆشکەکانیدا دەڕوات، ئەمـەش پاداشـتێکە لــە لایــەن خــواوە (پێشکەشـیان دەکرێـت) خــوا پاداشــتی چــاك و جــوانی لایــە (بــۆ تێکۆشەران).

خوای خۆی بەسۆز و بـەزەیی و لێبـوردەو بەخشـەرە، بـە حـاڵی بەنـدەکانی زانایـە و ئەزانێ چی لەبەرژەوەندی ئەواندایە و پێغەمبەرانی بۆ ناردوون، کۆتا پێغەمبەریشـی وەك بەزەییەك بۆ هەموو جیهانەکان ناردوە.

**ئایین بانگەواز بۆ ئاسانكاری ئەكات:**

لە قورئاندا بەمشێوە وەسفی سەروەرمان پێغەمبەر كراوە: ﴿ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُلْ حَسْبِيَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ ﴿١٢٩﴾ ﴾ جا ئەگەر ئەوانە (لەگەڵ ئەو هەموو دڵسۆزیی و میهرەبانیەی تۆدا) هەر پشت هەڵكەن و گوێت بۆ نەگرن، ئەوە ئیتر تۆ بڵێ: من خوام بەسە یارو یاوەرم بێت، كە پشتگیرو یاریدەدەرم بێت، هیچ خوایەك نیە جگە لەو، هەر پشت بەو دەبەستم، ئەو زاتەش پەروەردگاری عەرشی گەورەیە.{التوبة ١٢٩} ئەم بانگەوازەش بۆ ئاسانەكان و ئاسانكاری و دوركەوتنەوەیە لە سەختگیری و تەنگەتاوی.

لە سوننەتی پێغەمبەریشدا هاتوە، پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ئەم ئایینە ئاسانە هەركەسێك زیادەڕۆیی تیابكات ئەیدا بەزەویدا[٢]. كاتێكیش هەواڵی عوسمانی كوڕی مەزعون و هەندێ لە یارانیان بە پێغەمبەردا كە هەمیشە بەڕۆژوون و بەشەو هەر خەریكی شەونوێژن و ئەیانەوێت خۆیان تایبەت بكەن بە خواپەرستی و ژن نەهێنن! پێغەمبەرﷺ توڕەبوو فەرموی: ئێوە ئاواو ئاواتان وتوە، بەڵام بەخوا من لە هەموتان زیاتر لەخوا ئەترسم و زیاتریش لەتاوان پارێز ئەكەم، بەڵام ڕۆژوش ئەگرم و بەڕۆژوش نابم، نوێژ ئەكەم و ئەخەوم و ژنیش ئەهێنم هەركەس لە ڕێگەی من لابدا ئەوە لەمن نییە.[٣]

پیاوێكیش هاتە لای پێغەمبەرو سكالای موعازی كوڕی جەبەلی كرد كە نوێژی بەیانیان ئەوەنە درێژ ئەكاتەوە كە بەهۆیەوە ئەم ناچێت بۆ نوێژی بەیانی، پێغەمبەری خواﷺ توڕە بوو موعازی ئاگاداركردەوە و بە موعازی فەرموو: موعاز ئایا تۆ خەڵك لەدین دەرئەكەی سورەتی فلان و فلان بخوێنە.[٤]

---

٢- صحیح البخاری{بشرح فتح الباری} كتاب الایمان، باب الدین یسر{١/ ١٦} رقم ٣٩

٣ - ==========/ كتاب النكاح باب الترغیب فی النكاح{٩/٥}رقم ٥٠٦٣

٤ - اسناده قوی اخرجه ابن حبان فی صحیحه، كتاب الصلاة باب اعادة الصلاة رقم ٢٤٠٠

پێغەمبەری خواﷺ لە بەزەیی و دڵنەرمیدا سەرمەشق و پێشەوا بووە، خوا ئەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠٧﴾ ﴾ (الانبیاء)، (ئەی محمد ﷺ) ئێمە تۆمان ڕەوانە نەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە ببیتە ڕەحمەت و بەرەکەت بۆ هەموو جیهانەکان (جیهانی ئادەمیزاد و گیاندار و ڕووەك و پەری و... هتد) و پێغەمبەریش ئەفەرموێ: نەرمی لە هەرشتێکدا هەبوو جوانی ئەکات و لەهەرچیشدا لابرا ناشرین ئەبێت.[٥]

پێغەمبەرﷺ لەهەموو کاروبارێکیدا ئاسانی هەڵئەبژارد و دایکمان عائشە ئەڵێت: لەنێوان دوو کاردا پێغەمبەر هەمیشە ئاسانەکەی هەڵئەبژارد بەمەرجێ تاوان نەبوایە.[٦] داوای لەهەموو ئومەتەکەیشی کردووە و فەرمویەتی: ئاسانکاری بکەن خەڵك توشی تەنگەتاوی مەکەن، مژدەدەرین و خەڵك تارمەنێن.[٧]

بەهەمانشێوە خوای گەورە بانگمان ئەکات بۆ ئاسانکاری و مژدەدان و نەرمونیانی، بانگمان ئەکات بۆ پێکەوەژیان و لیبوردەیی و گفتوگۆ و ئەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱجْتَنِبُوا۟ كَثِيرًا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ ٱلظَّنِّ إِثْمٌ ۖ وَلَا تَجَسَّسُوا۟ وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًا ۚ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢﴾ ﴾ (الحجرات)

ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، خۆتان زۆر بپارێزن لەگومانی خراپ، لەڕاستیدا هەندێ لەو گومانانە گوناهو تاوانن (بۆیە حەق وایە لەهەموو گومانێك خۆپارێزبین ) بەشوێن کەمو کووڕیی و عەیب و عاری یەکتردا مەگەڕێن و سیخوڕی مەکەن و لەپاش ملەباسی یەکتری بەخراپ مەبەن، ئایا کەستان خۆشی دێت لەوەی گۆشتی برای خۆی

---

٥- صحیح اخرجە ابن حبان فی صحیحە، کتاب البر والاحسان، باب الرفق رقم ٥٥١

٦ - صحیح البخاری{بشرح فتح الباری} کتاب الحدود، باب: اقامة الحدود و الانتقام لحرمات الله{٨٨/١٢}، رقم٦٧٨٦

٧- ================ العلم باب ماکان النبی یتخولهم بالوعظة و العلم کی لا ینفروا{١٩٦/١ رقم ٦٩

بەمردوویی بخوات ؟! دیارە کاری واتان زۆر پێ سەخت و ناخۆشە، دەی کەواتە لەخوا بترسن و پارێزگار بن، چونکەبەڕاستی خوا گەڕانەوەی خەڵکی وەردەگرێت و میهرەبانە بۆتان .

بە پێغەمبەرەکەیشی فەرمووە: ﴿ ٱدْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلْحِكْمَةِ وَٱلْمَوْعِظَةِ ٱلْحَسَنَةِ ۖ وَجَٰدِلْهُم بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ ۖ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ ﴿١٢٥﴾ ﴾ (النحل و فصلت ولا تستوی) (ئەی پێغەمبەرﷺ، ئەی ئیماندار) بانگەواز بکە بۆ لای بەرنامەو ڕێبازی پەروەردگارت بەحیکمەت و دانایی (بۆ هەندێك) و ئامۆژگاری جوان و بەجێ، (بۆ هەندێکی تر)و گفتوگۆو موجادەلە بەجوانترین شێوە (لەگەڵ هەندێکی تردا بە تایبەتی خاوەن کتێبەکان)، چونکە بەڕاستی پەروەردگارت هەر خۆی زانایە، کە کێ گومڕایە، هەروەها هەر خۆیشی زانایە بە هیدایەت و وەرگران.

لە پەڕاوی پیرۆزیشدا هاتووە: لە ئیصحاحی شەشەمدا: بەڵام من بە ئێوە ئەڵێم ئەی بیسەران: دوژمنەکانتان خۆشبوێ و چاکە بکەن بەرانبەر ئەوانەی ڕقیان لێتانە، (٢٨) ئەوانەی نەفرینتان لێئەکەن پیرۆزکەن و بپاڕێنەوە بۆئەوانەی خراپەتان بەرانبەرئەکەن (٢٩)، هەرکەس لەڕومەتێکی دایت ئەو رومەتەکەیتری بدەرێ، هەرکەس پۆشاکەکەی بردی لە جلەکانی ژێرەوەش مەنعی مەکە (٣٠) هەرکەسێك داوای لێکردی بیدەرێ، ئەوکەسەی شتێکی تۆ ئەبات داوای مەکەرەوە.

**ئایین بانگەواز ئەکات بۆ کردنی هەموو چاکەیەک:**

لە قورئاندا نابینین ئایەتێك داوای باوەڕی کردبێت لەگەڵ ئەو داوایەدا داوای کردەوەی چاکی نەکردبێت وەك ئەفەرموێ: ﴿ وَٱلْمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٍ ۚ وَلَا يَحِلُّ لَهُنَّ أَن يَكْتُمْنَ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ فِىٓ أَرْحَامِهِنَّ إِن كُنَّ يُؤْمِنَّ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ۚ وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِى ذَٰلِكَ إِنْ أَرَادُوٓا۟ إِصْلَٰحًا ۚ وَلَهُنَّ مِثْلُ ٱلَّذِى عَلَيْهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ۚ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٢٨﴾ ﴾ ( البقرة)،

ژنانی تەڵاقدراو، دەبێت تا سێ جار عادەتی مانگانە چاوەڕێ بکەن و (شوونەکەنەوە) و حەڵاڵ نیە بۆیان ئەوەی خوا لە منداڵدانیاندا دروستی کردووە (منداڵ یان حەیز) بیشارنەوە، ئەگەر باوەڕیان بە خواو بەرۆژی دوایی دامەزراوە، (لەو ماوەیەدا) هاوسەرەکانیان شایستەن بەگێڕانەوەیان لە ماوەی چاوەروانی و عیدەدا، ئەگەر ویستیان چاکسازی لە ژیانی خۆیاندا بکەن (ئەمەش بۆ تەڵاقی ڕەجعی یە)، ژنان مافیان هەیە بەسەر پیاوانەوە بەوێنەی ئەو مافانەی کە بۆ پیاوانە لەسەر ژنان بەگوێرەی باو و نەریتێك کە پەسەندە لە ئیسلامدا و پیاوان بەسەر ئافرەتانەوە یەك پلەیان هەیە (ئەویش دەسەڵاتی گێڕانەوەی ژنەکانیانە لەکاتی تەڵاقی ڕەجعیدا)و خوا باڵادەست و دانایە (باڵادەستە بەسەر هەمواندا و دانایە لە دابەشکردنی ماف و ئەرکەکاندا).

وە هەروەها خوای گەورە داوای پێشبڕکێ ئەکات بۆ کردنی چاکەکان: ﴿ وَلِكُلٍّ وِجْهَةٌ هُوَ مُوَلِّيهَا فَاسْتَبِقُوا الْخَيْرَاتِ أَيْنَ مَا تَكُونُوا يَأْتِ بِكُمُ اللَّهُ جَمِيعًا إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٤٨﴾ ﴾ (البقــــرة)، ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ارْكَعُوا وَاسْجُدُوا وَاعْبُدُوا رَبَّكُمْ وَافْعَلُوا الْخَيْرَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ۩ ﴿٧٧﴾ ﴾، (الحج)

ئەی ئەو کەسانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە کڕنووش و سوژدە بەرن و (نوێژەکانتان بەجوانی بکەن) و پەروەردگارتان بپەرستن لە هەموو ناروڕۆخێکداو تا دەتوانن چاکە و چاکەکاری ئەنجام بدەن بۆ ئەوەی سەرفرازو سەرکەوتووبن... بۆ هەر گەل و میللەتێك ڕوگەو قیبلەیەك هەیە، خوا ڕوویان وەردەچەرخێنێت بۆ لای، (دە ئێوەی موسوڵمان) پێشبڕکێ بکەن لە چاکەکاندا، ڕوو لە هەرکوێ بن خوا هەمووتان کۆ دەکاتەوە چونکە بەڕاستی ئەو خوایە بەتوانایە بەسەر هەموو شتێکدا.

**ئایین بۆ زانست و بیریاری و ڕامان خەڵک بانگ ئەکات:**

سەرەتای قورئان بەبانگەواز بۆ زانست و فێربوون دەستی پێکرد: ﴿ ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ﴿١﴾ خَلَقَ ٱلْإِنسَـٰنَ مِنْ عَلَقٍ ﴿٢﴾ ٱقْرَأْ وَرَبُّكَ ٱلْأَكْرَمُ ﴿٣﴾ ٱلَّذِى عَلَّمَ بِٱلْقَلَمِ ﴿٤﴾ ﴾ (العلق)، (ئەی محمد ﷺ) بخوێنە بەناوی ئەو پەروەردگارەتەوە کە هەموو شتێکی دروست کردووە. ئادەمیزادی لە چەند خانەیەکی هەڵواسراو (لەناو منداڵدانـدا) دروست کردووە. بخوێنە، لەکاتێکدا هەر پەروەردگاری تۆ بەخشندەیە. ئەو زاتەیە کە بەهۆی قەڵەمەوە زانستی و زانیاری فێر کردووە. و زۆرێك لە ئایەتەکانیش خەلك بانگ ئەکەن بۆ کاراکردنی عەقڵ و بیر و ڕامان وەك ﴿ ۞ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ ۖ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَـٰفِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا ۗ وَيَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ ٱلْعَفْوَ ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْـَٔايَـٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١٩﴾ ﴾(البقرة و ٧٣)، پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی عەرەق و قومار، پێیان بڵێ: لەو دووانەدا تاوان و گوناهێکی گەورە هەیە، هەر چەندە چەند سوودێکیشان تێدایە بۆ خەڵکانێك، بێگومان گوناهەکەیان گەورەترە لە کەڵك و سوودیان، پرسیارت لێدەکەن کە چی ببەخشن؟ پێیان بڵێ: هەرچیتان لێ زیادە دەتوانن ببەخشن، ئا بەو شێوەیە خوای گەورە ئەم بەڵگەو فەرمانانەتان بۆ ڕوون و ئاشکرا دەکات بۆ ئەوەی بیر بکەنەوەو (واز لەو شتانە بهێنن کە زیانیان زۆرترە لە سوودیان، وەچی بۆ هەردوو جیهانتان چاکە ئەوە بکەن)... ﴿ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَـٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَـٰذَا بَـٰطِلًا سُبْحَـٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٩١﴾ ﴾ (ال عمران)، ئەوانەی یادی خوا دەکەن لەکاتێکدا کە بەپێوەن یان دانیشتوون یان ڕاکشاوون (لە هیچ حاڵەتێکدا یادی ئەوزاتە فەرامۆش ناکەن)، هەمیشە بیردەکەنەوە لە دروست بوونی ئاسمانەکان و زەوی (بیردەکەنەوە لە هەموو وردەکاریەك، سەرنجی

هەموو دیاردەیەك دەدەن، سەرئەنجام دەڵێن): پەروەردگارا تۆ ئەم هەموو دروست کراوانەت بێ هودە و بێ ئامانج دروست نەکردووە، پاکیی و بێگەردیی شایستەی تۆیە، دە تۆش بمانپارێزە لە سزای ئاگری دۆزەخ، تانە لەوانەش ئەدات کە ڕامان لە ئایەتەکانی خوا ناکەن: ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ ﴿٢٤﴾ ﴾ (محمد)، ئایا ئەوەبۆچی ئەوانەوردبینی لەقورئاندا ناکەن و گوێی بۆ ناگرن ؟! یان ئەوەیە دڵەکان لەئاستی ڕاستیدا قفلێ دراوە؟!

**ئاین بانگەواز بۆ جوانی ئەکات:**

قورئان پڕەلەو ئایەتانەی کە سەرنجی بینەرو بیر ڕائەکێشێ بۆلای جوانییەکانی بوونەوەر، لە (ئایەتی ٣٥ی سورەتی النور) ڕابمێنە کەئەفەرموێ:

﴿ ۞ ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ مَثَلُ نُورِهِۦ كَمِشْكَوٰةٍ فِيهَا مِصْبَاحٌ ۖ ٱلْمِصْبَاحُ فِى زُجَاجَةٍ ۖ ٱلزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوْكَبٌ دُرِّىٌّ يُوقَدُ مِن شَجَرَةٍ مُّبَٰرَكَةٍ زَيْتُونَةٍ لَّا شَرْقِيَّةٍ وَلَا غَرْبِيَّةٍ يَكَادُ زَيْتُهَا يُضِىٓءُ وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نَارٌ ۚ نُّورٌ عَلَىٰ نُورٍ ۗ يَهْدِى ٱللَّهُ لِنُورِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ وَيَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَٰلَ لِلنَّاسِ ۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٣٥﴾ ﴾،

خوا نوورو ڕووناکی ئاسمانەکان و زەویە (نوورو ڕووناکی بەخشە پێیان)، نموونەی نوورو ڕووناکیەکەی وەك تاقێك وایە چرایەکی تێدا بێت، چراکەش لەناو شووشەیەکدا بێت شووشەکەش وەك هەسارەیەکی گەش و پرشنگدار وابێت و داگیرسابێت بە ڕۆنی درەختی موبارەك و بەفەڕی زەیتوون، ڕووی نە لە ڕۆژ هەڵات و نە لە ڕۆژ ئاوا بێت (لە شوێنێکدا بێت بەیانی و ئێوارە خۆر لێ بدات)، ڕۆنەکەشی (ئەوەندە پاك و بێگەردە) خەریکە خۆی دابگیرسێت و ڕووناکی بداتەوە، ئەگەر ئاگریش لێی نەدات، ئەو هیدایەت و ڕێنموویی یە کە قورئانە ڕووناکی یە لەسەر ڕووناکی، خوایش هیدایەتی ئەو کەسانە دەدات کە دەیەوێت و شایستەن بۆ لای نووری خۆی کە قورئانە، خوا چەندەها نموونە دەهێنێتەوە بۆ خەڵکی (تا لە نموونە مەعنەویی یەکان تێبگەن) خوایش بەهەموو شتێك زانایە...

هەروەها سەرنجی ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەر بدە کە ئەفەرموێ: خوا خۆی جوانە و جوانیشی خۆشئەوێ.[8]

**ئاین بانگەوازە بۆ ڕەوشت بەرزی:**

خۆ ڕازاندنەوە بەڕەوشتە بەرزەکان وخۆلادان لە بەدڕەوشتی داواکارییەکی گرنگی هەموو پەیامەکانی ئاسمانە، بۆ ئەوەی مرۆڤ شایستەی پەیامی گەورەی جێنشینی بێت. لەقورئانی پیرۆزدا ئایەتی زۆر هەن کە خەڵکی هان ئەدات بۆ ڕەوشتە جوانەکان وپێغەمبەرەکەیشی ستایشکردوە بەوەی کە خاوەنی بەرزترین ڕەوشتە وئەفەرموێ: ئەی موحەمەد تۆ دارای بەرزترینی ڕەوشتەکانیت ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾ ﴾(القلم)، تۆ لەسەر ڕەوشت و خوویەکی زۆر جوان و پەسەند و بێ وێنە و مەزنیت.هەروەها لە ستایشی بەندە ڕاستەکانی خۆیدا لەسورەتی فورقاندا ئەفەرموێ: ﴿ وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى ٱلْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَٰهِلُونَ قَالُوا۟ سَلَٰمًا ﴿٦٣﴾ ﴾ (الفرقان).

بەندەکانی خوای میهرەبان ئەو کەسانەن کە زۆر بە هێمنی و سەلاری بەسەر زەویدا دەڕۆن، کاتێکیش نەفامان بە قسە و قسەلۆکی ناخۆش بەرەنگاریان دەبن، لە وەڵامیاندا دەڵێن: سڵاو (ڕەوشت بەرزی خۆیان دەنوێنن).

هەروەها فەرمان بەبەندەکانی ئەکات بەچاوپۆشی و لێبوردەیی و ڕقخواردنەوە وەك لە سورەتی ئالی عمراندا ئەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِى ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَٱلْكَٰظِمِينَ ٱلْغَيْظَ وَٱلْعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِ ۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٣٤﴾ ﴾ (آل عمران)، ئەوانەی لە خۆشی و ناخۆشیدا، لە هەرزانی و گرانیدا ماڵ و سامانیان دەبەخشن، ڕق و کینەی خۆیان دەخۆنەوەو خۆگرن، لە خەڵکی خۆش دەبن و لێبووهردەن، خوای میهرەبانیش چاکەکارو

---

٨- صحیح مسلم {بشرح النووی}، کتاب الایمان باب تحریم الکبر و بیانه ٤٨٣/٢/ رقم ٢٥٩

چـاکەخوازانی خـۆش دەویـت. لـە سـورەتی حجریشـدا ئەفـەرموێ: ﴿ وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ۗ وَإِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَءَاتِيَةٌ ۖ فَٱصْفَحِ ٱلصَّفْحَ ٱلْجَمِيلَ ﴿٨٥﴾ ﴾ (الحجـر )، ئێمـە ئاسمانـەکان و زەوی و هەرچـی لـە نێوانیاندایـە دروسـتمان نـەکردووە، بـۆ مەبەسـتی چەسپاندنی حەق و ڕاستی نەبێت (هیچ شتێك لە دروست کراوان بێ مەبەست نیـە، هـیچ شتێك بـێ ئامـانج نیـە..)، بەڕاسـتی ڕۆژی قیامـەتیش بەڕێوەیـەو هـەر دێـت و تـۆ (ئـەی پێغەمبەر، ئەی ئیماندار) بەشێوازێکی جوان چاوپۆشـی بکـەو لێبـوردە بـە (لـە ڕەفتـاری نادروستی نەفامان).عوقبەی کوری عامر خوای لێ رازی بیت ئەڵێت: گەیشتم بە پێغەمبـەر درودی خوای لەسەر بیت دەستم برد دەستی بپرۆزیمگرت، یان ئەو دەستی پیرۆزی هێناو دەستی منی گرت فەرموی: ئەی عوقبە باشـترین ڕەوشـتی خـەڵکی دونیـاو قیامـەتت پـێ بڵێم؟ ئەوەیە پەیوەندی بکە لەگەڵ ئەوانەی پەیوەندیان لەگەڵ تـۆ بچڕاندووە، ببەخشـە بەوانەی لەتۆیان گرتۆتەوە، ئەوانەی ستەمیان لەتۆکردوە بیانبەخشە، هەرکەس ئەیەوێت ڕۆزی فـراوان بیـت و تەمـەنی درێژبێتـەوە بـاخۆی لەتاوانـەکان بپـارێزێ و پەیوەنـدی خزمایەتی بپارێزێت.[9] هەروەها پرسیاریش لە پێغەمبەر کراوە: باشترین کردەوە کامەیە؟ فەرمویەتی: ڕەوشت بەرزی.[10].

ئەم پـەیامە پیرۆزە بەبێ کوششی بەردەوام و ڕووبەڕوبونەوەی شەیتان و ئارەزووەکـان نایەتەدی خـوای گەورەلەسـورەتی عەنکەبوتـدا ئەفـەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٦٩﴾ ﴾ (العنکبـوت)، ئەوانـەش لـە پێنـاوی ئێمـەداو بـۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئێمە" هـەوڵ و کۆششـیان کـردووە و خۆیـان مانـدوو کـردووە، سوێند بەخوا بەڕاستی ئەوانە ڕێنموویی دەکـەین بـۆ هـەموو ڕێگەیـەکی چـاك و دروسـتی

---

٩ – ذکره البغوی فی شرح السنة، کتاب الرؤیا، تاویل الثیاب والفرش/٦/٢٧٦

١٠ – اخرجه الطبرانی فی المعجم الکبیر/٤٦٨

خۆمـان (کـە بەدەستهێنانی ڕەزامەنـدی ئێمـەی لەدوایـە)، بێگومـان خـوای پـەروەردگار هەمیشە لەگەڵ چاکەکارانە. لەسەروی ئەمانەشەوە ئەبیت باوەڕی تـەواو هـەبێت بـەهاتنی قیامەت و بێگومان بیت لەوەی خوای گـەورە کـردەوەی بەنـدەکانی دەبینـێ و پاداشـتی چاکەی چاکەکاران و سزای خراپەکارانیش ئەداتەوە لە سورەتی زەلزەلەشـدا ئەفـەرموێ:

﴿ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ﴿٧﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ﴿٨﴾ ﴾،

جـا ئـەوەی بەقـەدەر سـەنگی گەردیلەیـەك خێـرو چـاکەی ئـەنجام دابێـت دەیبینێتـەوە. ئـەوەش کـە بەقـەدەر سـەنگی گەردیلەیـەك شـەڕو خراپـەی هـەبێت، دەیبینێتەوە. لەپەڕاوی پیرۆزیشدا هاتووە: هەتا ئەتوانی دریغی لە چاکە مەکە بەرانبـەر ئەوانەی شایستەن، ئەگەر هەتبوو بـە هاوەڵەکـەت مـەڵێ بـڕۆ سبەی وەرەوە ئەتـدەمێ، شەڕ بەهاوەڵەکەت مـەگێرە کاتێـك ئـەو بـە ئـارامی دانیشتوە، دوژمنایـەتی کـەس مەکـە ئەگەر کەس شەڕەگیزی بەرانبەرت نەکردوە. (امثال/٣/٢٧ــ٣٠ ).

دینداریکردن بەبێ بەدواداچونی وەحی خوایی بەتـەواوەتی کـەس پوختـە ناکاتـەوە و ژیری و ویژدان زیندوناکاتەوە و سروشت پاك ناکاتـەوە بـەڵکو ئەبێتـە بـارێکی قـورس و پەڵە لەسەرشانی ئیماندارانەوە.

ئیمانـداری ڕاسـتەقینە ئەبێتـە ئاوێنـە بـۆ گـەورەیی ئاینـەکانی ئاسمـانی. هـەموو ئاینـەکان ڕێنمونییـەکانیان ئەرێنییـە و شـوێنەواری قـوڵ لەسـەر ژیـان و دڵـی شوێنکەوتوەکانیان بەجێدەهێڵن.

**لە ئاماژەکانی ئاینەکانی ئاسمان ڕابمێنە:**

ئـەوەی لەهەرسـێ ئاینـە ئاسمانییەکـە ڕابمێنـێ ئێـدەگات دانـایی ڕەمـزی ئـاینی جولەکەیەو خۆشەویستی ڕەمزی ئاینی گاورە وبەزەییش ڕەمزی ئاینی ئیسلامە، هەنـدێك ئەپرسن ئایـا چـی ئـەبێت ئەگـەر دانـایی و خۆشەویسـتی و بـەزەیی یەکبگرێتـەوە ئایـا کۆمەڵگاکان ئەبێتە کۆمەڵگایەکی فریشتە ئاسا؟!.

بەڵێ بەوشێوە ئەبێت  بەڵام کۆمەڵێك لەخەڵك سورن لەسەرئەوەی ئەم بەرزی واتایانە بەلاڕێدا ببەن بەرەو دوژمنایەتی و کێشمەکێش، عاقڵەکانیش ئەپرسن:

- ئایا هەموو مرۆڤایەتی بەڕەنگ و زمانە جیاوازەکانیشەوە ناگەڕێنەوە بۆیەك ئەسڵ، باوکیان ئادەمە و دایکیان حەوایە؟!.
- کەواتە ئەی دابڕان و کینەو دژایەتی بۆچی؟!.
- چۆن ئەبێت وابێت کەخوا ئەو بەهرە گەورە و بەخششەی پێداوین کە عەقڵە؟ ئەو بەهرەیەی کە مرۆڤی کردۆتە سەرداری زەوی، داهێنان و دۆزینەوە و دەستەمۆکردنی هەموو سروشت بەهۆی ئەو بەهرەوەیە کە خوا بە مرۆڤیداوە، گەشتی ئاسمانەکان ئەکات و هەموو ڕێگرێکی کات و شوێنی بڕی و ژیانی سەرلەنوێ تازەکردەوە.
- خوای گەورە مرۆڤی بەزمان تایبەتکردوە، کە بەهۆیەوە پەیوەندی و بیرکردنەوە و ئاڵوگۆری زانیارییەکان ڕووئەدات، بەم دووبەهرە خواییە– زمان و عەقڵ - مرۆڤ دەسکەوتی زۆری بووە.
- خوای گەورە ویستی وابووە ئەم مرۆڤە بەپلەبەرزەکاندا ببات بۆیە پێغەمبەرانی بۆ ناردوون و پەڕاوی پێداون تا دڵەکان پڕبکات لە ڕوناکی بەزەیی و خۆشەویستی ، پێغەمبەران هەمویان بۆ بەرژەندی خەڵکی نێردراون.
- لادانی فیکری لای توندڕەوەکانی هەر ئاینێك  سروشتی پاکی تێکداون و واتا جوان و مەبەستە گەورەکانی ئاینیان شێواندوە، بەناوی ئاینەوە جەنگیان بەرپائەکرد، هەربەناوی ئایینەوە رق و کینەو دوژمنایەتیان ئەکرد، بەهرەی ژیان و ئاشتیان لەئێمە سەندەوە دوای ئەوەی کەخوا پێمانی بەخشیبوو، هەموو ژیانیان کردە بەربەرەکانی و خوێنرێژی.
- تێبینەری هەرسێ ئایینەکە، جولەکەو گاور و ئیسلام ئەبینێ ڕەمزی هەرئاینێك بەڵگەیە لەسەر مەستی ئاینەکە، دانایی ئاینی جولەکەو خۆشەویستی گاور و بەزەیی

ئیسلام ئەگەر پێکەوە کۆبکرێتەوە، جیهان دەکاتە بەهەشتێکی سەرزەوی، ئاشتی و هاوکاری و پێکەوەژیان باڵ ئەکێشێ بەسەر زەویدا.

- ئاشتییەکی جیاوازە، جیاوازە لە ئاشتی بەرژەوەندی و ئاشتی لاوازی و ئاشتی هێـز.... ئاشـتییەکە لـەناخ و دڵەوە...ئارامییەکـە لـەقوڵایی دڵـەوە دێت..ئەگـەر شـوێنکەوتەی هـەر ئاینێـک پێغەمبەرەکـەی خـۆی بکاتـە پێشـەنگی خـۆی لـەدانایی و خۆشەویسـتی و بەزەییـدا ئـەوا دونیـا پـڕ ئـەبێت لـە ئاشـتی و ئاسـایش و چـاکە و بەخشندەیی.
- ئایینـەکان هـەمویان ڕێنمونیکـارن بـۆ خـەڵکی. هەڵـەکان لـە هەڵەتێگەیشـتنەوە سەرچاوەیانگرتووە و ئاین لێی بەرییە،..بۆنمونە خاچ ڕەمزی گیانفیدایی و لەخربوردەیی خۆشەویستییە لە ئاینی گاوردا! بـەڵام بەسیاسـەتکردنی ئـەم ڕەمـزەی لـە بازنـەی خێـر دەرکردووە بۆ بازنەی خراپە، هەروەك چۆن ئەمە بە ڕوونی ئەبینین لە ناوی: شـەڕەکانی خاچ پەرستی...ئەمەش خراپەیەکـە بەرانبـەر بـە خـاچ ئـەکرێت، ئاینـداری ڕاسـتەقینە و عەقڵی ساغ ئەمە قبوڵ ناکات.
- لە ئیسلامیشدا کوشتار تـەنها بـۆ پەرچـدانەوەی ستەمە نـەك بـۆ هێرشـبردن و دوژمنایـەتی کـردن بـەڵام بەسیاسـەتکردنی شەڕوکوشـتار گۆڕیویـەتی بـۆ دوژمنایـەتی و تۆقاندن، ئەمەش خراپەیە بەرانبەر ئاینی ڕەحمەت و لێبوردەیی کە ئیسلامە.
- دەمارگیرەکـانی لـەناو شـوێنکەوتەی هـەر ئاینێـك تـاوانی گـەورە ئەکـەن کاتێـك بیرۆکـەی خۆیـان وەك ئـاینی پـیرۆز پیشـانی خـەڵك ئـەدەن و لەمـەش خـراپتر سـزا بـە شایستەی ئەوانە ئەزانن کە پێچەوانەی بیری ئەوان بێت.
- لە بێ ئاگایی ئێمـە لـە مەبەسـتە سـەرەکییەکانی پـەیام و ئایینـەکانی ئاسمـان، پەیامی مرۆڤایەتیمان لەبیرکرد، ڕێگەماندا کۆمـەڵێك لـە ئێمـە لەبـەهرەی خۆشەویسـتی و بـەزەیی و ئاشـتی بەریمانکـەن، مـەودای خۆشەویسـتی و ژیانمـان وەك خێزانێکـی

مرۆڤایەتی پڕ لە بڵندی و ڕوناکی خوایی لەدەست چوو، ئەو نورە خواییەی کە خوا هاویشتییە ناودڵمان خامۆش بوو، دوژمنایەتی پارچە پارچەی کردین، کێشەکان پەرتیکردین.

- بەڵام مرۆڤایەتی خاڵی نابێت لە ژیرەکان، خەڵك بانگهێشتی خۆشەویستی و بەزەیی و دانایی ئەکەن کە لە پێناویدا ئایینەکان هاتون.
- پەرتەوازەیی ودوژمنایەتی بەسە باهەنگاوێکیش بێت بەرەوپێش بڕۆین، لەسەر ڕێگەی خۆشەویستی و ئاشتی، لەبەر خاتری نەوەکانی داهاتوو.

## ئیسلام خەڵک بۆ گفتوگۆ بانگ ئەکات.. لەبری پێکدادان.

لەم دواییانەدا لەناو کۆمەڵگەی ئێمەدا هەندێ ئاکاری خراپ بڵاوبۆتەوە کە کاریکردۆتەسەر بارودۆخی گشتی کۆمەڵگاو ڕۆشنبیری و بەهاکانی، یەکێتی ئوممەتی ئیسلامی کەرتکردووە !، لەخراپترینی ئەو ئاکارانە بەکارهێنانی ئایینە بۆ بەرژەوەندی و مەبەستی تاکەکەسی و دونیایی، هەروەها بەکارهێنانی بنەما باڵاکانی بۆ بڵاوکردنەوەی ڕق و کینە کە بەهیچ شێوەیەك لەگەڵ ئاین و مەبەستە بەرزەکانیدا ناگونجێ و دژەوانەیە ! ئامانجی بەرزی ئایینەکان: پێکەوەژیان و یەکترناسین و ئاڵوگۆڕی پەیوەندییەکانە لە سورەتی حوجوراتدا ئەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَـٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَـٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾ ﴾، ئەی خەڵکینە بێگومان ئێمە هەمووتانمان لەنێرو مێیەك دروستکردووە( کە باوکە ئادەم و دایکە حەوایە) و کردوومانن بەچەندەها گەل و تیرە و هۆزی جۆربەجۆر، تا یەکتر بناسن و پەیوەندیتان خۆش بێت بەیەکەوە ... بەڕاستی بەڕێزترینتان لای خوا ئەو کەسانەتان کەزۆرتر لەخواترسەو فەرمانبەرداری خوایە، بێگومان خوا زاناو ئاگایە بەهەموان .ئەم پاشەکشەیە لە ڕۆشنبیریدا ئێمەی گەڕاندۆتەوە بۆ سەردەمی نەفامی کە هیچ

چوارچـێوەیەکی ڕەوشـتی و ڕۆحـی نـەبوو تـا بـیر و ئاکارەکـان ڕێکخـات و پێـوەرێکی یاساییان بۆ دابنێ، ئەم پاشەکشەیە جگە لە دارمان و لاوازی زیـاتر هیچـی بۆئێمـە نییـە، هەندێك گومانی ئەوەیان ئەبرد کە هەڵەی موسڵمانان ئیسلامی پـێ لەکـەدار ئـەبێت یـان ئـاینی مەسـیحیش هـەروەها... نـەخێر ئیسـلام و مەسـیحییەت دوو ئـاینی ئاسمـانین و شێوازی پراکتیزە کردنیان لەلایەن خەڵکەوە هەڵەو کەموکورتی تێدەکەوێت.

ئەگەر ئێمە باوەڕمان بەمە هێنا ئەوائەتوانین بابەتیانە و بەویژدانەوە سەیری بابەتەکە بکەین و زەمینـە لـەباربێت بـۆ گفتوگـۆ لـە نێـوان ژیارەکـان و ئایینـەکان بکرێـت لەسـەر بناغەیەکی پتەو لە باوەڕ بـە ئـازادی بـیروڕا و جیاکـاری لـە نێـوان ئـایین وەك دانراوێکـی خوایی بالا لەگەڵ هەڵەکانی مرۆڤ لە پراکتیزەکردنی ئەو ئایینە، هەروەها گفتوگۆ لەسـەر بناغەی برایەتی مرۆڤایەتی کە هەموو مرۆڤەکان پێکەوە ئەبەستێتەوە چ ئایینـدارین یـان بێ ئایین کە هاوبەشن لەو ڕێزەی کە خوا وەك مرۆڤ پێیبەخشیون.

- گفتو گۆ لەسـەر ئـەو بنەمایانـە دەوەسـتی لـەجیاتی هاتوهـاوار و دوژمنایـەتی و تۆمەت بەخشینەوە و خانـەگومانی کـە مرۆڤایـەتی لـە سـایەیدا هیچیان دەسـتنەکەوتوە جگـە لـە بـەفیڕۆدانی ووزەو بـەهاو و تەنانـەت خـوێنیش! . کۆتـا هەڵایـەك ئـەوەبوو کـە ڕۆژئاوا بەناوی ململانێی ژیارەکان برەوی پێدا، بەمشـێوە ململانـی کۆنەکـەیان گەڕانـەوە مەیدان، و بەناوی ئایینەوە شەڕی هەڵگیرسان نمونەش بۆئەمە شەڕەکانی خـاچ پـەرسـتی بوو کە دروشمەکەی: مەسیحییەت لە ڕوبەڕوبونەوەی ئیسلامدا.بوو
- پێویستە لەسەر دڵسۆزەکان و عاقڵەکانی جیهان کە هەموو ئەو پیلانانـە ئاشـکرا بکەن ئایینی کردۆتە قەڵغانێك بۆ هەموو مەرامێکی پیسی خۆیان، ئەو فروفیشـاڵانەی کـە ڕۆژئاوا بەمەرامی تایبەت بڵاویان دەکاتەوە سەرنەگرێت و نەکەوێتە هەڵـەی بـەکارهێنانی ئاین بۆ مەرامی تایبـەت و بەرژەوەنـدی دونیاییـەوە، بۆنمونـە لەبـەکارهێنانی ئایینـە کـە شەڕی خاچ پەرستی بەرپا ئەکرێت و لەو دروشمەشدا ناپاکی لەگەڵ خاچدا ئەکرێت کە لە

ڕاستیدا خاچ لای برادەرانی مەسیحی ڕەمزە بۆ لەخۆبوردەیی، ئەی چۆن ئەوان گۆڕییان بۆ ڕەمزێکی شەڕو دوژمنکاری؟؟!

- ئیسلام بیری گفتوگۆی ژیارەکانی هێنایە ئاراوە لە جیاتی ململانێی ژیارەکان، پێکەوە ژیانی ئاشتیانەش لەبری ڕقەبەرایەتی، برایەتیش لەبری پێکدادان و دژایەتی. تەورات و ئینجیلیش هەمان بانگەشە ئەکەن، لەپەڕاوی پیرۆزدا هاتوە: {خۆشحاڵی بۆ ڕۆح خاکییەکان، چونکە هێزی ئاسمانی بۆ ئەوانە، خۆشحاڵی بۆ خەمگینەکان چونکە دڵنەوایی ئەکرێن، بۆ نەرمونیانەکان چونکە ئەوان میراتگری زەوین، خۆشحاڵی بۆ ئەوانەی تینو برسی خێرن چونکە ئەوان تێر ئەکرێن، بۆ ئەوانەش بەبەزەیین چونکە بەزەیی خوا ئەیانگرێتەوە، خۆشبەختی بۆ دڵ پاکەکان چونکە خوا ئەبینن، خۆشبەختی بۆ ئەوانەی ئاشتی بەدیدێنن چونکە ئەوان وەك کوڕی خوا بانگ ئەکرێن، ئەوانەش کە لە پێناوی چاکەدا دەرئەکرێن چونکە ئاسمان بۆ ئەوانە، خۆشحاڵی بۆ ئێوە کاتێك تانەتان لێدەدرێ و دەردەکرێن و قسەی خراپتان دەربارە ئەکرێت لە پێناوی مندایە، ئەوان درۆزنن، شادو گەشاوەبن چونکە پاداشتان لای خوا گەورەیە، ئەو درۆزنانە بەوشێوە پێغەمبەرەکانی پێش ئێوەیان وەدەرناوە} (متی/٥: ٣ـ ١٢).

- ئەوە ناوەڕۆکی هەموو ئایینەکانی ئاسمانە هاژینی و یەکترناسین هەرچەندە ڕەنگ و زمان و ڕەچەڵەك و بیروباوەڕ و مەزهەب جیاواز بێت وەك لە سورەتی هوددا ئەفەرموێت: ﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ أُمَّةً وَٰحِدَةً ۖ وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ ﴿١١٨﴾﴾ (هود)، خۆ ئەگەر پەروەردگارت بیویستایە ئەوە هەموو خەڵکی دەکرد بەیەك تاقم و کۆمەڵ، (بەڵام) بەردەوامیش ئەو خەڵکە جیاوازن لەنێوانی یەکتردا لە ئایین و بەرنامە و بۆچووندا...ئەگەر ئەو جیاوازیانە نەبوایە هیچ پێویستیەك نەئەبوو بۆ بانگەشەی پێکەوەژیان و یەکتر ناسین و هاوسێیەتی و گفتوگۆی ژیارەکان.

## ئیسلام لەگەڵ جگە لە خۆی:

- لە ڕاستییە ڕونەکانە کەئیسلام هەموو ئایین و شارستانییەکانی پێش خۆی لەخۆگرتووە، باشترینی شتەکانی ئەوانی هێناوەتەوە و پێغەمبەری بەڕێزیش موحەمەد درودی خوای لەسەر بێت هەموو پێغەمبەرەکانی پێش خۆی بەڕاستگێڕاوە ، وەك لەم چەند ئایەتەدا دیارە: لە سورەتی فاتیردا:﴿ وَٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ هُوَ ٱلۡحَقُّ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِعِبَادِهِۦ لَخَبِيرُۢ بَصِيرٞ ٣١ ﴾ (فاطر)، ئەی پێغەمبەرﷺ ئەوەی کە بەوەحی و نیگا بۆمان ڕەوانەکردیت لەم قورئانە، ئەوە حەق و ڕاستیەو بەڕاست دانەری کتێبە پێشوکانیشە، بەڕاستی خوا ئاگاو بینایە بە بەندەکانی.
- لەئایەتی (٣٠)ی سورەتی ئەحقافدا ﴿ قَالُواْ يَٰقَوۡمَنَآ إِنَّا سَمِعۡنَا كِتَٰبًا أُنزِلَ مِنۢ بَعۡدِ مُوسَىٰ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ يَهۡدِيٓ إِلَى ٱلۡحَقِّ وَإِلَىٰ طَرِيقٖ مُّسۡتَقِيمٖ ٣٠ ﴾ وتیان : ئەی هۆز و گەلی ئێمە ! باوەڕ بکەن، گوێمان لەکتێبێك بوو کەلەدوای موسا نێردراوە، سەلمێنەری پەیام و کتێبەکانی پێش خۆیەتی و ڕێکە لەگەڵیاندا و، ڕێنموویی و هیدایەت دەدات بۆ حەق و ڕاستەشەقامی ڕاست و دروستیش. لە ئایەتی (٦)ی سورەتی(الصف)یشدا ئەفەرموێ:

﴿ وَإِذۡ قَالَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُم مُّصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيَّ مِنَ ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَمُبَشِّرَۢا بِرَسُولٖ يَأۡتِي مِنۢ بَعۡدِي ٱسۡمُهُۥٓ أَحۡمَدُۖ فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ قَالُواْ هَٰذَا سِحۡرٞ مُّبِينٞ ٦ ﴾، بیریان بخەرەوە، کاتێك عیسای کوڕی مەریەم بەنەوەی ئیسرائیلی وت: منیش بەڕاستی پێغەمبەری خوام بۆ سەر ئێوە، ڕاستی تەوراتیش دەسەلمێنم کەلە پێش مندا هاتووە، هەروەها مژدەدەریشم بە پێغەمبەرێك کە دوای من دێت و ناوی- ئەحمەد-ە، کەچی کاتێك بە بەڵگە و نیشانەی تێر و تەواوو موعجیزەی ئاشکراوە پێی ڕاگەیاندن، وتیان: ئەمە جادوویەکی ئاشکرایە.

- له سورەتی (البقرة)شدا ئەفەرموێ: ﴿ ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَـٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦۚ وَقَالُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۖ غُفۡرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٢٨٥﴾ ﴾ (البقرة).

پێغەمبەرو ئیمانداران باوەڕیان هەیە بەوەی لە لایەن پەروەردگاریانەوە هاتۆتە خوارەوە، هەموویان باوەڕیان هەیە بە خواو فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی (دەڵێن) هیچ جۆرە جیاوازیەك ناکەین لە نێوان هیچ پێغەمبەرێ لە پێغەمبەرەکانی خوادا (لە باوەڕدا)، هەروەها وتیان: گوێڕایەڵ و ملکەچین (بۆ بەدیهێنەرمان) پەروەردگارا لێخۆش بوونی تۆمان دەوێت و سەرئەنجام هەر بۆ لای تۆیە گەڕانەوە.

- لە ڕاستیە ڕونەکانە تاکوتەنهایی تەنها بۆ خوایە، بوونی چەندێتی و جۆرێتی و جیاوازی یاسایەکی خوایە لەسەر زەویدا و هەموو شتەکان ئەگرێتەوە جگە لەخوا وەك لەئایەتی (٢٢)ی سورەتی (الروم)دا ئەفەرموێ: ﴿ وَمِنۡ ءَايَـٰتِهِۦ خَلۡقُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱخۡتِلَـٰفُ أَلۡسِنَتِكُمۡ وَأَلۡوَٰنِكُمۡۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَـٰتٖ لِّلۡعَـٰلِمِينَ ﴿٢٢﴾ ﴾ (یەکێکی تر) لە نیشانەو بەڵگەکانی، دروستکردنی ئاسمانەکان و زەویە (کە زاناکانی ئەستێرەناسی لە ئاستیدا سەرسام و سەرگەردانن) و جیاوازی زمان و ڕەنگتانە (دەنگی هیچ کەس لە کەسی تر ناکات، سەرەڕای سەدەها جۆر زمان، کە جۆری قسەکردن و داڕشتنی هەر گەلێك تایبەتمەندی خۆی هەیە، جگە لە هەزاران شێواز کە لەو زمانە سەرەکیانە دەبێتەوە)، بەڕاستی ئا لەو دیاردەیەشدا بەڵگەو نیشانەی زۆر هەیە بۆ زانایان و شارەزایان.

- قورئان ئەوەی ڕونکردۆتەوە کە بوونی جیاوازییەکان هاندەرە بۆ کێبەرکێ و پێشبڕکێ لە خێردا وەك لە ئایەتی(٤٨)ی سورەتی (المائدة)دا ئەفەرموێ:

﴿ لِكُلّٖ جَعَلۡنَا مِنكُمۡ شِرۡعَةٗ وَمِنۡهَاجٗاۚ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَلَٰكِن لِّيَبۡلُوَكُمۡ فِي مَآ ءَاتَىٰكُمۡۖ فَٱسۡتَبِقُواْ ٱلۡخَيۡرَٰتِۚ إِلَى ٱللَّهِ مَرۡجِعُكُمۡ جَمِيعٗا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ فِيهِ تَخۡتَلِفُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾

بـۆ هەرلایـەکتان (موسـڵمانان و خاوەنـانی کتێـب) بەرنامـە و پرۆگرامـی تایبـەتمان بڕیارداوە خۆ ئەگەر خوا بیویستایە هەر هەمووتانی دەکردە یەك ئوممەت و گەلێکی یـەك پارچە، بەڵام (ویستی وایە بەو جیاوازیە) تاقیتان بکاتـەوە لـەوەی پێـی بەخشیوون (تـا بەهۆی عەقڵ و ژیریتانەوە شوێنی پێغەمبەری ئیسلام بکەون)، دەی کەواتە زۆر بەپەلەبن و پێشبڕکێ بکەن بۆ هەموو خێرو چاکەیەك، دڵنیاش بـن کـە هـەمووتان دەگەڕێنـەوە بـۆ لای خوا، ئەو کاتە هەواڵی تەواوتان دەداتێ دەربارەی ئەو شتانەی کە کێشەتان لەسەری هەبوو.

- قورئان دوپاتی کردۆتەوە کە ئەو جیاوازیانـە بـۆ یەکترناسـینە یـەکتر ناسـینیش هاوکاری و تەواوکاری و پێکەوەژیانییە، نەك ململانـێ و پێکـدادان، وەك لەئایـەتی(١٣)ی سورەتی (الحجـرات)دا ئەفـەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ﴿١٣﴾ ﴾

- ئـەی خەڵکینـە بێگومـان ئێمـە هـەمووتانمان لـەنێرو مێیـەك دروسـتکردووە (کەباوکەئادەم و دایکە حەوایە) و کردوومانن بەچەندەها گەل و تیرە و هۆزی جۆربەجۆر، تا یەکتر بناسن و پەیوەندیتان خۆش بێت بەیەکەوە ... بەڕاستی بـەڕێزترینتان لای خـوا ئەو کەسانەتان کەزۆرتر لەخواترسەو فەرمانبەرداری خوایـە، بێگومـان خـوا زانـاو ئاگایـە بەهەمووان .

- لە ڕاستیە ڕونەکانی قورئانە کە گرتنی پلە بالآکان بە خۆزگە و دەمارگیری نییە، بەڵکو ئەوەی مـرۆڤ ئەخاتـە پێشـەوە کردەوەچـاکەکانە وەك لەئایـەتی(١٢٣)ی سـورەتی (النسـاء)دا هـاتووە: ﴿ لَّيۡسَ بِأَمَانِيِّكُمۡ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِۗ مَن يَعۡمَلۡ سُوٓءٗا يُجۡزَ بِهِۦ وَلَا يَجِدۡ لَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرٗا ﴿١٢٣﴾ ﴾ (پاداشت و ڕێزو نرخ) نە بـە ئـارەزووی ئێوەیـە، نە بە ئارەزووی خاوەنانی کتێبە، ئەوەی خراپـەو گوناهێـك بکـات، ئـەوە بەهۆیـەوە سـزا

دەدرێت و هیچ کەس و هیچ هێزێکی تری دەست ناکەوێت جگە لە خوا پشتگیریی بکات و یارمەتی بدات.

- لــە ئایەتەکــەدا دەرەنجــامی بــەهۆکارەوە بەســتۆتەوە دەریخســتوە کــە بەدەستهێنانی هیواکان بە خـەون نابێـت بـەڵکو بەکردەوەیـەو بێکارو کـارا وەك یـەکنین تەمەڵ و کۆششکاریش یەکسان نین.

کەواتە مرۆڤ شوێن و پلـەی خـۆی بـەکردەوەکانی دیاریئـەکات و پێشـەنگی تـەنها بـۆ ئەوانەیە ڕێگەی پێشەنگبوون هەڵئەبژێرن، بەڵام ئەوانەی تـەنها خۆزگـە و هیـوا ئـەخوازن ئەوانە قورئان ڕاستیەکەی نیشانداون و ئەم ئایەتەش لەسیاقی شاباشیکردنی هـەرخاوەن ئاینیکدا هاتوە کەشانازی بە ئاینەکەیانەوە ئەکەن و خوای گەورەش پێـوەری باشـتربون ئەداتە دەستیان کە کە پێوەر تەنها کردەوەیە.

- قورئـان داوا ئـەکات پەیوەنـدی سـۆز و چاکەمان هـەبێت لەگـەڵ شـوێنکەوتەی ئایینـەکانیتر، ئەوانـەی بـە ئاشـتی لەگـەڵ ئێمـە ئـەژین وەك لـە ئایـەتی(٨)ی سـورەتی (الممتحنة)دا ئەفەرموێ:﴿ لَا يَنْهَىٰكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓاْ إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾ ﴾ ، دڵنیاش بن کە خوا قەدەغەی ئەوەتان لێ ناکات کە چاك ڕەفتـاری و دادپـەروەری بکـەن لەگـەڵ ئـەو کەسـانەدا جـەنگیان دژ نـەکردون و دژایەتی ئاینیـان نـەکردون و لـە شـوێنەوارتان دەریـان نـەکردون، چـونکە بەڕاسـتی خـوا دادپەروەرانی خۆش دەوێت.

- بەرنامـەی قورئـان بـۆ ژیـانی ئاشـتیانە وخۆشەویسـتی لـەم ئایەتـەی سـورەتی (فصلت)دا هاتووە:﴿ وَلَا تَسْتَوِى الْحَسَنَةُ وَلَا السَّيِّئَةُ ادْفَعْ بِالَّتِى هِىَ أَحْسَنُ فَإِذَا الَّذِى بَيْنَكَ وَبَيْنَهُۥ عَدَٰوَةٌ كَأَنَّهُۥ وَلِىٌّ حَمِيمٌ ﴿٣٤﴾ ﴾، بێگومان چاکە و خراپە وەك یەك نـین، (تـۆ ئـەی بـاوەڕدار) بەجوانترین و چاکترین شێوە بەرەنگاری خراپە و نادروستی بکە، ئەو کاتە ئیتر دەبینیـت

ئەوەی کە لە نێوان تۆ و ئەودا دوژمنایەتی و ساردیەك هەیە" دەبێتە دۆستێکی دڵسۆز و گیانی بەگیانی.

- کوشتار لە ئیسلامدا بۆکاتی ناچارییە ولەبنەماکان نییە، کاتێك دەستدرێژی ئەکرێتەسەر ناموس و خاك و سامانمان ئەوکات مۆڵەتمان دراوە بۆ لابردنی ستەم وەك لە سورەتی (الحج)دا هاتووە:﴿ أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللَّهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ (٣٩)﴾، کوشتار بۆ لادانی ستەم و دوژمنایەتییە و هەرکاتیش دەستدرێژکار داوای ئاشتیکرد ئەبێت ڕازی بین وەك چۆن قورئان فەرمانمان پێدەکات، لە سورەتی (الانفال)دا هاتووە:﴿ ۞ وَإِن جَنَحُوا۟ لِلسَّلْمِ فَٱجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٦١﴾ ﴾.

- قورئان فەرمانی کردووە هەمیشە شوێن باشترین و چاکترین بکەوین لە زومەردا ئەفەرموێ:﴿ ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمْ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٨﴾ ﴾.

- لەئیسلامیشدا پێغەمبەری خوا سێ سوننەتی هەیە کە وێنای ئیسلام بۆ خاوەن ئایینەکانیتر بەرجەستە ئەکات، تەنها بە دانپیانان بۆیان وازناهێنێ و بەڵکو وەك بەشێك لە ئوممەت و دەوڵەت ئەیانناسێنێ و هەموو ماف و ئەرکێکیان بۆ دائەنێت:

یەکەم سوننەت: پەیوەندی لەگەڵ جولەکە لەو پەیماننامەیەدا دیاریکراوە کە پێغەمبەرﷺ دوای کۆچەکەی لە مەدینە نوسی کە باسی یەکسانی و دادپەروەری ئەکات لە نیوان هەموو خەڵکیدا و لەچوارچێوەی ئەو دەڵەتە تازە دامەزراوەدا، لەوێدا هاتووە: جولەکە ئاینی خۆیان هەیە و موسڵمانانیش ئاینی خۆیان هەیە.

دووەم سوننەت: پەیوەندی لەگەڵ گاورەکان ئەمیش لە پەیماننامەکەی کە لەگەڵ گاورەکانی نەجران داینا لەوێدا پێغەمبەری خوا نوسی: نەجران و داروودەستەکەی و هەموو ئەوانەی کە مەسیحین لەهەموو شوێنێکی سەرزەوی: لەپەنای خوا و لەزیمەی

مەحەمەدی پێغەمبەری خوادان، سامان و نەفس و دین و ئامادەو نەهاتویان عەشیرەت و بازاڕەکانیان و هەمو ئەوەی لەژێر دەستیانە کەم تازۆر هەموی ئەپارێزم و بەرگرییان لێئەکەم، پارێزگاری کەنیسە و شوێنی پەرستشەکانیان ئەکەم، شوێنی پیاوانی ئاینیان و شوێنی گەشتیاریان، ئاین و کۆڕیان ئەپارێزم لەهەرکوێ هەبن هەربەوشێوەی خۆم و موسڵمانان ئەپارێزم، چونکە من پەیمان ئەدەم ئەوەی بۆ موسڵمانانە بۆ ئەوانیش هەیە و ئەوەی لەسەر موسڵمانانە لەسەر ئەوانیشە تا لەگەڵ موسڵماناندا ئەبنە شەریکەبەش لە ئەرك و مافدا.

بەڕونی لە پەیماننامەکەدا دیارە کە ئیسلام ڕێزی بەرانبەر ئەگرێت و قبوڵی ئەکات و تێکەڵی ئەبێت و ڕێز لە تایبەتییەکانی ئەگرێت، بۆکەسێك بیەوێ ئەمانە بەڕونتر ببینێ با سەیری ئەو دوو بەڵگەنامەیە بکات لە کتێبی: {مجموعة الوثائق السياسة للعهد النبوی و الخلافة الراشدة}ی موحەمەد حمیده الله هاتووە.

سێیەم سوننەت: نمونەیەکە لە پەیوەندی ئیسلام بە ئایینە دانراوەکانی خەڵکی سەرزەوییەوە، لەسەردەمی عومەری کوڕی خەتابدا کاتێك لە مزگەوتەکەی پێغەمبەردا عومەر پرسیاری لە خاوەن ڕاکانی خۆیکرد دەربارەی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەم ئایندارانەدا؟! عەبدولرەحمانی کوڕی عەوف ووتی: شایەتم لەسەر ئەوەی پێغەمبەری خوا فەرمویەتی: هەر وەك خاوەن کتێبەکان مامەڵەیان لەگەڵ بکەن . سەیری کتێبی {فتوح البلدان}ی بلازەری ٣٢٨٧ بکەن. لە شارستانی ئیسلامیدا بەهەمان شێوەی خاوەن کتێبەکان لەگەڵ ئایینە دروستکراوەکانیشدا مامەڵەکراوە.

ئەو هەڵوێستانە نایەنە ئەژمار کە دوپاتی ئەکەنەوە پەیوەندی ئیسلام لەگەڵ جگە لەخۆی لەسەر بنەمای دادپەروەری و لێبوردەیی و ڕێز و پاراستنی مافەکانبووە و ئەوەی سەلماندوە کە جیاوازی ئاین و بیروڕا نابێت هۆکار بێت بۆ ستەم و دابڕان و دوبەرەکی، هەرکات دژایەتیش کراین ئەبێت لەداد لانەدەین وەك لە ئایەتی(٨)ی سورەتی

(المائــــدة)دا ئەفـــــەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ شُهَدَآءَ بِٱلْقِسْطِۖ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعْدِلُواْۚ ٱعْدِلُواْ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿٨﴾ ﴾، ئــەی ئەوانــەی باوەڕتــان هێنــاوە، زۆر بەچــاکی هەســتن بەئەنجامدانی شایەتی دادپەروەرانە لەبەر خوا، ڕق و دوژمنایەتی هیچ کەس و هیچ لایـەك هـەڵتان نـەنێت کەلـە دادپـەروەریی لابـدەن، دادپـەروەربن، ئـەوە نـزیکترە لـە تـەقواو خواناسیەوە، دەی کەواتە لەخوا ترس و پارێزکاربن، چونکە بەڕاستی خـوا ئاگادارە بـەو کارو کردەوەیەی کە دەیکەن.

سەردەمانێکی زۆر موسڵمان و جگە لە موسڵمان لەدادگای ئیسـلامیدا کاروبارەکانیـان یەکلایی کردۆتەوە و دادپەروەری خۆی ئەسەپاند بێئـەوەی هـیچ جیاکارییـەك بکرێـت لـە نێـوان لایەنـەکانی کێشـەکاندا، شـایەت بۆئـەم بابەتـە چـەنەها ڕوداوی کردارییـە لــە شارستانییەتی ئیسلامیدا ڕویانداوە: لەوانە کاتێك عەمری کوڕی عاس کاتێك لە میسر والی بوو لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتابدا، یەکێك لە کوڕەکانی عەمر لەگـەڵ هاوڵاتییـەکی میسری کەوتنە کێشـەوە، بـەهێزی پلەوپایەکـەی بـاوکی لـەکابرای میسـریدا، ئەوکاتـەش هێشتا میسر تازە ئیسلامی قبوڵکردبوو، وا چاوەڕوان ئەکرێت کە لێدراوەکە بێدەنگ بێـت لەبەردەم کوڕی پیاوێکدا کە بەسوپاکەی گەورەترین هێزی ڕۆمەکانی شـکاندووە و فرێـی داوەتە ناو دەریای سپی ناوەڕاست! بەڵام میسریەکە بە ئیسلام و حوکمەکەی دڵخۆشە و سوێند ئەخوات کە سکالای خۆی لای گەورەی موسڵمانان بکات، بـەڵام کەورەکـەی عـەمر ئەمە بەگێلێتی ئەزانێ و ئەڵێ سکالآی تۆ هیچ لەمن ناکات من کوڕی خانەدانەکانم.

لە وەرزی حەجدا عومەری کوڕی خەتاب لەگەڵ دۆستانی نزیکیدا دانیشتبون و عـەمرو کوڕەکەیشی هاتبون بۆ حەج و لەو دانیشتنەدا هەبوون، میسـریە سـتەم لێکراوەکـە هاتـە لایان و ووتی: ئەی گەورەی ئیمانداران ئەم کوڕەی عەمر بەناهـەق لەمنیـداوە، کـاتێکیش ووتم سکالا ئەکەم ووتی: جا سکالا بکە من کوڕی خانەدانەکانم و سـکالای تـۆ هـیچ لـەمن ناکات.

عومەری کوڕی خەتاب بەچاوێکی لۆمەکارانەوە سەیری عەمری کردوو ئەم وتە زۆر گرنگەی فەرموو: لەکەیەوە خەڵکتان کردۆتە کۆیلە کە ئەوان بە ئازادی لەدایك بوون؟؟!. پاشان ڕویکردە سکاڵاکارەکە و قامچییەکەی خۆیی پێداو ووتی: ئادەی لەو شازادەیە بدە هەربەوشێوەی کەلەتۆی داوە!. ئیمامی عومەر بەم حوکمەی مافی ئیسلامیداوە.

- لەو هەڵوێستە کردارییانەی کە ئەیسەلمێنن ئاینی ئیسلام دامەزراوە لەسەر خۆش مامەڵەیی بەرانبەر و پاراستنی ڕێزی مرۆڤایەتی:

ـ بوخاری ڕیوایەتیکردووە کە تەرمێکیان بەلای پێغەمبەردا ڕەتکرد پێغەمبەری خوا درودی خوای لەسەر بێت هەستایەوە، یارانی ووتیان ئەوە تەرمی جولەکەیەکە! فەرمووی: ئەی ئەویش مرۆڤ نییە[11]؟!.

سوفیان لە حەممادی کوڕی ئەبی سولەیمان ئەویش لە شەعبیەوە ئەگێڕێتەوە کە ئافرەتێکی نەسرانی بەناوی دایکی حارسی کوڕی ئەبی ڕەبیعە مرد یارانی پێغەمبەر شوین جەنازەکەی کەوتن و جەنازەکەیان بەڕێکرد[12].

لەڕاستیدا ئیسلام هەموو دەرگایەکی لەبەردەم ئەوانەدا داخستوە کە بیانەوێت سوکایەتی بەماف وڕێزی خەڵکی بکەن، با بەووردی لەو ئایەتانە ڕابمێنین کە خوا مرۆڤی پێ ئەدوێنێ وچۆن سۆزو بەزەیی لێ ئەبارێ: لە سورەتی (الانفطار)دا ئەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ ٱلۡكَرِيمِ ﴿٦﴾ ٱلَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّىٰكَ فَعَدَلَكَ ﴿٧﴾ فِيٓ أَيِّ صُورَةٖ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ ﴿٨﴾ ﴾

- ئەی ئینسان!! تۆ چی وای لێکردویت کە سەرکەش بیت بەرامبەر پەروەردگاری میهرەبان و بەڕێزت؟ چی وای لێکردویت کە وەکو پێویست قەدری نەزانیت؟ (نافەرمان و یاخی بیت؟).

---

١١ – صحيح البخاري {بشرح فتح الباري/ كتاب الجنائز، باب من قام لجنازة يهودي{٣/ ٢١٤}رقم ١٣١٢

١٢ – اخرجه عبالرزاق في مصنفه، كتاب: اهل الكتاب، باب: اتباع المسلم جنازة الكافر.

(بەمـــەرجێك) ئـــەو پـــەروەردگارە تـــۆی دروســـت كـــردووە، بـــە ڕێكـــوپێكترین شـــێوە، بەجوانترین شێواز (ئەندامەكان هەموو لەشوێنی تایبەتی خۆیاندا دانراون كە بتـوانن كـارو فرنانی خۆیان بەچاكی ئەنجام بـدەن و ئـەو ئەندامانـەش كـە جـووتن قـەبارە و درێـژی و شێوەیان چوونیەكە، جگە لـەوەی كـە یارمـەتی و تەبابیـەكی تـەواو هەیـە لەنێوانیانـدا و هـەمووان هاوكـارن).لەهـەر شـێوە و شـێوازێكدا كـە ویسـتوویەتی تـۆی ڕێكخسـتووە و ئەندامـەكانتی بەیەكـەوە لكانـدووە.}لـە ئایـەتی(٦)ی سـورەتی (الانشـقاق)دا: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْإِنسَـٰنُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدْحًا فَمُلَـٰقِيهِ ﴿٦﴾ ﴾، ئـەی ئینسـان بەڕاسـتی تـۆ خـۆت زۆر مانـدوو دەكـەیت، زۆر ڕەنـج و زەحمـەت دەكێشـیت، سـەرئەنجامیش دەبـێ بگەڕێیتـەوە بـۆ لای پەروەردگارت (تا پاداشتی ڕەنج و هەوڵەكـەت وەربگریـت).} لـە ئایـەتی(١)ی سـورەتی (النســـاء)یشـــدا: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾ ﴾

ئەی خەڵكینە لە خەشم و ناڕەزایی ئەو پەروەردگارەتان خـۆ بپـارێزن كـە ئێـوەی لـە تاكە نەفسێك دروست كردووە، هەر لەو نەفسەش هاوسەرەكەی بەدی هێنـاو لـەو دووانـە پیاوان و ژنانی زۆری خستۆتەوە و بڵاوكردەوە، هەروەها لەو خوایە بترسن كـە لـە یـەكتر داوا دەكەن بەناوهێنانی ئەوەوە، هەوڵ بدەن پەیوەندی خزمایەتیش بپـارێزن و (پتـەوی بكـــەن)چـــونكە بەڕاســـتی خـــوا (هەمیشـــە و بـــەردەوام) چـــاودێرە بەســـەرتانەوە. لەئایەتی(٥٧)ی سورەتی (یونس)یشدا: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَتْكُم مَّوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَشِفَآءٌ لِّمَا فِى ٱلصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٥٧﴾ ﴾، ئـــەی خەڵكینـــە، بەڕاســـتی ئێـــوە ئامۆژگاریـــەكی گـــەورە و گرنگتـــان لـــە لایـــەن پەروەردگارتانـــەوە بـــۆ هـــاتووە كـــە (قورئانـــە) شـــیفا و چارەسەریشـــە بـــۆ نەخۆشـــی دڵ و دەروونـــەكان و ڕێ نیشـــاندەرو ڕەحمەتیشـــە بـــۆ ئیمانداران.

مایەی شانازیە بۆ مرۆڤ کەخوا لەپەڕاوە پیرۆزەکەیدا سورەتێکی ناردوە بەناوی (الانسان) کەدەستپێدەکات بە ئایەتی: ﴿ هَلْ أَتَىٰ عَلَى الْإِنسَانِ حِينٌ مِّنَ الدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْئًا مَّذْكُورًا ﴿١﴾ إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعًا بَصِيرًا ﴿٢﴾ ﴾

بەڕاستی ماوەیەکی زۆر لە ڕۆژگار بەسەر ئادەمیزادا هات کە شتێکی وانەبوو ناو ببرێت.

بێگومان ئێمە ئینسانمان دروستکرد لە تێکەڵەیەك (لە سەرەمێکوتەیەکی بچووك و هێلکۆکەیەك) لە کاتێکدا دەمانەوێت تاقی بکەینەوە، هەر بۆیە دەزگای بیستن و بینینمان پێبەخشی.ئەوەی لەسەرمانە هەموو هۆشمان بدەینە ئەو بانگە پڕلە ڕێزانەی خوا بۆ ئەوەی بێتە مایەی ڕوناکی و ڕێنمایی و شیفا و چاکبونمان.

**مەوسوعەی(بیان الاسلام) بۆچی؟!**

ئاینی ئیسلام{ قورئان، پێغەمبەر، سوننەتی پێغەمبەر} توشی شاڵاوێکی فراوان لە تیربارانی تانەو گومان ئەبنەوە، تیرهاوێژەکانیش جۆراوجۆر و هەمە لایەنەن، هەندێ کەناڵی ئاسمانیش تایبەتمەندیان لە بڵاوکردنەوەی ئەم گومانانەدا هێناوە، هەروەك چۆن چەندەها پێگەی ئەلەکترۆنیش لە سەرتۆرە زانیارییەکان هەمان کار ئەکەن، بڵاوکراوە لە پەڕاوو پۆستەرەکانیش کەمیان نەکردوە لەوبارەیەوە... لەئەنجامی ئەمانەوەیە چەنەها پرسیار لای گەنجان دروستبوە دەربارەی ئەو گومانانە وئەڵێن : بۆ؟ ئاخۆ ئەوانە ڕاستن؟

ئەی ڕاستییەکان کامانەن لەناو ئەم تەمومژەی کە ئەیانەوێ ڕووناکی خوای پێ خامۆش بکەن؟

- لە گفتوگۆیەکی سەر کەناڵێکی ئاسمانی کە دوو زانایان بۆ بانگهێشتکردبوو گومانیان دەربارەی کۆیلەو کەنیزەك وورووژاند، لەبەر ئەوەی زاناکان بەتەواوی خۆیانیان بۆ بابەتەکە ئامادە نەکردبوو، کۆتاییەکەی بەتوڕەبوونی زاناکان تەواوبوو، یەکێکیان بە

پێشکەشکارەکەی ووت: ئەوە ئیسلامە وهەرکەس پێی ڕازی نییە سەری دای لەبەرد، ئەوە ئاینی ئێمەیە و ئێمە ئاوا ئەمانەوێت.

- هەندێ پەڕاویش کەکەسی تایبەتمەند نەینوسیوە پەرچی گومانەکانیان داوەتەوە لەجیاتی ئەوەی گومانەکە هەڵوەشێننەوە زیاتر چەسپاندویانە،بۆنمونە: گومانی ئەوەی کە خوا فەرمانی بە پێغەمبەرکردوە شتی بیرنەچێت و ئایەتی﴿ سَنُقۡرِئُكَ فَلَا تَنسَىٰٓ ٦ ﴾ (الأعلى)، ئەی محمد! ئێمە قورئانت لە ڕێگەی جوبرەئیلەوە بەسەردا دەخوێنینەوە، ئیتر هەرگیز بیرت ناچێت.ئەکەنە بەڵگە بۆ گومانەکەیان! .ئەو برادەرەش لە رەدی گومانەکدا وتویەتی: {لا}کە ناهیەیەو فەرمان بە پێغەمبەر ئەکات بیری نەچی کار بەقورئان بکات! ئەمە هەڵەیە، ئەوەی ڕاستە {لا}کە نافیەیەو نەفی ئەوە ئەکات کە پێغەمبەرﷺ هیچی لەبیرچوبێت بەڵگەی ڕاستی ئەم ووتەیە ئەوەیە ئەگەر لاکە ناهیەبوایە فیعلەکەی دوای ئەو مەجزوم ئەبوو بەمشێوەیەش فیعلی: تنسى ئەبوو {ى}نەمایە.
- وەڵامی هەڵە و بەپەلە زیاتر تەمومژی گومانەکە ئاڵۆز دەکات و کەسی لادراو ناهێنێتەوە بۆ لای ڕاستییەکان و نایگەیەنێتە کەناری ئارامی.

**دکتۆر نەبیل لۆقا بەپیاوی بیرۆکەی ئەم زانیارینامەیەی هێنایەئارا:**

لە شایەتییە ڕاستەکانی ئەم زانیارینامە ئەوەیە کارێکی زانستییەو برایەکی مەسیحی خۆشەویست و لێکۆڵەری زانستی ووردەکار داوایکردوە کەناوی دکتۆر نەبیل لۆقایە لە کتێبێکیدا بەناوی: {عبقرية محمدﷺ بلا تعصب او مجاملة}لەو پەڕاوەیدا وتویەتی: بەپیشەکردنی دوژمنایەتی ئیسلام و هەڵکەوتوەکانی کارێکی تازە نییە، بەڵکو لەگەڵ دەرکەوتنی ئیسلامەوە تا ئیستە بەردەوامە، جیاوازی نییە لەسێ ساڵی بانگەوازی داخراوی مەکە و دوای هاتنە خوارەوەی وەحی بۆ سەر پێغەمبەر لەساڵی ٦١٠ی زاینی

بۆ ٦١٣ی زاینی یان دوای ئاشکراکردنی بانگەوازەکە هەر لەوکاتەوە ئیسلام ڕووبەڕووی ناشرینترین جۆری خراپەکاری بوهتان بوەتەوە، هەربەمشێوەیە توش ئەبێت تا ئەوکاتەی هەمووی بۆلای خوا ئەگەڕێتەوە، پێغەمبەری خوا هەرلەسەرەتای ژیانی پێغەمبەرایەتی مەککەو مەدینەوە خراپەی بەرانبەرکراوە، لەسورەتی (ص)دا هاتووە:﴿ وَعَجِبُوٓاْ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٞ مِّنۡهُمۡۖ وَقَالَ ٱلۡكَٰفِرُونَ هَٰذَا سَٰحِرٞ كَذَّابٌ ﴿٤﴾ ﴾، بێ باوەڕەکان سەرانسورما لەوەی کە بیدارکەرەوەیەك لە خۆیان هاتووە بۆیان و وتیان: ئائەمە جادوگەرێکی زۆر درۆزنە. ئێمە ئەزانین کە دژایەتیکردنی پێغەمبەر تەنها کاری ئەمڕۆ نییە بەڵکو لەسەرەتای سەرهەڵدانی ئیسلامەوە تا ئیستەو لەئایندەشدا هەربەردەوام ئەبێت بۆیە نابێت موسڵمانان خۆیان بدەنە دەستی سۆز و هەڵچونەکان و خۆپیشاندان و سوتاندنی باڵوێزخانەکان چونکە" بنەماکانی ئیسلام دژی ئەم جۆرە کارانە ئەوەستنەوە، ئیسلام فەرمان ئەکات لەکاتی تواناادا چاوپۆشی و لیبوردن هەبێت، بەشێوەیەك هەڵوێست نەنوێنن کە بێئەوەی بیانەوێت زیان بە خودی پەیامەکەیان بگەیەنن.

لەسەر موسڵمانانە ڕق بە ڕق وەڵام نەدەنەوە چونکە بە ئامانج گرتنی ئیسلام و هەڵکەوتوەکانی ناو ئیسلام بوەتە ستراتیژییەکی نەگۆڕ لەلای ڕۆژئاوا لەسەر ئەساسی پارچە پارچەکردنی جیهانی ئیسلام و گومان خستنەسەر بیروباوەڕ و پێغەمبەرەکەیان.

نابێت موسڵمانان بیانو بدەنە دەست دوژمنەکانیان و ببنە یارمەتیدەر بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی ئەوان، چونکە چەند لایەنێك هەیە بەتایبەت - اللوبی الصهیونی - لە ئامانجەکانێتی دوژمنایەتی لەنێوان جیهانی ئیسلامی و وولاتەکانی ڕۆژئاوا و ئەمەریکا دروست بکات، بۆیە نابێت وەڵامی ئەو دژایەتییەی ڕۆژئاوا بە کوشتار و ئاگربەردان و کوشتنی دبلۆماسییەکان بدرێتەوە چونکە ئەوە بۆخۆی تەڵەیەکی دانراوە بۆ پێوەکردنی ئیسلامییەکان و نابێت بەپێی خۆیان بەرەو تەڵەکە بچن بەڵکو ئەبێت گەردنگیری

بنەماكانی ئیسلامبن و نابێت لەو بنەما شارستانیانەی خۆیان لابدەن وەك لە سورەتی نەحلدا ئەفەرموێت:﴿...وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ...﴾ (النحل) ، (بۆ هەندێكی تر)و گفتو گۆو موجادەلە بەجوانترین شێوە (لەگەڵ هەندێكی تردا بە تایبەتی خاوەن كتێبەكان) نابێت ئەوپەڕاوانەی لەدژایەتی ئەماندا ئەنوسرێت دەستی بەسەرابگیرێ چونكە موسڵمان توانای ڕەددانەوەی هەموو ئەوانەیان هەیە لە ڕێگەی مێژوی ئیسلامی و قسەی زانایان و لەسەروی ئەوانەشەوە لە ڕێگەی قورئان و سوننەتەوە.

هەموو ئەمانە واملێدەكات بۆ چەندەمین جار پێشنیاربكەمەوە كە كاربكرێت بۆ دامەزراندنی چەند سەنتەر و پەیمانگایەك لە ئەمریكا و لە ئەوروپا و پاشانیش لە دەوڵەتەكانیتر وەك سەنتەرە ئیستشراقیەكان و ئامانج لەم پەیمانگاو سەنتەرانە ڕەددانەوەی هەموو ئەو درۆ و بۆهتانانە بێت كە بۆ ئیسلام و ڕەمزەكانی دروست ئەكرێت، لە ڕێگەی ئینتەرنێت و قەڵەمی ڕۆژنامەنوسان و پەڕاوو خول و توێژینەوەی زانستی و كوڕو كۆبونەوەكانەوە خەریكی ئەوكارەبن باسەرەتا بەدوو سەنتەر یەكێك لە ئەمریكاو ئەویتریش لە ئەوروپا دەست پێبكەین و بەپارەی زەكاتی موسڵمانان پشتگیری لەمەبكرێت، من لە ئەوروبا بەچاوی خۆم بینیومە دەوڵەمەندەكانی عەرەب و موسڵمانان لەژیان لە هۆڵی قومار و مەیخواردنەوە بەسەر ئەبەن! كامیان بۆ موسڵمانان باشترە: بەرگریكردن لە ئیسلام و پێغەمبەرەكەی یان بەفیڕۆدانی سامان لە شتانێكی بێسوددا؟ ئایا لای موسڵمان هیچ شتێكیتر هەیە لە ئیسلام پێغەمبەرەكەی بەنرختر بێت تا بەرگری لێبكەن؟! من لەگەڵ ئەوەی مەسیحیەكی ئەرسۆدەكسیم و تا ژیانم مابێت لەسەر دینەكەی خۆمم بەڵام ئامادەم بەبڕی دەهەزار دۆلار بەشداربم بۆ دروستكردنی یەكێك لەوسەنتەرانە چونكە باوەڕم هەیە كە ئاینێكی ئاسمانی وەك مەسیحیەت باوەڕی بەخۆشەویستی هەیە و ئێمە لەمیسردا لەگەڵ موسڵمانان زیاتر لە خۆشەویستی و هاوڕێیەتی و برایەتی ئەمانبەستێتەوە پێكەوە، ئەوەی براموسڵمانەكەم ئازار ئەدات من

ئازار ئەدات و بەپێچەوانەشەوە، هەر لەبەر ئەمەشبوو بابا شنۆدەی سێیەم دوای کۆنگرە ڕۆژنامەوانییەکەی لەساڵی ٢٠٠٦دا بابای فاتیکان ـ بندکتی شەشەمی تاوانبار کرد کاتێك خراپەیکرد بەرابیەر پێغەمبەر، چونکە ئەوەی بۆ برا مەسیحییەکان خراپە بۆ برا ئیسلامییەکانیش خراپە و ئەوەش بۆ برا ئیسلامییەکان خراپە بۆ برا مەسیحیەکانیش خراپە}.

**چەند هەوڵێکی جێی شایستە پێش ئەم زانیارینامە:**

- سود وەرگیراوە لە کۆششی زانایانی کۆن و تازە بۆ وەڵامدانەوەی گومانەکان.
- هەروەها سود وەرگیراوە لەکۆششی زانایان لەتەفسیرەکانی قورئان یان هەر پەڕاوێك کە تایبەت بۆ ڕەددانەوە نوسرابێت وەك: الرد علی ابن الراوندی الملحد.ـ مشكل القران لابن قتيبة الدينوري.ـ التمهيد، اعجاز القران ـ لابی بكر الباقلانی.ـ تنزيه القران عن المطاعن، للقاضی عبدالجبار.ـ الرد الجميل للامام ابی حامد الغزالی.
- لەم سەردەمە تازەشدا کۆمەڵێك کوششی بەسود و باشی تاکەکەسی یان کاری بەکۆمەڵ هەبوە لەوانە: پەڕاوی: {حقائق الاسلام واباطيل خصومه}، عەباس العقاد و پەڕاوی {شبهات حول الاسلام، محمد قطب} و نوسینەکانی شێخ محمد غەزالی و دکتۆر عبدولعەزیمی مەتعەنی و مامۆستا محمد عەمارە و دکتۆر یوسف قەرزاوی و زۆریتریش و هەندی کاری بەکۆمەڵیش وەك ئەو موجەلەدەی کە مەجلیسی ئەعلی بۆ کاروباری ئیسلامی دەریانکرد لە ژێر ناونیشانی{حقائق الاسلام فی مواجهه شبهات المشككين}
- لەفراوانبونی مەیدانی هێرشەکە لەسەر نێت و پەڕاوو کەناڵە ئاسمانییەکان وا پێویستیکرد کارێکی زانستیانەی تێروتەسەل ئەنجامبدرێت کەهەموو لایەنەکانی گومانەکان بگرێتەوە و کۆمەڵێك لەزانای تایبەتمەند لەبوارە جۆربەجۆرەکان پێی هەڵسێت، لێرەوە بیرۆکەی ئەم زانیارینامە سەرچاوەیگرت.

- دوای کۆبونـــەوە لەگـــەڵ زانایـــانی تایبەتمەنـــد و گفتوگـــۆ لەســـەر بەرنامـــەی زانیارینامەکە بەمشێوە پێڕەوەکەی دیاریکرا

**گومان کامەیە؟ ( پێوەری گومان ) :**

- هەر بانگەشەو بوختان و تانە و گومانێك دروستبکرێت لەسەر ڕاستیەکان و بنەما نەگۆڕەکانی ئیسلام.

بـەپێی ئـەم پێـوەرە هـەموو جنێـوو تۆمـەتبارکردن و زماندرێژییـەك بـە گومـان ئەژمارناکرێت، هەروەها هەموو ڕاوبۆچونە جیاوازەکانی ناو فیقهـی ئیسـلامی لەگـەڵ ئـەو ڕەخنانەی کەلە موسڵمانان ئەگیرێت یان ئەو پرسـیارە ئاینییانـەی وەك ڕاپرسـی دیـارن، تەنانـەت ئـەو تەفسـیرو تێنەگەیشـتنە هەڵانـەی کەهەیـە بـۆ هەنـدێ لەچـەمك و پرسـە ئاینییەکان، ئەمانە هەموی لەکاتی پۆلێنکردن و جیاکردنەوەی گومانەکان دەرهێنران.

**بەرنامەی زانیارینامەکە لە وەڵامدانەوەی گومانەکان:**

ئەم زانیارینامە لەسەر بەنامەیەکی زانسـتی پشـت بەسـتو بـە گفتوگـۆی بیرۆکـەکان و سـوورە لەســەر بەڵگــەی یەکلاکــەرە، ئــەکرێت بەرنامــەی شــێوازی وەڵامــی گومانــەکان بەمشێوە دیاریبکەبن:

١) دیاریکردنی بیرۆکەی گومانەکە.

٢) دیاریکردنی بیرۆکە یان بیرۆکەکانی هەڵوەشاندنەوەی گومانەکە.

٣) دەستپێك بەبەرنامەی عەقڵی بۆ وەڵامدانەوە چونکە ئەوانەی کـە گومـان ئەچـنن زۆربەیان باوەڕیان بە قورئان و سوننەت نییە.

٤) دوای بناغـــە عەقڵییەکـــە بـــە وەڵامـــەکانیتری نـــەقڵی ئەبەســـترێتەوە بـــە ناوبەندی{ ئەمە ئەوەیە کـە عاقڵـەکان لەسـەری کـۆکن و لەگـەڵ ڕێنماییـەکانی قورئـان و سوننەتیشدا یەکئەگرێتەوە وەك چۆن.....}

٥) پاشان بە کورتەیەکی پوختکراوەی هەموو باسەکە کۆتایی پێدەهێنین.

**بەرنامەی دەرخستە و گەڕانەوەکان:**

لەتایبەتمەندییەکانی ئەم شاکارە بوونی دەرخەر و ناوەڕۆك و تۆڕێکی گەڕانەوەی بابەتەکانە، ئەمیش لە ڕێگەی سێ دەرخەرەوە:

یەکەم: دارشتەیەکی درەختی بۆ سەردێری گومانەکان

لەم دەرخستەیەدا سەردێری گومانەکان بەشێوازێکی زانستیانە و مەنتیقیانە ڕیزکراوە و هەروەك چۆن لەناوەڕۆکی بەشەکانی زانیارینامەکەدا هاتوە، ئامادەکردنی ئەم جۆرە لە دەرخستە بۆ ئەوەیە خوێنەر کاتی گەڕان مامەڵە لەگەڵ خودی سەردێرەکاندا بکات و بزانێت هەر بەشەی چەند گومانی لەخۆگرتوە، هەروەها ئەو دەرخەرە درەختییەی کە هەموو ناونیشانی گومانەکانی ناو زانیارینامەکەی لەخۆگرتوەکە ڕیزبەندی بۆکراوە وەك ڕیزبەندی ناوەڕۆکی بەشەکان بەشێوەیەك بچێتەوە ژێر تەوەری گشتی گومانەکان پاشان ژمارەی ئەو گومانە لەبەشەکەیدا و بەناو نیشانەکەیەوە و ژمارەی لاپەڕەکەیشی دانراوە.

دووەم: دەرخستەیەکی بابەتیانە بۆ پرسەکان

ئەم دەرخستەیە هەموو ئەو پرسانە ئەگرێتەوە کە لەزانیارینامەکەدا چارەکراوە بەشێوەیەك کەسی گەریدە ئەتوانێت هەموو پرسێك کە پەیوەندیداربیت بە پرسەکانی ناو زانینامەکە بدۆزێتەوە کە کۆکراونەتەوە لەژێر باسێکدا کە ناونراوە بە ووشەی دەروازە یان کرۆکی بابەت یان کلیلی بابەت: { دیارترین ووشەیە کە بابەتەکان ناوەڕۆك و چەمکەکان لەخولگەیدا ئەسوڕێنەوە }، ووشەکانیش بە پێی ڕەگی ووشەکان ڕیزکراون، بۆ نمونە بابەتی یەکخواپەرستی کەسی گەریدە ئەتوانیت لە پیتی واودا بۆی بگەڕێت و بابەتی کۆشش لە پیتی جیمدا و بەمشێوەیەو هەمانکات ژمارەی بەو بەشەی ئەوبابەتەی تێدایە هاتوە و ژمارەی گومانەکە و ژمارەی ڕووی هەڵوەشانەوەی گومانەکەیشی لەگەڵدا هاتووە.

سێیەم: دەرخستەیەکی بابەتیانە بۆ ئایەتەکانی قورئان:

ئـەم دەرخسـتەیە جیـاوازە لـە دەرخسـتەکانیتر تـەنها مەبەسـت لێـی کۆکردنـەوەی ئایەتەکات و ژمارەی ئایەت و سورەتەکان نییە بەڵکو بەدواداچونیشە بـۆ ئـەو ئایەتانـەی کە پەیوەندیدارن بە گومانەکە یان گومانیان دەربـارە دروسـت ئـەکرێت و ئـەوروژێنرێن، بێگومـان ئامـاژە بـە پـرس و گومانەکـە و شـوێنی لـەناو زانیارینامەکـەش ئـەکرێت، بـە خوێندنەوەی ئەم دەرخستەیە لێکۆڵەر ئەتوانێت هەموو گومان و پرسـێك شـارەزابێت کـە پەیوەستن بە ئایەتێك یان چەند ئایەتێك یان پەیوەندیان بەهەر سورەتێکەوە هەبێت.

**شێواز و ئاکاری گەڕانەوەکان:**

لەکۆتاییدا دێینەسەر یەکێکیتر لەتایبەتمەندییکانی ئەم زانیارینامەیـە ئـەویش ئاکـاری ئەو گەڕانەوە تۆکمانەیە کە لە نێوان بابەتەکاندا هەیە کە کەسی لێکۆڵـەر شـارەزا ئـەبێت بە هەموو لایەکانی پرسەکە بەهۆی ڕێکخستنی گەڕانەوەکان" بەخوێندنەوەی زیادەکـان و درێژکراوەکان " مەبەست بەمە ئاسـانکارییە بـۆ خوێنـەر کـە ئـەو پرسـانەی پەیوەنـدیان بەیەکەوە هەبێت پێکەوە گرێبدات.

گەڕانەوەکان دابەشکراون بەسەر چوارجۆردا کە ئەمانەن:

- گەڕانەوە لە گومانێك بۆ گومانێك
- گەڕانەوە لە گومان بۆ ڕووەکانی بوچکردنەوە
- گەڕانەوە لە ڕوو بۆ ڕوو
- گەڕانەوە لە ڕوو بۆ گومان

گەڕانەوەکانیش یەك شێوازی نەگۆڕیان بۆ دیاریکراوە ئەویش:

لە فلانـە پـرس{عینـوانی پرسـەکە}فلانـە ڕوو بخوێنـە{ژمـارەی ڕووەکـە} لـە فلانـە گومان{ژمارەی گومانەکە} لە فلانە بەش{ژمارە و عینوانی بەشەکە}.

**بەرنامەی بەڵگەداری و دەرهێنان لە زانیاریینامەکەدا:**

سێ جۆر بەرنامە بۆ ئەم بەڵگەو دەرهێنانە هەیە:

١/ بەڵگەی ناوئاخنی: ئەمەش بوونی بەڵگەکانە لەناو خودی بابەتەکان و مەبەست بەمانە:

ـ هێنانی ئایەتەکانی قورئانە بە نوسینی تەنها ناوی سورەتەکە کە ئەگەر ژمارەی ئایەتەکە لەگەڵ ئلیەتەکە هاتبوو ئەویش بەپێی چاپی مەدینە لە بڵاوکراوە ئەلکترۆنییەکە.

ـ نوسینی ژمارەی سەفەر و ئینجیل و ژمارەی ئیسحاحەکان و ژمارەی برگەکان ئەنوسرێت ئەگەر لە کتێبی پیرۆز وەرگیرابوو ئەمیش پشت بەستووە بە وەرگێردراوەکەی فاندایك بوستانی کە وەرگیراوە لە بنەماکانی گۆرانییە عیبری و یۆنانییەکان.

ـ بەڵگەدارکردنی دەق و وەرگیراوەکان بەیەکێك لە شێوازە تەقریریەکان وەك: ئەمە پشت ڕاست ئەکرێتەوە بۆ بۆچوونی فلان لە فلانە پەڕاویدا ئیتر ناوی نوسەر و ناوی پەڕاوەکەش ئەنوسرێت{ لە پەراوێزدا ئاماژە بکرێت یان نا بەپێی جۆری گوازراوەکە}.

٢/ بەڵگەدارکردن لە پەراوێزدا و ئەمانەش لە خۆدەگرێت:

بیبیلۆگرافیای سەرچاوەکە، بەمشێوە باس ئەکرێت: ناوی پەڕاو، ناوی نوسەر، چاپەمەنی، شوێنی چاپەمەنی، ژمارە و ساڵی بەچاپ گەیاندن کۆچی و زاینی، ژمارەی لاپەڕە، بوونی نێوان بە سلاشێك.

ئەمە لەیەکەم ناو هاتنی سەرچاوەکە پێڕەوئەکرێت و پاشان تەنها ناوی نوسەر و پەراوو ژمارەی لاپەرە باس ئەکرێت و ئیتر بەپیی جۆری سەرچاوەکە کەمێك جیاوازی تێدا دەبێت{ پەراو ، گۆڤار، نامە، رۆژنامە}.

**تەخریجی فەرمودەکانی پێغەمبەر:**

بەرنامەیەکی وورد و تۆکمە دانراوە بۆ تەخریجی فەرموده و ئەسەر، ئەکرێت بەرنامەکە لەم چەند خاڵەدا کۆکرێتەوە:

- پەڕاو و بەش و ژمارەی فەرموودەکە لە پەڕاوە چاپراوەکاندا ناو دەهێنرێت.
- سەرەتا پشت بە فەرمودەکانی ناو سەحیحی بوخاری و موسلیم دەبەسترێ.
- حوکمی فەرمودەکە دادەنرێت پێش ئەوەی تەرخریجەکەی بهێنرێت بۆ ئەوەی خوێنەر و لێکۆڵەر بەخێرایی دڵنیابن لە حوکمی فەرمودەکە.
- حوکمی فەرمودەکان جگە لە بوخاری و موسلیم وەردەگیرێ لە ئەو پەڕاوانەی شێخ ئەلبانی تەحقیقی کردوون وەك {سلسله صحيحه...}یان ئەرنەئوت لە{صحيح ابن حبان و مسنداحمد بن حنبل}یان هەیسەمی لە{مجمع الزوائد}یان زەهەبی لە{التلخيص على مستدرك الحاكم}یان حسين سليم اسد لە{سنن الدارمیو مسند ابی يعلى} یان شەوکانی لە{نيل الاوطار} یان ئیبن حجر لە{تلخيص الحبير}.
- ئەگەرانەوە بۆ لاوازەکان و ئەگەر لاوازێکیش هەبوو جێگرەوەیەکی سەحیح یان ئەو سەحیحەی هەمان واتای هەبێت.
- پەڕاوەکانیتری تەخریج بە پێی ریزبەندی کاتی مێژوویيان کاريان لەسەرکراوە.
- بوخاریش ئەچێتە ئەو ریزبەندییە ئەگەر فەرمودەکە لە پەڕاوی {الادب المفرد}دا هاتبوو.
- راوی بەهێزتر لەبەرچاو ئەگیرێ.
- ئەگەر فەرمودەکە زیاتر لە ڕاوییەکی هەبوو ئەوا لە پێش فەرمودەکە ناوی ئەو ڕاوییە ئەبەین کە فەرمودەکەمان لێوەرگرتوە و ئەو تەخریجەش ناو دەهێنین کە تایبەتە بە ڕاوی فەرمودەکە.
- دڵنیا بوونەوە لەوەی کە فەرمودەکە تەنها یەکجار لە پەڕاوەکەدا هاتوە.

- هاتنی لەدوو پەڕاودا بەس بێت + حوکم.
- پشت بەستن بە لەفزی هاتو ئەگەر سەحیح بوو بە واتاش لای بەهێزترەکە.
- ئەگەر ڕیوایەتی بوخاری هاتبو لای موسلیمیش بە ڕێژەی ٩٠٪ وەك واتای ئەو فەرمودەی بوخاری بوو ئەنوسین لای موسلیم بەو واتایە هاتووە، مەگەر ئەوەی لای بوخاری و موسلیمیش بەهەمان واتا هاتیبێت ئەوکات ناونسین بەو واتایە هاتووە، بەلاّم ئەگەر فەرمودەکەی لای موسلیم جیاوازبوو لەوەی کە هێناومانە لەکۆتایی تەخریجەکە ئەنوسین بەم لەفزە هاتووە.

٣/ بەڵگەدار کردنی بیبیلۆگرافی:

لە لیستی سەرچاوەکانی زانیارینامەکە بەم ڕێگەیە باسکراوە: {ناوی پەڕاو، ناوی نوسەر، چاپخانە، شوێنی چاپ، ساڵی کۆچی و زایینی، لەگەڵ ڕیزبەندی ئەبجەدی سەرچاوەکان}.

قۆناغەکانی جێبەجێکردنی زانیارینامەکە:

ئەم شاکارە بەم قۆناغانەدا تێپەڕیووە:

١) قۆناغی پلان و دانانی پێوەر و چوارچێوە بۆ پاراستنی ڕێڕەوی زانستیانەی زانیارینامەکە و لانەدان لە میانەڕەوی و لۆژیکی گفتوگۆ و وەلاّمدانەوەی جوان بەشێوەیەك ڕێزی بەرانبەر و خۆشویستنی خێر بۆ بەرانبەر پێڕەوبکرێت.

٢) قۆناغی کۆکردنەوەیگومانەکان لە سەرچاوە جیاوازەکانی{نوسراو/ ئیلیکترۆنی/ کەنالی ئاسمانی}

٣) قۆناغی پۆلینکردن{گشتی- ناوخۆیی - لاوەکی}

٤) قۆناغی کۆکردنەوەی وەلاّمەکانی پێشوو کۆن و نۆی و ئاگاداربوون لە کۆششی زانایان.

٥) قۆناغی وەڵامدانەوە بەپێی بەرنامەیەکی دیاریکراو لەژێر ناوی ـ بەرنامەی زانیارینامەکە بۆ وەڵامدانەوەـ

٦) چونە سەر کۆمبیەتەرو هەماهەنگی لە ڕێگەی ئالی.

٧) پیاچونەوە و ووردبینی بەپێی بەرنامە و دڵنیابونەوە لە بەڵگەداربوونی گوازراوەکان و یەکخستنی شێوازی نوسینەکە.

٨) پیاچونەوەی دوبارە و دانپیانانی زانستیانەی وەڵامەکان لەلایەن کۆمەڵێك زانا هەریەکەیان لە تایبەتمەندی خۆیان.

٩) ئامادەکردنی دەرخستەکان بۆ ئایەتەکان و فەرموودەکان و پرسە فیکری و ووشە سەرەکییەکانی ناو زانیارینامەکە و ئامادەکردنی گەڕاوە و ناوەڕۆکەکان.

١٠) پیاچونەوەی سێیەم، زانایانی بەناوبانگ لەهەموو بوارە جیاوازەکان پێی هەستاون.

١١) ئامادەکردنی کۆتایی و ناردنی بۆ چاپخانە.

ئەمانە ئەو قۆناغانەبوون کە زانیارینامە پێدا تێپەڕیوە پێش ئەوەی چاپ بکرێت و هەر قۆناغەش ووردەکاری چۆنێتی زیاتری هەبوو.

**ڕێڕەوی زانستیانەی زانیارینامەکە:**

- شێوازی هێنانەوەی بەڵگە و پێکەوە بەستنی بیرۆکەکان لە نوسیندا: لەگەڵ خۆلادان لە شێوازی ووتار لەکاتی دانانی زانراوەکان و دورکەوتنەوە لە ئاوازی هێرش و توندی و پەرچەکردار بۆ ئەوەی ئەم کارە تایبەتمەندی زانستی و لۆژیکی و بنەمای گفتوگۆ و هێنانی بۆچونە جیاوازەکان لەدەست نەدات و لە دانپیانراوو خاڵە هاوبەشەکانەوە سەرچاوەبگرێ و ئەو پرسیارانە بوروژێنرێ کە بەڵگەی ئەوان پێچەوانە بکاتەوە، هەروەها دانپیانانی کەسە بەویژدان و داتا و ڕوداوە ڕاستەکانی مێژو لەگەڵ دەقە ئایینیەکان ئەهێنرێت....بەشێوەیەك بیانوو ببڕێت و بانگەشەی گومانکاران هەڵوەشێنێتەوە.

- میانـەڕەوی بـیر: هەرکەسـێك ئـەم زانیارینامەیـە بخوێنێتـەوە نـابینی لایـەنگیری بیرێکی دیاریکراو یان مەزهەبیك یان ڕەنگی هەر بۆچونێکی تایبەتی پێوە دیاربێت، بەڵکو پشـك و بەشـی گـەورە بـۆ میانـەڕەوی هاوسـەنگییە و ئـەم کـارە بـۆ هـەموو میللـەتی ئیسلامییە نەك موڵکی مەزهـەب و لایـەنیك بەمشـێوەیە پێـوەری یەکلاکـەرەوەی کارەکـە هاوسەنگی و میانەڕەوی و کۆدەنگی زانایانی متمانەپێکراوە و لانەکراوە بـەلای بۆچـونێك جێگـەی جیـاوازی بێـت یـان بۆچـونی تـەنها زانایـەك بێـت بەتایبـەت بابەتـەکانی فیقهـو بیروباوەڕ که هەندێ بەمەبەست حەز بە وورووژاندنی ئەکـەن و لای کەسـانی ژێـر شـاراوە نییە، هەموو موسڵمانێك هـەر هەردیدگایـەکی هـەبێت لـەناو ئـەم زانیارینامەیـەدا شـتانێك ئەبینێ کە لەگەڵ خەڵکیتر هاوڕابێت لەسەری، هەروەك چۆن زۆربەی زانایانمان شایەتیان بۆ ئـەم کـارە داوە، ئـەم تایبەتمەندییـە جێگـەی ستایشـە و هـەمو خوێنـەران بەدیـدگا و بۆچونە جیاوازەکان کۆدەکاتەوە لەسەر یەککار.

**ئەم زانیارینامە ڕوو لەکێ دەکات؟:**

- هـەموو پیـاوو ژنێکـی موسـڵمانی گـەنج و ڕۆشـنبیران بۆیـە ڕەچـاوی شـێوازێکە ئاسانکراوە.
- ووتاربێـژ و بـانگخوازان بەگشـتی بۆئـەوەی وەك سەرچـاوە بـەکاریبێنن ئەگـەر داوایانلێکرا هەڵوێستی ئیسلام لە گومانێك ڕوونکەنەوە.
- خاوەنی پەڕاوەکانیتری ئاسمانی بۆ ئەوەی ڕاستییەکان بخرێتە بەردەستیان.
- هەموو لێکۆڵەرێك کە حەزبکات پوختە و ڕاستی ئیسـلامی بـۆ ڕوون بێتـەوە دوور لەوەی پێوەی لکاوە لەبوختان و گومان.

**بەشەکانی زانیارینامەکە و ناونیشانی بەشەکان:**

زانیارینامەی ڕوونکردنـەوەی ئیسـلام لـە سـێ بـەش پێکـدێت: {قورئـان، پێغەمبـەر، سوننەت}

**یەکەم/ قورئان**

١١بەرگە و بەهەمووی ١٩بەشی لەخۆگرتووە لەگەڵ بەرگێك بۆ ناوەڕۆك و بـەم شـێوە ڕیزبەندی بۆ کراوە:

بەرگی یەکەم: بەشی یەکەم: ئەو گومانانەی قورئان خۆی وەڵامی داوەتەوە.

بەرگی دووەم: بەشی دووەم: ئەو گومانانەی ووتراوە هەڵەی زمانەوانییە لە قورئاندا.

بەرگی سێیەم: بەشی سێیەم: ئەو گومانانەی دەربارەی مێـژووی ئیسـلامین،١/ پـێش ئیسـلام، ئیسـلامیەتی هـاوەڵان، کۆچـەکانیان، جیهـانیبونی ئیسـلام و بڵاوبونـەوەی، جێنشینی ئەبوبکر.

بەشـی چـوارەم: گوومانـەکانی سـەر مێـژوی ئیسـلامی: ٢/ جێنشـینی عومـەر، فیتنـە گەورەکە، جێنشینی ئەمەوییەکان، جێنشینی عەباسییەکان.

بەشی پێنجەم: گومانەکان دەربارەی یاسا ژیارییەکان لە ئیسلامدا

بـەرگی چـوارەم: بەشـی شەشـەم: گومانـەکان دەربـارەی بیروبـاوەڕی ئیسـلامی و پرسەکانی یەکخواپەرستی ئلوهییەت و ربوبییەت و ئەسمائو سیفات.

بەشی حەوتەم: گومانەکات دەربارەی بـاوەڕ و دینـداری{باوەڕپـەنادیارەکان، قـەزا و قەدەر، کۆمەڵ و مەزهەبە فیکرییەکان}.

بەرگی پێنجەم: بەشی هەشتەم: گومانەکان دەربارەی بەراوردی ئایینەکان.

بەرگی شەشەم: بەشی نۆیەم: گومانـەکان دەربـارەی پێغەمبـەران لـە ئادەمـەوە بـۆ موسا.

بەشی دەیەم: گومانەکان دەربارەی پێغەمبەران لە داودەوە بۆ موحەمەد سەلامی خوایان لیبێت.

بەرگی حەوتەم: بەشی یازدە: گومانەکان دەربارەی پاریزراوی و تەواوی قورئان.

بەشی دوازدەیەم: گومانەکان دەربارەی پاریزراوی و تێروتەسەلی قورئان.

بەرگی هەشتەم: بەشی سیازدە: گومانەکان دەربارەی پەرستش و مامەڵە داراییەکان لە ئیسلامدا.

بەرگی نۆیەم: بەشی چواردە: گومانەکان دەربارەی پەیوەندییە نێو دەوڵەتییەکان لە ئیسلامدا{ جیهاد، کۆیلایەتی، و کەنیزەك، پەیوەندی ئاشتیانە}.

بەشی پازدەیەم: گومانەکان دەربارەی سیاسەتی سزا لە ئیسلامدا{ حەدەکان، سزا، تۆڵە، نرخی خۆێن، تەعزیرەکان}.

بەرگی دەیەم: بەشی شازدە: گومانەکان دەربارەی ڕەسەنی شەریعەتی ئیسلام و پاشکۆنەبوونی.

بەشی حەڤدەیەم: گومانەکان دەربارەی مرونەتی شەریعەتی ئیسلام و گونجاوی بۆ هەموو کات و شوێن و بارودۆخێك.

بەرگی یازدەیەم: بەشی هەژدە: گومانەکان دەربارەی ژنان و مافیان لە ئیسلامدا.

بەشی نۆزدەیەم: گومانەکان دەربارەی حوکمەکانی خێزان لە ئیسلامدا.

بەرگی دوازدەیەم: بەشی بیستەم: ناوەڕۆك.

بەشی بیست و یەکەم ناوەڕۆك.

**دووەم/ پێغەمبەری ئیسلام:**

٣ بەرگە و ٦ بەشە لەگەڵ بەرگێکی ناوەڕۆك و بەمشێوە ڕیزبەندی کراوە:

بەرگی یەکەم: بەشی یەکەم: گومانەکان دەربارەی ژیانی تایبەتی پێغەمبەر{ڕەچەڵەکی، لەدایکبونی، ژیانی تاکەکەسی}

بەشی دووەم: گومانەکان دەربارەی ڕەوشتەکانی پێغەمبەر.

بەرگی دووەم: بەشی سێیەم: گومانەکان دەربارەی بیروباوەڕی پێغەمبەر، پارێزراوی و موعجیزەکانی.

بەشی چوارەم: گومانەکان دەربارەی بانگەوازی پێغەمبەر و گەیاندنی وەحی.

بەرگی سێیەم: بەشی پێنجەم : گومانەکان دەربارە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر و پەیوەندی بە خاوەن پەڕاوەکانیتر.

بەشی شەشەم: گومانەکان دەربارەی حوکم و سیاسەت و جیهادی پێغەمبەر.

بەرگی چوارەم: بەشی حەوتەم: ناوەڕۆك.

**سێیەم/ سوننەت**

٧ بەرگە و ١٢ بەشەلەگەڵ بەرگێك بۆ ناوەڕۆك بەم شێوە ڕیزکراوە:

بەرگی یەکەم: بەشی یەکەم: گومانەکان دەربارەی سەرچاوە و حوجییەتی سوننە

بەشی دووەم: گومانەکان دەربارەی نوسینەوەی سوننەو بوونی دانراو تیایدا.

بەرگی دووەم: بەشی سێیەم: گومانەکان دەربارەی یارانی پێغەمبەرﷺ ١/ تانەدان لە ئەبو هورەیرە.

بەشی چوارەم: گومانەکان دەربارەی یارانی پێغەمبەر٢

بەرگی سێیەم: بەشی پێنجەم: گومانەکان دەربارەی پێشەوایان و ڕاوییەکانی فەرمودە.

بەشی شەشەم: گومانەکان دەربارەی تۆمارەکانی سوننەت.

بەشی حەوتەم: گومانەکان دەربارەی پرسەکانی سەنەد و مەتن

بەرگی چوارەم: بەشتی هەشتەم: گومانەکان دەربارەی فەرمودەکانی بیروباوەڕ ۱/ ئیلاهیات

بەشی نۆیەم: گومانەکان دەربارەی فەرمودەی بیروباوەڕ۲/ نبووات

بەرگی پێنجەم: بەشی دەیەم: گومانەکان دەربارەی فەرمودەی بیروباوەڕ۳/ سمعییات

بەرگی شەشەم: بەشی یازدە: گومانەکان دەربارەی فیقهی ئیسلامی ۱/ پەرستشەکان.

بەرگی حەوتەم: بەشی دوازدە: گومانەکان دەربارەی فیقهی ئیسلامی۲/ مامەڵەکان و چەند باسێکیتر.

بەرگی هەشتەم: بەشی سیازدە: ناوەڕۆك

بەشی چواردەیەم: ناوەڕۆك

لەخوا داواکارین ئەم کارە بەسوود بێت و ئەوانەی کاریاتێداکردوە پاداشتی بەخێریان بداتەوە.

دەربارەی ئەم زانیارینامەیە وتراوە:

هەموو ئەوانەی پیاچوونەوەیان بۆ ئەم زانیارینامە کردوە بۆچوونی خۆیان دەربارەی نوسیوە و قسەکانیان تەعبیر لە ڕای خۆیان ئەکات:

*مامۆستا ئەلئەحمدی ئەبو ئەننور...وەزیری پێشوی ئەوقاف ئەڵێت:

ئەم زانیارینامە کارێکی زانستیانەی بەبەرنامەیە و لەکاتی خۆیدا هاتۆتەبوون، خوا تەوفیقی هەڵسۆڕاوەکانی بدات و بیخاتە ترازی چاکەکانیانەوە.

*مامۆستا و دکتۆی/ ئەحمەد عومەر هاشم.. مامۆستای حەدیس و زانستەکانی و سەرۆکی پێشوی زانکۆی ئەزهەر ئەنوسێت و ئەڵێت:

ئەم زانیارینامەیە" ڕونکردنەوەی ئیسلام.. وەڵامدانەوەی بوختان و گومانەکان" لە بەهێزترین و گرنگترین ڕەوانترین زانیارینامەکانە کە زانایەکی پایەدار و بانگخوازێکی دڵسۆز و هاورێیەکی بەڕێز و خۆشەویست شانیداوەژێری ئەویش مامۆستاو دکتۆری بەڕێز موحەمەد داوودە خوای گەورە پاداشتی بداتەوە لەسەر ئەو کۆششە زانستییەی بۆ خزمەتی ئیسلام و قورئان و سوننەتی پێغەمبەر.

بەڕاستی ئەمە کۆششێکە شایستەیە باس و ستایش بکرێت، چونکە بێگومان لە گەورەترین و بەهێزترینی زانیارینامەکانە، مۆرکێکی زانستی وورد و لایەنێکی ئاینی قوڵی لەخۆگرتووە کە لەوەدا کەس پێشی نەکەوتوە.

ئەم زانیارینامەیە خەریکە بڵێم ئەگەر هەموی نەبێت زۆرینەی گومانەکانی لەخۆگرتوە، بەوەڵامی یەکلاکەرەوە و زۆر نایاب، هەموو ئەو ڕاستیانەی ڕونکردۆتەوە کەکاری سەرخستنی ئاینی خوا ئەکەن، سنورو قاغەی فەرمودەش ئەپارێزێت لە گومانەکان و هەموو ئەو تانەو بوختانانەی لەسەر لائەبات کە خاوەن ئارەزوە سەرکەشەکان و دوژمنەکانی سوننەتی پێغەمبەر و ئەوانەی لەسەر ڕێچکەی ئەوانن دروستیانکردوە.

هەڵسوڕاوانی ئەم زانیارینامە ئەم ووتەیان لەسەر ئەنەخشێت کە ئەڵێت: ئەم زانستە باشترینی ناو هەموو بەرەیەك هەڵیئەگرن، لادانی توند ئاژۆکان و بەدین زانراوی بەتاڵەکان و ڕاڤەی نەفامەکانی لەسەر لادەبەن.

ئەم زانیارینامە بە بەرنامەیەکی تازەوە هاتوە، هەموو بوارە زانستیەکانی لەخۆگرتووە، لەهەموو لق و بەشەکانی ئاینیدا لیکۆڵینەوەی تیروتەسەلی کردوە، بەشێوەیەکی سەرنج ڕاکێش کە لە داهێنان و گشتگیریدا پێشی نەدراوەتەوە.

ئەم زانیارینامە لەکاتێکی هەستیاردا لەدایکبوو لەکاتی وەرچەرخانێکی مەترسیداردا کە میللەتی ئێمەی پێدا تێپەر ئەبێت، سەردەمی دڕندەترین هێرشەکانە بۆسەر ئاینی خوا و قورئان و پێغەمبەرەکەی.

ئەم هێرشانە بە چەندەها ڕێگا و هۆکاری جۆراوجۆرەوە، بینراوو نوسراو، هەموو بوارەکانی زانستیشی گرتۆتەوە، وەك سوپایەکی بێشمارە کە هەموو کات و شوێنێکی گرتبێت و بیەوێت تەڕو ووشك پێکەوە بسوتێنێت.

ویستی خوای گەورە وابوو کۆمەڵێك دیاریبکات بۆ بەرگری لە دین و قورئان و پێغەمبەرەکەی کە بەرپەرچی دەستدرێژییەکان بدەنەوە، ویستی وابوو ئەم زانیارینامە بێتەبوون وەك بەرگریکارێکی لێهاتوو سەرکەوتنی تەواوی ڕێنماییەکانی خواو فەرمودەکانی پێغەمبەر وزانستەکانی ئیسلام دەستەبەر بکات.

ئەم زانیارینامەیە پێی ڕاگەیاندین ئەوەی پێغەمبەر بۆی هێناوین هەموی وەرگرین و وازبهێنین لەوەی کە لێمانی قەدەغەکردووە﴿ ... وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٧﴾ ﴾(الحشر)، ئێوەدا نەبێت، جا ئەوەی پێغەمبەرﷺ پێی بەخشیوون وەری بگرن، هەر فەرمانێکی پێدان بەگوێی بکەن، قەدەغەی هەر شتێکی لێ کردن مەیکەن، لە خوا بترسن، چونکە بەڕاستی خوا بەتوندی تۆڵە دەسێنێت.

پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێت خۆی پێویستی دەستگرتنی شوێنکەوتوانی ڕونکردۆتەوە بە سوننەتەکانی خۆی و خەلیفە ڕاشیدەکامەوە و فەرمویەتی: {لەناو ئێوەدا شتانێکم جێهێشتوە ئەگەر دەستیان پێوەبگرن هەرگیز دوای من ڕێوون نابن، قورئان و سوننەتەکانم[١٣]} لێرەدا ڕونیکردۆتەوە دەستگرتن بە قورئان و سوننەتەوە مایەی ڕزگاربونە لە گومڕایی و لەدین دەرچوونی دیار و نادیار.

---

١٣- اخرجه الحاكم فی مستدركه، كتاب العلم، رقم/٣١٩ وصححه

له گەورەترین وێنەکانی بەرگریکردن لە ئیسلام و قورئان و سوننەت ئەم زانیارینامە گەورەیەیە کە بەهەق دەریای زانیارینامەیەکی جیهانییە، ناهەق پەرچ ئەکاتەوە و بەتاڵی ئەکاتەوە، هەقیش بڵند و بەرز ئەکاتەوە، چونکە تەنها هەق شایستەی شوێنکەوتنە، خوای گەورە بەهەمو خێرێك پاداشتی بەڕێز دکتۆر محمد داوود بداتەوە کەبەم شاکارە ئیسلامییە مێژوییە هەستاوە، خواش یارویاوەرە بۆ گەیشتن بەخێرەکان.

مامۆستاو دکتۆر/ کەمال بیشر... ئەمینداری گشتی کۆڕبەندی زمانەوانی زانستی عەرەبی و جێگری سەرۆکی کۆڕبەندی زمانی عەرەبی لە قاهیرە و مامۆستای زانستی زمان لەکۆلیجی دارولعلوم. زانکۆی قاهیرە:

لەم سەردەمەدا قورئان توشی هێرشێکی دڕندانە بۆتەوە، بۆ پێکانی مەستیش چەندەها هۆکاری گرتۆتەبەر، هەر لە پەڕوی نوسراو وپێگە ئەلیکترۆنییەکانەوە تا گرتنی کۆڕو سیمینار و گۆنگرە و بڵاوکردنەوەی سیدی تۆمارکراو و جگە لەمانەش..

لەنێوان ئەو گومانانەی وروژاندویانە گومانی زمانەوانییە لەهەندی مەسەلەی زمانەوانی ناو قورئانی پیرۆز ئەوەی کە لای هەندێ شاراوەیە و کەوتونەتە ناو وەهمێك کە ئەوانە گەیاندۆتە حوکمی ناڕاست، لێرەوە پێویست بوو لەسەر زانایانی زانستە قورئانییەکان لەو بانگەشانە ڕابمێنن و ڕوی ڕاستییەکان دەربخەن.

لە نوسین و ڕیزبەندی گومانەکان" حاڵەتی ڕۆشنبیران لە خوێنەری ئەم زانیارینامەیە بەهەند وەرگیراوە، بەپێی ڕیزبەندی ئایەت و سورەتەکان ڕێکخراوە بۆ ئەوەی ئاسانکاری بۆ زانستخوازەکان بکات کاتێك ئەیانەوێت بەدوای وەڵامی گومانەکاندا بگەڕێن، هەر بۆئەم مەبەستە وامان بەباش زانی بۆهەر گومانێك وەڵامێکی سەربەخۆ بنوسین و لەوانەشە ئەم ڕێکارە هەستی بوونی دوبارەبونەوە بدات بەتایبەت لەوبابەتانەی کەپەیوەندیان لەنێواندا هەیە.

هەندێ رایان وابوو بەشێوازێکیتر چارەبکرایە هەروەك چۆن کوڕی شیرینمان موحەمەد داود لە پەراوی{کمال اللغة القرانية بين حقائق الاعجاز و اوهام الخصوم[١٤]}پێڕەوی کردبوو، بەشێوەیەك دیاردەکانی زمانەوانی پۆلێن بکرێن و هەرکۆمەڵەی لەژێر بەشی تایبەت بەخۆی وەڵام بدرێنەوە تا کورتتربکرێتەوە و لەدووبارەبونەوەش رزگارمان بێت.

هەرچۆنێك بێت ئاسانکاری کراوە بۆ خوێنەر بەهۆی ریزبەندی گومانەکان بەپێی ریزبەندی ئایەت و سورەتەکانی ناو قورئان.

من خۆم پیاچونەوەیەکی ووردمکردوە بۆ ئەم شاکارەی بەردەستتان تا بەمشێوە لەنگەری گرتوە بەو هیوایەی مەبەستی خۆی بپێکێت و بەس بێت بۆ هەڵوەشانەوە و سرینەوەی گومان لە عەقڵی ئەوانەی وەهمێکیان بۆ دروستبوە، هەندێجاریش تێکەڵە بە ئامازەکانی زمان پاراوی و رەوانبێژی.

لەکۆتاییدا ئەڵێم ئەم کارە شاکارێکی زانستی زۆر باشە گشت کەسێك وکەسانی تایبەتمەندیش لێی سودمەند ئەبن. تەنها خواش تەوفیق ئەدات.

*مامۆستا و دکتۆر مەحمود محمد عمارە... مامۆستای زانکۆی ئەزهەر، دەربارەی زانیارینامەی" رونکردنەوەی ئیسلام.. وەڵامدانەوەی بوختان و گومانەکان" نوسیوویەتی:

دوای تەواوبوون لەخوێندنەوەی بەشێك لە زانیارینامەکەبەمشێوەیە رای خۆم تۆمار ئەکەم:

یەکەم: کۆششێکی ستایشکراوو بەپاداشت ئەبێت بەویستی خوا، لەپشتی ئەم کارەوە غیرەتێکی جوان هەیە بۆ ئیسلام و پێغەمبەرەکەی.

---

١٤– ئامۆژگاریشمکردون ئەم پەراوە بەکورتی لە کۆتایی ئەم بەشەدا دابنرێت

دوەم: ئەوانــەی ئــەم گومانانــە ئەخەنــە ناوخــەڵك بــەدوای وەڵامــدا ناگــەڕێن بــەڵام کۆمەڵێکی فراوان لەخەڵك هەن هەنگاوێك دێن و هــەنگاوێك ئەگەڕێنــەوە و ئەوانــە سـودی لێوەرئەگرن و دێنە ناو ئیسلام، هەیە لەناو ئێماندارانیشدا لەوانەیە ئــەو گومانانــە کاریـان تێبکات ئەم زانیارینامەیە ئاگادارکردنەوەیە بۆ ئەوانە.

سێیەم: دەرگاوانەکانی ئەم هێرشە بەمەرامــە باوەڕیـان بــە قورئـان و سـوننەت نییــە، بۆیە پێویست بوو شتێك هەبێت متمانە بوون بەقورئان و سوننەتی پێغەمبــەر بچەسـپێنێ و جەختی لێبکاتــەوە، ئــەوەی کــە زانایانمـان بەهــەق بـۆی تێکۆشـاون و کارێکیـانکردوە بـواری پەرچـدانەوەی نــەبێت و پشتگیریشــی لێکـراوە وەك ئــەوەی ئێمــە دانپیانـانی بـۆ ئەکەین و تەنها خوا یارو یاوەرە.

*مامۆسـتا و دکتـۆر /محمـد غـەنیم غـەنایم... مامۆسـتا و سـەرۆك بەشـی پێشـووی شەریعەتی ئیسلامی لە کۆلیجی دارلعلوم زانکۆی قاهیرە نوسیویەتی:

بەشی شەشەمی زانیارینامەی ڕونکردنەوەی ئیسلام پیاچونەوەم بۆ کرد و موتاڵامکرد بینیم کـارێکی زانسـتی گەورەیــە و پشـت بەبەڵگــەو شـیکاری ئەبەسـتێ، بیرۆکــەکانی بــە سانایی و ئاسانی ئەخاتەڕوو، لەسەرچاوەکانەوە ووتەکان بەڵگەدار ئەکات.

زۆر دەگمەن نەبێت هەڵەم نەبینی چونکە پێش منیش پیاچونەوەی بۆکرابـوو ئەمــەش بەڵگەیە لەسەر گرنگیدان بەم شاکارە، من زۆر سوپاسـی سەرپەرشـتیارەکانی ئــەم کـارە ئەکەم بەتایبەت مامۆستا و دکتۆر محمد داود و هــەموو هاوکارەکـانی نـزای بــەردەوامی و سەرکەوتنیان بۆ ئەکەم.

*مامۆسـتا و دکتـۆر/ عەبدولحەمیـد مــەدکور.. مامۆسـتا و سـەرۆك بەشــی پێشـوی فەلسەفەی ئیسلامی لە کـۆلیجی دارولعلـوم زانکـۆی قـاهیرە، ئەنـدامی کۆربەنـدی زمـانی عەرەبی لە قاهیرە: بەنوسین ووتی:

ئەم زانیـاریـنـامە" ڕونکردنەوەی ئیسلام.. وەڵامدانـەوەی بـوختان و گومـانەکان" م موتالاکرد خۆشحاڵیکردم چونکە کۆمەڵێك تایبەتمەندیم تیدا بینی کە نرخ و گرنگی بەرز ئەکاتەوە لەوانە:

گەڕانێکی وورد بـەدوای ئـەو گومانانـەی کـە ووروژێنـەری هەیە پاشـان ئـەو کۆششـە زانسـتیانەش کـە وەڵامـی پێدراوەتـەوە بەشـێوەیەك پوچـەڵیکردونەتەوە وهەقیقـەتی قورئانیش دەربارەیان ڕوون ئەکاتەوە، لەگەڵ ئەمانەشدا ڕێکاری عەقڵی و لۆژیکیشـی بـۆ وەڵامدانەوە بەکارهێناوە، بەوشێوەی کە لەبەڵگەکانی قورئاندا دیارە، ئەوەی کە هەندێك وائەزانن بەڵگەکانی قورئان تەنها بەڵگەی شەرعین، و نازانن کە بەڵگەی شـەرعی عـەقڵین، بیانوی ئیسلامن بۆ هەموو سەردەمێك و بۆ هەموو تاکێك.

پاشـان ڕاسـتییەکانی قورئـان بـەزمانێکی پـاراوی وورد پێشـکەش ئـەکات و لەگـەڵ ئەمەشدا ڕوون و ڕەوانە توانای زیاتری ئەداتی بۆ قەناعەت پێکردنی بەرانبەر.

لەگـەڵ هـەموو ئەمانەشـدا جـەماوەرێکی فـراوان لەخوێنـەران ئـەدوێنیّ، بـەبونی بەڵگەکانیشی توانای ڕازیکردنی زانایان و لێکۆڵەرەکانی هەیـە، بـەبونی ئاسـانی و سـانایی زانیارییەکانیشی توانای دواندنی ڕۆشنبیرانی ناتایبەتمەندیشی هەیە بیّ گریّ و گرانی.

لــەخوا ئەپاڕێمــەوە ئەوانــەی هەڵســوڕێنەری ئــەم کــارەبون، نوســەر و سەرپەرشتیکارەکانی هەمویان پاداشت بداتەوە لەسەر ئەم کۆششە چاك و پیرۆزە، لییان وەرگرێت و بیخاتە ترازوی چاکەکانیان لەو ڕۆژەی پێی ئەگەنەوە، بەڕاستی ڕاستییەکانی ئیسـلامیان بەخـەڵك گەیانـدوە و لادانـی تونـدئاژۆکان و تەڵەکـەی فێڵبازانیـان گومـانی خانەگومانەکانیان هەڵوەشـاندەوە، سـوپاس بـۆ خـوا و پاشـان بـۆ ئـەوانیش خـوا زیـاتر تەوفیقیان بدا خوای گەورە بیسەر و نزیکە.

*مامۆستا و دکتۆر/ عەبدولفەتاح ئەبولفتوح ئیبراهیم..مامۆستا و سەرۆك بەشی بنەماکانی زمان لە کۆلیجی دیراساتی ئیسلامی و عەرەبی کچان لە زانکۆی ئەزهەر: ئەنوسێ و ئەڵێت:

دوای بینینی زانیارینامەی بەنرخ" ڕونکردنەوەی ئیسلام.. وەڵامدانەوەی بوختان و گومانەکان" ئەنوسم:

ڕونبوویەوە ئەمە کارێکی زانستی چاکی پێگەیشتووە، ئەوانەی پێی هەستاون ولێکۆڵەرەکانیش ڕەنجێکی پاکی جیاوازی دڵسۆزانەیانداوە، لەخوا داواکارین بیخاتە ترازوی چاکەکانیان، کاتێك بەدوای ئەوگومانانە کەوتون کە ڕووئەکاتە تەواوی و پارێزراوی قورئان، بەبەڵگەی درەوشاوە بەڵگەنەویستی وپووچ هەموو گومانەکانیان لەگۆڕنا، بە وەڵامدانەوەیەکی زانستی و بیانوبڕ دائەنرێت بۆ خانەگومان و داخ لەدڵەکان، ئەوانەی گەورەیی و جوانی و تەواوی زمانی قورئان ناناسن، نەئەزانن نەدەرکی ئیعجازی زمانەوانی قورئان ئەکەن کە خوا ئالینگاری مرۆۆ و جنۆکەی پێئەکات و کەسیش نەیتوانیوە وێنەی سورەتێکی بێنێت.

ئەم زانیارینامە بەزمانێکی پاراوی ووردی ڕەوانی عەرەبی نوسراوە لە ئاستێکی بەرزدایە کەلەگەڵ چاکی ئامانج و بەرێزی ئەنجام و گەورەیی مەبەستەکەدا ئەگونجێت

خوای گەورە باشترین پاداشتی هەموو ئەوانەباتەوە کە بەشداربون لەم کارە پیرۆزەدا، تەنها خوا یارو یاوەرە و ڕێنمونی ئەکات بۆ ڕاسترین ڕێ.

*مامۆستا و دکتۆر/ محمد موتەوەلی مەنسور.. مامۆستای زمانی عەرەبی لەکۆلیجی زمانی عەرەبی زانکۆی ئەزهەر، بەنوسین و ئەلێت:

لەوکاتەی دوژمن کەڵبەکانی دەرخستوە و تانەوتەشەر لە قورئان ئەدات کە سەرچاوەی هێز و ڕێزی ئەم ئوممەتەیە، ئەم زانیارینامەیە کە کۆمەڵێك برای بەڕێز غیرەتیان بۆ دینەکەیان هانیدان وەڵامی ئەو گومانانە بدەنەوە بەوەڵامێکی زانستیانەی

پشتبەستو بە بەڵگەی عەقڵی و نەقڵی بەشێوەیەك گومانـەکان بەتـەواوی پوچـەڵکەنەوە، هۆکـار و لاوازییـەکان دیـاری بکـەن بـێ زیـادەڕۆیی و سـتەم، بـێ هێرشکردنەسـەر بـیری بەرانبەر، ئائەمەیە ئەو بەرنامەیەی قورئان فـیری کـردوین وەك خـوا ئەفـەرموێت: {النحـل /ادع الى سبيل}

بەبۆچونی من ئەم کارە زانستیە هەمەلایەنە لە شاکارە پێشـەنگەکانی ئـەم بوارەیـە و ئەوەی جیاوازی پێئەدات کۆکردنەوەی هەموو گومانە پرش و بڵاوەکانـە لـە دوتـوێی ئـەم شاکارەدا، هەروەها بە شێوازێکی ئاسان  و زمانێکی نەرم وەڵامدراونەتەوە.

لەخوا داواکارم هەموو ئەوانە بەمکارە هەستاون بەباشترین پاداشت بداتەوە و بەسـود بێـت و لـە تـرازوی چـاکەکانماندا بێـت لـە ڕۆژی هەسـتانەوەمان{یـوم یقـوم النـاس لـرب العالمین} المطففین

*مامۆستا و دکتۆر/ عەبدولمەجید محمود عەبدولمەجید مامۆستای بەشـی شـەریعەتی ئیسلامی لە کۆلیجی دارولعلوم زانکۆی قاهیرە، ئەنوسێت و ئەڵێت:

ڕاپۆرتێـك دەربـارەی بەشـی گومانـەکان لەسـەر سەرچـاوەبوونی سـوننەت و بەبەڵگـە سـەیرکردنی لـەناو زانیارینامـەی" ڕونکردنـەوەی ئیسـلام.. وەڵامدانـەوەی بوختـان و گومانەکان" ئەم بەشە لە زانیارینامەکە پیاچونەوەم بۆکرد، ئەو هەستە دڵخۆشیکردم کە بینیم کۆششـێکی گـەورە کـراوە لـە کۆکردنـەوە و پـۆلینکردن و دەرهێنـان، گرنگییـەکی زۆری پێـدراوە کـە پاڵنـەرە ئـەخلاقی ئـاینی و زانسـتی و نەفسـیەکانی پشـت ئـەم زانیارینامەیە دەرئـەخات و شایسـتەی ئەوەیـە شـوێنی خـۆی لـەناو زانیارینامـە باڵاکانـدا بکاتەوە.

سوپاسـی خـۆم ئاراسـتەی ئەوکەسـانە ئەکـەم گرنگیـان بـەم کـارە داوە لـەخواش ئەپاڕێمەوە کە مەستەکانیان بپێکن و هەوڵەکانیان پیرۆز بکات و بیخاتە تـرازوی کـردەوە چاکەکانیان لە خوێندنەوەم بۆ ئەم بەشە تـەنها چـەند هەڵەیـەکی زۆر کـەمم دۆزییـەوە و ڕاستمکردنەوە.

*مامۆستا و دكتۆر/ ئەحمەد یوسف سولەیمان...مامۆستا و سەرۆك بەشی پێشوی شەریعەتی ئیسلامی لە كۆلیجی دارولعلوم ـ زانكۆی قاهیرە، بەنوسین ئەڵێت:

بەشی دوازدەی زانیارینامەی" ڕونكردنەوەی ئیسلام.. وەلآمدانەوەی بوختان و گومانەكان"م خوێندەوە بەناونیشانی: گومانەكان دەربارەی تەواوی و پارێزراوی قورئان، ە ئەم بەشە لەهەشتاودوو گومان پێكهاتوە نوسەرەكانی بە بێلایەنانە و بابەتیانە نوسیویانە و وەلآمەكانیان ئەو كەسانە ڕازی و تێرئەكات كەبەدوای ڕاستیدا ئەگەڕێن، ئەم وەلآمانە لەئاستێكی بەرزی داڕشتن و ڕونی و گشتگیری لە بەڵگە و بابەتدا خۆی ئەبینێتەوە، لەسەروی ئەمانەشەوە ڕیزبەندی و كورتبڕی و درێژبوونەوەی بەگونجاوی پێكەوە گرێداوە و لەگەڵ گەڕانەوەش بۆ سەرچاوە ئەسڵیەكان، كەسەرچاوەكان كۆن و نوێشیان تێدایە.

ڕام وایە بەتەواوبونی ئەم زانیارینامە كەلێنێكی زۆر گەورەی كتێبخانەی ئیسلامی ئەم سەردەمە پڕئەكاتەوە

و تونێتی گەنجەكانمان پاراو ئەكات، یارمەتی ئەدات بۆ پاراستنی بیروباوەرەكەی و زیاتر وابەستەی ئاینەكەی ئەكات.

*مامۆستاو دكتۆر/ محمد صالح توفیق... مامۆستای زانستی زمانی بەراوردكاری و ڕاگری كۆلیجی دارولعلوم ـ زانكۆی قاهیرە، بەنوسین ئەڵێت:

زانیارینامەی"ڕونكردنەوەی ئیسلام... وەلآمدانەوەی گومان و بوختانەكان“ بەرنامەیەكی زانستی تەندروستی لەخۆگرتوە لەهەڵەی تایپ و زمانەوانیش بەدورە، زۆر دەگمەن نەبێت و ئەویشمان ڕاستكردۆتەوە، وپیاچونەوەش بە بەراوردكاریەكان و ئەوەش كە پەیوەندی بەعەهدی قەدیمەوە هەیە هەڵەكانی ڕاستكراونەتەوە، خوای گەورەش یارویاوەرە.

*مامۆستاو دکتۆر/ محمد ئیبراهیم شەریف... مامۆستا و سەرۆك بەشی پێشوی بەشی شەریعەتی ئیسلامی لە کۆلیجی دارولعلوم زانکۆی قاهیرە، بەنوسین ئەڵێت:

زانیارینامەی" ڕونکردنەوەی ئیسلام.. وەڵامدانەوەی بوختان و گومانەکان" زۆر کارێکی گەورەیە لەولایەنەی تۆڕی ناوەتەوە بۆ هەموو ئەو پشێوییانەی کە داخ لەدڵەکانی ئیسلام دروستینەکەن و ڕوی هەمویان و ئاژاوەکانیانی دەرخستوە، بەگیانێکی بەرز و بەسۆزەوە بەبەرنامەیەکی زانستیانەی بەڵگەدارەوە، لەگەڵ شیکارییەکی گونجاو بۆ گشت ڕۆشنبیران لەلایەك و لەلایەکیتر ئەم جۆرە لەکار وەڵامی ویستی موسڵمانان بەگشتی ئەداتەوە.

ئەمەکارێکە جێگەی ستایشە و ئەوانەی پێی هەستاون شایستەی ڕێزو پاداشتی دونیاو قیامەتن.

*مامۆستاو دکتۆر/ یوسری ئەحمەد زیدان... بریکاری کۆلیجی دارولعلوم بۆ خوێندنی بالاـ زانکۆی قاهیرە، بەنوسین ئەڵێت:

زانیارینامەی " ڕونکردنەوەی ئیسلام.. وەڵامدانەوەی بوختان و گومانەکان" شایستەی ڕێز و خوێندنەوە و وەرگرتنە، چەندەها بیرۆکەی لارو و گومانی نابەجێ کە دوژمنانی ئیسلام بازاڕی بۆ گەرم ئەکەن و هەندێ لەموسڵمانانیش بەنەزانی شوێنی کەوتون و کەوتونەتە ژێر کاریگەری ڕاگەیاندنی دژ بە ئیسلامی ڕاست و دروست، لەوانە: ئەو گومانانەی دەربارەی جێنشینی ئەبوبەکر خوای لێ ڕازی بیت ئەوروژێنرێ هەروەها دەربارەی پەیماندانی عەلی کوری ئەبوتالیب بە ئەبوبەکر خوا لێیان ڕازی بێت و جگە لەمانەش.

ئەم زانیارینامە زانستییە، تەواو لەکاتی خۆیدا هات بۆ ئەوەی وەڵامی هەموو پرسیارەکان بداتەوە کە دەربارەی ئیسلام و مێژوەکەی ئەکرێت بە تەواوی بێ لایەنیانە و بابەتیانە بۆئەوەی هەموو ناحاڵیبون و شاراوەیەك دەربارەی مێژوو مەسەلەکان

بزانرێت، هەموو گومانێك بەبەڵگەی عەقڵی و نەقڵی بیانوی ببڕێت و هەڵوەشێتەوە، ئای موسڵمانان چەندە پێویستیان بەبونی ئەم زانیارینامەو خوێندنەوەی هەیە.

خوا پاداشتی زۆری هەڵسوڕێنەرانی ئەم زانیارینامەیە بداتەوە و هەموو ئەوانەش بەشداریان تێداکردوە، خوا پاداشتی بەرگریکردنیان لەم ئیسلامە بداتەوە و پاداشتیان بداتەوە لەسەر هەڵماڵینی ڕووی درۆو بوختان و لادانی فیکری نیازگڵاوەکان.

*مامۆستاو دکتۆر/ حوسەین سەمورە...مامۆستا و سەرۆك بەشی شەریعەتی ئیسلامی لە کۆلیجی دارولعلوم ـ زانکۆی قاهیرە، بەنوسین ئەڵێت:

زانیارینامەی" ڕونکردنەوەی ئیسلام.. وەلآمدانەوەی بوختان و گومانەکان" من پیاچونەوەم بۆ ئەو گومانانە کرد کە دەربارەی پێگەی ئافرەت لە ئیسلامدا، هەروەها ئەو گومانانەی دەربارەی عیبادەتەکانی ئیسلامن. ئەم گومانانە بەشێوەیەکی بابەتیانەو زانستیانە چارەکراون و ڕێگای زانستخوازان ڕوناك ئەکاتەوە، بانگەشەی خاوەن مەرامەکانیش بەتاڵ ئەکاتەوە لەموسڵمانان و جگە لەموسڵمانەکانیش ئەوانەی شەیتان لێیانی تێکەڵکردوە.

زانیارینامەکە شاکارێکی زانستی گرنگە لە بوارەکەی خۆیدا، توێژەری جیاواز و بەتوانا پێی هەستاون، هەموو ئەوگومانانەی کە دەربارەی پێگەی ئافرەت و پەرستشەکان ئەووروژێنرێ هەڵوەشاوەتەوە، خوا پاداشتی خێری هەموو ئەو بەڕێزانە بداتەوە کەبەمکارە هەستاون، چونکە میللەتەکەمان زۆر پێویستی بەمجۆرە کارانەیە، لە بەنرخی بابەت و ئاسانی ڕێکار و بەڵگەدار بونەکەیدا.

لەخوا داواکارم پاداشتی بەخێری هەڵسوڕێنەرانی ئەم زانیارینامە بداتەوە و بیخاتە سەر ترازوی چاکەکانیان و کارچاکێکی نەبڕاوەش بێت بۆ دوای خۆیان، تەنها خوا تەوفیق ئەدات.

*مامۆستا و دکتۆر/ ئەحمەد قوشتی عەبدولرەحیم... مامۆستای فەلسەفەی ئیسلامی یاریدەدەر لەکۆلیجی دارولعلوم ـ زانکۆی قاهیرە، ئەنوسێت و ئەڵێت:

موتالأی ئەم شاکارە" ڕونکردنەوەی ئیسلام.. وەڵامدانەوەی بوختان و گومانەکان"م کرد کەلەکاتی خۆیدا هات، لەمکاتەدا هێرشی بێویژدانانە بۆسەر ئیسلام توندتر بووە، بیروباوەڕ و شەریعەت و پێڕەویشی گرتۆتەوە، توتییەکانیش زۆربوون ئەوانەی ئەڵێنەوە، نەزانستیان هەیە نەڕەوشت، ئەم کارە هات کەلێنێکی فراوانی پرکردەوە، بۆئەوەی توێشوو بداتە هەموو خوێنەرێکی ڕۆشنبیری بەویژدان بۆ پەرچدانەوەی گومانەکان و هەڵوەشانەوەیان.

لەخوای گەورە داواکارم ئەوکەسانەی بەمکارە هەستاون سەرکەوتویکات و پاداشتی بەخێریان بداتەوە.

## پێشەکییەکی گشتی بۆ بەشی قورئان لە زانیارینامەکە

أ. د. محمد محمد داوود

مامۆستا لەهەردوو کۆلیجی ئاداب و پەروەردە/ زانکۆی قناة السویس

ڕاگری پەیمانگای: معلمی القران الكريم

### شەڕ لە دژی قورئان:

هێرش کردنە سەر قورئان لەیەکەم دابەزینی قورئان دەستی پێکردوە و ئاگرەکەی کڵپەی سەند کاتێک قورئان ڕوبەڕوی بت پەرستی وەستایەوە، قورئان یەکەمین بەرەنگاربونەوەی ئەم جەنگەی تۆمارکردووە لەکاتی ڕوودانیدا و لە تاوتوێکردنی ئەم باسانەدا ڕون ئەکرێتەوە. کەواتە دژایەتیکردنی قورئان کۆن و نوێیە.

ئەم جەنگە بەردەوامە هەندێ جار توندو بڵێسەدارە و هەندێجاریش بەرەو خامۆشی ئەڕوات، لەماوەی شەڕی خاچ پەرستاندا قورئان ڕووبەڕوی هێرشێکی دڕندانە بوویەوە"

هەندێ لە ڕۆژهەلأتناسەکان پەڕاوێکیان بەناوی{دحض القران الکریم} دانا واتە: بۆڕدانی قورئانی پیرۆز. لەم پەڕاوەدا لەفزەکانی قورئان نەك واتاکانی وەرگێرا بۆ زمانی لاتینی بۆئەوەی بوار بۆ لادان و گۆڕانی قورئان خۆشکەن، بەلأم هەموو هەولەکانیان نەزۆك بوو قورئان وەك خۆی بە پارێزراوی مایەوە.

هێرشی نوێ بۆ سەر قورئان زۆر دژوارترە لەوانەی پێشوو چونکە لەسەر تۆڕەکانی ئەنتەرنێت و کەنالە ئاسمانییەکانەوە هێرش ئەکەن و تەنانەت کۆمەلێك لە لێکۆلەرە ئەمریکییەکان قورئانێکیان بەناوی {الفرقان الحق} دانا کەچی قورئان بەسەر ئەویشدا سەرکەوت چونکە قورئان کەلامی خوایەو بۆ بۆ ئەوانەی پەنای بۆ ئەبەن بەبەزەیی و ڕێنمونی و ئارامییە، زۆر جیاوازە لە هەلەو پەلە و کەموکورتی مرۆڤەکان، ئەم ململانێ بەردەوام ئەبێت لەنێوان چاکە و خراپەدا و لەنێوان هەق و ناهەقدا ئەمە سوننەتی خوایە لەناو دروستکراوەکانیدا.

ـ زانایان لەهەمو سەردەمێکدا کۆششی بەرچاویان هەبوە بۆ لادان هەلوەشاندنی گومانەکان لەوانە:

- پەڕاوی{الرد علی ابن الراوندی الملحد}ی جاحظ (ت ٢٥٥ی هـ).
- پەڕاوی {مشکل القران}لابن قتیبە الدینوری (ت ٢٧٦ ه).
- هەردوو پەڕاوی{ التمهید و اعجاز القران}ی ابوبکر الباقلانی (ت ٤٠٣ ه).
- پەڕاوی{ تنزیە القران عن المطاعن}ی قاضی عبدالجبار (ت ٤١٥ هـ)
- پەراوی{ حقائق الاسلام و اباطیل خصومە}ی عباس محمد العقاد
- پەڕاوی {شبهات حول الاسلام}ی محمد قطب
- جگە لەمانە زۆریتریش هەن وەك ئەوەی زانایانی تەفسیر لەکاتی تەفسیرکردندا باسیانکردووە بەتایبەت ئەمانەی خوارەوە:
- {معانی القران }للفراء (ت ٢٠٧ ه).

- {الكشاف}للزمخشرى(ت ٥٣٨ هـ).
- {تفسير الكبير و مفاتيح الغيب} للفخر الرازى(ت ٦٠٤ هـ).
- {روح المعانى}للالوسى( ت ١٢٧٠ هـ).
- {تفسير التحرير و التنوير}ی محمد طاهر عاشور
- {تفسير القران الحكيم: تفسير المنار}ی محمد رشيد رضا
- {مناهل العرفان فى علوم القران}ی زرقانى

هەروەها پەراوەکانی ئیعرابی قورئانی پیرۆز لەکۆن و نوێدا لەوانە:

- {معانى القران و اعرابه}ی زجاج( ت ٣١١ هـ)
- {اعراب القران}ی نحاس (ت ٣٣٨ی هـ)
- {التبيان فى اعراب القران}ی عكبرى(ت ٦١٨ هـ).
- {اعراب القران الكريم}ی محى الدين الدرويش.... هتد

زۆرترینی تانەکان کە لەقورئان ئەدرێت لـەم پەڕاوانـە و شـێوەی ئەمانـە وەرگـیراون! ئەچن تەنها گومانەکە ئەگوێزنەوە و وەڵامەکـەی وازلێـدێنن، هـەرگومانێکیش بەچـەندەها ڕوو ئەیکۆڕن بۆ ئەوەی گومانەکان زۆرکەن و بۆ خوێنـەر وادەرکـەوێت لەبـەردەم دەیـەها گوماندا وەستاوەتەوە بەڵکو لەمەش زیاتر بۆ قورسکردنی تای ترازووەکەیان دێن بوختـان بۆ قورئان و پێغەمبەری ئیسلام و موسڵمانانیش دروست ئەکەن، بوختان جنێو بە گومـان ناژمێردرێ بۆیە باس نەکردنی و خۆلادان لێی باشترین چارەسەرە.

**هێرش کردنە سەر قورئان بۆ؟**

پاڵنەر زۆرن بۆ هێرش کردنە سەر قورئان ئەکرێت لەدوو پاڵنەردا چڕی کەینەوە:

- پاڵنەری دەرونی: بریتییە لە بەناراست دەرخستن و ئاوەژوکردنی هەق، ئەمـەش لـە شکسـت و دەسەوسـانی بەرانبـەرەوە سەرچـاوە ئـەگرێ کـەناتوانێ ڕوبـەڕوی بوەسـتێ، دەسەوسـانی بەرانبـەر بـە ناحـەز زۆربـەی کـات ئەبێتـە هـۆی دروسـتکردنی بوختـان بـۆ

بەرانبەر، هەروەها بونی سیفاتی خراپ ئەبێتە هۆی ئەوەی بدرێتەپاڵ خەڵکانیتر بۆ ئەوەی لە خۆ لادرێ ئەمە لای دەروونناسان بە ئیسقات ناسراوەو بە فێڵێکی بەرگری ناسراوە تاکەکەس پەنای بۆئەبات کاتێك بیەوێت لەو دەرون ئاڵۆزییە خۆی ڕزگارکات کە تێی کەوتوە، چونکە زاڵبون هەمیشە بۆ بیری بەهێزترە. ئیسلامیش وەك زانراوە لەبیروباوەڕو ڕەوشتدا بەهێزترینە و لەبەهێزی شوێنکەوتوانییەوە نییە وەك ئایینەکانیتر بەڵکو هێزەکەی لەخۆیدایە چونکە ڕاستە و خێرە و ئاسایشە وئارامییە، توشی هیچ لادان و گۆران و ڕوکەشکارییەك نەبووە.

هەر لێرەوە دۆڕانی ڕۆژئاوا لەسەر ئاستی فیکری و رۆحی، لەگەل سەرکەوتنی لە بواری سیاسەت و ئابوری و سەربازی پاڵنەری بووە بۆ دەرچونی لە گفتوگۆو لۆژیك بۆ بەکارهێنانی هێز و تۆمەت بەخشینەوە و گەندەڵکاری ئەوەی ئەیکات هەموی ناهەقی و ستەمکارییە.

ـ پاڵنەری مەعریفی: بریتییە لە بەزیوی ڕۆژئاوا بۆ ڕوبەڕو بوونەوەی لایەنی فیکری ئیسلام، هەرچەندە موسڵمانان بەزیون بەرانبەر ڕۆژئاوا لە بوارەکانی سیاسەت و ئابوری و سەربازی لەم سەردەمەدا.

هەتا ئێستەش ڕۆژئاوا مومارەسەی بیری پەراوێزخستن و فرێدانی بەرانبەری هەیە بە بەردەوامی تانەدان لە قورئان و پێغەمبەرێتی پێغەمبەر، لەهەمان کاتدا ئیسلام تاوانبار ئەکات بەوەی مومارەسەی پەراوێزخستنی بەرانبەر ئەکات.

**بیری ڕۆژهەلاتناسی و هێرشکردنە سەر قورئان:**

لەو ویژدانەی کە قورئان ڕواندویەتی تیاماندا ئەبێت بڵێین ڕۆژهەلاتناسان هەمویان وەك یەکنین، هەیانە لەسەر هەق وەستاوە و بەویژدانەوە مامەڵەی لەگەڵ ڕاستییەکان کردووە، هەیشیانە سنوری بەزاندوە و خراپەی زۆری بەرانبەر ڕاستییەکان کردووە.

لەو بیرۆکە  ڕۆژهەڵاتناسیانەی کە بەشداربوو لە هێرشکردنە سەر قورئان لە ڕێگەی لێکۆڵینەوە قورئانییەکان بوو، نمایش کردنی ئەم نمونانە دەریدەخەن کە قەبارەی دژایەتیکردنەکە  چەندە:

١/  پەڕاوی تیودور نولدکە: {تاریخ القران} geschichte des qorans، لە ناودارترین پەڕاوە کە ڕۆژهەڵاتناس نوسیبێتی لە مێژوی قورئاندا ئەوەی دوای ئەو هاتوە و نوسراوە لە ژێرکاریگەری ئەمدا بووە، ئەم پەڕاوە بوویە ئینجیلی ڕۆژهەڵاتناسەکان و بوویە سەرچاوە بۆ هەموو لێکۆڵینەوەکان دەربارەی قورئان.[١٥]

٢/ پەڕاوی جولد تسیهر بەناونیشانی[١٦]:

،die richtungen der islamtschen koranauslegnug

٣/ پەڕاوی جون وانسبر بەناونیشانی: دراسات قرانیة و طرق تفسیرها

.Quranic studies: sources and methods of scriptural interpretation

لە مەترسیدارترین پەڕاوە و ئەوانەی بەدوایدا  هاتون کەوتونەتە ژێر کاریگەری ئەم پەڕاوە لە لێکۆڵینەوە قورئانییەکان و مێژوی ئیسلامی بەگشتی.

ئەو بانگەشەو فیشاڵانەی کە وانسبر ورووژاندبوی  خۆی نەگرت و دارما لەبەردەم ئەو توێژینەوە  زانستییەی کە توێژەر سەعد عبدالله عەبدولعەزیز کردی  بەناوی{کتابات اسلامیه من مکه المکرمه} ئەم توێژینەوە سەلماندی ئەو هەڵکۆڵراوە قورئانیانەی کە لەمەکە هەیە پوچەڵی بیرۆکەکەی وانسبر ئەسەلمێنن کە ئەڵێ قورئان لەمەکە نەهاتوە.

٤/ پەڕاوی دون ریتشاردسون بەناوی: {اسرار القران} secrets of the Koran  ئەم پەڕاوەش سیاسەت و دیراسانی قورئانی تێکەڵ ئەکات.

٥/ پەڕاوی نیل روبنسۆن بەناوی: اکتشاف القران: مقاربه معاصره لنص محجب.

---

١٥ - ئەم پەڕاوە وەرگێڕراوەتە سەرۆ زمانی عەرەبی

١٦ – ئەم پەرلوە وەرگێرراوە بۆ زمانی عەرەبی لەلایەن  د. عبد الحلیم النجار لەژێر ناوی: مذاهب التفسیر الاسلامی

Discovering the quran: a contemporarg approach to a veiled text

٦/ پەڕاوی کریستۆف لوکسنبورج بەناوی: قراءة سريانية ـ ارامية للقران : مساهمة فی تحليل لغة القران.

Die syro _aramaische lesart des Koran ein beitrag zur entschlusselung der quran sprache.

کریستۆف لێرەدا زۆر پێدەچێت ناوێکی خوازراو بێت و ئەم دیاردەی ناوی خوازراو لەم ساڵانەی دواییدا بۆتە شتێکی باو بۆ ئەوانەی هێرش ئەکەنە سەر قورئان لەوانەیە لەبەر ترسی پەرچەکرداری ئیسلامییەکان بێت دژی ئەوانەی زماندرێژی و ناهەقی بەرانبەر قورئان ئەکەن.

٧/ پەڕاوی ئیبن ورراق بەناوی: بۆچی من موسڵمان نیم؟

why I am not a muslim ?

ئەم پەڕاوەش بەبەرنامەیەکی زانستیانە ڕەخنەی زۆر توند و بەهێز لە ئیسلام ئەگرێت بیّ ئەوەی لە ناوەڕۆکدا هیچی ڕاست بێت.

ئەمە مشتێك بوو لە خەروارێك حەزمکرد خوێنەری بەڕێز ئاگاداربکەم لەو هێرشە درندانەی کە لەدژی قورئان ئەکرێت، وەسفێك نابینم بۆ ئەم بوختانانە بشێت باشتر لەم ووتەی پایەدار مامۆستا محمود محمد شاکر کە ئەڵێت: ناحەزان مەبەستیان نەبوو ڕۆشنیری بە ڕۆشنبیری وەڵام بدەنەوە یان وێڵبونێك بە ڕێنمونی چارەبکەن یان ناهەقێك بەهەقێك ببەزێنن یان هۆکاری لاوازی بە هۆکاری بەهێز بسڕنەوە بەڵکو مەبەستی سەرەکی و کۆتاییان ئەوەبوو کە لە گۆڕەپانی ڕۆشنبیری جیهانی ئیسلامیدا کوژراو بریندارێکی زۆربخەن و نەتوانن هەستنەوە و لەشوێن ئەواندا کۆمەڵێك دابنێن دەرك و ژیریان کارنەکات بەوشێوە نەبێت کە ئامارەیان بۆ ئەکرێت، تاوانی ئەوان لە تێکشانی گەورەترین ڕۆشنبیری مرۆڤایەتی کە تائیستە ناسرابێت وەك تێکشاندنی دەوڵەتەکانە و

نەتوانرێ من و تۆیی لەگەڵدا بکرێت.، بەڵێ ئـەوەی خـوا مۆڵەتیـدا بـوو دوژمنـان توانیـان سەرکەوِن بەسەرماندا و ئەوەی ویستیان لێیانسەندین.[17]

**قورئان تا دێت هێز و بڵندی زیادتر دەبێت بەرانبەر گومان و بوختانەکان:**

هەرکەس سەیرێکی مێژوی قورئانی پـیرۆز بکـات لەهـەموو کـات و سـاتێکدا ئـەبینێت هـەرکات هێرشـەکان تونـدتر بـوبن زیـاتر ڕاسـتیەکانی قورئـان دەرکـەوتون و بـەهێزتر دەرکەوتوە، ئەم ڕاستیە گەشتۆتە ڕادەی ئیعجاز چونکە قورئان هەر خۆی هیچ گومان و ناهەقییەك وەرناگرێت و پوچەڵی دەکاتەوە! وەك لە سورەتی فوسیلەتدا هاتوە:{٤٢}

ئایەتـەکانی قورئـان لەسـەر قەناعـەت بەعـەقڵ و لەسـەر ئـارامی دڵان ئـیش ئـەکات، هەروەها لەسـەر هـەڵماڵینی ڕوی درۆ و بوختانـەکان ڕاوەسـتاوە بـۆ ئـەوەی هەرکەسێك بـاوەڕی پێـدەهێنێ لەسـەر چـاوڕوونی بێـت و ئەوەیشـی پێـی کـافر ئـەبێت هـەر لەسـەر چاوڕونی بێت.

قورئــان خــۆی سەرکەشــەکان ئــەدوێنێ، چــونکە دوانگــەی خوایــە لەگــەڵ دروستکراوەکانی و خۆی باشیان ئەناسێ لەئایەتی(١٤)ی سورەتی (الملـك)دا ئەفـەرموێ: ﴿ أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٤﴾ ﴾، مەگەر خوا نازانێت کێی دروست کردووەو چۆنی دروست کردووە، لەکاتێکدا ئەو زاتە وردکارو بە سۆزو ئاگایە. لەقورئاندا نمونـەی ڕێنـوێن هەیە بۆ کەسی ملهوڕ ، وەك گفتوگۆ لەگەڵ نمرود کەلە سورەتی بەقەرەدا هاتوە:

﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِى حَآجَّ إِبْرَٰهِـۧمَ فِى رَبِّهِۦٓ أَنْ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلْمُلْكَ إِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّىَ ٱلَّذِى يُحْىِۦ وَيُمِيتُ قَالَ أَنَا۠ أُحْىِۦ وَأُمِيتُ ۖ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَأْتِى بِٱلشَّمْسِ مِنَ ٱلْمَشْرِقِ فَأْتِ بِهَا مِنَ ٱلْمَغْرِبِ فَبُهِتَ ٱلَّذِى كَفَرَ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٢٥٨﴾ ﴾ ( البقرة)،

١٧ – لە ووتەیەکیدا دەربارەی ئیعجازی قورئـان، لـە پێشـەکی پـەراوی مالـك بـن نبـی{الظـاهرة القرانيـة}لـە وەرگێرانی مامۆستا و دکتۆر: عبدالصبور شاهین لا٢١.

ئایا نەتبیستووە و نەتڕوانیوەتە ئەو کەسەی دەمەقالەی دەکرد لەگەڵ ئیبراهیمدا لە بارەی پەروەردگاریەوە لەبەر ئەوەی خوا پاشایەتی پێبەخشی بوو، (لە جیاتی باوەڕهێنان و سوپاسگوزاری کەچی دەمە دەمێی دەکرد لەگەڵ ئیبراهیمدا)، (ئەم لووت بەرزیەشی کاتێك بوو بە هەواو فیزاوە پرسیوویەتی لە ئیبراهیم کە پەروەردگاری تۆ کێیە؟ ئەویش لە وەڵامدا وتی: پەروەردگاری من ئەوزاتەیە کە ژیان دەبەخشێت و مردنیشی بەدەستە، (نەمروود لە وەڵامیدا) وتی: جا منیش ژیان دەبەخشم و مردنیشم بەدەستە، (ئینجا فەرمانیدا هەندێك لە نەیارانی بکوژن گوایە ئەوە دەیانمرێنێت، هەندێکیشی نەکوشت گوایە ئەوە ژیانی پێبەخشین! !)، ئەوسا ئیبراهیم وتی: بەڕاستی خوا خۆر لە ڕۆژهەڵاتەوە دەهێنێت جا (ئەگەر تۆ دەتوانیت) لە ڕۆژئاواوە بیهێنە، ئینجا ئەو بێ باوەڕە ڕەنگی پەڕی و دەمکوت کراو وەڵامی نەما، بێگومان خوا هیدایەتی قەومی زاڵم و ستەمکار نادات. لەبەر ئەوەی قورئانی پیرۆز پەڕاوی ڕێنمونییەهەموو ئایەتێك بەڵکو هەموو ووشەیەك و هەموو پیتێکی نهێنییەك لە نهێنییەکانی ڕێنمونی خوایی لەخۆگرتوە ئەگەر گەیشتە دڵ و عەقڵیش لێی ڕاما ئەوا لەوێدا ئەگاتە پەناگای ئارامی و ڕاستییە نەبڕاوەکە و بەخێرایی وەڵامی ئایەتەکان ئەداتەوە دوای ئەوەی لێوانلێو ئەبێت لە باوەڕ و متمانە.

منیش بێگومانم و بەدڵ و عەقڵ و ئەزمونیش کە هێرشی ئەم سەردەمەش وەك جاران لە بەرژەوەندی قورئان تەواو ئەبێت و سەرکەوتنیش بە دەرەنجامەکان ئەپێورێت دەرەنجامەکانیش ئەمانەن:

یەکەم: دوای هەموو هێرشێك سەرنجی زیاتر بۆ لای قورئان ڕائەکێشرێت و دوای ئەوەش خاوەن عەقڵە پێگەیشتوەکان زیاتر لێکۆڵینەوە و ڕامان ئەکەن لە قورئان ، لەبەر ئەوەی قورئانیش لای خواوەیە و ڕاستە و وەك قسەی خەڵکی نییە بۆیە دڵ و عەقڵە تیژەکان بۆلای خۆی ڕائەکێشێ و چەنەها کەس هەبون بەدڵی پڕ لە گومانەوە هاتون

بـۆلای قورئـان بـەڵام قورئـان چـوەتە ناودڵیـان و بـە بـاوەڕی پتـەو و بـە قورئانـەوە گەڕاوەتەوە.

دووەم: موسڵمانان لە خەوی بێئاگایی هەڵدەستێنێ و دوای ئەوەی پشتیان لە قورئان کردبـوو بـە ڕەوشـت و کـردار دێنـەوە و حـاڵی خۆیـان چـاك ئەکەنـەوە، ئەبنـەوە بـە ئاوێنەیەکی پاك و دیسانەوە ئەو خێرداریی‌ەی خوا لەوانی وویستوە بـەدەستی دێننەوە.

﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ ۗ وَلَوْ آمَنَ أَهْلُ الْكِتَابِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُم ۚ مِّنْهُمُ الْمُؤْمِنُونَ وَأَكْثَرُهُمُ الْفَاسِقُونَ ﴿١١٠﴾ ﴾ ( ال عمران)،

بەڕاستی ئێوە چاکترین ئوممەتێکن کە (بۆ سوودی) خـەڵکی هێنراونەتـە مەیدانـەوە، چونکە فەرمان بەچاکە دەدەن و قەدەغەی خراپـە دەکـەن و بـاوەڕی دامـەزراوتان بخـوا دەهێنن، خۆ ئەگەر خاوەنانی کتێب باوەڕیان بهێنایە (بە ئاینی ئیسلام) ئەوە چاکتر بـوو بۆیان هەیانە ئیماندارن، بەڵام زۆربەیان گوناهبارو تاوانکارن.

هەستکردنی موسڵمانان بە مەترسی وایان لێدەکات پـەنا بـۆ خـوا ببـەن و لێـی نزیـك ببنەوە و بگەڕێنەوە.

لەهەموو هێرشەکانی پێشوو هەر لەسەرەتای دابەزینی قورئانەوە زاڵبـوون بـۆ قورئـان بووە، کاتێـك بێباوەڕەکـان ویسـتیان کـەس گـوێ لـە قورئـان نـەگرێت وەك اە سـورەتی فوسیلەتدا ئەفـەرموێت: ﴿ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَا تَسْمَعُوا لِهَٰذَا الْقُرْآنِ وَالْغَوْا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ ﴿٢٦﴾ ﴾ (فصلت)، بێ باوەڕان دەیانوت: گوێ مەگرن بـۆ ئـەم قورئانـە و بیکـەن بەگاڵـە و هـەرا و هوریا (لەم سەردەمەدا ئەو ڕاگەیاندنەی بەدەست ناحەزانەوەیـە ئـەو ڕۆڵـە دەبینێـت) بـۆ ئەوەی ئێوە زاڵ ببن و بیبەنەوە. ڕووبەڕووبونەوە ی یەکلاکەرەوە ئەم ئایەتەی قورئانە کـە ئەفەرموێ: ﴿ وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٢٣﴾ ﴾ (البقرة)، جا ئەگەر ئێوە لە دوو دڵیدان و گومانتـان لـەم

(قورئانە پیرۆزە) هەیە کە دامانبەزاندووە بۆ بەندەی خۆمان محمدﷺ ئەگەر بۆتان دەکرێت ئێوەش هەوڵ بدەن سوورەتێکی وەك ئەو بهێنن، هاوپەیمان و هاوکارەکانیشتان جگە لە خوا (بۆ ئەو مەبەستە) بانگ بکەن ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن.

کاتێك پاڵەوانەکانی ڕەوانبێژی نەیانتوانی گومان لەسەر قورئان بچەسپێنن هاتن داوای پێکهاتن و ڕێککەوتنیانکرد! داوایانکرد پێغەمبەر ئایەتەکان بگۆڕێ بە ئایەتیتر کە ئەوان پێی ڕازی بن:

﴿ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا بَيِّنَاتٍ ۙ قَالَ الَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَاءَنَا ائْتِ بِقُرْآنٍ غَيْرِ هَٰذَا أَوْ بَدِّلْهُ ۚ قُلْ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أُبَدِّلَهُ مِنْ تِلْقَاءِ نَفْسِي ۖ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰ إِلَيَّ ۖ إِنِّي أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٥﴾ ﴾ ( یونس)

کاتێکیش ئایەتەکانی ئێمە کە ڕوون و ئاشکرایە بەسەریاندا بخوێنرێتەوە، ئەوە ئەوانەی کە بەتەمانین ئامادەی بەردەم بارەگای ئێمە ببن دەڵێن: قورئانێکی جگە لەمە بهێنەو بیخوێنەرەوە، یان بیگۆڕە (بەشێوەیەکی تر)، تۆیش ئەی محمدﷺ پێیان بڵێ: من بۆم نیە لەخۆمەوە ئەوە بیگۆڕم، من شوێنی هیچ شتێك ناکەوم جگە ئەوە نەبێت کە بەوەحی پێم دەگات، بەڕاستی من دەترسم ئەگەر یاخی بم لە پەروەردگارم و نا فەرمانی بکەم گیرۆدەی سزایەکی سەختی ڕۆژێکی زۆر گەورەببم.

خوای گەورە پێغەمبەرەکەی پاراستوە لەوەی ئایەتێك یان حەرفێك یان خوێندنەوەکەیشی لەبیر بچێت یان بیگۆڕێت ، ئایەتەکان ئەوە دوپات ئەکەنەوە کە پێغەمبەر زۆر سوربوە لەسەر ئەوەی هیچی لێتێك نەچێت بەڵام خوا بە ئایەت دوای لێکرد پەلە نەکات چونکە ئەو بەفەرمانی خوا هیچی لەبیرناچێت ﴿ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُ وَقُرْآنَهُ ﴿١٧﴾ فَإِذَا قَرَأْنَاهُ فَاتَّبِعْ قُرْآنَهُ ﴿١٨﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُ ﴿١٩﴾ ﴾ (١٧ و ١٨ی قیامة)، بەڕاستی لەسەر ئێمەیە کۆکردنەوەو خوێندنەوی.جا کاتێك ئێمە دەیخوێنینەوە تۆش شوێنمان بکەوە لە

خوێندنەوەیدا.پاشان بەڕاستی ڕوون کردنەوەشی لەسەر ئێمەیە. ﴿ سَنُقْرِئُكَ فَلَا تَنسَىٰٓ ﴿٦﴾ ﴾ (الاعلی)، ئەی محمد ﷺ ئێمە قورئانت لە ڕێگەی جوبرەئیلەوە بەسەردا دەخوێنینەوە، ئیتر هەرگیز بیرت ناچێت.

(لا) ـ لێرەدا نافییەیە نەك ناهییە چونكە ئەگەر ناهیە بوایە ئەبوو حەرفە عیللەكەی كۆتایی فعلەكە نەمایە و واتای ئایەتەكە ئەوەیە: كە ئێمە ئایەتەكان بەسەر تۆدا ئەخوێنین تۆ ئیتر هیچیت لە بیرناچێتەوە.

ئایەتەكان بۆ هەموو هۆشدارێك ئەوە ئەسەلمێنن كە ئەم ئایینە كاری مرۆڤ نییە و عەقلی خەڵكی بەهەرمی نەهێناوە بەڵكو لای خواوە دابەزیوە، بێباوەڕەكان دەسەوسانی خۆیانیان نەئەشاردەوە لە ڕووبەڕووبونەوەی قورئان بۆیە ئەیانووت: سیحرە! وەك چۆن كاتێك خاوەن زمانێكی پاراو و دانایەكیان ناردە خزمەتی پێغەمبەر ئەویش عەتبەی كوڕی ڕەبیعەبوو، كاتێك عوتبە گوێبیستی ئایەتەكانی بوو دڵی بەرەو ڕێگا ڕاستەكە ئەهات و گەڕایەوە لای سەرانی قورەیش هەواڵی پێدان: كە ئەوەی موحەمەد ئەیخوێنی قسەی مرۆڤ نییە.... ئەوانیش ووتیان : ئەی باوكی وەلید سیحری لێكردوی.

ساڵەكان و سەدەكان تێپەر ئەبن و قورئان ڕووبەڕووی هێرشێكیتر لە گومان و دژایەتی ئەبێتەوە! ئەویش هێرشی خاچپەرستەكانبوو و كۆمەڵێكی زۆر لە ڕۆژهەلاتناسان دەستیان كردە نوسین دژی قورئان و پەڕاوێكیان بەناوی {پەرچدانەوەی قورئان}نوسی، هەندێكیتر هاتن و لەفزەكانی قورئانیان وەرگێڕایە سەر زمانی لاتینی بۆ ئەوەی هەنگاوێك بێت بۆ ئەوەی لادان و گۆڕانكاری تێدا دروست بكەن، ئەو هەوڵانە هەموی بەباچوون و قورئان زیاتر بەرزبویەوە.

سەرەڕای ئەو فەرمودانەی كە دوژمنانی ئیسلام دروستیانكردوە و خزاندویانەتە ناو سوننەتەكانی پێغەمبەر بۆ ئەوەی دژایەتی قورئانی پێبكەن بە ڕاستەوخۆ یان

ناڕاستەوخۆ دەربارەی نوسەرەکانی وەحی، زانایانی فەرموده ئاگاداریانداوه دەربارەی ئەو هەڵبەستراوانه و فەرموده نەبونیان.

لە سەردەمی ئێستاشدا قورئان ڕوبەڕوی هێرشێکی هەمەلایەنەی تاکەکەسی و دامەزراوەی زانستی و کۆمەلآیەتی بۆتەوه، بەڵکو لەر ئاستی نەتەوەیی بە وورووژاندنی گومان و نوسینی قورئانی هەڵبەستراو.

لێرەدا جێگەی باسه بڵێین لە تایبەتمەندییەکانی قورئانه لەناو هەموو پەڕاوەکانی ئاسمان و زەویدا که شوێنکەوتەکانی لە دڵیاندا بە پاریزراوی هەڵیانگرتووه و لەنێوان موسڵمانان به نوسراو بەلەبەرکراوی ئەیگوێزنەوه و نەبوه و ناکری گوڕانکاری خۆی لێبدا ، بەڵکو نوسخەی هەڵگیراو لەناو سینەکاندامەمو هەولێك پوچەڵ دەکاتەوه ئەگەر بیانەوێت بیخەنە ناو نوسینەکانەوه، پاك و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی فەرمویەتی:﴿ إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ۝٩ ﴾ (الحجر )، بەڕاستی هەر ئێمه قورئانمان دابەزاندووەو بێگومان هەر ئێمەش پارێزگاری دەکەین و (نایەڵین دەستی خیانەتکار هیچ جۆره دەستێکی تیَ بخات و هەموو هەولێك بۆ دەستکاری کردنی نەزۆکه).

بێگومان پارێزراوی قورئان ناگەڕێتەوه بۆ هەوڵ و کۆششی خەڵکی و بۆ شوێنی عەرەب و موسڵمانانیش ناگەڕێتەوه، چونکە موسڵمانان بەچەندەها قۆناغی سەخت و دژواردا تێپەڕیوه و لاوازبوه ئەگەر پارێزراوی قورئان پەیوەندی به موسڵمانانەوه هەبوایه سەدان ساڵ پێش ئێسته نەمابوو، بەڵکو تەنها الله که خاوەنی قورئانه و خاوەنی هەمو جیهانەکانه پاراستویەتی:﴿ إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ۝٩ ﴾ (الحجر).

هەر لێرەوه زۆر پێویست بوو قورئان خۆی ڕوبەڕوی گومانەکان بکرێتەوه لە پرۆژەی{زانیارینامەی ڕونکردنەوەی ئیسلام: وەلآمی گومان وهەڵبەستراوەکان} بۆ هەڵوەشانەوەی ئەو گومانانەی کە لەسەر باشترین پەڕاو دروستکراوه بۆ باشترین نێرراوەکانی که موحەمەده درود و سەلامی خوای لێبێت.

ئـەم بەشـەی زانیارینامەکـە نـۆزدە بەشـە لـە یـازدە بەرگـدا و لەگـەل بـەرگێك بـۆ ناوەڕۆکەکان و گومانەکانیش بەپێی بابەت ڕیزبەندیان بۆ کراوە بەمشێوەیە:

بەرگی یەکەم: بەشی یەکەم: ئەو گومانانەی قورئان خۆی وەڵامی داوەتەوە.

بەرگی دووەم: بەشی دووەم: ئەو گومانانەی ووتراوە هەڵەی زمانەوانییە لە قورئاندا.

بەرگی سێیەم:بەشی سێیەم: ئـەو گومانانـەی دەربـارەی مێـژوی ئیسـلامین،١/ پـێش ئیسـلام، ئیسـلامیەتی هـاوەڵان، کۆچـەکانیان، جیهـانیبونی ئیسـلام و بڵاوبونـەوەی، جێنشینی ئەبوبکر.

بەشـی چـوارەم: گومانـەکانی سـەر مێـژوی ئیسـلامی: ٢/ جینشـینی عومـەر، فیتنـە گەورەکە، جێنشینی ئەمەوییەکان، جێنشینی عەباسییەکان.

بەشی پێنجەم: گومانەکان دەربارەی یاسا ژیارییەکان لە ئیسلامدا

بـەرگی چـوارەم: بەشـی شەشـەم: گومانــەکان دەربـارەی بیروبـاوەڕی ئیسـلامی و پرسەکانی یەکخواپەرستی ئلوهییەت و ربوبییەت و ئەسمائو سیفات.

بەشی حەوتەم: گومانەکات دەربارەی بـاوەڕ و دینـداری{باوەڕپـەنادیارەکان، قـەزا و قەدەر، کۆمەڵ و مەزهەبە فیکرییەکان}.

بەرگی پێنجەم: بەشی هەشتەم: گومانەکان دەربارەی بەراوردی ئایینەکان.

بەرگی شەشەم: بەشـی نۆیـەم:گومانـەکان دەربـارەی پێغەمبـەران لـە ئادەمـەوە بـۆ موسا.

بەشی دەیەم: گومانەکان دەربـارەی پێغەمبـەران لـە داودەوە بـۆ موحەمـەد سـەلامی خوایان لیبێت.

بەرگی حەوتەم: بەشی یازدە: گومانەکان دەربارەی سەلامەتی و تەواوی قورئان.

بەشی دوازدەیەم: گومانەکان دەربارەی پاریزراوی و تێروتەسەلی قورئان.

بەرگی هەشتەم: بەشی سیازدە: گومانەکان دەربارەی پەرستش و مامەڵە داراییـەکان لە ئیسلامدا.

بەرگی نۆیەم: بەشی چواردە: گومانەکان دەربارەی پەیوەندییە نێو دەوڵەتییەکان لـە ئیسلامدا{ جیهاد، کۆیلایەتی، و کەنیزەك، پەیوەندی ئاشتیانە}.

بەشی پازدەیەم: گومانەکان دەربارەی سیاسەتی سزا لە ئیسلامدا{ حەدەکان، سـزا، تۆڵە، نرخی خوێن، تەعزیرەکان}.

بەرگی دەیـەم: بەشـی شـازدە: گومانـەکان دەربـارەی ڕەسـەنی شـەریعەتی ئیسـلام و پاشکۆنەبوونی.

بەشی حەڤدەیەم: گومانەکان دەربارەی مرونەتی شـەریعەتی ئیسـلام و گونجـاوی بـۆ هەموو کات و شوێن و بارودۆخێك.

بەرگی یازدەیەم: بەشی هەژدە: گومانەکان دەربارەی ژنان و مافیان لە ئیسلامدا.

بەشی نۆزدەیەم: گومانەکان دەربارەی حوکمەکانی خێزان لە ئیسلامدا.

بەرگی دوازدەیەم: بەشی بیستەم: ناوەڕۆك.

بەشی بیست و یەکەم ناوەڕۆك.

لەخوا داواکارین ئەم کارە سودی هەبێت و ئەوانەی پێی هەستاون باشترین پاداشتیان بداتەوە﴿ .. رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١٢٧﴾ ﴾ (البقرة) پەروەردگارا ئەم کارەمـان لێ وەربگرەو لـە ڕیـزی چاکەکانماندا تۆمـاری بکـە، چـونکە بەڕاسـتی تـۆ خوایـەکی زۆر بیسەرو زانایت. سلاو و سەلامیش لەسەر پێغەمبەر و خێزانی و یارانی.

موحەممەد داوود

## بەرنامەی قورئان بۆ وەڵامدانەوەی نەیارانی:

سوباس و ستایش بۆ خوای جیهانیان و درود و سەلام لەسەر پێغەمبەری خوا و پاشان:

لەسەردەمی ئێستاماندا بەتایبەت لەم چەند دەیەیەی کۆتایی ئیسلام ڕوبەڕوی گێژەڵوکەیەکی زۆر بەهێز بوەتەوە لە هاشوهوش و درۆ و بوختان بەرانبەر قورئان و پێغەمبەر و مێژوی ئیسلام و شەریعەت و بیروباوەڕ و ڕەوشت و نەگۆڕەکانی.

دوژمنانی ئیسلام مەبەستیان لەم هێرشە چڕوپڕو هەمەلایەنە ئەوەیە وێنەی ئەوانە لای موسڵمانان و جگە لەموسڵمانان بشێوێنن و بیروباوەڕی تازە ئیمانداران بلەرزێنن، ئەمەش تەنها لەبەر ئەوەیە ئیسلام بەدوژمنی سەرسەختی خۆیان دەزانن کە ئەبێت دژایەتی بکەن و زاڵبن بەسەریدا.

هەر لەبەر ئەمەیە دوژمنانی خوا ئەبینین لەهەموو لایەکەوە ئیسلام تیرباران ئەکەن، ئەیانەوێت لە کەسایەتی پێغەمبەر و مێژوی ئیسلام و شارستانییەتەکەی بدەن، بۆ گەیشتن بەمە ئەنیشن بە ساتە لاوازەکانی مێژوی ئیسلامیەوە و تیشك ئەخەنەسەر ناکۆکی و پشێوییەکانی هەروەها کەسایەتییە هەڵکەوتوەکانی ئیسلام ئەڕوخێنن وەك ئەبو هورەیرە و شافیعی و غەزالی و وئیبن تەیمییە و جگە لەوانیش لەگەڵ ئەوەدا بەشانی کەسانێکدا هەڵئەدەن کە لەگەڵ پیلانەکانی ئەواندا دێتەوە، ئەوەشیان بەهەلزانیوە کە موسڵمانانی ئێستە لاوازن لە بواری توێژینەوەی زانستیدا و شکستەن لەوەی هۆکارەکانی هەستانەوە بگرنەبەر، ئەو قین لەدڵانە ئەیانەوێت لە قورئانیش بدەن لە ڕێگەی ئەوەی وەسفی بکەن بە بوونی دژەوانە و هەڵەی تێدایەو پێچەوانەی عەقڵ و زانستی سەردەمە و قسەی هیچ و پوچیتر.

ئەم گرنگیدانەیان بەقورئان لەبەر ئەوەیەقورئان سەرچاوەی بەرزی و تازە بونەوەی موسڵمانانە، قورئان هەرگیز جوانییەکانی کۆتایی نایەت، بە زۆر ووتنەوە کۆن نابێت بەڵکو ئیماندار هەمیشە دڵنیایی و ئارامی پێ زیاد ئەکات، تا شەوو ڕۆژ مابێت ئەویش بە موعجیزەیی ئەمێنێتەوە و خوا خۆی قورئان بە پارێزراوی ئەهێڵێتەوە:﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿٩﴾ ﴾ (الحجر)، بەڕاستی هەر ئێمە قورئانمان دابەزاندووەو بێگومان هەر ئێمەش پارێزگاری دەکەین و (نایەڵین دەستی خیانەتکار هیچ جۆرە دەستێکی تێ بخات).

ئەم پلەو شکۆیەی قورئان وای لە دوژمنانی کردوە هێرشی بەکۆمەڵ بکەنە سەری و درۆ و بوختان و گومانی بۆ دروست بکەن چونکە ئەزانن ئەگەر گومان لەسەر پەڕاوی پیرۆزی موسڵمانان بچەسپێ ئیتر موسڵمانان لە گەردنگیریان بۆ ئیسلام پەشیمان ئەبنەوە، قورئان بناغەی ئەم ئاینەیە بۆیە شەر دژی قورئان مەترسیدارترین جەنگە و لاواز بوونی بناغە واتە لاوازبون و دارمانی هەموو کۆشك و ئەمە هەموو خاوەن ژیرییەك ئەیزانێ، بۆیە لەهەرە پێویستیەکانی ئێستەیە کە زانستێکی تازە بینابکرێت بۆ ڕووهەڵماڵین و ڕەواندنەوەی گومانەکان و ڕاستکردنەوەی هەڵە و چەمکەکان و ..

ئەم زانستە ئەبێت فیکر تیایدا ئازاد بێت و خوێندنەوە بکرێت بۆ هەموو زاراوە باوەکان و بۆ چونی ئیسلام لەو بارەیەوە ڕوون بکرێتەوە، بە شێوەیەکی ڕوون چەمکەکانی ئیسلام بخرێتە ڕوو.

ئێمە لێرەدا پێڕەوی قورئان لە دواندنی بەرانبەرەکانیدا ئەخەینە ڕوو و تایبەتمەندییەکانیشی بۆ بانگکردنی بەرانبەرەکانی دەرئەخەین، پاشان ئەو بنەماو یاسایانەی کە قورئان دایڕێژاوە بۆ گفتوگۆ لەگەڵ نەیارانی ئەکەینە چرای ڕێگای وەلاَمدانەوەمان بۆ دژەکان لە نێوەندی گفتوگۆی فیکری لەسەر هەموو ئاستەکان.

بێگومان زمانی گفتوگۆ لە ئێستادا ناوەندە فیکرییەکانی گرتۆتەوە، ئەمەش نمونەیە بۆ ئەو لایەنە لە بەرنامەی قورئان بۆ بانگکردنی خەڵکی بۆ بنەماکانی، بەرنامەی قورئان بۆ گفتوگۆ روونە و هەنگاوەکانی رێکخراوە و یاساکانی بۆ دەرخستنی هەقیقەتی هەرشتێك دیاریکراوە، بەڵگە دانان و برینی بیانوی بەرانبەر و راستکردنەوەی هەڵەکانیش لەبەرنامەکەدا هەیە.

ئەم هەنگاوە رێکخراوانە و ئەم یاسا پێرەوکراوانە لەهەموو پرسە چارەسەرکراوەکاندا لەقورئاندا بونی هەیە، وەك پرسی یەکخوا پەرستی و پێغەمبەرایەتی و پەیام و کوفر و دابەزینی قورئانی پیرۆز و ئەحکامی شەریعەت و رووبەروبونەوەی نەفامی.

قورئان لە گفتوگۆی لەگەڵ بەرانبەردا خەڵك بانگ ئەکات بۆ بینین و ووردبونەوە، بۆ ئەزمون و بەکارهێنانی ژیری و کۆکردنەوەی بەڵگەو پرس لە تایبەتمەندەکان ، خەڵك بانگ ئەکات بۆ ئازادی لە کۆتی ئارەزوەکان و لەو بانگەشانەی تەنها لەسەر گومان دامەزراون و هیچ بەڵگەیەك پشتگیریان ناکات، بەرانبەرەکەی بانگ ئەکات بۆ رامان و تێگەیشتن لە بەڵگەو بینراوەکان و نمونەکان، بۆ وازهێنان لەدەمارگیری، بۆ خوێندنەوەی مێژوو واقیع، بۆ وازهێنان لەنکولی و درۆ و بوختان، وازهێنان لە چاولێکەری و هەڵەبازی، بانگیان ئەکات بۆپەندگیری و تێگەیشتن لە ئامانجەکان و پێشبینی دەرەنجامەکان بە هۆی سەرەتاکانەوە و جگە لەم بەڵگانەیتری عەقڵ.

ئەتوانین لەم چەند دێرەی داهاتودا تایبەتمەندی بەرنامەی قورئان لە بانگکردنی بەرانبەردا و دواندنی بۆیان بخەینەروو:

١/ گشتگیری: قورئان دەرونی مرۆڤی پاراوکردوە بەهەموو ئەو بەڵگە بەهێزانەی کە بەڵگەن لەسەر راستی و دروستی یاساو رێنمایی و بنەماکانی کە خەڵکی بۆ بانگ ئەکات، عەقڵ و دەرون و ویژدانی مرۆڤی تێرکردووە و نمونەی بۆ هێناوەتەوە و بەڵگەکانی جۆراوجۆرن و دوپاتیکردونەتەوە و بەڵگەی بیانوبری داناوە، بەرنامەی مێژوویی و عەقڵی

و گوازراوه و و کرداری و پۆچەڵکردنەوەی بانگەشەی دژەکانی، فەلسەفەی فەرمانەکانی خوای ڕونکردۆتەوە، بەرانبەر بانگ ئەکات بۆ ڕامان لە ئایەتەکان دور لە دەمارگیری و لاساییکردنەوە و جوینەوەی بیرە کۆن و بەسەرچوەکان، وەڵامەکانی کورت و گەیەنەرن، بۆیە بەڵگەکانی گشتگیر و دەوڵەمەند و تێروتەسەلن، واز لە مرۆڤ ناهێنن تا قەناعەتی پێنەکەن، قورئان بەڵگەی لەسەر هەموو شتێك داناوە.

٢/ ڕوونی: لەگەڵ گشتگیری بەڵگەکان ئەبینین ڕوونیشن ، نزیکن لە عەقڵ و دڵی مرۆڤ، قورئان وەك ڕێڕەوی نادیار و ئاڵۆزی فەیلەسوفەکان یان وەك دەمەدەمێی موتەکەلیمەکان نییە، بەڵکو بەڵگەی زۆر نزیك لەهەموو ئاستە جیاوازەکانی تێگەیشتنی خەڵکی هێناوە، زانا گوێبیستی ئەبێت ملکەچ ئەبێت و کەسێکی ئاساییش بەهەمانشێوە، دەمارگیر خاوئەکاتەوە و خاوەن بیری دروستیش باوەڕی پێدەهێنێ، بەڵگەکانی قورئان چارەی دەرونی مرۆڤ ئەکەن و بەکورتترین ڕێگا ئەیبەن بۆ هیدایەت، کەسی نکولیکار ناتوانێ وەك هاوشانێك بەربەرەکانێ و چەلەحانێ بەرانبەر قورئان بکات.

٣/ بەدواداچوون: قورئان هەموو بەڵگەیەکی هێناوە بۆ هەموو ئەو پرسانەی کە بانگەشەی بۆ ئەکات، بەڵگەیەك نییە کە دانپێنەر بێت و نەیهێنابێت، ئەمەش بۆ ئەوەیە مرۆڤەکان پەروەردە بکات و پێی بگەیەنێت ، بەڵگە بەدوای بەڵگە ڕیز ئەکات تا قەناعەتی تەواو بۆ بەرانبەرەکەی دروست ئەکات و تەسلیمی خوای ئەکات، وەك ئەوەیە قورئان هەموو کەلێنەکان بۆ گومڕا بوون کوێربکاتەوە، تا مرۆڤ ڕێك بۆ خوا ڕائەوەستێ .

٤/ دوپاتکردنەوە: ئەمەش لە تایبەتمەندییەکی دیاری قورئانە، قورئان بۆ بابەتێك بەڵگەی زۆر دەهێنێت بۆ ئەوەی ئەوکەسەی بەڵگەیەك نایگرێت لەبەڵگەی دوای ئەو گیربێت، یان ئەگەر لە بیانویەك ڕایکرد بیانوی دوەم بێتە پێشی.

دوپاتبونەوەی بەڵگەکانیش بە شێوازی جیاوازە بەشێوەیەك مرۆڤ کاتێك بەڵگەیەکی عەقڵی ئەبیستێت و ڕایئەکێشێ بەڵگەیەکیتری جیاواز بەشێوازێکیتری جیاواز ئەبیستێ کە قەناعەتی زیاتر ئەبێت و هەموو بەڵگەکان ناکرێت خەڵك لێیان بێ ئاتاج بێت.

دوای ئـەوەی گـرنگترین پێـرەوی قورئانمـان بـۆ گفتوگـۆی بەرانبـەر و بانگکردنیـان ڕوونکردەوە، ئەبێت گرنگترین یاسای قورئانی بۆ گفتوگۆ بخەینە ڕوو کە زیاترە لە بیست یاسا و هەڵێنجێنراوە لە دوانگەکانی قورئان بۆ بەرانبەرەکانی.

## یاساکانی قورئان و گفتوگۆی نەیارەکانی:

**١/ پەرچدانەوەی بانگەشە بێ بنەماکـان و فڕێـدانی ئەو بوختانـانەی بـێ بەڵـگەن:** ئەمـە بنەمایەکی سەرەکییە قورئان بڕیاری لەسەرداوە و زیاد لە جارێك ئاگاداریداوە دەربارەی، لای قورئان ئەوە هەقـە کـە بەڵگـەی یەکلاکـەرەوەی لەسـەر هاتبێـت، ئەوانـەی خـاوەنی بەرنامەی زانسین بۆ بیرکردنەوە هـەمویان لەسـەر ئـەو بنەمایـە ڕێککـەوتون ، بۆیـە هـەر بانگەشـەیەك بــێ بەڵگــەبێت ئــەوا ئەدرێتــەوە بەســەر خاوەنەکەیدابەهــەمان شــێوە بوختانەکانیش هەر بەبوختان و قسـەیەکی بـێ بنـەما هـیچ ئەرزشـێکی نییـە لای خـاوەن ژیرییە ساغەکان، بەمشێوە قورئان فێری ڕێگا ڕاستەکانی توێژینەوە و ڕامانمان ئەکات بۆ چەسپاندنی ڕاستییەکان، زانایانیش ئەم بنەمایەیان بەم دەستەواژەیە داڕشتوە و ئـەڵێن: ئەگەر قسەی خەڵك ئەڵێیتەوە بەڕاستی وەك خۆی نقڵی بکە ئەگەر داهێنـانی خۆتـە ئـەوا بەڵگە بێنە.

بەڵام قورئان پـێش ئـەوان کـەوتوە و ئەفـەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا الْقُرْآنِ مِن كُلِّ مَثَلٍ لَّعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾ (الزمر)، سوێند بێت بەخوا بەڕاستی ئێمە لـەم قورئانـەدا هەموو جۆرە نموونەیەکمان بـۆ خـەڵکی هێناوەتـەوە، بـۆ ئـەوەی یـادەوەری وەربگـرن و بیرێك بکەنـەوە لـە ڕاسـتیەکان و تـێ بگـەن..لەسـەر ئـەم بنەمایەیـە کـە قورئـان هـەموو بانگەشەو قسەیەك ڕەد دەکاتەوە کە بێ بەڵگە بێت، شاعیریش ڕاستی ووتوە کە ئەڵێت:

والدعاوى مالم تقيموا عليها ببينات ابناؤها أدعياء[18]

---

١٨- هەر بانگەشەیەك ئەگەر بەڵگەی بۆ نەهێنرایەوە ئەوە خەیاڵپڵاوی و لافلێدانە

نمونە بۆ ئەم بنەمایە ڕەددانەوەی ئەو بانگەشانەبوو کە گاوڕ و جوو ئەیانووت کەس ناچێتە بەهەشت ئەگەر لەسەر ئاینی ئەوان نەبێت و خوای گەورە لەوەڵامیاندا فەرموی:

﴿ وَقَالُواْ لَن يَدْخُلَ ٱلْجَنَّةَ إِلَّا مَن كَانَ هُودًا أَوْ نَصَٰرَىٰ ۗ تِلْكَ أَمَانِيُّهُمْ ۗ قُلْ هَاتُواْ بُرْهَٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١١١﴾ ﴾ (البقرة)، (جوولەکە و گاورەکان) دەڵێن: هەرگیز کەس ناچێتە بەهەشتەوە بێجگە لە جوولەکە یان گاوڕ، جا ئەوە ئاوات و خەیاڵی خۆیانە (تۆش ئەی محمد ﷺ، یان ئەی ئیماندار) پێیان بڵێ: ئەگەر ڕاستگۆن، بەڵگەتان لەسەر ئەم قسەیە بهێننە مەیدانەوە (ئەگەر ئێوە بەهەشتی بن، ئەوا موسوڵمانانیش بەهەشتیە چونکە باوەڕیان بە موسا و عیسا هەیە).

یان کاتێك ووتیان ئێمە تەنها چەند ڕۆژێك سزا ئەدرێین و خوای گەورە فەرموی{البقرة ٨٠}

یان کاتێك موشریکەکان وتیان ئێمە ئەتوانین وێنەی قورئان بهێنین و خوای گەورە فەرموی: ﴿ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا قَالُواْ قَدْ سَمِعْنَا لَوْ نَشَآءُ لَقُلْنَا مِثْلَ هَٰذَآ ۙ إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٣١﴾ ﴾ (الانفال)، کاتێکیش ئایەت و فەرمانەکانی ئێمە بەسەر بێ باوەڕاندا دەخوێنرێتەوە، ئەوە دەڵێن: بەڕاستی ئێمە بیستمان و ئەگەر بمانویستایە ئەوە وێنەی ئەوەمان دەگوت!!، ئەم بابەتانە جگە لە داستانی پێشینان شتێکی تر نیە!!

خوای گەورە تەحەدایکردن کە ناتوانن وێنەی قورئان تەنانەت دە سورەت یان یەك سورەتیش بهێنن ، کاتێك نەیانتوانی بانگەشەکەیان هەڵوەشایەوە: ﴿ قُل لَّئِنِ ٱجْتَمَعَتِ ٱلْإِنسُ وَٱلْجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأْتُواْ بِمِثْلِ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِۦ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا ﴿٨٨﴾ ﴾ (الاسراء)، ئەی محمدﷺ پێیان بڵێ: سوێند بە خوا ئەگەر هەموو ئادەمیزادو پەریەکان کۆ ببنەوەو (هەوڵی بەردەوام بدەن تا) قورئانێکی وەکو ئەمە دانێن و بیهێننە (مەیدان) ناتوانن کاری وابکەن و ناتوانن لە وێنەی بهێنن، ئەگەر چی هەموو لایەکیان ببنە پشتگیرو یارمەتیدەری یەکتر،هەروەها ئەفەرموێ: ﴿ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۖ قُلْ فَأْتُواْ بِسُورَةٍ مِّثْلِهِۦ

﴿ وَٱدْعُواْ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٣٨﴾ ﴾ (يونس)، بەڵكو (لەگەڵ ئەو هەموو بەلگانەدا) ئەوانە دەڵێن کە محمدﷺ قورئانی هەڵبەستووە، بڵێ: دەئێوەش سوورەتێك وەك سوورەتەکانی دارێژن و بیهێنن، داوا بکەن لەهەر کەسێکی تر کە دەتوانن جگە لەخوا (کەیارمەتیتان بدات) درێغی مەکەن ئەگەر ڕاستگۆن.

بەهەمانشێوە خوای گەورە بەرپەرچی ئەو بانگەشەی جولەکە کاتێك ووتیان خوا فەرزەندی هەیە یان وتیان فریشتەکان کچی خوان: ﴿ قَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدًاۗ سُبْحَٰنَهُۥۖ هُوَ ٱلْغَنِيُّۖ لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِۚ إِنْ عِندَكُم مِّن سُلْطَٰنِۭ بِهَٰذَآۚ أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦٨﴾ ﴾ (یونس)، (خوانەناسان) دەڵێن: خوا منداڵی بۆ خۆی بڕیارداوە ! پاکی و بێگەردی شایستەی ئەو خوایەیە، ئەو زاتە بێ نیازە (پێویستی بە کوڕو کچ نیە)، هەرچی لە ئاسمانەکان و لە زەویدا هەیە هەر خوا خاوەنیانە، بێگومان هیچ بەلگە و نیشانەیەکتان نیە بۆ ئەم بوختانە نارەوایە، ئایا شتێك هەڵدەبەستن بۆ خواو (بێ باکانە) دەیلێن، کە هیچی لێ نازانن و هیچ بنەمایەکی نیە؟! هەروەها ئەفەرموێ: ﴿ مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿١٥٤﴾ ﴾ (الصافات)، ئایا چیتانە و چۆن بڕیاری بێ بەلگەی وا دەدەن.، قورئان سەلماندی کە بانگەشەکەیان بێ بنەماو بەلگەیە تەنها بوختان و نەزانییە و درۆیەکی شاخدارە.

**٢/ فڕێدانی ئەو بانگەشانەی لەسەر وەهم و گومان سازدراون:**

ئەمەش بنەمایەکی قورئانییەو لە بەرنامەی زانستیشدا کۆدەنگی لەسەرە، هەست و ئەگەر و خەمڵاندن ناگەنە ئاستی تیۆر، قورئان پێش ئەمان دوپاتیکردەوە کە گومان هیچ ئەرزشێکی نیە بۆ چەسپاندنی هەق، لێرەوە هەر بانگەشەیەك لەسەر گومان و قاڵەقاڵ ڕاوەستا ئەوا خۆی بۆ خۆی ڕوخاوە و هەموو قسەیەك بەرزنەبێتەوە بۆ نزمترین پلەی زانستی فڕێدەدرێت.

لەو ئایەتانەی قورئان کە نمونەن بۆ ئەمە ئایەتی ١٤٨ی سورەتی (الانعـام) کـە ڕەدی موشریکەکانی داوەتەوە لەوەی کە بیانویان بۆ پەرستنی چەند خوایەك بەوە ئەهێنایـەوە کە کاری قەدەرە و ئەفەرموێ:

﴿ سَيَقُولُ ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ لَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشۡرَكۡنَا وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمۡنَا مِن شَيۡءٖۚ كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ حَتَّىٰ ذَاقُواْ بَأۡسَنَاۗ قُلۡ هَلۡ عِندَكُم مِّنۡ عِلۡمٖ فَتُخۡرِجُوهُ لَنَآۖ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا تَخۡرُصُونَ ١٤٨ ﴾

لەمەودوا موشریك و هاوەڵگـەران دەڵـێن: ئەگـەر خـوا بیویسـتایە هاوەڵمـان بـۆ بڕیـار نەدەدا! ! باوو باپیرانیشمان موشریك نەدەبوون! ! هیچ شتێکیشـمان لـە خۆمـان حـەرام نەدەکرد! ! (ئەمانە هەمووی قسەی بەتاڵە و هەرگیز خوای گەورە زۆر لە کەس ناکات بۆ باوەڕ هێنان یان بێ باوەڕی) هەر بەو شێوەیە ئەوانەی پێش ئـەمانیش درۆ و بوختانیـان هەڵدەبەست، هەتا تووشی بەڵای ئێمە بوون و سزای ئێمـەیان چەشـت، پێیـان بڵـێ: ئایـا هیچ زانیاری و زانستیەکی خوایتان لەلایە، تا نیشانمان بـدەن و بۆمـان دەربخـەن؟ ئێـوە شوێنی هیچ شتێکی تر ناکەون جگە لەگومان و ئێوە هیچ شتێکی تر ناکەن مەگـەر ئـەوە نەبێت کە درۆ دەکەن. خوای گەورە بۆی ڕونکردنەوە کەیاساو بنەماکانی ئاین لەسەر درۆ و قاڵەقاڵ بینا ناکرێت بەڵکو لەسەر زانستی بەهێز و بەڵگـەی یەکلاکـەرەوە بینـا ئـەکرێت بۆیە لەدوای ئەوە فەرموی: ﴿ قُلۡ فَلِلَّهِ ٱلۡحُجَّةُ ٱلۡبَٰلِغَةُۖ فَلَوۡ شَآءَ لَهَدَىٰكُمۡ أَجۡمَعِينَ ١٤٩ ﴾ (الأنعـام)، ئەی پێغەمبەرﷺ پێیان بڵێ: کەوابوو هەر بۆ خوایـە خـۆی بەڵگـە تێـرو تـەواوەکان، جـا ئەگەر بیویستایە ئەوە هەمووتانی بەتەواوی هیدایەت دەداو بە ناچاریی هـەمووان بـڕوادار دەبـوون (بـەڵام ڕێـزی لێگرتـوون و سەرپشـکی کـردوون).هـەروەها لەسـورەتی یونسـدا فەرمویـــــەتی: ﴿ أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُۖ قُلۡ فَأۡتُواْ بِسُورَةٖ مِّثۡلِهِۦ وَٱدۡعُواْ مَنِ ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ٣٨ ﴾ (یونس)، بەڵکو (لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگانەدا) ئەوانـە دەڵـێن کـە محمـدﷺ

قورئانی هەڵبەستووە، بڵێ: دە ئێوەش سوورەتێك وەك سوورەتەكانی داڕێژن و بیهێنن، داوا بكەن لەهەر كەسێكی تر كە دەتوانن جگە لەخوا (كەیارمەتیتان بدات) درێغی مەكەن ئەگەر ڕاستگۆن. لە سورەتی نەجمیشدا ئەفەرموێ: ﴿ ... إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَمَا تَهْوَى ٱلْأَنفُسُ ۖ وَلَقَدْ جَآءَهُم مِّن رَّبِّهِمُ ٱلْهُدَىٰٓ ﴿٢٣﴾ ﴾ (النجم)، ئەوانە تەنها شوێنی گومان و ئارەزوی دەروونەنەخۆشیەكانیان دەكەون، لەكاتێكدا كەبەڕاستی لەلایەن پەروەردگاریانەوە هیدایەت و ڕێنموویییان پێ گەیشتووە ! هەروەها لە ڕەدی دەهرییەكاندا فەرموێ:

﴿ وَقَالُوا۟ مَا هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَآ إِلَّا ٱلدَّهْرُ ۚ وَمَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ (الجاثية)، خوانەناسان دەیانوت: ژیان تەنها ئەم ژیانی دنیایەیە، دەمرین و دەژین بە نۆرە، هەر ڕۆژگارو زەمانە كایگەرن تیاماندا و دەمان مرێنن و هیچی تر! جا ئەوانە وەنەبێت لەسەر بنچینەی هیچ جۆرە زانستی و زانیاریەك ئەوە بڵێن بەڵكو تەنها پشت بەگومان و دوودڵی دەبەستن.

بەمشێوەیە قورئان ئەم یاسایە لە توێژینەوەی زانستیدا ئەچەسپێنێت كە گومان و دڵنیایی وەك یەك نین و وەك یەك مامەڵەیان لەگەڵ ناكرێت.

**٣/ گفتوگۆی عاقڵانە كە پشت بەستوبێت بە یاسا و دانپیانراو و بەڵگە نەویستەكانی عەقڵ:**

ئەمەش یەكێكیترە لە بەرنامەكانی قورئان و ڕێگاكانی، قورئان عەقڵ ئەدوێنێ، چونكە عەقڵ ئەو سەرەتایەیە كەهەموو مرۆڤێك لێوەی پەل ئەهاوێ لەهەستكردنی بە خوا و ڕێنمونیكارە بۆی، هەر بەعەقڵیش زانست و كردارەكان كامڵ ئەبن.

قورئان لەچەند ئایەتدا هانمان ئەدات عەقڵ بەكاربهێنین و پەراوێزی نەخەین: ﴿ ۞ أَتَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ ٱلْكِتَٰبَ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾ (البقرة)، (كەی ئەوە ڕاستە) فەرمانی چاكە بەخەڵكی بدەن و خۆتان فەرامۆش بكەن؟! لەكاتێكدا خۆ ئێوە كتێبی خوا ـ تەورات ـ دەخوێننەوە، (دەزانن سزای گوفتاری بێ ڕەفتار چۆنە) جا ئایا ژیریتان ڕێتان لێناگرێت لەو هەڵوێستە ناشرینە؟! هەروەها ئەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ بِطَانَةً مِّن دُونِكُمۡ لَا يَأۡلُونَكُمۡ خَبَالًا وَدُّواْ مَا عَنِتُّمۡ قَدۡ بَدَتِ ٱلۡبَغۡضَآءُ مِنۡ أَفۡوَٰهِهِمۡ وَمَا تُخۡفِي صُدُورُهُمۡ أَكۡبَرُۚ قَدۡ بَيَّنَّا لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِۖ إِن كُنتُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴿١١٨﴾ ﴾ (ال عمران)

ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، بە کەسانێکی تر جگە لە خۆتان متمانە مەکەن و نهێنی خۆتان لایان مەدرکێنن، چونکە ئەوان کۆڵنادەن لە دروستکردنی تەنگانەو گیروگرفت و ناخۆشی بۆتان، ئاواتیان ئەوەیە دووچاری ئازارو کێشە ببن، بەئاشکرا ڕق و کینە لە دەم و دویاندا دیارە، ئەوەی لە سینەیاندا شاردویانەتەوە زۆر گەورەترە لەوەی کە دەریدەخەن، بێگومان ئێمە نیشانەو بەڵگەمان بۆ دیاری کردوون (تا دۆست لە دوژمن جیابکەنەوە)، ئەگەر عەقلّ و ژیریتان بخەنەکار. هەروەها ئەفەرموێ: ﴿ لَهُۥ دَعۡوَةُ ٱلۡحَقِّۖ وَٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَسۡتَجِيبُونَ لَهُم بِشَيۡءٍ إِلَّا كَبَٰسِطِ كَفَّيۡهِ إِلَى ٱلۡمَآءِ لِيَبۡلُغَ فَاهُ وَمَا هُوَ بِبَٰلِغِهِۦۚ وَمَا دُعَآءُ ٱلۡكَٰفِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَٰلٖ ﴿١٤﴾ ﴾ ( الرعد)، هەر بۆ خوایە بانگەوازی حەق و ڕاستی، (بەڵام) ئەوانەی هاناو هاوار بۆ کەسێکی تر دەبەن جگە لەو زاتە، هاوار لێکراوان بە هیچ شێوەیەك بەهانایانەوە نایەن و وەڵامیان نادەنەوە، مەگەر وەکو کەسێك (تینووی بێت لە دوورەوە) دەستەکانی درێژە بکات بۆ ئاو تا بیگەیەنێتە دەمی، کەچی بێسوودەو ناگاتە دەمی، بێگومان دوعا نزای بێ باوەڕان تەنها لەناو تاریکی و گومڕایدایە و هیچی تر نییە، ئەوانەش بەمردوو ئەناسێنێ کە بیرناکەنەوە﴿ ۞ إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلصُّمُّ ٱلۡبُكۡمُ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡقِلُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾ (الانفال)، بەڕاستی خراپترین زیندەوەران لای خوا ئەو کەسانەن کە کەڕن (حەق نابیستن) و لاڵن (حەق بێژ نین)، ئەوانەی کە ژیر نابن (بیرو هۆشیان ناخەنەکارو تێنافکرن و بیرو مێشکیان قفلّ داوە).هەروەها ئەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدۡ أَضَلَّ مِنكُمۡ جِبِلّٗا كَثِيرًاۖ أَفَلَمۡ تَكُونُواْ تَعۡقِلُونَ ﴿٦٢﴾ ﴾ ( یس)، بێگومان شەیتان خەڵکێکی زۆری لە ئێوە گومڕا کرد، جا ئایا بۆچی ژیر نەبوون.

ڕێڕەوی قورئان بۆ وورد‌بونەوەی عەقڵی پشت ئەبەستێتبە ڕونکردنەوە و دەربڕین ، لەوانەش ڕێگای {سەبر و تەقسیم}لە بیانوبڕینی ئەوانەی بانگەشەی حەرامبوونی حەلاڵەکان ئەکەن: ﴿ ثَمَٰنِيَةَ أَزْوَٰجٍ مِّنَ ٱلضَّأْنِ ٱثْنَيْنِ وَمِنَ ٱلْمَعْزِ ٱثْنَيْنِ قُلْ ءَآلذَّكَرَيْنِ حَرَّمَ أَمِ ٱلْأُنثَيَيْنِ أَمَّا ٱشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ أَرْحَامُ ٱلْأُنثَيَيْنِ نَبِّـُٔونِى بِعِلْمٍ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٤٣﴾ ﴾ (الانعام)، (خوای گەورە) هەشت جووت ماڵاتی (بۆ خزمەتی ئادەمیزاد دروستکردووە) لەمەڕ جوتێك و لەبزنیش جوتێك (ئەی محمدﷺ) بەو نەفامانە بڵێ کە هەر لە خۆیانەوە شت حەرام دەکەن) ئایا خواردنی گۆشتی نێرەکانی حەرام کردووە یان مێیەکان یان ئەوەی کەلە سکی مێیەکاندا هەیە؟! ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن و بەڵگەیەکی زانستیتان هەیە، بۆمان ڕوون بکەنەوە؟!

قورئان هەموو ئەگەر و بۆ چونە لەبارەکانی بانگەشەی ئەوانی خستۆتەڕوو پاشان هەمویانی هەڵوەشاندۆتەوە و بیسەری گەیاندۆتە ئەو دەرەنجامەی کە خاوەنی ئەو بانگەشانە لە ستەمکارترینی مرۆڤەکانن، لەوانەش دانانی ئەو محاڵەی کە ئەیڵێن بۆ ئەوەی نکولیکار بگەیەنیت بەو دەرەنجامەی بەدوای خۆیدا ئەیهێنێت وەك ئەم ئایەتە:

﴿ مَا ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ مِن وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُۥ مِنْ إِلَٰهٍ ۚ إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَٰهٍۭ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٩١﴾ ﴾ (المؤمنون)، هەرگیز خوا کەسی نەکردووە بە ڕۆڵەی خۆی و هیچ خوایەکی لەگەڵدا نی یە، چونکە ئەو کاتە هەر خوایەك دەچوو بەلای دروستکراوانی خۆیەوەو هەندێکی خۆی بڵند دەکرد بەسەر هەندێکی تردا (ئەوسا بوونەوەر تێکدەچوو)، پاکی و بێگەردی بۆ زاتی خوایە لە بەرامبەر ئەو شتانەوە کە (خوا نەناسان) هەڵی دەبەستن و دەیڵێن.

دیسان لەوانەش وەك لێکهەڵوەشان، ئەویش بەستنەوەی ئەستەمێکە بە ئەستەمێکیتر بۆئەوەی دەریخەی ئەوەی پێوەی بەستراوە ئەویش محاڵ و ئەستەمە:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَٱسۡتَكۡبَرُواْ عَنۡهَا لَا تُفَتَّحُ لَهُمۡ أَبۡوَٰبُ ٱلسَّمَآءِ وَلَا يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ حَتَّىٰ يَلِجَ ٱلۡجَمَلُ فِي سَمِّ ٱلۡخِيَاطِۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴿٤٠﴾ ﴾ (الاعراف)،

بێگومان ئەوانەی بڕوایان بە ئایەت و فەرمانەکانی ئێمە نەهێناوە و خۆیان لە ئاستیدا بەگەورە داناوە، ئەوانە دەروازەکانی ئاسمانیان بۆ ناکرێتەوە و ناچنە بەهەشتەوە هەتا وشتر ئەچێت بەناو کونی دەرزیدا، ئا بەو شێوەیە ئێمە پاداشتی تاوانباران دەدەینەوە و تۆڵەیان لێدەسێنین.

لەیاسا عەقڵییەکانیتری قورئان: دانانی دەرەنجامە لەسەر پێشەکی و هاوسانییە لە نێوان لێکچوەکاندا و جیکاری لەنێوان جیاوازەکان، هەروەها بوون بە زانستەوە بەستراوە و کار و کردار بەبێ بکەر نابێت، هەروەها بەکارهێنانی قیاسی عەقڵی وناچارکردنی بەرانبەر لە ڕێگەی ئەوەی ئەیبینێ و باوەڕی پێی هەیە، هەروەها هێنانی بەڵگە دروستەکان بە ڕێگە ڕاستەکان و قبوڵکردنی ئەو دەرەنجامانەی کە بەم ڕێگە پێی دەگەین و جگە لەمانەش هەموو ئەو ڕێگایانەی کە عاقڵەکان نکوڵی لێناکەن و بەمشێوە عەقڵ ناتوانێت لە یاساو بەڵگە نەویستەکان ڕابکات و هیچی بۆ نامێنێتەوە خۆبەدەستەوەدان نەبێت.

لەو نمونانەی ناو قورئان عاقڵی بەرانبەری دواندوە: ڕەد دانەوەی بۆ ئەو درۆیەی کە بوختان چییەکان ئەیانوت خوا کوڕی هەیە! خوا بۆی ڕونکردنەوە کە کەسێك بۆ ئەوەی منالی ببێت ئەبێت لەیەك جنس نێر و مێ هەبێت و زەواج لە نێوانیان هەبێت، ئێ خۆ خوای گەورە جنسی نییە تا ڕەگەزی بەرانبەری هەبێت. وەك خۆی ئەفەرموێت: ﴿ بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُۥ وَلَدٞ وَلَمۡ تَكُن لَّهُۥ صَٰحِبَةٞۖ وَخَلَقَ كُلَّ شَيۡءٖۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴿١٠١﴾ ﴾ (الانعام)، بێگومان ئەو زاتە بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەویە لە جوانترین و ڕێك و پێکترین شێوەدا، چۆن ڕۆڵەی دەبێت؟! خۆ ئەوزاتە هاوسەری نەگرتووە؟! بەڵکو

هەموو شتێکی دروست کردوە، بەڕاستی ئەو زاتە بەهەموو شتێك زانایە. چۆن کوڕی ئەبێت ئەگەر نەعەقڵ و نەخونەریت قبوڵی ئەوە نەکەن کە لە خۆڕا منداڵ ببێ بەبێ بونی ڕەگەز و هاوسەر. بەمشێوە دەرەنجامەکان لەسەر پێشەکییەکان بینا ئەکرێن.

بۆ وەلآمی ئەوانەش کە بانگەشەی ئەوەیان ئەکرد کە فریشتەکان کچی خوان فەرموی ئایا ئەوانە شایەتی دروستکردنی فریشتەکان بوون؟ ﴿ وَجَعَلُوا۟ ٱلۡمَلَـٰۤىِٕكَةَ ٱلَّذِینَ هُمۡ عِبَـٰدُ ٱلرَّحۡمَـٰنِ إِنَـٰثًاۚ أَشَهِدُوا۟ خَلۡقَهُمۡۚ سَتُكۡتَبُ شَهَـٰدَتُهُمۡ وَیُسۡـَٔلُونَ ﴿١٩﴾ ﴾ (الزخرف)، ئەو خوانەناسانە فریشتەکان کە بەندەی خوای میهرەبانن، بەکچی خوایان دەدایە قەڵەم!! ئایا ئەوان ئامادەی دروستکردنیان بوون؟! لە ئایندەدا ئەم بوختانەیان لەسەر دەنوسرێت و پرسیاریشیان لێ دەکرێت.ئەمەش چەسپاندنی یاسایەکی قورئانییە بۆ گفتوگۆ ئەویش: ئەبێت شایەتیدان لەسەر بنەمای زانیاری بێت. لەسەر زمانی براکانی یوسف پێغەمبەریش فەرموی: ﴿ وَمَا شَهِدۡنَاۤ إِلَّا بِمَا عَلِمۡنَا وَمَا كُنَّا لِلۡغَیۡبِ حَـٰفِظِینَ ﴿٨١﴾ ﴾ (یوسف)، جگە لەوەی کە زانیومانە، ئێمە لە شاراوە و نهێنیەکان شارەزا نین (نازانین ئەو کوڕە بۆ وای کرد).

لەو بەڵگە عەقڵیانەیتر کە قورئان بۆ سەلماندنی تاك و تەنهایی خوا دایڕشتوە: ﴿ لَوۡ كَانَ فِیهِمَاۤ ءَالِهَةٌ إِلَّا ٱللَّهُ لَفَسَدَتَاۚ فَسُبۡحَـٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلۡعَرۡشِ عَمَّا یَصِفُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾ (الانبیاء)، ئەگەر لە هەردووکیاندا (لە ئاسمان و زەویدا) چەند خوایەکی تر هەبوایە غەیری (الله)، ئەوە کاول و وێران دەبوون و تێك دەچوون بەسەر یەکدا، پاکی و بێگەردی بۆ خوا کە پەروەردگاری عەرشە، لەو باس و خواسانەدا (کە خوانەناسان) دەیڵێن (هاوەڵ بۆ ئەو زاتە بریار دەدەن). کە ئەمە بەڵگەیەکی عەقڵی ڕوونە کەس نکوڵی لێناکات بەواتای ئەوە دێت کە نەبونی نارێکی لەبونەوەردا بەهۆی نەبونی چەند خواییە، هیچ نارێکی و خراپەیەك لە جوڵەی بونەوەردا نییە و بەڵکو هەموو یاساکانی سروشت چۆن ڕێڕەویان بۆ دیاریکراوە

بەوشێوە لەکاردان، ئەگەر چەند خوایەك خاوەنی ئەم بونەوەرە بونایە ئەوا هەر خوایەی بەشی خۆی دائەبڕی و یاساکانی بونەوەر تێك ئەچوو بەهۆی حەز و جیاوازی بۆچونی هەر خوایەك.

ئەمە بەڵگەیەکی بڕاوەیە و زانستی نوێش ئەمەی سەلماندوە کە ناکرێت ئەم بونەوەرە جگە لەیەك خوای هەبێت، ئەم جموجوڵە سەیرو ڕێکە ئەبێت تەنها یەك بەڕێوەبەری دانای هەبێت، ئەم جیهانە ناکرێت جگە لەیەك داهێنی بەتوانای هەبێت، بۆیە نابینین لە ناو موشریکە کۆنەکانیش کەس هەبێت بانگەشەی ئەوەی کردبێت کە ئەم بونەوەرە لە خۆڕاو بێ داهێنەرێك دروست بوبێت و هەمویان شایەتیان داوە بەتەنهایە خوای خاوەن ئاسمانەکان و زەوی: ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ ۚ قُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٥﴾ ﴾ ( لقمان)، سوێند بە خوا ئەگەر پرسیار لە خوانەناسان بکەیت: کێ ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە، ئەوە بە دڵنیاییەوە دەڵێن: (الله)، دروستی کردوون، تۆش ئەی محمد ﷺ بڵێ: سوپاس و ستایش بۆ خوا (لەسەر وتنی ڕاستی)، نەخێر وانییە، ئەو وەڵامە لە قەناعەتەوە هەڵنەقوڵاوە، بەڵکو زۆربەیان نازانن (لە خۆیانەوە قسە دەکەن). بەڵام ئەمڕۆ لەناو قاڵەکاراندا هەیە ئەو ناماقوڵییە ئەکات.

بەڵگەیەکیتری قورئان﴿ مَا اتَّخَذَ اللَّهُ مِن وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُ مِنْ إِلَٰهٍ ۚ إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَٰهٍ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٩١﴾ ﴾ ( المؤمنون)، هەرگیز خوا کەسی نەکردووە بە ڕۆڵەی خۆی و هیچ خوایەکی لەگەڵدا نی یە، چونکە ئەو کاتە هەر خوایەك دەچوو بەلای دروستکراوانی خۆیەوەو هەندێکی خۆی بڵند دەکرد بەسەر هەندێکی تردا (ئەوسا بوونەوەر تێکدەچوو)، پاکی و بێگەردی بۆ زاتی خوایە لە بەرامبەر ئەو شتانەوە کە (خوا نەناسان) هەڵی دەبەستن و دەیڵێن. واتاکەی دیارەو زانایانی زانستی کەلام بە بەڵگەی تەمانع ناوی ئەبەن.

بەڵگەیەکیتر بەکارهێنانی قیاسی عەقلییە[19] لە قورئاندا بۆ ئەوانەی کە نکوڵی لە زیندوبونەوەی دوای مردن ئەکەن و بیانوشیان بۆ ئەم بانگەشە نەهاتنەوە و زیندونەبونەوەی باوباپیرانیانە کە چەنەها ساڵە مردوون.!

قورئانیش بەپێی ئەم بەڵگەیە بیانویان ئەبڕێت : ئەو خوایەی کە ئەوانی لەنەبون هێنایە بوون بۆی ئاسانترە دوبارە دوای مردن بیانژێنێتەوە وەك ئەفەرموێت: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِي يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَهُوَ أَهۡوَنُ عَلَيۡهِۚ وَلَهُ ٱلۡمَثَلُ ٱلۡأَعۡلَىٰ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٢٧﴾ ﴾ (الروم)، هەر ئەو زاتە لە سەرەتاوە بەدیهێنراوەکان بەدی دەهێنێت، پاشان بە جۆرێکی تر دروستیان دەکاتەوە، ئەو کارەش بۆ خوا ئاسانە، نموونەی بەرزو وەسفی بڵند هەر شایستەی ئەو زاتەیە لە ئاسمانەکان و زەویدا، هەر ئەویش زاتێکی باڵادەست و دانایە.هەروەها ئەفەرموێ: ﴿ قُلِ ٱللَّهُ يُحۡيِيكُمۡ ثُمَّ يُمِيتُكُمۡ ثُمَّ يَجۡمَعُكُمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا رَيۡبَ فِيهِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٢٦﴾ ﴾ (الجاثیة)، ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ: (ئەو شتانە بەدەست ئێمە نیە) ئەوە هەر خوایە ژیانتان پێ دەبەخشێت و پاشان دەتان مرێنێت و دوای ئەوە کۆتان دەکاتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا کە هیچ گومانی تیادانیە، بەڵام زۆربەی خەڵکی ئەمە نازانن.هەر بەوشێوەش وەلامی جوو گاوری دایەوە کە بانگەشەی جوبون و گاوربونی ئیبراهیم پێغەمبەریان ئەکرد، لەوەلامیاندا فەرموی: ﴿ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تُحَآجُّونَ فِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَمَآ أُنزِلَتِ ٱلتَّوۡرَىٰةُ وَٱلۡإِنجِيلُ إِلَّا مِنۢ بَعۡدِهِۦٓۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴿٦٥﴾ ﴾ (ال عمران)، ئەی خاوەن کتێبەکان، ئێوە بۆ لە ئیبراهیم دەدوێن و (هەریەکەتان وادادەنێت کە لەسەر ئاینی ئەوە) خۆ تەورات و ئینجیل دوای ئەو ڕەوانە کراون، ئەوە بۆ عەقڵ و ژیرتان ناخەنەکارو تاکەی ژیرنابن؟! چۆن بانگەشەی لەوشێوە ئەکەن کە کاتی ژیان و

---

١٩- قیاسی عەقڵی: دەرخستنی حوکمی شتێکە کە نەزانراوە بەهۆی پێوانی بە حوکمی شتێکیتری زانراو لە قورئان و سوننەتدا بەهۆی بونی (عیللەت) هۆی هاوبەش لە نێوان ئەو دوو شتەدا.

پێغەمبەرایەتی ئیبراهیم پێش هاتنی جولەکەو گاورە و پێش دابەزینی تەورات و ئینجیلە؟! ئەمە بەڵگەیەکی عەقڵی بەڵگەنەویستە بۆیە لە کوتایی ئایەتەکەدا ئەفەرموێ{افلا تعقلون}واتە ئایا تێناگەن قسەکەتان چەند لاوازە و بانگەشەکەتان چەند بەتاڵە؟

هەر لەم بارەیەوە قورئان وەڵامی ئەوانە ئەداتەوە کە پەرستشی بت و بێ گیانەکان ئەکەن و ئەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ شَرِيكٌ فِى ٱلْمُلْكِ وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍ فَقَدَّرَهُۥ تَقْدِيرًا ﴿٢﴾ ﴾ (الفرقان)، ئەو زاتەی کە هەموو ئاسمانەکان و زەوی موڵکی ئەوەو هەر ئەو خاوەنیانە، کەسیشی نەکردووە بە ڕۆڵەی خۆی و کەسی نەکردووە بە شەریك و هاوبەش لە مەودای موڵك و دەسەڵاتیدا، هەموو شتێکی دروستکردووە بە ئەندازەو قەبارە و شێوە و تام و بۆن و ڕەنگ و جیاوازی هەمە جۆر...هتد، نەخشەی ڕێکوپێکی بۆ هەموو شتێك داناوە (بە شێوەیەك کە پێویستیەکانی ئادەمیزاد دابین بکەن و لە خزمەتیدا بن). ئەمە لاوازی عەقڵی ئەوان نیشان ئەدات کە شتانێك ئەپەرستن نابسێ و نابینێ و زیان و قازانج ناگەیەنێت، چونکە دارانەبونی بیستن و بینین و ووتە شایستە نەبوونە بۆ پەرستن، ئیبراهیم پێغەمبەریش کاتێك عەقڵی گەلەکەی ئەدواند دەربارەی خواکانیان فەرموی: ﴿ قَالَ أَفَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكُمْ شَيْـًٔا وَلَا يَضُرُّكُمْ ﴿٦٦﴾ أُفٍّ لَّكُمْ وَلِمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۖ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٦٧﴾ ﴾ (الانبیاء)،

ئیبراهیم وتی: باشە، ئاخر، چۆن شتێك دەپەرستن لە جیاتی خوا کە ناتوانێت هیچ جۆرە قازانج یان زیانێکتان پێ بگەیەنێت، (تەنانەت ئەوەتا نەیانتوانی بەرگری لە خۆشیان بکەن).تۆف لە دەستتان و لەو شتانەش کە لەجیاتی خوا دەیپەرستن، جا ئایا ئەوە تێناگەن و بیرو هۆشتان ناخەنەکار؟!.

بۆ وەڵامی جولەکەو گاور لەو بانگەشەیان کە ئەوان نەوە و خۆشەویستی خوان فەرموی: ﴿ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ وَٱلنَّصَٰرَىٰ نَحْنُ أَبْنَٰٓؤُا۟ ٱللَّهِ وَأَحِبَّٰٓؤُهُۥ ۚ قُلْ فَلِمَ يُعَذِّبُكُم بِذُنُوبِكُم ۖ بَلْ أَنتُم بَشَرٌ مِّمَّنْ خَلَقَ ۚ يَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ ۚ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ۖ وَإِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٨﴾ ﴾ (المائدة)

جوولەکەو گاور دەیانوت: ئێمە ڕۆڵەی خواو خۆشەویست و نزیکی ئەوین، پێیان بڵێ: کەواتە بۆچی لەسەر گوناهو تاوانتان سزاتان دەدات (لە دنیادا بەئاشکرا بەڵاو ناخۆشیتان بۆ پێش دەهێنێت، سزای قیامەتیش با لەولاوە بوەستێت، ئێوە خۆتان ئاوا بەگەورەو نازدار دامەنێن و خۆتان جیا مەکەنەوە) نەخێر وانیە، چونکە ئێوەش بەشەر و ئادەمیزادێکن لەو خەڵکەی کە دروستی کردووە، ئەوەی خوا بیەوێت لێی خۆش ببێت، لێی خۆشدەبێت، ئەوەش کە بیەوێت سزای بدات سزای دەدات (ئەڵبەتە لە چوارچێوەی دادپەروەریدا) هەرچیش لە ئاسمانەکان و زەوی و نێوانیاندا هەیە هەر خوا خاوەنیانە، گەڕانەوە و سەرئەنجامیش بۆ لای ئەو زاتەیە. ئەمە یانی: ئەگەر ئێوە لە بانگەشەکەتان ڕاست ئەکەن ئەی بۆ خوا لەدونیا سزاتان ئەدات و بۆ ئێوە کردە مەیمون و بەراز یان بۆ بەسزای ئاگری قیامەت ئەتانترسێنێت،؟ خۆ ئەوەی کە زانراوە خۆشەویست خۆشەویستی خۆی سزا نادات و باوکیش منالی خۆی ئازار نادات، کەواتە بانگەشەکەتان ڕاست نییەو بەتاڵە.

ئەم وەڵامدانەوەیە جەدەلییەکان بە بەڵگە یان قیاسی خولف ناوی ئەبەن کە چەسپاندنی ویستراوە بە هەڵوەشانەوەی دژەکەی، چونکە دوودژ پێکەوە کۆنابنەوە و یەکێکیان ئەمێنێتەوە وەك خوای گەورە فەرموی: ﴿ لَوْ كَانَ فِيهِمَآ ءَالِهَةٌ إِلَّا ٱللَّهُ لَفَسَدَتَا ۚ فَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾ (الانبیاء)، ئەگەر لە هەردووکیاندا (لە ئاسمان و زەویدا) چەند خوایەکی تر هەبوایە غەیری (الله)، ئەوە کاول و وێران دەبوون و تێك

دەچوون بەسەر یەکدا، پاکی و بێگەردی بۆ خوا کە پەروەردگاری عەرشە، لەو باس و خواسانەدا (کە خوانەناسان) دەیڵێن (هاوەڵ بۆ ئەو زاتە بڕیار دەدەن).تێکچونی ئەوشتەی کە دوبەڕێوەبەری هەبێت و هەریەکەیان خۆی بەباڵادەست بزانێ گومانی تێدا نییە و ئەمە وەڵامێکی عەقڵی یەکلاکەرەوەیە و بەڵگە عەقڵییەکانی ناو قورئانیش زیاترە لەوەی بێتە ئەژمار.

٤/ کۆکردنەوەی هەردوو عەقڵ و نەقڵ بۆ وەڵامدانەوە:

کۆکردنەوەی بەڵگەی عەقڵ و بەڵگەی نەقڵ بۆ وەڵامدانەوە یەکێکیترە لەبەرنامەکانی قورئان، لای لێکۆڵەرەکانی بەرنامە و پێڕەوی زانستی زانراوە کە هەموو بەرنامەیەکی گوازراوە بێ ئاتاج نییە لە ڕامانی عەقڵی، و پێچەوانەکەیشی هەر ڕاستە، هاوکاری لەنێوان بەرنامەکاندا ڕاستییەکی زانستییە و گومانی لەسەر نییە، و قورئان ئەم ڕێگەیەی بەکارهێناوە، هەندێجار هێزی وەڵامدانەوەکە لەکۆی هەردوو ڕێگاکەوە دەست ئەکەوێت.

نمونە بۆ بەکارهێنانی ئەم ڕێگەیە لە قورئاندا وەڵامی خوای گەورەیە بوو بۆ ئەوانەی تەوافی ماڵی خوایان ئەکرد بەبێ بەرگ و بەڕووتی بەژن و پیاوەوە! خوای گەورە ڕونیکردەوە ئەوەکارێکی نەشیاوە و تاوانە و چۆن کارێك کە نایزانن ئەیدەنە پاڵ خوا؟ ئەمەش بەدرۆ خستنەوەیان بوو بەهەردوو ڕێگاکە.

لەلایەنی عەقڵییەوە ڕونیکردەوە کە ئەوکارە خراپە و نەشیاوە و خوا بێگەردە لەوەی فەرمان بەخراپە بکات، تەنها شەیتان ئەو فەرمانەی پێکردوون: ﴿ وَإِذَا فَعَلُوا۟ فَـٰحِشَةً قَالُوا۟ وَجَدْنَا عَلَيْهَآ ءَابَآءَنَا وَٱللَّهُ أَمَرَنَا بِهَا ۗ قُلْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَأْمُرُ بِٱلْفَحْشَآءِ ۖ أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾ (الاعراف)، کاتێکیش (بێ باوەڕان) تاوان و گوناهێك ئەنجام بدەن دەڵێن: باوو باپیرانیشمان دیوە ئەم کارەیان کردوەو خوای گەورە خۆی فەرمانی پێداوین بیکەین!! پێیان بڵێ: (نەخێر وانییە) چونکە بەڕاستی خوا فەرمان بەگوناهو تاوان و کاری نابەجێ نادات، چۆن (جەسارەت دەکەن) و شتێك هەڵدەبەستن بۆ خوا کە نازانن وتویەتی یان نا.

﴿ ٱلشَّيۡطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلۡفَقۡرَ وَيَأۡمُرُكُم بِٱلۡفَحۡشَآءِۖ وَٱللَّهُ يَعِدُكُم مَّغۡفِرَةً مِّنۡهُ وَفَضۡلًاۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٦٨﴾ ﴾ (البقرة)، (كاتىَ ئێوه له ماڵ و دارایيتان دهبهخشن) شهیتان بهڵێنی ههژاری و نهداریتان پێ دهدات (دهتانترسێنێت به ههژاری) و فهرمانتان پێ دهدات بهگوناهو تاوان و خراپه و نهبهخشين، خواى گهورهش بهڵێنی لێخۆشبوونێکی تایبهتی خۆیتان پێدهدات لهگهڵ زۆری ڕۆزی و بههرهی فراوانداو خوا فراوانگیرو زانایه. بهلاّم به ڕێگهی نهقلّی و گوازراوهکه ئهوهیه ههرشتێك درایه پاڵ خوا ناچهسپێت ئهگهر له ڕێگهی وهحییهوه نههاتبێت، ئێ مادام نهخوا نه پێغهمبهر ئهوهیان نهفهرموه کهواته بانگهشهکه بهتاڵــــه: ﴿ وَإِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً قَالُواْ وَجَدۡنَا عَلَيۡهَآ ءَابَآءَنَا وَٱللَّهُ أَمَرَنَا بِهَاۗ قُلۡ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَأۡمُرُ بِٱلۡفَحۡشَآءِۖ أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾ (الاعراف).

کاتێکیش (بێ باوهڕان) تاوان و گوناهێك ئهنجام بدهن دهڵێن: باوو باپیرانیشمان دیوه ئهم کارهیان کردوهو خوای گهوره خۆی فهرمانی پێداوین بیکهین! ! پێیان بڵێ: (نهخێر وانییه) چونکه بهڕاستی خوا فهرمان بهگوناهو تاوان و کاری نابهجێ نادات، چۆن (جهسارهت دهکهن) و شتێك ههڵدهبهستن بۆ خوا که نازانن وتویهتی یان نا. نمونهیهکیتر وهلاّمدانهوه شوعهیب پێغهمبهر سهلامی خوای لێبێت بۆ گهلهکهی کاتێك له کێشانه و پێوانهدا خیانهتیان ئهکرد و ئهیانوت ئێمه لهناو خۆماندا پێی ڕازین و ماڵی خۆمانه و بۆمان ههیه چۆنمان بوێت ئاوا مامهڵهی پێوه بکهین، شوعهیب پێغهمبهر بۆی ڕونکردنهوه که بهههموو عهقڵێکی ساغ ئهبێت خهڵك مافی خۆی وهرگرێت له کێشانه و پێوانهدا و بهکهم و کورتی پێی نهدرێت ئهوکات داد بهرپا ئهبێت و دوژمنایهتی و ڕق و کینه نامێنێت، ئهمه بهڵگهیهکی عهقڵیبو پێغهمبهر شوعهیب بهکاریهێنا: ﴿ وَيَٰقَوۡمِ أَوۡفُواْ ٱلۡمِكۡيَالَ وَٱلۡمِيزَانَ بِٱلۡقِسۡطِۖ وَلَا تَبۡخَسُواْ ٱلنَّاسَ أَشۡيَآءَهُمۡ وَلَا تَعۡثَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُفۡسِدِينَ ﴿٨٥﴾ ﴾ (هود)، ئهی قهوم و خزمهکانم، با پێوان و کێشانتان تێرو تهواوبێت و به

دادپەروەرانە ئەنجامی بدەن، شتومەکی خەڵکی کەم نرخ مەکەن و (فێڵیان لێ مەکەن) و خراپەکاری مەکەن لە زەویدا و تۆوی خراپە مەچێنن..

هەروەها ئەوەیشی بۆ ڕونکردنەوە کە ماڵ و سامان موڵکی خوایە و خـوا ڕۆزیـدەرە و بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بـەخەڵك دراوە و ئـەمەش لـەم بـەشەی ووتەیدا دەرئەکەوێت:

﴿ قَالَ يَٰقَوۡمِ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي وَرَزَقَنِي مِنۡهُ رِزۡقًا حَسَنٗاۚ وَمَآ أُرِيدُ أَنۡ أُخَالِفَكُمۡ إِلَىٰ مَآ أَنۡهَىٰكُمۡ عَنۡهُۚ إِنۡ أُرِيدُ إِلَّا ٱلۡإِصۡلَٰحَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُۚ وَمَا تَوۡفِيقِيٓ إِلَّا بِٱللَّهِۚ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ وَإِلَيۡهِ أُنِيبُ ﴿٨٨﴾ ﴾ (هود)، شوعەیت وتی: ئەی قەوم و خزمەکانم هەواڵم بدەنێ ئەگەر منتـان بـینی و بۆتـان دەرکەوت کە لەسەر بەرنامەیەکی ڕێك و ڕۆشنم لەلایەن پەروەردگارمـەوە و هـەر لەلایـەن خۆشیەوە ڕزق و ڕۆزی جوان و باشی داومەتێ، منیش نامـەوێت قەدەغـەی شـتێکتان لـێ بکەم، کەچی خۆم وەك ئێـوە نەکـەم (چـی بـە ئێـوە بگەیـەنم خـۆم لـە پێشـدا ئـەنجامی دەدەم) من هیچم ناوێـت تـەنها چاکسـازی نـەبێت، بـەگوێرەی توانـام، ڕێکخسـتنی کـارم بەدەستی کەس نیە بەدەستی خوا نەبێت، پشت و پەنام هەر بەو بەستووە و هەر بـۆ لای ئـەویش دەگەڕێمـەوە. خـوا بەسـەرتانەوە پـارێزەرە و چـاودێرە بەهـەموو مامەڵـە داراییەکانتان و ناکرێت کاریتێدا بکەن بەوشـێوە نـەبێت دروسـتە و ڕاسـتە بـەڵام نـەدانی مافی دارایی خەڵك و خیانەت لە کێشانە و پێوانە ستەم و خراپەکارییە لەزەویدا.

**٥/ هێنانی بەڵگە دروستەکانی مەزهەبی زانایانی زانستی کەلام:**

لەسەر شێوازی مەزهەبی زانایانی زانستی کەلام بۆ وەڵامدانەوە لەقورئانـدا بەرنامـەی ڕاسـت هەیـە، بـۆ نمونـە کاتێـك بێباوەڕەکـان بانگەشـەی ئـەوەیانکرد کـە موحەمـەد لـە خۆیەوە قورئانی هەڵبەستووە خوای گەورە وەڵامی دانـەوە و فـەرموی: ﴿ وَلَوۡ تَقَوَّلَ عَلَيۡنَا بَعۡضَ ٱلۡأَقَاوِيلِ ﴿٤٤﴾ لَأَخَذۡنَا مِنۡهُ بِٱلۡيَمِينِ ﴿٤٥﴾ ثُمَّ لَقَطَعۡنَا مِنۡهُ ٱلۡوَتِينَ ﴿٤٦﴾ فَمَا مِنكُم مِّنۡ أَحَدٍ عَنۡهُ حَٰجِزِينَ ﴿٤٧﴾ ﴾ (الحاقـە)، خۆ ئەگـەر محمـدﷺ هەنـدێك قسـەو گوفتـار بـەدەم ئێمـەوە هەڵبەسـتایە.ئـەوە بـەهێزو

دەسەڵاتی خۆمان دەمانگرت.لەوەودوا ڕەگی دڵی دەپچڕێنین و دەیمرێنین.ئەوسا هیچ کەسێك نی یە لە ئێوە بەربەست و بەرگری بکات لە ئێمە. ئەمەش یانی: محمد ئەگەر شتێك بڵێ و لای خواوە دانەبەزی بێت ئەوا بەخێرایە سزا ئەدرێت، ئەم بەڵگەیە لە بیردا ئەیچەسپێنێت  کە خوا توانای تەواو و بێسنوری هەیە و کەس بۆی نییە بەناوی ئەوەوە هیچ بڵێت، ئەگەر محمد بڵێت قورئان هەڵبەستی خۆمە ئەوا خوا سزاکەی بۆ پێش ئەخات و لەناوی ئەبات. لەبەر ئەوەی خوا سزای پێغەمبەری نەداوە  ولەناوی نەبردوە کەواتە پێغەمبەر لەخۆیەوە هیچی نەووتوە. لێرەوە ئەگەینە دەرەنجامە تەواوەکە ئەویش: محاڵە سەرچاوەی قورئان مرۆڤ بێت و لەبەرانبەریدا چەسپاندنی دابەزینی قورئان لەلایەن خواوە، ئەم چۆرە لە بەڵگە لای زانایانی زانستی کەلام ناسراوە.

**٦/ نمونە هێنانەوە لە دوتوێی وەڵامدا بۆ ڕونکردنەوە و نزیککردنەوەی بیرۆکەو قەناعەت پێکردنی بەرانبەر:**

پەند و قسەی نەستەق و بەڵگە و نمونە لەناو قسەدا کاریگەری زۆرە، لەقورئانیشدا نمونە زۆر هێنراوە لەکاتی دواندنی نەیاران و گومانسازەکان، لە سودەکانی هێنانەوەی نمونە:

- نزیککردنەوەی بیرۆکە لە یادەوەری، بیسەر و واهەست ئەکات نمونەیەکی زیندوی ئەو فیکرەیە ئەبینێ و خێراتر ڕێگای ڕاست ئەگرێت و قەناعەتیش بە بیروڕاکە ئەهێنێت.

ناسینەوەی زانا و ژیرەکان و جیاکردنەوەیان، ئەوانەی لە نمونەکان ئەگەن تەنها زاناکانن: ﴿ وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ ۖ وَمَا يَعْقِلُهَآ إِلَّا ٱلْعَٰلِمُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾ (العنكبوت) ئا ئەم نمونانە ئێمە دەیهێنینەوە بۆ خەڵکی، تەنها زانا و شارەزاکان تێی دەگەن و تێ دەفکرن.

ئـەو شـتانەی لەسـنوری هەسـتەوەرەکان بـەدەرن نمونـەکان بەرجەسـتەیان ئەکـەن، ئەوەش کە عەقڵ دەرکی ناکات بەم نمونانە دەرك ئەکرێن و ئەوەش نەبوەتە باو ئاسـایی دەبێتەوە، هەرچیش هیچ هێزێکی نەبوە هێزی ئەدرێتێ.

- لە نمونەکانی قورئان زۆر سود وەردەگیرێـت بـۆ بوارەکـانی هانـدان و ترسـاندن، پیاهەڵـدان و زەمکـردن، ئامۆژگـاری و تـەمێکردن، لەبەرچـاوگرتن و دانپیانـان، نزیککردنەوەی بابەتەکان بۆ عەقڵ و وێناکردنی و بەرجەستەکردنیان، هێنەری نمونە وەك ئەو پیشەوەرەیە ڕێز لە پیشەکەی ئەگرێت، بۆیە ناونراوە نمونـە چـونکە ئـەوەی وتـراوە نمونەکەی لە یادەوەریدا و واتاکەیشی لەدەروندا ئامادە و کاریگەر ئەبێت.

خـوای گـەورە نمونـەکان ئـەهێنێت بـەڵکو بیسـەرەکان هیدایـەت وەرگـرن و بـەهرەی دڵنیـایی بنۆشـن کـە مایـەی ڕونـاکی دڵ و ئـارامی گیانـە، نمونـەکان زیـاتر کاریگـەرن و زووتـریش گەیەنـەرن ﴿ وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا الْقُرْآنِ مِن كُلِّ مَثَلٍ لَّعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾ (الزمر)، سوێند بێت بەخوا بەڕاستی ئێمە لەم قورئانەدا هـەموو جـۆرە نموونەیـەکمان بـۆ خەڵکی هێناوەتەوە، بۆ ئەوەی یادەوەری وەربگرن و بیرێك بکەنەوە لە ڕاستیەکان و تـێ بگەن.

ئەو نمونانەی خوای گەورە لە قورئاندا فەرمویەتی هەقیقەتی هیدایەت لـە دەرونـەکان نزیك ئەخاتەوە، نمونەی بەرجەستەکراوی زینـدون و تـەنها کەسـی نکولیکـاری لـەخۆبایی بەگومانەوە لێی ئەڕوانێت، نمونەکانیش لەناو قورئانـدا زۆر و جۆراوجـۆرن، لەوانـە نمونـە ڕاشکاوەکان و واتادارەکان و ئەونمونانـەی کـە ئـەکرێت بـۆ جگـە لـەو شـوێنە تایبەتـەش بهێنرێتەوە، ئەم نمونانە بەهەموو جۆرەکانی خەریکـە ببنـە واقعێکـی زینـدو کـە دەرونـی مرۆڤایەتی ئەدوێنن و بەرەو هەق کێشی ئەکەن، ئەم نمونانە هەروا بـێ هـودە نـەهێنراون بەڵکو پەندو ئامۆژگاری و ئامـانجی بڵنـدی لەپشـتەوەیە، پێشـەنگی مـرۆڤ ئەکـەن بـەرەو تەسـلیمبوون بـەخوا و گـەردنکەچی بـە فـەرمان و خۆپـارێزی لـە قەدەغـەکراوەکانی، بـۆ

ڕەوشت بەرزی و چارەی نەخۆشییەکان، بۆ پاککردنەوەی ئاکار و ڕێککردنەوەی ڕێگاکان، بۆ دامەزراندنی دڵی ئیمانداران، هەروەها ئەو نمونانە زیاتر مایەی گومڕابوونی ستەمکار و بێباوەڕەکانە و دەرخەری ڕەحمەتی خوایە تا واتاکانی نمونەکان لە دڵەکاندا ئەچەسپێت:﴿ وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا الْقُرْآنِ مِن كُلِّ مَثَلٍ لَّعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾ (الزمر)، سوێند بێت بەخوا بەڕاستی ئێمە لەم قورئانەدا هەموو جۆرە نموونەیەکمان بۆ خەڵکی هێناوەتەوە، بۆ ئەوەی یادەوەری وەربگرن و بیرێك بکەنەوە لە ڕاستیەکان و تێ بگەن..}.

لەوئایەتانەی قورئان کە نمونەی تێدا بەکارهێنرابێت بۆ قەناعەتپێکردن و ڕونکردنەوەی بیرۆکە: وەڵامدانەوەی ئەوانەیە کە نکولی لە زیندوبونەوەی دوای مردن ئەکەن، بەدوری ئەزانن دوای پوان و ڕزینی ئێسك دیسانەوە زیندوو بێتەوە، لەوەڵامیاندا خوا فەرموی: ﴿ وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِيَ خَلْقَهُ ۖ قَالَ مَن يُحْيِي الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ ﴿٧٨﴾ قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ ﴿٧٩﴾ الَّذِي جَعَلَ لَكُم مِّنَ الشَّجَرِ الْأَخْضَرِ نَارًا فَإِذَا أَنتُم مِّنْهُ تُوقِدُونَ ﴿٨٠﴾ أَوَلَيْسَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِقَادِرٍ عَلَىٰ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُم ۚ بَلَىٰ وَهُوَ الْخَلَّاقُ الْعَلِيمُ ﴿٨١﴾ ﴾ (یس)، نموونەی لاوازیی وبێ دەسەڵاتی بۆ ئێمە هێناوەتەوە و بەدیهاتنی خۆی لەبیر کردووە، دەیوت: کێ ئەم ئێسکانە زیندوو دەکاتەوە لە کاتێکدا کە ڕزیوو و پروکاون؟پێیان بڵێ: ئەو زاتەی کە یەکەمجار دروستی کرد، هەر ئەویش زیندووی دەکاتەوە، ئەو بەهەموو دروستکراوێك زاناو ئاگایە (دروستکردن و دروستکردنەوەی هەموو شتێکی لا ئاسانە).. ئەو زاتەی کە لە درەختی سەوز ئاگرتان بۆ بەدی دەهێنێت، ئیتر ئێوە دایدەگرسێنن.ئایا ئەو زاتەی کە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە ناتوانێت دووبارە وەك خۆیان دروستیان بکاتەوە؟! بەڵێ (زۆر چاك دەتوانێت چونکە ئەو زاتە لە دروستکردن و داهێناندا بە توانا و زانایە..

خوای گەورە نمونەی بە هەڵگیرسانی ئاگر هێنایەوە لەدرەختی سەوز، درەخت لە نەبون و دوای بەهۆی ئاوەوە سەو ز بوو گەشەیکرد و بەرهەمیدا و پاشان ووشك بویەوە و ئاگری پیێ خۆشکرا، ئوم نمونەیە زۆر روونە بۆ ئەوانەی عەقڵیان ئەیگرێ.

بۆ ئەوانەش کە جگە لەخوا ئەپەرستن فەرموی: هەموو پەرستراوەکانی جگە لەخوا ناتوانن مێشێك لەخۆیان لادەن و هەرکات مێش شتێکیان لێببات ناتوانن بیگەرێننەوە، هەمو پەرستراوەکانی جگە لەخوا زۆر لاوازن و تواناى لادانی زیان یان هێنانی قازانجیان نییە و توانای خەلقی هیچیان نییە:

﴿ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ تَعْرِفُ فِى وُجُوهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلْمُنكَرَ ۖ يَكَادُونَ يَسْطُونَ بِٱلَّذِينَ يَتْلُونَ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِنَا ۗ قُلْ أَفَأُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكُمُ ۗ ٱلنَّارُ وَعَدَهَا ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٧٢﴾ ﴾ (الحج).

کاتێك کە ئایەتەکانی ئێمە بەروونی و ئاشکرایی بەسەریاندا دەخوێنرێتەوە، لە رووخساری ئەوانەدا کە بێ باوەڕن بێزاری و تاڵی و گرژی بەدی دەکەیت، بەجۆرێك خەریکە هێرش بەرنە سەر ئەوانەی کە ئایەتەکانی ئێمەیان بەسەردا دەخوێننەوە، پێیان بڵێ: ئایا هەواڵتان بدەمێ بە خراپتر لەو کینەو بوغزەتان؟! ئەویش ئاگری دۆزەخە!! کە خوای گەورە بەڵێنی داوە بەوانەی کە بێ باوەڕ پێی، ئای کە سەرەنجام و چارەنووسێکی خراپە..

ئەم نمونەیە لەوپەڕی رونیدایە و ئامازەیە بۆ لاوازی عەقڵی ئەوانەی ئەپارێنەوە لەو بێ دەسەلاَتانە، لەنمونەیەکیتری پەیوەندیدار بەهەمان بابەت ئەفەرموێت: یەکسان نین ئەو دوانەی یەکێکیان چەند خوایەك لەگەڵ خوای تاك و تەنها ئەپەرستێ و دوەمیان تەنها خوای تاك و تەنیا ئەپەرستێ: ﴿ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا رَّجُلًا فِيهِ شُرَكَآءُ مُتَشَٰكِسُونَ وَرَجُلًا سَلَمًا لِّرَجُلٍ هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلًا ۚ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٩﴾ ﴾ (الزمر)، خوای گەورە نموونەی

هێناوەتەوە بە پیاوێك کە گیری خوارد بێت بەدەست چەند بەرپرسێکی شەڕانی و سەرکەشەوە،پیاوێکی تریش تەنها یەك بەرپرسی هەبێت، ئایا ئەو دوو جۆرە نموونەیە، وەك یەکن، سوپاس و ستایش تەنها شایستەی خوایە، نەخێر یەکسان نی یە، بەڵام زۆربەی ئەو خەڵکە لەم ڕاستیە تێناگەن و نایزانن و لێکی نادەنەوە. یەکەمیان خواکانی کێش مەکێشی لەسەر ئەکەن و دوەمیان تەنها خۆی تەسلیمی یەکخواکردوە ئایا ئەو دوانە یەکسانن؟!لای خواش ئەو دوانە یەکسان نابن.

خوای گەورە وەڵامی ئەوانەشی داوەتەوە کە سەرسامبون لەوەی بۆ ئەبێت موحەمەد لەنێوان ئەو هەموو پیاوەدا تایبەت بکرێت و هەڵبژێررێت؟!، لەژیانی خۆیاندا نمونەی بۆ هێنان و سەرنجی ڕاکێشان بۆ ئەوەی خوای گەورە هەروەك چۆن ڕۆزی و بژێوی لەنێوانیاندا دابەشکردوە، هەژا ر و دەوڵەمەند، بەهێز و لاواز، بەرز و نزم هەر بەوشێوەیەش هەندێك تایبەت ئەکات بە ناردنی پەیامەکانی: ﴿ أَهُمۡ يَقۡسِمُونَ رَحۡمَتَ رَبِّكَۚ نَحۡنُ قَسَمۡنَا بَيۡنَهُم مَّعِيشَتَهُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۚ وَرَفَعۡنَا بَعۡضَهُمۡ فَوۡقَ بَعۡضٖ دَرَجَٰتٖ لِّيَتَّخِذَ بَعۡضُهُم بَعۡضٗا سُخۡرِيّٗاۗ وَرَحۡمَتُ رَبِّكَ خَيۡرٞ مِّمَّا يَجۡمَعُونَ ﴿٣٢﴾ ﴾ (الزخرف)، ئایا ئەوانە ڕەحمەتی پەروەردگاری تۆ دابەش دەکەن؟! (کەسانی شایستە دەدۆزنەوە بۆ پێغەمبەرایەتی؟!) لە کاتێکدا ئێمەین کە ڕزق و ڕۆزیمان لە نێوانیاندا دابەش کردووە لە ژیانی دنیادا و پلەو پایەی هەندێکیمان بەرزکردۆتەوە بەسەر هەندێکیاندا، بۆ ئەوەی هەمووان کاروباری یەکتر تەواوبکەن و کەڵك لە توانایی ولێهاتوویی یەکتر وەربگرن، جا لەگەڵ ئەو هەموو بەهرەو بەخششانەدا ڕەحمەت و میهرەبانی پەروەردگاری تۆ (کەتایبەتی ئیماندارانە لە قیامەتدا) لە هەموو ئەو شتانەی کە خەڵکی کۆی دەکەنەوە (لە ماڵ و سامان و هۆکارەکانی ڕابواردن) چاکترو بەنرخترە.ئەگەر تێبگەن و بفامن لەنمونەکە ئەگەن.

**٧/ هەڵوەشانەوەی سەرلەبەری بانگەشە:**

یەکێکیتر لە بەرنامەکانی قورئان بۆ گفتوگۆ لەگەڵ بەرانبەر و ڕونکردنەوەی هەڵەی بیرو درۆی بانگەشەکە ئەوەیە سەرەتا کۆی بانگەشەکە هەڵدەوەشێنێت و ئەمەش لە زانستی دیبەیتدا پێی دەوترێت:هەڵوەشانی کۆی بابەت. پاشان دێتە سەر وردەکاری و برگەکان و ئەوانیش بەتاڵ ئەکاتەوە ئەمەیشیان ناوی هەڵوەشانەوەی درێژەی بابەتە.

لەم جۆرە وەڵامدانەوە ئەوەیە کە خوا وەڵامی ئەوانەی پێداوەتەوە کە بانگەشەی ئەوە ئەکەن بوونی ماڵ و سامان و منداڵ و نەوەنیشانەی ڕازیبونی خوای گەورەیە لێیان و لەخۆشەویستیان ئەو بەهرانەی پێی بەخشیون! ئەمە بەڵگەیەکی واقیعی نییە، بۆیە خوای گەورە بۆی ڕونکردنەوە کە لەوانەیە بە بێباوەڕو تاوانکار ببەخشێت یان لە چاکەکار و باوەڕداریش بگرێتەوە، یان ئەکرێت بە پێچەوانەشەوە، بوون و نەبوون نەستراوە بە ڕەزا و نارەزایی خواوە، هیچیان با لەخشتەتان نەبات و هەرشتێك لەشوێنی خۆی دابنێن، هۆکارەکانی نزیکبونەوە لەخوا دیاریکراوە و نەبەستراوە بە زۆری ماڵ و سامان و کوڕەوە، دەستکەوتنی دونیا هۆکاری تایبەتی خۆی هەیە ئەمەش هەڵوەشانەوەی سەرلەبەری بانگەشەکەیانە.

**٨/ قایلبون بە نەفیکردنی بانگەشە بێنەوەی بەڵگەی بۆ بێنیت:**

ئەم ڕێگایەی قورئان بۆ وەڵامدانەوەی بوختان لەبەر ئەوە نییە نەتوانێ وەڵامی بداتەوە بەڵکو لەبەر بێ ئەرزشی و لاوازی تانە و بوختانەکەیە، بۆیە تەنها نەفی ئەکات و هیچی لەسەر نافەرموێ ئەو شتانەی کە وەك خۆر لەڕۆژی ڕووناکدا دیارن پێویست بە هێنانی بەڵگە ناکات، شاعیریش لەم واتایەدا ئەڵێت:

و ليس يصحُّ في الأذهانِ شيء          إذا أحتاج النهار إلى دليل[٢٠]

---

٢٠- لەبیردا هیچ بەڕاستی نامێنێ ئەگەر بۆ بینینی ڕۆژ بەڵگە پێویست بێ.

بەهەمانشێوە هەموو ئەو بوختانانەی ئەیانکرد بۆ پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێت کە بە شێت و جادوکار و شاعیر و ئەستێرەگرەوە ناوزەدیان ئەکرد خوای گەورە هەمویانی نەفیکرد و ئیتر هیچیتری لەسەر نەفەرموو چونکە پێویست بە بەڵگە ناکات وەك لەم ئایەتانەدا هاتوە: ﴿ مَآ أَنتَ بِنِعۡمَةِ رَبِّكَ بِمَجۡنُونٖ ۝٢ ﴾ (القلم)، (ئەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم تۆ بەهۆی نازو نیعمەتی پەروەردگارتەوە دووریت لە شێتی یەوە وەکو نەفامن دەڵێن)، ﴿ وَمَا صَاحِبُكُم بِمَجۡنُونٖ ۝٢٢ ﴾ (التکویر)، دڵنیابن کە هاورێکەتان محمد (صلی الله علیه وسلم) شێت نیە و (لەکەماڵی ژیریدایە). ﴿ فَذَكِّرۡ فَمَآ أَنتَ بِنِعۡمَتِ رَبِّكَ بِكَاهِنٖ وَلَا مَجۡنُونٍ ۝٢٩ ﴾ (الطور)، ئەی محمدﷺ ئامۆژگاری ئەوخەڵکە بکە، چونکەبەهۆی نازو نیعمەتی پەروەردگارتەوەنەفاڵچیت، نەشێتی، ﴿ أَمۡ عِندَهُمُ ٱلۡغَيۡبُ فَهُمۡ يَكۡتُبُونَ ۝٤١ أَمۡ يُرِيدُونَ كَيۡدٗاۖ فَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ هُمُ ٱلۡمَكِيدُونَ ۝٤٢ ﴾ (الحاقة)، دڵنیابن کە ئەم قورئانە گوفتاری شاعیر نیە، ئەوە بۆ زۆر کەمتان باوەڕ دەهێنن؟! گوفتاری فاڵچی و زێوانیش نیە، ئەوە بۆ زۆر کەمتان یاداوەری وەردەگرن؟! .بێباوەڕان و نەیارانی پێغەمبەر ئەگەر بە وویژدانبن بەسە بۆیان بەس سەیری حاڵی پێغەمبەر بکەن چونکە لەناوخۆیاندا ژیاوە و مومارەسەی جادو ئەستێرەگرتنەوەی نەکردوە و ڕەوشت و ئاکاریشی هیچ نیشانەیەکی شێتی پێوە نەبووە، بەڵکو لەوپەڕی ڕوشت بەرزیدا بوە و بە کەمترین سەیرکردن دەرئەکەوێت کە هەموو ئەو ناوزەدکردنانەی بێباوەڕەکان بۆ پێغەمبەر ستەمێکی گەورەبووە، بۆیە بۆ بەتاڵکردنەوەی ئەو تۆمەتانە تەنها نەفیکردنی تۆمەتەکە بەسە چونکە بەڵگەکانی ئەبینرێن و ڕونن بۆ هەموو خاوەن چاوو عەقڵێك.

### ٩/ بەکارهێنانی ڕەوانبێژی لە پەرچدانەوە و کورتبڕی لە وەڵامی بەرانبەردا:

وەك زانـراوە قورئـان بـەرزترین دەقـی ڕەوانبێژییـە چـونکە لای خـوای ستایشـکراوی داناوە دابەزیوە، بۆیە لە گفتوگۆی لەگەڵ نەیارانیـدا بـەهێزترین و کـورترین دەسـتەواژە بەکار ئەهێنێت کە واتای زۆر و ئاماژەی قوڵی تێدابێت.

بۆنمونە کاتێك دووڕووەکان تانەیان ئەدا لە پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێت بەوەی گوێ بۆ هەموو قسەیەك ئەگرێت و باوەڕی پێ ئەکات قورئان لە ڕەدی ئەواندا فەرموی:

﴿ وَمِنْهُمُ ٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱلنَّبِيَّ وَيَقُولُونَ هُوَ أُذُنٌ قُلْ أُذُنُ خَيْرٍ لَّكُمْ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَيُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِينَ وَرَحْمَةٌ لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ رَسُولَ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦١﴾ ﴾ (التوبة).

هەندێکی تر (لە دووڕووەکـان) ئەوەنـدە نـەفامن، ئـازاری دڵـی پێغەمبـەرﷺ دەدەن، بەوەی کە دەڵێن: (محمد) گوێ بۆ هەموو کەس دەگرێت، پێیان بڵێ: گوێ بیستی خێـرە بۆتـان، بـاوەڕی پتـەوی بـەخوا هەیـە، بـاوەڕی (بـە ڕاسـتگۆی) ئیمانـدارانیش هەیـە، ڕەحمەتیشە بۆ ئەوانەتان کە باوەڕیان هێناوە، (بەڵام) ئەوانەی ئـازاری پێغەمبـەری خـوا دەدەن سزایەکی بەئێش بۆیان ئامادەیە.

ئەمە دەستەواژەیەکی کورتە و دونیایەك واتا لەخۆ ئـەگرێت، لەوانـە: بـەڵێ ئـەو گـوێ ئەگرێت بەڵام بەخێر نەك بەوەی ئێوە ئـەیڵێن، پێغەمبـەر لـە ووتراوەکـان تـەنها هـەق و شەرعییەکان و ئەوەی بەرژەوەندی تێدایە قبولّ ئـەکات، ئـەو گوێڕایـەڵی درۆ و ناهـەق و بوختان نییـە و هـەرکات لـەم خراپانـەش ببیسـتێ بـا سوێندیشـی لەگەڵدا بێـت بـاوەڕی پێناکـات، پێغەمبـەر پێچـەوانەی پادشـا و دەسـەڵاتدارانیترە کـە هەمیشـە کۆمـەڵێك لەکەسانی دووڕ و چواردەوریان ئەگرن و بە زمانی لوس و درۆ و بوختان کەسانی چاکیان لێدوردەخەنـەوە. ئـەی درۆزنـەکان ئێـوە نەخەڵـەتێن بـەوەی پێغەمبـەر لـوتفی هەیـە بەرانبەرتان و خراپەکانتان لە ڕووتان ناداتەوە، ئەوە لە ڕەوشتی بەرزییەتی، لـە فراوانـی لێبوردەیی پێغەمبەرە ئەگەرنا هەموتان باش ئەناسێت.

قورئـان لێرەشـدا شـێوازێکیتری دانایانـە بـەکار ئـەهێنێت ، لەسـەرەتادا لەگـەڵیان هاوڕائەبێت بەوەی بەڵێ پێغەمبەر گوێ لەهـەموی ئـەگرێت و لەبڕگـەی دوەمـدا پەرچیان ئەداتەوە و بانگەشـەکەیان هەڵئەوەشـێنێ بـەوەی تـەنها ئـەوەی خێـرو چاکەیە قبـوڵی ئەکات! هیچ وەڵامێك ئەوەنەی ئـەم وەڵامـە بـەهێز و کاریگـەر نابێـت، سـەرەتا تـەماحی ئەوەیان لادروست ئەکات کە قسەکەیان وایە بەڵام یەکسەر نائومێدیان ئەکات، هیچ شتێك ئەوەندە بڕندە نیە تەماح بخیتەبەری کەسێك پاشان نائومێدی بکەیت.

نمونەیەکیتر بۆ ئـەم جـۆرە وەڵامـە لەقورئانـدا: بڕینـی بیـانوی ئـەو جولەکانـەبوو کـە ئەیانووت: ئێمە بۆیە ئیسلام قبولٚ ناکەین چونکە جوبرەئیل قورئانی دابەزاندوە و ئەگـەر میکائیل بوایە ئەوا باوەڕمان ئەهێنا و جوبرەئیلیان وەك دوژمنـی خۆیـان سـەیر ئـەکرد، خوای گەورەش فـەرموی: ﴿ قُلْ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُۥ نَزَّلَهُۥ عَلَىٰ قَلْبِكَ بِإِذْنِ ٱللَّهِ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿٩٧﴾ ﴾ (البقرة)، (ئەی محمد ﷺ) پێیان بڵێ: هەر کەسێك دوژمنی جوبرەئیلە، (با بزانێت) کـە هـەر ئـەو جوبرەئیلـە بـە فـەرمانی خـوا ئـەو قورئانەی دابەزاندۆتە سەر دڵت کە کتێبە پێشووەکان بەڕاست دادەنێت و ڕێنمـوویی (بـۆ چاکە) دەکات و مژدە بەخشیشە بە ئیمانداران. خوای گـەورە بـۆی ڕونکردنـەوە ناکرێـت لەبـەر هۆکـاری پڕوپـوچ هیدایـەت ڕەدکرێتـەوە و باوەڕنـەهێنرێت، هەرکـەس دوژمنـی جوبرەئیل بێـت دوژمنـی میکائیلیشـە و دوژمنـی هـەموو هـەق و نوێنـەرەکانی هەقیشـە، هـەروەك چـۆن ئـەوەی دوژمنایـەتی یـەك پێغەمبـەر بکـات دوژمنایـەتی هـەموو پێغەمبـەرانیکردوە چـونکە کـاری پێغەمبـەران و سەرچـاوەکەیان هـەموی یەکێکـە، بۆیـە ئەفـەرموێت: ﴿ كَذَّبَتْ عَادٌ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٢٣﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ هُودٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٢٤﴾ ﴾ (الشـعراء)، قـەومی عادیش بەرنامەی هەر هەموو پێغەمبەرانیان بە درۆزانی.کاتێك (هود)ی پێغەمبەری برایان پێی وتن: باشە، ئێوە لە خوا ناترسن، پارێزکار نابن. هـەروەها ئەفـەرموێ: ﴿ كَذَّبَتْ ثَمُودُ

ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٤١﴾ ﴾ (الشعراء)، قەومی (ثمود) یش بڕوایـان بـە پێغەمبـەرانیان نـەکرد. ئـەوان تەنها پێغەمبەری خۆیان بەڕاست نەزانی بـەلأم وەك ئەوەیـە هـەمو پێغەمبـەران بەڕاسـت نەزانن. ئەمانە نمونەی کورتبڕییـە لەقورئانـدا کـە هـەرخۆی ئـەم تایبەتمەندییـەی هەیـە، بەمشێوەیە قورئان بەتاڵی و ناهەقی بیانوی باوەڕنەهێنانی ئەوانی بەقورئان دەرخست.

**١٠/ بـانگکردن بـۆ ووردبـونەوە لە هۆکـاری کێشـە و ڕامـان لەبـابەت دور لەچـاولێکەری و نارەزوبازی:**

لەبەرنامەکانی قورئان ئەوەیە تیشك بخرێتەسەر ئەو بابەتەی کە کێشەکەی لەسەرە و وازهێنان لە قاڵەقاڵ و چەلەحانێ لەو بابەتە لاوەکیانەی لە نـاوەڕۆکی بابەتەکـەوە دورن، ڕامان لەناوەڕۆکی بابەتەکە و وازهێنان لە چاولێکەری کوێرانە و دەمارگیری بۆ باوباپیران و ئەو بیرۆکانەی بێ بنەمان.

قورئـان نـەیارەکانی بـانگ ئـەکات بـۆ پابەنـدبوون بـەو بنەمایـەی هـەموو خـاوەن سروشتێکی پاك و عاقڵەکان لەسەری کۆکن، عاقڵ بـەدوای ڕاسـتیدا ئەگـەڕێت لـە ڕێگـای بەڵگە عەقڵییەکانەوە.

بۆ نمونە کاتێك بێباوەڕەکان وتیان ئێمە دڵمان لێوان لێوە لە زانیاری و پێویسـتیمان بە ڕێنمایی موحەمەد نییە، خوای گەورە وەلأمی دانەوە کە ئەوان دڵیان مـۆری لێـدراوە و چەقبەستوە بە چاولێکەری بێباوەڕی و بە چاوی پەند و بەبیری زینـدوە وە نـەیانڕوانیوە بۆیە باوەڕناهێنن هەرکەس سەیر نەکات نابینێـت، هەرکەسـیش نـەبینێت باوەڕناهێنێـت، سەیرکردن و ڕامان لەتوانای هەموو کەسدایە، بەلأم ئەوان بە لاساییکردنەوەی باوبـاپیران و دەمارگیرییەوە خوویـانگرتووە: ﴿ فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَٰقَهُمْ وَكُفْرِهِم بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَقَتْلِهِمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَقَوْلِهِمْ قُلُوبُنَا غُلْفٌۢ ۚ بَلْ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَيْهَا بِكُفْرِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٥٥﴾ ﴾ (النسـاء)، ئینجـا بـەهۆی پـەیمان شـکاندنیان و بـێ باوەڕیـان بەئایەتـەکانی خـواو کوشـتنی بەناحـەقی

پێغەمبەران لەلایەن ئەوانەوە و ئەو قسەیەشیان کە دەڵێن دڵی ئێمە داخراوە و بەرگی پێوەیە (مەبەستیان ئەوەیە کە ئامادەنین گوێ بۆ هیچ ڕاستیەك بگرن، خوا خەشمی لێگرتن و نەفرینی لێکردن) نەخێر بەو جۆرە نیە کە ئەوانە دەیلێن، بەڵکو خوا مۆری ناوە بەسەر دڵ و دەروونیاندا بەهۆی بێ باوەڕ بوونیانەوە، جا هەر بۆیە کەمێکیان نەبێت باوەڕناهێنن.

ئەو بیانوەی موشریکەکان کە بۆ ڕەدکردنەوەی پەیامی پێغەمبەران و داواکاریان بۆ زیندوکردنەوەی ئەوانەی بەسەرچوون تەنها یاریکردن و خۆلادان و خۆلکردنە چاوە، پەنابردنە بۆ چەکی دەستی کەسی دەسەوسانی لەخۆبایی، خۆدزینەوەیە لە لێکۆڵینەوە و گەڕان بەدوای کرۆکی بابەت: ﴿ هَٰذَا كِتَٰبُنَا يَنطِقُ عَلَيۡكُم بِٱلۡحَقِّۚ إِنَّا كُنَّا نَسۡتَنسِخُ مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٢٩﴾ ﴾ (الجاثیة، صادقین) ئەمە ئیتر نامەی کردەوەکانتانە کە تۆمارمان کردووە لەسەرتان، خۆی گوایە قسە دەکات و حەق وێژە (دیارە کردەوەکانمان تۆمار کراوە لەسەر دەزگای زۆر پێشکەوتوو) چونکە بەڕاستی ئێمە کاتی خۆی ئەوەی ئێوە دەتان کرد لەبەرمان دەگرتەوە.

نمونەیەکیتر: موشریکەکان بانگەشەی ئەوەیان ئەکرد بوونی هەژارەکان لەدەوری پێغەمبەران وایکردوە کە خەڵکیتر شوێن پێغەمبەران نەکەون و فراوانی و ڕۆزی و خۆشگوزەرانی بەڵگەیە لەسەر ڕاستی بیروباوەڕی خاوەنەکەی و خوا لەبەر باشییان ئاوا دونیای بۆ ئاسانکردون، بەلام قورئان بۆی ڕونکردنەوە کە ئەم قسانە خۆلادانە لە کرۆکی بابەتەکە و ئەوان پێویستە لە پەیامی پێغەمبەران ووردببنەوە ئایا هەقە یان نا، نەك لە شوێنکەوتوەکانیان ئایا هەژارن یان خانەدان، نوح پێغەمبەر نەفامی گەلەکەی ڕونکردەوە لەم بارەیە و وەك لە قورئاندا هاتوە فەرمویەتی: ﴿ وَيَٰقَوۡمِ لَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مَالًاۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِۚ وَمَآ أَنَا۠ بِطَارِدِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْۚ إِنَّهُم مُّلَٰقُواْ رَبِّهِمۡ وَلَٰكِنِّيٓ أَرَىٰكُمۡ قَوۡمٗا تَجۡهَلُونَ ﴿٢٩﴾ ﴾ (هود)،

ئـەی خزمـەکانم (خـۆ مـن) لـە بـری ئـەم بانگـەواز و ئامۆژگاریانـەم داوای هـیچ مـالّ و خەرجیتان لێناکەم، کرێ و پاداشتم تەنها لای خوایە، من هەرگیز ئەوانەی بڕوایان هێناوە لە خۆم دوور ناخەمەوە و دەریان ناکەم، چونکە بێگومان ئەوان ئەگەن بـەخوای خۆیـان، حیسابیان لای خوایە، بـەڵام بەڕاسـتی مـن ئێـوە ئـەبینم هـۆزێکن خۆتـان گێـل و نـەفام دەکـەن (بـەوەی بـە کـەم سـەیری ئیمانـداوانی دەوری مـن دەکـەن لەبـەر بـێ کەسـی و هـەژاریان). بێبـاوەڕبوونی هەنـدێ لـە دەوڵەمەنـدەکان و باوەڕهێنـانی هـەژارەکان تاقیکردنەوەیە، دارابوون نیشانەی بەڕێزی نییە و نەبونیش نیشانەی بێ ئەرزشی نییـە، بەڵام خوای گەورە خەڵکان بەیەکتر تـاقی ئەکاتـەوە، خـەڵك ئـەبێت لـە کرۆکـی بانگـەواز بکۆڵێتەوە و مەبەستی خوا لـەناردنی پێغەمبـەران بزانێـت ﴿ أَوَلَمْ يَعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٢﴾ ﴾ (الزمـــر)، ئایـا نەیانـدەزانی کـە بەڕاسـتی هـەر خـوا ڕزق و ڕۆزی دەبەخشـێت بـە هـەر کـەس کـە بیـەوێت، یـان تـەنگی دەکاتەوە؟ بێگومان ئا لەو (کەم و زۆری ڕزق و ڕۆزیەدا) بەڵگە و نیشـانەی زۆر هەیـە بـۆ کەسانێك کـە ئیمـان دەهێـنن و باوەڕیـان هەیـە. هـەروەها ئەفـەرموێ: ﴿ وَمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَلَآ أَوْلَـٰدُكُم بِٱلَّتِى تُقَرِّبُكُمْ عِندَنَا زُلْفَىٰٓ إِلَّا مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَـٰلِحًا فَأُو۟لَـٰٓئِكَ لَهُمْ جَزَآءُ ٱلضِّعْفِ بِمَا عَمِلُوا۟ وَهُمْ فِى ٱلْغُرُفَـٰتِ ءَامِنُونَ ﴿٣٧﴾ ﴾ (سباء)، (لەڕاستیدا) نە ماڵتان و، نە نەوەتان شـتێك نـین کـە ببنـە هۆی نزیکبوونەوەتان لە ئێمە، (یا ڕازیبوونی ئێمە لێتـان)، بـەڵکو ئەوانـەی کـە باوەڕیـان هێناوەو کاروکردەوەی چاکە ئەنجامدەدەن (ئەوانە نزیکن لـە ئێمـەوەو ڕێزیـان لای ئێمـە هەیە) ئا ئەوانە پاداشتیان چەند بەرابەرە بەهۆی کردەوەی چاکیانەوە، هەر ئەوانیش لـە کۆشك و تەلارەکانی (بەهەشتدا) بە ئاسودیی و ئارامیی و خۆشیی، ژیان دەبەنە سەر.

قورئان ئاگاداری ئەدات لە خراپی چاولێکەری و شوێنکەوتنی خەڵکی بەبێ بنەمایەکی دروست، هەروەك چۆن لادان بـۆ لای ئـارەزو بـەبێ زانیـاری هەرمەترسـیدارە، ئـەم بنـەما

قورئانییە زۆر زانستییە و کەس پێچەوانەی ئەمە نالێت: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّبِعُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُواْ بَلْ نَتَّبِعُ مَآ أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَآۗ أَوَلَوْ كَانَ ءَابَآؤُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَهْتَدُونَ ﴿١٧٠﴾ ﴾ (البقرة)، ئەگەر بەو خەڵکە نادانە بوترێت: شوێنی ئەو بەرنامەیە بکەون کە لەلایەن خواوە رەوانە کراوە، دەڵێن: نەخێر، هەر شوێنی ئەوە دەکەوین کە باوو باپیرانمان پێوەی ئالوودە بوون و لەسەری راهاتوون، ئایا ئەگەر باوو باپیرانیشیان تێ نەگەیشتوو هیچ نەزان و ناشارەزاو رێنموویش وەرنەگرن (هەر شوێنیان دەکەون؟!). ﴿ بَلِ ٱتَّبَعَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ أَهْوَآءَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍۖ فَمَن يَهْدِى مَنْ أَضَلَّ ٱللَّهُۖ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾ (الروم )، نەخێر، ئەوانە ژیر نابن، بەڵکو ئەوانەی ستەمیان کردووە شوێنی ئارەزووی خۆیان دەکەون دوور لە هەموو بنەمایەکی زانستی و زانیاری، جا ئیتر کێ دەتوانێت رێنموویی ئەو کەسانە بکات خوا گومرای کردوون (ئەڵبەتە خۆیان رێگەی گومراییان هەڵبژاردووە، خوای گەورەش بە زۆر هیدایەتی کەس نادات)، کەسیش پشتیوان و یارمەتیدەریان لە سزای سەخت بیانپارێزێت. بەمشێوە چاولێکەری کوێرانە و لادان بەلای ئارەزودا بەبێ زانیاری لە ترازوی قورئان و زانستدا هیچ ئەرزشێکی نییە.

**١١/ بانگکردن بۆ رامان لە قورئان و ووردبونەوە لە واتاکانی:**

زۆرجار ئەبینین قورئان لە گفتوگۆکانی لەگەڵ نەیارانیدا داوائەکات : لە قورئان و واتاکانی رابمێنن بەتایبەت لەو شوێنانەی پەیوەندی بە تانە و بوختانەکانی موشریکەکانەوە هەیە، ئەگەر ئەوان بە جوانی قورئانیان بخوێندایە و لەواتاکانی ووردبونایەتەوە ئەوا بۆیان روون ئەبویەوە کە قورئان وەك هیچ خوێنراوێکیترنییە و قسەی مرۆڤ نییە، دژەوانەی تێدا نییە هەمووی یەکپارچەیە و لاری تێدا نییە.

دوای رامان و وردبونەوە تێدەگەن کە نە موحەمەد درودی خوای لەسەر بێت نە بێجگە لە ئەویش کەس ناتوانێت لەخۆیەوە وەك ئەم قورئانە بهێنێت، چونکە قورئان مەعجیزەیە

له بنەما و یاسا و ئاداب و ئەخلاق و شەریعەت وبەڕیوەبردنی گەل و نەتەوە و شێوازی دەربڕین و ئاوەدانی و نمونە هێنان و وتنەوەی یەك چیرۆك بەچەند جۆری جیاواز لە دەربڕین، ئەو زانستە زۆرەش لە جیهانی نادیار، هەواڵی ئەو مێژوەی کە پێغەمبەر تیایدا نەژیاوە و نادیارەکانی سەردەم کە هەموو ئەمانەش لەگەڵ عەقڵ سروشتدا بگونجێن و دژوانەو ناڕێکییەکی تێدا نەبێت ! نەك هەر ئەوەندە بەڵکو لەکرۆکی مەبەستەکان ئەدات بیانوەکانیش ئەبڕێت.

بەمشێوە هەرکەس لە قورئان ڕابمێنێت ئەگاتە ئەوەی کە قورئان لای خوای تاك و تەنهاوە هاتوەخوای گەورە لە سورەتی نیسائدا ئەفەرموێ:﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ ۚ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُوا۟ فِيهِ ٱخْتِلَٰفًا كَثِيرًا ﴿٨٢﴾ ﴾ (النساء)، ئەوە بۆ ئەوانە سەرنجی قورئان نادەن و لێکی نادەنەوەو لێی وردنابنەوە؟ خۆ ئەگەر لە لایەن کەسێکی ترەوە بوایە جگەلە خوا بێگومان جیاوازی و دژایەتیەکی زۆریان تێدا دەدۆزیەوە. لە کەهفیشدا ئەفەرموێ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبْدِهِ ٱلْكِتَٰبَ وَلَمْ يَجْعَل لَّهُۥ عِوَجَا ۜ ﴿١﴾ ﴾ (الكهف)، (سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی ئەم کتێبە کە قورئانە بۆ سەر بەندەی خۆیﷺ دابەزاندووە، هیچ کەم و کووڕی و ناتەواویەکیشی بۆ ڕەوا نەداوە.)﴾و لە زومەریشدا ئەفەرموێ:﴿ ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ ٱلْحَدِيثِ كِتَٰبًا مُّتَشَٰبِهًا مَّثَانِىَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهْدِى بِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴿٢٣﴾ ﴾ (الزمــــر)، خوا جل جلا لە جوانترین و پیرۆزترین فەرمایشتی ناردۆتە خوارەوە کە ئەم قورئانەیە، (لە جوانی داڕشتندا) بابەتەکانی لە یەك دەچن، هەندێك باسیشی بەشێوازی جیاواز تیادا دووبارە بۆتەوە، جا کارکردی ئەم قورئانە ئەوەیە کە: تەزوو دەهێنێت بە گیان و پێستی ئەوکەسانەدا کە ترسی پەروەردگاریان لە دڵ و دەرووندا هەیە، پاشان گیان و پێست و دڵیان نەرم و ئامادە و چالاك دەبێت بۆ یادی خواو خواپەرستی ئا ئەوە هیدایەت و

ڕێنموویی خوایە کە هەر کەس شایستە بێت هیدایەت و ڕێنموویی دەکات بۆ پلەو پایە بەرزانە، ئەوەش کە ڕێبازی خوا ون بکات کەس نیە ڕێنموویی بکات.

لە سەرەتاکانی قورئانیشدا بە ڕستەیەك بێباکی خۆی دەردەخات لەهەموو خوێنەرێکی کە بتوانن هەڵەیەك یان دژەوانەیەکی تێدا بدۆزنەوە و دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ ٱلْكِتَٰبُ لَا رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ۝٢ ﴾ (البقرة)، ئەو قورئانە کتێبێکە هیچ گومانێکی تێدا نیە، (کە لە لایەن خوای پەروەردگارەوە ڕەوانە کراوە بە جبرەئیلدا بۆ پێغەمبەر ﷺ کە مایەی ڕێنمووی و سەرچاوەی هیدایەتە بۆ خواناسان و پارێزکاران (کە ئەوانەن فەرزەکان جێبەجێ دەکەن و لە حەرام خۆیان دەپارێزن، لە ڕووی بیروباوەڕو کردارو گوفترەوە).

ئەمە پێچەوانەی هەموو نوسەرێکە لە سەرەتای نوسینەکەیان داوای لێبوردن ئەکەن لەهەر کەمو کوڕییەك لەنوسینەکەیاندا هەبێت ، بەلآم قورئان هیچ گومان و لارییەك تێیدا بوونی نییە، لە سورەتی تاریقدا دەفەرموێ﴿ وَمَا هُوَ بِٱلْهَزْلِ ۝١٤ ﴾ (الطارق)، بەڕاستی ئەم قورئانە گوفتارێکی جیاکەرەوەیە (جیاکەرەوەی حەق و ناحەق، ڕاست و درۆ، چاك و خراپ و، ... هتد).ئەم قورئانە گوفتارێکی گەڵتە نیە..

بەڕاستی هەرکەس ووردبێتەوە و ڕابمێنێ لە قورئان بەڵگەی یەکلاکەرەوەی دەست دەکەوێت کە قورئان هەموی ڕاستە، هەواڵەکانی لە نادیار و زانست و شەریعەت و شێوازی دەربڕینی هەموی موعجیزەن ، واتاو مەبەستەکانی بڵندن، لە کورتبڕی و ڕەوانبێژی و نهێنییە زۆرەکانی زانستیدا بێوێنەیە، هەروەها هەمو ئەمانە و هاتنی لەسەر زمانی نەخوێندەوارێك کە زانستەکانی نەخوێندبێت، بەهێزی دەستەواژە و هەواڵە مێژوییەکانی، بەرنامە چاکسازییەکانی، ناسکی و پاراوی و شیاوی بۆ هەموو سەردەمێك، بەهێزی بەڵگەکانی، سەرسوڕهێنەری لە ڕیزبەندی ئایەت و سورەتەکان، جوانی لە گواستنەوەی بابەت و چیرۆکەکان، پارێزراوی لە خورافە و بێهودەیی، بێگەردی لە دەربڕین، ئەمانە و جگە لە ئەمانەش لە ڕووەکانی موعجیزەبوونی قورئانن.

**١٢/ خوێندنەوەی مێژوو پەند لێوەرگرتنی بەشێوەی کرداری:**

لەبەرنامەکانی قورئان بۆ گفتوگۆی لەگەڵ بەرانبەر: هێنانی ڕوداو و بەسەرهاتەکانی مێژووە و بەستنەوەی بە واقعیی کردارییەوە، ئەمە بۆ کاتێکە کە بەڵگە عەقڵییەکان لەگەڵ هەندێ کەس دادی نەدا، و دواندنەکانیش سودی نەبوو، ئەوکات قورئان بانگیان ئەکات بۆ پیاچونەوەی مێژوو سەیرکردنی لاپەرەکانی بۆ ئەوەی ببینن چەندەها گەل و نەتەوەی بەهێز هەبوون بەخوا کافربوون و ئازاری پێغەمبەرەکەیان داوە و دژایەتی هەقیانکردوە ئەوکات تورەیی خوا بۆ ئەوان دابەزیوە و کە کەسیان نەیانتوانیوە لێی دەربازبن، هەمویان بوونەتە پەندی زەمانە، لە قورئاندا بابەتی مێژوویی لەگفتوگۆی نەیاراندا زۆر بەڕونی دیارە و گرنگی پێدراوە، چونکە لەوێدا ئەکرێت پەند لە تیاچوەکان وەربگیرێت وچاککارانیش بکرێنە سەرمەشق.

لەگەڵ ئەمانەشدا ڕووداوەکان ڕاستن و واتاکانی دروستن، هەرکەس لە ئامانج و پەند و ئامۆژگارییەکان ووردبێتەوە ئەگاتە ڕاستییەکان، مێژوش گەورەترین مامۆستایە.

بۆنمونە کاتێك بێباوەڕەکان نکولیان لە پەیامی پێغەمبەری ئیسلام کرد و ووتیان: ﴿ مَا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِي الْمِلَّةِ الْآخِرَةِ إِنْ هَٰذَا إِلَّا اخْتِلَاقٌ ﴿٧﴾ ﴾ (ص)، ئێمە ئەم دەنگوباسەمان لە کۆتا ئایندا (کە ئاینی مەسیحیە و سێ خوا دەپەرستن) نەبیستووە ! ئەمە هەر تەنها شتێکی دەست هەڵبەست و دروستکراوە ! ! خوای گەورە بە پێغەمبەری فەرموو با سەیرێکی مێژوی کۆن و تازە بکەن ﴿ قُلْ مَا كُنتُ بِدْعًا مِّنَ الرُّسُلِ وَمَا أَدْرِي مَا يُفْعَلُ بِي وَلَا بِكُمْ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰ إِلَيَّ وَمَا أَنَا إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٩﴾ ﴾ (الاحقاف)، ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ : کەمن یەکەم پێغەمبەرو تازەپەیدابوو نیم، ناشزانم چیم بەسەر دێت، چیش بەسەر ئێوە دێت ؟ ( چونکە غەیب زان نیم و لەنهێنی و شاراوەکان ئاگادار نیم )، من تەنها شوێنی ئەو وەحی و نیگایە دەکەوم کەپێم دەگات و من تەنها بێدارکەرەوەیەکی ئاشکرام .

موحەمەد یەکەم پێغەمبەرێك نییە لەدەرگای جیهانی دابێت بەڵکو مێژوو هەواڵی زۆرێك لە پێغەمبەران و شوێنکەوتەکانیانی بۆ بەجێهێشتوین و هەواڵی سەرکەوتنی پێغەمبەرانیش زانراوە، بۆیە فەرمانیکرد کە پێغەمبەرش بە گەلەکەی بڵێت: خوا منی بە شتێکی نامۆوە نەناردوە تا ئێوە پێغەمبەرایەتی من بەدوور بزانن، هەموو گەلەکانی پێش ئێمە پێغەمبەریان بۆ نێردراوە: ﴿ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ بِٱلۡحَقِّ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗاۚ وَإِن مِّنۡ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٞ ﴿٢٤﴾ ﴾ (فاطر)، بێگومان ئێمە تۆمان ڕەوانەکردووە بەحەق و ڕاستییەکی تەواوەوە، تۆ مژدەدەری (ئیماندارانیت)، ترسێنەری (بێ بڕواکانیت) هیچ گەل و نەتەوەیەکیش نەبووە کە فرستادە و بێدارکەرەوەیەکی بۆ ڕەوانە نەکرابێت. و بەڵگەکانیش ئاماژەن بۆ ڕاستی پەیامەکەی موحەمەد و سەردەمیش شایەتە بۆ زەرورەتی هاتنی پێغەمبەر.

نمونەیەکیتر کاتێك تانەیان لە پێغەمبەر ئەدا و ئەیانووت خواردن ئەخوات و بەبازاڕدا ئەسوڕێتەوە و ئەمەیان بە عەیب و عار ئەزانی بۆ پێغەمبەر، خوای گەورە بانگیکردن بۆ خوێندنەوەی مێژوو کە هەموو پێغەمبەران هەمویان بەوشێوە بوون: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا قَبۡلَكَ مِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ إِلَّآ إِنَّهُمۡ لَيَأۡكُلُونَ ٱلطَّعَامَ وَيَمۡشُونَ فِي ٱلۡأَسۡوَاقِۗ وَجَعَلۡنَا بَعۡضَكُمۡ لِبَعۡضٖ فِتۡنَةً أَتَصۡبِرُونَۗ وَكَانَ رَبُّكَ بَصِيرٗا ﴿٢٠﴾ ﴾ (الفرقان)، ئێمە پێش تۆ (ئەی محمد ﷺ) هیچ کەسێکمان لە پێغەمبەران ڕەوانە نەکردووە کە خواردنیان نەخواردبێت، یان بە بازاڕدا نەگەڕابن، ئێمە هەندێك لە ئێومان کردۆتە هۆی تاقیکردنەوەی هەندێکی ترتان.. ئایا خۆدەگرن و خۆڕاگر دەبن، بێگومان پەروەردگاری تۆ هەمیشە و بەردەوام بینایە (بە هەڵسوکەوتی بەندەکانی). ﴿ وَمَا جَعَلۡنَٰهُمۡ جَسَدٗا لَّا يَأۡكُلُونَ ٱلطَّعَامَ وَمَا كَانُواْ خَٰلِدِينَ ﴿٨﴾ ﴾ (الانبياء)، ئێمە وە نەبێت ئەو پێغەمبەرانەمان لە پەیکەر و لاشەیەك دروست کردبێت کە خواردن نەخۆن و ژیانی هەمیشەیشمان پێ نەبەخشیوون. کاتێکیش جولەکە باوەڕهێنانیان بەستەوە بەمەرجی هێنانی قوربانێك کە ئاگری تێبەربێت، خوای گەورە

وەڵامی دانەوە کە لەمێژودا پێغەمبەرتان بۆ هات و ئەو نیشانەیشی بۆ هێنان کەچی هەوڵی کوشتنی ئەوانیشتان ئەدا و مێژوو شایەتی ئەمەیە: ﴿ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ عَهِدَ إِلَيۡنَآ أَلَّا نُؤۡمِنَ لِرَسُولٍ حَتَّىٰ يَأۡتِيَنَا بِقُرۡبَانٖ تَأۡكُلُهُ ٱلنَّارُۗ قُلۡ قَدۡ جَآءَكُمۡ رُسُلٞ مِّن قَبۡلِي بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَبِٱلَّذِي قُلۡتُمۡ فَلِمَ قَتَلۡتُمُوهُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿١٨٣﴾ ﴾ (ال عمران)، (ئەو جوولەکانەی) دەڵێن: خوا پەیمانی داوە بە ئێمە کە بە هیچ پێغەمبەرێك باوەڕ نەکەین تاقوربانیەکمان بۆ نەهێنێت و (نەیبینین) ئاگر دەیخوات و دەیسوتێنێت و لە ناوی دەبات، (ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم) پێیان بڵێ: خۆ ژمارەیەك پێغەمبەر لە پێش منەوە ڕەوانەکران بۆتان بەچەندەها بەڵگەو نیشانەی ئاشکراوە و بەو داخوازیەشەوە کەوتتان، جا بۆ کوشتانن و (شەهیدتان کردن) ئەگەر ئێوە ڕاستگۆن؟!

کاتێکیش موشریکەکانی مەککە بیانوی شوێننەکەوتنیان بۆ پێغەمبەر بەوە ئەهێنایەوەکە ئەگەر موسڵمان ببن مەترسی لەسەر ژیانیان دروست ئەبێت و بژێوی و رۆزییان دابین نابێت، خوای گەورە لاوازی بیانوەکانیانی ڕونکردەوە بەوەی کە لە مێژوشدا ئەوان بەهۆی پێگەی مەکەوە پارێزراوبون ئیتر چۆن لە ماڵەکەی خوا ئەمێننەوە و لە ڕۆزی خوا ئەخۆن و جگە لەخوا ئەپەرستن:

﴿ وَقَالُوٓاْ إِن نَّتَّبِعِ ٱلۡهُدَىٰ مَعَكَ نُتَخَطَّفۡ مِنۡ أَرۡضِنَآۚ أَوَلَمۡ نُمَكِّن لَّهُمۡ حَرَمًا ءَامِنٗا يُجۡبَىٰٓ إِلَيۡهِ ثَمَرَٰتُ كُلِّ شَيۡءٖ رِّزۡقٗا مِّن لَّدُنَّا وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٥٧﴾ ﴾ (القصص).

(قورەیش و باوەڕلاوازان لە هەموو سەردەمێکدا) دەیانوت: ئەگەر ئێمە شوێنی هیدایەت و بەرنامەی ئیسلام بکەوین لەگەڵ تۆدا لە وڵاتی خۆماندا دەفڕێنرێین و تووشی نەهامەتی دەبین، مەگەر ئێمە شوێنێکی دوور لەستەم و پڕ لە ئاسایشمان بۆ فەراهەم نەهێناون کەجۆرەها بەروبوومی بۆدێت و لە هەموو ناز و نیعمەتێك بەهرەوەر؟ هەموویشی ڕزق و بەخششن لەلایەن ئێمەوە، بەڵام زۆربەیان نازانن و هەست بەدەسەڵاتی ئێمە ناکەن..

### ١٣/ دەرخستنی مەبەست و بەرژەوەندییەکان لە فەرمان و یاساو ڕێساکانی خواییدا:

ئەوەی کە ڕوونە قورئان لە دواندنی بەرانبەر و جگە لە موسڵماناندا کاتێك ئەوان ڕێگری ئەکەن لە فەرمان و شەریعەتەکانی خوا، قورئان کارزانی و مەبەبەستی ئەو فەرمان وشەرعە ڕون ئەکاتەوە و ئەیسەلمێنێت کەوا بێهودە و بۆ گاڵتە ئەو دانەبەزیوون و هۆکارێکی هەیە کە لەناو خەڵکدا هەیە ئەیزانیٚ و پەی پێئەبات و هەیشە نایزانێت، هیچ فەرمانێکی خوایی نییە ئەگەر بەرژەوەندییەکی گەورە لە پشتییەوە نەبێت، شەریعەتی ئیسلامی لەسەر بنەمای پاراستنی بەرژەوەندی خەڵکی دامەزراوە و پڕە لە خێر بۆ خەڵکی.

کاتێك جولەکە تانەیاندا لە نەسخی ئاینەکەیان و بە ئەستەمیان زانی لە ڕوی عەقڵ و نەقڵەوە، خوا وەڵامی تانەکەی دانەوە بەوەی کە خوا بەدینی ئەوان و دینی تازەش ئاگادارە و کاتێك حوکمێك بە حوکمێکیتر ئەگۆڕێت ئەزانێت چی بەکەڵکی سەردەمە جیاوازەکان دێت و کارزانی تێدایە و لەبەرژەوەندی خەڵکی سەر زەوی ئەو فەرمانەی دەرکـــردوە: ﴿ ۞ مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ أَوْ مِثْلِهَآ ۗ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٠٦﴾ ﴾ (البقرة). هەر ئایەتێك بسڕینەوە، یان بیخەینە بارودۆخی فەرامۆشییەوە و پشتگوێی بخەین، چاکتر لەو، یان وێنەی ئەو دەخەینە ڕوو، مەگەر نەتزانیوە کە خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە؟

بەهەمانشێوە جولەکە لەگەڵ موشریکەکانی مەککە تانەیان لە گۆڕینی قیبلە گرت خوای گەورە فەرموی بۆ دەرخستنی پلەی باوەڕی باوەڕدارانە: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ۗ وَمَا جَعَلْنَا ٱلْقِبْلَةَ ٱلَّتِى كُنتَ عَلَيْهَآ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يَتَّبِعُ ٱلرَّسُولَ مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ ۚ وَإِن كَانَتْ لَكَبِيرَةً إِلَّا عَلَى ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُ ۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤٣﴾ ﴾ (البقرة)، بەو شێوەیەش ئێوەمان

بەگەڵێکی میانەڕەو گێڕاوە (لە هەموو ڕوویەکەوە، لە ڕووی عیبـادەت و خواپەرستیەوە، لە ڕووی دنیاو قیامەتەوە، لە ڕووی داخوازیەکانی ڕۆح و نەفسەوە.. هتد) تا ببنە شایەت بەسەر خەڵکیەوە (تا بزانن ئەم ئاین و بەرنامەیـە هـەمووی مایـەی خێـرو سـەربەرزیە بـۆ تـاکو کۆمـەڵ لـە هـەموو سـەردەمێکدا و لـە هـەموو بوارەکـانی ژیانـدا) و بـۆ ئـەوەی پێغەمبەریش (لە هەموو ئەو بوارانەدا مامۆستاو ڕابەری ئێـوە بێـت و لـە ڕۆژی قیامەتـدا) شـایەتی بـدات (بـۆ دڵسـۆزانی ئوممـەتی لەسـەر ئـەوەی بەئـەرکی سەرشـانی خۆیـان هەسـتاون) و ئـەو قیبلـەو ڕووگەیـەش ڕووت تێکردبـوو (کـە بیـت المقـدس بـوو) گۆڕانکاریشمان بەسەردا هێنا تەنها بۆ ئەوە بوو بزانین و دەربکـەوێت، کـێ شـوێنکەوتەی پێغەمبەر دەبێت و کێش پاشەو پاش هەڵدەگەڕێتـەوە، هەرچـەندە (گـۆڕینی قیبلـە) بـوو بـەهۆی نارەحەتییـەکی گـەورە، مەگـەر لەسـەر ئەوانـەی خـوا دڵیـانی دامەزرانـدبوو و ڕێنموویی کردبوون، بێگومان خوا ئیمان و بـاوەڕداریی و (نوێـژتان) زایـە ناکـات، چـونکە بەڕاستی خوا بۆ خەڵکی، زۆر بەسۆزو بە بەزەیی یە..

هەروەها خوای گەورە هۆکـاری نـاردنی پێغەمبـەران و هەڵبـژاردنیان لـەناو مرۆڤـەکان خۆیاندا ڕونکردەوە بەوەی کـە پێغەمبـەران ئـەبێت مـرۆڤبن بـۆ ئـەوەی بتـوانن گفتوگـۆ لەگەڵ خەڵکی بکەن و لێیان نزیك بکەونەوە خۆشەویستی بڵاوبکەنەوە ئەگەر پێغەمبەران فریشتە بونایە ئەوا کەس نەیدەتوانی پەیوەنـدیان لەگـەڵ دروسـت بکـات و لەیـەك بێـزار ئـــــەبون: ﴿ قُل لَّوْ كَانَ فِي ٱلْأَرْضِ مَلَٰٓئِكَةٌ يَمْشُونَ مُطْمَئِنِّينَ لَنَزَّلْنَا عَلَيْهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَلَكًا رَّسُولًا ﴿٩٥﴾ ﴾ (الاسراء)، پێیان بڵێ: ئەگـەر لەسـەر زەویـدا فریشـتە هەبوونایـەو بەدڵنیاییەوە هاتوچۆیان بکردایەو ژیانیان ببردایەتە سەر، ئەوە ئێمە هـەر لـە ئاسمانـەوە فریشتەیەکمان دادەبەزاندە سەریان کە پێغەمبەرو فرستادە بێت بۆیان (چونکە فرستادە دەبێت لە جۆری خۆیان بێت). لـە بـەزەیی و سـۆزی خوایـە بـۆ خـەڵکی کاتێـك لـەخۆیان

پێغەمبـــەری بـــۆ نـــاردوون: ﴿لَقَدْ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿١٦٤﴾﴾ (ال عمــران )، ســوێند بێــت بێگومــان خــوا منــەتی ناوەتــە ســەر ئیمانــداران کاتێــك پێغەمبەرێکی بۆ ڕەوانە کردوون لە خۆیان ئایەتەکانی ئەویان بەسەردا دەخوێنێتەوە، دڵ و دەروونیان پاك و پوخت دەکاتەوە، هەروەها فێری قورئان و داناییان دەکات، بەڕاستی پێشتر لە گومڕاییەکی ئاشکرادا ڕۆچوو بوون..

هەر لەم بەرنامەیەی قورئانـە  کاتێك بـۆ هەنـدێ لـە فەرمانـەکانیتری ئەفـەرموێت بـۆ تاقیکردنـــەوەی بەنـــدەکانێتی و ئەمـــەش بنەمایـــەکی قورئانـــە کاتێـــك نکولیکـــاران و بەرهەڵستکاران ئەدوێنێت.

کاتێکیش دووڕوەکان تانەیان ئەدا لە نمونەکانی قورئان وەڵامیان ئەوەبوو نمونـەکانی قورئان بە وورد و درشتەوە هەموی تاقیکردنەوەیە بۆ ئیمانداران ، شایستەکان بە باوەڕو متمانە جیادەکاتەوە لە نکولیکار و وێڵبوەکان:

﴿ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَسْتَحْىِۦٓ أَن يَضْرِبَ مَثَلًا مَّا بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا ۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ ۖ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَيَقُولُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلًا ۘ يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرًا وَيَهْدِى بِهِۦ كَثِيرًا ۚ وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ إِلَّا ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٢٦﴾﴾ (البقرة)،

بەڕاستی خوا باکی نیەو نەنگ نیە بەلایەوە هەر نموونەیەك بهێنێتەوە بە مێشولەیەك، لەویش بچووکتر بێت یان گەورەتر، جـا ئەوانـەی ئیمـان و باوەڕیـان هێنـاوە، ئـەوە چـاك دەزانن ئەم نمونەیە ڕاستە و لە لایەن پەروەردگاریانەوەیە، ئەوانـەش کـافرو بـێ بـاوەڕن دەڵێن: خوا مەبەستی چی بوو لەم نموونەیـەدا؟ (خـوای گـەورەش دەفـەرموێت) زۆرێکـی پێ گومڕا دەکات و زۆرێکی تریشی پێ هیدایەت و ڕێنمووی دەکات، بەڵام دیارە جگـە لـە لارو وێرو یاخی و تاوانباران کەسی تر گومڕا ناکـات...  نمونـەکان بـاوەڕدار زیـاتر بـەهێز

ئەكات و لێی حاڵی ئەبن و بێباوەڕەكان لێی حاڵی نابن و زیاتر پێی سەرگەردان ئەبن:

﴿ وَإِذَا مَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ نَّظَرَ بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ هَلْ يَرَىٰكُم مِّنْ أَحَدٍ ثُمَّ ٱنصَرَفُوا۟ ۚ صَرَفَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُم بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ ﴿١٢٧﴾ ﴾ (التوبة)، كاتێكیش سورەتێك لە قورئان دابەزێنرا (ئەوان سەغڵەتن)، ئەوە هەندێكیان تەماشای هەندێكی تریان دەكەن (حەز دەكەن زوو ئەو شوێنە جێ بهێڵن، بەچپە یان بەئیشارەت) دەڵێن: ئایا هیچ كەس دەتانبینێت (لە ئیمانداران)، پاشان بەنهێنی خۆیان دزیەوەو ڕۆیشتن، لەكاتێكدا خوای باڵادەستیش دڵی ئەوانی وەرچەرخاندووە، چونكە بەڕاستی ئەوانە كەسانێكن كە تێ ناگەن وحاڵی نین (ناشیانەوێت تێبگەن).

هەروەها بەدرێژایی مێژوو خەڵكان هەبوون تانەیانداوە لە پێغەمبەران بەوەی كە زۆرتر هەژار و كۆیلەكان شوێنیان ئەكەون و دەسەلاتدار و دەوڵەمەندەكان بێباوەڕن پێیان و هەق لای دەوڵەمەندەكانە، خوا لێیان ڕازییە بۆیە ئاوا دەرگای سەروەت و سامانی لێ والاكردوون، خوای گەورە بۆی ڕونكردنەوە كە بوون و نەبون تاقیكردنەوەی خواییە و باوەڕهێنانی هەندێ هەژار و بێباوەڕی هەندێ سامادار تاقیكردنەوەیە بۆ خەڵكی و خوا خۆی ئاگادارە بە نهێنی هەموو كەسێك: ﴿ وَكَذَٰلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لِّيَقُولُوٓا۟ أَهَٰٓؤُلَآءِ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنۢ بَيْنِنَآ ۗ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَعْلَمَ بِٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٥٣﴾ ﴾ (الانعام)، ئێمە هەر بەو شێوەیە هەندێكیان بە هەندێكیان تاقیدەكەینەوە (كێشە بۆ یەكتر دروست دەكەن، دەبنە بەڵا بۆ یەكتر، یاخود هەندێك هەژار دەكەین و هەندێك دەوڵەمەند..هتد) تا بێ بڕوایان بڵێن: ئایا ئائەوانە خوا ڕێزی لێناون لەناوماندا؟! (ئەو هەژارو داماوانە كەی شایستەی ئەوەن خوا هەڵیانبژێرێت و هیدایەتیان بدات) ئایا خوا زانا نیە بە سوپاسگوزاران؟.

### ١٤/ پەنابردن بۆ تەحەدای گەورە و دەستەوسانکەر:

هەر لەبەرنامەکانی قورئانە لەگەڵ نەیارانی پەنابەرێت بۆ ئالنگارییەك کە دژەکانی دەستەوسان و کەنەفتە بکات، بۆ نمونە کاتێك ناحەزانی قورئان لافی ئەوەیان لێئەدا کە ئەوانیش ئەتوانن وەك قورئان بلێن و قورئانیان بە سیحر و خورافە و هەڵبەست ناوزەد دەکرد، لێرەدا داوای لێکردن: بێ منەتبن ئێوەش نمونەی قورئان بهێنن کاتێك نەیانتوانی تەحەداکەی توندکردەوە بۆ هێنانی دە سورەت و پاشان بۆ یەك سورەت: ﴿ قُل لَّئِنِ اجْتَمَعَتِ الْإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَىٰ أَن يَأْتُوا بِمِثْلِ هَٰذَا الْقُرْآنِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا ﴿٨٨﴾ ﴾ (الاسراء)، ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: سوێند بە خوا ئەگەر هەموو ئادەمیزادو پەریەکان کۆ ببنەوەو (هەوڵی بەردەوام بدەن تا) قورئانێکی وەکو ئەمە دانێن و بیهێننە (مەیدان) ناتوانن کاری وابکەن و ناتوانن لە وێنەی بهێنن، ئەگەر چی هەموو لایەکیان ببنە پشتگیرو یارمەتیدەری یەکتر. ﴿ وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٢٣﴾ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا وَلَن تَفْعَلُوا فَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ ﴿٢٤﴾ ﴾ (البقرة)، جا ئەگەر ئێوە لە دوو دڵیدان و گومانتان لەم (قورئانە پیرۆزە) هەیە کە دامانبەزاندووە بۆ بەندەی خۆمان محمد ﷺ ئەگەر بۆتان دەکرێت ئێوەش هەوڵ بدەن سوورەتێکی وەك ئەو بهێنن، هاوپەیمان و هاوکارەکانیشتان جگە لە خوا (بۆ ئەو مەبەستە) بانگ بکەن ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن.

خۆ ئەگەر نەتانتوانی و هەرگیز نایشتوانن (کەواتە باوەڕبهێنن و) خۆتان بپارێزن لەو ئاگرەی: سووتەمەنیەکەی خەڵکی و بەردە، کە بۆ بێ باوەڕ و خوانەناسان ئامادە کراوە.

ئەمانە وەك بروسکە و تریشقە ئەیدا بەگوێی سوارچاکەکانی ڕەوانبێژی و هەڵبەست و پاڵەوانەکانی جادودا، ئەوانەی خاوەن پێگەو بازاڕەگەرمەکانی ئەو بوارانە بوون و پێش قورئانیش موحەمەد لەو ناوەندانەدا ناوی نەبوو، نە هیچ پەڕاوێکیشی خوێندبوو نە

هیچیشی نوسیبوو، لەگەڵ هەمو ئەمانەشدا کەس لەمەیدانی بەربەرەکانێدا نەماو کەسیش فزەی لێوە نەهات بۆ لەم بوارەدا، ئەمە تەحەدا گەورەکەبوو دەریخست کە قورئان وەحی خوایە، موعجیزەی موحەمەد پێغەمبەرە، کەس ناتوانی وێنەی بهێنێت، نیشانەی ڕاستگۆیی پێغەمبەرە، تەحەدایکردوە و کەسیش نییە بەرەنگاری بوەستێتەوە.

**چۆنێتی مامەڵەکردن لەگەڵ گومانەکانی ئەم سەردەمە:**

لە نێوەندی بەدواداچونمان بۆ وەڵامەکانی قورئان لەگەڵ نەیارانی و هەڵوەشانەوەی بوختان و بانگەشەی دوژمنەکانی چەند ڕێگایەکمان بۆ ڕون ئەبێتەوە بۆ چۆنێتی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو گومانانەی دروست ئەکرێت بۆ قورئان و ئیسلام و پێغەمبەرەکەی لەم سەردەمەی ئێستاماندا.

لەسەرەتادا ئەبێت هەمومان ئەوە لەدەرونماندا چەسپاوبێت کە قورئان کەلامی خوایەو بەهیچ کلۆجێ گومان و بۆختان بانگەشەی بێبنەما کاری تێناکات و بەدورە لەهەموو کەموکورتییەك، ئەبێت بەم باوەڕەوە لەگەڵ نەیاران و ناحەزان بکەوینە گفتوگۆ و بزانین ئەوان هەرچی ئەڵێن بێبنەمایەو فشۆڵە، قورئان دورە لەهەموو دژەوانە وهەڵە ولارییەك وگومان لەسەری ناوەستێ: ﴿ لَّا يَأْتِيهِ الْبَاطِلُ مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِ ۖ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ ﴿٤٢﴾ ﴾ (فصلت)، هیچ ناحەقی و نادروستی و ناتەواویەك ڕووی تێ ناکات لە هیچ کاتێکدا و لەهیچ لایەکەوە ڕەوانەکراو و نێردراوی زاتێکە کە خاوەنی حیکمەت و داناییە و شایانی سوپاس و ستایشە. محاڵە بەتاڵی لەقورئاندا بونی هەبێت یان ناکۆکی تێدا بێت چونکە خوا بۆ ڕێنمونی خەڵك ناردویەتی: ﴿ وَإِذَا جَاءَهُمْ أَمْرٌ مِّنَ الْأَمْنِ أَوِ الْخَوْفِ أَذَاعُوا بِهِ ۖ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى الرَّسُولِ وَإِلَىٰ أُولِي الْأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ الَّذِينَ يَسْتَنبِطُونَهُ مِنْهُمْ ۗ وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ لَاتَّبَعْتُمُ الشَّيْطَانَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٣﴾ ﴾ (النساء)، (لێرەدا خوا ڕەخنە دەگرێت لە هەندێك ئیمانداران): هەرکاتێك هەواڵێکیان بۆ بێت دەربارەی ئاسایش و هێمنایەتی،

یاخود ترس و بیم، بڵاوی دەکەنەوە (بیر لە سەرئەنجام ناکەنەوە)، خۆ ئەگەر ئەو هەواڵەیان بڵاو نەکردایەتەوە و بیانگێڕایەتەوە بۆلای پێغەمبەرو ﷺ، یان بۆ لای کاربەدەستانێك کە لە خۆیانن، ئەوە ئەوانەی کەلە نهێنی هەواڵەکان تێدەگەن و دەکۆڵنەوە، نهێنی و ڕازەکانیان لێ دەردەهێنا، جا ئەگەر فەزڵ و چاودێری خواو ڕەحمەت و میهرەبانیەکەی نەبوایە شوێنی شەیتان دەکەوتن، جگە لە کەمێکتان.. جگە لەقورئان هیچ پەڕاوێکیتر پارێزراو نییە، بەدەیان بەڵگەی بەهێز هەیە لەسەر ئەوەی ئەم قورئانە لای خوای خاوەن دەسەلاٌتەوە هاتوە و نەمرۆڤ و نەجنۆکە ناتوانن وێنەی سورەتێکیشی بهێنن با هێزەکانیشیان لەسەر ئەم کارە یەکخەن، ئەم بیروباوەڕە پێویستە وەك یاسایەکی چەسپاو هەبێت ئەوسا وەلاٌمی گومانەکان بدرێنەوە و دەبێت مکوڕ بیت لەسەر ئەوەی هەموو گومانەکانی دەربارەی قورئان ووتراوە هەموی درۆ و بوختانە و هەڵبەستراون، هەموی هەڵە و پەڵەیەو لە تۆڕی جاڵجاڵۆکە لاوازترن.

یاسای دووەم ئەوەیە ئەگەر موسڵمانان نەیانتوانی بەتەواوی وەلاٌمی دەمکوتکەر بدەنەوە ئەوە واتای ئەوە نییە تانەی دراو لەقورئان سەرکەوتوە بەڵکو بێگومان کەس و کۆمەلاٌنیتر هەن گومان و تانەکە بەتەواوی ڕەدکەنەوە و هەڵیوەشێنن چونکە: ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ ﴿٩﴾ ﴾ (الحجر)، بەڕاستی هەر ئێمە قورئانمان دابەزاندووەو بێگومان هەر ئێمەش پارێزگاری دەکەین و (نایەڵین دەستی خیانەتکار هیچ جۆرە دەستێکی تێ بخات و هەموو هەوڵێك بۆ دەستکاری کردنی نەزۆکە).یاسای سێیەم: ئەوەیە بۆ وەلاٌمدانەوەی هەر گومانێك سەرەتا سەیری ئەو پێڕەوانە بکرێت کە پێشینە باشەکانی ئێمە بۆ وەلاٌمدانەوەی گومانەکان لەسەری ڕۆیشتون، وەك کۆکردنەوەی ئاماژەکانی دەقەکان و بەپێی توانا گونجاندنیان و پێشخستنی تایبەت بەسەر گشتیدا، ئەگەر نەکرا ئەوا کار بەنەسخ بکرێت ئەگەر پێشهاتوو لە پاشهاتوو زانرابوو، جگە لەم

یاسایانەش زۆریتر هەن، خوای گەورەش هیدایەتی هەرکەسێك ئەدات ویستی هەبێت بۆ سەر باشترین وەڵام.

ئەم یاسایانە بەکاردەهێنرێت ئەگەر گومانەکان دەربارەی قورئانی پیرۆز بوو، بەڵام ئەوەی کە ئێمە ئەتوانین سودی لێوەرگرین لە مامەڵەی خودی قورئان لەگەڵ نەیارانی و ڕەددانەوەی دژەکانی بۆ ئێستەمان لەم چەند خاڵەی خوارەوە خۆی دەبینێتەوە:

- یەکخستنی کۆششی هەمو زانایانی زانستەکانی ڕێزمان و تەفسیر و ڕەوانبێژی و ئوسول، بانگخوازان و مێژونوسان و ئەدیبەکان، چونکە ئەو گومانانەی ئەمڕۆ ئەوروژێنرێت هەمەلایەنە و هەمەچەشنە، ناکرێت تەنها بەشێك لە زانایان بەم کارە گرنگە هەستن، بەڵکو ئەبێت زانایانی هەموو بوارەکانی توێژینەوەی زانستی و زانستە ئیسلامی و زمانەوانییەکان هاوکاری یەکتربن ولە کێشە بەدوربن بەیەك دەنگ و یەکریزی گومانەکان لای خەڵکی بڕەوێننەوە.
- ئەوانەی ئەمکارە گەورەیە ئەخەنەسەرشانی خۆیان - کاری بەرگری لەقورئان - ئەبێت لەوەڵامدانەوەی نەیاراندا کورتبڕ و یەکلاکەرەوە و کرداریبن مەگەر زۆر پێویست بیت ئەگینا پەنا نەبەن بۆ درێژدادڕی چونکە ڕوداوەکانی ئەم سەردەمە زۆر خێرایە، با وەڵامەکان بە ساناترین و کورتترین دەستەواژە وبڕندەترین بەڵگە بێت بەشێوەیەك دژ و نەیار قسەی نەمێنێت و بواری چەنوچونی نەبێت.

سودوەرگرتن لە ڕوداوەکانی مێژوو، بەتایبەت چیرۆکی پێغەمبەران و گفتوگۆیان لەگەڵ گەلەکانیان، شێوازی بانگەوازیان بۆ لای خوای گەورە: ﴿ لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُولِي الْأَلْبَابِ ۗ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَىٰ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿١١١﴾ ﴾ (یوسف)، سوێند بێت بەخوا بەڕاستی لە سەرگوزەشتە و بەسەرهاتی پێغەمبەران پەندو ئامۆژگاری هەیە بۆ کەسانی ژیرو

هۆشمەند، وەنەبێت ئەم قورئانە قسەو باسێك بێت هەڵبەسترابێت، بەڵكو بەڕاست دانەری ئەوەیە كە لە پێش خۆیەوە هاتووە (تەورات و ئینجیل) و ڕوونكەرەوە و جیاكردنەوەی هەموو شتێكی پێویستە لەئایندا، ڕێنمومیی و ڕەحمەتیشە بۆ كەسانێك باوەڕ دەهێنن.،

هەروەها: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقۡتَدِهۡۗ قُل لَّآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ أَجۡرًاۖ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرَىٰ لِلۡعَٰلَمِينَ ٩٠ ﴾ (الانعام)، ئەو (ناوبراوانە) ئەو كەسانەن كە خوا (بەتایبەت) هیدایەت و ڕێنموویی كردوون، تۆش (ئەی محمد ﷺ)، ئەی ئیمانداران) شوێنی هیدایەت و ڕێنموویی ئەوانە بكەوە (هەروەها بەو خەڵكە) بڵێ: كە من هیچ جۆرە كرێ و پاداشتێكتان لەسەر ڕێنموویی لێ داوا ناكەم، ئەم قورئان و بەرنامەیەش (كە بە مندا ڕەوانەكراوە) تەنها یادخەرەوەیە بۆ هەموو خەڵكی سەر ئەم زەویە، لەسەرمانە پایەكانی بانگەوازی پێغەمبەران بزانین و پەندیان لێوەرگرین، چۆنێتی گفتوگۆی پێغەمبەران لەگەڵ بەرانبەرەكانیان بە شێوازێكی عەقڵی لۆژیكی و پشت بەستنی ئەوان بەخوا بۆ سەركەوتنیان بەسەر نەیارەكانیان پڕن لە پەند، وەلامدانەوە ئەبێت زانستیانە و لەسەر چاوڕۆشنی و ممارەسەكردن و دیراسەكردن بێت: ﴿ قُلۡ هَٰذِهِۦ سَبِيلِيٓ أَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِيۖ وَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ١٠٨ ﴾ (یوسف)، (ئەی پێغەمبەر ﷺ! تۆ) بڵێ: ئا ئەمە ڕێگەو ڕێبازمە: من و شوێنكەوتوانم بانگ دەكەین بۆ لای خوای پەروەردگار لەسەر بنچینەو بناغەیەكی ڕوون و ئاشكرا، پاكی و بێگەردیش بۆ زاتی پەروەردگارە، من هیچ كاتێك لە موشریك و هاوەڵگەران نیم. لەسەرمانە لە وێستەگەكانی پێغەمبەران و چۆنێتی بیانوبڕینی نەیارەكانیان سوود وەرگرین.

- سوود وەرگرتن لە زانستەكانی پزیشكی و ئەندازیاری و بۆماوەیی و میكانیكی و فیزیا و كیمیا و جوگرافیا و .. ئەوەی زانراوە هەموو زانستەكان لەم سەردەمەی ئێستاماندا بەشێوەیەكی بەرچاوو پێشكەوتوە، زانست هەموو بوارەكانی ژیانی خەڵكی

گرتۆتـەوە، تایبەتمەندییـەکانیش هەمـە چەشـنەن، هۆکارەکـانی زانسـتیش زۆر و هەمـە لایەنەن، بۆیە ئەبێت سوود لەهەموو زانستەکان وەربگیرێت بۆ دیراسـەکان بـا هـەڵگرانی زانستەکەش موسڵمان نەبن، دانایی وونبوی ئیمانداره لەکوێدا بینیەوە لەهەموکەس زیاتر شایستەیە پێی، خەڵکیش بە دەستەوارەکەی ئەناسرێت، لەوانەیـە خـوای گـەورە هـەقێك بەزمانی جگە لە موسڵماندا بنێرێت و ئەویش بیگەیەنێت.

- ئەو گومانانـەش کـە پەیوەنـدی بەرەخنـەگرتن لـە فـەرمان و قەدەغـەکراوەکانی خواوەیە، لەسەرمانە دانایی لە فەرزبون یان قەدەغـەکردنی فەرمانەکـە دەربخـەین و ئـەو بەرژەوەندیانەی لەپشت جێبەجێکردنی فەرمانەکەی خوایە ڕونیان بکەینەوە، شـەریعەتی خـوا بمانـەوێت یـان نـا بۆسـەر عاقڵـەکان دابـەزیوە، هـەموو حوکمـەکانی وەکـو ریبـا و هاوسـەرگیری ڕۆژوگـرتن و زەکـات و سـزاکان و تـەلاق و مـیرات و بالآپۆشـی زۆرێـك لـە حوکمەکانیتر پێویست ئەکات مەبەست و دانایی لە دابـەزینیان ڕونبکرێتـەوە، شـەریعەتی ئیسلامی لەسەر بەرژەوەندی و ئاسانکاری و دادپـەروەری دامـەزراوە، سـەراپای هـەموی خێرە، شتێکی تیانییە پێچەوانەی عەقڵ و سروشت بێت.

جەختکردنەوە لەسەر دواندنی عەقڵ، ئەو عەقڵەی کـە ئیسـلام ئەیـدوێنێت چـوار ڕۆڵ ئەبینێت: دژەکان جیادەکاتەوە، هاوسەنگی کاروبارەکان ڕائەگرێت، دەرکی هەق دەکات، ویژدان ئەپارێزێ. عەقڵ دژی چەقبەستویی و نکولیکردن و ملهوڕیە، بۆیە ئەبینین قورئان وێنەی ئـاستەنگەکانی بەردەم عەقڵمـان بۆ دیاریئەکات: لاساییکردنەوەی باوباپیران:

﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّبِعُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَا أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا ۗ أَوَلَوْ كَانَ آبَاؤُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ شَيْئًا وَلَا يَهْتَدُونَ ﴿١٧٠﴾ ﴾ (البقرة).

ئەگەر بەو خەڵکە نادانە بوترێـت: شـوێنی ئـەو بەرنامەیـە بکـەون کـە لەلایـەن خـواوە ڕەوانە کراوە، دەڵێن: نەخێر، هـەر شـوێنی ئـەوە دەکـەوین کـە بـاوو باپیرانمـان پێـوەی

ئالووده بوون و لەسەری ڕاهاتوون، ئایا ئەگەر باوو باپیرانیشیان تێ نەگەیشتوو هیچ نەزان و ناشارەزاو ڕێنموویش وەرنەگرن ( هەر شوێنیان دەکەون؟!). هەروەها: ﴿ وَكَذَٰلِكَ مَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِي قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقْتَدُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾ (الزخرف)، هەر بەو شێوەیە هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردووە بۆ هیچ شارێك، کە خۆشگوزەرانەکان نەیانوتبێت: ئێمە باوو باپیرانی خۆمان بینیووە پابەندی بیروباوەڕێك بوون، بێگومان ئێمەش چاو لەوان دەکەین و پەیڕەوی ئەوان دەکەین. پاشان لاساییکردنەوەیخاوەن دەسەلاتدارانی ئاینی ئەوانەی بەهەڵە لە ئایین حاڵیبون: ﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلْمَسِيحَ ٱبْنَ مَرْيَمَ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعْبُدُوٓاْ إِلَٰهًا وَٰحِدًا لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ سُبْحَٰنَهُۥ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٣١﴾ ﴾ (التوبة).

(گاور و جوو) حاخام و قەشەکانی خۆیان کردۆتە پەروەردگاری خۆیان لە جیاتی خوا (ملکەچ و فەرمانبەرداریانن، ئەوانیش بەئارەزووی خۆیان شتیان بۆ حەڵاڵ یان حەرام دەکەن) هەروەها مەسیحی کوڕی مەریەمیش (بەکوڕی خوا دەزانن) لەکاتێکدا کە فەرمانیان پێنەدراوە جگە لە پەرستنی تاکە خوایەك، بێگومان جگە لەوزاتە خوایەکی تر نیە، پاکی و بێگەردی و ستایش بۆ ئەو زاتەیە، کە (ئەو نەفامانە) هاوەڵی بۆ بڕیار دەدەن.پاشان ئیرهابی فیکری وەك ئەوەی فیرعەون بەگەلەکەی ئەووت: ﴿ يَٰقَوْمِ لَكُمُ ٱلْمُلْكُ ٱلْيَوْمَ ظَٰهِرِينَ فِي ٱلْأَرْضِ فَمَن يَنصُرُنَا مِنۢ بَأْسِ ٱللَّهِ إِن جَآءَنَا ۚ قَالَ فِرْعَوْنُ مَآ أُرِيكُمْ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهْدِيكُمْ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴿٢٩﴾ ﴾ (غافر)، هەروەها وتی: ئەی قەوم و هۆزم ئەمڕۆ ئێوە دەسەڵاتتان هەیە بەسەر ئەم ناوچەیەدا و بەئارەزووی خۆتان فەرمانڕەوایی تیادا دەکەن، جا بیر بکەنەوە و تێفکرن کێ دەتوانێت فریامان بکەوێت، کێ دەتوانێت ڕزگارمان بکات، لە تۆڵە و سزای خوا ئەگەر یەخەی پێگرتین؟ فیرعەون قسەکەی پێ بڕی وتی: من تەنها هەر ئەو ڕاو بۆچوونە بەچاك دەزانم و لام پەسەندەکە پێم ڕاگەیاندن، من تەنها ڕێبازی چاك و دروستم نیشانداون!!.

لەبەر ئەمانە ئەبێت لە گفتوگۆمان لەگەڵ جگە لە موسڵمانان  لەسەر بنەمای دواندنی عەقڵ بێت، ئەمە بنەمایەکە هەموو عاقڵەکان لەسەری کۆکن.

- ڕوونی و گشتگیری کورتبڕی لەکاتی وەڵامدانەوە: نزیکی بەڵگەکان لە دڵ وعەقڵی مرۆڤ ودورکەوتنەوە لە دەمەدەمێی نەزۆکانە و چەن و چونی بێمانا، هەروەها گشتگیری و شارەزایی بە هەموو بوارەکانی بابەتە جێناکۆکەکان وادەکات زوتر بەرانبەر بدات بەدەستەوە یان قەناعەتیان بۆ دروست بکات. تا بەڵگەکان تۆکمە و پشتگیربن بۆیەکتر زیاتر بەرانبەر قەناعەت پێدەکات، بۆیە دەبێت وەڵامەکان جۆراوجۆربن و بەڵگە عەقڵی و نەقڵی و ویژدانییەکان یەکانگیر بکرێن، ئەمەش لە کرۆکی بەرنامەی قورئانە، قورئان جیاوازییەکانی هەست و پلەی تێگەیشتن و دەرك لەناو مرۆڤەکان ڕەچاو ئەکات، ئەمە ڕێکاری خوایە لەناو دروستکراوەکانی، بۆیە ئەبینین قورئان وەڵامەکانی جۆراوجۆر ئەکات لەناو بەندەکانی  بۆ ئەوەی کاریگەری لەسەر هەموو چین و توێژەکان وەك یەك دروست بکات، ئەوانەی عەقڵیان بەهێزە  و بیریان تیژە بە کۆمەڵێك لە ئایەتی تایبەت بە بنەماکانی عەقڵ قەناعەتیان پێ ئەکات، ئەوانەش ویژدانیان زاڵە بەسەر عەقڵیان ئەوا ویژدانیان ئەدوێنێ و لەدڵیان نزیك ئەبێتەوە، بەمشێوەیە قورئان وەڵامەکانی هەمە ڕەنگن بۆئەوەی لەنزیکترین ڕێگەوە ڕێنمونی مرۆڤە جیاوازەکان بکات هەر جۆرە ووزەو توانایەك بە جۆری شیاوی تایبەت بەخۆی.

- وەڵام نەدانەوەی ئەوبانگەشانەی بێ بنەمان، لەخۆباییبون و نکولیکردن و خانەگومانی سەرچاوەکەیانە و هیچ بەڵگەیەك پشتگیریان لێناکات، باشترین وەڵام بۆ ئەمانە بێدەنگییە، چونکە بە بڵاوکردنەوەیان لەناو خەڵکیدا ناوبانگ و ئەرزش پەیدا ئەکەن.

- بەکارهێنانی نمونەکانی قورئـان کـە هـەمویان مەبەسـتدار و ڕاشـکاو و واقیعـی و ژیـانی و زانسـتین لـەکاتی وەڵامدانـەوەدا، چـونکە نمونـەکانی قورئـان زیـاتر بیروڕاکـان ئەچەسپێنن و ڕونیان ئەکەنەوە.
- بانگکردنی جگە لەموسڵمان بۆ ڕامان لەقورئان و بیرکردنەوە لە ئایەتەکانی.
- تیشك خستنەسەر بابەتی ناکۆکی لەسەر و لانەدان بۆ بابـەتی لاوەکـی بۆئـەوەی ووزەکان بەفیرۆ نەچن و بیروهۆش پەرت نەبێت.
- گوێنەدان بەو بانگەشانەی کە لەسەر گومان و خەملاَندن و عینادی و خۆبەزلزانی هەڵچنراون، ئەوانە کە پشت بە بچوکترین بەڵگە نابەسـتن، باشـترین وەڵام بۆیـان ئەوەیـە وەڵامیان نەدەیتەوە، چونکە بەوەڵامدانەوەی نابانگ لەناو خەڵکدا پەیدا ئەکات و ڕێگـەی بۆ خۆش ئەکرێت بێتە ناو خەڵکی

هەر خوا ئاگای لە نیازەکـانی نـاو دڵ هەیـە و هـەر ئـەویش دەسـتی خـەڵکی ئـەگرێت بەرەو راسترین ڕێگە





# تەوەری یەکەم

**چەند گومان و بوختانێک سەبارەت بە خوای گەورە - جل جلاله -**

**یەکەم: چەنـد گومانێـک پەیوەنـد بە خـوایەتی و تـاک و تەنیـایی خـوا (جـل جلاله).**



# گومانی یەکەم

## بانگەشەکردن بەوەی خوا(جل جلالە) منداڵی هەیە

**ناوەڕۆکی گومانەکە/**

هەندێك لەگاورو جولەکەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کەخوای گەورە منداڵی هەیە.جولەکەکان دەڵێن عوزەیر کوڕی خوایە، گاورەکانیش وادەزانن کەعیسا کوڕی خوایە، گەورەیی و پاك و بێگەردی بۆخوا، خوای گەورە (جل جلالە) دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ عُزَيْرٌ ٱبْنُ ٱللَّهِ وَقَالَتِ ٱلنَّصَـٰرَى ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ ٱللَّهِ ذَٰلِكَ قَوْلُهُم بِأَفْوَٰهِهِمْ يُضَـٰهِـُٔونَ قَوْلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَبْلُ قَـٰتَلَهُمُ ٱللَّهُ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾ (التوبة) [1]

واتە/ جولەکە وتیان: عوزەیر کوڕی خوایە، گاورەکانیش وتیان: مەسیح کوڕی خوایە!! ئا ئەو بوختانە (نابەجێیانە) قسەی ئەوانە و بەدەم دەیڵێن و لێی تێناگەن (بیرێك ناکەنەوە، تیافکرن) ئەو گوفتارەیان لاسایی کردنەوەی ئەوانەیە کە پێشتر بێ باوەڕ بوون (لەوەدا کە دەیانوت فریشتەکان کچی خوان)، دەك بەکوشت چن و خوا لەناویان بەرێت، ئاخر ئەم بوختانە ناڕەوایانە چۆن هەڵدەبەستن.

**ڕێگاکانی پوچەڵکردنەوەی گومانەکە:**

١- خوای گەورە پاك و بێگەردە لەوەی کەمنداڵی هەبێت ،ئەم گومانەش بەرامبەر بەخوای گەورە کارێکی نەشیاوە چونکە ئیمکان نیەخوای تاك و تەنها هاوەڵی هەبێت .

---

١- الأيات التى وردت فيها الشبهة (البقرة/١١٦ ، الانعام /١٠٠ ، يونس/٦٨ ، الكهف/٤ ، مريم/٨٨،٩١ ، الصافات/١٥١-١٥٣ ، التوبة/٣٠النحل/٥٧ ، الانبياء/٢٦) .

الأيات التى وردت فيها الرد على الشبهة: (البقرة/١١٦،١١٧ ، النسأ /١٧١،١٧٢ ، الانعام/١٠٠،١٠١ ، يونس/٦٨ ، الكهف/٤،٥ ،مريم/٣٠،٣٥،٨٩،٩٥ ، الصافات/ ١٤٩،١٥٣ ، الزمر/٤ ، التوبة/٣٠ ، الاخلاص/١،٤ ، المؤمنون/٩١،٩٢ ، النمل/ ٥٧ ، الطور/٣٩ ، الزخرف/١٦،٨١ ، الاسرأ /١١١ ، الانبيأ /٢٦ ، الفرقان/ ٣ ، الجن/٣ ) .

٢- چۆن دەگونجێ خوای گەورە منداڵی هەبێ لەبەرامبەریشدا هاوسەری نەبووە تا منداڵی ببێ؟

٣- خوای گەورە پێویستی بەمنداڵ نیە، وەك هەریەکە لە دروستکراوەکانی.

٤- ئەوکەسانەی ئەم جۆرە قسانەهەڵدەبەستن هیچ بەڵگەو ڕوونکردنەوەیان لەسەرئەوشتانەی بانگەشەی بۆدەکەن .

٥- ئەگەرخوای گەورە بیویستایەمنداڵی هەبێت ئەوابەویستی خۆی هەرکەسی بویستایە هەڵی دەبژارد و ئەم کارەی بۆئەوان بەجێ نەدەهێشت .

**درێژەی بابەتەکە:**

**یەکەم/ خوای گەورە پاک و بێگەردە لەهەبوونی منداڵ و زۆر لەوەبەرزترو گەورەترە**،خوای گەورە خاوەنی ئەوەی لەئاسمانەکان و زەوی دایە و ئەوشتانەش لەنێوانیاندان ، ئەو تاك و تەنهایەو پێویستی بەکەس نیە ،هەموو شتێك هەژاروبەندەن لەبەرامبەریدا، خوای گەورەدەوڵەمەندەلەبەرامبەرئەوانیتردا. بۆیەنەشیاوو نەگونجاوە کەمنداڵی هەبێت بەهۆی گەورەیی و شکۆمەندی و دەسەڵاتدارییەکەیەوە،چونکە لەنێودروستکراوەکانیدا کەس هاوشانی نیە،خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا يَنۢبَغِي لِلرَّحۡمَٰنِ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا ﴿٩٢﴾ ﴾ (مریم)، لەکاتێکدا بۆ خوای میهرەبان نەهاتووە و ڕەوا نیە کە نەوە بۆ خۆی بڕیار بدات. وە دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدٗاۗ سُبۡحَٰنَهُۥۖ بَل لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ كُلّٞ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ ﴿١١٦﴾ ﴾ (البقرة)، (جوولەکەو گاورو بت پەرستان) دەڵێن: خوا منداڵی بۆ خۆی داناوەو فەراهەمی هێناوە (لەکاتێکدا خوا پێویستی بەکەس نیە) نەخێر وانی یە، بێگومان هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هەر خۆی خاوەنیەتی و هەر هەمووشیان ملکەچ و فەرمانبەرداری ئەوزاتەن.

وەدەفـــەرموێ: ﴿ وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ شُرَكَآءَ ٱلْجِنَّ وَخَلَقَهُمْ ۖ وَخَرَقُوا۟ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتٍۭ بِغَيْرِ عِلْمٍ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٠٠﴾ ﴾ (الأنعـام)، (لەگـەڵ ئـەو هـەموو نیشـانەی دەسـەڵاتداریەدا نـەفامان) پـەری و جنۆکـەیان کردۆتـە هاوبـەش و هاوتـای خـوا، لـە حاڵێکـدا هـەر خـوا دروسـتکاری پـەری و جنۆکەکانـە و بەناحـەق کـوڕو کـچ دەدەنـە پـاڵی، بـێ هـیچ جـۆرە زانیاریەك (گاور دەڵێ: عیسا کـوڕی خوایـە، جـوو دەڵـێ: عـوزەیر، هاوەڵگـەران دەڵێن: فریشـتەکان کچـی خـوان!!) پـاکی و بێگـەردی و بڵنـدی بـۆ ئـەو زاتەیـە کـە دوورە لـەو سیفەتە ناقۆڵاو نادروستانەوە کە ئەوانە خوای پێی پێناسە دەکەن

وەدەفەرموێ: ﴿ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٥٩﴾ ﴾ (الصافات)، پاکی و بێگـەردی بـۆ خـوای گەورەرە، دەربارەی ئەو شتانەی کە ئەوان باسی ئەکەن و ئەو قسە بێ جێیانەی دەیکـەن بەرامبەر بە خوا.

وە دەفەرموێ: ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢﴾ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٣﴾ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٤﴾ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴿٥﴾ ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴿٦﴾ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴿٧﴾ ﴾ (الإخلاص)، ئەی محمد! ( ئەی ئیماندار) بڵێ: ئەو خوای کە ناوی _ الله_ خوایەکی تاك و تەنهایە (بێ هاوەڵ و هاوتایە).خوا زاتێکی پایەدار و دەسەڵاتدارە، نیازی بە کـەس نییەو هەموویان ئاتاجی ئەون، هەر ئەو دەتوانێ بەڵاو و ناخۆشی لابـەرێت و پێویسـتی و داخوازیـەکانمان جـێ بـە جـێ بکـات.هـیچ کەسـی لـێ نـەبووە و خۆشـی لـە کـەس نەبووە.هەرگیز هاوتاو هاوشێوە و دەسەڵاتدارێکی تر نییە کە لەبەرامبەریەوە بەوەستێت و هاوشانی بێت..

وە دەفەرموێ: ﴿ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٩٢﴾ ﴾ (المؤمنون)، ئـەو زاتە زانای نهێنی و شاراوەکانە، هـەروەها زانـای دیـارو ئاشـکراکانە، بـەرزی و بڵنـدی بـۆ ئەوە لەبەرامبەر ئەو شتانەوە کە (نەفامان) دەیکەنە شەریك و هاوەڵی.

وەدەفــــەرموێ: ﴿ أَفَمَن يَتَّقِي بِوَجْهِهِۦ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِۚ وَقِيلَ لِلظَّٰلِمِينَ ذُوقُواْ مَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ (الزمر)، جا ئایا ئەو کەسەی بە ڕوخسارو دەم و چاوی بـەرگری لـە سـزای سەختی ڕۆژی قیامەت بکات، (وەك ئـەوە وایـە کـە نەترسـێت)، ئەوسـا بـەو سـتەمکارانە دەوترێت: دەی بچێژن سزای ئەوەی کە دەتـانکرد. وەدەفـەرموێ: ﴿ سُبْحَٰنَ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبِّ ٱلْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٨٢﴾ ﴾ (الزخـرف)، پـاکی و بێگـەردی بـۆ پـەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی، بۆ پەروەردگاری عەرش و تەختی فەرمانڕەوایەتی، دەربـارەی ئـەو گوفتارە ناقوڵاو بێ سەرو بنانەی کە نەفامان بۆ پەروەردگار هەڵی دەبەستن.

وشەی (سبحانه) (پاك و بێگەردی) لە زۆربەی ئایەتەکانی پێشەوەدا دووبارەبوەتەوەو واتـای پـاك و بێگـەردی دەگەیـەنێ لەگـەڵ نیشـاندانی لەگـەڵ نیشـاندانی سەرسـوڕمان بۆشتێك کە نەفی کراوەو بوونی نیە.

ئەوەی خـوای گـەورە بەڕاسـتی ناسـیبێ پێویسـتە ئەوجۆرەقسـانەی لێ نەوەشـێتەوە کەئەوەبگەیەنێ کەخوای گەورە ڕەگەزێکی هاوشێوەی خۆی هەیە.

—حاشـا بۆخـوا— ئەگـەروای وت ئەوەکـەمترین زانیـاری نیـەدەربارەی خـوا ئەوکاتـە هەرلەخۆیەوە قسەو قسەلۆك دەکات و بەناحەق گومانی خـراپ دەبـات، پـاك و بێگـەردی بۆخوا ڕەگەزی نییە بۆئەوەی منداڵی لێی ببێ.

ئەومنداڵەشی داویانەتەپاڵی دەبێت سەربەجیهانیی سـەرەوە بـێ، یـان سـەربەجیهانی خوارەوەبێ کەزەوییە، هیچ یەکێك لەم دووانەش ناگونجێ هاوشـێوەی خـوای گـەورە بـێ .چونکەسـەرجەم ئەوشـتانەی لەئاسمانـەکان و زەویـدان مـوڵکی خـوان و مـل کەچـن لەبەرامبەرگەورەیی و شکۆمەندی و دەسەڵاتی خوادا مـل کەچـن بۆسـزای خـوایی ،لـەژێر باری ویستی ئەودان ، ئەگەرهەمووان بەسروشتی خۆیـان لـەژێرباری ئـەودابن و ئامـادەبن شـوێن ئـیرادەی ئەوپەروەردگارەبکـەون ، ئەوکاتـە هـیچ مانایـەکی تێـدا نـامێنێ یـەکێك

لەوانەجیابکرێتــەوەو تایبەتمەنـدی دانــەپاڵی بـدرێتی و بکرێتــە منــداڵێکی هاوڕەگــەزی ئەوخوای گەورەدەفـەرموێ: ﴿ وَمَا يَنۢبَغِي لِلرَّحۡمَٰنِ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا ۝٩٢ ﴾ (مـریم)، لەکاتێکدا بـۆ خوای میهرەبان نەهاتووە و ڕەوا نیە کە ئەوە بۆ خۆی بڕیار بدات.

بێگومــان خــوای گــەورەبۆی هەیەبەویســتی خــۆی تایبەتمەنــدێتی بداتەهەنــدێك لەدروســتکراوەکانی وەك چــۆن پێغەمبــەرانی تایبــەت کــردوە بــەناردنی وەحــی بۆیــان (سەلامی خوایان لێ بێت) بەڵام ئەم تایبەت کردنەدروستکراوەکانی بەرزناکاتەوە بۆ پلە و پایەی (خالق) بەدیهێنەر.

ئەمەش وەڵامێکەبۆگاورو جولەکە کەدەڵێن عـوزەیر یـان مەسـیح کـوڕی خـوان چـۆن خوامنداڵێکی دەبێت کە ئەو منداڵە بەدوورنیە لەوەی یـان دەبـێ لەئاسمانەکانـدابێت یـان لەزەوی ئەوەشی لەئاسمانەکان و زەویدان موڵکی خوان .

ئەگەربەوشـێوازەبوایەئەوان بانگەشــەی بۆدەکــەن نــەدەبو ئــەو منداڵــە هاوشـێوەی ئەوشـتانەبێت کەلەئاسمانــەکان و زەویـدان لەدروسـتکراوو بەنـدەکانی کەچـۆن نیشـانەی بەدیهێنان پێوەدیارەکەخواخۆی دروستی کردون.

***دووەم/ چۆن خوای گەورە منـداڵی دەبێت لەکاتێکدا هاوسەری نیەبـۆئەوەی منـدالی لێـی ببـێ لەڕێگەی جووت بونەوە؟!***

چۆن خوای گەورە منداڵی دەبێـت لەکاتێکـدا هاوتـاو هاوشـانی نیـە و لەکاتێکـدا کـوڕ دەبێ هاوتاو هاوشانی باوکی بێت؟!

خوای گەورەبەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوییە،هاوشێوەو هـاو وێنــەی نییە،ئەگەرئــەو بەدیهێنــەری ئاسمانــەکان و زەوی بێــت و ئەمانــەش (ئاسمانــەکان و زەوی ) واپێناســە نــەکراون کــە منــداڵی ئــەون بــەڵکو لــەڕیزی دروسـتکراوەکانی ئــەودان بەهــەمان شـێوەی فریشتەکان .

بۆئەم مەبەستەش دروستکردنی مەسیح لەدایکێك بەبێ باوك ناگونجێ بکرێتە منـدالّ ، کورتەی ئەوباسەئەوەیە ئەمـە داهێنانێکـەو ئـەنجامی ئەوداهێنانـە داهێنراوەکەیەکـەناوی منـدالّی لێ نـانرێ دروسـت بوونەکـەش لـەجوتبوونی نێرومێیـەك لەڕەگـەزی هاوشـێوەی یەکترنەبووە خوای گـەورەش ڕەگـەزی نیـە تاهاوسـەرێکی لەڕەگـەزی هاوشـێوەی خـۆی هـەبێت. بۆیـە خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿ وَلَقَدِ ٱسۡتُهۡزِئَ بِرُسُلٖ مِّن قَبۡلِكَ فَحَاقَ بِٱلَّذِينَ سَخِرُواْ مِنۡهُم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ١٠ ﴾ (الأنعـام)، ئـەی محمـدﷺ) دلّـت لـەخۆت دانەمێنێت) سوێندبێت بەخوا بەڕاستی گالّتەکراوە بـە پێغەمبـەرانی پـێش تـۆ، سـەرنجا م ئەوەی ئەوان بڕوایان پێی نەبوو، گالّتەیان پێدەکرد، یەخەی پێگرتن و نغرۆی کردن (خوا تۆڵەی لێسەندن).

ئیتر چۆن مندالّی دەبێت لەکاتێکدا خۆی بەدیهێنەری هـەموو شـتێکە ؟!حالّەتەکـەش بەوجۆرەیەکەهاوسەری نەبووە تامندالّی لێی ببێ لەڕگـەی هاوسـەرگیریەوە ، ئەگـەر بـەم شـێوازە نـەبێ هـیچ مانایـەك بـۆ بـوونی منـدالّ نامێنێتـەوە ،بێگومـان دروسـتکردنی (دەرچـوونی) سـەرجەم ئەوبونەوەرانـەی لەئاسمانـەکان و زەویـدان لەلایـەن ئـەوەوە داهێنانە،ئەهەموو شتێکی بەدروستکردن دروسـتکردووە لێـی نـەبووە وەك منـدالّ بـوون ،هەرچیتان داوەتەپەنای وەك مندالّ دروستکراوی ئەوە نـەك لـەوبوبێ ،ئەگـەر دەرچـوون لەڕێرەوی ئاسایی زمانەکە باوەو قسەی پـێ دەکرێ ،وەدروسـتکردنی دروسـتکراوەکانی ئەوتان ناونا مندالّ بوون ،ئەواهەرچی لەئاسمانەکان و زەویـدان لـەڕیزی منـدالّانی ئـەون، ئەوکاتـەی ئـەوەی کەئـەتان ویسـت لەتایبـەتکردنی هەنـدێ لەدروسـتکراوەکانی بـۆ ئـەو پلەوپایەو فەزڵدانی هەندێکیان بەسـەرئەوانی تـردا لەدەسـتان دەردەچێت ئـەو ئایەتـەی سورەتی ئەنعامیش بەڵگەیە لەسەر نەفی کردنی مندالّ لەچەند ڕوویەکەوە:

١– ئاسمانەكان و زەوی لەداهێنراوەكانی خودان ئەمانەش بەرین و دوورن لەوەی سیفەتی لەدایكبوونیان بدرێتە پاڵ بەهۆی درێژی كات و بەردەوامییانەوە،بۆخوای گەورەئەولاترە لەوەی هیچ شتێك لەسەرووی ئەوەوە بێت .

٢–منداڵ ئەوەیەلەنێرومێیەك ببێت كەهاوڕەگەزی یەكتربن خوای گەورەپاك و بێگەردەو هاوڕەگەزی نییە.

٣–منداڵ هاوتای باوكە،پاك و بێگەردی بۆخوا كەهاوتای نیەلەبەردوو هۆ:

*جگەلەخوا خۆی هەمووشتەكانی تردروستكراون و هاوتای ئەونین .

*خوای گەورە زانایەبەسەر هەمووشتەكاندا،بەكۆی دەنگ جگەلەو كەسی تر وانیە.

**سێیەم/ خوای گەورە دەوڵەمەندبەزاتی خۆی لەمنداڵ:( خوای گەورەبێ نیازە لەوەی منداڵی هەبێت)**

چونكەهەموو ئەوشتانەی كەبونیان هەیەلەعالەمی سەرەوەو خوارەوە موڵك و بەندەی خوان ، لەوشتانەدا خوا پێویستی بە هیچ كامیان نیە،وەهەموو ئەوانەش پێویستیان بەخوایە،هیچ شتێك لەوانە هاوشێوەو هاوڕەگەزی خوانیە،خوای گەورە دەفەرموێ :

﴿ قَالُوا اتَّخَذَ اللَّهُ وَلَدًا سُبْحَانَهُ هُوَ الْغَنِيُّ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ إِنْ عِندَكُم مِّن سُلْطَانٍ بِهَٰذَا أَتَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦٨﴾ ﴾ (یونس)،

(خوانەناسان) دەڵێن: خوا منداڵی بۆ خۆی بڕیارداوە! پاكی و بێگەردی شایستەی ئەو خوایەیە، ئەو زاتە بێ نیازە (پێویستی بە كوڕو كچ نیە)، هەرچی لە ئاسمانەكان و لە زەویدا هەیە هەر خوا خاوەنیانە، بێگومان هیچ بەڵگە و نیشانەیەكتان نیە بۆ ئەم بوختانە ناڕەوایە، ئایا شتێك هەڵدەبەستن بۆ خواو (بێ باكانە) دەیڵێن، كە هیچی لێ نازانن و هیچ بنەمایەكی نیە؟!

مرۆڤ بۆهەندێ کاروبار پێویستی بەمنداڵە ،لەوانە مانەوەی نـاوی بۆنـەوەکانی، لەوانـە منـداڵ هێـزو بـازووە بۆبـۆی کـەخۆی و بنەماڵەکـەی شـانازی پێـوە بکەن،لەوانـە منـداڵ جوانیـەکی دونیایـە لەماڵەکەیـدا لـەکاتی منـداڵی گاڵتەوگـەپی لەگـەڵ دەکـات لەگـەورە بونیشیدا شانازی پێوە دەکات لەنێو هاورێکانیدا، لەوانە پێویسـتی بەمنداڵـە بۆجێبـەجێ کردنی کاروبار و بەرژەوەندییەکانی یاخود پێویستی پێیەتی لـەپیری و لەهەژاریدا،بـەڵام خـوای گـەورە پێویسـتی بـەهیچ یـەکێك لـەم سـودمەندییانە نیە،چـونکە خـوای گـەورە دەوڵەمەندەبەهەموو شتێك لەخۆیەوەبۆخۆی بەهەمیشەیی و هەتاهەتایی .

**چوارەم/پـوچەڵی بانگەشـەی ئەو قسەهەڵبەسـتانەی کەبەهـۆی نەبـوونی بەڵـگەوە بە دەستیانەوەیە :**

بانگەشـەیەکی خـاڵی لەبەڵگـەو ڕووت و دامـاڵراو لـە ڕوونکردنـەوە ئـەوە بوهتـان و قسەهەڵبەستنێکی پوچەڵ و بێ بنەماو دوور لە ڕاستیە، ئەمەش ئـەو نەزانینەیـە کـە ئـەو قسە هەڵبەسانە تێیدا دەژین، چونکە هیچ بەڵگەو ڕوونکردنـەوەو بـەدوادا چـونێکیان نیـە لەسەر ئەو شتەی بانگەشەی بۆدەکەن .

هیچ بەڵگەیەکی زانستی یاوەحی خوایی یاعەقڵ و ژیری نیە دژایـەتی پـاك و بێگـەردی خواو بێنیازبوونی موتڵەقی خـوابێ بۆمنـداڵ و شـتیتر خـوای گـەورە دەفـەرموێ : ﴿ قُلْ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ ﴿٦٩﴾ ﴾ (یونس)، ئـەی پێغەمبـەر! تـۆ بڵـێ: بەڕاستی ئەوانەی درۆو بوختان بەدەم خواوە هەڵدەبەستن، ئەوە سەرفرازو ڕزگار نابن.

ئەم نیشانەی پرسیارکردنە پەك خستن و پوچەڵ کردنـەوەی ئـەو قسـە و قسـەڵۆکەیە کـە دەیکـەن لەڕوانگـەی نـەزانین و بێباوەڕییانـەوە، ئەمـەش بەڵگەیەلەسـەر ئـەوەی هەرقسەیەك بەڵگەی لەسەرنەبوو ئەوە هەڵبەست و نەزانینە.

خـوای گـەورەش وەڵـامی بانگەشـەکانیان دەداتەوەلەچـەند جێگایـەکی کتێبەکەیـدا، پاشان خوای گەورە فەرمانیان پیێ دەکات کە بەڵگەی پشت بەستوو بەپەڕاوێکی ئاسمانی بهێنن کەڕاستی و دروستی بانگەشـەکەیان ڕوون بکاتـەوەو دەفـەرموێ : ﴿ فَأْتُوا۟ بِكِتَـٰبِكُمْ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿١٥٧﴾ ﴾ (الصافات)، ئادەی کـوا کتێبتـان، کـوا بەڵگـەتان ئەگـەر ئێـوە ڕاسـت دەکەن بیهێننە مەیدان.

بێگومـان توانـای ئـەوکارەیان نیەچـونکە ئـەم شـتەلەگەڵ زانسـت و عەقڵـدا یـەك ناگرێتەوە،بەڵکوعـەقڵ بەهەمووشـێوازێك ڕەدی دەکاتـەوە ئەمەجگەلەدرۆیـەکی گـەورە هیچی تر نیـە، خـوای گـەورە دەفـەرموێ : ﴿ مَّا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ وَلَا لِـَٔابَآئِهِمْ ۚ كَبُرَتْ كَلِمَةً تَخْرُجُ مِنْ أَفْوَٰهِهِمْ ۚ إِن يَقُولُونَ إِلَّا كَذِبًا ﴿٥﴾ ﴾ (الکهـف) جـا ئەوانـە نـە خۆیـان و نـە بـاوو باپیرانیان لە ڕووی زانست و زانیاری و تێگەیشـتنەوە ئـەو گوفتـارە ناقۆڵایـە نـاڵێن، ئـەو بوختانەیان قسەیەکی زۆر گەورەو ناڕێکە کە لە دەمیان دەردەچێت، ئەوانە جگە لە درۆو گوفتاری نابەجێ هیچی تر ناڵێن.

وەدەفـــەرموێ: ﴿ تَكَادُ ٱلسَّمَـٰوَٰتُ يَتَفَطَّرْنَ مِنْهُ وَتَنشَقُّ ٱلْأَرْضُ وَتَخِرُّ ٱلْجِبَالُ هَدًّا ﴿٩٠﴾ أَن دَعَوْا۟ لِلرَّحْمَـٰنِ وَلَدًا ﴿٩١﴾ ﴾ (مریم)، خەریکە ئاسمانەکان لە ناقۆڵـایی ئـەو گوفتـارە نابەجێیـە، لەت و پەت ببێت، زەوی خـەریکە شەق بەرێت و ڕۆبچێت، کێوەکانیش خـەریکـە بکـەون و ورد و خاش ببن.

کاتێك کە نەفامان بوونی ڕۆڵە و نەوەیان دایە پاڵ خوای میهرەبان.

﴿ أَلَآ إِنَّهُم مِّنْ إِفْكِهِمْ لَيَقُولُونَ ﴿١٥١﴾ وَلَدَ ٱللَّهُ وَإِنَّهُمْ لَكَـٰذِبُونَ ﴿١٥٢﴾ ﴾ (الصــافات)، ئاگــادار بـن! ! بەڕاسـتی ئەوانـە هەنـدێك لـە درۆ و بوختانیـان ئەوەیـە کـە دەڵـێن: خـوا منـداڵی بووە ! ! بەڕاستی و بێگومان ئەوانە زۆر درۆزنن.

**پێنجەم/موستەحیلەخوای گەورە ویستی بۆمنداڵ هەبێ:**

خـوای گـەورە بۆئەوقسەهەڵبەسـتانەی ڕوون کردۆتـەوە کەئەگەرویسـتی لەوەبوایـە کەدەیڵێن ئەو بەویستی خۆی لەناوبەندەکانیدا کەسێکی هەڵدەبـژاردو ئـەم کـارەی بۆئـەوان بەجێ نەدەهێشت .

بـەڵام خـوا پـاك و بێگـەردە لەهـەبوونی منـداڵ ،ئەمـە مەرجێکـە ڕوودان و ڕێگـە پێـدانی نیەومەحاڵە،مەبەسـت لێـی ئاشـکراکردنی نەزانییانەبەرامبـەر بەوشـتانەی بانگەشـەیان بـۆکردووە و قسەوقسـەلۆکیان لەسـەر وتـوە. خـوای گەورەدەفـەرموێ : ﴿ لَّوۡ أَرَادَ ٱللَّهُ أَن يَتَّخِذَ وَلَدٗا لَّٱصۡطَفَىٰ مِمَّا يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُۚ سُبۡحَٰنَهُۥۖ هُوَ ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ ﴿٤﴾ ﴾ (الزمر)، ئەگەر خوا بیویستایە ڕۆڵەیەك بۆ خۆی بڕیار بدات، ئەوا لە نێوان ئەو شـتانەدا کـە دروسـتی کردووە شتێکی هەڵدەبژارد کە بە ویستی خۆی بوایە نەك بەویستی ئەوان، پاکی و بێگـەردی بۆ ئەو زاتەیە کـە دوورە لـە شـتی نـارەواو نابـەجێ، ئـەو زاتـە خوایـەکی تـاك و تـەنهاو زۆر بەدەسەڵاتە (تۆلەدەسێنێت لەوانەی دژایەتی دەکەن و ناپەرستن).

ئـەم مەرجەبۆمەبەسـتی قسـەکەر موسـتەحیلە ڕووبـدات، وەڵامەکـەی ڕێگـە پێنـەدراوە بەهۆی ڕێگە پێ نەدانی مەرجەکـەوە،خوای گـەورە پـاك و بێگـەردو پـیرۆزە لـەوەی منـداڵی هەبێت ،خوای گەورە لەهەموو شتە کان بەهێزترە هەربۆیە هەموو شتێك بێ دەسەڵات و مـل کەچەلەئاستیدا،بەرزی و پیرۆزی بۆئەو لەبەرامبەر ئەوشتانەی ستەمکاران دەیڵێن.

**بەکورتی:**

* خـوا جـل جلالـە پـاك و بێگـەردە لەهـەبوونی منـداڵ ،ئـەم کـارە شـیاوی ئـەو نیـە، چونکەنابێ هاوبەشی هەبێ لەیەکتاپەرستیدا.

* ئەوەی بەچاو دەبینرێ و عـەقڵ قـەبوڵی دەکـات منـداڵ لـە ئـەنجامی جـووت بـووتی نێرومێیەکی هاوڕەگەز دروست دەبێت خوای گەورە هاوشێوەی نیە تا هاوسەری هەبێت.

* خوای گەورە هاوتاوهاوشانی نیە ئەو دەوڵەمەندە بەزاتی خـۆی لـە هـەبوونی منـداڵ، ئەو پێویستی بە منداڵ نیە وەك چۆن دروست کراوەکانی پیویستیان پێیەتی .

* ئەگەر خوای گەورە متدالی بویستایە خۆی هەلی دەبژارد بە ویستی خۆی ،ئـەم کـارەی ئەسپەردەی ئەو نەفامانە نەدەکرد .

## گومانی دووەم

## بانگەشەی ئەوەی کەفریشتەکان کچانی خوان(جل جلاله)

**ناوەڕۆکی گومانەکە:**

موشریکەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کەفریشتەکان کچانی خوان ، ئەو فریشتانەی کەبەندەی خوان بەمێینەیان داناون ،پاشان پەرستویانن جگەلەخوا، خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿ وَيَجْعَلُونَ لِلَّهِ ٱلْبَنَٰتِ سُبْحَٰنَهُۥ ۙ وَلَهُم مَّا يَشْتَهُونَ ﴿٥٧﴾ ﴾ (النحل)، ئەو نەفامانە کچان دەدەنە پاڵ خوا (گوایە فریشتەکان کچی خوان)، پاکی و بێگەردی شایستەی ئەو زاتەیە هیچ پێویستیەکی بە کچ و کوڕ نیە لە کاتێکدا بۆ خۆیان حەز بەچی دەکەن ئەوە بۆ خۆیان دادەنێن.هەروەها ئەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلُوا۟ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ ٱلَّذِينَ هُمْ عِبَٰدُ ٱلرَّحْمَٰنِ إِنَٰثًا ۚ أَشَهِدُوا۟ خَلْقَهُمْ ۚ سَتُكْتَبُ شَهَٰدَتُهُمْ وَيُسْـَٔلُونَ ﴿١٩﴾ ﴾ (الزخرف)، ئەو خوانەناسانە فریشتەکان کە بەندەی خوای میهرەبانن، بەکچی خوایان دەدایە قەڵەم! ! ئایا ئەوان ئامادەی دروستکردنیان بوون؟! لە ئاییندەدا ئەم بوختانەیان لەسەر دەنوسرێت و پرسیاریشیان لێ دەکرێت.

**ڕێگاکانی پوچەڵ کردنەوەی گومانەکە:**

١–خوای گەورە لەبنەڕەتدا منداڵی نەبووە ، ئەو پاك و بێگەردە لەو شتە.

٢–موشریکەکان بۆخۆیان بەکچ ڕازی نابن ئیتر چۆن بۆخوای بڕیار دەدەن؟!

٣–دانانی فریشتەکان بەکچانی خوا بێ باوەڕییەکی ئاشکرایە بەرامبەر نیعمەتەکانی خواو بێ ئەدەبی کردنە بەرامبەر خوا .

٤–دانانی فریشتەکان بەکچانی خوا دژایەتی بڕیار دانیان دەکات لەسەرپەروەردگارێتی پەروەردگار .

٥-موشریکەکان چۆنیەتی دروستکردنی فریشتەکانیان نەدیوە ئیتر چۆن بڕیار دەدەن کەئەوان کچانی خوا بن .

٦-موشریکەکان هیچ بەڵگەو بیانویەکیان نیەلەسەر ئەوشتەی بانگەشەی بۆدەکەن ، بەڵکو گومان و شوێن کەوتنێکی کوێرانەی باوباپیرانیانە.

٧- فریشتەکان بەندەی خوان و بەڕێزن و گوێڕایەڵی خوان و فەرمانیان بەکەس نەکردووە کەبیان پەرستن جگە لەخوا.

**درێژەی بابەتەکە:**

**یەکەم: خوای گەورە لەبنەڕەتدا منداڵی نەبووە، ئەو پاک و بێگەردە لەوشتە.**

سێ کۆمەڵ لەسەر گومڕایی کۆبونەتەوە و دەڵێن خوا منداڵی هەیە:

گاورو جولوکەو موشریکەکانی عەرەب، جولەکەکان دەڵێن: عوزەیر کوڕی خوایە، گاورەکانیش دەڵێن : مەسیح کوڕی خوایە ، موشریکەکانی عەرەبیش دەڵێن : فریشتەکان مێینەن و ئەوان کچانی خوان ، پێشتر ڕەدی قورئانمان بۆ ڕوون کردەوەلەسەر گاورو جولەکەکان و چۆن گومان و پڕوپاگەندەکانیانی هەڵوەشاندەوە لێرەشدا چۆنیەتی هەڵوەشاندنەوەی گومانی موشریکەکانی عەرەب دەخەینە ڕوو لەلایەن خوای گەورەوە کەپڕو پاگەندەی ئەوە دەکەن کەفریشتەکان کچانی خوان.

ئەم وەڵامدانەوەش تەنها موشریکەعەرەبەکان ناگرێتەوە بەتەنها بەڵکو هەموو ئەوانە لەخۆ دەگرێ کە بانگەشەی هەبوونی منداڵ دەکەن بۆخوا.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُوا اتَّخَذَ اللَّهُ وَلَدًا سُبْحَانَهُ بَل لَّهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ كُلٌّ لَّهُ قَانِتُونَ ﴿١١٦﴾ بَدِيعُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَإِذَا قَضَىٰ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُن فَيَكُونُ ﴿١١٧﴾ ﴾ (البقرة)

(جوولەکەو گاورو بت پەرستان) دەڵێن: خوا منداڵی بۆ خۆی داناوەو فەراهەمی هێناوە (لەکاتێکدا خوا پێویستی بەکەس نیە) نەخێر وانی یە، بێگومان هەرچی لە

ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هەر خۆی خاوەنیەتی و هەر هەمووشیان ملکەچ و فەرمانبەرداری ئەوزاتەن.

(هەر ئەو زاتە) بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەویە بەجوانترین شێوە، جا هەر کاتێك بڕیاری هەر شتێك بدات، تەنها ئەوەندەی بەسە کە فەرمانی بوون یان پێشهاتنی بدات، ئیتر خێرا ئەو شتە، یان ئەو کارە، دەبێت و ئەنجام دەدرێت.

ئەم خستنەڕووە شێوازی گاڵتەپێکردن و سوکایەتی پێکردنیانە لەبەرئەوەی وتەکانیان یەك ناگرێتەوە چونکە ئەوان لەلایەن خۆیانەوە بڕیاری منداڵیان بۆخوا داوەو دەڵێن خواکردویەتی بەمنداڵی خۆی دانانیش واتە بەدەست خستن ئەمەش پێچەوانەی منالبوونەچونکە منالبوون بەدیهاتنەبەبێ دەستکاری خاوەنەکەی ، جائەگەر دەستکاری هاتە جێ ئەوە بەندایەتیش دێتە جێ چونکە بەدەست هاتووە دیسان وەك دروستکراوی خوا مامەڵەی لەگەڵ دەکرێ و خوا دەبێتە دروستکەرو بەدەستهاتووەکەش دەبێتە دروستکراو ئەمەش دژایەتیە لەزانستی جەدەلدابەتێکدان ناو دەبرێ واتە سەلماندنی بوونی شتێك بەبوونی دژەکەی ، وەك ئەوەی کەسێك بڵێت کوشتن تاوانێکی گەورەیەو لێخۆشبونی نیە وەك پاشگەزبونەوە لەدین (لەکاتێدا پاشگەزبونەوە لەدین لێخۆشبونی هەیە بە تەوبەکردن)[٢]

بنەڕەتی ئەم قسانە بەنیسبەت موشریکەکانەوە لەنەزانینەوە سەرچاوەی گرتووە وەبەنیسبەت ئەهلی کیتابەوە (خاوەن پەڕاوەکانەوە) لەڕۆچوون و خراپ حاڵی بونیان لەدینەوە سەرچاوەی گرتووە . ئەمەش بەهۆی خەیاڵ کردنیان کەلەیەکچواندن و لەبری دانان حەقیقەت و ڕاستیە ، لەوەسفی پیاو چاکاندا هاتووە کەئەوانە بەشێوازی لێکچواندن منداڵی خوان ، وەلە ئینجیلی گاورەکاندا وەسفی خوا کراوە بەباوکی عیسا و ئومەتەکەی ، ئەم شتانە ڕووبەڕووی عەقڵی کەسانێك کراوەتەوە هیچ لەبارەی تەئویلەوە

---

٢–وەرگێر.

شـارەزانیە و پشـتگیریش لـەبیرو باوەڕەکـەی ناکـات بەبەڵگـەی ڕاسـت و دروسـت بۆیـە واگومان دەبات ئەو شتانە راستین .

فـەرموودەی خوا(سـبحانە) پـاك و بێگەردییـە ئـەو قسـەنابەجێیانە وەهێمـای ئـەوەی تێدایـە کـە هـەبوونی منـداڵ کەموکورتییەکـە بەنیسـبەت خـواوە ئەگەرچـی لەڕواڵەتـدا تەواوکاریش بێت ،چونکە ئەگەر لەڕواڵەتدا تەواوکاری بێت لەڕووی پڕ کردنـەوەی هەنـدێ کەموو کورتی لەکاتی پیری و هەژاریـدا یـان پڕکردنـەوەی جێگـای بێـت لـەکاتی نـەمان و لەناو چوندا، ئەوە خوای گـەورە پـاك و بێگـەردە لەهـەموو ئـەم شـتانە ، ئەگـەر منـداڵی هەبوایە ڕێگای پێ دەدا کەهاوکاری بکات .

چۆن خوای گەورە منداڵ بۆخۆی دادەنێت لەکاتێکدا هەموو ئەوانـەی لەئاسمانـەکان و زەویدان کردگارو بەدیهێنراوی ئەون و هەمووان ملکەچن بۆگەورەیی خوا. ﴿وَقَالُوا اتَّخَذَ اللَّهُ وَلَدًا سُبْحَانَهُ بَل لَّهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ كُلٌّ لَّهُ قَانِتُونَ ﴿١١٦﴾﴾ (البقرة).

ئەمـەش بەڵگەیـەکی تـرە لـەنفی کردنـی منـداڵ بۆخـوا، چـونکە ملکەچـی یەکێکـە لەئاکارەکانی بەندە، بەڵام منداڵ نازی هەیە بەسەر باوکداو پەیوەندی کوڕو باوکیش ڕێزو گوێڕایەڵییە نەك ملکەچ بـوون، چەسپاندنی ملکەچـی کینایەیـەبۆ رەد کردنـەوەی منـداڵ کەواتە لەبەرئەوەی ملکەچ بوون هەیە بەندایەتی دەسەلمێ نەك منداڵداریتی .

**دووەم: موشریکەکان کچیان بۆخۆیان پێ قەبوڵ نیە ئیترچۆن بۆخوای بڕیار دەدەن ؟!**

ئەم بانگەشەکردنە یەکێکە لەکارە قێزەونەکانی موشـریکەکان ،ئەوانـەی شـتی تریـان لەگەڵ پەرستنی خـوادا پەرسـتوە، ئـەوان ئەوفریشـتانەی کەبەنـدەی خـوان بەمێینـەیان داناون و کردویانن بەکچانی خوا ، پاشان پەستویانن لەگەڵ خوا.

ئەوانەهەڵەیەکی گـەورەیان ئەنجامداوەلەچـەند ڕوویەکـەوە لـەڕووی ئـەوەی منـداڵیان بۆخـوا بڕیـار داوە و ئـەویش منـداڵی نیـە، پاشـان بـێ ڕێزتـرین پشـکیان بۆبڕیـارداوەو

لەڕوانگەی خۆیانەوە کەکچە،چونکە ئەوان ئەم پشکەیان بۆخۆیان پێ قەبوڵ نیە ، هەربۆیە قورئان لەچەند جێگایەکدا ئەو هەڵبەستراوەیانی ڕەد کردۆتەوە لەوانە کەدەفەرموێ: ﴿ وَيَجْعَلُونَ لِلَّهِ ٱلْبَنَٰتِ سُبْحَٰنَهُۥ وَلَهُم مَّا يَشْتَهُونَ ﴿٥٧﴾ ﴾ (النحل)، ئەو نەفامانە کچان دەدەنە پاڵ خوا (گوایە فریشتەکان کچی خوان)، پاکی و بێگەردی شایستەی ئەو زاتەیە هیچ پێویستیەکی بە کچ و کوڕ نیە لە کاتێکدا بۆ خۆیان حەز بەچی دەکەن ئەوە بۆ خۆیان دادەنێن.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿ أَلَكُمُ ٱلذَّكَرُ وَلَهُ ٱلْأُنثَىٰ ﴿٢١﴾ تِلْكَ إِذًا قِسْمَةٌ ضِيزَىٰٓ ﴿٢٢﴾ ﴾ (النجم)، ئایا ڕەوایە کوڕان بۆ خۆتان و کچان بۆ خوا بەچاك بزانن (خوای گەورەدەیەوێت بەعەقڵی چەوتیان ڕەخنەیان لێبگرێت، ئەگینا کوڕو کچ هەردووك دروستکراوی خوان و پێوەی ڕێز تەنها خواناسی و پارێزکاریە)

ئەگەر وابێت ئەو کاتەئەو دابەشکردن و بڕیارەتان زۆر دوورەلەدادپەروەریەوە و لەسنوور ترازانە.

ئەوموشریکانە نێرینە بۆخۆیان هەڵدەبژێرن، وەڕوو لەکچان وەردەگێڕن کە داویانەتە پاڵ خوا، بۆیە قورئان باسی حاڵیان دەگێڕێتەوە کاتێك کە مژدەی کچیان پێ دەدرێ و دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِٱلْأُنثَىٰ ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿٥٨﴾ ﴾ (النحل)، خۆ ئەگەر مژدەی بوونی کچ بدرێت بە یەکێك لەو نەفامانە، ڕووی گرژو تاڵ دەبێت و ڕەش دادەگیرسێت و سینەی پڕ دەبێت لە خەم و پەژارە.

بەومانایەی : ئەگەر یەکێکیان مژدەی ئەوەیان پێ بدرێ کەکچیان بووە ڕوخساری ڕەش و مۆن دادەگیرا لەخەفەتدا ئەتاساو بێدەنگ دەبوو لەخەم و پەژارەداو دلگران دەبوو لەوەی خەڵك ببینێ ،خۆی حەشاردەدا لەبەرامبەر ئەو مژدانەی کەپێی درابوو، لەم حاڵەتەشدا یان بەزیندویی دەیهێشتەوەو بەسوکایەتیەوە مامەڵەی لەگەڵ دەکردو گرنگی و میراتی پێ نەدەدرا یاخود زیندە بەچاڵی دەکرد هاوشێوەی سەردەمی نەفامی ئەمە هەڵوێستیان بوو بەرامبەر مێینە .

قورئــان وەڵــامی ئــەو قسەهەڵبەســتانە دەداتــەوەو دەفــەرموێ: ﴿ إِنْ هِيَ إِلَّآ أَسْمَآءٌ سَمَّيْتُمُوهَآ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَٰنٍ ۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَمَا تَهْوَى ٱلْأَنفُسُ ۖ وَلَقَدْ جَآءَهُم مِّن رَّبِّهِمُ ٱلْهُدَىٰٓ ﴿٢٣﴾ ﴾ (الـنجم)، ئـەم بـت و پەیكەرانـە تـەنها شـتێكە كـەخۆتان و بـاوو باپیرانتان ناوتان لێ ناون و هیچی تر نین، خوا بەڵگەیەكی نەناردووەلەسەر ڕەوا بوونیان، سـەیرە، ئەوانەتـەنها شـوێنی گومـان و ئـارەزوی دەروونەنەخۆشـیەكانیان دەكـەون، لەكاتێكدا كەبەڕاستی لەلایەن پەروەردگاریانەوە هیدایەت و ڕێنموویان پێ گەیشتووە!

ئەگەرنێوە ئەم جۆرە بەشكردنەتان لەنێوان خۆشتاندا ئەجام بدایە هەربەشـكردنێكی ستەم كارانەوپوچەڵ دەبوو، ئیتر چۆن بەو شێوازە بەشی خوا دیاری دەكەن ؟!

هەروەها قورئا وەڵامی ئـەو خەیاڵاتانـەیان دەداتـەوە كـەگوایا ئـافرەت ناتـەواوە ئـەم ناتەواویەشـی بەلەبـەركردنی خشـڵ پڕدەكاتـەوە هەرلەمنداڵیـەوە . وەئەگـەر شـەڕو هەرایەكی بـە ڕیاركرد ئـەوە دەستەوسـانە و توانـای سـەركەوتنی نیـە بۆیـە هـیچ ڕخێكـی بۆدانانرێ.

چـونكە ئـەو(ئافرەت) لەڕواڵــەت و ناوەرۆكـدا ناتـەواوە، ناتەواویـەكانی ڕواڵــەت و ڕوخسـاری بەخشـڵ و هاوشـێوەكانی پـڕ دەكاتـەوە بەمەبەسـتی شـاردنەوەی وەك چـۆن شاعیرێكی عەرەب دەڵێ:

وَمـــا الحَلْيُ إلا زينةٌ لنقيصةٍ     يتم من حسنٍ إذا الحُسْنُ قصرا

فأما إذا كان الجَمالُ موفوراً     كحسنك لم يحتجْ إلى أن يزورا [٢]

ئەگەر كەسێك ئەوە حاڵی بێت دەدرێتەپاڵ خوای گەورە؟!

---

٢- خۆڕازاندنەوە بە خشڵ بۆ ئەوانەن كە كەموڕیان هەیە، قەرەبووی جوانی بۆ ئەكاتەوە كە كـەمی پێدراوە، بەڵام ژن كە خۆی جوان بوو وەك جوانی تۆ ئەوە پێویستی بە بەوە نیە كە بە تەزویر خۆی جوان بكات.

خوای گەورەئەم بەشکردنەی ئەوان ڕەد دەکاتەوە و دەفـەرموێ: ﴿ أَوَمَن يُنَشَّؤُاْ فِي ٱلْحِلْيَةِ وَهُوَ فِي ٱلْخِصَامِ غَيْرُ مُبِينٍ ﴿١٨﴾ ﴾ (الزخـرف)، ئایـا کەسـێك بـە منـداڵی خـودا ڕەوا دەبینن، (کە لەباوی ئەواندا) هەردەم پەروەردە دەکرێـت لـەناو خشـڵ و ئـارایش کردنـی خۆیداو لە شەڕو شۆڕو جەنگیشدا دەرناکەوێت!

**سێیەم/ دانانی فریشتەکان بەکچانی خوا بێباوەڕییەکی ئاشکرایە بەرامبەر نیعمەتەکانی خواو مامەڵەکردنێکی خراپە لەگەڵ خوادا.**

ئەگەر خوای گەورە منداڵی هەبێت چۆن دەبـێ کچـەکان بۆخـوا دانـێن و کوڕەکـانیش بۆخۆیـان هەڵدەبـژێرن ؟! ئایـا دەگـونجێ ئـەوان ئـەو خەیاڵـە بکـەن بەرامبـەر خـوای گەورەلەکاتێدا بەلەدایك بوونی کچان بێزار دەبن و تێـك دەچـن: ﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِٱلْأُنثَىٰ ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿٥٨﴾ ﴾(النحل)، خۆ ئەگەر مژدەی بوونی کچ بـدرێت بـە یـەکێك لەو نەفامانە، ڕووی گرژو تاڵ دەبێت و ڕەش دادەگیرسێت و سینەی پڕ دەبێت لە خەم و پەژارە..

کەی ئەوە مامەڵەیەکی شیاوە بەرامبەربەخوا کەکەسێك دەدەنە پاڵی ئەگەر بۆخۆیـان مژدەی ئەوەیان پێ بدرێت حاڵیان تێك دەچێت تەنانەت ڕوخساری هەریەکێکیان ڕەش دا دەگەڕێ لەبەرامبەر ئەو هەواڵـەی پێـی دراوە تادەگاتـە ئاسـتێکی بـەرز لـەتوڕەیی بـەڵام ئاشـکرای ناکـات و دەیشـارێتەوە لەگـەڵ ئەوەشـدا خەریکـە ئەتەقێتـەوەو پارچەپارچـە دەبێ.

ئەوەکـەی مامەڵـەیـەکی شـیاوە بەرامبـەر بـەخوا کەکەسـێك تایبـەت بکـەن بـەخواوە کەلـەناو زێـڕو خشـڵدا گـەورەبوبێ بەنەرموناسـکی کـەنتوانای شـەڕو نـەتوانای دەربڕینـی هەبێت ،لەکاتێکدا خۆیان لەژینگەکانیاندا خۆشی و شادی دەردەبڕن بۆسوارچاکەکانیان و پیاوە جەربەزەکانیان.

ئەوکارەئەگەر لەڕوانگەی خۆیانەوە وەربیگرێ مایەی سەرشۆڕییە بۆیان، ئیتر چۆن شتێك بۆخوا هەڵدەبژێرن و دەیدەنەپاڵی کەبۆ خۆیان ڕقیان لێیەتی ؟! ئەگەر بڕیاربێ هەرئەم کارە بکەن ئەوە بائەوشتە بۆخوا هەڵدەبژێرن کەپێیان چاکەو بۆخۆیان پێیان خۆشە؟![4] گومانی تێدا نیە ئەم کارەی ئەوان بێباوەڕییەکی ڕوون و ئاشکرایە بەرامبەرنیعمەتەکانی خوای گەورە.وەك دەفەرموێ: ﴿ أَمِ ٱتَّخَذَ مِمَّا يَخْلُقُ بَنَاتٍ وَأَصْفَىٰكُم بِٱلْبَنِينَ ﴿١٦﴾ ﴾ (الزخرف)، ئایا ڕەواو ڕاستە، لەوەی کە دروستی دەکات کچان بۆ خۆی بڕیار بدات و بەخشینی کوڕانیش بەڕەوا بزانێت بۆ ئێوە؟! (ئەمانە هەمووی بیروباوەڕی نەفامەکان بوون خوای گەورە دەیەوێت هەر بە بۆچوونی خۆیان بیروباوەڕیان پووچەڵ بکاتەوە.

**چوارەم/ دانانی فریشتەکان بەکچانی خوا دژایەتی بڕیاردانیان (دان پیانانیان) دەکات لەسەر پەروەردگاریتی پەروەردگار:**

ئەوبانگەشەی کەئەوقسەهەڵبەستانەدەیکەن کەفریشتەکان کچانی خوان دژایەتی بڕیارەکانی خۆیان دەکەن،موشریکەکان دان بەوەدا دەنێن کەخوای گەورە دروستکەری هەموو شتەکانە ، لەگەڵ ئەوەشدا لەڕووی یەکتا پەرستیەوە هاوبەشیان بۆ بڕیارداوە،

کەی ئەوە ڕەوایە دروستکراو بکرێ بەخوا؟! وەك چۆن کچانیان داوەتە پاڵ خوا ، هەبوونی منداڵیش هاوڕەگەزی و هاوشێوەی دەخوازێ ، چۆن دەگونجێ بەدیهێنەری هەموو شتەکان تەنها کچی هەبێت ؟! بێگومان ئەوانیش دروستکراوی ئەون (جل جلاله).

ئەگەر ئەوان دروستکراو نەبن کەواتە دەبێ بەبوونی خوا ئەوانیش هەبن ، ئیتر چۆن دەبنەکچانی خوا ؟! لەم بارەیەوە قورئان ئاماژە بەدوو ڕای جیاواز دەکات و دەفەرموێ: ﴿ أَمِ ٱتَّخَذَ مِمَّا يَخْلُقُ بَنَاتٍ وَأَصْفَىٰكُم بِٱلْبَنِينَ ﴿١٦﴾ ﴾ (الزخرف)، ئایا ڕەواو ڕاستە، لەوەی

---

٤- فی ظلال القران، سید قطب، دار الشروق ، مصر، ط ١٣، ١٤٠٧هـ ، ١٩٩٨م ، ج٥،(ﷺ)٣١٨١، بتصرف.

که دروستی دەکات کچان بۆ خۆی بڕیار بدات و بەخشینی کوڕانیش بەڕەوا بزانێت بۆ ئێوە، ئەوان دوو جۆر بیرکردنەوەیان لەخەیاڵی خۆیاندا کۆکردۆتەوە، یەکێکیان داهێنانی فریشتەکانە کە پێویستە بەندەی خوا بن، دووەمیان باوەڕبوون بەخوایەتی فریشتەکان کەدەڵێن کچانی خوان چونکە هەبوونی منداڵیش هاوشێوەیەکی پێویستەلەڕەگەزدا.

دوای پوچەڵ کردنەوەی ئەم تێڕوانینە چەسپاوە یان دەربارەی ئەو بیرو باوەڕە چەپەڵەیان قورئان بەڵگەیەکی سەلمێنراو باس دەکات کەبانگەشەکەی ئەوان پوچەڵ دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِمَا ضَرَبَ لِلرَّحْمَٰنِ مَثَلًا ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿١٧﴾ أَوَمَن يُنَشَّؤُا۟ فِى ٱلْحِلْيَةِ وَهُوَ فِى ٱلْخِصَامِ غَيْرُ مُبِينٍ ﴿١٨﴾ ﴾ (الزخرف)، کاتێکیش مژدە بدرێت بە یەکێکیان بەوەی کە بۆ خوای میهرەبان بە ڕەوای زانیوە (مەبەست ئەوەیە کە کچیان بووە)، ئەوە ڕووخساری ڕەش هەڵدەگەرێت و لە دەروونـدا پێش دەخواتەوە.ئایا کەسێك بە منداڵی خوا ڕەوا دەبینن، (کە لەباوی ئەواندا) هەردەم پەروەردە دەکرێت لەناو خشڵ و ئارایش کردنی خۆیداو لە شەڕو شۆڕو جەنگیشدا دەرناکەوێت؟!

بۆچوونەکانی ئەوانی پوچەڵ کردەوە کە فریشتەکان کچانی خوان چونکە ڕەد کرنەوەی ئەو کەماڵەی تێدایە کە بۆ یەکتاپەرستی خوا پێویستە، ڕێگرییانە دەکات لەوەی ئەو کچانەی لای خۆیان ویستراو نین بیانکەنە منداڵی خوا .[٥]

لەسەرو ئەوەشەوە فریشتەکان بەندەی خوان دانە پاڵیان وەك منداڵی خوا ئەوە دەگەیەنێ سیفەتی بەندایەتیان لەسەرلابراوەو تایبەتکراون بەنزیکی زۆر نزیك لەخوا ، ئەوانیش بەندەن وەك هەموو بەندەکانی تر، ئیتر پێویست بەتایبەتکردنیان ناکات بە سیفەتێك جگەلەسیفەتی بەندایەتی و پەیوەندییان بەپەروەردگارو دروستکەرەکەیانەوە تەنها پەیوەندی خالق و مەخلوقە .[٦]

---

٥- التحرير والتنوير ، طاهر ابن عشور ، ج ١٣ ،(ﷺ) ١٧٦ – ١٧٩ بتصرف

٦- فى ظلال سيد قطب ، مرجع السابق ، ج ٥ ،ص ٣١٨١

**پێنجەم/ موشریکەکان دروستکردنی فریشتەبەڕێزەکانیان نەبینیوە ئیتر چۆن بڕیاردەدەن کەئەوان کچی خوان؟!**

قورئان مەودای قسە هەڵبەستن و قسەوقسەلۆکی ئەو خەڵکانە دیاری دەکات لەبارەی خواوە دەیڵێن بەبێ بەڵگەو زانیاری کە دەفەرموێ: ﴿ أَمْ خَلَقْنَا ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ إِنَٰثًا وَهُمْ شَٰهِدُونَ ﴿١٥٠﴾ ﴾ (الصافات)، ئایا مەگەر فریشتەکانمان بە مێینە درووست کردووە و لەو کاتەدا ئەوان لەوێ بوون؟! هەروەها ئەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلُوا۟ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ ٱلَّذِينَ هُمْ عِبَٰدُ ٱلرَّحْمَٰنِ إِنَٰثًا ۚ أَشَهِدُوا۟ خَلْقَهُمْ ۚ سَتُكْتَبُ شَهَٰدَتُهُمْ وَيُسْـَٔلُونَ ﴿١٩﴾ ﴾ (الزخـرف)، ئـەو خوانەناسـانە فریشتەکان کە بەندەی خوای میهرەبانن، بەکچی خوایان دەدایە قەڵەم!! ئایا ئەوان ئامادەی دروستکردنیان بوون؟! لە ئایندەدا ئەم بوختانەیان لەسەر دەنوسرێت و پرسیاریشیان لێ دەکرێت.

ئایا ئەو هاوبەش بڕیاردەرانە دروستکردنی فریشتەکانیان بینیوە کەبڕیاری ئەوە بدەن کەئەوانە مێینەن؟! هەرگیز شتێکی وا نەبوو بەڵکو ئەوانە درۆدەکەن و دەشزانن کەقسەکانیان درۆیە.

بینین بەڵگەو بیانویەکە بەدەست خاوەن سکاڵاوە کەپشتی پێ ببەستێ، بەڵام ئەوان ناتوانن بانگەشەی ئەوەبکەن کەدروستکردنی فریشتەیان بینیوە، ئەوان کە ئەو شایەتیە دەدەن و بانگەشەی بۆدەکەن با بەرپرسیارێتی ئەوکارە لەئەستۆ بگرن ﴿ .. سَتُكْتَبُ شَهَٰدَتُهُمْ وَيُسْـَٔلُونَ ﴿١٩﴾ ﴾ پاشان قورئان بەدوای ئەو قسەهەڵبەستەی کەبەئارەزوی خۆیان دایدەڕێژن و بیانوی بۆدەهێننەوەو دەمەدەمەی لەسەردەکەن دەفەرموێت: ﴿ وَقَالُوا۟ لَوْ شَآءَ ٱلرَّحْمَٰنُ مَا عَبَدْنَٰهُم ۗ مَّا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ ﴿٢٠﴾ ﴾ (الزخـرف)، (بۆ پینە کردنی هەڵویستی ناڕەوایان) دەیانوت: ئەگەر خوای میهرەبان بیویستایە... ئێمە ئەمانەمان نەدەپەرست، وە نەبێت لەسەر بنچینەی هیچ زانستی و زانیاریەك ئەو قسەیە بکەن، ئەمانە تەنها درۆ نەبێت هیچی تر ناڵێن..

ئـەوان ڕادەکـەن کـاتێ بەڵگـەکان دەورەیـان دەگرێـت و ئەفسـانەکانی بەردەسـتیان تێکدەشکێت و پەنادەبەنە بەرفێڵ کردن سەبارەت بەویستی خوا بانگەشەی ئەوە دەکەن کەخوا ڕازیـە لـەوەی ئـەوان فریشـتەکان بپەرسـتن، خۆئەگـەر ڕشـازی نەبوایـە ڕێگـری لێ دەکـردن و نەیدەهێشـت بیـان پەرسـتن، ئـەم قسـانە چەواشـەکردنی ڕاسـتیە ،چـونکە هەرکارێك لەم بونەوەرەدا بەویستی خوایەئەمە ڕاستە، بەڵام ویستی خوا لەوەدایە توانای بەمرۆڤـ بەخشیوە کە ڕێگای ڕاست بگرێتەبەر نەك گومڕابێ، خوای گـەورە هەڵبـژاردنی ڕێگـای ڕاسـتی سـپاردوە بەبەنـدەکانی و بـەوەش ڕازیـە نـەك ڕازی بـێ بـەبێ بـاوەڕی و گومڕایی .

کـاتێ ئـەوان ئـەم چەواشـەکاریە ئـەنجام دەدەن لەسەرویسـتی خـوا بێگومـان بـێ سـەروبەرە دەیـدەن بەسـەریەکدا، ئـەوان یـەقینیان نیـە کـە خـوا ویسـتی وایـە ئـەوان فریشتەکان بپەرستن.[٧]

قورئانیش بۆئەم مەبەستەدەڕوانێتەپرۆگرامێکی زانسـتی تۆکمـە و یاسـایەکی زانسـتی پەیڕەو دەکـات کەکـەس جیـاوازی نـەبێت لەسـەری ،یاسـاکەش ئەوەیـە ڕەد کردنـەوەی هەربانگەشەیەك کەلەسەر بنەمای گومان و درۆ دروست کرابێت ، بەمەش قورئـانی پـیرۆز هەموو بانگەشەکانی ئەوانی هەڵوەشانۆتەوە چونکە هیچـکامیان لەسـەربنەمای زانسـت و یەقین نەبووە .

**شەشەم/ موشریکەکان هیچ بەڵگەو بیانویەکیـان بەدەستەوە نیە لەسەرئەوشتانەی بانگەشەی بۆدەکەن:**

قورئـان قسـەی ئـەوانی ڕەد کـردەوە کـەدەیان وت فریشـتەکان کچـانی خـوان وەك دەفەرموێ: ﴿ أَصۡطَفَى ٱلۡبَنَاتِ عَلَى ٱلۡبَنِينَ ١٥٣ ﴾ (الصافات)، ئایا مەگەر کچانی هەڵبژاردووە کە بیکات بە نەوەی خۆی وە ڕێزی داون بەسەر کوڕاندا.

٧- المرجع السابق(ﷺ)٣١٨٣

بەواتای چ هۆکارێك وا لەخوای گەورە دەکات کچان بۆخۆی هەڵبژ یرێت نەك کوڕان؟!

وەك دەفەرموێ: ﴿ أَفَأَصْفَىٰكُمْ رَبُّكُم بِٱلْبَنِينَ وَٱتَّخَذَ مِنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنَٰثًا ۚ إِنَّكُمْ لَتَقُولُونَ قَوْلًا عَظِيمًا ﴿٤٠﴾ ﴾ (الاسراء)، ئینجا ڕوو بەهاوەڵگەران دەفەرموێت: ئایا ڕەوایە خوا ئێوەی هەڵبـژاردبێت تـا کوڕتان پێ ببەخشێت و خۆی فریشتەکانی هەڵبژاردبێت تا بیانکات بەکچی خۆی؟ (ئـەم بـیرو بـاوەڕە پـووچ و بـێ سـەروبنانە کـەی ڕەوایـە، مەگـەر کـوڕو کـچ هـەر خـوا نایانبەخشێت؟)، بەڕاستی ئێوە قسەو گوفتارێکی نابەجێ و گەورە و ناقۆڵا دەکەن.

هەروەك چۆن خـوای گـەورە ئەوەشـی ڕوون کردۆتـەوە کەئەوانـە هـیچ بەڵگـەوبیانوو پاڵپشتێکیان نیەلەسەرئەوەی کەدەیڵێن ،ئایا پشتیان بەپەڕاوێکی ئاسمـانی بەسـتوە کـە لە خـواوە دابـەزیبێ کـە خـوا لـە نێـو دروسـتکراوەکانیدا کچـانی بۆخـۆی هەڵبـژاردوە؟! ئەوەی کەدەیڵێن ناچێتە عەقڵەوە بە تەواوی ڕەدی دەکاتەوە.

خـوای گەورەدەفـەرموێ: ﴿ مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿١٥٤﴾ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿١٥٥﴾ أَمْ لَكُمْ سُلْطَٰنٌ مُّبِينٌ ﴿١٥٦﴾ فَأْتُوا۟ بِكِتَٰبِكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٥٧﴾ ﴾ (الصافات)، ئایا چیتانە و چۆن بڕیـاری بـێ بەڵگـەی وا دەدەن. ئایـا بیرێـك ناکەنـەوە؟ (لـەم قسـە بـێ سـەروبەنانە ؟! لـەم تۆمەتـە ناماقوڵانە؟!).ئایا مەگەر بەڵگە و شتێکی بەهێز و ئاشکراتان بەدەستەوەیە (بۆ ئەم قسە حەلەق و مەلەقانە).ئادەی: کوا کتێبتان، کوا بەڵگەتان ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن بیهێننە مەیدان.

ئـەم قسـانەی ئـەوان چاوسـاغ و بەڵگەیـەك پشـتگیریيان لێ ناکـات بـەڵکوگومان و قسەهەڵبەستنێکەلەسـەردرۆوگومان وهـەواو ئـارەزوو بنیـات نـراوە، بۆیـە خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿ وَقَالُوا۟ لَوْ شَآءَ ٱلرَّحْمَٰنُ مَا عَبَدْنَٰهُم ۗ مَّا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ ﴿٢٠﴾ ﴾ (الزخرف)، (بـۆ پینـە کردنـی هەڵوێسـتی ناڕەوایـان) دەیـانوت: ئەگـەر خـوای میهرەبـان بیویستایە... ئێمە ئەمانەمان نەدەپەرست، وە نـەبێت لەسـەر بنچینەی هـیچ زانسـتی و زانیاریەك ئەو قسەیە بکەن، ئەمانە تەنها درۆ نەبێت هیچی تر ناڵێن.

لەکوێوە دڵنیایان بۆدێ لەکاتێکدا ئەوان دوای خەیاڵ و گومان کەوتوون؟! بۆیە خوای گــەورە کارەکــەیان ڕەتدەکاتـــەوەو دەفـــەرموێ: ﴿ أَمْ ءَاتَيْنَٰهُمْ كِتَٰبًا مِّن قَبْلِهِۦ فَهُم بِهِۦ مُسْتَمْسِكُونَ ﴿٢١﴾ ﴾ (الزخرف)، ئایا ئەو خوانەناسانە پێش ئەم قورئانـە کتێبێکی ترمـان بۆ ناردوون؟ تا پابەندی بن و پەیرەوی بکەن.

ئایا پەڕاوێکیان هەیـە کەپشـتگیریان بکـات لەسـەرئەوەی کـەدەیلێن و دەسـت بگـرن بەوڕاستیانەی کەتێیدایەوپەنای بۆبەرن لەپەرستشەکانیاندا؟!

لەو ڕووەوە هیچیان پێ نامێنێ و دەگەنە بەربەست پێیان ڕادەگەیـەنرێ کـەبیرو بـاوەڕ نــابێ بــە هـــەنگاوی کوێرانـــە و بـــێ ســـەروبەرەیی دەســـتی تێوەربـــدرێ و بۆچـــوون و بانگەشەکانیان پشتی پێ نابەسترێ بەڵکو دەبێت لە پەڕاوێکەوە وەرگیرابێـت کەلەلایـەن خواوە بێت و ئەوکەسەدەستی پێوە دەگرێت کەبۆی دابەزیوە..

باوەڕکردنیان بە ئەفسانەیەکی پڕوپوچ و بێ بنەماو ئەنجامـدانی پەرستشـێکی بـەتاڵ کە پشت بـە هـیچ پـەڕاوێك نابەسـتێ ئەمـە تاکـە بەڵگـەی دەسـتیانە وەك خـوای گـەورە دەفەرموێ: ﴿ أَمْ ءَاتَيْنَٰهُمْ كِتَٰبًا مِّن قَبْلِهِۦ فَهُم بِهِۦ مُسْتَمْسِكُونَ ﴿٢١﴾ ﴾ (الزخـرف)، ئایـا ئـەو خوانەناسانە پێش ئەم قورئانە کتێبێکی ترمان بۆ ناردوون؟ تـا پابەنـدی بـن و پـەیڕەوی بکەن؟ ئەم قسـەبێ بنەمایـە مایـەی گاڵتەجاڕیە،ئەمەتـەنها حیکایـەت و شـوێنکەوتنێکی کوێرانەیەکە هیچ تێفکران و بیرکردنەوەو بەڵگەو بیانویـەکیان نیە،ئەمەگاگەلێکـە دەڕوات بۆهەرکوێ ببرێ ناپرسێ بۆکوێ دەڕوات و شـارەزای ڕێگـا نیـە ! پێویسـتە تێگەیشـتن و تێفکـران و وردبونـــەوە هـــەبێت پاشـــان هەڵبژاردەیـــەك بکـــرێ لەســـەربنەمای یـــەقین و تێگەیشتن .[8]

---

٨- المرجع السابق (ﷺ)٣١٨٢

**حەوتەم/ فریشتەکان بەندەی بەڕێزی خوان و گوێ ڕایەڵن بۆفەرمانی ئەو،** فریشتەکان بەندەی ڕێزدارن لای خوا لەپێگەو پلەی بەرزدان، ئەوان ئەوپەڕی ملکەچ و گوێ ڕایەڵی خوان بەوتەو بەکردار، وەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُوا اتَّخَذَ الرَّحْمَنُ وَلَدًا سُبْحَانَهُ بَلْ عِبَادٌ مُكْرَمُونَ ﴿٢٦﴾ لَا يَسْبِقُونَهُ بِالْقَوْلِ وَهُمْ بِأَمْرِهِ يَعْمَلُونَ ﴿٢٧﴾ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ارْتَضَى وَهُمْ مِنْ خَشْيَتِهِ مُشْفِقُونَ ﴿٢٨﴾ ۞ وَمَنْ يَقُلْ مِنْهُمْ إِنِّي إِلَهٌ مِنْ دُونِهِ فَذَلِكَ نَجْزِيهِ جَهَنَّمَ كَذَلِكَ نَجْزِي الظَّالِمِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾ (الانبیاء)، خوانەناسان دەیانوت: خوای میهرەبان کوڕی بۆ خۆی بڕیارداوە (فریشتەکان ڕۆڵەی ئەون)، پاکی و بێگەردی بۆ ئەو زاتەیە، بەڵکو ئەوانە بەندەی ڕێزداری ئەون.(ئەو فریشتانە ئەوەندە ڕەوشت بەرزن) هەرگیز (نافەرمانی ناکەن و) قسە لەقسەیدا ناکەن و لە گوفتاردا پێشی ناکەون، ئەوانە بە فەرمانی ئەو دەجوڵێنەوە و فەرمانی ئە جێبەجێ دەکەن.هەر خوا دەزانێت ئە خەڵکە لە ڕابوردوودا چیان ئەنجامداوە و لە داهاتووشدا چی ئەنجام دەدەن (دنیا و قیامەت، ڕابوردوو و داهاتوو، بۆ ئەو زاتە چوونیەکە)، فریشتەکانیش تکاکار نابن تەنها بۆ ئەو کەسانە نەبێت خوا پێی ڕازییە و ئەو فریشتانە لە ترسی ئەو زاتە ناوێرن هیچ سەرپێچیەك ئەنجام بدەن.

لەم ئایەتانەدا وەڵامێکی بەهێزی موشریکەکان دراوەتەوە لەسەر ڕوون کردنەوەی حەقیقەت و سروشتی فریشتەکان، ئەوانە کچانی خوانین وەك ئەوەی ئەوان دەیڵێن : ﴿ بَلْ عِبَادٌ مُكْرَمُونَ ﴿٢٦﴾ ﴾ واتە بە هۆی بەگەورەزانین و گوێڕایەڵی کردن و ئەدەبیانەوە فریشتەکان تێکەڵی کاری خوا نابن ، بەڵکو کاربەفەرمانی خوادەکەن بەبێ چەنو چون (موناقەشە) تەنانەت داوای شەفاعەت بۆکەسێکیش ناکەن کەخوا ڕازی لەسەرنەبێ

کەشەفاعەتی بۆبکرێ، لای خوا شاراوە نین ئەوان بەسروشتی خۆیان لەخوا دەترسن بەهۆی نزیکی و پاکیو گوێ ڕایەڵیان بەبێ جیاکاری و لادان لێی ، ئەوان بەهیچ جۆرێك بانگەشەی خوایەتی ناکەن ، ئەگەر واشبکەن ئەوا سزایان وەك سزای هەرکەسێکە کەبانگەشەی خوایەتی بکات ، ئەویش مانەوەی هەتاهەتاییە لەدۆزەخدا،ئەوە سزای هەرستەمکارێکە کەداوایەکی ستەمکارانەی دوور لەڕاستی بکات لەم بونەوەرەدا بانگەشەی هاوبەش بڕیاردەدان لەڕواڵەتدا بەم جۆرە نەخوازراوە دوورلەڕاستیەیە کەکەس بانگەشەی لەوجۆرە ناکات ،ئەگەر کردیشی ئەوا سزای بەئازار دەچێژێ!

دیمەنی باوی فریشتەکان کەگوێ ڕایەڵن بۆخواو ملکەچن لەترسی خوا ، لەکاتێکدا موشریکەکان گومان دروست دەکەن و سنوردەبەزێنن! (٩)

پاش ئەوەی قورئان حەقیقەتی فریشتەکانی بۆڕوون کردنەوە ، و پەرستنیان جگەلەخوا کوفرو گومڕاییە ـ موشریکەکان ـ بەڵکو دوای گومان کەوتون بەبێ پشت بەستن بەوەحی یان بەڵگەیان زانست،ئەوانە هەموو ئەو شتانە دەزانن و لەناخیاندا بڕیاری لەسەر دەدەن، وەك ئەوەشی ڕوون کردۆتەوە کەشوێن کەوتنی باوباپیران و لاسایی کردنەوەیان بەڵگەنیە.

پاش هەموو ئەوانە قورئان بەڵێنی پێداون کەلەڕۆژی دواییدا ڕووبەڕوی ئەوفریشتانەیان دەکاتەوە کەدەیان پەرستن، فریشتەکان بێ بەرییان دەکەن لەپەرستنیان و ئەوان فەرمانیان بەموشریکەکان نەکردوە کەبیان پەرستن، ناکرێ فریشتەکان جگە لەخوا (ئەولیا) بۆخۆیان دیاری بکەن .

لەکاتێکدا ئەوان لەخواترسترین دروستکراوی خوان و لەهەموویان زیاتر بەندایەتی خوادەکەن، خوای گەورەدەفەرموێ: ﴿ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَيَقُولُ

---

٩- المرجع السابق (ﷻ)٣١٨٢

﴿ءَأَنتُمْ أَضْلَلْتُمْ عِبَادِى هَٰٓؤُلَآءِ أَمْ هُمْ ضَلُّوا۟ ٱلسَّبِيلَ ﴿١٧﴾ قَالُوا۟ سُبْحَٰنَكَ مَا كَانَ يَنۢبَغِى لَنَآ أَن نَّتَّخِذَ مِن دُونِكَ مِنْ أَوْلِيَآءَ وَلَٰكِن مَّتَّعْتَهُمْ وَءَابَآءَهُمْ حَتَّىٰ نَسُوا۟ ٱلذِّكْرَ وَكَانُوا۟ قَوْمًۢا بُورًا ﴿١٨﴾﴾ (الفرقـان)، ڕۆژێك دێت خـوا بـێ بـاوەڕان کۆدەکاتـەوە و هـەموو ئـەو شـتانەش کـە لـەجیاتی خـوا دەیانپەرست، ئەوسا (خوا ڕوو بەپەرستراوەکان) دەفـەرموێت: ئایـا ئێـوە ئـەو بەندانـەی منتان گومڕا کرد؟ یاخود خۆیان ڕێبازی ڕاستیان وێـڵ کـرد و گـومڕا بـوون ؟.لـە وەڵامـدا دەڵێن: خوایە، پاکی و بێگەردی بۆ تۆیە، هەرگیز ڕەوا نیە ئێمە جگە لە تۆ کەسێك، یـان شتێکی تر بپەرستین یان بیکەینە پشتیوان و یاوەری خۆمان، بەڵام تۆ نازو نیعمەتت بەو خەڵکـە گومڕاییــە و بــاوو باپیرانیــان بەخشــی بــوو، ئــیتر هــەموو یــاداوەری و یــاد خستنەوەکانیان فەرامۆش کرد و بوونە قەومێکی بێ خێر و تیاچوو..

ئەونیشانە پرسـیارەی کەلەئایەتەکـەدا هەیـە﴿ .. ءَأَنتُمْ أَضْلَلْتُمْ عِبَادِى هَٰٓؤُلَآءِ ..﴿١٧﴾﴾ پرسیارێکی ڕاڤەکاریە بە مەبەستی دانپێدانان و شایەتیدان، بەواتای ئایا ئێـوە گومڕاتـان کردوون یان خۆیان گومڕابوون؟ خۆیان بێ بەری دەکـەن لەپەرسـتنیان ، وەشـایەتی بـێ باوەڕبونیان بۆدەدەن لەسەر نیعمەتەکانی خواو پشت کردنیان لە قورئـان و درۆکردنیـان بەدەم فریشتەکانەوە لەوەی کەداویانەتەپاڵ کەگوایـە ئـەوان فـەرمانیان پـێ کـردون کـە گومڕابن، کاتێك دەفەرموێ ( سُبْحَٰنَكَ ) ئەودان پێدانانـە بەگـەورەیی خـوا کەئـەوان خـوا بەپاك و بێگەرد دەزانن لەبەرامبەر ئـەوەی بانگەشـە بۆخۆیـان بکـەن لەبەشـداری کردنـی خوا لەخوایەتیدا .

هــەروەك خــوای گــەورە دەفــەرموێ: ﴿وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ يَقُولُ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ أَهَٰٓؤُلَآءِ إِيَّاكُمْ كَانُوا۟ يَعْبُدُونَ ﴿٤٠﴾ قَالُوا۟ سُبْحَٰنَكَ أَنتَ وَلِيُّنَا مِن دُونِهِم ۖ بَلْ كَانُوا۟ يَعْبُدُونَ ٱلْجِنَّ ۖ أَكْثَرُهُم بِهِم مُّؤْمِنُونَ ﴿٤١﴾﴾ (سبأ)، ڕۆژێك دێت کە هەموان کۆدەکرێنەوە (ئەوسـا خـوا بـە فریشـتەکان دەفـەرموێت: (بەڕاسـت)، ئەوانـە ئێوەیـان دەپەرسـت؟!(لـە وەڵامـدا) دەڵـێن: پـاکیی و

ستایش بۆ تۆ (ئەی پەروەردگار) تۆ یارو یاوەری ئێمەی نەك ئەوان، بەڵکو ئەوانە پەرییان دەپەرست، زۆربەیان باوەڕیان پێیان هەبوو (باوەڕیان بە جادووگەرو دەجالەکان هەبوو).

واتە ئەوان پشتیان بەشەیتان بەستوە یان یان بەڕووتێکردنی یاخود بەپەرستن یابەگوێ ڕایەڵی کردنی لەدانانی هاوبەش بۆخوا،ئەوان لەکاتێکدا فریشتەکانیان پەرستوە لەڕاستیدا شەیتانیان پەرستوە ئەویش بەگوێ ڕایەڵی کردنی ، بەم جۆرە قورئان لەهەموو ڕوویەکەوە ڕوبەروویان دەبێتەوەو گومراییەکەیان بەهەموو شێوازێك ئاشکرا دەکات ، بۆئەوەی هیچ بیانویەکیان بەدەستەوە نەمێنێ .[١٠]

**بەکورتی/**

ـ بڕیاردان لەسەرشتێك جۆرێکە لەباوەڕپێکردنی ،موشریکەکان دروستکردنی فریشتەکانیان نەبینیوە تاوەکو بڕیاری ئەوە بدەن کەئەوان مێینەن.

ـ موشریکەکان لەدایك بوونی کچیان بۆخۆیان پێ قەبوڵ نیە ئیتر چۆن بۆخوای ڕەوا دەبینن؟

ـ فریشتەکان لەنور دروستکراون و مرۆڤ ناتوانێ بیان بینێ ، ئەوانە بەندەی گوێڕایەڵ و بەڕێزی خوای گەورەن.

ـ ئەوەی کەردروستکراوەکان بەندەن، یەك ناگرێتەوەلەگەڵ ئەوەی کەلەهەمان کاتدا خوابن یاکوڕی خوابن یان بەشێك بن لەخوا،لەڕووی عەقڵەوە (ژیری)ناکرێ ئەو دوو پێگەیەبەیەکەوە کۆبکرێنەوە ـ بەندایەتی ـ خوایەتی لەیەك کاتدا.

---

١٠- المرجع السابق (ﷺ)٢٩١١

## گومانی سێیەم

### بیـانو لە نموونەهێنـانەوەی خـوای گەورە دەگـرن بەشـتێکی سـووک و ڕسـوای وەک مێشولەو مێش لە پایەو پلەی خودا کەم دەکاتەوە: [(١١)]

**ناوەڕۆکی گومانەکە:**

موشـریك و دووڕوەکـان ڕشـەخنەدەگرن لەهەنـدێك لـەو نمونانـەی کـە خـودای گەورەهێناویەتیەوە و دەڵێن : خودا لەوە بەرزو بـەڕێزترە لـەوەی نمونـە بهێنێتـەوە بـەم شتەبچوك و ڕیسوایانە.

خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَسْتَحْيِۦٓ أَن يَضْرِبَ مَثَلًا مَّا بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا ۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ ۖ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَيَقُولُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلًا ۘ يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرًا وَيَهْدِى بِهِۦ كَثِيرًا ۚ وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ إِلَّا ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٢٦﴾ ﴾ (البقـرة) بەڕاستی خوا باکی نیەو نەنگ نیە بەلایەوە هـەر نموونەیـەك بهێنێتـەوە بـە مێشـولەیەك، لەویش بچووکتر بێت یان گەورەتر، جـا ئەوانـەی ئیمـان و باوەڕیـان هێنـاوە، ئـەوە چـاك دەزانن ئەم نمونەیە ڕاستە و لە لایەن پەروەردگاریانەوەیە، ئەوانـەش کـافرو بـێ بـاوەڕن دەڵێن: خوا مەبەستی چی بوو لەم نموونەیـەدا؟ (خـوای گـەورەش دەفـەرموێت) زۆرێکـی پێ گومڕا دەکات و زۆرێکی تریشی پێ هیدایەت و ڕێنمووی دەکات، بەڵام دیارە جگـە لـە لارو وێرو یاخی و تاوانباران کەسی تر گومڕا ناکات.

---

١١- الأيات التى ورد فيها الرد على الشبهة:(البقرة/ ٢٦ ، العنكبوت /٤٣ ، الحج/ ٧٣ ، الحشر/ ٢١)، فى ضـرب الأمثال فى القران الكريم طالع :الشبهة السادسة من الجزء الثانى عشر(عصمةالقران وكماله).

**ڕێگاکانی پوچەڵ کردنەوەی گومانەکە:**

١-خودای گەورە بەدیهێنەری هەموو شتێکەو خۆی زانایە بەبەدیهێنەراوەکانی.

٢-ئەونمونانەی کە خودا (جل جلاله)هێناویەتیەوەپەندو ئامۆژگاری زۆر هەڵدەگرێ لەوانە:

- تاقیکردنەوەلەلایەن خودا(جل جلاله)هێناویەتیەوە پەندو ئامۆژگاری زۆر هەڵدەگرێ.

-نزیك کردنەوەی بیرۆکەکە لەزەینی گوێگر.

-جیاکردنەوەی ئەوانەی کەتێدەگەن لەوانەی کەتێناگەن .

-پەندوعیبرەت وەرگرتن .

٣-لەوشتانەدا کە واگومانی لێدەکرێ کە هیچ و پوچن حیکمەتی زۆری تێدایە.

**درێژەی بابەتەکە:**

**یەکەم/ خودا بەدیهێنەری هەموو شتێکەو خۆی زانایە بەبەدیهێنراوەکانی** جولەکەو موشریك و دوڕووەکان ئەوەڕەد دەکەنەوەکە خودا(جل جلاله)نمونەی بەوشتە سوك و ڕیسوایانەی وەك مێشولەو جاڵجاڵۆکەهێناوەتەوە، بەڵگەشیان ئەوەیەکەبۆخودا(جل جلاله)شایستە نیە نمونە بەم شتە سوك و ڕسوایانە بهێنێتەوە.

بێگومان خودای گەورە ئەم گومانانەی پوچەڵ کردونەتەوەو ڕونیکردۆتەوە کەئەو شەرم ناکات لەوەی نمونە بەهەرشتێك بهێنێتەوە بچوك بێت یاخود گەورە، چونکە خودا(جل جلاله)بەدیهێنەری هەمووشتێکە وەخودا مافی هەیەبەسەر دروستکراوەکانیدا و هەرخۆشی زانایە بەرامبەریان. ﴿ أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ ﴿١٤﴾ ﴾ (الملك)، مەگەر خوا نازانێت کێی دروست کردووەو چۆنی دروست کردووە، لەکاتێکدا ئەو زاتە وردکارو بە سۆزو ئاگایە.

بەویستی خۆی سودو قازانج دەگەیەنێ بەهەرشتێك و بەهەردروستكراوێكی وەبەنمونە دەیهێنێتەوەبۆمرۆڤـەكان بۆئـەوەی پەنـدی لێ وەربگـرن ئەمـە لـەڕوی یەكتاپەرسـتیەوە كەموكورتی نیە تاشەرمی لێ بكات بەڵكو ئەوەگەورەیی و فەزڵی خودایە كەلەدروستكراوە لاوازو ڕیسواكانیشدا بەپێی عورفی خەڵكی سودو قازانجی دیاری كردوە.

خودای گەورە وەڵامی ئەم بیانوو بانگەشەكەیان دەداتـەوەو دەفـەرموێ: ﴿ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَسْتَحْيِۦٓ أَن يَضْرِبَ مَثَلًا مَّا بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا ...﴿٢٦﴾ ﴾ (البقرە)، بەڕاستی خوا باكی نیەو نەنگ نیە بەلایەوە هەر نموونەیەك بهێنێتەوە بە مێشولەیەك، لـەویش بچووكتر بێـت یـان گەورەتر.

مێشولە قەبارەی بچوكە،مەبەست لـە(فَمَا فَوْقَهَا) واتـە ئـەوەی لەوگـەورەترە،وتراوە لەویش بچوكتر.

واتای ئایەتەكە ئەوەیە خودای گـەورە وازی نـەهێناوە لەنمونـە هێنانـەوە بەمێشـولە، وازهێنانێك كەسەرچـاوەكەی شـەرمەزاری بێـت بۆهێنانـەوەی نمونەبـەوجۆرە گیانلەبـەرو وردو بچـوكانە، تەنانـەت ئەگـەر لەبچـوكی و بـێ نرخیشـدا وەك مێشـولە بێـت خـودای گـــەورەخۆی كـــەنارگیر نـــەكردوە لەدروســـتكردنی خۆشـــی كـــەنار گیرناكـــات لەنمونەهێنانەوەپێی ،كارەكەش تەنها لەسەرمێشولە نەوەستاوە بەڵكو نمونەشی بـەمێش و جاڵجاڵۆكە هێناوەتەوە وەك خـۆی دەفـەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَٱسْتَمِعُواْ لَهُۥٓۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَن يَخْلُقُواْ ذُبَابًا وَلَوِ ٱجْتَمَعُواْ لَهُۥۖ وَإِن يَسْلُبْهُمُ ٱلذُّبَابُ شَيْـًٔا لَّا يَسْتَنقِذُوهُ مِنْهُۚ ضَعُفَ ٱلطَّالِبُ وَٱلْمَطْلُوبُ ﴿٧٣﴾ ﴾ (الحـج)، ئـەی خەڵكینـە: نموونەیـەك هێنراوەتەوە چاك گوێی بۆ بگرن" بەڕاستی ئەوانەی كە هاناو هاواریان لێدەكەن لـەجیاتی خوا، هەرگیز ناتوانن تاكە مێشێك دروست بكـەن، هەرچـەندە بـۆ ئـەو كـارە كۆببنـەوە و (یارمـەتی یـەكتریش بـدەن) و ئەگـەر مێشـەكە شـتێكیان لـێ بفڕێنێـت، نـاتوانن لێـی

بسەننەوە، داواکارو داوالێکراو هـەردووکیان لاواز و بـێ دەسـەڵاتن.هەروەها ئــەفەرموێ:

﴿ مَثَلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْلِيَآءَ كَمَثَلِ ٱلْعَنكَبُوتِ ٱتَّخَذَتْ بَيْتًا ۖ وَإِنَّ أَوْهَنَ ٱلْبُيُوتِ لَبَيْتُ ٱلْعَنكَبُوتِ ۖ لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ ﴿٤١﴾ ﴾ (العنكبوت)، نمونەی ئەوانەی جگە لە خوای گەورە، کەسانێکی تر دەکەنە پشتیوانی خۆیان، وەك نمونەی جاڵجاڵۆکەیەك وایە کە ماڵێکی بۆخۆی سازکردبێت بەڕاستی لاوازتـرینی هـەموو ماڵـەکان، مـاڵی جاڵجاڵۆکەیـە ئەگەر سەرنجیان بدایە و تێبگەیشتنایە ( چونکە ماڵی جاڵجاڵۆکە نە بناغـە و نـە دیـواری هەیە، نە سەرو دەرگا و پەنجەرە، نە دەتوانێت بەرگەی بـا و بـاران و ڕوداوەکـان بگرێـت مێیەکەش نێرەکە لە ناو دەبات دوای جووت بوون، پاشان بێچوەکانیش دایکیـان لـە نـاو دەبەن) ! ! !

ئەمانەو نموونەی تریش لەقورئانی پیرۆزدا،ئەوانـە خـەڵکانی گێـل و نـەفامن خـەریکی نکولی و مشت و مڕن ، پێیـان سـەیرە شـتە سـوك و ڕیسـواکان بکرێتەنموونـە، بابەتەکـە نکـولی کـردن و سەرسـوڕمان نیـە، باسـکردنی نموونـە دەمانگەیەنێتـە ئاشـکراکردنی مەبەسـتەکەو لابردنـی پـەردە لەسەرمەبەسـتەکە،ڕوون کردنـەوە ی بیرۆکەکـە لای بینـەر ئەمە ئـەوە ناگەیـەنێ ئەگـەر ئەولایەنـەی نمونەکـەی بۆهێنراوەتـەوە – کەمرۆڤـە، بـەرزو بڵندبێت نمونە هێنراوەکەش بەرزو بڵندبێت ، وەئەگەر سوك و ڕیسوا بـوو ئـەو لایەنەشـی نمونەکەی بۆهێنراوەتەوە بەهەمان شێوە بێت .

پاشان خاوەن نمونەکە – کە خودایە– کارلەسـەرئەو مەسـەلەیەدەکات ، ئایـا نـابینی کەحەق ڕوون و ئاشکرایە ئیتر چۆن نموونەی تیشك و ڕوونـاکی پـێ دەهێننـەوە؟ یـاخود باتڵ کەپێچەوانەی ڕاستیە چۆن نموونەی پێ دەهێنیتەوە بەتاریکی؟

ئەمانە هەمووی زانراوە لای ئەو خەڵکە بەڵام مەسەلەکە دەستەوسانی و نکولی کردنە.

ئایەتەپێشووەکان بەگشتی لەسـەردژایەتی کردنـی ڕەوانبێـژەکان دەدا کەسـورەتێکی هاوشـێوەی قورئـان بهێـنن ،بـەڵام کەدەستەوسـان بـوون لەدژایـەتیکردنیان لـەڕووی

دارشـتنەوە، ئـیتر لەدژایەتیکردنـدا ڕێگـای ڕەخنـەو تانـەیان گرتەبـەرو واخـەڵکیان تێگەیاندکـەقورئان مانـای ناماقوڵی تێدایەکەکـەلامی خـودا پـاك و بێگـەردە لەوماناپانـە بۆئەوەی بگەنە پوچـەڵکردنەوەی ئـەو ڕاستیەی کـەقورئان لەلایـەن خوداوەیـە، ئـەویش بەخستنە گومـان و دوودڵـی بۆنـاو نـاخی موسـڵمانان و چـاندنی تـۆوی ئومێـد لـەناخی موشریك و دووڕووەکاندا.

وە دژایـەتی کردنـی هێنانـەوەی نموونـە بەمێشـولەو شـتانی تـری ڕیسـواو بـیٚ بایـەخ ئەمانەلەسەرزاری جولەکەو موشریکەکان بوو،جولەکە ئەمانەیان لەڕق و کینـەو نـەزانین و لـوت بەرزیـدا دەوت چـونکە ئـەوان سەرسـەختترین دژایـەتی کـەربوون، وە ڕەشـبینی و ڕۆچـوون لەنێوانیانـدا تەشـەنەی کـرد لـەواتاو مانـای وشـەکاندا. ﴿ ...وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ إِلَّا ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٢٦﴾ ٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهْدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مِيثَٰقِهِۦ...﴿٢٧﴾ ﴾ (البقرة)، بەڵام دیارە جگە لە لارو وێرو یاخی و تاوانباران کەسی تر گومڕا ناکات، ئەوانەی پەیمانی خـوا (کـە لـە ڕووی فـیترەت و سروشـت و پەیامـەکانی خـواوە) هەیانـە، (کـە دەبێـت خوانـاس بـن) هەڵدەوەشێننەوە و پەیڕەوی ناکەن لەدوای بەهێزو پتەو بوونی..

ئەمانـە ڕەفتـاری جولەکـەن. بـەڵام موشـریکەکانی عـەرەب دژایـەتی ئـەو حاڵەتـەیان دەکردلەگەڵ ئەوەی زانیاریـان هـەبوو کەهـەمان شـت لەقسـەی ڕەوانبێژەکانیانـدا بـوونی هەیە، وەك ئەو وتەیان: لە مێشووله بەجورئەتترە، لە بەخێوکەری مـەیمون سـەرترە، لـە پەپولە هەڵەشەترە، لە مێش لاوازتـرە، ئـەویش تـەنها خۆبەگـەورەزانین و دژایەتیکردنـە، ئەوان کاتێك لەکیٚ برکیٚ کەدا دۆڕاندیان و دەستەوسان بـوون لـەهێنانی سـورەتێك ئابـەم قسەپڕو پوچـانە بیانویـان دەهێنایـەوە، ئـەوەی کەکەسێکی لـوت بـەرز دەیڵـیٚ خۆشـی باوەڕی پێی نیـە، وەکەسـی دۆڕاوو سەرسـام شـتی ڕاسـت خواردەکاتـەوە و ڕاسـتیەکان دەشارێتەوە.[١٢]

---

١٢- التحرير والتنوير، الظاهر ابن عاشور ، مرجع السابق بع ،ج١(ﷺ)٣٥٧ : ٣٥٩ بتصرف

**دووەم/ سودەکانی هێنانەوەی نموونە لەقورئاندا:**

١-تاقیکردنەوەی مرۆڤـــ بۆجیاکردنەوەی ڕاستگۆیان لەدرۆزنان:

خوای گەورە ڕوونی دەکاتەوە کەهێنانـەوەی نموونـە لەقورئانـدا گـەورەبێت یابچـووك تاقیکردنەوەی خودایەبۆمرۆڤـــ و هەڵسـەنگاندنیانە بەمەبەسـتی جیاکردنـەوەی ئـەهلی ئیمان و باوەڕدار لەئەهلی کوفرو گومڕایی، ئەوەهۆکاری گومڕابوونی کەسانێکەو هۆکـاری ڕێنمـــونی کردنـــی ئـــەوانیترە، خـــودای گـــەورە دەفـــەرموێ: ﴿.. فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَيَعۡلَمُونَ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّهِمۡۖ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَيَقُولُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلٗاۘ يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرٗا وَيَهۡدِي بِهِۦ كَثِيرٗاۚ وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ إِلَّا ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿٢٦﴾ ﴾ (البقـرة)، جـا ئەوانـەی ئیمـان و باوەڕیـان هێنـاوە، ئـەوە چـاك دەزانـن ئـەم نمونەیـە ڕاسـتە و لـە لایـەن پەروەردگاریانەوەیە، ئەوانەش کافرو بـێ بـاوەڕن دەڵێن: خـوا مەبەسـتی چـی بـوو لـەم نموونەیەدا؟ (خوای گەورەش دەفەرموێت) زۆرێکی پـێ گـومڕا دەکـات و زۆرێکـی تریشـی پـێ هیدایەت و ڕێنمووی دەکات، بەڵام دیارە جگە لە لارو وێرو یاخی و تاوانبـاران کەسـی تر گومڕا ناکات..

کاتێك لەقورئاندا باس لەنموونە دەکرێ ئیماندار ئیمانەکەی زیادو دامەزراو تـر دەبێـت بەئیزنی خـودا، بـەڵام بێبـاوەڕو دوڕو و خراپـەرکار کاتێـك خودا(جـل جلالـه) نموونەیـەك دەهێنێتــەوە گومــانی لێــدەکات و سەرســامدەبێت و دوچــاری دودڵــی دەبێــت ڕوبــەڕوی دەبێتەوەو لەقورئان دووردەکەوێتەوە، خودای گەورەش دڵیـان دووردەخاتـەوە هـەروەك دەفـــەرموێ: ﴿ وَإِذَا مَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٞ نَّظَرَ بَعۡضُهُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٍ هَلۡ يَرَىٰكُم مِّنۡ أَحَدٖ ثُمَّ ٱنصَرَفُواْۚ صَرَفَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُم بِأَنَّهُمۡ قَوۡمٞ لَّا يَفۡقَهُونَ ﴿١٢٧﴾ ﴾ (التوبـة)، کـاتێکیش سـورەتێك لـە قورئـان دابەزێنرا (ئەوان سەغڵەتن)، ئـەوە هەنـدێکیان تەماشـای هەنـدێکی تریـان دەکـەن (حـەز دەکەن زوو ئـەو شـوێنە جـێ بهێڵن، بەچپە یـان بەئیشـارەت) دەڵێن: ئایـا هـیچ کـەس

دەتانبینێت (لە ئیمانداران)، پاشان بەنهێنی خۆیان دزیەوەو ڕۆیشتن، لەکاتێکدا خوای باڵادەستیش دڵی ئەوانی وەرچەرخاندووە، چونکە بەڕاستی ئەوانە کەسانێکن کە تێ‌ناگەن وحاڵی نین (ناشیانەوێت تێبگەن).

بەمەش هەڵەودرۆی جولەکەو دووڕووەکان و قسەناقوڵاکانیان ڕوون دەبێتەوە ، کەچەندەگومڕاو نەزان و سەرلێشێواون .

٢-نزیك کردنەوەی بیرۆکەکە لە هۆشی بیسەر :

بەجۆرێك وێنای ئەو بابەتە بکات کە بیستویەتی بەشێوازێك کە لەبەردەمیدا نمایش کرابێ ،نموونە پەسەندو ماقوڵەکان لەشێوەی لەشێوەی بەرچاودا دەردەخەن بەجۆرێك کەبەدەست لێدان هەستی پێ دەکەی لەم حاڵەتەشدا عەقڵ و هۆشی مرۆڤ قەبوڵی دەکات ،چونکە ماقوڵەکان لەناخی مرۆڤدا جێگای خۆیان دەکەنەوە ،ئەگەر بەشێوازێك وێنابکرێت نزیك بێت لەتێگەیشتنی مرۆڤەکان.

ئەم شێوازەش لەقورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەردا ﷺ دەبینرێ ، هەرکاتێك خودای گەورە(جل جلاله)ویستبێتی ڕاستیەك لەقورئاندا بخاتە ڕوو نموونەی بۆهێناوەتەوە ، یاخود پێغەمبەری خوا ﷺ ویستبێتی هەرکارێك بۆهاوەڵەکانی و خەڵکانی تریش ڕوون بکاتەوە نموونەی بۆهێناوەتەوە.

لەونموونانەش خوای گەورەباس لەحاڵی ئەو کەسەدەکات کە ماڵی دەبەخشێ بەنیەتی ڕیا بێگومان هیچ پاداشتێکی لەوبەخشینە دەست ناکەوێت.

خوای گەورەدەفەرموێت: ﴿ ..فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ صَفْوَانٍ عَلَيْهِ تُرَابٌ فَأَصَابَهُۥ وَابِلٌ فَتَرَكَهُۥ صَلْدًا لَّا يَقْدِرُونَ عَلَىٰ شَيْءٍ مِّمَّا كَسَبُوا۟ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٦٤﴾ ﴾ (البقرة)، جا نموونەی ئەو جۆرە کەسانە وەك بەردێکی ساف وایە کە خۆڵێکی بە سەرەوە بێت، لەوەودوا بارانێکی لێزمە ببارێت بەسەریداو هیچی بەسەرەوە نەهێڵێت و بەرەق و تەقی بەجێی بهێڵێت و حەقیقەتی دەریکەوێت، (ئینجا ئەو جۆرە ڕیابازو بێ باوەڕ منەتنەرانە)

هیچ جۆرە بەهرەیەك لەو بەخشینەیان بەدەست ناهێنن، بێگومان خوای گەورە ڕێنموویی قەومی بێ باوەڕو کافران ناکات.

بەم جۆرە نموونەکان بیرۆکەکان نزیك دەکەنەوە لەبیروهۆشی گوێگرو ڕاستیەکان ئاشکرا دەکەن و نادیارەکان دەخەنە ڕوو.

خوای گەورەدەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ ٱلرِّبَوٰاْ لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِى يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيْطَٰنُ مِنَ ٱلْمَسِّ ..﴿٢٧٥﴾ ﴾ ( البقرة).[13] واتە: بەڵام ئەوانەی کە سوو دەخۆن ، کەلە گۆڕەکانیان دێنەدەرەوە لەکاتی زیندووبوونەوەدا دەڵێی شێتن.

٣–جیاکردنەوەی ئەوانەی کەتێدەگەن لەوانەی کەتێناگەن :

ئەوانە لەنمونەکان تێدەگەن ئەوانە نەزانانن ،خودای گەورەدەفەرموێت: ﴿ وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ ۖ وَمَا يَعْقِلُهَآ إِلَّا ٱلْعَٰلِمُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾ (العنكبوت)، ئا ئەم نمونانە ئێمە دەیهێنینەوە بۆ خەڵکی، تەنها زانا و شارەزاکان تێی دەگەن و تێ دەفکرن.

وەهەروەهادەفەرموێ: ﴿ لَوْ أَنزَلْنَا هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ عَلَىٰ جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُۥ خَٰشِعًا مُّتَصَدِّعًا مِّنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ ۚ وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ ﴾ (الحشر)، ئەگەر ئەم قورئانەمان دابەزاندایە سەر کەژو کێوێك، دەتبینی ملکەچ دەبوو، وردو و خاش دەبوو، شەق و پەق دەبوو، لە ترسی فەرمانی خوا، لە هەیبەتی گەورەیی و دەسەڵاتی خوا، ئێمە ئەم نموونانە دەهێنینەوە بۆ خەڵکی بۆ ئەوەی بیربکەنەوە و ژیرییان بخەنە کار و شوین قورئانی پیرۆز بکەون.

هەندێ لەپێشینان دەیانوت کاتێك نموونەیەکی قورئانم ببیستایەو لێی تێنەگەشتمایەبۆحاڵی خۆم دەگریام چونکە خوا گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ ۖ وَمَا يَعْقِلُهَآ إِلَّا ٱلْعَٰلِمُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾ (العنكبوت)، ئا ئەم نمونانە ئێمە دەیهێنینەوە بۆ خەڵکی، تەنها زانا و شارەزاکان تێی دەگەن و تێ دەفکرن.

---

١٣- مباحث في علوم القران، مناع القطان، مكتبة وهبة، القاهرة، ط١٣،١٤٢٥هـ، ٢٠٠٤م، ص٢٨١.

لەبەرئەوەی لەنموونەکە تێنەگەیشتوە واتە ئەو کەسێکی زانانیە.

٤-یەکێکیتر لەسوودەکانی هێنانەوەی نموونە پەند وەرگرتن و وەبیرهێنانەوەیە، چونکە نموونە کاریگەرترە لەسەردەروون و کارتێکەرترە لەئامۆژگاری و بەهێزترە لەسەرزەنشت و زیاتر باوەڕ بەخاوەنەکەی دەکات ،خوای گەورە نومموونەی زۆری هێناوەتەوە لەقورئانی پیرۆزدا بەمەبەستی پەند وەرگرتن و بیرخستنەوە،خوای گەورەدەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا الْقُرْآنِ مِن كُلِّ مَثَلٍ لَّعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾ (الزمر)، سوێند بێت بەخوا بەڕاستی ئێمە لەم قورئانەدا هەموو جۆرە نموونەیەکمان بۆ خەڵکی هێناوەتەوە، بۆ ئەوەی یادەوەری وەربگرن و بیرێك بکەنەوە لە ڕاستیەکان و تێ بگەن.

پێغەمبەری خوداش لەفەرمودەکانیدا نموونەی زۆری هێناوەتەوە بەهەمان شێوە بانگخوازان لەهەمووسەردەمەکاندا پشتیان پێ بەستووە وەك بەڵگەو سەرخستنی ڕاستیەکان، پەروەرشکارانیش وەك وەسیلەیەکی ڕوون کردنەوەو هاندان بەکاری دەهێنن،وەبەیەکێك لەشێوازەکانی پەروەردە هەژماری دەکەن بۆهاندان و بۆ ترساندن وە لەپیاهەڵدان و لەسەرزەنشت کردندا پشتی پێ دەبەستن .(١٤)

نموونە هێنانەوە لەکەلامی خوادا نیشانەی کەموکورتی نیە بەڵکو ڕەواو ڕاستیە ،چونکە ڕاستیەکان ڕوون و پشت ڕاست دەکاتەوە وەك بەڵگەیەك کاری پێ دەکرێت و کاریگەری لەسەردەروون بەجێ دەهێڵێ ، بەهەمان شێوەئەکرێ واتا گشتی و پێچ و پەناکان بەڕوونی نەگەنە بیرو هۆشی بیسەرو نارەحەت دەبێت بۆی.

لێیان حاڵی ببێت و دەرك بەنهێنی و حیکمەتەکانیان بکات بۆیە باسکردنی نموونە شتە پێچ و پەناکان و ئەوشتانەی بەکورتی ئیشارەتیان پێدراوە ڕونیان دەکاتەوە، واتەنموونە پارسەنگی ڕەوانبێژییەو مەشخەڵی ڕێ نیشاندانە .(١٥)

---

١٤-المرجع السابق،ص٢٨٣.

١٥- تفسير المنار، محمد رشيد رضا، دارالمعرفة ، بيروت ط٣ ،ج١ ، ص٢٢٧ ومابعدها

**سێیەم/ لەوشتانەدا کەگومان دەبرێ سوک و ڕیسوابن حیکمەتی گەورەی تێدایە.**

خوای گەورە نموونە بەشتی سوک و ڕیسوا ناهێنێتەوە وەك ئەوەی گومان دەبەن بەهۆی بیرتەسکییانەوە ،ئەگەر ئەوان بیریان لەو بونەوەرە بچوکەبکردایەتەوە گەورەیی دەسەڵاتی خوای گەورەکەسنوری بۆنیە دەردەکەوت، بۆڕوون کردنەوەی ئەمەش تەماشای ئەو نموونە دەکەین کەخوا لەم ئایەتەدا هێناویەتیەوە دەفەرموێ: ﴿ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَسْتَحْيِۦٓ أَن يَضْرِبَ مَثَلًا مَّا بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا ۚ ..﴿٢٦﴾ ﴾ (البقرة)، بەڕاستی خوا باکی نیەو نەنگ نیە بەلایەوە هەر نموونەیەك بهێنێتەوە بە مێشولەیەك، لەویش بچووکتر بێت یان گەورەتر..

مێشوولەکە چەند جۆرێکی هەیە وەك (وڕە) یان (البق) کە گیانلەبەرێکی زۆر بچووکەو گەستنی زۆر بەئازارەو بۆنی ناخۆشەو زۆر لاوازە و تەنها بەدەستلێدانێك دەکوژرێت لەسەر دیواری ماڵان و جێگا و بان دەبینرێت ئەگەر بەمێش کوژێك پێیدا بکێشرێ پان و پلیش دەبێتەوەو جێگاکە خوێناوی دەکات، ئەمەلەگەڵ ئەوەی زۆر بچووکە یەکێکە لەبەدیهێنراوە سەرسوڕ هێنەرەکانی خودای گەورە ، شەش قاچ و چوار باڵی هەیە لەگەڵ کلك و لمۆز، لەگەڵ بچووکیەکەی لمۆزی دەچەقێنی بەپێستی فیل و حوشتردا و خوێنەکەی دەمژێت .

ئەبوایەبەزیرەکی خۆیان بیانزانیایە کەئەومێشووله بچووکە خودا وەك موعجیزەیەك دروستی کردوە، چونکە ئەم بونەوەرە بچووکە خوای گەورە سەرجەم ئەودەزگایانەی کەپێویستیەتی بۆژیانی تێیدا دروستی کردوە، کاتێك نموونەی بەمێشولە هێناوەتەوە یان دەفەرموێ : (فما فوقها) واتە نموونەیەکی لەویش بچووکتر مەبەستی ڕکێشچانی سەرنجی بەرامبەرە، بۆ وردەکاریەکان چونکە هەرشتێك تاقەبارەکەی بچوکتر بێت پێویستی بەوردەکاری و تۆکمەکاری زیاتر هەیە. (١٦)

---

١٦ – تفسير الشعراوي، أخبار اليوم، القاهرة، ط ١٩٩٩م، ج١، ٢١١ بتحرف

خودا پەروەردگاری بچووك و گەورەكانە،بەدیهێنەری هەنگ و فیلە ئەو موعجیزەی لەمێشوولەدا هەیە موعجیزەیەكەلەفیلدایە:

ئەویش موعجیزەی ژیانە .... موعجیزەی نهێنیەكی داخراوە كەخودا نەبێ كەس نایزانێت ، پەندو ئامۆژگاری وەرگرتن لە نموونەكانی پەیوەندی بەقەبارەو شێوەوە نیە، بەڵكونموونەكان هۆكارێكن بۆبەرچاو ڕوونی و ناساندن .

لەنموونەهێنانەوەدا هیچ عەیبەیەكی تێدانیەو باسكردنی مایەی شەرم نیە حیكمەتی خوداش بەرزو بڵندەو دەیەوێت دڵ و دەروونەكان تاقیبكاتەوە.[17]

خودای گەورە نموونەی بەمێش هێناوەتەوەكەبونەوەرێكی بچووكە، مرۆڤ دەستەوسانە لەڕووبەڕوبونەوەی و زاڵ بون بەسەریدا ئەگەر شتێكی لێ برد(خراند) وەك دەفەرموێ: ﴿... ضَعُفَ ٱلطَّالِبُ وَٱلۡمَطۡلُوبُ ﴿٧٣﴾ مَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ ﴿٧٤﴾﴾ (الحج)، داواكارو داوالێكراو هەردووكیان لاواز و بێ دەسەڵاتن. ئەوانە (وەكو پێویست) قەدری خوایان بەچاكی نەزانی، ڕێزی پەروەردگاریان بەتەواوی نەگرت، لەكاتێكدا بەڕاستی خوا زۆر بەهێزو بە توانا و باڵادەستە..

دروستكردنی مێش موستەحیلە بەهەمان شێوازی حوشترو فیل بێت ، چونكە مێش هەمان موعجیزەو نهێنی تێدایە ،نهێنی ژیان كەسەرجەم بونەوەرەكان تێیدا هاوبەشن ، بەڵام شێوازە قورئانیەكە مێشێكی سوك وریسوا هەڵدەبژێرێ ، چونكە دەستەوسانبوون لەدروستكردنیدا

لەلایەن مرۆڤەوە بێدەسەڵاتی و دەستەوسانیەكی زیاتر دەبەخشێتەمرۆڤ لەبێدەسەڵاتی و دروستكردنی حوشترو فیل ، ئەوەش بەبێ زیان گەیاندن بەڕاستی لێكدانەوەكان، ئەمەش یەكێكە لە سەرسوڕهێنەرترینی شێوازەكانی قورئان، پاشان

---

١٧- فی ظلال القران ، سید قطب ، مرجع السابق ، ج١ ، ص٥ بتحرف

قورئان هەنگاوێکی فراوانتر دەنێت بۆخستنە ڕووی لاوازیەکانیان: ﴿ وَإِن يَسْلُبْهُمُ ٱلذُّبَابُ شَيْـًٔا لَّا يَسْتَنقِذُوهُ مِنْهُ ..﴿٧٣﴾ ﴾ ئەو خوایانەی ئەوان بانگەشەیان بۆدەکرد توانای ڕزگار کردنی شتێکی نیە کەمێش لێی دەفڕێنێ ... چەندەها شت کە مێش لەمرۆڤەکانی دەفڕێنێ ناتوانن بیگەڕێننەوە، مێش کەبەتایبەتی دەست نیشانکراوە بەهۆی لاوازییەکەیەوەتی و لەهەمان کاتدا ئەو هەڵگری ترسناکترین نەخۆشیەو پەلاماری بەنرخترینی جێگا دەدات کە چاوو ئەندامەکانی لەشە ، لەوانەشە ژیانی لێ بسێنێتەوە چونکە هەڵگری میکرۆبی سیل و گرانەتاو چاو ئێشەو مەلاریایە.

ئەوبەولاوازی و بچوکیەی خۆی شتێك دەبات کەڕێگایەك نیە بۆ گێڕانەوەی ... ئەگەر بوترایە : دڕندەیەك شتێکی لێ بردوەو ناتوانرێ لەدەستی ڕزگاربکرێ .

ئەوە ئیشارەتێك بوو بۆدەسەڵاتێك لەبەردەم لاوازێکدا ، دڕندە شتێك نافڕێنێ گەورەتربێ لەوشتەی مێش دەیفڕێنێ ، بەڵام شێوازە قورئانیەسەرسوڕهێنەرەکە لاوازی هەمووان دەخاتە ڕوو خودای گەورە دەفەرموێ : ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَـٰدِلُ فِى ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَيَتَّبِعُ كُلَّ شَيْطَـٰنٍ مَّرِيدٍ ﴿٣﴾ ﴾ (الحج)، هەندێ لە خەڵکی دەبینیت بەبێ هیچ زانستی و زانیاریەك دەربارەی (گەورەیی و دەسەڵاتی) خوای پەروەردگار موجادەلە دەکەن و باس و خواس دەکەن و شوێن هەموو شەیتانێکی یاخی و سەرکەش دەکەون.

پاشان بۆنموونە تەماشای ئەو هەموو سەروەت و سامانە بکە کە خەرج دەکرێت بۆلەناوبردن و بنەبڕکردنی مێش ئەوانەشی لەو بچوکترن لەگەڵ ئەوەشدا بەرپرسان نەیانتوانیوە بەو هەموو سامان و دەزگاو ئامێرانە لەناوی ببەن، ئایا پاش ئەوەش ئەو دووڕوو موشریکانە نکوڵی لەنموونەکانی قورئان دەکەن ؟!

**بەکورتی/**

– پەروەردگار خۆی بەدیهێنەری هەمووشتێکەو خۆشی دەزانێ زیان و زەرەری ئەوشتەسوك و ڕیسوایەی دروستی کردووە چیە.

– ئەو نموونانەی کەخوای گەورە لەقورئاندا هێناونەتیەوە ئامۆژگاری و حیکمەتی زۆر لەخۆدەگرێ لەوانەش :

*پەند وەرگرتن و نزیك کردنەوەی بیرۆکەکەو جیاکردنەوەی کەسانی ژیر ئەوانەی لەشتەکان تێدەگەن لەوانیتر .

*جیاکردنەوەی باوەڕداران لەبێباوەڕان لەکاتی تاقیکردنەوەی خواییدا .

*ڕوون کردنەوەی فراوانی دەسەڵاتی خودا کەسنوری بۆنییە.

⁂⁂ ⁂⁂ ⁂⁂

## گومانی چوارەم

## بانگەشەکردن بۆئەوەی کەلەنێوان خوداو جنۆکەدا خزمایەتی هەیە

**ناوەرۆکی گومانەکە:**

کاتێك موشریکەکان گوتیان : فریشتەکان کچانی خودان ، ئەبوبەکر خودای لێ ڕازی بێ پێی گوتن ئەی دایکیان کێیە؟ وتیان کچانی خانەدانی جنۆکەن تاقمێکی تر وتیان خوداو ئیبلیس بران، پاك و بێگەردی بۆخودا لەبەرامبەر ئەوەی کەدەیڵێن خودا دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلُواْ بَيْنَهُۥ وَبَيْنَ ٱلْجِنَّةِ نَسَبًا ۚ وَلَقَدْ عَلِمَتِ ٱلْجِنَّةُ إِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ ﴿١٥٨﴾ ﴾(الصافات)، (لەلایەکی ترەوە کافرەکان) خزمایەتیان بڕیار داوە لەنێوان زاتی پەروەردگار و پەریەکاندا، سوێن بەخوا پەریەکانیش چاك زانیویانە کە ئامادە دەکرێن (بۆ لێپرسینەوە و محاسەبە ئەگەر ئاوا خزمایەتیەك هەبێت چۆن دادگای دەکرێن؟!).

**ڕێگای پوچەڵکردنەوەی گومانەکە:**

جنۆکە دەزانن ئەوەی کەموشریکەکان بانگەشەی بۆدەکەن درۆیە ئەوان لەحەشرو حیسابدا ئامادەن و لەکاتی سزاداندا بونیان هەیە خوداش پاك و بێگەردە لەهەموو کەموو کورتیەك .

**درێژەی بابەتەکە:**

**جنۆکە ئەزانن موشریکەکان درۆزنن لەو بانگەشەیاندا:**

هەندێك ڕاوبۆچوون هەیەلەلایەن ئەوکەسانەی تەئویل دەکەن لەمانای خزمایەتی کەخودای گەورە خۆی هەواڵی لێ داوە کەموشریکەکان بۆ خودای بڕیاردەدەن هەندێکیان دەڵێن: کەمەبەست لێیان موشریکەکانە، گوتویانە خوداو ئیبلیس بران .

وە هەندێکی تر گوتویانە فریشتەکان کچانی خودان و جنۆکەش لەڕەگەزی فریشتەن، گوتویانە خودا هاوسەرگیری لەگەڵ جنۆکە کردووەو فریشتەی لێ بووە، بێگومان خودای

گەورە(جل جلالە)وەڵامی بانگەشەکەیان دەداتەوەو زانیارییان دەداتێ کەجنۆکە خۆشیان دەزانن کەئامادەی حەشرو حیساب و لێ پرسینەوە دەبن ئەوان دەزانن کە موشریکەکان درۆ دەکەن و ئەو قسانە بۆخودا هەڵدەبەستن ، و سزا دەدرێن لەسەر ئەوکارەیان ، بۆیە ئەوان حاشاو تەبەرا دەکەن لەو خزمایەتیە کاتێك بۆیان دەردەکەوێ لەئەهلی ئاگرن نەك لەجیهانی ئەرواحی پاك و بێگەرد.

ئیتر ئاخۆ حاڵی موشریکەکان چۆن دەبێت سەبارەت بەو هەڵیت و پەڵیتەی کەدەیڵێین وبەزانیاری قسەدەکەن ؟!

خودای گەورەدەفەرموێ: ﴿..وَلَقَدْ عَلِمَتِ الْجِنَّةُ إِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ ﴿١٥٨﴾﴾ (الصافات)، سوێن بەخوا پەریەکانیش چاك زانیویانە کە ئامادە دەکرێن (بۆ لێپرسینەوە و محاسەبە ئەگەر ئاوا خزمایەتیەك هەبێت چۆن دادگای دەکرێن؟!).

مەبەست لە جنۆکە لێرەدا (شەیاتینەکانە) نەك فریشتە، وەك ئەوەی هەندێکیان دەیڵێن، چونکە فریشتەکان لەڕووناکی دروستکراون نەك لەئاگر وەك جنۆکە، فریشتەکان پارێزراون لەگوناهو تاوان و زاوزێ ناکەن و سیفەتی نێرو مێ نادرێتەپاڵیان بەپێچەوانەی جنۆکە. دورنیە واتای (عیلم) لەئایەتەکەدا ئەوەبێت کەجنۆکە پێشتر هەندێ شتیان زانیوە، وەدەشێت بەکارهێنانی رابوردو بەمەبەستی داهاتوو بێت بەواتای دڵنیابوون لەڕوودانی وەك خودا دەفەرموێ: ﴿أَتَىٰ أَمْرُ اللَّهِ فَلَا تَسْتَعْجِلُوهُ ۚ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿١﴾﴾ (النحل)، فەرمانی خوا بەڕێوەیە و واگەیشت، پەلەی لێمەکەن و پەلەتان نەبێت، پاکی و بڵندی بۆ ئەو زاتەیە لەوەی کە هاوەڵگەران دەیکەنە هاوەڵ و شەریك بۆ خوا .

واتەجنۆکە لەڕۆژی دواییدا ئەوە دەزانێت، مەبەست ئەوەیەموشریکەکان دڵنیادەبن لەوەو توانای گێرانەوەی سزایان نییە لێیان ، ئەوان پێشتر جنۆکەیان دەپەرست بەگومانی ئەوەی کەجنۆکە بەرێز خاوەن پێگەن لەلا ی خودا بەهۆی بەهەڵەداچونیان لەبوونی خزمایەتی لەگەڵ خودای گەورە.

ئەگەر لەنێوان جنۆکەوخودادا خزمایەتی هەبوایە یان هاوبەشی خودا بونایە لەپەرستن و گوێڕایەڵیدا ئەوا هەرگیز خودا سزای نەدەدان.

خوای گەورە چیرۆکی قسەو قسەلۆکی بێ بنەمایان ڕوون دەکاتەوەسەبارەت بەو خزمایەتیەی داویانەتە پاڵی وەك دەفەرموێ : ﴿ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٥٩﴾ ﴾ (الصافات)، پاکی و بێگەردی بۆ خوای گەورەرە، دەربارەی ئەو شتانەی کە ئەوان باسی ئەکەن و ئەو قسە بێ جێیانەی دەیکەن بەرامبەر بە خوا

زۆر سەرسوڕهێنەرەشتێکی ئاوا بیری لێ بکرێتەوە و دەماو دەم بیگێڕێتەوە، لەسەروئەمانەشەوە بکرێتەبیرو باوەڕو وەك ڕێچکەیەك تەماشا بکرێ، خودا پاك وبێگەردە ئەم دەربڕینی پاکێتیە ئاماژە بەگێلی و نەفامی و کاڵفامی خەون و دەرون و بیروهۆشیان ، هیچ پەیوەندییەك نیە تابێتە خزمایەتی سەرەڕای مەحاڵ بوونی لەڕووی زیرییەوە .

**بەکورتی/**

بانگەشەی موشریکەکان کەگوایە خزمایەتی لەنێوان خوداو جنۆکەدا هەیە، ئەوە تەنها وڕێنەیەو هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوەنیە جنۆکە خۆشیان بەو درۆی موشریکانە دەزانن و لەڕۆژی دواییدا حاشای لێ دەکەن ، کەواتە ئەگەر خزمایەتیەك لەنێوان ئەوان و خودادا هەبوایە پارێزگاریان لێ دەکرد.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَقُولُونَ عُلُوًّا كَبِيرًا ﴿٤٣﴾ ﴾ (الاسراء)، ستایش و پاکی و بڵندی بۆ ئەو پەروەردگارەیە (کە ئەو نەفامانە دەربارەی ئەو هەموو ناڕەواییە دەڵێن) و ئەو زاتە زۆر بەرزو بڵندو گەورەترە (لە بۆچوونی ئەوان).

## گومانی پێنجەم

## نکولی کردن لەتەنیایی و پەروەردگاریتی خودا (جل جلاله)

### ناوەڕۆکی گومانەکە:

موشریکەکان نکولی لەتەنیایی و پەروەردگارێتی خودا (جل جلاله)دەکەن ئەوان خۆیان بت و پەیکەریان دەپەرست و بانگەشەیان دەکرد کە ئەوبت و پەیکەرانەلەخودایان نزیك دەکاتەوەو دەبنە تکاکار بۆیان ئەوان ئەوان سەرسوڕمانی خۆشیان ڕاگەیاندوە لەبوونی خودایەکی تاك و تەنها ئەو شایستەی پەرستن بێت .

خودای گەورە(جل جلاله)چیرۆکی ئەوان لەسەرزاری خۆیان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: ﴿ أَجَعَلَ ٱلْـَٔالِهَةَ إِلَٰهًا وَٰحِدًا ۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَىْءٌ عُجَابٌ ۝٥ ﴾ (ص)، (هەروەها دەیانوت: ئایا پێتان سەیر نیە) هەموو خواکانی کردووە بە یەك خوا، بەڕاستی ئەمە شتێکی زۆر سەیرو سەمەرەیە !

وەهەروەها دەفەرموێ: ﴿ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِ .. ۝١٨ ﴾ (یونس)، (بێ باوەڕان وخوانەناسان) شتێك دەپەرستن لەجیاتی خوا نە زیانیان پێدەگەیەنێت نە قازانج، دەشڵێن: ئا ئەو بت و شتانە تکا کارمانن لای خوا..

### ڕێگاکانی پوچەڵکردنەوەی گومانەکە:

بێگومان قورئانی پیرۆز ئەم مەسەلەیەی بەدوو ڕێگا چارەسەر کردووە :

١-خستنە ڕووی بەڵگەعەقڵیەکان لەسەربوونی خودا(جل جلاله)کەئەوتاك وتەنهایەو ئەو بەدیهێنەرو ڕێکخەری ئەم بونەوەرەیە، لەژێر ئەم ڕوونکردنوەیەشدا هەندێك پرسیاری ئاراستەی عەقڵی مرۆڤایەتی کردووە بۆئەوەی تێبفکرین و لێی ورد بینەوە و بەڵگە بێت لەسەربوونی خودا(جل جلاله)لەوانە :

–ئایا دەکرێ ئەم بوونەوەرە بەبێ بەدیهێنەرێك هاتبێتە بوون ؟!

–ئایا دەکرێ کاروباری ئەم بوونەوەرە گەورەو گرانە ڕێك بخرێت بەبێ بوونی خوایەکی بەتواناو داناو زانا؟!

– ئایا دەکرێ ئەم خودایە شەریك و هاوبەشێکی هەبێت لەموڵکداریدا یاخود لەڕێکخستنی کاروبارەکاندا؟!

– ئایا دەکرێت ئەم هەموونیشانەو بەڵگەی دەسەڵاتانەی خودای گەورە لەسەرتاسەری گەردوندا ئاماژە بێت بەوەی کەخودایەکی ئاوا بەدەسەڵات ئەکرێ ئاوا دەستەوسان بێت لەبەردەم کارێك لەکاروباری بەدیهێنان و بەڕێوەبردن و مردن و زیندوکردنەوە؟

دەتوانرێ وەڵامی ئەم پرسیارانە بەکورتی بدرێتەوە:

– ناکرێ بونەوەرێکی ئاوا مەزن بەدیهێنەرێکی نەبێت ، بەدیهێنراو بەڵگەیەلەسەربەدیهێنەرێك، هەروەها شوێن پێ بەڵگەیەلەسەر ڕۆشتن ، ئایا سیستەمی ئەم بونەوەرە مەزنە کەسەراپای وردەکارییە بەڵگە نیە لەسەربەدیهێنەرێك؟!!

– بەڕێوەبردنی کاروباری ئەم بونەوەرەگەورەو گرانە بەڕێوە ناچێت ئەگەر خودایەکی بەتواناو داناو زانا بەڕێوەی نەبات ، ئەگەر ئەو خاوەنی توانایەکی بێ سنور نەبێت هەرلەسەرەتاوە ئەستەم بوو دروستی بکات چ جای ڕێکی بخات و کاروبارەکانی ڕاپەڕێنێ .

– ناکرێ ئەم خودایە هاوبەشی هەبێت لەموڵکداری و لەبەڕێوەبردندا ، چونکە چەند خودایەتی دەبێتە هۆکاری کەم و کورتی و تێکچوونی سیستەمی بوونەوەر .

– هێماو نیشانەکانی دەسەڵاتی خودا لەبونەوەردا بەڵگەیەکی ئاشکرایە کەخودا هیچ شتێکی لێ عاسی نابێ بەرامبەر هیچ شتێك دەستەوسان نیە.

٢-خستنەڕووی ئەوبەڵگانەی پەرستنی غەیری خودا پوچەڵ دەکەنەوەو دەستەوسانی ئەوهاوبەشانەکە هیچ توانایەکیان هەبێت بۆگەیاندنی سودوزیان بۆخودی خۆشیان ، ئیتر چۆن دەتوانن سودوزیانیان هەبێت بۆکەسانیتر؟!

لەژێر ڕۆشنایی ئەم خاڵەوە قورئانی پیرۆز ئاماژە بەوخودا دەستکردانە دەکات :

- هیچ توانایەکیان نیە نەلەئاسمانەکانداو نەلەزەویشدا.

- گوێیان لەپاڕانەوەکان نیە و توانای سودو زیان گەیاندنیان نیەو دەستەوسانن لەدروستکردنی تەنانەت مێش و مێشولەیەکیش .

- دەستکردی خودی مرۆڤەکانن ئیتر چۆن دەپەرسترێن لەکاتێدا دەستێك دروستی کردون؟!

مرۆڤەکان ترس و سامیان بەرامبەریان و گرنگیان پێ نادەن .

- موشریکەکان هیچ پەڕاوو بەڵگەیەکیان نیە کەفەرمانیان پێبکات بۆپەرستنی ئەم خودا دەستکردانە.

**درێژەی بابەتەکە:**

ئەم گومانە لەبەرامبەر گومانەکانی تردا زیاتر دوبارەبوەتەوە و باسکراوەلەقورئاندا لەسەر زاری موشریکەکان ، ئەوان تەنیایی و پەروەردگارێتی خودا ڕەد دەکەنەوەو بەپێغەمبەری خوداﷺ دەڵێن قورئان دەیگێڕێتەوە: ﴿ أَجَعَلَ ٱلْءَالِهَةَ إِلَٰهًا وَٰحِدًا ۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَىْءٌ عُجَابٌ ﴿٥﴾ ﴾ (ص)، (هەروەها دەیانوت: ئایا پێتان سەیر نیە) هەموو خواکانی کردووە بە یەك خوا، بەڕاستی ئەمە شتێکی زۆر سەیرو سەمەرەیە!

ئەمە حاڵی بێباوەڕانە لەهەمووکات و سەردەمێکدا، فیرعەون بەموسا و هارونی وت (علیهما السلام): ﴿ قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَٰمُوسَىٰ ﴿٤٩﴾ ﴾(طه)، فیرعەون بە فیزەوە وتی: باسە ئەی موسا پەروەردگاری ئێوە کێیە؟! ...

نـەمروديش بـە ئيـبراهيم (عليـه السـلام) ى ووت: ﴿أَنَا أُحْيِۦ وَأُمِيتُ ...﴿٢٥٨﴾﴾ (البقـرة) (نـەمروود لـە وەڵاميـدا) وتـى: جـا منـيش ژيـان دەبەخشـم و مردنيشـم بەدەسـتە.

موشـريكەكانيش لەبەرامبـەر خـودادا پەيكـەرو بـت و فريشـتەكان دەپەرسـتن بۆئـەوەى پشتيوانيان لىٚ بكەن و ببێتەمايەى شكۆمەندى و شـفاعەتكردنيان لاى خـودا. خودا(جـل جلاله)دەفـەرموىٚ: ﴿وَٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ ءَالِهَةً لِّيَكُونُواْ لَهُمْ عِزًّا ﴿٨١﴾﴾ (مـريم)، ئـەو بـىٚ باوەڕانـە لـەجياتى خـوا جۆرەهـا شـتى تريـان كردۆتـە خـواى خۆيـان تـا پايـەدارى و دەسەڵاتيان (بەخەياڵى خۆيان) دەست بكەوێت، هـەروەها دەفـەرموىٚ: ﴿وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِ ۚ قُلْ أَتُنَبِّـُٔونَ ٱللَّهَ بِمَا لَا يَعْلَمُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿١٨﴾﴾( يونس ).

(بىٚ باوەڕان وخوانەناسان) شتێك دەپەرستن لەجياتى خوا نـە زيانيـان پێدەگەيـەنێت نە قازانج، دەشڵێن: ئا ئەو بت و شتانە تكا كارمانن لاى خوا، پێيان بڵێ ئەى محمد ﷺ: باشە ئايا ئێوە خوا ئاگادار دەكەنەوە بەشتێك كە لەئاسمانەكان و لەزەويدا هەبێت و خوا نەيزانێت؟! پاك و بێگەردەو بەرزو بڵندەو دوورە لەوەى كەنەفامان دەيكەن بەهاوەڵى.

قورئانى پيرۆز تـەنيايى پـەروەردگارێتى خـوداى گـەورە دوپـات كردۆتـەوە، هاوبـەش بڕياردانى بۆ خودا بەتاڵ كردۆتەوە لە زۆربەى ئايەتەكاندا، ئەوەش لەچەند ڕوويەكەوە كە بەرەو ئاراستەمان دەبات:

**يەكەم: خستنەڕووى ئەو بەڵگـانەى كە پەيوەنـديان بەژيـرى و عەقڵەوە هەيە لەسەر بـوونى خوداو تەنهاى ئەو و هەر خۆشى بەديهێنەرى ئەم بوونەوەرميە:-**

بێگومان خـودا پێويسـتى بـە هـيچ كەسـێك نيـە كـە يارمـەتى بـدات لـە بـەڕێوەبردنى كاروبارەكانيدا، تەنانەت بـۆ كەسـيش نيـە دەسـت وەربـدات لـە كـارى خـوادا، جـا لەبـەر

ئـەوەی هـیچ کـەس هاوبەشـی خـودا نیـە لـە بەدیهێنانیـدا ــ ئـەو کـارە تەنانـەت موشریکەکانیش مشت و مڕی لەسەر ناکـەن ــ ئـیتر چۆن کەسێك هاوبەشـی دەکـات لـە بەڕێوەبەردنـدا؟! خـودا دەفـەرمویَ: ﴿ أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ ۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٥٤﴾ ﴾ (الاعراف)، (ئاگادار بن و بزانن و تێفکرن کـە: هەرچـی دروسـتکردن و بڕیاردانـە هـەر بـۆ ئەوە، (کەواتە دەبا هەموان فەرمانبەرداری ئەو بین و لە فەرمانی دەرنەچین)، موبـارەك و پیرۆزو گەورەیە زاتی (الله) پەروەردگاری جیهانیان.

قورئانی پیرۆز موخاتەبەی سـەرجەم مرۆڤـەکان دەکـات: لـەڕووی عـەقڵ و یژدانـەوە، بـەجۆرێك بەڵگـەکان دەخاتـە بەردەسـتی و گفتوگـۆی لەسـەر دەکـات، و بـەئاگای دەهێنێتەوە بۆ بیرکردنەوەیەکی عاقڵانی ڕاست و دروست کە بیگەیەنێتە تێگەیشتنی لـە حەقیقەتی تاك و تەنهای خوداو دەرك کردن بەو ڕاستیەو باوەڕهێنان پێی.

پاش پێویستبوونی باوەڕهێنان بەخودایەکی تاك و تەنها:[١٨]

قورئـان پـەروەردگارێتی و تـەنیایی خـودای چەسـپاندووە لەڕێگـەی پرسـیارکردن لـە خودی موشریکەکان ئەوانەی کە نەفی ئەو ڕاستی دەکەن و دەفەرمویَ: ﴿ أَمْ خُلِقُوا۟ مِنْ غَيْرِ شَىْءٍ أَمْ هُمُ ٱلْخَـٰلِقُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾ (الطـور)، (ئایـا ئەوانەبـەبێ هـیچ شـتێك، هـیچ هۆیـەك، هاتوونەتەکایەوە ؟! یان هەر خۆیان دروستکارن)؛ ئەمەش یانی: ئایا هاتونەتەدی بـەبێ بەدیهێنەرێك؟! یاخود خۆیان خۆیانیان بەدیهێناوە؟! وەڵامەکە ئەمەیە نە ئـەوە، بـەڵکو خودا خۆی دروستیکردون دوای ئەوەی کـە هـیچ نـەبوون و باسـیان لـەئارادا نـەبوو. ئـەم ئایەتە لەڕودا وەستانێکی گەورەیە بۆ عەقڵی مرۆڤایەتیەکی گومڕا لەمێژوودا.. هـەردەڵێی بۆ گومڕاکانی ئەم سەردەمە دابەزیوە کە نوکوڵی لـەبوونی خـودا دەکـەن و پـەنا دەبەنـە بەر بێباوەڕی و گومڕایی. ئەوانەی پەنادەبەنە ئەو ئاستـە لـە گومڕاییـدا نکـۆڵی لـەبوونی

---

١٨ – رکائز الایمان ، محمد قطب ، مرجع سابق ، ص٤٣ بتصرف

خودا ناکەن لەڕاستیدا، چونکە سروشت و فیترەتی مرۆڤەکان ــ چەندەش گومڕابێت ــ نکۆڵی لەبوونی بەدیهێنەرێك ناکات.

بەڵام ئەوان ــ بەهۆکارێك لە هۆکارەکان ــ لووت بەرزی دەکەن و ڕاستیەکان ڕەت دەکەنەوە. فیترەتی مرۆڤەکان هەرگیز نکوڵی ئەو دانپێدانانە ناکات کە دانیا بەوەدا ناوە کە خودا پەروەردگاریانە. ﴿ وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنْ بَنِيٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُواْ بَلَىٰ شَهِدْنَآ أَن تَقُولُواْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَٰذَا غَٰفِلِينَ ﴿١٧٢﴾ ﴾ (الاعــراف) یادی ئەوکاتەش بکەرەوە کە پەروەردگارت پشتاو پشتی نەوەی ئادەمی کۆ کردەوە (لە جیهانی پەنهان و شاراوەدا پەیمانی لیّ وەرگرتن) و کردنی بە شایەت بەسەر خۆیانەوە و (پێی فەرموون): ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم؟! هەموو وتیان: نابێت تۆ خوای ئێمە نەبیت، بەڵێ شایەتیمان داوە (کە تۆ پەروەردگارمانیت)، ئەمەش بۆ ئەوەی نەوەکو لە ڕۆژی قیامەتدا بڵێن: بەڕاستی ئێمە لەمە بێئاگا بوین!!

بەڵام ئەوەی کە ڕوودەدات ئەوەیە کە مرۆڤە گومڕاکان لوت بەرزی دەکەن لەبەرامبەر ئەو ڕاستیەدا، چونکە نایانەوێ مل کەچ بن بۆ خودا، خۆ ئەگەر بەئاشکرا دانی نا بەبوونی خودادا ئیتر پێویست دەبێت لەسەری کە گوێڕایەڵی خودا بکات و بیپەرستێ ئەویش ــ لەبەر هەر هۆکارێك بێت ــ ئەوەی ناوێت، و لەبەر ئەوەی بەنکۆڵی کەرو کەمتەرخەم دەرنەکەوێ دەست دەکات بە فەلسەفەلێدان و بانگەشەی ئەوە دەکات کە ئەسڵن باوەڕی بە بوونی خودا نیە!

فیترەتی مرۆڤەکان چۆن نکۆڵی ئەو دان پێدانانە دەکات لەکاتێکدا بونەوە لەپێش چاویەتی ــــ بەهەموو ئەوشتانەی لەناویدایە ــــ و دەوری دەدات و ئەیگێڕێتەوە بەرەوڕاستیەکان؟!

چۆن ڕووبەڕووی بەدیهێنان دەبێتەوە وەڵامی چیە بۆ؟! ئەم گرفتە چۆن چارەسەر دەکات ئەگەر باوەڕی بە بوونی خودا نەبێت؟! ئەم بەدیهێنانە هاتۆتەکایەوە کە هەموو هەستەوەرەکان هەستی پێدەکەن و ڕێگایەك نامێنێتەوە بۆ نکوڵی کردن؟! ئاسمانەکان و زەوی و مانگ و ئەستێرەو هەسارەکان و ئەوانەشی لەسەر زەویدان بەمرۆڤیشەوە چۆن بەدیهێنراون؟! ئەم بوونەوەرە بەبێ بەدیهێنەرێك چۆن بەدیهێنراوە؟! هەروا لەنەبوونەوە؟! پاشان ئەمانە چۆن ڕێکخران پاش ئەوەی بەدیهێنران؟! پاشان چۆن پارێزگاری و بەرگری کرا لەو سستمە لەماوەی ئەو چەندین ملیۆن ساڵەدا، کە ئەقڵی مرۆڤ توانای هەژمار کردنی نیە، بەبێ ئەوەی هیچ نارێکی و کەم و کورتیەك ڕوبدات؟!

ئایا ئەمانە هەموویان ڕوودەدەن بەبێ بەدیهێنەرێك؟! ئایا عەقڵ نەبوونی ئەم قسەیە دەکات، تەنانەت ئەگەر ئەو عەقڵە گومڕاش بێت و لەتاریکیدا بسوڕێتەوە؟ ﴿ أَمْ خُلِقُوا۟ مِنْ غَيْرِ شَىْءٍ أَمْ هُمُ ٱلْخَـٰلِقُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾ (الطور)، ئایا ئەوانەبەبێ هیچ شتێك، هیچ هۆیەك، هاتوونەتەکایەوە ؟! یان هەر خۆیان دروستکارن ؟

یان ئەوەیە خۆیانیان بەدیهێناوە ئەمەش کارێکە هیچ یەکێك لە گومڕاکان بانگەشەی ئەوەیان نەکردووە، بۆیە پرسیاری یەکەم بەبێ وەلام دەمێنێتەوە: ﴿ أَمْ خُلِقُوا۟ مِنْ غَيْرِ شَىْءٍ ﴿٣٥﴾ ﴾ ؟! ئەو پرسیارە بێدەنگکەر و دەمکوتکەرە، کە هیچ یەکێك لەبێباوەڕان توانای وەڵامدانەوەیان نیە لەسەری. بەم جۆرەش تەنها کارێك ماوە ئەویش ئەوەیە بەدیهێنەرێك هەبێت، ئەوەی هەموو بەدیهێنراوەکانی بەدیهێناوە بەتواناو دەسەڵاتی خۆی، ئەوەی سەرجەم کاروبارەکان بەڕێوەدەبات بەبێ هاوبەش، ئەمە ئەوەیە کە فیترەت ناتوانێ نکوڵی لێ بکات تەنانەت ئەگەر گومڕاش بێت و لەگوکرایشدا ڕۆچوبێ .... بەڵکو خۆ لوت بەرزەکان بەزمان نکوڵی لێدەکەن بەهۆی لووتبەرزییانەوە بەرامبەر پەرستنی خودا، وەك خـــــودا دەفـــــەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُجَـٰدِلُونَ فِىٓ ءَايَـٰتِ ٱللَّهِ بِغَيْرِ سُلْطَـٰنٍ أَتَىٰهُمْ إِن فِى

صُدُورِهِمْ إِلَّا كِبْرٌ مَّا هُم بِبَٰلِغِيهِ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿٥٦﴾ ﴾ (غـافر)، بەڕاسـتی ئەوانـەی کـە موجادەلـە و گفتوگـۆی سەرکەشـانە دەکـەن و، بـە نەشارەزایی لە ئایەتەکانی خوا دەدوێن بێ ئەوەی بەڵگەیەکی بەهێزیان پێ بێـت، ئەوانـە تەنها لە سینەیاندا خۆ بەل زانین هەیە، بەمەرجێك هـیچ کـات ناگەنـە ئـەو ئامانجـەی کـە هەیانە، کەواتە تۆ پەنا بگرە بە خوا لـە شـەڕی خوانەناسـان چونکە بەڕاسـتی ئـەو زاتـە بیسەر و بینایە.

قورئانی پیرۆز بەڵگەی عـەقڵی هێناوەتـەوە کـە تـاك و تـەنهایی خـودا دەسـەلمێنێ و ئەوەشی دەتگەیەنێتە ئەوەی کە گریمان چەند خـودای هەیـە، ئـەوا هەریەکـەیان گرنگـی بـەوە دەدا کـە خـۆی بـەدیهێناو، سەرەنجامەکەشـی بوونـەوەرێکی نارێـك وپێـك دەبـوو، بێگومان ئەوەی کە دەبینـرێ بوونـەوەرێکی رێکخـراو رێـك وپێکـە، هەریەکـە لـە جیهـانی سەرەوە و خوارەوە پێکەوە گرێ دراون لەوپەڕی ئاستی کامڵیدا، خودا دەفـەرموێ:( مَـا تَـرَىٰ فِـي خَلْـقِ الـرَّحْمَٰنِ مِـنْ تَفَـاوُتٍ )(الملـك:٣) لـە نێـو بـەدیهێنراوەکانی ئـەو خـوای میهرەبانەدا هیچ نارێکی و ناتەواویەك بەدی ناکەیت.

ئەگەر ئاوا دەبوو هەریەکە لەو خودایانە هەوڵی زاڵبوونی دەدا بەسـەر بەرامبەرەکەیـدا و هەندیکیان خۆیان لەوانیتر بەگـەورە دەزانـی، وەك دەفـەرموێ: ﴿ مَا ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ مِن وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُۥ مِنْ إِلَٰهٍ إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَٰهٍۭ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٩١﴾ ﴾ (المؤمنـون)، هـەرگیز خـوا کەسـی نـەکردووە بـە ڕۆڵـەی خـۆی و هـیچ خوایـەکی لەگەڵدا نی یە، چـونکە ئـەو کاتـە هـەر خوایـەك دەچـوو بـەلای دروسـتکراوانی خۆیـەوەو هەندێکی خۆی بڵند دەکرد بەسەر هەندێکی تردا (ئەوسا بوونـەوەر تێکدەچـوو)، پـاکی و بێگەردی بۆ زاتی خوایە لە بەرامبەر ئەو شتانەوە کە (خـوا نەناسـان) هـەڵی دەبەسـتن و دەیلێن.

فەیلەسوفەکانیش باسیان لەم بابەتەکردووە بەبەڵگەی ڕێگریکردن ناوزەدیان کردووەکەبریتی یە لە گریمانەی هەبوونی دوو بەدیهێنەر یان زیاتر ئەوا یەکێکیان دەیەوێت لاشەکە (تەنەکە) بجوڵێت، ئەوی تریشیان دەیەوێت وەستاوبێت، ئەگەر مەبەست هەریەکێکیان نەهاتەدی ئەوا دەستەوسان دەبن، لەکاتێکدا بەدیهێنەرێك نابێ دەستەوسان بێت. بەم جۆرەش پێچەوانەبوونی مەبەستیان ڕێگرە لەبەردەم ڕێکەوتنیان، ئەم مەحاڵ بوونەش لەچەند خوایەتیەوە سەرچاوەی گرتووە بۆیە چەند خودایەتیش دەبێتە مەحاڵ بەڵام ئەگەر مەبەستی یەکێکیان هاتەدی لەبەرامبەر ئەویتردا ئەوە دەبێتە خودایەکی سەرەکی و دەستەڵاتدا ئەویتریان دەبێتە خودایەکی بەزێنراو وەلاخراو، چونکە خودایەك سیفەتی بەزاندن بێت ناکرێ بێدەسەلات بێت. وەك خودای گەورە دەفەرموێ: ﴿ أَمِ ٱتَّخَذُوٓاْ ءَالِهَةً مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ هُمۡ يُنشِرُونَ ﴿٢١﴾ لَوۡ كَانَ فِيهِمَآ ءَالِهَةٌ إِلَّا ٱللَّهُ لَفَسَدَتَاۚ فَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلۡعَرۡشِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٢٢﴾ لَا يُسۡـَٔلُ عَمَّا يَفۡعَلُ وَهُمۡ يُسۡـَٔلُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾ (الانبیاء)، ئایا خەڵکی نالەبار پەرستراوی ساختەیان بڕیارداوە لەزەویدا و ئەو پەرستراوانە دەتوانن ژیان ببەخشن؟ ئەگەر لە هەردووکیاندا (لە ئاسمان و زەویدا) چەند خوایەکی تر هەبوایە غەیری (الله)، ئەوە کاول و وێران دەبوون و تێك دەچوون بەسەر یەکدا، پاکی و بێگەردی بۆ خوا کە پەروەردگاری عەرشە، لەو باس و خواسانەدا (کە خوانەناسان) دەیڵێن (هاوەڵ بۆ ئەو زاتە بڕیار دەدەن). پرسیار ناکرێت لەوەی کە خوا دەیکات، لە کاتێکدا ئەوان پرسیاریان لێ دەکرێت و موحاسەبە دەکرێن.

ڕاستیە ئاشکراکە ئەوەیە ئەم بوونەوەرە ڕێکخراوە تا ئەوسەری کە عەقڵ بهێنێتە پێش چاوی خۆی لەڕێکخستندا، ئایا پاش ئەوە ئەکرێ خودایەکی تر هەبێت لەئاسمانەکان و زەویدا جگە لەخودایەکی تاك و تەنها و باڵادەست و ڕێکخەرو دانا کە (الله) یە: ﴿ فَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلۡعَرۡشِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾ ئایا هەر خودایەك هەرچیەکی بوێت بۆ خۆی دروسستی ناکات؟! ئیتر چۆن ئەو شتەی دروستکراوە لەلایەن خودایەکی دیکەوە

وەك ئەو شتەی خوداکەی تر لێك دەچن؟!... ئیتر چۆن دەورانی بوونەوەر ڕێك دەخرێت لەلایەن دوو خودای جیاوازەوە بەدیهێنرابێت و چەند خودایەکیش سەرپەرشتی بکات؟!

ئایا دەکرێ بوونەوەرێکی ڕێکخراوبێت ئەگەر چەند ئیرادەو دەستەڵاتدارێکی جیاواز بەڕێوەی ببات؟! ئەی ناکرێ یەکێك لەخوداکان بیەوێت ڕۆژ لە ڕۆژهەڵاتەوە بەدەربکەوێ و خودایەکی تریش بیەوێت ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە بەدەربکەوێ؟! ئەی ئەوکاتەچی ڕوودەدات؟! لەم حاڵەتەدا تەنها شتێکیش لەم بوونەوەرەدا ڕێك ناخرێت؟ ئایا کارەکان ڕێك و ڕاست دەبن یاخود بوونەوەر دەبێتە گەڕەلاوژەو پاشاگەردانی و گەردوونەکان بەریەك دەکەون و پێك دانان ڕوودەدات، تەنانەت پێك دادان لەنێوان ئەو ئیاردانەشدا ڕوودەدات کە سەرپەرشتیان دەکەن و، وەك ملوانکەیەکی پچڕاوی لێدێت؟! لەبەرئەوەی قورئان عەقڵەکان دەدوێنێ و دەڵێت پێیان ﴿ لَوْ كَانَ فِيهِمَآ ءَالِهَةٌ إِلَّا ٱللَّهُ لَفَسَدَتَا ﴿٢٢﴾ ﴾، ئەگەر لە هەردووکیاندا (لە ئاسمان و زەویدا) چەند خوایەکی تر هەبوایە غەیری (الله)، ئەوە کاول و وێران دەبوون و تێك دەچوون بەسەر یەکدا.. قورئان تەنها بەوە قایل نابێت، بەڵکو لەگفتوگۆکردندا هەنگاوێکی تر دەچێتە پێشەوە، ئەم ڕاستیە دەخاتە بەردەستی بۆئەوە لێی حاڵی ببێ، گریمان ـ باوابێت ـ کە لەگەڵ خودا خودایەکی تر هەبێت ئایاهەڵوێست چۆن دەبێت؟! لەڕاستیشدا ئەگەر لەبوونەوردا ژمارەیەك خودا هەبوون: ﴿ وَمَا كَانَ مَعَهُۥ مِنْ إِلَٰهٍ ۚ إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَٰهٍۭ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٩١﴾ ﴾ (المؤمنون)، هەرگیز خوا کەسی نەکردووە بە ڕۆڵەی خۆی و هیچ خوایەکی لەگەڵدا نیە، چونکە ئەو کاتە هەر خوایەك دەچوو بەلای دروستکراوانی خۆیەوەو هەندێکی خۆی بڵند دەکرد بەسەر هەندێکی تردا (ئەوسا بوونەوەر تێکدەچوو)، پاکی و بێگەردی بۆ زاتی خوایە لە بەرامبەر ئەو شتانەوە کە (خوا نەناسان) هەڵی دەبەستن و دەیڵێن.

ئەگەر هێنامانە پێش چاوی خۆمان کە هەریەکێك لەو خودایاە بەشێك یاخود سوچێکی بەدیهێنراوێکیان دروست کرد، ئایا دەچێتە عەقڵەوە خودایەك لەو خودایانە واز لەبەشەکەی خۆی بهێنێ بۆ خودایەکی تر؟! ئەوکاتە کێبەرکێ لەسەر دەستەڵات دروست دەبێت لەنێوان خودا سەپێنراوەکاندا.. هەریەکەیان ویستی خۆی دەسەپێنێ بەبیانوی ئەوەی ئەو ڕاست و گەورەترە.. ئایا بونەوەر بەم حاڵەتانەوە جێگیردەبێت؟! وەیاخود بەدیهێنان و بەڕێوەبردن و جوڵەی گەردیلەکان ڕێکخراودەبوو؟!

عەقڵی مرۆڤایەتی لەسەریەتی بیربکاتەوە و تێڕابمێنێ .. لەبەرئەوەی مرۆڤ دانی بەوەداناوە کە ئاسمانەکان و زەوی و دەسەلات و بەڕێوەبردن بۆ خودایە، ئیتر چ کارێك دەمێنێتەوە بۆ خوداکانی تر؟! بەهۆی ئەوەی کە بوونەوەر لەبەڕێوەچوونیدا هیچ کەم و کورتی و نارێکیەك بەدی ناکرێت، بەڵکو ئەوەی کە دەبینرێ بونەورێکی توندو تۆڵ و ڕێکخراوە، ئەمانە بەڵگەن لەسەر تاك دەستەڵاتی لە بەڕێوەبردن و چاودێری کردندا.

٣ـ قورئان سەربەخۆیی خودا لە بەدیهێنانی هەموو شتەکان و بەڕێوەبردن و دیاری کردنی چارەنوسیاندا دووپات دەکاتەوە کە ئەم کارانە خودا بەبێ هاوبەش جێ بەجێ یان دەکات، بەڵام ئەوانەی موشریکەکان بەشەریك بڕیاریان داوە بۆ خودا ئەوانە بەندەن وەك خۆیان و هیچ دەستەڵاتێکیان نیەو خوداش بەئامادەبوونی ئەوان ئاسمانەکان و زەوی دروست نەکردووە تەنانەت ئەوان لەوکات و ساتەدا هەربونیشیان نەبووە. وەك خودا دەفەرموێ: ﴿ ۞ مَّآ أَشۡهَدتُّهُمۡ خَلۡقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلَا خَلۡقَ أَنفُسِهِمۡ وَمَا كُنتُ مُتَّخِذَ ٱلۡمُضِلِّينَ عَضُدٗا ﴿٥١﴾ ﴾ (الکهف)، وەنەبێت من لەکاتی دروستکردنی ئاسمانەکان و زەویدا ئەوانم ئامادە کردبێت، بگرە هەتا لە دروست بوونی خۆشیان ئاگادارنین، بەڕاستی من هەرگیز ئەوانەی خەڵك گومڕا دەکەن نەمکردووە بەیارمەتیدەری خۆم و پشتم پێ نەبەستوون.

قورئان بەڵگە دەهێنێتەوە لەسەر بوونی خوداو دەستەڵاتی، کە ئەو بەدیهێنەر و فەرمانڕەوایە، لەکاتێکدا مرۆڤی لەنەبوونەوە هێناوەتە بوون، وەك دەفەرمویّ: ﴿ كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِاللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَاتًا فَأَحْيَاكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾ (البقرة)، (خەڵکینە)، چۆن بیّ بڕوا دەبن بە خوا لەکاتێکدا ئێوە بیّ گیان بوون (لە تویّی خاکدا) خوا (دروستی کردوون) و گیانی بەبەردا کردن، پاشان دەتانمرێنێت و دوایی زیندووتان دەکاتەوە، ئەوسا هەر بۆ لای ئەویش دەبرێنەوە، هەروەها دەفەرمویّ: ﴿ هَلْ أَتَىٰ عَلَى الْإِنسَانِ حِينٌ مِّنَ الدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْئًا مَّذْكُورًا ﴿١﴾ ﴾ (الانسان)، بەڕاستی ماوەیەکی زۆر لە ڕۆژگار بەسەر ئادەمیزادا هات کە شتێکی وانەبوو ناو ببرێت.

ئەمە ئەو بەڵگەیە کە کابرای باوەڕدار بەنموونە هێنایەوە بۆ هاوڕیّ بێباوەڕەکەی لەچیرۆکی خاوەنی دوو بەهەشتەکەدا، کە دەفەرمویّ: ﴿ أَكَفَرْتَ بِالَّذِي خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ سَوَّاكَ رَجُلًا ﴿٣٧﴾ لَّٰكِنَّا هُوَ اللَّهُ رَبِّي وَلَا أُشْرِكُ بِرَبِّي أَحَدًا ﴿٣٨﴾ ﴾ (الكهف)، هاوەڵە ئیماندارەکەی لەکاتێکدا کە گفتوگۆی لەگەڵدا دەکرد پێی وت: ئایا باوەڕت نەماوە بەو زاتەی کە سەرەتا تۆی لە خاك دروست کردووە؟! لەوەودوا نوفتەیەك بوویت، پاشان کردیتی بە پیاو؟! بەڵام من دەڵێم کە:_الله_ (بەدیهێنەری هەموو بوونەوەر)، هەر ئەو پەروەردگارمە، هیچ جۆرە هاوەڵ و شەریکێك بۆ ئەو پەروەردگارەم بڕیار نادەم.

ئەمە نکوڵی کردنە لەلایەن ئەوەوە هەروەها ترسناکی لادان و سەرپێچی هاوڕێکەی دەخاتەڕوو بەرامبەر بەو خودایەی کە مرۆڤی لەقوڵڕەوە بەدیهێناوە، ئیتر مرۆڤ چۆن دەتوانێت سەرپێچی خودا بکات. لەکاتێکدا بەڵگەکان لەسەر بوونی خودا دیارو ئاشکران و هەموو تاکێك لەناخی خۆیەوە ئەو ڕاستیە دەزانێت، هیچ دروستکراوێك نیە لەنێو دروستکراوەکاندا نەزانێت کە لەنەبوونەوە هاتۆتە بوون دروست بوونیشی لەخۆیەوە نەبووە واتە پەیوەندی بەخۆیەوە نیە و بەهەمان شێوە دروستبونەکەشی نەدراوەتە پاڵ

هیچ دروستكراوێكی تر چونكه هەموویان لەیەك پلەو پایەو ئاستدان، كەواتە زانستی دانەپاڵی دروستبوونی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو خودایەی كە هیچ خودایەكی ترنیە جگە لو بەدیهێنەری هەموو شتەكان، بۆیە ئیماندارەكە پێی ووت: ﴿ لَّٰكِنَّا۠ هُوَ ٱللَّهُ رَبِّي وَلَآ أُشۡرِكُ بِرَبِّيٓ أَحَدٗا ٣٨ ﴾ (الكهف)، بەڵام من دەڵێم كە: _الله_ (بەدیهێنەری هەموو بوونەوەر)، هەر ئەو پەروەردگارمە، هیچ جۆرە هاوەڵ و شەریكێك بۆ ئەو پەروەردگارەم بڕیار نادەم.

واتاكەشی: من قسەكانی تۆ دووبارە ناكەمەوە بەڵكو دان بەتاك و تەنهایی پەروەردگارێتی خودادا دەنێم كە هیچ هاویەشێكی نیە. ئەو بەڵگە ئاشكرایانەی دەستەڵات و سەربەخۆ بوونی خودا دەسەلمێنن لەزاڵبوونی بەسەر دروستكراوەكانیدا، ئەوەی كە ئیبراهیم پێغەمبەر (علیه السلام) بەبەڵگەهێنایەوە لەبەرامبەر نەمرود دا كاتێك كە نكۆڵی لەبوونی خودا كرد، ئیبراهیم پێغەمبەر (علیه السلام) بۆی سەلماند دروستبوونی شتەكان دوای نەبونیان و مراندنیان و ژیاندنیان بەڵگەن لەسەر بوونی خودا، كاتێك نەمرود لەوەڵامدا بەڕووكەش بانگەشەی ئەوەی دەكرد كە دەتوانێ بژێنێ و بمرێنێ ابراهیم (علیە السلام) داوای لێكرد كە خۆر لەخۆرئاواوە هەڵبێنی وەك چۆن خودای باڵادەست ئەو كارەی بەلاوە ئاسانە، ئالەوێدا دەستەوسانی ئاشكرابوو، لەهەمان كاتدا بۆی دەركەوت كە ناتوانێ لەسەر لوت بەرزی و نكۆڵی كردن بەردەوام بێت. ﴿ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِي حَآجَّ إِبۡرَٰهِـۧمَ فِي رَبِّهِۦٓ أَنۡ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلۡمُلۡكَ إِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِـۧمُ رَبِّيَ ٱلَّذِي يُحۡيِۦ وَيُمِيتُ قَالَ أَنَا۠ أُحۡيِۦ وَأُمِيتُۖ قَالَ إِبۡرَٰهِـۧمُ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَأۡتِي بِٱلشَّمۡسِ مِنَ ٱلۡمَشۡرِقِ فَأۡتِ بِهَا مِنَ ٱلۡمَغۡرِبِ فَبُهِتَ ٱلَّذِي كَفَرَۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٢٥٨ ﴾ (البقرة)، ئایا نەتبیستووە و نەتڕوانیوەتە ئەو كەسەی دەمەقاڵەی دەكرد لەگەڵ ئیبراهیمدا لە بارەی پەروەردگاریەوە لەبەر ئەوەی خوا پاشایەتی پێبەخشی بوو، (لە جیاتی باوەڕهێنان و سوپاسگوزاری كەچی دەمە دەمێی دەكرد لەگەڵ ئیبراهیمدا)، (ئەم لووت بەرزیەشی كاتێك بوو بە هەواو فیزاوە پرسیوویەتی

له ئیبراهیم که پەروەردگاری تۆ کێیە؟ ئەویش لە وەڵامدا وتی: پەروەردگاری من ئەوزاتەیە کە ژیان دەبەخشێت و مردنیشی بەدەستە، (نەمرود لە وەڵامیدا) وتی: جا منیش ژیان دەبەخشم و مردنیشم بەدەستە، (ئینجا فەرمانیدا هەندێك لە نەیارانی بکوژن گوایە ئەوە دەیانمرێنێت، هەندێکیشی نەکوشت گوایە ئەوە ژیانی پێبەخشین!!)، ئەوسا ئیبراهیم وتی: بەڕاستی خوا خۆر لە ڕۆژهەڵاتەوە دەهێنێت جا (ئەگەر تۆ دەتوانیت) لە ڕۆژئاواوە بیهێنە، ئینجا ئەو بێ باوەڕە ڕەنگی پەڕی و دەمکوت کراو وەڵامی نەما، بێگومان خوا هیدایەتی قەومی زاڵم و ستەمکار نادات.

یەکێکی تر لە بەڵگە ڕوون و ئاشکراکان لەسەر بوونی خوداو سەربەخۆی لەبەرامبەر دروستکراوەکانیدا سەربەخۆیی لەبەرامبەر دروستکراوەکانیدا ئەو نیشانەو بەڵگە گەردونیانەن کە قورئانی پیرۆز عەقڵی مرۆڤەکان پەلکێش دەکات بۆ تێڕامان و بیرکردنەوە لێیان لەسەرتاسەری گەردوندا. ئەو نیشانانەی کە ئاماژە بەوەدەدەن کە خوای گەورەدەستەوسان نیە بەرامبەر هیچ کاروبارێکی بەندەکانی لەرزق و ڕۆزی و بوڕێوەبردن و مردن و زیندوکردنەوەو پاداشت و سزایان وەك دەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَٱلْفُلْكِ ٱلَّتِي تَجْرِي فِي ٱلْبَحْرِ بِمَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ وَمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن مَّآءٍ فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٍ وَتَصْرِيفِ ٱلرِّيَٰحِ وَٱلسَّحَابِ ٱلْمُسَخَّرِ بَيْنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿١٦٤﴾﴾ (البقرة)، بەڕاستی لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی و ئاڵو گۆڕی شەوو ڕۆژدا و لەو کەشتیانەدا کە دەگەڕێن بە دەریادا و بەهۆیەوە سوود بە خەڵکی دەگەیەنن و لەو ئاوەی کە خوا لە ئاسمانەوە دەیبارێنێت و ئینجا بەهۆیەوە زەوی پێ زیندوو دەکاتەوە دوای وشك بوون و مردنی، هەروەها جۆرەها زیندەوەر و گیانلەبەر و مارو مێرووی لەسەر ڕووکاری زەویدا بڵاو کردۆتەوە و گۆڕاندن و هاتووچۆ پێکردنی باو شەماڵ و ڕاگیر کردنی هەورەکان لە نێوان ئاسمان و زەویدا،

ئەمانە هەموو بەڵگەو نیشانەی بەهێزن بۆ ئەوانەی کە عەقڵ و بیروهۆشیان دەخەنەکارو بیر لە دەسەڵاتی بێ سنووری خوا دەکەنەوە.

ئەگەر مرۆڤ لەڕێگەی عەقڵیەوە بیربکاتەوە لەو هەموو نیشانە پەخشکراوە لەخودی خۆیی و لەگەردوندا دووچاری سەرسوڕمان و دەستەپاچەی دێت لەبەرامبەر ئەو نیشانە سەرسامکەرانەی کە ئاماژەن لەسەر بوونی بەدیهێنەرێکی بەتوانا وەك دەفەرموێ:

﴿ قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ وَسَلَٰمٌ عَلَىٰ عِبَادِهِ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَىٰٓ ۗ ءَآللَّهُ خَيْرٌ أَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٥٩﴾ أَمَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَنۢبَتْنَا بِهِۦ حَدَآئِقَ ذَاتَ بَهْجَةٍ مَّا كَانَ لَكُمْ أَن تُنۢبِتُوا۟ شَجَرَهَآ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ بَلْ هُمْ قَوْمٌ يَعْدِلُونَ ﴿٦٠﴾ أَمَّن جَعَلَ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا وَجَعَلَ خِلَٰلَهَآ أَنْهَٰرًا وَجَعَلَ لَهَا رَوَٰسِىَ وَجَعَلَ بَيْنَ ٱلْبَحْرَيْنِ حَاجِزًا ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٦١﴾ أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ ٱلسُّوٓءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَآءَ ٱلْأَرْضِ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٦٢﴾ أَمَّن يَهْدِيكُمْ فِى ظُلُمَٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَمَن يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦٓ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ تَعَٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٣﴾ أَمَّن يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَمَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ قُلْ هَاتُوا۟ بُرْهَٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٦٤﴾ ﴾ (النمل)،

(ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەی ئیماندار) بڵێ: سوپاس و ستایش بۆ خوای میهرەبان، سڵاو لەسەر ئەو بەندانەش کە هەڵی بژاردووە، ئایا ئەو خوا میهرەبانە چاکترە (کە بپەرسترێت و پەیرەوی بەرنامەکەی بکرێت) یان ئەوانەی ئەوان دەیکەنە شەریك و هاوەڵ بۆی؟

(ئایا شەریك و هاوەڵ چاکترە بپەرسترێت) یان ئەو زاتەی کە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە و لە ئاسمانەوە بارانی باراندووە، جا باخ و بێستانی جوان و ڕازاوەمان پێ بەرهەم هێناوە، ئێوە نەتاندەتوانی درەختەکانی بڕوێنن، چ جای بەرو بوومەکەی، ئایا ڕەوایە، کە خوایەکی تر لەگەڵ خوای پەروەردگاردا هەبێت؟! نەخێر، لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگانەدا زۆربەی ئەو خەڵکە لە ڕێبازی ڕاست لادەدەن و شوێنی چەوتی و ناردوستی دەکەون.

(ئایا تـەنها ئـەو زاتـە نیـە) کـە زەوی دامەزرانـدووە و لـە ناویـدا جۆگـە و ڕووبـاری ڕەخساندووە، هـەروەها زنجیرە چیای تیـادا چەسـپاندووە، لـە نێـوان دوو دەریاکەشـدا بەربەستی بەرپاکردووە (کە ئاوی شیرین و سوێر تێکەڵ نـابن) ئایـا ڕەوایـە خوایـەکی تـر لەگەڵ خوا پەروەردگاردا هەبێت؟! نەخێر وا نییە، لەگەڵ ئەو هـەموو بەڵگانـەدا زۆربـەی ئەو خەڵکە (ئەم ڕاستیانە) نازانن و تێناگەن.

ئایا کێیە جگە لە زاتی پەروەردگار کە بێت بە هانا و هاواری لێقەوماو و بـێ دەرەتـان و بێ داڵدەوە، کاتێك نزا دەکات و لێی دەپارێتەوە، ئەوسا بەڵاو ناخۆشیەکان لادەبـات و دەتانکاتە نیشـتەجێ و جێنشـین لـە زەویـدا، ئایـا ڕەوایـە لەگـەڵ ئـەو زاتـەدا خـوای تـر هەبێت؟! کەمێك یاداوەری وەربگرن و تێفکرن و بیربکەنەوە.

ئایا کێ لە تاریکستانی سەر وشکانی و دەریا ڕێنموییتان دەکات تا ون نـەبن؟! کـێ بـای شـەماڵ (هـەڵگری هـەڵمی ئـاو) دەنێرێـت وەك مژدەیـەك پـێش گەیشـتنی بـارانی ڕەحمەت؟، ئایا ڕەوایە لەگەڵ خوادا خوای تر هەبێت، بەرزی و بڵندی و مەزنی بـۆ خـوای گەورە لەبەرامبەر ئەو شتانەوە کە نەفامان دەیکەنە هاوەڵ و شەریك بـۆ ئـەو زاتـە. ئایـا کێ لە سەرتاوە دروستکراوان بەدی دەهێنێت، پاشان دوای تێکدانی سـەرلەنوێ دروسـتی دەکاتەوە، کێ لەو ئاسمانەوە (بەهۆی تیشکی خۆر و باران و هەواوە) لـە زەوییـەوە (بـە هۆی خاکەوە) ڕزق و ڕۆزیتان پی دەبەخشێت؟، ئایا ڕەوایە لەگەڵ زاتی خوادا خـوای تـر هەبێت؟، پێیان بڵێ: ئادەی بەڵگەتان چییە بیهێننە مەیدان ئەگەر ئێوە ڕاستگۆن.

**دووەم: ڕێگـای دووەم کە قورئـان پشـتی پـێ بەسـتووە بـۆ سـەلماندنی تـاك و تەنهـایی وپەروەردگارێتی خودا ڕوونکردنەوە و ئاشکراکردنی دەستەوسانی ئەو موشریکانەیە:**

١- قورئـان چـەند ڕێگایـەکی عـەقڵی گرتۆتەبـەر کـە عـەقڵ گـەواهی ئـەو ڕاسـتیە بەرجەستەو بەرچاودەدات ـ لەبەرامبەر ئەو پێڕەدا ـ کە هەمووشیان دەستەوسـانی ئـەو خودایانە دەسەلمێنێ لەبەرامبـەر خـدای ڕاسـتەقینە پاشـان پوچـەڵکردنەوەی پەرسـتنی خودا دەستکردەکان لەو بەڵگانەش:

ئـەو بـت و پەیکـەرو فریشـتـەو خودایانـەی تـر کـە موشـریکەکان هانـای بـۆ دەبـەن لەبەرامبەر خودای ڕاستەقینەدا هیچ دەستەڵاتێکیان نیەلە ئاسمانـەکان و زەویـدا، ئەوانـە گوێیان لە پاڕانەوە نیە و توانای وەڵامدانەوەی داوایان نیە، وەك خودا دەفەرموێ:

﴿ قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۖ لَا يَمْلِكُونَ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا لَهُمْ فِيهِمَا مِن شِرْكٍ وَمَا لَهُۥ مِنْهُم مِّن ظَهِيرٍ ﴿٢٢﴾ وَلَا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ عِندَهُۥٓ إِلَّا لِمَنْ أَذِنَ لَهُۥ... ﴿٢٣﴾ ﴾ (سبأ)، (ئەی پێغەمبەر! بە هاوەڵپەرستان بڵێ: با هاناو هاوار ببەن بۆ ئەو شتانەی کە لەجیاتی خوا (دەیانپەرستن)!! (ئەوانە) خاوەنی بچوکتر لە ئەتۆمێك نین نە لە ئاسمانەکان، نە لە زەویدا، وەهیچ هاوبەشی و هاوکاریەکیشیان نیە تیایاندا، دەسەڵاتی هیچ پشتیوانی و یارمەتیەکیشیان نیە. هیچ تکاو پاڕانەوەیەك سودی نیە لای (خوا) مەگەر خۆی مۆڵەت بدات.

خودا ڕوونی کردۆتەوە کە خودایەکی تاك و تـەنها و بێهاوتـاو بێنیـازە لەبەنـدەکانی و هاوشـێوەو هاوبەشـی نیـە، بـەڵکو سـەربەخۆیە بـۆ خـۆی لەکارەکانیـدا بـەبێ ڕکابـەرو بەرهەڵسـتکار، بـەڵام خوداکـانیتر خـاوەنی هـیچ نـین تەنانـەت سـەربەخش نـین، وەك دەفەرموێ: ﴿ ..وَٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ مَا يَمْلِكُونَ مِن قِطْمِيرٍ ﴿١٣﴾ ﴾ (فاطر)، (بـەڵام) ئەوانەی جگە لەو هاناو هـاواری بـۆ دەبـەن ولێـی دەپاڕێنـەوە تەنانـەت خـاوەنی توێکڵـە تەنکەکەی دەوری ناوکی خورمانیش نین.

هاوچەشنەکانی خودا هیچ دەستەڵاتێکیان نیـە لەبەرامبـەر یـدا و هـەموویان بەنـدەی ئەون، خـودای پـاك و بێگـەرد بـەهۆی مـەزن و دەسـەڵاتیەوە کـەس جورئـەتی شفاعەت کردنیان نیە لەهیچ شتێکدا تا ئەو ڕێگا نەدات بە شفاعەت کردن وەك دەفـەرموێ: ﴿ مَن ذَا ٱلَّذِى يَشْفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ ۚ .. ﴿٢٥٥﴾ ﴾ (البقرة)، کێ یە ئەوەی (دەتوانێـت) تکـا بکـات لـە لای ئەو، بەبێ مۆڵەتی خۆی..

هــەروەها دەفــەرموێ: ﴿ ۞ وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ لَا تُغْنِي شَفَٰعَتُهُمْ شَيْـًٔا إِلَّا مِنۢ بَعْدِ أَن يَأْذَنَ ٱللَّهُ لِمَن يَشَآءُ وَيَرْضَىٰٓ ﴿٢٦﴾ ﴾ (الـنجم)، زۆر فریشــتەش لەئاسمانەکانــدا هــەن کــەتکاو پاڕانەوەیان ناکام و بێ سوودە، مەگەر خوا مۆڵەت بدات بۆ هەرکەسێك کەشایستەیە و ڕازی بێت کەتا بکات، یان تکای بۆ بکرێت، هەروەها دەفـەرموێ : ﴿ إِن تَدْعُوهُمْ لَا يَسْمَعُوا۟ دُعَآءَكُمْ وَلَوْ سَمِعُوا۟ مَا ٱسْتَجَابُوا۟ لَكُمْ ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكْفُرُونَ بِشِرْكِكُمْ ۚ وَلَا يُنَبِّئُكَ مِثْلُ خَبِيرٍ ﴿١٤﴾ ﴾ (فاطر)، خۆ ئەگەر هاناو هاواریان بۆ بەرن گوێیان لێتان نییە و نابیستن، ئەگەر بشبیستن بە دەمتانـەوە نایـە، ڕۆژی قیامـەتیش حاشـا دەکـەن لێتـان و لـەوەی کـە بـە (خواتـان) زانیـوون، بێگومـان کـەس نییـە وەك (خـوا) ئاگـاو زانـا بێـت و هـەواڵی ڕاسـت و دروسـت بگەیەنیت.

ئـەو خودایانـەی هانایـان بـۆ دەبـەن جگـە لـە خـودا توانـای جـێ بـەجێ کردنـی ئـەو داواکاریانەیان نیە کە داوایان لێ دەکرێت وەك دەفەرموێ:

﴿ أَيُشْرِكُونَ مَا لَا يَخْلُقُ شَيْـًٔا وَهُمْ يُخْلَقُونَ ﴿١٩١﴾ وَلَا يَسْتَطِيعُونَ لَهُمْ نَصْرًا وَلَآ أَنفُسَهُمْ يَنصُرُونَ ﴿١٩٢﴾ وَإِن تَدْعُوهُمْ إِلَى ٱلْهُدَىٰ لَا يَتَّبِعُوكُمْ ۚ سَوَآءٌ عَلَيْكُمْ أَدَعَوْتُمُوهُمْ أَمْ أَنتُمْ صَٰمِتُونَ ﴿١٩٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ عِبَادٌ أَمْثَالُكُمْ ۖ فَٱدْعُوهُمْ فَلْيَسْتَجِيبُوا۟ لَكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٩٤﴾ أَلَهُمْ أَرْجُلٌ يَمْشُونَ بِهَآ ۖ أَمْ لَهُمْ أَيْدٍ يَبْطِشُونَ بِهَآ ۖ أَمْ لَهُمْ أَعْيُنٌ يُبْصِرُونَ بِهَآ ۖ أَمْ لَهُمْ ءَاذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا ۗ قُلِ ٱدْعُوا۟ شُرَكَآءَكُمْ ثُمَّ كِيدُونِ فَلَا تُنظِرُونِ ﴿١٩٥﴾ ﴾ (الاعراف)

ئایا کەسێك یان شتێك دەکەنە شەریك و هاوبەش کـە ناتوانێـت هـیچ شـتێك دروسـت بکـات، لەکاتێکـدا خۆشـیان دروسـتکراون و (هیچیـان بەدەسـت نیـە)...ئەوانـە نـاتوانن سەرکەوتن بەوان ببەخشن و ناشـتوانن یارمـەتی خۆیـان بـدەن و بـەرگریی لـە خۆیشـیان بکەن. ئەگەر بانگیشیان بکەن بۆ ڕێبازی هیدایەت، ئەوە شوێنتان ناکەون، چوونیەکیشـە بۆتان ئایا بانگتان کردبن، یان ئێوە بێ دەنگ بن (ناتوانن بیانهەژێنن ئەگەر خـوا ویسـتی

لەسەر نەبێت).بەڕاستی ئەوانەی ئێوە هاواریان لێدەکەن جگەلە خواو لێیان دەپاڕێنەوە، چەند بەندەیەکی وەك ئێوەن (هیچیان بەدەست نیە) دە هاواریان لێ بکەن، بابێن بەدەمتانەوە، ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن (لەو داوایەتاندا).ئایا ئەو پەرستراوانە قاچیان هەیە پێی بڕۆن بەڕێوە؟ یان دەستیان هەیە ڕای بوەشێنن و ئازاری نەیارەکانی پێ بدەن؟ یاخود چاویان هەیە پێی ببینن؟ یاخود گوێیان هەیە پێی ببیستن؟ ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: داوا لە پەرستراوەکانتان بکەن و چیتان لە دەست دێت لە پیلان گێڕان بیکەن و مۆڵەتم مەدەن. هەروەها دەفەرموێ: ﴿ قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِهِۦ فَلَا يَمْلِكُونَ كَشْفَ ٱلضُّرِّ عَنكُمْ وَلَا تَحْوِيلًا ﴿٥٦﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ يَبْتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ ٱلْوَسِيلَةَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُۥ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُۥٓ ۚ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحْذُورًا ﴿٥٧﴾ ﴾ (الاسراء)، ئەی پێغەمبەرﷺ بە هاوەڵگەران بڵێ: ئادەی هاناو هاوار بکەن لەو بت و شتانەی کە لەجیاتی خوا دەیانپەرستن (ئایا هیچیان لە دەست دێت؟ دڵنیابن کە ئەوانە) نە دەتوانن بەڵاو ناخۆشیەکتان لەسەر لابەرن. نەدەتوانن بارودۆخ بگۆڕن.

ئا ئەوانەی کە ئەوان هاناو هاواریان لێ دەکەن، کامیان لە خوا نزیکترە؟! لە کاتێکدا کە ئەوان خۆیان هاوار لە خوا دەکەن و داوای نزیك بوونەوە لە پەروەردگاریان دەخوازن و چاوەڕوانی ڕەحمەتی دەکەن، لە سزاو تۆڵەشی دەترسن، بەڕاستی سزای پەروەردگارت مەترسی لێکراوە.هەروەها دەفەرموێ: ﴿ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَمْلِكُ لَهُمْ رِزْقًا مِّنَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ شَيْـًٔا وَلَا يَسْتَطِيعُونَ ﴿٧٣﴾ فَلَا تَضْرِبُوا۟ لِلَّهِ ٱلْأَمْثَالَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٧٤﴾ ﴾ (النحل)، ئەو (خەڵکە سەرگەردانە) شتێك دەپەرستن لە جیاتی خوا، کە هیچ جۆرە ڕزق و ڕۆزیەکی ئەوانی بەدەست نیە لە ئاسمانەکان و زەویدا، ناشتوانن هیچ بەدەست بن!!

کەوابوو ئێوە ئەی خوا نەناسان نموونە مەهێننەوە بۆ خواو بەراوردی هەڵە مەکەن (دەیانوت پیاوانی پاشا خزمەتکاریان هەیە، پیاوانی پاشاش خزمەتکاری پاشان!!)، چونکە خوا خۆی هەموو شتێك چاك دەزانێت، بەڵام ئێوە نەزان و نەفامن.

ئەو هاوچەشن و بت و پەیکەرانەی کە دەپەرستڕێن جگە لەخودا توانای ڕۆزیدان و باران بارین و ڕواندنی ڕووەك و وەڵامدانەوەی پاڕانەوەیان نیە تەنانەت ناشبیستن، وەك ئەوەی خودا خستیە ناخی ئیبراهیم پێغەمبەرەوە کە داوا لە گەلەکەی بکات وەك سەلماندن و پێی وتن: ﴿فَسۡـَٔلُوهُمۡ إِن كَانُواْ يَنطِقُونَ ٦٣﴾ (الانبیاء)، ئیبراهیم وتی: دە لێیان بپرسن ئەگەر قسە دەکەن و تیێ دەگەن!! بەباوکی ووت: ﴿يَٰٓأَبَتِ لِمَ تَعۡبُدُ مَا لَا يَسۡمَعُ وَلَا يُبۡصِرُ وَلَا يُغۡنِي عَنكَ شَيۡـٔٗا ٤٢﴾ (مریم)، کاتێك بەباوکی وت: باوکی بەڕێزم ! ئەوە تۆ بۆچی شتێك دەپەرستیت کە نەگوێ بیستە، نەکەس بەرچاو ڕوون و ڕۆشنبیر دەکات، نە هیچ سوودێکت پێ دەگەیەنێت..

٢-خودای گەورە هەواڵی بە نەزانینی موشریکەکان داوەلە هەڵبژاردنی خودایەکی تر لەبەرامبەر خودادا کە توانای دروستکردنی باڵە مێشولەیەکیان نیە، ئەوان خۆیان دروستکراون و توانای سودو زیانیان نیە تەنانەت بۆ خودی خۆشیان ئیتر چۆن توانای ئەوەیان هەیە بۆ شوێن کەوتەکانیان، خودای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةٗ لَّا يَخۡلُقُونَ شَيۡـٔٗا وَهُمۡ يُخۡلَقُونَ وَلَا يَمۡلِكُونَ لِأَنفُسِهِمۡ ضَرّٗا وَلَا نَفۡعٗا وَلَا يَمۡلِكُونَ مَوۡتٗا وَلَا حَيَوٰةٗ وَلَا نُشُورٗا ٣﴾ (الفرقان)، کەچی هاوەڵگەران لە جیاتی ئەو زاتە شتانێکی تریان کردووە بە خوای خۆیان کە هیچ دروست ناکەن و هیچیان پێ بەدی ناهێنرێت، بەڵکو خۆیان دروست دەکرێن، (تەنانەت) ناتوانن سودێك یان زەرەرێك بە خۆیان بگەیەنن، هەروەها نە مردنیان بە دەستە، نە ژیان، نە زیندووکردنەوە. ئەوەی کەخاوەنی هیچ شتێك نەبێت بۆ خۆی و کەسانی تریش ڕاست نیە کە ناوی خودای لێ بنرێ، بۆیە خودای گەورە ئاگاداری

داوه لەسەر زەبوونی بتەکان و لاوازی عەقڵی شوێن کەوتوانیشی، ئەوەشی ئاشکراکردووە کە هەموو ئەوانەی بت و پەیکەرەکان دەپەرستن کۆببنەوە بۆ ئەوەی مێشولەیەك دروست بکەن توانیان نیە، بۆیە پێغەمبەری خواﷺ لەفەرمودەی سەحیحدا دەفەرموێ: قال الله تعالى: ومن أظلم ممن ذهب يخلق كخلقي، فيخلقوا ذرة أو ليخلقوا حبَّة أو شعيرة)[19]

واتە: ( خودا دەفەرموێ: کێ ستەمکارترە لەوەی کە دەیەوێت وەك من بەدیهێنان بکات، دەبا تەنۆچکە، یان دەنکۆڵەیەك، یان چڵەگیایەك دروست بکات).

بۆیە خودای گەورە دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَٱسْتَمِعُواْ لَهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَن يَخْلُقُواْ ذُبَابًا وَلَوِ ٱجْتَمَعُواْ لَهُۥ ۖ وَإِن يَسْلُبْهُمُ ٱلذُّبَابُ شَيْـًٔا لَّا يَسْتَنقِذُوهُ مِنْهُ ۚ ضَعُفَ ٱلطَّالِبُ وَٱلْمَطْلُوبُ ﴿٧٣﴾ ﴾ (الحج)، ئەی خەڵکینە: نموونەیەك هێنراوەتەوە چاك گوێی بۆ بگرن" بەڕاستی ئەوانەی کە هاناو هاواریان لێدەکەن لەجیاتی خوا، هەرگیز ناتوانن تاکە مێشێك دروست بکەن، هەرچەندە بۆ ئەو کارە کۆببنەوە و (یارمەتی یەکتریش بدەن) و ئەگەر مێشەکە شتێکیان لێ بفڕێنێت، ناتوانن لێی بسەننەوە، داواکارو داوالێکراو هەردووکیان لاواز و بێ دەسەڵاتن .

سەرجەم ئەم خودایانە دەستەوسانن لەدروستکردنی مێشولەیەك. لەوەش کاریگەرتر ئەگەر مێشولە شتیکیان لێ داگیر بکات و بیانەوێ لێی بستێننەوە هەرگیز ناتوان، لەگەڵ ئەوەی کە مێشولە لاوازترین و بێهێزترین بەدیهێنراوی خودایە. وەك دەفەرموێ:( وَإِنْ يَسْلُبْهُمُ الذُّبَابُ شَيْئًا لَا يَسْتَنْقِذُوهُ مِنْهُ) ئەگەر مێشەکە شتێکیان لێ بفڕێنێت، ناتوانن لێی بسەننەوە.

---

٣٩- أخرجه البخاري في صحيحه، كتاب التوحيد، باب قول الله تعالى (والله خلقكم وما تعبدون) الصافات ٩٦،(ﷺ)٧١٣٠.

٣-خودای گەورە ڕوونی کردۆتەوە کە ئەوبت و پەیکەرانە مرۆڤ خۆی بەدەستی خۆی دروستیکردوون ئیتر چۆن شتێك دەپەرستن کە بەدەستی خۆیان دروستیان کردوە؟! ئەمە شتێکی سەرسوڕهێنەرەی! ئەمە هەمان ئەو بەڵگەیە کە ئیبراهیم پێغەمبەر (علیە السلام) ئامـاژەی پێکـردو بەگەلەکەی وت: ﴿ قَالَ أَتَعْبُدُونَ مَا تَنْحِتُونَ ﴿٩٥﴾ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾ ﴾ (الصافات)، ئەویش پێی وتن: باشە، ئایا ئەو پەیکەرانەی خۆتان دایدەتاشن، دەیپەرستن؟!

لەکاتێکدا خوا بەدیهێنەری ئێوەیش و ئەم بتانەشە کە دروستتان کردوون (نەشیانتوانی بەرگری لە خۆیان بکەن. ئەوانەبەڵگەی دەمکوتکەرو سەلمێنەرن. لەو بەڵگانەی تریش:

﴿ أَيُشْرِكُونَ مَا لَا يَخْلُقُ شَيْئًا وَهُمْ يُخْلَقُونَ ﴿١٩١﴾ وَلَا يَسْتَطِيعُونَ لَهُمْ نَصْرًا وَلَآ أَنفُسَهُمْ يَنصُرُونَ ﴿١٩٢﴾
وَإِن تَدْعُوهُمْ إِلَى ٱلْهُدَىٰ لَا يَتَّبِعُوكُمْ سَوَآءٌ عَلَيْكُمْ أَدَعَوْتُمُوهُمْ أَمْ أَنتُمْ صَـٰمِتُونَ ﴿١٩٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ
مِن دُونِ ٱللَّهِ عِبَادٌ أَمْثَالُكُمْ فَٱدْعُوهُمْ فَلْيَسْتَجِيبُوا۟ لَكُمْ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿١٩٤﴾ أَلَهُمْ
أَرْجُلٌ يَمْشُونَ بِهَآ أَمْ لَهُمْ أَيْدٍ يَبْطِشُونَ بِهَآ أَمْ لَهُمْ أَعْيُنٌ يُبْصِرُونَ بِهَآ أَمْ لَهُمْ ءَاذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا قُلِ
ٱدْعُوا۟ شُرَكَآءَكُمْ ثُمَّ كِيدُونِ فَلَا تُنظِرُونِ ﴿١٩٥﴾ إِنَّ وَلِـِّۧىَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْكِتَـٰبَ وَهُوَ يَتَوَلَّى ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿١٩٦﴾
وَٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَسْتَطِيعُونَ نَصْرَكُمْ وَلَآ أَنفُسَهُمْ يَنصُرُونَ ﴿١٩٧﴾ وَإِن تَدْعُوهُمْ إِلَى ٱلْهُدَىٰ
لَا يَسْمَعُوا۟ وَتَرَىٰهُمْ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ وَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ ﴿١٩٨﴾ ﴾ (الاعراف)

ئایا کەسێك یان شتێك دەکەنە شەریك و هاوبەش کە ناتوانێت هیچ شتێك دروست بکات، لەکاتێکدا خۆشیان دروستکراون و (هیچیان بەدەست نیە)...ئەوانە ناتوانن سەرکەوتن بەوان ببەخشن و ناشتوانن یارمەتی خۆیان بدەن و بەرگریی لە خۆیشیان بکەن.ئەگەر بانگیشیان بکەن بۆ ڕێبازی هیدایەت، ئەوە شوێنتان ناکەون، چوونیەکیشە بۆتان ئایا بانگتان کردبن، یان ئێوە بێ دەنگ بن (ناتوانن بیانهەژێنن ئەگەر خوا ویستی

لەسەر نەبێت).بەڕاستی ئەوانەی ئێوە هاواریان لێدەکەن جگەلە خواو لێیان دەپاڕێنەوە، چەند بەندەیەکی وەك ئێوەن (هیچیان بەدەست نیە) دە هاواریان لێ بکەن، بابێن بەدەمتانەوە، ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن (لەو داوایەتاندا).ئایا ئەو پەرستراوانە قاچیان هەیە پێی بڕۆن بەڕێوە؟ یان دەستیان هەیە ڕای بوەشێنن و ئازاری نەیارەکانی پێ بدەن؟ یاخود چاویان هەیە پێی ببینن؟ یاخود گوێیان هەیە پێی ببیستن؟ ئەی محمد پێیان بڵێ: داوا لە پەرستراوەکانتان بکەن و چیتان لە دەست دێت لە پیلان گێڕان بیکەن و مۆڵەتم مەدەن... (هەروەها بڵێ): بەڕاستی پشت و پەنای من ئەو خوایەیە کە قورئانی دابەزاندوەو لەکاتێکدا ئەو زاتە سەرپەرشتی چاکان و پاکان دەکات.ئەوانەی کە ئێوە جگە لە خوا هاناو هاواریان بۆ دەبەن ناتوانن سەرکەوتوتان بکەن، (تەنانەت) ناتوانن یارمەتی خۆیشیان بدەن.خۆ ئەگەر بانگیان بکەیت بۆ ڕێبازی هیدایەت، ئەوە (بانگەوازت) نابیستن (چ جای ئەوەی یارمەتیشت بدەن)، تۆ دەیانبینیت ئەوان سەیرت دەکەن، لەکاتێکدا کە نابینن ئەو خودایەی کە پێویستە مرۆڤ باوەڕی پێی هەبێت و بیپەرستێت خودای بەدیهێنەرە، ئیتر ئەو موشریکانە چۆن بیردەکەنەوە کە خودایەك دەکەن بەشەریکی خودا کەتوانای دروستکردنی هیچ شتێکی نیە. تەنانەت خۆشی دروستکراوە، مرۆڤ بە دەستی خۆیان دروستی دەکەن و دەیکەنە خودا ؟! ئایا ئەوە مەنتیقە کە عەقڵ و سروشتی ڕاست و دروست قەبوڵی بکات؟! پاشان سیاخی گفتوگۆکان واتای دیکە هەڵدەگرن حاڵی ئەو بتانەی کە موشریکەکان دەیپەرستن لێکدانەوەو ڕوونی دەکاتەوە، ئەوانە توانای بەرگری کردنی خۆیان نیە کاتێك دەستدرێژی دەکرێتە سەریان چ جای بەرگری کردن لە کەسانی تر، ئەوان گوێیان لە هاواری کەس نیە ، ئیتر بیدوێنی و نەیدوێنی ئەنجامەکەی یەك شتە، پاشان قورئان بڕیار لەسەر ڕەوای ئەو خودا دەستکردانە دەدات ئەوانە (عِبَادٌ أَمْثَالُكُمْ) واتە ئەوانە هاوشێوەی ئێوە بەندەن.

ئایا ئەم دروست کراوانە قاچ یا دەست یا چاو یا گوێیان هەیە پێی بڕۆن یان دەستی لێ بدەن یان ببینن یان گوێ بگرن؟!

ئاخۆ ئەوانەی دەیانپەرستن لەبەر چ شتێك دەیانپەرستن لا کاتێکدا ئەوان بەو دەستەوسانییەوە دەیانبینن؟!

دواتر گوتارەکە ڕوو لە پێغەمبەرﷺ دەکات بەوەی لەڕوویاندا بووەستێتەوە کە بتوانن بچوکترین زیانی پێ بگەیەنن لە ڕێگەی وتەکانیانەوە.

ئەوان هەڕەشەیان لە پێغەمبەرﷺ دەکرد بەوەی کە ئەو خودا دەستکردانە زیانی پێ دەگەیەنن لە ئەنجامی هێرش کردنە سەریان–خودای گەورە پێی دەفەرموێ:– ئەی محمد پێیان بلێ:– پیلانەکانتان ئاشکرا بکەن ئەو پیلانانەی کە هەڕەشەی پێ دەکەن و دوا مەکەون واتە خاوەخاو مەکەن و نیشانم بدەن بزانم خواکانتان چیان لەدەست دێت؟

خودا بۆ خۆی پشتگیری لە من و شوێنکەوتوانم دەکات و دەمانپارێزێت و چاودێریمان دەکات ، بەڵام خوداکانی ئێوە توانای بەرگری کردنی نیە لێتان ، ئەگەر خودا بیەوێ زیانتان پێ بگەیەنێ، چونکە توانای بەرگریکردنی لە خۆشی نیە لەبەرئەوەی نابینێ و نابیستێ بۆیە شێیەنی پەرستن و هاوار لێ کردن نیە[٢٠]

٤– لە بەڵگە ڕوون و ئاشکراکان لەسەر تاك و تەنهایی و پەروەردگاریێتی خودا و درۆی موشریکەکان لەوەی کە دروستی دەکەن و هەوڵی بۆ دەدەن – جگە لەوەی کە باسمان کرد– ئەو بەڵگەی کە (إبراهیم )(علیه السلام) خستییە بەردەست گەلەکەی کاتێك مشت و مڕی لەگەڵ دەکردن لەسەر شەریك بۆ خودا قەراردانیان وەبیری دەهێنانەوە لەو بەڵگە ئاشکرایانەش لەسەر پوچەڵی ئەو خودایانەی کە دەیپەرستن ئەوەیە کە هیچ کاریگەرییەکیان نیەو ئەویش لێیان ناترسێ و گوێسیان پێ نادات.

---

٢٠– رکائز الایمان ـ محمد قطب ـ مرجع السابق ص٦٧–٦٨

(إبراهيم)(عليه السلام) داوا له گەلەکەی دەکات که له رێگەیه بتەکانیانەوه پیلانێکی بۆ بگێڕن ئەگەر توانای پیلانیان هەیه، داواشدەکات که پەله بکەن له جێ بەجێ کردنیداو با چاوەڕێ نەکەن ، وەك خودای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَحَآجَّهُۥ قَوْمُهُۥ قَالَ أَتُحَٰٓجُّوٓنِّى فِى ٱللَّهِ وَقَدْ هَدَىٰنِ ۚ وَلَآ أَخَافُ مَا تُشْرِكُونَ بِهِۦٓ إِلَّآ أَن يَشَآءَ رَبِّى شَيْـًٔا ۗ وَسِعَ رَبِّى كُلَّ شَىْءٍ عِلْمًا ۗ أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ ﴿٨٠﴾ ﴾(الانعام)، (کەچی قەومە نالەبارەکەشی) کەوتنە موجادەلەو دەمەدەمێ دژی (له وەڵامیاندا ئیبراهیم وتی): ئایا ئێوه دەربارەی خوای (تاکو تەنها) لەگەڵ مندا دەمەدەمێ و موجادەله دەکەن؟ لەکاتێکدا ئەو بەڕاستی هیدایەتی داوم و ڕێبازی ڕاستی نیشانداوم و ناشترسم لەو شتانەی که ئێوه دەیکەن بەشەریکی خوا (چونکه ناتوانن زیانێکم پێ بگەیەنن) مەگەر ویستی پەروەردگارمی لەسەربێت و بیەوێت شتێکم بەسەردا بهێنێت، پەروەردگارم بەزانست و زانیاری هەموو شتێکی گرتۆتەوە، ئایا ئەوه بیرناکەنەوه و یاداوەری وەرناگرن؟

ئەم بەڵگه هاوشێوەی هەمان بەڵگەیه که هود پێغەمبەر (علیه السلام) هێنایەوه بۆ گەلی (عاد) خودای گەورە لەسەر زمانی ئەو دەفەرموێ: ﴿إِن نَّقُولُ إِلَّا ٱعْتَرَىٰكَ بَعْضُ ءَالِهَتِنَا بِسُوٓءٍ ۗ قَالَ إِنِّىٓ أُشْهِدُ ٱللَّهَ وَٱشْهَدُوٓا۟ أَنِّى بَرِىٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴿٥٤﴾ مِن دُونِهِۦ ۖ فَكِيدُونِى جَمِيعًا ثُمَّ لَا تُنظِرُونِ ﴿٥٥﴾ ﴾ (هود)، ئێمه هیچ نالێین ئەوه نەبێت: وا دیاره هەندێ له خواکانمان بەخراپ دەستیان لێ وەشاندوویت!! هود وتی: دەی من بەڕاستی خوا دەکەم بەشایەت و ئێوەش بەشایەت بن که بێگومان من بەریم لەوەی ئێوه دەیکەنه شەریك و هاوەڵ بۆ خوا...جگه له خوا خۆتان به پەرستراوەکانتانەوه فێڵ و پیلانم لێ بکەن هەر هەمووتان، کەوابوو وەرن هەمووتان کۆببنەوه و نەخشه بکێشن بۆ لەناو بردنم، پاشان مۆڵەتیشم مەدەن!...

هاوشێوەی ئەویش کە دەفەرموێ: ﴿... قُلِ ٱدۡعُواْ شُرَكَآءَكُمۡ ثُمَّ كِيدُونِ فَلَا تُنظِرُونِ ﴿١٩٥﴾﴾ (الاعراف)، ئەی محمد! پێیان بڵێ: داوا لە پەرستراوەکانتان بکەن و چیتان لە دەست دێت لە پیلان گێڕان بیکەن و مۆڵەتم مەدەن...

واتە :- لە ڕێگەی خوداکانتانەوە داوای پشتیوانی بکەن لە دژی من و بۆ چاو تروکاندنێکیش دوا مەکەون و هەموو هەوڵەکانتان بخەنە کار، بۆیە پاش ئەوە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ وَلِـِّۧيَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي نَزَّلَ ٱلۡكِتَٰبَۖ وَهُوَ يَتَوَلَّى ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٩٦﴾﴾(الاعراف)،

(هەروەها بڵێ): بەڕاستی پشت و پەنای من ئەو خوایەیە کە قورئانی دابەزاندوەو لەکاتێکدا ئەو زاتە سەرپەرشتی چاکان و پاکان دەکات.

واتە :- خوادام بەسە کە پستیوانم بێ و بۆ لای ئەو دەگەڕێمەوە، ئەو چاودێریکەرمە لە دونیاو دوارۆژداو لە هەموو کاریکی باشدا.

٥- قورئان داوا لەو موشریکانە دەکات کە هەمان چەشنی خودا شتانێك دەپەرستن لەبەرامبەر خودادا باباسی بکەنکێ فەرمانی پێ کردوون وڕێنمونی کردوون بۆ ئەم کارە؟! یاخود کێ بانگی کردوون بۆ پەرستنی ئەو خودانە؟! یاخود ئەم کارە پێشنیاری خۆیانە بۆ خۆیان ؟! ئایا بەڵگەو هۆکارێك یان ڕوووونکردنەوەیەکیان هەیە لەسەر ئەوەی کە دەیلێن، یان ئەوەتا کتێبێکیان لەبەردەستە لەو کتێبانەی کە بۆ پێغەمبەران (علیهم السلام) دابەزیوەو فەرمانیان پێ دەکات بە پەرستنی ئەو بت و پەیکەران ؟! خودای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ أَرَءَيۡتُم مَّا تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَرُونِي مَاذَا خَلَقُواْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِ أَمۡ لَهُمۡ شِرۡكٞ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِۖ ٱئۡتُونِي بِكِتَٰبٖ مِّن قَبۡلِ هَٰذَآ أَوۡ أَثَٰرَةٖ مِّنۡ عِلۡمٍ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٤﴾﴾ (الاحقاف)، ئەی محمد ﷺ هەواڵم بدەنێ : ئایا سەرنجتان داوەلەو شتانەی کەلەجیاتی خوا دەیانپەرستن و، هاناو هاواریان بۆ دەبەن ؟ باشەئاخر ئەوانەچ شتێکیان لەزەویدا بەدیهێناوە، با پێشانم بدەن !... یاخود ئەوانە لەهەڵسوڕانی ئاسمانەکاندا هیچ هاوبەشی

وهاوکاریەکیان هەیە؟!.. ( ئەگەر دەڵێن: بەڵێ ) دەکەواتە کتێبێکی ئاسمانیم نیشان بدەن کەپێش ئەم قورئانە بۆتان هاتبێت، یان دیاردەیەکی زانستی لەو ڕووەوە بیسەلمێنێت ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن

هەروەها دەفەرموێ: ﴿ أَمْ لَهُمْ سُلَّمٌ يَسْتَمِعُونَ فِيهِ فَلْيَأْتِ مُسْتَمِعُهُم بِسُلْطَانٍ مُّبِينٍ ﴿٣٨﴾ ﴾ (الطور)، یان ئەوانەپەیژەیان هەیەو پیایدا سەردەکەون، تا گوێ لەنهێنیەکانی ئاسمان بگرن ؟! دەبا گوێگرەکانیان بەڵگەیەکی ئاشکرا پەیدا بکەن (ئەوسا ملەجەڕی بکەن).

واتە با ئەو کەسانەی کە گوێیان بۆ دەگیرێ بەڵگەیەکی ئاشکرا بهێنن بۆ ڕاستکردنەوەی هەڵوێستەکانیان، بێگومان هیچ ڕێگایەکیسییان نیە بۆ ئەوە چونکە لەسەر هیجن و بەڵگەسیان بە دەستەوە نیە بۆیە خودای گەورە لە جێگایەکی تردا لەسەر زاری هاوەڵانی ئەشکەوت کە باس لە شەریك بۆ خوا قەرار دانی گەلەکەیان کرد وتیان: ﴿ هَٰؤُلَاءِ قَوْمُنَا اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ آلِهَةً ۖ لَّوْلَا يَأْتُونَ عَلَيْهِم بِسُلْطَانٍ بَيِّنٍ ۖ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا ﴿١٥﴾ ﴾ (الکهف)، ئا ئەوانە قەومەکەی خۆمانن (لە ڕێبازی ڕاست لایانداوە لەجیاتی خواناسی) شتی تریان کردووە بە خوای خۆیان، دەبا بەڵگەیەکی ئاشکراش بهێنن لەسەریان، جا کێ ستەمکارترە لەوەی کە درۆ بۆ خوا هەڵدەبەستێت؟!

واتە بۆ پشت ڕاستکردنەوەی ئەوەی کە دەیڵێن ناکرێ بەڵگەیەکی ڕاست و ئاشکرا بخەنە ڕوو؟! بەڵام ئەوان درۆزن و ستەمکارن لەوە کە دەیڵێن.

**بەکورتی:**

– ئایا دەکرێ ئەم بونەوەرە مەزنە بەبێ بەدیهێنەرێك بەدیهێنرابێت ئەی مرۆڤ لەم بوونەوەرەدا بەدیهێنراون یان بەدیهێنەرن؟!

– ئەگەر دروست بوونی بوونەوەر بەبێ بەدیهێنەرێك مستحیل بێ، ئیتر چۆن وا بیردەکەنەوە کەلەلایەن چەن خودایەکەوە بەدی هێنراوە؟! وێڕای ئەوەی ئەو خودایانە بۆ خۆیان دەستکردی مرۆڤن.

– بت و پەیکەرەکان دەسەڵاتیان بۆ بەرگری کردن لە خۆشیان نیە ، ئیتر چۆن دەبنە تکاکار لای خودا بۆ ئەو کەسانەی کە دەیان پەرستن؟!



## گومانی شەشەم

## بانگەشە کردن بۆ ئەوەی کە خودا (جل جلالە) مەسیحی کوڕی مەریەمە [٢١]

**ناوەڕۆکی گومانەکە:**

گاورەکان بەهاو نرخێکی زۆر بۆ عیسای کوڕی مەریەم(علیها السلام) دادەنێن کە ئەو بەندەیەکە لە بەندەکانی خودا و دروستکراویکە لە دروستکراوەکانی بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ئەو خۆی خودایە ، بەرزی و گەورەیی بۆ خودا لەوەی کە دەیڵێن ، پێدەچێت ئەو هۆکارەی ئەو وەهم و خەیاڵەی لای ئەوان دروست کردبێت ئەو موعجیزانەیە کە خودا لەسەر دەستی ئەو جێ بەجێی کردوون: لەزیندوکردنەوەی مردوو، چاککردنەوەی گەروگول.

بەهەمان شێوە موعجیزەی لەدایك بوونیش لە دایکێك بەبێ باوك.

خودا (جل جلالە) دەفەرموێ : ﴿ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ عُزَيْرٌ ٱبْنُ ٱللَّهِ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَى ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ ٱللَّهِ ۖ ذَٰلِكَ قَوْلُهُم بِأَفْوَٰهِهِمْ ۖ يُضَٰهِـُٔونَ قَوْلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَبْلُ ۚ قَٰتَلَهُمُ ٱللَّهُ ۚ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾ (التوبة).

جولەکە وتیان: عوزەیر کوڕی خوایە، گاورەکانیش وتیان: مەسیح کوڕی خوایە ! ! ئا ئەو بوختانە (نابەجێیانە) قسەی ئەوانە و بەدەم دەیڵێن و لێی تێناگەن (بیرێك ناکەنەوە، تیافکرن) ئەو گوفتارەیان لاسایی کردنەوەی ئەوانەیە کە پێشتر بێ باوەڕ بوون (لەوەدا کە دەیانوت فریشتەکان کچی خوان)، دەك بەکوشت چن و خوا لەناویان بەرێت، ئاخر ئەم بوختانە ناڕەوایانە چۆن هەڵدەبەستن.

---

٢١- الأيتان اللتان وردت فيهما الشبهة: (المائدة(١٧ – ٧٣). الأيات التي ورد فيها الرد على الشبهة (المائدة(١٧) ، مريم (٣٠) ، ال عمران (٥٩ – ٦٤). ((أكذوبة ألوهية عيسى)) طالع: الشبهة السابقة والثمانين من الجزء العاشر (الأنبياء والرسل٣ ). وفي (إبطال القران الكريم لاعتقاد النصارى ألوهية عيسى ومريم)) طالع: الشبهة الحادية والستين، من هذا الجزء. وفي ((تهافت الاستدلال بخلق عيسى للطير على ألوهية)) طالع: الشبهة الثامنة والثمانين، من الجزء العاشر (الأنبياء والرسل٣).

**ڕێگاکانی پوچەڵکردنەوەی گومانەکە:**

١- ئەم بانگەشە گەورەترین بەڵگەیە لەسەر گومڕایی و نەفامی گاورەکان.

٢- بڕیاردانی مەسیح (علیە السلام) لەسەر بەندایەتی خۆی بۆ خودا(جل جلالە)لەسەر لانکەکەی و لەڕۆژی دوایدا، گەواهیدەرن لەسەر ئەو بوهتانەیان.

٣- مەسیح (علیە السلام) پەیامبەری خودایەو خواردن دەخوات هاوشێوەی دروستکراوەکانی ترە ئیتر چۆن دەبێتە خودا؟!

٤- هیچ کەس توانای ڕێگری کردنی نیە لە خودا ئەگەر بیەوێت مەسیح و دایکی و ئەوانەشی لەسەر زەویدان لەناویان ببات.

٥- ئەو شتە سەیرو سەمەرانەی لەسەر دەستی عیسا(علیە السلام) ڕوویانداوە بە فەرمان و چاودێری خودا بووە بۆ بەڕاست گێڕانی پێغەمبەرایەتی ئەو ، ئەو شتانە دەستکردی عیسا (علیە السلام ) نەبوون ئەوەس لەسەر زاری خۆی کەلە قورئاندا هاتووە.

٦- هاوشێوەی عیسا (علیە السلام) لە موعجیزەی دروستکردنیدا هاو شێوەی ئادەم پێغەمبەرە (علیە السلام) لە کاتێکدا کەس باسی خوایەتی ئادەم (علیە السلام) ناکات.

**درێژەی بابەتەکە:**

**یەکەم: ئەم بانگەشە بەڵگەیە لەسەر گومڕایی گاورەکان.**

ئەم بانگەشە یەکێکە لە ئابڕووبەرەکانی خاوەن پەیامە ئاسمانییەکان لە گاورەکان کۆمەڵێك لەوانە کە (یەعقوبیەکانن)[٢٢] دەڵێن : مەریەم خودایەکی بەدونیا هێناوە.

---

٢٢- اليعقوبية: فرقة من النصارى، وهم أتباع يعقوب البرادعي الذي عاش في الشام في القرن السادس الميلادي، ويقولون باتحاد اللاهوت والناسوت ويعرفون بـ (أصحاب الطبيعة الواحدة).

(مولکانیەکانیش)[٢٣] دەڵێن : خودا لە عیسادا تواوەتــەوەو بوونەتــە زاتێـك ،خوداش(جـل جلاله)لەسەر زاری عیسا (علیه السلام) وەڵامیان دەداتــەوەو دەفــەرموێ: ﴿ لَقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ وَقَالَ الْمَسِيحُ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ اعْبُدُوا اللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمْ إِنَّهُ مَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿٧٢﴾ ﴾ (المائدة)، سوێند بەخوا بەڕاستی، ئەوانە بێ باوەڕ بوون کــە وتیـان: خـوا هــەر مەسـیحی کـوڕی مەریەمــە (بەمــەرجێك) مەسـیح وتوویــەتی: ئــەی نــەوەی ئیســرائیل، ئــەو خوایــە بپەرســتن کــە پــەروەردگاری مــن و پــەروەردگاری ئێوەشــە و دڵنیــابن ئــەوەی شــەریك و هاوبەش بۆ خوا بڕیار بدات، ئەوە بێگومان خوا بەهەشتی لەسەر حەرامکردووە و شوێن و جێگاو سەرەنجامی ئاگرە، ئەوسا ئەوستەمکارانە هیچ جۆرە پشتیوانێکیان نی یە (کــەس ناتوانێت فریایان بکەوێت).

ئــەوەتا عیســا(علیــە الســلام ) خــۆی وەڵامیــان دەداتــەوە بــەم وتانــە ، ئــیتر چــۆن بانگەشەی خودایەتی دەدەنە پاڵ کەسێك کە خۆی دان وەدا دەنێت کە بەنــدەی خودایــە هاوشێوەی ئــەوان؟! ئــەوە بەڵگەیــەکی ســەلمێنەرە لەســەر خراپــی قســەی گاورەکــان ، چونکە ئەو(علیه السلام) جیاوازی نەکردووە لە نێـوان خـۆی لەبەرامبــەر کەســانی تــردا و ئەویش بەندەیەکە لە بەندەکانی خودا (جل جلاله).

بۆیە یەکەم وشە کە دەرکاندی و لەسەر زاری (علیه السلام) هاتــە دەرێ کاتێـك کــە لــە لانکەکەیدا بوو: ﴿ قَالَ إِنِّي عَبْدُ اللَّهِ آتَانِيَ الْكِتَابَ وَجَعَلَنِي نَبِيًّا ﴿٣٠﴾ ﴾(مریم)، (ئینجا منداڵی ساوا هاتە گفت و بەدەنگە ناسکەکەی) وتی: بەڕاستی من بەندەی خوام، کتـێبی ئینجیلــی پــێ بەخشیووم و کردوومی بە پێغەمبەری خۆی، نــەیگووت مــن خــودام، یــان کــوری خــودام، بەڵکو بەندایەتی خۆی بۆ خودا چەسپاندو پێغەمبەرایەتیش بۆ خۆی.

---

٢٣- الملكانية: فرقة أخرى من النصارى -، وهم أتباع ملك الروم، وهـم يقولـون ان الله اسم لثلاثـة معـان، وإن المسيح له طبيعتان: طبيعة بشرية وطبيعة إلهية (ناسوت ولاهوت).

**دووەم: بڕیاردانی مەسیح (علیه السلام) لەسەر بەندایەتی خۆی بۆ خودا (جل جلاله) :**

خودا(جـل جلاله)لـەڕۆژی دوایـدا پرسـیار لـە مەسـیح دەکـات لەبـەردەم هـەموو دروستکراوەکانیدا بە ئامادەبوونی ئەوانەی عیساو دایکیان بە دوو خودا دانـاوە جگـە لـە خودای ڕاستەقینە و پێی دەڵێت لە کاتێکدا خۆی زاناو ئاگادارە بە وەڵامەکەی:

﴿ وَإِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَـٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ءَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِى وَأُمِّىَ إِلَـٰهَيْنِ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۖ قَالَ سُبْحَـٰنَكَ مَا يَكُونُ لِىٓ أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِى بِحَقٍّ ۚ إِن كُنتُ قُلْتُهُۥ فَقَدْ عَلِمْتَهُۥ ۚ تَعْلَمُ مَا فِى نَفْسِى وَلَآ أَعْلَمُ مَا فِى نَفْسِكَ ۚ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّـٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴿١١٦﴾ مَا قُلْتُ لَهُمْ إِلَّا مَآ أَمَرْتَنِى بِهِۦٓ أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبَّكُمْ ۚ وَكُنتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَّا دُمْتُ فِيهِمْ ۖ فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِى كُنتَ أَنتَ ٱلرَّقِيبَ عَلَيْهِمْ ۚ وَأَنتَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿١١٧﴾ ﴾ (المائدة)،

کاتێکیش خوا (هەر لە قیامەتدا) فەرمووی: ئەی عیسای کوڕی مەریـەم، ئایـا ئـەوەتۆ بەخەڵکیت وتوە: منیش و دایکیشم بە دوو خوا دابنێن لە خـوار خـوای پـەروەردگارەوە؟ عیسا لە وەڵامدا وتی: پاکی و بێگەردی و بێ هاوەڵی شایستەی تۆیە، بۆم نیە من شـتێك بڵێم بۆ خۆم کە مافی من نەبێت؟! (چۆن حەق بەخۆم دەدەم شتی وا بێت بـە زارمـدا؟!) خۆ ئەگەر شتی وام وتبێت ئەوە بەڕاستی تـۆ دەیزانیـت و لێـت شـاراوە نیـە، چـونکە تـۆ دەزانیت بەهەرچی لە دڵ و دەروونمدا هەیە، بەڵام من نازانم بەوەی کە لە دەریـای علـم و زانستی بێ پایانی تۆدا هەیە، چونکە بەڕاستی هەر تۆ زانا و شارەزای نهێنی و پـەنهانی. (بێگومان تۆ چاك دەزانیت): من هیچ شتێکم پێ نەوتوون جگـە لـەوەی کـە تـۆ فـەرمانت پێداوم، ئـەویش ئەوەیـە: تـەنها خـوا بپەرسـتن کـە پـەروەردگاری مـن و پـەروەردگاری ئێوەشە و من شایەت بووم بەسەریانەوە هەتا لەناویاندا بووم، ئینجا کاتێك منـت مـران و گیانت کێشام، ئیتر ئەوە هەر خۆت چاودێر و ئاگادار بوویت لێیان و هەر تـۆش شـایەتیت بەسەر هەموو شتێکەوە.

له (التحرير و التنوير)دا هاتووەو دەڵێ : ﴿ وَإِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ءَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَٰهَيْنِ مِن دُونِ ٱللَّهِ ...﴿١١٦﴾ ﴾ (المائدة)، وتەیەکە لە رۆژی دوایدا دەیڵێت، ئەمەش بنەمای تێکشکاندنی گاورەکانە دوای ئەوەی لە تێکشکاندنی جولەکەکان تەواو بوو، تێکشکاندنی گاورەکان لەم ئایەتانەدا جێگەی مەبەستە لەم ئایەتانەدا کە دەفەرموێ: ﴿ ۞ يَوْمَ يَجْمَعُ ٱللَّهُ ٱلرُّسُلَ فَيَقُولُ مَاذَآ أُجِبْتُمْ ۖ قَالُوا۟ لَا عِلْمَ لَنَآ ۖ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴿١٠٩﴾ ﴾ (المائدة)، رۆژێك دێت، خوا هەموو پێغەمبەران کۆدەکاتەوە، ئیجا پێیان دەفەرموێت: چۆن وەڵامتان درایەوەو خەڵکی هەڵوێستیان چۆن بوو بەرامبەرتان؟ تا چ رادەیەك هاتن بەدەمتانەوە؟ (لە سامناکی ئەو رۆژە و بەهۆی دڵنیاییان لە زانیاری بێ سنووری خوایی) وتیان: ئێمە نازانین و هیچ شارەزاییەکمان نیە، بەراستی خوایە تۆ هەر خۆت ئاگات لە هەموو نهێنی و شاراوەکانە و بە هەموو پەنهانێك دەزانیت.

پرسیارکردن لێرەدا وەك هەمان پرسیارکردنەلە پێغەمبەران (مَاذَا أُجِبْتُمْ) خودا بۆ خۆی دەزانێت کە عیسا (علیە السلام) ئەوەی نەگوتووە، بەڵام دەیەوێت درۆی بێباوەرانی گاور ئاسکرا بکات. واتاکەسی ئەوەیە ئەو خۆی خاوەنی ئەو قسە نەبوایە ، ئیتر هیچ بیانوێك نیە بۆ ئەوی دەیڵێن، چونکە ئەوان وا نیشانی دەدەن کە شوێن قسەو رێنماییەکانی عیسا دەکەون ، ئەوگەر ئەو قسەی بکردایە دەیووت: من و دایکم بکەنە خودا ، بۆیە دەستەواژەکە بەم دوو زاراوە هاتووە لە ئایەتەکەداو مەبەستیش بە خەڵك شوێنکەوتوانی ئاینەکەیەتی. وەڵامی عیسا(علیە السلام ) کە دەڵێ: (سُبْحَانَكَ) پاك و بێگەردی بۆ خودا لە ناوەرۆکی ئەو قسانەدا ئەسەلمێنێ، دەستپێشخەری کردنی لە پاك راگرتنی خودا زۆر گرنگترە لە تەبەراکردنی خۆی، چونکە ئەگەر خودا بە پاك رادەگرێ لەوکارە ، گومانی تێدانییە کە هەرگیز فەرمان بەوکارە ناکات کە بریتییە لە پێشەکییەك بۆ پاکانە پاشان تەبەرای خۆی دەکات فەرموی: ﴿ مَا يَكُونُ لِيٓ أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِي بِحَقٍّ ﴿١١٦﴾ ﴾

ڕستەی : (مَا يَكُونُ لِيَ ) دەستپێکەرەوەیە چونکە وەڵامی پرسیارە وە ڕستەی: (سُبْحَانَكَ) ئامادەکارییە، وە کە دەڵێ : (مَا يَكُونُ لِي) موبالەغەیە لە تەبەڕاکردنی خۆی لەوە، واتـە: شتێك کە مافی من نییە من قسەم نیە لەسەری، پیتی (لام) لە ئایەتەکـە کـە دەفـەرموێ : (مَا يَكُونُ لِي) بۆ لێکۆڵینەوەیە، واتە مافی ئەوەم نییە کە بیڵێم، ئەم بەهێزترو کاریگەرترە لەوەی کە بفەرموێ : ئـەم وتـووە چـونکە ئـەو ڕەتـی کردۆتـەوە کـە مـافی ئـەو قسـەیەی هەبێت.

پیتی (بیَ) لە ئایەتەکەدا (بِحَقٍّ ) زیادەیە لە خەبری (لَيْسَ ) بۆ دڵنیایی نکوڵی لیَ کردن کە (لَيْسَ) ئاماژەی لەسەر کردووە. ئەوەی لەو فەرمودە وەردەگیریَ لـە زانسـتی کەلامـدا ئەوە بە دڵنیایی ئەو کارە مافی ئەو نیە چونکە نکوڵی دەکات کە ڕێگەی پیَ بدریَ وتەیەك بڵێت کە مافی ئەو نییەو دەزانیَ کە ئەو مافی ئەوەی نیە و هەر لەبەر ئەوەشـە کـە ئـەوەی نەگوتووە، ئەمە دڵنیاکردنێکە لەوپەڕی ئاستی ڕەوانبێژی و دڵنیا کردندا.

پاشان لە تەبەڕاکردنی خۆیدا (علیه السلام) بڵندتر دەبێتـەوەو دەفـەرموێ: ﴿إِن كُنتُ قُلْتُهُۥ فَقَدْ عَلِمْتَهُۥ ﴿١١٦﴾﴾ ڕسـتەکە دەسـتپێکەرەوەیە چـونکە بەڵگـەو نیشـانەیە لەسـەر نـاوەڕۆکی ڕسـتەکەی پێشـوو، وەك ڕونکردنەوەیـە بۆیـە درێـژەی پێـداوەو بەڵگـەی هێناوەتەوە لەسەر نکوڵی کردنی لەوە کە وتبێتی و خودا ئاگادارە کـە ئـەو نـەیگوتووە ، ئەوەش ئەوە دەهێنێتە دی کە نەیگوتووە بۆیە بابەتەکەی گێڕاوەتەوە بۆ عیلمی خودا.

ئەمە وەك وتەی عەرەبەکانە کە دەڵـێن : خـودا دەزانـیَ کـە نـەمگوتووە لەبـەر ئـەوە فەرموی : (تَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِي) ڕسـتەی (تَعْلَـمُ مَـا فِـي نَفْسِـي) ڕونکردنەوەیـە بـۆ ڕسـتەی مەرج (شرط) : (إِنْ كُنْتُ قُلْتُهُ فَقَدْ عَلِمْتَـهُ) بۆیـە درێـژەی پێـدەدات ... وتاکـەش لێـرەدا ئەوەیە دەزانیَ بیروبۆچونم چۆنە ، واتە : دەزانیَ چی دەزانم چونکە معلومە کـە نـەفس جێگەو شوێنی زانستەکانە.

وەفەرموودەی : (وَلَا أَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِكَ) ڕەخنەگرتنێکە سەرچاوەی گرتوە لە (تَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِي) بە مەبەستی کۆکردنەوەی هەردوکارەکە لە یەك کاتدا و لە هەموو حاڵەتێکدا، ئەوەش موبالەغەکردنە لە پاك ڕاگرتندا و کاریگەری نیە لەسەر تەبەڕابوون و ڕزگاربوون ، بۆیە ئەو (واو)ە (واو)یکی ڕەخنەگرانەیە ، وە فەرمودەی (إِنَّكَ أَنْتَ عَلَّامُ الْغُيُوبِ). عیلەتە بۆ فەرمودەی : (تَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِي) بۆیە (إِنْ)ەی هێناوە چونکە بەکەڵکە بۆ پاساودان، بەدڵنیای چوار ئامرازی دڵنیاکەی تێدا کۆکردۆتەوە لەگەڵ ڕێگای دەست بەسەراگرتن : وە ڕاناوی جیاکردنەوە کەڵکی بۆ دەست بەسەرداگرتنە. وە (إِنْ) وە شێوەی دەست بەسەرداگرتن، و کۆکردنەوەی نادیارەکان، ونیشانەی سەرسوڕمانە.

پاش ئەوەی عیسا (علیه السلام) تەبەڕای کرد لەوەی کە فەرمانی کردبێ بە ئومەتەکەی بەو شتە کە خستیانە پاڵی و بۆیان دروستکرد، ڕونیکردەوە کە بە پێچەوانەی ئەوە کە فەرمانی پێکردون بەو شێوازەی کە خودا فەرمانی پێکردوە فەرموی(مَا قُلْتُ لَهُمْ إِلَّا مَا أَمَرْتَنِي بِهِ) فەرمودەی : (إِمَا قُلْتُ لَهُمْ إِلَّا مَا أَمَرْتَنِي بِهِ) بەرزبونەوەیە لە وەڵام.

بە پلەی دەست پێکردنەوەی وەڵامی یەکەم، ئەو (مَا يَكُونُ لِي أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِي بِحَقٍّ) وەڵامەکەی لێرەدا ئاشکرا دەکات، چونکە پرسیار لە وتەیەك ، واتە سنورم تێنەپەڕاندوە لەوەی کە فەرمانت پێ کردوم بە گەیاندنی.

و (نْ) ڕونکردنەوەیە بۆ (أَمَرْتَنِي) چونکە فەرمانکردن واتەی وتەی تێدایە جگە لە پیتەکانی، وە ڕستەی (اعْبُدُوا اللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمْ) لێکدانەوەیە بۆ (أَمَرْتَنِي) . بەڵام ووشەی (أَمَرْتَنِي) هەڵبژێردراوە بەسەر وشەی(قلت لي) لەبەر نواندنی ڕێزو گەورەیی زیاتری تێدایە.

پاشان تەبەڕای کرد لەوانەی شوێنی کەوتوون و فەرموی : (وَكُنْتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَا دُمْتُ فِيهِمْ) واتە : بینەرو چاودێربووم بەسەریانەوە لەوەی قسەیەکی ئاوا ناقۆڵا بکەن بەو

مانایەی : کە تۆ منت مراند وەفا بەربەستێك بوو لە نێوانماندا و من بۆم نەبوو رێگری لە گومرابونیان بکەم لەبەرئەوە فەرموی : (كُنْتَ أَنْتَ الرَّقِيبَ عَلَيْهِمْ ) لێرەدا ڕاناوی جیاکردنەوەی هێناوە کە بەڵگەیە لەسەر کورتکردنەوە، واتە : تۆ چاودێربووی نەك من . چونکە لە نێوان من و دونیادا پەیوەندی نەما.

بەو واتایەی : تۆ خۆت ئاگاداری بە حاڵیان و هەرکاتێ بیتەوێ کەسێکیان بۆ دەنێری بۆ ڕێنمایی کردنیان . بێگومان (محمد)ی بۆ ناردن و ڕێنمایی کردن بە هەموو شێوازەکانی ڕێنمایی کردن و ئەوپەری ڕێگاکانی گەیاندنی گرتەبەرو لەدوا ڕۆژدا دەزانرێ حاڵیان چی بەسەردێ.

**سێیەم: عیسا (علیه السلام)بەندەیەکی دروستکراوەو خۆراکی خواردووە:**

قورئانی پیرۆز دوپاتیکردۆتەوە کە عیسا(علیه السلام) پەیامبەرەو پێش ئەویش پەیامبەرانی تر هەبوون، ئەو بەندەیەکی دروتکراوە لە بەندەکانی خودا، هەروەها دایکی ڕاستگۆ بووە خواردنیان خواردووە و پێویستیان پێی بووە، وەك دەفەرموێ: ﴿ مَّا ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ وَأُمُّهُۥ صِدِّيقَةٌ ۖ كَانَا يَأْكُلَانِ ٱلطَّعَامَ ۗ ٱنظُرْ كَيْفَ نُبَيِّنُ لَهُمُ ٱلْـَٔايَـٰتِ ثُمَّ ٱنظُرْ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٧٥﴾ ﴾ (المائدة) مەسیحی کوڕی مەریەم هیچ شتێك نی یە (نە خوایە و نە کوڕی خوایە) جگە پێغەمبەرێکی خوا نەبێت، بە ڕاستی پێش ئەو چەندەها پێغەمبەری تریش ڕابوردوون، دایکیشی ئافرەتێکی زۆر ڕاست و ڕاستگۆیە، هەردووکیان خواردنیان دەخوارد (وەکو هەموو ئینسانێك) سەیر بکە و سەرنج بدە (ئەی محمد ﷺ، ئەی ئیمانداران) چۆن هەموو فەرمان و بەڵگەیەکیان بۆ ڕوون دەکەینەوە، لەوەودوا تەماشاکا چۆن ڕوویان لە حەق وەردەچەرخێنرێت و لەڕاستی لادەدرێن.

ئایا کەسێك حاڵی بەو شێوازە بێت ئەگونجێ بکرێتە خودا؟ ئەکرێ کەسێك بکرێتە خودا کە پێویستی بە خواردن بێت بۆ ئەوەی جەستەی بەهێز بکات ؟! خودای ڕاستەقینە دەوڵەمەندە بەرامبەر هەموو شتەکان ، پێویستی بە هیچ نیەو هاوتاو هاوشێوەی نیەشاعیرەکەش چەند جوان ئەڵێ:

أعُبَّـادَ المَسِيحِ لَنَـا سُؤَالٌ نُرِيدُ جوَابَـهُ مِّمنْ وَعَـاهُ

إذا مـاتَ الإلـهُ بِصُنْعِ قومٍ أَمَاتُوهُ فَمـا هذَا الإلـهُ؟

وَهَـلْ أرضـاه مـا نَـالُوهُ مِنْهُ؟ فَبُشْرَاهمْ إذا نـالُوا رِضَاهُ

وَإِنْ سَخِطَ الـَّذِي فَعَلُوهُ فيـه فَقُوَّتُهُمْ إِذًا أَوْهَـتْ قُـوَاهُ

وَهَـلْ بَقِي الـوُجُودُ بِلاَ إِلـهٍ سَمِيعٍ يَسْتَجِيبُ لَمِنْ دَعَـاهُ؟

وَهَلْ خَلَتِ الطِّبَاقُ السَّبْعُ لَمَّا ثَوَى تَحتَ التُّرَابِ، وَقَدْ عَلاَهُ

وَهَـلْ خَلَتِ الْعَوَالُِم مِن إِلـهٍ يُـدَبِّرهَـا، وَقَـدْ سُمِرتْ يَـدَاهُ؟

وَكَيْفَ تَخَلْتِ الأمْلاَكُ عَنْـهُ بِنَصْرِهِمُ، وَقَـدْ سَمِعُوا بُكَـاهُ؟

وكيف أطاقت الخشبات حمل ال إلـه الحق مشدودا قفاه ؟

وَكَيْفَ دَنَـا الحَدِيدُ إِلَيْـهِ حَتَّى يُخَـالِطَـهُ، وَيَلْحَقَـهُ أذَاهُ؟

وَكَيْفَ تَمكْنَتْ أَيْدِى عِداهُ وطَـالتْ حَيْثُ قَـدْ صَفَعُوا قَفَـاهُ؟

وَهَلْ عَـادَ المَسِيحُ إِلَى حَيَـاةٍ أَمَ المُحْيِى لَـهُ رَب سِوَاهُ؟

وَيَـا عَجَباً لِقَبْرٍ ضَمَّ رَبـا وَأَعْجَبُ مِنـْهُ بَطْنٌ قَدْ حَـوَاهُ

أَقَامَ هُنَاكَ تِسْعاً مِنْ شُهُورٍ لَـدَى الظُّلُمَاتِ مِـنْ حَيْضٍ غِذَاهُ

وَشَقَّ الْفَرْجَ مَوْلُـودًا صَغِيراً ضَعِيفـًا، فَـاتِحاً لِلثَّدْى فَـاهُ

وَيَـأْكُلُ، ثمَّ يَشْرَبُ، ثمـَّ يَأْتِى بِـلاَزِمِ ذَاكَ، هَلْ هذَا إِلـهُ؟

تَعَالَى اللهُ عَـنْ إِفْكِ النَّصَارَى سَيُسْأَلُ كُلُّهُمْ عَمَّـا افْتـرَاهُ

**چوارەم: چارەنوسی مەسیح (علیه السلام) و دایكی بەدەست خودایە تەنها ئەو چۆنی بوێت بڕیار دەدات.**

ئەگەر خودا(جل جلاله) ویستی لەسەربێ مەسیحی كوڕی مەریەم و دایكی لەناوببات و ئەوەشی لەناو زەویدایە ، هیچ كەس بۆی نیە دەست تێوەردان بكات لە ویستی خودادا(جل جلاله)، ئەگەر كەس توانای ڕێگری كردنی نەبوو لەو(جل جلاله)لەو شتانە ، كەواتە هیچ خودایەك نیە جگە لە الله وە هیچ پەروەردگارێك نیە جگە لەو ، وە هیچ پەرستراوێكی ڕاستەقینە نیە جگە لەو، ئەگەر مەسیح خودا بوایە وەك ئەوەی كە گاورەكان دەڵێن ئەبوایە توانای ئەو كارانەی هەبوایە، وە توانای لابردنی كەمترین زیانی هەبوایە لەسەر خۆی ، وە نەیتوانیوە زیان لە خۆی و دایكی دوور بخاتەوە ، خودای گەورە دەفەرموێ:

﴿ لَقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ ۚ قُلْ فَمَن يَمْلِكُ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا إِنْ أَرَادَ أَن يُهْلِكَ الْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُ وَمَن فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا ۗ وَلِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ۚ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ ۚ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ (١٧) ﴾ (المائدة)،

سوێند بێت بێگومان ئەوانە بێ باوەڕ بوون كە وتیان: بەڕاستی خوا، هەر مەسیحی كوڕی مەریەمە، (ئەی محمد ﷺ) پێیان) بڵێ: ئەگەر خوا بیەوێت مەسیحی كوڕی مەریەم و دایكی و هەرچی لەسەر زەویدا هەیە لەناوی بەرێت، ئەوە كێ یە لە بەرامبەر خواوە دەسەڵاتی شتێكی هەیە؟ (كەواتە ئەویش و دایكیشی و ئەو خەڵكەش بەدیهێنراوی خوان و لە دەسەڵاتی دەرناچن، ئیتر بە چ بەڵگەیەك قسەی وا نابەجێ دەكەن؟!)، بەمەرجێك) خوا زاتێكە هەرچی لە ئاسمانەكان و زەوی و نێوانیاندا هەیە هەر ئەو خاوەنیانە، هەرچی بیەوێت دروستی دەكات (شتێكی ئاساییە ئەو زاتە مەسیح بێ باوك دروست بكات)، چونكە خوا دەسەڵاتی هەیە بەسەر هەموو شتێكدا (هەموو شت لای ئەو ئاسانە).

**پێنجەم: موعجیزەکانی مەسیح(علیه‌السلام) بە ویستی خودا ڕوویانداوە.**

قورئانی پیرۆز لەسەر زاری عیسا(علیه السلام) ڕوونیکردۆتەوە کە ئەو موعجیزانەی کە ڕوویانداوە لە ڕێگەی ئەوەوە (علیه‌السلام) بە ویستی خودا بووەو عیسا هیچ دەستێکی نەبووەتێیدا جگە لەوەی لەسەر دەستی ئەو ڕوویانداوە ، خودا(جل جلاله)لەسەر زاری عیسا(علیه السلام) دەفەرموێ:

﴿ وَرَسُولًا إِلَىٰ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَنِّي قَدْ جِئْتُكُم بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ ۖ أَنِّيٓ أَخْلُقُ لَكُم مِّنَ ٱلطِّينِ كَهَيْـَٔةِ ٱلطَّيْرِ فَأَنفُخُ فِيهِ فَيَكُونُ طَيْرًۢا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۖ وَأُبْرِئُ ٱلْأَكْمَهَ وَٱلْأَبْرَصَ وَأُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۖ وَأُنَبِّئُكُم بِمَا تَأْكُلُونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ فِي بُيُوتِكُمْ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَـَٔايَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ (٤٩) وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَلِأُحِلَّ لَكُم بَعْضَ ٱلَّذِي حُرِّمَ عَلَيْكُمْ ۚ وَجِئْتُكُم بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ (٥٠) إِنَّ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ ۗ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ (٥١) ﴾ (ال عمران)،

(لە ئایندەدا ڕایدەگەیەنێت) بەنەوەی ئیسرائیل کە من پێغەمبەرێکم، بۆ لای ئێوە ڕەوانەکراوم، بەڵگە و نیشانەیەکیشم پێ یە لە لایەن پەروەردگارتانەوە، (ئەویش ئەمەیە کە): من لە قوڕ شێوەی باڵندەتان بۆ دروست دەکەم، ئینجا فووی پێدا دەکەم، بەفرمانی خوا یەکسەر، دەبێتە باڵندەیەکی زیندوو و کوێری زکماك و نەخۆشی بەڵەکیی چاك دەکەمەوە بەویستی خوا و مردووانیش زیندوو دەکەمەوە بەفرمانی خوا و هەواڵی ئەو شتانەی کە دەیخۆن و هەڵی دەگرن لە ماڵەکانتاندا پێتان ڕادەگەیەنم، بەڕاستی لەو شتانەدا بەڵگەو نیشانە هەیە بۆتان ئەگەر ئیماندارن. هەروەها بەڕاستدانەری ئەو تەوراتەم کە لەبەر دەستمدایە، هاتووم بۆ ئەوەی هەندێك لەو شتانەی لەسەرتان حەرامکراوە (بەفەرمانی خوا) حەڵاڵی بکەم و بەڵگەشم بۆ هێناون لەلایەن پەروەردگارتانەوە (لەسەر ڕاستی پێغەمبەرایەتیم) کەواتە لە خوا بترسن و فەرمانبەرداری

من بن و به قسه‌م بكه‌ن. به‌ڕاستی هه‌ر خوا په‌روه‌ردگاری منیش و ئێوه‌شه، كه‌واته ته‌نها ئه‌و بپه‌رستن و ملكه‌چی ئه‌و بن، ئه‌مه‌یه ڕێبازی ڕاست و دروست.

قورئان گرنگی داوه به‌وه‌ی له‌سه‌ر زاری مسیح (علیه السلام)بیگێڕێته‌وه وه‌ك ئه‌وه‌ی ته‌قدیر كرابوو له په‌نهانی خوادا كاتێك كه مژده درایه مریه‌م ، و چۆن دواتر هاته‌دی له‌سه‌ر زاری عیسا(علیه السلام)

كه هه‌ر موعجیزه‌یه‌ك له‌و موعجیزانه‌ی كه بۆی هێناون بێ گومان له‌لایه‌ن خوداوه بووه ، وه باسی (بِإِذْنِ اللّهِ)ی كردووه له‌دوای هه‌ر یه‌كێكیان به دیاری كراوی و به درێژی ، ڕێگه‌ی نه‌داوه وته‌كان ته‌واو ببێ له كۆتاییه‌كه‌دا باسی (بِإِذْنِ اللّهِ)ی كردووه وه‌ك ئیحتیاتێكی زیاتر.

وه له كۆتای ئایه‌ته‌كاندا ده‌فه‌رموێ: ﴿ إِنَّ اللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمْ فَاعْبُدُوهُ هَٰذَا صِرَاطٌ مُسْتَقِيمٌ ﴿٥١﴾ ﴾ (ال عمران).

به‌و جۆره پێشه‌وامان عیسا(علیه السلام) حه‌قیقه‌تی تێڕوانینی بیروباوه‌ڕ ده‌كات كه سه‌رجه‌م ئاینی خودای له‌سه‌ر وه‌ستاوه، ئه‌و موعجیزانه‌ی كه بۆی هێناون له‌لایه‌ن خۆیه‌وه نه‌بوون، ئه‌و توانای نیه به‌سه‌ریاندا چونكه مرۆڤه به‌ڵكو له‌لایه‌ن خوداوه بۆی هێناون و بانگه‌وازه‌كه‌ی وه‌ستاوه له‌سه‌ر بانگكردنی خه‌ڵك بۆ له خواترسان و گوێڕایه‌ڵی كردنی. پاشان په‌روه‌ردگارێتی خودا بۆ خۆی بۆ ئه‌وانیش یه‌كسانی ده‌سه‌لمێنی به دڵنیایی ئه‌و په‌روه‌ردگار نیه به‌ڵكو به‌نده‌ی خودایه – وه بانگیان ده‌كات و هانیان ده‌دات بۆ به‌ندایه‌تی كردنی په‌روه‌ردگاری تاك و ته‌نها و به‌ندایه‌تی بۆ كه‌س نیه جگه له خودا... وته‌كانی به حه‌قیقه‌تێكی گشتگیر ده‌هێنێ... تاك و ته‌نیای په‌روه‌ردگار و په‌رستنی و گوێڕایه‌ڵی كردنی له فه‌رمانه‌كانیدا و دووركه‌وتنه‌وه له‌و شتانه‌ی ڕێگه‌ی پێنه‌دراوه ئه‌وه ڕێگای ڕاسته جگه له‌وه لاڕێ و لادانه.

**شەشەم: نموونەی عیسا(علیه السلام) وەک نموونەی ئادەم وایە(علیه السلام).**

قورئان حەقیقەتی عیسا(علیه السلام) ئاشکرا دەکات و دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَ ۖ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٥٩﴾ ﴾ (ال عمـــران)، بەڕاســـتی نموونەی دروست بوونی عیسا لەلایەن خواوە" وەك نموونەی ئادەم وایە کە لە خاك دروستی کرد و لەوەودوا فەرمانی داو پێی وت: ببە (بە ئینسان) ئەویش بوو، (عیسا دایکی هەبوو، ئادەم دایك و باوکیشی نەبوو).

ئەگەر لەدایکبوونی عیسا مایەی سەرسوڕمان بێت لە بەرامبەر لەدایکبوونی ئاساییدا، چ نامۆییەکی تێدایە کاتێك بەراورد دەکرێت بە دروستکردنی ئادەم باوکی مرۆڤەکان؟!

کاتێك ئەهلی کتاب بەربەرەکانێ و مشت و مڕیان دەکرد لەبارەی عیساوە — بەهۆکاری لەدایك بوونەکەی جۆرەها داستان و خەیاڵیان دادەڕشت بەهۆی ئەوەی کە بەبێ باوك لەدایك بووە، ئەوانە هەر خۆیان داندەنێن بە دروستکردنی ئادەم لە قوڕ، و بەهۆی فوکردنی خودا بۆی لە ڕۆحی خۆی ئەوەکردویەتی بەم بونەوەرە مرۆییە...بەبێ ئەوەی داستان و خەیاڵ دابڕێژن لەسەر ئادەم وەك ئەو داستان و خەیاڵانەی کە بۆ عیسایان دروست دەکرد... بەبێ ئەوەی بە ئادەم بڵێین: کە ئەو سروشتی لاهوتی هەیە، لەکاتێکدا ئەو بنەڕەت ڕەچەڵەکەی کە ئادەمی پیاتێپەڕیوەو بووەتە مرۆڤێك هەمان بنەڕەت و ڕەچەڵەکە کە عیسای پێ لەدایك بووە بەبێ باوك ، ئەویش تۆخم و ڕەگەزی فوپێداکردنی ئیلاهییە لەمیش و لەویشدا کە ئەویش وشەی (کُنْ)ە ئیتر ئەو ستەی کە خودا بیەوێ دروست ببێ دروست دەبێ (فَيَكُونُ). بەو شێوەس زۆر بە ئاسانی حەقیقەتی ئەو بابەتە ئاشکرا دەبێ... حەقیقەتی ئادەم و عیساو سەرجەم دروستکراوەکانی ترو بە ئاسانی و ئاشکرا دەچێتە ناخی مرۆڤەوە، تا ئەو ئاستەی مرۆڤ سەری سوڕدەمێنێ و پرسیار دەکات: چۆن مست و مڕ لەبارەی ئەم ڕوداوەوە ووروژێنرا

لەکاتێکـــدا ئـــەو ڕوداوە وەك (ســـونەتێکی) گـــەورەی وەك (ســـونەتی) بـــەدیهێنان و دروستکردندا قۆناغی بڕیوە.

**بەکورتی:**

* قسەکردن لەسەر خوایەتی مەسیح گەورەترین بەڵگەیە لەسـەر گـومڕای گاورەکـان چـونکە وەڵـامی خـودی مەسـیح و بەڵگـەکانی بـە مرۆڤایـەتی بـوونی نکـوڵی ئـەم بانگەشەکردنە دەکات لە بنەڕەتدا.

* دانپێـدانانی خـودی مەسـیح (علیـە السـلام) بـە بەندایـەتی کردنـی بـۆ خـودا لـە سەرلانکەکەی و لەڕۆژی دوایدا بەرپەرچی ئەم بانگەشە دەداتەوە چونکە لەگـەڵ مـەقامی خودایەتیـدا نـاگونجێ هـەروەها لەگـەڵ پێداویسـتییەکانی مرۆڤایـەتی و بڕیاردانیـان بـۆ بەندایەتی خودا یەك ناگرێتەوە.

* مەسـیح (علیـە السـلام) پەیامبـەری خودایـەو خـواردن دەخـوا ئـیتر چۆن دەبێتـە خودا؟!

* هیچ کەسێك توانای ڕێگـری کردنـی نیـە لەبەرامبـەر خودا(جـل جلالە)کـە مەسـیح و دایکـی و ئەوانـە لـەناو زەویـدان لـەناو ببـات، چارەنوسـی ئـەو و دایکـی و سـەرجەم دروستکراوەکان بەدەست خودایە (جل جلالە).



# گومانی حەوتەم

## نكوڵی كردن لە دووبارە زیندووبوونەوەی دروستكراوەكان لە ڕۆژی دوایدا و ئەوە بە جۆرێک لە جادووگەری و ئەفسانە لە قەڵەم ئەدات [٢٤]

**ناوەرۆكی گومانەكە:**

دەهریەكان[٢٥] و ئەوانەش هاوڕای ئەوانن لە موشریكە عەرەبەكان نكوڵی دەكەن لە زیندوبونەوەو ڕۆژی دوای، هەندێ لە فەیلەسوفەكانیش هاوڕان لەگەڵیاندا نكوڵی سەرەتاو كۆتایی ژیانی دونیا دەكەن و زیندوبوونەوەی دروستكراوەكان بۆ جارێكی تر بە ئەفسانەو داستان لە قەڵەم دەدەن، كۆمەڵێكی تریش دەڵێن زیندووكردنەوە تەنها بۆ ڕۆحەكانە نەك جەستەكان، خودای گەورەش(جل جلاله)دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُوا۟ مَا هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَآ إِلَّا ٱلدَّهْرُ ۚ وَمَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ (الجاثیة)، خوانەناسان دەیانوت: ژیان تەنها ئەم ژیانی دنیایەیە، دەمرین و دەژین بە نۆرە، هەر ڕۆژگارو زەمانە كایگەرن تیاماندا و دەمان مرێنن و هیچی تر! جا ئەوانە وەنەبێت لەسەر بنچینەی هیچ جۆرە زانستی و زانیاریەك ئەوە بڵێن بەڵكو تەنها پشت بەگومان و دوودڵی دەبەستن.

---

٢٤- الآيات التي ورد فيها الشبهة: (سبأ: ٣، ٧، ٢٩، ٣٥)، (التغابن: ٧) ، (يونس: ٥٣)، (الملك: ٢٥) ، (ق: ٣، ١٥)، ( الدخان: ٣٥)، (الجاثية: ٢٤، ٣٢)، (يس: ٤٨، ٧٨)، (الصافات: ١٦، ١٧، ٥٣)، (السجدة: ١٠، ٢٨)، (النمل: ٦٧، ٦٨، ٧١)، (المؤمنون: ٣٥، ٣٧، ٨٢، ٨٣)، (الأنبياء: ٣٨)، (مريم: ٦٦)، (الكهف: ٣٦)، الأسراء: ٤٩، ٥١، ٩٨)، (النحل: ٣٨)، (الرعد: ٥)، (هود: ٧)، (٧)، (الشعراء: ١٣٨)، (الواقعة: ٤٧، ٤٨)، (النازعات: ١، ١٢)

الآيات التي ورد فيها رد على الشبهة: (سبأ:٣) ، (يونس: ٥٣، ٥٤)، (التغابن: ٧)، (سبأ: ٨، ٣٠)، (الجاثية: ٢٦)، (الأسراء: ٥، ٥٢، ٩٩)، (النحل: ٣٨، ٤٠)، (هود: ٨)، (الأعراف: ٢٥)، (طه: ٥٥)، (الواقعة: ٤٩، ٥٠)، (الحج: ٥،٧)، (الشورى: ١٨)، (الصافات: ٦٧)، (١٨، ١٩)، (يس: ٧٩، ٨٣)، (السجة: ٢٩، ٣٠)، (الأنبياء: ٣٩، ٤٠)، (مريم: ٦٧)، (الكهف: ٢١، ٣٧)، (الروم: ٢٧).

٢٥ دەهریەكان كۆی دەهریە: بریتین لەو كەسانەی كە بڕوایان بە زیندووبوونەوەو ژیانی دوارۆژ نیە،ئەڵێن دونیا هەر ئەمێنی و تەواو نابێ، یان ئەڵێن: گەردوون لە ئەزەلەوە هەر بووە و پێویستی بەوە نیە دروست بكرێت.

**ڕێگاکانی پوچەڵکردنەوەی گومانەکە:**

١. زیندوکردنەوە ڕاستیەکی سەلمێنراوو دیاریکراوە بۆ کاتێکی دەستنیشانکراو.

٢. ئەو کەسەی لە توانایدا بووە ژیان دەست پێکات تواناشی هەیە کۆتای پێ بهێنێ.

٣. ئەوەی توانای هەبێت بەسەر شتانێك کە لە ئادەمیزاد گەورەترو مەزنترن توانای بەسەر شتانی تریشدا دەشکێ.

٤. توانای ئەو(جل جلاله)لەسەر گۆڕینی دروستکراوەکانی لە دۆخێکەوە بۆ دۆخێکی تر بەڵگەیە لەسەر توانای بۆ زیندوکردنەوەو ژیاندنەوە لە پاش مردن.

٥. چیرۆکی (کەسێك)کە نکوڵی لە زیندوبونەوەکرد باشترین بەڵگەیە لەسەر توانای خودا بۆ زیندوکردنەوەو هەڵسانەوە لە ڕۆژی دوایدا.

٦. زیندوکردنەوەی هەندێ لە مردوان لە ژیانی دونیادا بەڵگەیەکی ڕاستی هەڵگرە لەسەر توانای خودا بۆ زیندوکردنەوە.

٧. هێنانەوەی نمونە بە زیندوکردنەوەی زەوی بە ئاو و سوڕی ژیانی ڕووەك بەڵگەن لەسەر ڕاستی و دروستی زیندوکردنەوە.

٨. زیندوکردنەوەی بەندەکان پێویستە لەپێناو وەرگرتنی سزاو پاداشت ئەمەش دادپەروەری خودای گەورە دەسەلمێنێ.

٩. هاوڕایی سەرجەم پێغەمبەران لەبارەی هەواڵدانیان بە زیندوکردنەوە.

١٠. گوێڕایەڵی نکوڵی کارانی زیندوکردنەوە لەو ڕووەوە کە هیچ بەڵگەیەکیان نیە.

**درێژەی بابەتەکە:**

ئەم گومانە گومانێکی بێ بنەماو پوچەڵە کە موشریکەکان زۆر وتویانەتەوە، ئەوە لە زۆرترین بانگەشەو گومانەکانیانە کە لە قورئاندا چەندەها جار دووبارەبووەتەوە، ئەوان ڕایانگەیاندووە کە زیندوناکرێنەوە، زیندوکردنەوەو هەستانەوە لە گۆڕەکاندا پاش بوونی

جەستەکان بە خۆڵ بەدوور دەگرن.ئەو کارە بە سیحرو ئەفسانە دەزانن، قورئان لە چەند جێگادا لەبارەیانەوە دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُواْ مَا هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنۡيَا نَمُوتُ وَنَحۡيَا وَمَا يُهۡلِكُنَآ إِلَّا ٱلدَّهۡرُۚ وَمَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنۡ عِلۡمٍۖ إِنۡ هُمۡ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ (الجاثیة)، خوانەناسان دەیانوت: ژیان تەنها ئەم ژیانی دنیایەیە، دەمرین و دەژین بە نۆرە، هەر ڕۆژگارو زەمانە کاریگەرن تیاماندا و دەمان مرێنن و هیچی تر! جا ئەوانە وەنەبێت لەسەر بنچینەی هیچ جۆرە زانستی و زانیاریەك ئەوە بڵێن بەڵکو تەنها پشت بەگومان و دوودڵی دەبەستن. ﴿ إِنۡ هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنۡيَا نَمُوتُ وَنَحۡيَا وَمَا نَحۡنُ بِمَبۡعُوثِينَ ﴿٣٧﴾ ﴾ (المؤمنون)، ژیان تەنها ژیانی ئەم دنیایەمانەو هیچی تر نی یە، دەژین و دەمرین و ئێمە زیندوو ناکرێینەوە ! ! ، ﴿ زَعَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَن لَّن يُبۡعَثُواْۚ قُلۡ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتُبۡعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلۡتُمۡۚ وَذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ﴿٧﴾ ﴾ (التغابن)، ئەوانەی بێ باوەڕ بوون بە بۆچوونی خۆیان وتیان: هەرگیز زیندوو ناکرێنەوە، پێیان بڵێ: وا نیە، سوێند بە پەروەردگارم، بەڕاستی هەر زیندوو دەکرێنەوە، پاشان ئاگادار دەکرێن لە هەموو ئەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامتان دەدا، ئەوەش بۆ خوا زۆر ئاسان و سادەیە. هەروەها ئەفەرموێ: ﴿ ... وَلَئِن قُلۡتَ إِنَّكُم مَّبۡعُوثُونَ مِنۢ بَعۡدِ ٱلۡمَوۡتِ لَيَقُولَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ مُّبِينٞ ﴿٧﴾ ﴾ (هود)، سوێند بەخوا ئەگەر بڵێت بەڕاستی ئێوە زیندوو دەکرێنەوە دوای مردن، بێگومان ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون دەڵێن: ئەم قسە و باسە هیچ نیە، تەنها جادوویەکی ئاشکرایە.هەروەها ئەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَا تَأۡتِينَا ٱلسَّاعَةُۖ ..﴿٣﴾ ﴾ (سبأ)، ئەوانەی کافرو حەقپۆشن دەڵێن: قیامەت هەر نایەت و نامانگاتێ.

ئەوانەی کە قورئان باسیان دەکات و نکوڵی زیندوبوونەوە دەکەن تەنها یەك تاقم نین، بەڵکو دەکرێ پۆلێن بکرێن بۆ سێ پۆل لە ڕێگەی وەڵامدامەوەی قورئان بۆیان

یەکـەم: ئـەو بێباوەڕانـەی نکوڵی لـە بـوونی بەدیهێنـەر دەکـەن، ئەوانـەش زۆربـەی فەیلەسوفە دەهرییەکانن، هاوشێوەیان شیوعیەکانی(٢٦) ئەم سەردەمەن.

ئەوانە نکوڵی دروستکردنی بـەدیهێنراوەکان دەکـەن لـە بەدیهێنەرێکـەوە، هـەروەها نکـوڵی پەیـدابوونی یەکـەم و دووەم دەکـەن ، وە لـە بنەرەتـدا نکـوڵی لــە بــوونی بەدیهێنەرێکیش دەکەن.

ئەوانە سەرەتا خودا(جـل جلالە)مشـت و مـڕی بـوونی بەدیهێنـەرێك و تـاك و تـەنهایی خۆیان لەگەڵ دەکاتوەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد پاشان ئەوە چەسپاندنی زیندوبوونـەوە دێت، چونکە زیندوبونەوە بەشێکە لە باوەڕبوون بە خودا.

دووەم: ئەوانــە کــە دانــدەنێن بــە بــوونی بەدیهێنەرێکــدا، بــەڵام زیندوبووەنــەوەو هەستانەوە بە درۆ دەخەنەوە، لـەوانە عەرەبەکانن کە خودا لــە بارەیانـەوە دەفـەرموێ: ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ۚ قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٥﴾ ﴾ (لقمان)، سوێند بە خوا ئەگەر پرسیار لە خوانەناسـان بکـەیت: کـێ ئاسمانـەکان و زەوی دروست کردووە، ئەوە بە دڵنیاییەوە دەڵێن: (الله)، دروستی کـردوون، تـۆش ئـەی محمـد ﷺ بڵێ: سوپاس و ستایش بۆ خوا (لەسەر وتنی ڕاستی)، نەخێر وانییە، ئەو وەڵامـە لـە قەناعەتەوە هەڵنەقوڵاوە، بەڵکو زۆربەیان نازانن (لە خۆیانەوە قسە دەکەن).

ئەوان لەگەڵ دانپێدانانیان بە بوونی بەدیهێنەرێك نکوڵی زیندوبوونـەوەو هەسـتانەوە دەکەن لە ڕۆژی دوایدا، قورئان ئـەو شـتەیان لـەبارەوە دەگێڕێتـەوە: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبًا وَءَابَآؤُنَآ أَئِنَّا لَمُخْرَجُونَ ﴿٦٧﴾ لَقَدْ وُعِدْنَا هَٰذَا نَحْنُ وَءَابَآؤُنَا مِن قَبْلُ إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٦٨﴾ ﴾ (النمل)، ئەوانەی بێ باوەڕن بوون دەیانوت: باشە ئەگەر ئێمە بوونیە خاك لەگەڵ باوو و باپیرانماندا، ئایا ئێمە (بۆ ژیانێکی نوێ) دەدەهێنرێینەوە ؟!

---

٢٦- الشيوعيون: هـم مـن يعتنقـون الـمذهب الشيوعي مـذهب كـارل مـاركس وهـو نظـام إجتمـاعي وسياسـي وأقتصادي يقوم على الإنتاج الجماعي و اشاعة الملكية وإزالة الطبقات الاجتماعية، و ان يعمل فرد على قدر طاقته و يأخذ على قدر حاجته.

سوێند بە خوا بەڕاستی ئێمە پێشتر لەم بەڵێنانەمان پێدراوە لەگەڵ باوو باپیرانماندا ئەمە هیچ شتێك نییە، تەنها داستان و قسەی پێشینەکانە ! !

ئەوانە دەڵێن کە باوەڕیان بە خودا هەیە، بەڵام لەهەمان کاتدا دەڵێن کە توانی خودا دەستەوسانە لەوەی کە زیندویان بکاتەوە پاش مراندنیان! ئەوانە خودای گەورە نمونەی بۆ هێناونەتەوە، بەڵگەی بۆ هێناونەتەوە بۆ ڕونکردنەوەی توانای خۆی لەسەر زیندوکردنەوەو هەستانەوە، هیچ شتێك لای ئەو مەحاڵ نیە. هەروەها کۆمەڵێکی تر لە گاورەکان کە پێیان دەوترێت(الصادوقیون)[٢٧]، کە گوایە دەڵێن باوەڕیان بە تەوراتی (موسی)یە ئەوان زیندوبونەوەو بەهەشت و جەهەنەم بە درۆدەخەنەوە !

سێیەم: ئەوانەن کە باوەڕیان بە زیندوبوونەوە هەیە بەڵام لەسەر ئەو شێوازە نیە کە لە پەیامە ئاسمانییەکاندا هاتووە، ئەوان باوەڕیان وایە ئەوەی کە پاداشت و سزا دەدرێ لە ڕۆژی دوایدا تەنها ڕۆحە ، زۆر لە فەیلەسوف و تاقمە گومڕاکان هاوشێوەی ئەمان بڕیاردەدەن.[٢٨]

بێگومان قورئان وەڵامی ئەوانەی داوەتەوە کە نکوڵی زیندوبوونەوە دەکەن و هەستانەوەو ژیاندنەوە بە درۆ دەخەنەوە لە چەند جێگایەکدا بە بەڵگەی سەلمێنراوو دەمکوتکەر کە زیندوبوونەوەو ژیاندنەوە دەسەلمێنێ لەوانە:

**یەکەم: قورئانی پیرۆز ڕوونی کردۆتەوە کە زیندوکردنەوە ڕاستییەکی سەلمێنراوو دیاریکراوە بۆ کاتێکی دەستنیشانکراو.**

بێگومان خودا(جل جلاله)چەند جۆرێتی بەکارهێناوە لە شێوازی بەکارهێنانی ئەو ڕاستیە، جارێك شێوازی یەکلاکەرەوەی بەکارهێناوە لەسەر ڕوودانی ئەو ڕۆژە وەك

---

٢٧- (الصادوقيون) جماعة قليلة العدد ولكن معظمها كان من المثقفين والأعيان، وإسمها مشتق من صادوق رئيس الكهنة في أيام داود وسليمان (عليها السلام) وقد حصروا تعليمهم في الكتاب المقدس فقط زاعمين أن حرف الناموس المكتوب وحده هو الملزم وينكرون القيامه.

٢٨- القيامة الكبرى، د. عمر سليمان الاشقر/ ٢٠٠٥، ص٦١، ٦٣، ٨٤ بتصرف.

دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٌ أَكَادُ أُخْفِيهَا لِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا تَسْعَىٰ ﴿١٥﴾ ﴾ (طه)، بێگومان ڕۆژی قیامەت بەڕێوەیە و هەر دێت، نزیکە بیشارمەوە، بۆ ئەوەی هەموو کەسێك بە گوێرەی کارو کردەوە و هەوڵ و کۆششی پاداشت بدرێتەوە.هەروەها دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَأَاتِيَةٌ لَّا رَيْبَ فِيهَا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾ (غافر)، بەڕاستی ڕۆژی قیامەت بەڕێوەیە و هەر دێت، هیچ گومانیشی تیادانیە، بەڵام زۆربەی خەڵکی ئیمان و باوەڕناهێنن و باوەڕیان پێی نیە. ،بە هەمان شێوە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ مَا تُوعَدُونَ لَأَاتٍ ۖ وَمَا أَنتُم بِمُعْجِزِينَ ﴿١٣٤﴾ ﴾ (الانعام)، بەڕاستی ئەو بەڵێنانەی کە دەتاندرێتێ (دەربارەی قیامەت و لێپرسینەوە) بەڕێوەیە و بێگومان هەر دێت و ئێوە دەسەوسانکەرنین. وە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَصَادِقٌ ﴿٥﴾ ﴾ (الذاریات)، بەڕاستی ئەو بەڵێنانەی پێتان دراوەڕاستەو هەر دێتە دی .

وە هەندێ جار باس لە نزیك بوونەوەی ئەو ڕۆژەی دەکات وەك دەفەرموێ: ﴿ إِنَّهُمْ يَرَوْنَهُۥ بَعِيدًا ﴿٦﴾ وَنَرَىٰهُ قَرِيبًا ﴿٧﴾ ﴾ (المعارج)، بەڕاستی ئەو بێ باوەڕانە، قیامەت بەدوور دەبینن، بەدووری دەزانن.ئێمەش، زۆر بەنزیکی دەزانین (چونکە خوا خۆی بەدیهێنەری کاتە).=،هەروەها دەفەرموێ: ﴿ ٱقْتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلْقَمَرُ ﴿١﴾ ﴾ (القمر)، ڕۆژی قیامەت نزیك بۆتەوە و مانگیش لەت بوو، (هەندێ ڕوایات هەیە کەئامازەدەکات بۆئەوەی کە: خوانەناسان داوای موعجیزەیان لەپێغەمبەر کردبێت ئەویش پەنجەی موبارەکی ڕووەو مانگ بزواندو بەویستی خوا لەت بوو) بەڵام هەندێك لەموفەسرین دەڵێن: ئەم ڕووداوەلەسەرەتای بەرپابونی قیامەتدا پێش دێت

لە هەندێ جێگای تردا خودا(جل جلاله)سوێند لەسەر ڕودان و هاتنی ڕۆژی دوایی دەخواتو دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ لَيَجْمَعَنَّكُمْ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَا رَيْبَ فِيهِ ۗ وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ

ٱللَّهِ حَدِيثًا ﴿٨٧﴾ ﴾ (النساء)، (الله) خوایەکە بێجگە لەو هیچ خوایەکی تر نیە (شایستەی پەرستن بێت)سوێند بە خوا لە ڕۆژی قیامەتدا کۆتاندەکاتەوە و هیچ شك و گومانێکی تێدا نی یە، جا کێ هەیە قسە و گوفتاری لە فەرمایش و فەرموودەی خوا ڕاستترو دروستتر بێت؟

یاخود فەرمان بە پێغەمبەر دەکات کە سوێند بخوا لەسەر هاتنەدی و ڕودانی زیندوبوونەوە، ئەوەش لە ڕێگەی وەڵامدانەوەی ئەوانە کە نکوڵی لێ دەکەن و بە درۆی دەخەنەوە وەك دەفەرموێ: ﴿ ۞ وَيَسْتَنۢبِـُٔونَكَ أَحَقٌّ هُوَ ۖ قُلْ إِى وَرَبِّىٓ إِنَّهُۥ لَحَقٌّ ۖ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ ﴿٥٣﴾ ﴾ (یونس)، (بێباوەڕان بەگاڵتەوە لێت دەپرسن): ئایا بەڕیا بوونی قیامەت ڕاستە؟ (شتی وا پێش دێت؟!). بڵێ: بەڵێ، ڕاستە، سوێند بەپەروەردگارم بەڕاستی ئەوە حەقیقەتێکی و (هەر پێش دێت و) ئێوە ناتوانن خوا دەستەوسان بکەن..هاوشێوەی ئەوەش دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَا تَأْتِينَا ٱلسَّاعَةُ ۖ قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّى لَتَأْتِيَنَّكُمْ عَـٰلِمِ ٱلْغَيْبِ ۖ...﴿٣﴾ ﴾ (سبأ)، ئەوانەی کافرو حەقپۆشن دەڵێن: قیامەت هەر نایەت و نامانگاتێ، (ئەی پێغەمبەر ﷺ) پێیان بڵێ: (وانیە) ئەرێ! سوێند بە پەروەردگارم هەر یەخەتان دەگرێت (چونکە ئەو زاتە) زانایە بە نهێنی و شاراوەکان و (هەر خۆی دەزانێ کەی بەرپای دەکات).

قورئان دوپاتیدەکاتەوە کە ڕۆژی دوایی دیاریکراوە بۆ سەری زیاد ناکرێ و لێشی کەم ناکرێتەوەو دەفەرموێ: ﴿ قُل لَّكُم مِّيعَادُ يَوْمٍ لَّا تَسْتَـْٔخِرُونَ عَنْهُ سَاعَةً وَلَا تَسْتَقْدِمُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾ (سبأ)، پێیان بڵێ: کاتێك دێت کە ناتوانن نە تاوێك دوا بکەون نە تاوێك پێش بکەون (بەڵکو لەکاتی خۆیدا ئامادە دەکرێن).

کەواتە ڕۆژێکی هەژمارکراوو چەسپێنراوە نە بۆی زیاد دەکرێ و نە لێشی کەم دەکرێتەوە وەك دەفەرموێ: ﴿ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُؤَخِّرْكُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ إِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ إِذَا جَآءَ

﴿ لَا يُؤَخَّرُۚ لَوۡ كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ۝٤ ﴾ (نوح)، ئەو كاتە خوا لە گوناهەكانتان خۆش دەبێت و دەتانهێڵێتەوە بۆ كاتێكی دیاری كراو، بێگومان كاتی دیاری كراوی خوا وەختێك پێش دێت، بەهیچ شێوەیەك دواناكەوێت ئەگەر بتانزانیایە.

ئەوە پەیمانێكی ڕاستەو هەواڵێكی دروستە و ڕۆژێكە گومانی تێدانیە وەك دەفەرموێ: ﴿ .. ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّمَنۡ خَافَ عَذَابَ ٱلۡأٓخِرَةِۚ ذَٰلِكَ يَوۡمٞ مَّجۡمُوعٞ لَّهُ ٱلنَّاسُ وَذَٰلِكَ يَوۡمٞ مَّشۡهُودٞ ۝١٠٣ وَمَا نُؤَخِّرُهُۥٓ إِلَّا لِأَجَلٖ مَّعۡدُودٖ ۝١٠٤ ﴾ (هود).

بێگومان لەو بەسەرهاتەدا نیشان و پەندو ئامۆژگاری هەیە بۆ كەسێك لە سزای ڕۆژی دوایی بترسێت، ئەوە ڕۆژێكە خەڵكی بۆی كۆ دەكرێنەوە و ئەوە ڕۆژێكە خەڵكی هەموو ئامادە كراون و هەمووان لەبەرچاون دەبن تیایدا.ئێمە بەرپابوونی ئەو ڕۆژە دواناخەین مەگەر بۆ كاتێكی كەم و سنووردار نەبێت.

**دووەم: لەو بەڵگە عەقڵیە دەمكوتكەرانەی كە قورئان بەڵگەی پێ هێناونەتەوە لەسەر زیندوكردنەوە بەڵگەی لەسەر ژیانە ئەوەی دواڕۆژی بە ژیانەوەی ئەم دونیا هێناوەتەوە .**

هەموو ڕۆژێك ژیانێكی نوێ دەبینین، منالآن لەدایك دەبن ، باڵندە لە هێلكەكەی دێتە دەرەوە، گیانلەبەران لەدایك دەبن، ڕوبارو دەریاكان پڕیەتی لە ماسی، مرۆڤ هەموو ئەمانە بەچاوی خۆی دەبینێ پاشان نكوڵی دەكات كە شتێكی لەو جۆرە دووبارە ببێتەوە ، پاش ئەوەی كە خودا كۆتایی بە ژیانی دونیا دەهێنێ ، ئەوانەی داوای بەڵگە دەكەن لەسەر زیندوبونەوە بێ ئاگان لەوەی كە دروستكردنیان بەم شێوازە گەورەترین بەڵگەیە لەسەری ، بەتوانا لەسەر دروست كردنیان لەسەرەتاوە بە توانایە لەسەر دوبارە دروستكردنەوەیان جارێكی تر [٢٩]

خودا(جل جلاله)هەواڵی داوە كە خودی ئادەمیزاد سەری سوڕدەمێنێ و بەدووری دەزانێ دروست بكرێتەوە لە پاش مردنی وەك دەفەرموێ: ﴿ وَيَقُولُ ٱلۡإِنسَٰنُ أَءِذَا مَا مِتُّ

---

٢٩- المرجع السابق: ص٦٦، بتحرف

لَسَوۡفَ أُخۡرَجُ حَيًّا ﴿٦٦﴾ ﴾ (مريم)، ئادەمیزادی (بێ باوەڕ) دەڵێت: ئایا کاتێك مردم، جارێکی تر لە ئایندەدا زیندوو دەکرێمەوە.

بەڵگەدەهێنێتەوە(جل جلاله)بە سەرەتا لەسەر دووبارەکردنەوە واتە مرۆڤی دروستکردووە کاتێ کە بوونی نەبووە ، ئایا(جل جلاله)ناتوانێ دوبارە زیندوی بکاتەوە لە کاتێکدا بوونی هەیە ! وەك ئەفەرموێ: ﴿ أَوَلَا يَذۡكُرُ ٱلۡإِنسَٰنُ أَنَّا خَلَقۡنَٰهُ مِن قَبۡلُ وَلَمۡ يَكُ شَيۡـٔٗا ﴿٦٧﴾ ﴾ (مريم)، باشە ئاخر ئادەمیزاد بۆ ئەوە یاد ناکات بەڕاستی ئێمە پێشتر ڕدوستمان کرد، هەر هیچ نەبوو؟

ئەمە ڕونکردنەوەیەکە بۆ ئەوانە ، کورتەکەی ئەوەیە ئەوەی توانای لەسەرەتا هەبێ توانا لەسەر دووبارەکردنەوەش هەیە وەك دەفەرموێ: ﴿ قُلِ ٱللَّهُ يُحۡيِيكُمۡ ثُمَّ يُمِيتُكُمۡ ثُمَّ يَجۡمَعُكُمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا رَيۡبَ فِيهِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٢٦﴾ ﴾ (الجاثية)، ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ: (ئەو شتانە بەدەست ئێمە نیە) ئەوە هەر خوایە ژیانتان پێ دەبەخشێت و پاشان دەتان مرێنێت و دوای ئەوە کۆتان دەکاتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا کە هیچ گومانی تیادانیە، بەڵام زۆربەی خەڵکی ئەمە نازانن..

هەروەکو چۆن توانای هەیە لە دروستکردنتان لەنەبوونەوە بەهام شێوە توانای گێڕانەوەی لاشەکانی هەیە دوای فەوتان و تیاچونی، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِي يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَهُوَ أَهۡوَنُ عَلَيۡهِۚ وَلَهُ ٱلۡمَثَلُ ٱلۡأَعۡلَىٰ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٢٧﴾ ﴾ (الروم)، هەر ئەو زاتە لە سەرەتاوە بەدیهێنراوەکان بەدی دەهێنێت، پاشان بە جۆرێکی تر دروستیان دەکاتەوە، ئەو کارەش بۆ خوا ئاسانە، نموونەی بەرزو وەسفی بڵند هەر شایستەی ئەو زاتەیە لە ئاسمانەکان و زەویدا، هەر ئەویش زاتێکی باڵادەست و دانایە.

هـەروەها دەفـەرموێ: ﴿ فَسَيَقُولُونَ مَن يُعِيدُنَا قُلِ ٱلَّذِى فَطَرَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ ﴿٥١﴾ ﴾ (الاسـراء)، ئەوسا ئەوانە (بە سەرسامیەوە) دەڵێن: دەی باشە، کێ زیندوومان دەکاتەوە؟ بڵێ: ئـەو زاتەی کە یەکەمجار بەدیهێناون (زۆر لای ئاسانە زیندووتان بکاتەوە)..

قورئان لە جێگایەکی تـردا دروسـتکردنی سـەرەتای ئادەمیزادمـان یـاد دەخاتـەوە ، خودا ئادەمی لە قوڕ دروست کردووە، ئەوەی بتوانێ لە قوڕ مرۆڤێکی ڕێك و پێك دروست بکات جارێکی تر دەستەوسان نابێ لە گێڕانەوەی بۆ مرۆڤێکی ڕێك و پێك لە پاش مردنـی هـەر چـۆن دروسـتکردنی ئێمـەی نـەوەی ئـادەم وەبـیر دەهێنێتـەوە ئـەو ڕەچـەڵەکی دروستکردووین لە ئاوێکی ڕیسوا ، پاشان ئاوەکە گۆڕاوە بە تۆو پاشان تۆوەکە بـووە بـە زەرو (پارچەخوێن) ، پاشان بووە بە گۆشت پارە واتە وەك پـاروە گۆشـتێکی جـوراو تـا ئەو کاتەی ڕۆحی کراوە بەبەرداو بووە مرۆڤیکی ڕێك و پیك، ئەوەی توانای دروسـتکردنی بینراوزانراوێکی هەبێ بەتوانایە لەسـەر گێڕانـەوەو دروسـتکردنەوەی لـەپاش مردنـی وەك دەفەرموێ:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمْ فِى رَيْبٍ مِّنَ ٱلْبَعْثِ فَإِنَّا خَلَقْنَـٰكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ مِن مُّضْغَةٍ مُّخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ لِّنُبَيِّنَ لَكُمْ ۚ وَنُقِرُّ فِى ٱلْأَرْحَامِ مَا نَشَآءُ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ثُمَّ نُخْرِجُكُمْ طِفْلًا ثُمَّ لِتَبْلُغُوٓا۟ أَشُدَّكُمْ ۖ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرْذَلِ ٱلْعُمُرِ لِكَيْلَا يَعْلَمَ مِنۢ بَعْدِ عِلْمٍ شَيْـًٔا ۚ وَتَرَى ٱلْأَرْضَ هَامِدَةً فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ ٱهْتَزَّتْ وَرَبَتْ وَأَنۢبَتَتْ مِن كُلِّ زَوْجٍۭ بَهِيجٍ ﴿٥﴾ ﴾ (الحج).

ئەی خەڵکینە ئەگەر ئێوە گومانتان لە زینـدوو بوونـەوە هەیـە، ئـەوە چـاك بـزانن کـە ئێمە سەرەتا ئێوەمان لە خاك و خۆڵ دروستکردووە، لەوەودوا (نـەوەکان) لـە نوتفەیـەك (پەیدا بوون)، پاشان نوتفەش دەبێتە خۆهەڵواسەرێك لەناو منداڵداندا، لـەوەودوا دەبێتـە گۆشتپارەیەکی تـەواوو سـەرو سیمادار، یـان ناتـەواو، (هـەموو ئـەم شـتانە دەهێنینـەوە

یادتـان) تـا بۆتـان ڕوون بکەینـەوە کـە ئێمـە ئـاوا ئێوەمـان دروسـتکدووە و دووبـارە دروستکردنەوەشتان لامان ئاسانە، ئەوەش بمانەوێت لە منداڵدانەکاندا جێگیری دەکـەین، تا کاتێکی دیاریکراو، لەوەودوا بەساوایی و بەبچووکی دەرتاندەهێنین (لە سکی دایکتـان) دوایـی بـۆ ئـەوەی گـەورە بـبن و بگەنـە ئەوپـەڕی هێـزو تواناتـان، هەتانـە دەمرێنرێـت بەگەنجی، هەشتانە دەگەڕێنرێتەوە بۆ پەڕپووتترنی تەمەنـەکان، بـۆ ئـەوەی هـیچ شـتێك نەزانێت دوای ئەوەی جاران دەیزانی، (بەڵگەیەکی تـریش لەسـەر زیندووبوونـەوە ئەوەیـە کە ئەی ئینسان) تۆ زەویش دەبینیت وشك و برنگە، جـا کاتێـك ئـاوی بارانمـان بەسـەردا باراند، دادەچڵەکێت و دەلەرزێت و تۆوەکان چەکەرە دەکەن و ڕەگ و چـڵ دەردەکـەن و دەڕوێن، ئەوسا لە هەموو جۆرە گژوگیاو گوڵ و گوڵزارێکی جوان جووت دەڕوێنێت.

**سێیەم: لەو بەڵگە بەهێزانە لەو بارەیەوە کە قورئـان هێنـاویەتی وەک بەڵگەیەک بـۆ عەقڵ کە بیری لێ بکاتەوە، ئەوەی ڕوونکردووەتەوە کە لەنێو دروستکراوەکانیدا زۆر مەزنتـرو گەورەتـری تێدایە لە بەرامبەر دروستکردنی مرۆڤ، گومـانی تیـانیە ئەوەی توانـای دروستکردنی شتی مەزنـی هەبێت توانای دروستکردنی لەوانە بچوکتریشی هەیە.**

خودا(جل جلاله)هەموو ئەوانەی عەقڵیان هەیە ئاگاداریان دەکاتەوە بیری لێ بکاتـەوە لەسەر توانـای ئـەو لەسـەر دوبـارە دروسـتکردنەوەی دروسـتکراوەکان بـۆ جـارێکی تـر ، ئـەوەش بـە بەڵگـەی دروسـتکردنی ئاسمانـەکان و زەوی، توانـای لەسـەر دوبـارە دروستکردنەوە ئاسانترە لـە دروسـتکردنی ئاسمـان و زەوی، وەك دەفـەرموێ: ﴿ لَخَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٧﴾ ﴾ (غـافر)، بەڕاسـتی دروسـتکردنی ئاسمانـەکان و زەوی لـە دروسـتکردنی خـەڵکی زۆر گـەورە و گرنگترە، بەڵام زۆربەی خەڵکی ئەم ڕاستیانە تێناگەن و پەی پێ نابەن و نایزانن.

هەروەها دەفـەرموێ: ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَلَمْ يَعْىَ بِخَلْقِهِنَّ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحْۦِىَ ٱلْمَوْتَىٰ ۚ بَلَىٰٓ إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٣٣﴾ ﴾ (الاحقـاف)، ئایـا ئەوەسـەرنجیان

نەداوەبەڕاســـتی ئەوەخوایـــە کەئاسمانـــەکان و زەوی دروســـت کـــردووەو لەدروســـت کردنیشیاندا هیچ ماندوو نەبووە، توانای نییە مردووەکان زیندوو بکاتەوە، بەڵێ، بێگومان ئەو زاتە، بەسەر هەموو شتێکدا دەسەڵاتی هەیە .

هـەروەها دەفـەرموێ: ﴿ ۞ أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ قَادِرٌ عَلَىٰ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُمْ وَجَعَلَ لَهُمْ أَجَلًا لَّا رَيْبَ فِيهِ فَأَبَى الظَّالِمُونَ إِلَّا كُفُورًا (٩٩) ﴾ (الاســراء)، ئایـا ئەوانـە نەیانبینیووە بەڕاستی ئەو خوایەی کە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە بەتوانایە کـە وەك ئەوان دروسـت بکـات و (وەك خۆیـان بـەدیان بهێنێتـەوە)، دیـارە کـە ڕۆژو کـاتێکی تایبەتی دیاری کردووە (بۆ مراندنیان و زیندوو کردنـەوەیان) کـە هـیچ گومـانی تێـدا نیـە (لەگەڵ ئەو بەڵگە بەهێزانەدا) کەچی ستەمکاران هەر بڕیاری یاخی بـوون و سەرکەشـی و کوفریانداوەو هیچی تر.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَيْسَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِقَادِرٍ عَلَىٰ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُم ۚ بَلَىٰ وَهُوَ الْخَلَّاقُ الْعَلِيمُ (٨١) ﴾ (یس)، ئایا ئەو زاتەی کە ئاسمانەکان و زەوی دروسـت کـردووە ناتوانێت دووبارە وەك خۆیان دروستیان بکاتـەوە؟! بـەڵێ (زۆر چـاك دەتوانێـت چـونکە ئەو زاتە لە دروستکردن و داهێناندا بە توانا و زانایە.

. قسەیەکی ئیبن تەیمییەبەرەحمەت بێ ئـەم جـوان ڕوونەکاتـەوە دوای ئـەوەی ئـەم ئایەتانە ئەهێنێت، ئەڵێت: ( لە ڕووی ژیرییەوە ئاشکرایە کە دروسـتکردنی ئاسمانـەکان و زەوی گەورەترە لە دروستکردنی هاوشێوەی ئادەمیزاد، و توانا بەسەریدا بەهێزترە، ئـەم شتە ئاسانە لە پێشترە بۆ دەسەڵاتی خودا لەوی تر).[٣٠]

---

٣٠- المرجع السابق: ص٦٨

**چوارەم: لە وەڵامەکانی قورئان بۆ نکوڵی کارانی زیندوکردنەوە ئەوەیە کە خودا وەک بەڵگەیەک ڕوونی کردۆتەوە بۆ عەقڵی مرۆڤایەتی بۆ ئەوەی لێی تێبگەن کە خودا لە توانایدایە دروستکراوەکان لە دۆخێکە بگۆڕێ بۆ دۆخێکی تر و دەستەوسانیش نیە لە دروستکردنەوەیان لە پاش مردن.**

لە کاملی پەروەردگارێتی و تاك و تەنهای خودا ئەوەیە دەستەڵاتی گۆڕینی دروستکراوەکانی هەیە لە دۆخێکەوە بۆ دۆخێکی تر ، ئەو دەمرێنیّ و دەژێنیّ زیندو لە مردو دەردێنیّ ، مردوش لە زیندو ، بەدیدەهێنیّ و دەفەوتینیّ وەك دەفەرمویّ: ﴿ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ فَالِقُ ٱلْحَبِّ وَٱلنَّوَىٰ ۖ يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَمُخْرِجُ ٱلْمَيِّتِ مِنَ ٱلْحَىِّ ۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ ۖ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ﴿٩٥﴾ فَالِقُ ٱلْإِصْبَاحِ وَجَعَلَ ٱلَّيْلَ سَكَنًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ حُسْبَانًا ۚ ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ﴿٩٦﴾ ﴾ (الانعام) بەڕاستی خوا لەتکەری دەنك و دانەوێڵەیە بۆ ئەوەی بیشکوێنێت و بروێت، زیندووش لە مردوو دەردەهێنێت، دەرهێنەری مردووشە لە زیندوو، ئا ئەوەیە خوای پەروەردگارتان، جا ئیتر بۆ کویّ لادەدرێن و بۆ کویّ وێلّ دەکرێن.(هەرئەو زاتەیە) بەیانیان فەراهەم دەهێنێت و ئاسۆ ڕوناك دەکاتەوە و شەوی کردووە بەهۆی ئارامی و خامۆشی، ڕۆژو مانگیشی کردووە بەهۆی ڕاگرتنی حساب، ئەو شتانە هەمووی بەنەخشەی خوای باڵادەست و زانا کێشراوە.

لە تۆوێکی ڕەق و سەخت ڕوەکێك دەڕوێنیّ کە گولّ دەرکات و بەردەگریّ، پاشان ئەم ڕووەکە تۆوێکی ڕەقی لیّ دروست دەبیّ ، وە لە باڵندە زیندوەکان هێلکەیەکی مردو بەرهەم دیّ، وە لە هێلکەی مردوو باڵندەی زیندو بەرهەم دیّ کە دەجولّیّ و دەخوێنیّ و بە ئاسماندا دەفڕیّ!

گۆڕینی شێوەی ئادەمیزاد : مردن و ژیان و ژیان و مردنبەڵگەیەکی گەورەیە لەسەر دەسەڵاتی خودا کە وا لە دەرونی مرۆڤەکان دەکات مل کەچ بیّ لە بەرامبەر دەسەڵات و گەورەیی خودا بۆیەو دەفەرمویّ: ﴿ كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِٱللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَٰتًا فَأَحْيَٰكُمْ ۖ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾ (البقرة)، (خەڵکینە)، چۆن بیّ بروا دەبن بە

خوا لەکاتێکدا ئێوە بێ گیان بوون (لە توێی خاکدا) خوا (دروستی کردوون) و گیانی بەبەردا کردن، پاشان دەتانمرێنێت و دوایی زیندووتان دەکاتەوە، ئەوسا هەر بۆ لای ئەویش دەبرێنەوە.[31]

**پێنجەم: قورئان هەندێ بەڵگە دەخاتەڕوو بە مەبەستی وەڵامدانەوەی یەکێک لە تکوڵی کارانی ڕۆژی زیندوبوونەوە.**

قورئان چیرۆکی یەکێك لەو موشریکانە دەگێڕێتەوە کە زیندوبوونەوە بە دوور دەزانێ کە ئەویش (العاص بن وائل)، کاتێك هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ ئێسکێکی ڕزیوی بە دەستەوە بوو دەیپرواند و هەڵی دەدا بە هەوادا، و ئەیوت:ئەی (محمد) ئەمە زیندو دەکاتەوە دوای ئەوەی کە ڕزیوە ؟! پێغەمبەرﷺ فەرموی: (بەڵێ ئەمە زیندودەکاتەوە، دەتمرێنێ پاشان زیندوت دەکاتەوە پاشان دەتخاتە ئاگری دۆزەخەوە)[32] . پاشان ئەم ئایەتانە دابەزی: ﴿ أَوَلَمْ يَرَ الْإِنسَانُ أَنَّا خَلَقْنَاهُ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ﴿٧٧﴾ ﴾ (یس)، ئایا ئادەمیزاد سەرنجی نەداوە کە: ئێمە بێگومان دروستمان کردووە لە نوتفەیەك، کەچی خێرا بووەتە دوژمنێکی ئاشکراو دژایەتیمان دەکات.

لەسەر ئەم چیرۆکە ئایەتەکانی کۆتایی سورەتی یس دابەزی کە تیایدا خودا(جل جلاله) دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمْ يَرَ الْإِنسَانُ أَنَّا خَلَقْنَاهُ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ﴿٧٧﴾ وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِيَ خَلْقَهُ ۖ قَالَ مَن يُحْيِي الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ ﴿٧٨﴾ قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ ﴿٧٩﴾ ﴾ (یس)، ئایا ئادەمیزاد سەرنجی نەداوە کە: ئێمە بێگومان دروستمان کردووە لە نوتفەیەك، کەچی خێرا بووەتە دوژمنێکی ئاشکراو دژایەتیمان دەکات؟!

---

٣١- المرجع السابق: ص٦٩-٧٠

٣٢- صحيح: أخرجه الحاكم في مستدركه، كتاب التفسير، باب التفسير سورة يس(٣٦٠٦)، وصحيحه الحاكم، وقال: هذا حديث صحيح على شرط الشيخين ولم لم يخرجاه، ووافقه الذهبي.

نموونەی لاوازیی وبێ دەسەڵاتی بۆ ئێمە هێناوەتەوە و بەدیهاتنی خۆی لەبیر کردووە، دەیوت: کێ ئەم ئێسکانە زیندوو دەکاتەوە لە کاتێکدا کە ڕزیوو و پروکاون؟!

پێیان بڵێ: ئەو زاتەی کە یەکەمجار دروستی کرد، هەر ئەویش زیندووی دەکاتەوە، ئەو بەهەموو دروستکراوێك زاناو ئاگایە (دروستکردن و دروستکردنەوەی هەموو شتێکی لا ئاسانە..

ئەم موشریکە نمونە بۆ خودا دەهێنێتەوەو لەیادی کردووە کە خودا لە تۆوێك دروستی کردووە، ڕێی پێ نەبرد کە ئەوە سەرسوڕهێنەرترە لە لە دروستکردنەوەی ئێسکەکەی: ﴿ أَفَعَيِينَا بِٱلۡخَلۡقِ ٱلۡأَوَّلِۚ بَلۡ هُمۡ فِي لَبۡسٖ مِّنۡ خَلۡقٖ جَدِيدٖ ﴿١٥﴾ ﴾ (ق)، ئایا ئێمە لەسەرەتا و یەکەم جاردا کەئەو خەڵکەمان دروست کرد ماندوو بووین و گیروگرفت هاتەرێمان ؟! نەخێر ماندوو نەبووین، بەڵکو ئەوان لەگوماندا بەرامبەر بە دروست بوونەوەیەکی تازە. بۆیە خوا(جل جلاله) لە وەڵامی پرسیارە پوچەکەدا دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ يُحۡيِيهَا ٱلَّذِيٓ أَنشَأَهَآ أَوَّلَ مَرَّةٖۖ وَهُوَ بِكُلِّ خَلۡقٍ عَلِيمٌ ﴿٧٩﴾ ﴾ (یس)، پێیان بڵێ: ئەو زاتەی کە یەکەمجار دروستی کرد، هەر ئەویش زیندووی دەکاتەوە، ئەو بەهەموو دروستکراوێك زاناو ئاگایە (دروستکردن و دروستکردنەوەی هەموو شتێکی لا ئاسانە).

واتە زانیاری هەیە دەربارەی ئێسکەکان لەهەموو جێگایەکی زەویدا بۆ کوێ چووەو بڵاوبوەتەوەو هەڵوەشاوەتەوە پاشان خودا(جل جلاله)نمونەیەکی تری بۆ هێناوەتەوە ئەویش دارێکی سەوزە کە ئاگری لێ هەڵدەگیرسێ، خودا ئەو دارەی سەرەتا لە ئاو خولقاندوە تا سەوز و سەرنج ڕاکێش و بەردار بێت، پاشان گێڕایەوە تا بوو بە دارێکی وشك کە ئاگری لێ هەڵدەگیرسێ، بەو جۆرە هەرچییەکی بوێ ئەنجامی دەدات، بە توانایە لەسەر هەر کارێك کە بیەوێ و هیچ شتێك مەحاڵ نیە بۆی وەك دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلشَّجَرِ ٱلۡأَخۡضَرِ نَارٗا فَإِذَآ أَنتُم مِّنۡهُ تُوقِدُونَ ﴿٨٠﴾ ﴾ (یس)، ئەو زاتەی کە لە درەختی سەوز ئاگرتان بۆ بەدی دەهێنێت، ئیتر ئێوە دایدەگرسێنن.

پاشان قورئان نمونەی تر دەهێنێتەوە لەسەر گێڕانەوەی لاشەکان بە دروستکردنی ئاسمان و زەوی و بەوەسی کە تێیدایە لە هەسارەی گەڕۆك و شاخەکان و دەریاکان و لمەکان و ئەوەی لەنێوان ئەواندایە، وەك دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَيْسَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُم ۚ بَلَىٰ وَهُوَ ٱلْخَلَّٰقُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٨١﴾ ﴾ (یس)، ئایا ئەو زاتەی کە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە ناتوانێت دووبارە وەك خۆیان دروستیان بکاتەوە؟! بەڵێ (زۆر چاك دەتوانێت چونکە ئەو زاتە لە دروستکردن و داهێناندا بە توانا و زانایە.

لەم چیرۆکەدا تێبینی دەکەین کە خودا(جل جلاله)ئەوەندە بەڵگەی هێناوەتەوە کە پەسەندو دەمکوتکەر بێت بۆ موشریکەکان و خەڵکانی تریش سەبارەت بە زیندوکردنەوەو گێڕانەوە.

بەڵگەی بەسەرەتا هێناوەتەوە لەسەر گێڕانەوە، پاشان بەڵگەی بە دەسەڵاتی هێناوەتەوە لەسەر گۆڕی ی دروستکراوەکانی لە دۆخێکەوە بۆ دژەکەی ، پاشان دووپاتی کردووەتەوە ئەوەی توانای دروستکردنی شتی مەزنی هەبێت ئەوا ئاساییە کە شتی بچوکترو ئاسانتر دروست بکات، پاك و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی کە فەرمان بە شتێك بکات دەبێت، هەموو شتێك بە دەستی ئەوەو هەموانیش بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِىَ خَلْقَهُۥ ۖ قَالَ مَن يُحْىِ ٱلْعِظَٰمَ وَهِىَ رَمِيمٌ ﴿٧٨﴾ قُلْ يُحْيِيهَا ٱلَّذِىٓ أَنشَأَهَآ أَوَّلَ مَرَّةٍ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ ﴿٧٩﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلشَّجَرِ ٱلْأَخْضَرِ نَارًا فَإِذَآ أَنتُم مِّنْهُ تُوقِدُونَ ﴿٨٠﴾ أَوَلَيْسَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُم ۚ بَلَىٰ وَهُوَ ٱلْخَلَّٰقُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٨١﴾ إِنَّمَآ أَمْرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيْـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٨٢﴾ فَسُبْحَٰنَ ٱلَّذِى بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَىْءٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٨٣﴾ ﴾(یس)، نموونەی لاوازیی وبێ دەسەڵاتی بۆ ئێمە هێناوەتەوە و بەدیهاتنی خۆی لەبیرکردووە، دەیوت: کێ ئەم ئێسکانە زیندوو دەکاتەوە لە کاتێکدا کە ڕزیوو و پروکاون؟! پێیان بڵێ: ئەو زاتەی کە یەکەمجار دروستی کرد، هەر

ئـەویش زینـدووی دەکاتـەوە، ئـەو بەهـەموو دروسـتکراوێك زانـاو ئاگایـە (دروسـتکردن و دروستکردنەوەی هەموو شتێکی لا ئاسانە)....

ئـەو زاتـەی کـە لـە درەخـتی سـەوز ئاگرتـان بـۆ بـەدی دەهێنێـت، ئـیتر ئێـوە دایدەگرسێنن.ئایا ئەو زاتەی کە ئاسمانەکان و زەوی دروست کـردووە ناتوانێـت دووبـارە وەك خۆیـان دروسـتیان بکاتـەوە؟! بـەڵێ (زۆر چـاك دەتوانێـت چـونکە ئـەو زاتـە لـە دروستکردن و داهێناندا بە توانا و زانایە. بێگومـان هـەر کاتێـك فـەرمانی خـوا دەرچـوو، ویستی شتێك جێبەجێ بکات و بیهێنێتە دی، پێی دەڵێت ببە، ئەویش دەستبەجێ و بـێ دواکەوتن پێش دێت و ئەنجام دەدرێت و دروست دەبێت. پاکی و بێگەردی بۆ ئەو زاتـەی جڵەوی هەموو شتێکی بەدەستە، هەر بۆ لای ئەویش دەبرێنەوە.

**شەشەم: زینـدوکردنەوەی هەنـدێ مردو لەم دنیـا بەڵگەیەکـی ڕاستەقینەیە لەسەر توانـای ئەو(جل جلاله)بۆ زیندوکردنەوەو ژیاندنەوە لە ڕۆژی دوایدا.**

قورئان چەند چیرۆکێکی باسکردووە لەسەر زیندوکردنـەوە هەنـدێ مـردوو لـەم ژیـانی دونیـادا، بەهـەمان شـێوە خـودا پشـتیوانی لـە هەنـدێ لـە پێغەمبـەران کـردووە بـۆ زیندوکردنـەوەی مـردو لەسـەر دەسـتیان، لەوانەشـدا گـەورەترین بەڵگـە هەیـە لەسـەر توانای(جـل جلالـە)بۆ زیندوکردنـەوەو ژیاندنـەوە، قورئـان چـیرۆکی ئـەو کەسـەمان بـۆ دەگێڕێتەوە کە بەلای گوندێکدا تێپەڕ بوو کە گوندەکـە دانیشـتوانەکەی لەناوچووبوون و کۆسك و تەلاری خاڵی و وێران بوو، بۆیە پێـی سـەیر بـوو کـە چـۆن خـودا ئەمانـە زینـدو دەکاتەوە لەپاش مردنیان لەکاتێکدا کەسێکی باوەڕداربوو بـەڵام دوو دڵ بـوو، هـەر بۆیـە خودا ئەو شتەی فێرکرد لەڕێگەی دڵنیاکردنەوە واتە: بەتاقی کردنەوە، دەفەرموێ:

﴿ أَوْ كَالَّذِي مَرَّ عَلَىٰ قَرْيَةٍ وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا قَالَ أَنَّىٰ يُحْيِي هَٰذِهِ اللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا ۖ فَأَمَاتَهُ اللَّهُ مِائَةَ عَامٍ ثُمَّ بَعَثَهُ ۖ قَالَ كَمْ لَبِثْتَ ۖ قَالَ لَبِثْتُ يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ ۖ قَالَ بَل لَّبِثْتَ مِائَةَ عَامٍ فَانظُرْ إِلَىٰ

طَعَامِكَ وَشَرَابِكَ لَمْ يَتَسَنَّهْ وَٱنظُرْ إِلَىٰ حِمَارِكَ وَلِنَجْعَلَكَ ءَايَةً لِّلنَّاسِ وَٱنظُرْ إِلَى ٱلْعِظَامِ كَيْفَ نُنشِزُهَا ثُمَّ نَكْسُوهَا لَحْمًا فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥ قَالَ أَعْلَمُ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ (٢٥٩)﴾ (البقرة).

یاخود وەك ئەو كەسەی تێپەڕی بەلای شارۆچكەیەكدا كە هەموو خانووەكانی بەسەر سەقفەكانیدا تەپی بوون، لەبەر خۆیەوە وتی: ئاخۆ خوای گەورە چۆن خەڵكی ئەم شارۆچكەیە دوای مردنیان زیندوو دەكاتەوە؟! (ئەو كەسە عوزەیر پێغەمبەر بوو ﷺ) یەكسەر خوای گەورە سەد ساڵ مراندی و پاشان زیندووی كردەوە و پێی فەرموو: چەند مایتەوە؟ (عوزەیر) وتی: ڕۆژێك یان كەمتر لە ڕۆژێك ماومەتەوە، (خوا) فەرمووی: نەخێر ئەوە سەد ساڵت پێچووە، جا تەماشای خواردن و خواردنەوەكەت بكە (لەو ماوە درێژەدا) نەگۆڕاوە و تێك نەچووە، تەماشای گوێدرێژەكەشت بكە، (بۆیە ئەمەمانكرد) تا بەم بەسەرهاتە بتكەینە موعجیزە بۆ خەڵكی، جا سەیری ئێسكەكانی (گوێدرێژەكەت بكە) چۆن بەرزیان دەكەینەوە و بەیەكەوەیان دەبەستین و پاشان بەگۆشت دایاندەپۆشین، كاتێك بینی و بۆی دەركەوت وتی: چاك دەزانم و دڵنیام بەڕاستی خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێكدا هەیە.

وە لەبارەی (ابراهیم)ەوە بۆمان دەگێڕێتەوە كە داوای لە پەروەردگاری كرد كە نیشانی بدات مردو چۆن زیندو دەكاتەوە ، خودا(جل جلاله)دەفەرمویٚ: ﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّ أَرِنِى كَيْفَ تُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن قَالَ بَلَىٰ وَلَٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِى قَالَ فَخُذْ أَرْبَعَةً مِّنَ ٱلطَّيْرِ فَصُرْهُنَّ إِلَيْكَ ثُمَّ ٱجْعَلْ عَلَىٰ كُلِّ جَبَلٍ مِّنْهُنَّ جُزْءًا ثُمَّ ٱدْعُهُنَّ يَأْتِينَكَ سَعْيًا وَٱعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ (٢٦٠)﴾ (البقرة)، بە یاد بهێنە، كاتێك ئیبراهیم وتی: پەروەردگارا نیشانم بدە چۆن مردوو زیندوو دەكەیتەوە؟ خوا فەرمووی: ئایا باوەڕت نەهێناوە؟ ئیبراهیم وتی: بەڵێ (باوەڕم هەیە) بەڵام حەزدەكەم (بەچاوی خۆم ببینم) تا دڵم ئارام بگرێت، خوا فەرمووی: جا

کەواتە چوار باڵندە بهێنەو جوان سەرنجیان بدەو دوایی هەر چواریان سەربڕەو گۆشت و پەڕ و خوێنیان تێکەڵ بکە، ئەوسا لەسەر لوگکەی هەر شاخێك هەندێك لەو تێکەڵەیە دابنێ، پاشان بانگیان بکە، بەگورجی و بەپەلە هەموویان دێنەوە بۆ لات و چاك بزانە و دڵنیابە بەڕاستی خوا باڵاداست و کار بەجێ یە.

وە لەبارەی عیسا (علیه السلام) بۆمان دەگێڕێتەوە کە قوڕ شێوەی باڵندەی دروست دەکرد پاشان پیادەکرد دەبووە باڵندە بە ئیزنی خودا، هەروەها مردوی زیندو دەکردەوە بە ئیزنی خودا، هەمیشە بە گەلەکەی دەفەرموو: ﴿ وَرَسُولًا إِلَىٰ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنِّي قَدْ جِئْتُكُم بِآيَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ ۖ أَنِّي أَخْلُقُ لَكُم مِّنَ الطِّينِ كَهَيْئَةِ الطَّيْرِ فَأَنفُخُ فِيهِ فَيَكُونُ طَيْرًا بِإِذْنِ اللَّهِ ۖ وَأُبْرِئُ الْأَكْمَهَ وَالْأَبْرَصَ وَأُحْيِي الْمَوْتَىٰ بِإِذْنِ اللَّهِ ۖ وَأُنَبِّئُكُم بِمَا تَأْكُلُونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ فِي بُيُوتِكُمْ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٤٩﴾ ﴾ (ال عمران).

(لە ئایندەدا ڕایدەگەیەنێت) بەنەوەی ئیسرائیل کە من پێغەمبەرێکم، بۆ لای ئێوە ڕەوانەکراوم، بەڵگە و نیشانەیەکیشم پێ یە لە لایەن پەروەردگارتانەوە، (ئەویش ئەمەیە کە): من لە قوڕ شێوەی باڵندەتان بۆ دروست دەکەم، ئینجا فووی پێدا دەکەم، بەفرمانی خوا یەکسەر، دەبێتە باڵندەیەکی زیندوو و کوێری زکماك و نەخۆشی بەڵەکیی چاك دەکەمەوە بەویستی خوا و مردووانیش زیندوو دەکەمەوە بەفرمانی خوا و هەواڵی ئەو شتانەی کە دەیخۆن و هەڵی دەگرن لە ماڵەکانتاندا پێتان ڕادەگەیەنم، بەڕاستی لەو شتانەدا بەڵگەو نیشانە هەیە بۆتان ئەگەر ئیماندارن.

هەروەها لەبارەی هاوەڵانی ئەشکەوت بۆمان دەگێڕێتەوە کە خەوی لێ خستن بۆ ماوەی سێ سەدو شەست و نۆ ساڵ ، پاشان لەو خەوە بەئاگای هێنانەوە وەك دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ بَعَثْنَاهُمْ لِنَعْلَمَ أَيُّ الْحِزْبَيْنِ أَحْصَىٰ لِمَا لَبِثُوا أَمَدًا ﴿١٢﴾ نَّحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ نَبَأَهُم بِالْحَقِّ ۚ إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ آمَنُوا بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَاهُمْ هُدًى ﴿١٣﴾ ﴾ (الکهف)، پاشان (دوای ماوەیەکی دوورو

درێژ) له خەو خەبەرمان کردنەوەو له نوستن هەستان، تا بزانین کام دەستەیەیان دەزانن کە چەندە خەویان لێکەوتووە (ئەوانەیان کە دەڵێن رۆژێك یان کەمتر، یان ئەوانەیان کە دەڵێن مەگەر هەر خوا بزانێت چەندە خەوتووین).

ئێمە بەڕاستی و دروستی هەواڵی بەسەرهاتی ئەو لاوانەت بۆ دەگێڕینەوە، بەڕاستی ئەوانە لاوانێك بوون باوەڕی دامەزراویان هێنابوو بە پەروەردگاریان، ئێمەش زیاتر لە نووری ئیمان و هیدایەت بەهرەوەرمان کردن.

وە باسی موسی(علیه السلام)مان بۆ دەکات ئەوانەی کە پێیان ووت: ﴿ وَإِذْ قُلْتُمْ يَٰمُوسَىٰ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ نَرَى ٱللَّهَ جَهْرَةً ... ﴿٥٥﴾ ﴾ (البقرة)، یادی ئەو نیعمەتە بکەنەوە کە وتتان: ئەی موسا هەرگیز باوەڕت پێناهێنین تاوەکو بە ئاشکراو بە چاوی خۆمان خوا نەبینین.

ئەوە بوو هەورەبروسکە لەناوی بردن و تەماشایان دەکرد، پاشان خودا زیندوی کردنەوە پاش مردنیان، خودا(جل جلاله)دەفەرموێ: ﴿ .. فَأَخَذَتْكُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ﴿٥٥﴾ ثُمَّ بَعَثْنَٰكُم مِّنۢ بَعْدِ مَوْتِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٥٦﴾ ﴾ (البقرة )، ئیتر یەکسەر هەورەبروسکەکە لێی دان، لە کاتێکدا کە تەماشاتان دەکرد و بەدەورو بەری خۆتاندا دەتانڕوانی (بەسەرسامیەوە بیرتان دەکردەوە)، پاشان زیندوومان کردنەوەو ژیانمان پێبەخشینەوە لەدوای ئەو مەرگەتان بۆ ئەوەی سوپاسگوزاریی بکەن.

هەروەها باسی (بنی اسرائیل)مان بۆ دەکات کەسێك لەنێوانیاندا کوژرا بوو، وە هەر کۆمەڵێك کۆمەڵەکەی تری تاوانبار دەکرد بە کوشتنی ، پێغەمبەرەکەیان فەرمانی پێکردن بە سەربڕینی مانگایەك ، سەریان بڕی پاش ئەوەی پرسیاری زۆریان کرد لەسەر سیفاتەکانی ، پاشان فەرمانی پێکردن کە پارچەیەکی سەربڕاوەکە بکێشن بە کوژراوەکەدا ، خودا کوژراوەکەی زیندوکردەوەو هەواڵی دا بەوەی کە کێ بکوژەکەیەتی

له كاتێكدا ئه‌وان بینه‌ری ڕووداوه‌كه بوون، وه‌ك ده‌فه‌رموێ: ﴿ فَقُلْنَا اضْرِبُوهُ بِبَعْضِهَا كَذَٰلِكَ يُحْيِي اللَّهُ الْمَوْتَىٰ وَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٧٣﴾ ﴾ (البقرة)، ئینجا وتمان: به‌ پارچه‌یه‌ك له‌و مانگا سه‌ربڕاوه‌ بده‌ن به‌ لاشه‌ی كوژراوه‌كه‌دا (دیاره‌ به‌ویستی خوا وه‌ك موعجیزه‌یه‌ك كوژراوه‌كه‌ زیندوو بۆته‌وه‌و ڕاستی بكوژه‌كه‌ی خۆی وتووه‌)، جا ئا به‌و شێوه‌یه‌و به‌ ئاسانی، خوا مردوان زیندوو ده‌كاته‌وه‌و ده‌سه‌ڵاتی خۆیتان نیشان ده‌دات بۆ ئه‌وه‌ی تێبگه‌ن و ژیر بن.

**حه‌وته‌م: یه‌كێكی تر له‌و به‌ڵگانه‌ی كه‌ قورئان هێناویه‌تی له‌سه‌ر زیندوكردنه‌وه‌و سه‌رنجی مرۆڤه‌كانی بۆ ئه‌وه‌ ڕاكێشاوه‌ كاتێک نمونه‌ به‌ زیندوكردنه‌وه‌ی زه‌وی ده‌هێنێته‌وه‌ كه‌ ڕووه‌كی تیا ده‌ڕوێنێ پاش بارینی باران.**

- خودا(جـل جلاله)ده‌فه‌رموێ: ﴿ فَانظُرْ إِلَىٰ آثَارِ رَحْمَتِ اللَّهِ كَيْفَ يُحْيِي الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا إِنَّ ذَٰلِكَ لَمُحْيِي الْمَوْتَىٰ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٥٠﴾ ﴾ (الروم)، جا ئیتر سه‌رنج بده‌و ته‌ماشای چه‌نده‌ها ئاسه‌واری ڕه‌حمه‌تی خوا بكه‌، كه‌ چۆن زه‌وی زیندوو ده‌كاته‌وه‌ دوای مردنی، بێگومان ئه‌و زاته‌ی كه‌ ئه‌و كارانه‌ ئه‌نجام ده‌دات، مردووان زیندوو ده‌كاته‌وه‌و هه‌ر ئه‌و زاته‌ ده‌سه‌ڵاتی به‌سه‌ر هه‌موو شتێكدا هه‌یه‌، (مردووانیش وه‌ك ڕوه‌ك له‌ كاتی خۆیدا له‌ زه‌وی ده‌رده‌هێنێته‌وه‌ بۆ لێپرسینه‌وه‌).
- هه‌روه‌ها ده‌فه‌رموێ: ﴿ وَاللَّهُ الَّذِي أَرْسَلَ الرِّيَاحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَسُقْنَاهُ إِلَىٰ بَلَدٍ مَّيِّتٍ فَأَحْيَيْنَا بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا كَذَٰلِكَ النُّشُورُ ﴿٩﴾ ﴾ (فاطر)، خوا ئه‌و زاته‌یه‌ كه‌ بای ڕه‌حمه‌ت ده‌نێرێت و هه‌ڵمی ده‌ریاكانی پێ ده‌گوێزێته‌وه‌ و ده‌یكاته‌ هه‌ور، جا ده‌ینێرین بۆ وڵاتێكی وشك و مردوو، ده‌فه‌رموێت: ئینجا ئه‌و زه‌ویه‌مان پێ زیندوو كردوه‌ دوای ئه‌وه‌ی كه‌ مردبوو، زیندو كردنه‌وه‌ی ئێوه‌ش هه‌ر به‌و شێوه‌یه‌ ده‌بێت.

• هەروەها دەفـەرموێ: ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنَّكَ تَرَى ٱلْأَرْضَ خَٰشِعَةً فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ ٱهْتَزَّتْ وَرَبَتْ ۚ إِنَّ ٱلَّذِىٓ أَحْيَاهَا لَمُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰٓ ۚ إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ ﴾ (فصـــلت)، لـــە بەڵگـــە و نیشانەکانی خـوا ئەوەیـە کـە دەبینیـت زەوی کش وماتـە، جـا کـەتێك بـاران بەسـەریدا دەبارێنین دەخرۆشێت و گەشە و نەش و نما دەکـات، چـونکە بەڕاسـتی ئـەو زاتـەی کـە زەوی زیندوو کردەوە، مـردووانیش زینـدوو دەکاتـەوە، بێگومـان ئـەو خوایـە دەسـەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە..

• بەهەمان شێوە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِى نَزَّلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءًۢ بِقَدَرٍ فَأَنشَرْنَا بِهِۦ بَلْدَةً مَّيْتًا ۚ كَذَٰلِكَ تُخْرَجُونَ ﴿١١﴾ ﴾ (الزخرف)، هەروەها ئـەو خوایـە لـە ئاسمانـەوە بـە ئەندازەیـەکی دیـاریی کـراو بـارانی بارانـدووە و دەفـەرموێت، وڵـاتی وشـك و مردوومـان پـێ زینـدوو کردۆتەوە، هەر بەو شێوەیە ئێوەش لە گۆڕەکانتان دەهێنرێنە دەرەوە.

مەبەسـت لـە واتـای هـەموو ئەمانـە: تێـڕوانین و ڕێنمایکردنە،واتـە: ئەگـەر خودا(جـل جلاله)توانای ئەو کارانەی هەبێت کەواتە ئەولاترو ئاسانترە بۆی کە مردو زیندو بکاتـەوە، بە مانایەکی تر ئەوەی بە چاو دەبینرێ لە دەسەڵاتی خودا بەڵگەیە لەسەر ئـەو شـتانەی بەچاو نابینرێن و نادیارن[٣٣]

**هەشـتەم: لە گرنگتـرین بەڵـگە ئاشکراکان کە قورئـان باسـی کـردوە لەسـەر زینـدوبوونەوە، ڕونکردنەوەی حیکمەتی ئەو کارەیە.**

دانـــایی و دادپـــەروەری دەخـــوازن بەنـــدەکان زیندوبکرێنـــەوە بـــۆ خەمڵانـــدنی کاروکردەوەکـانی بەنـدەکان، بێگومـان ئەگـەر ڕۆژی دوایـی نەبوایـە بـۆ زیندوکردنـەوەی مرۆڤـەکان ئـەوا دروسـتکراوەکان لەسـەر بنـەمای نـاڕەوای و خراپـەکاری و سـتەم کـاری بەردەوام دەبوون بەڵام ڕۆژی دوایی بۆ لێپێچینەوە لەسەر ئەو کردەوانـەی کـە لـە ژیـانی

٣٣- الجامع الأحكام القران، القرطبي، دارالأحياء التراث المصري، بيروت ١٩٨٥م، ج١٤ ، صفحة ٤٥ بتحرف.

دونیادا ئەنجامی دەدەن، واتە ئەگەر ژیانی دونیا کۆتایی ڕێگاکە بوایە ئەوا ژیان دەبووە گاڵتەجاڕی و دروستکردنی ئاسمانەکان و زەویش بەتاڵ و بێ مانا دەبوو، خودا(جل جلاله)دەفەرموێ: ﴿ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ ﴾ (المؤمنون)، ئایا گومانتان وادەبرد کە بە ڕاستی ئێمە ئێوەمان بە بێ مەبەست دروست کردووەو ئێوە بۆ لای ئێمە ناهێنرێنەوە.[٣٤] ، هەروەها دەفەرموێ: ﴿ إِلَيْهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا ۖ وَعْدَ اللَّهِ حَقًّا ۚ إِنَّهُ يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ لِيَجْزِيَ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ بِالْقِسْطِ ۚ وَالَّذِينَ كَفَرُوا لَهُمْ شَرَابٌ مِنْ حَمِيمٍ وَعَذَابٌ أَلِيمٌ بِمَا كَانُوا يَكْفُرُونَ ﴿٤﴾ ﴾ (یونس)، گەڕانەوەی هەر هەمووتان بۆ لای ئەو زاتەیە، بەڵێنی خوا هەمیشە ڕاستەو دروستەو نەگۆڕە، بەڕاستی خۆی سەرەتا دروست کراوان بەدی دەهێنێت و دوایش وەك خۆیان لێدەکاتەوە (تا لەقیامەتدا) ئەوانەی کەباوەڕیان هێناوەو کارو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوەبەدادپەروەری پاداشتیان بداتەوە، ئەوانەش کەبێ باوەڕ بوون خواردنەوەی لەکوڵ و سزای بەئێش و ئازاریان بۆ ئامادەیە بەهۆی ئەوەی کەباوەڕیان پێ نەئەکرد.

دانایی و دادپەروەری ئەوە دەخوازێ کە بەندەکان زیندوبکرێنەوە بۆ ئەوەی پاداشت بدرێنەوە، واتە چاکە بە چاکەو خراپەش بە خراپە .خودا بەندەکانی بۆ بەندایەتی خۆی خولقاندووە، وە پێغەمبەرانی ناردووە و پەڕاوی ئاسمانی دابەزاندووە بۆ خستنەڕووی شێوازی خواپەرستی ، هەندێ لە بەندەکان بەردەوام دەبێ لە گوێڕایەڵی کردن و گیان و سامانی لەو پێناوەدا دەبەخشێ. هەندێکی تریش بەردەوامی و گوێڕایەڵی ڕەت دەکاتەوە و سەرپێچی دەکات، ئایا دەگونجێ چاك و خراپ هاوشێوەی یەکتر بمرن و خودا پاداشتی چاکەکاران نەداتەوە بە چاکە و سزای تاوانباران نەدات بەرامبەر تاوانەکانیان؟! وەك دەفـــەرموێ: ﴿ أَفَنَجْعَلُ الْمُسْلِمِينَ كَالْمُجْرِمِينَ ﴿٣٥﴾ مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿٣٦﴾ أَمْ لَكُمْ كِتَابٌ فِيهِ تَدْرُسُونَ ﴿٣٧﴾ إِنَّ

---

٣٤- رکائز الایمان، محمد قطب، مرجع سابق، ص٣٨٧

لَكُمْ فِيهِ لَمَا تَخَيَّرُونَ ﴿٣٨﴾ (القلم)، ئایا ڕەوایە پاداشتی موسوڵمانان وەك تاوانبار و تاوانكاران بێت؟! ئەوە چیتانە؟ چۆن حوكم و بڕیاری نارەوای وا دەردەكەن! ئایا كتێبێكی ئاسمانیتان بۆ هاتووە، تیایدا بخوێنن؟!.تا هەرچی ئێوە بتانەوێت بە ئارەزووی خۆتان هەڵی بژێرن.[٣٥] ئێمە دەبینین لە ژیانی دونیادا ستەمكاران ستەم دەكەن و بەردەوامن لەسەری تا دەمرن، ستەملێكراوانیش ستەمیان لێ دەكرێ تا كۆتای ژیانیان، ئایا دادپەروەرییە بە كۆتای هاتنی ژیانی دونیا هەموو شتێ كۆتای پێ بێت؟!

ئەوە كەی دادپەروەرییە ستەمكاران تۆڵەیان لێ نەكرێتەوەو ستەملێكراویش تۆڵەی بۆ نەكرێتەوە؟!

كەی لەگەڵ داناو زانای خودا(جل جلاله)یەك دەگرێتەوە كە ڕووداوەكانی ژیان بەپێچەوانەی دادپەروەری بەڕێ بكرێت و بەو شێوازەش كۆتای بێت؟!

ئایا ئەوە ڕاستە ئەوانەی وەڵامی بانگەوازی پەروەردگاریان داوەتەوە و باوەڕیان هێناوەو بەردەوام بوون لەسەر ڕێگاكەی، بە ڕیسوایی و زەلیلی بژین و بمرن وەك ئەوەی غەزەبیان لێ گیرابێت، ئەوانەشی وەڵامی داوای پەروەردگاریان نەداوەتەوەو باوەڕیان نەهێناوە، بەخۆشی و تێروتەسەلی بژین و بمرن وەك ئەوەی ڕەزامەندی خودایان دەستگیر بووبێ؟! نەخێر بێگومان ئەوە لەگەڵ دانایی و عەدلی پەروەردگاردا ناگونجێ و لەگەڵ خوایەتی خوادا یەك ناگرێتەوە... بۆیە ئەم پرسیارە دەمكوتكەرە دێتە پێشەوە: ﴿ أَفَنَجْعَلُ ٱلْمُسْلِمِينَ كَٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٣٥﴾ ﴾ (القلم)، ئایا ڕەوایە پاداشتی موسوڵمانان وەك تاوانبار و تاوانكاران بێت؟! حاشا بۆ خودا كە وابێ.

ئەوە گومانی بێباوەڕانە، ئەوان وا گومان دەبەن كە كارەكە هەڕەمەكیەو پاداشت و سزا نیە ، وەك ئەوەی بڵێن : خودا ئاسمانەكان و زەوی بەبێ هودە دروست كردووە،

---

٣٥- القیامة الكبرى، د.عمر سلیمان الأشقر، مرجع سابق، ص٧٥-٧٦

نـــەخێر: ﴿ وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَٰطِلًاۚ ذَٰلِكَ ظَنُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۚ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنَ ٱلنَّارِ ﴿٢٧﴾ أَمْ نَجْعَلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَٱلْمُفْسِدِينَ فِي ٱلْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ ٱلْمُتَّقِينَ كَٱلْفُجَّارِ ﴿٢٨﴾ ﴾ (ص)، ئێمە ئاسمان و زەوی دروستکراوانی نێوانمان بێ هودە و هەڕەمەکەی دروست نەکردووە، ئەوە بیرو باوەڕی ئەوانەیە کە بێ باوەڕبوون، هاوار و ناهوناڵە بۆ ئەوانەی کە کافر و بێ بڕوان لە سزای ئاگری دۆزەخ. نەخێر، ئەو باوەڕەیان هەڵەیە، بەڵکو ئایا ڕەوایە پاداشتی ئەوانەی ئیمان و باوەڕیان هێناوە و کاروکردەوە چاکەکانیان ئەنجام داوە، وەك ئەوانە لێ بکەین کە تۆوی خراپەیان چاندووە لە زەویدا، یاخود ئایا ئەوانەی پارێزگار و لەخواترسن وەك خراپەکاران سەیریان بکەین؟!

ئەم ئایەتە لەبارەی موشریکەکانی (قریش)ەوە دابەزیوە کە نکوڵی زیندوکردنەوەیان دەکرد، بەڵام ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە ئەنامێتی ئەم سەردەمەش هەمان نمونە بەرهەم دەهێنێ کە بە تەواوەتی ئایەتەکەی بەسەردا جێ بەجێ دەبێ.

لەوانە: (سارتەری ڕێبەری وجودییەکان)ە[٣٦] ئەو بێباوەڕەی کە دەڵێ: بوون گاڵتەیە و بەتاڵە، وە ژیانی ئادەمیزاد هیچ واتایەکی نیە و هیچ حیکمەتیکی لە پشتەوە نیە: ﴿ ..ذَٰلِكَ ظَنُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۚ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنَ ٱلنَّارِ ﴿٢٧﴾ ﴾ (ص)، ئەوە گومانی ئەوانەیە کە بێ باوەڕبوون، هاوار و ئاهوناڵە بۆ ئەوانەی کە کافر و بێ بڕوان لە سزای ئاگری دۆزەخ.[٣٧]

---

٣٦- الوجودی: القائل بمذهب الوجود أو الوجودية، وهو مذهب فلسفي يرى أن الوجود سابق على الماهية، وأن الانسان حر، يستطيع أن يصنع نفسه، ويتخذ موقفه كما يبدو له، تخفيفاً بوجوده الكامل.

٣٧- ركائز الايمان، محمد قطب، مرجع سابق، ص٣٩٠.((في اقتضاء فكر العدالة)) طلع: الوجه الثاني، من الشبهة التاسعة، من الجزء السابع، (الايمان والتدين).

**نۆهەم: یەکێکی تر لە بەڵگەکانی زیندوکردنەوە،هاورایی سەرجەم پێغەمبەرانە لەسەر هەواڵدانیان بە رۆژی دوایی: باوەر بە رۆژی دوایی و بەهەشت و جەهەنەم بنەمای ئیمانن کە پەیامی کە پەیامی سەرجەم پێغەمبەران و شوێنکەوتوانیان تیایدا هاوبەشن.**

قورئان هەواڵی ئەو بەدبەختانەی کە لە ئاگردان باسکردووە ، ئەوانەی کە داندەنێن بە ئاگادارکردنەوەی پێغەمبەرانیان بە رۆژی دوایی، وەك دەفەرموێ: ﴿ تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ ٱلْغَيْظِۖ كُلَّمَآ أُلْقِيَ فِيهَا فَوْجٞ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَآ أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٞ ٨ قَالُواْ بَلَىٰ قَدْ جَآءَنَا نَذِيرٞ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ مِن شَيْءٍ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا فِي ضَلَٰلٖ كَبِيرٖ ٩ وَقَالُواْ لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِيٓ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ١٠ ﴾ (الملك)، لە داخی خوانەناسان خەریکە پارچە پارچە ببێت و لێك ببێتەوە، هەر جارێك دەستەو تاقمێك فرێ دەدرێتە ناوی پاسەوانی دۆزەخ لێیان دەپرسێت: باشە، ترسێنەرێکتان بۆ نەهات تا لەم سەرئەنجامە ئاگادارتان بکات؟!لە وەڵامدا بەکەساسیەوە دەڵێن: با، بەڵێ، لەراستیدا ترسێنەرمان بۆهات، بەڵام ئێمە بروامان پێنەکردن و وتمان: خوا هیچی لەم بارەیەوە نەناردووە، ئێوە تەنها لە گومرایی گەورەدا گیرتان خواردووەو هیچی تر! !ئینجا دەڵێن: ئەگەر ئێمە گوێمان بگرتایەو بیرو هۆشمان بەکار بهێنایە نەدەبووینە نیشتەجێی دۆزەخ.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿ وَسِيقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ زُمَرًاۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا فُتِحَتْ أَبْوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَآ أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٞ مِّنكُمْ يَتْلُونَ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِ رَبِّكُمْ وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَاۚ قَالُواْ بَلَىٰ وَلَٰكِنْ حَقَّتْ كَلِمَةُ ٱلْعَذَابِ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ٧١ ﴾ (الزمر).

ئەوسا ئەوانەی کە بێ باوەر بوون، راپێچ دەکرێن بەرەو دۆزەخ دەستە دەستە و تاقم تاقم دەگوێزرێنەوە، تا کاتێك دەگەنە بەر قاپیەکانی، (هەموو مۆڵدەخۆن لەبەردەمیدا، دوای ماوەیەك) بۆیان دەکرێتەوە، فریشتەی بەرپرس و سەرپەرشتیار سەرزەنشتیان دەکات و پێیان دەڵێت: باشە، مەگەر پێغەمبەران لە خۆتان رەوانە

نـەکرابوو بۆتـان کـە ئایەتـەکانی پـەروەردگاری خۆتـان بەسـەردا بخوێنێتـەوە، وە یاداوەریتان بکات و داتان بچڵەکێنێت لە گەیشتنی ئەم ڕۆژە؟! بەدەم ئاخوداخ و ناڵـەوە دەڵێن: بەڵێ، بەڵام تازە، بەڵێ، سوودی نیە و بڕیاری سزاو ئازار دراوە بەسەر کافر و بێ بڕواکاندا.

سەرجەم بێباوەڕان لەکاتی چونە جەهەنەم ئەم پرسیارەیان لێ دەکرێت، دان بـەوەدا دەنێن کە پێغەمبەرانیان ترساندویانن لە گەیشتن بەو ڕۆژە بەڵام باوەڕیان پێـی نـەبووەو بە درۆیان خستووەتەوە.

وە ئـەو سـتەیە کـە ئایەتـەکانی پێشـوو لـە چـەند جێگایەکـدا ئامـاژەی پێکـردووە، خودا(جل جلاله)حیکمەت و عەدلی وا دەخوازێ کە هیچ کەسێك سـزا نـەدات کـە پـەیامی پێ نەگەشتبێ و بەڵگەی لەسەر دروست نەبوبێ وەك دەفـەرموێ: ﴿ مَّنِ ٱهۡتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهۡتَدِي لِنَفۡسِهِۦۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيۡهَاۚ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٞ وِزۡرَ أُخۡرَىٰۗ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبۡعَثَ رَسُولٗا ﴿١٥﴾ ﴾ (الاسراء)، ئێمەش سزای کەسمان نەداوە تا پیغەمبەرێکی بۆ دەنێرین.

هـــەروەها دەفـــەرموێ: ﴿ رُّسُلٗا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةُۢ بَعۡدَ ٱلرُّسُلِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمٗا ﴿١٦٥﴾ ﴾ (النســاء)، پێغەمبــەرانمان (ڕەوانــە کــردووە) کــە مژدەدەرن (بە ئیمانداران) و ترسـێنەرن بـۆ (یاخیـەکان)، تـا خـەڵکی هـیچ بەڵگەیـەکیان بەدەستەوە نەمێنێت (لەسەر بێ دینی و یاخی بوونیان) دوای ئـەوەی خـوا پێغەمبـەرانی بۆ ڕەوانە کردوون، بێگومان هەمیشەو بەردەوام خوا باڵادەست و دانایە.

لەو پێناوەشدا پەیامی ئاسمانی هەموو مرۆڤێك دەگرێتەوە واتـە گشـتگیرە خودا(جـل جلاله)دەفـەرموێ: ﴿ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ بِٱلۡحَقِّ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗاۚ وَإِن مِّنۡ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٞ ﴿٢٤﴾ ﴾ (فـاطر)، بێگومـان ئێمـە تۆمـان ڕەوانـەکردووە بەحـەق و ڕاسـتیەکی تـەواوەوە، تـۆ مـژدەدەری

(ئیمانـدارانیت)، ترسـێنەری (بـێ بڕواکانیـت) هـیچ گـەل و نەتەوەیـەکیش نـەبووە کـە فرستادە و بێدارکەرەوەیەکی بۆ ڕەوانە نەکرابێت.

وەك ئـەوەی قورئـان ئامـاژەی پێکـردووە هـیچ پێغەمبـەرێك نیـە گەلەکـەی ئاگـادار نەکردبێتەوە لە ڕۆژی دوایی لەپێناو پاداشت و سزادا.

ئەوەش لە ڕێگەی گێڕانەوەی چیرۆکی پێغەمبەران لە قورئانی پیرۆزدا.(٣٨)

**دەهەم: قورئـان لە چەنـد جارێـک زیـاترو لە چەنـد جێگایەکـدا دوپـاتیکردۆتەوە کە ئەوانەی نکوڵی زیندوکردنەوە دەکەن پشت بە هیچ بەڵگەیەک نابەستن لەسەر ئەوەی کە دەیڵێن.**

ئـەوان هـیچ زانیارییـەکیان لا نییـە لەسـەر زیندوکردنـەوە، ئـەوان تـەنها دوای گومـان کەوتون و وڕێنە دەکەن، خودا(جل جلاله)دەفـەرموێ: ﴿ وَقَالُوا۟ مَا هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَآ إِلَّا ٱلدَّهْرُ ۚ وَمَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ (الجاثية)، خوانەناسـان دەیـانوت: ژیان تـەنها ئەم ژیانی دنیایەیە، دەمرین و دەژین بە نۆرە، هەر ڕۆژگـارو زەمانـە کایگـەرن تیاماندا و دەمان مرێنن و هیچی تر! جـا ئەوانـە وەنـەبێت لەسـەر بنچینـەی هـیچ جـۆرە زانستی و زانیاریەك ئەوە بڵێن بەڵکو تـەنها پشت بـەگومان و دوودڵـی دەبەسـتن.هەروەها دەفـــەرموێ: ﴿ وَإِذَا قِيلَ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَٱلسَّاعَةُ لَا رَيْبَ فِيهَا قُلْتُم مَّا نَدْرِى مَا ٱلسَّاعَةُ إِن نَّظُنُّ إِلَّا ظَنًّا وَمَا نَحْنُ بِمُسْتَيْقِنِينَ ﴿٣٢﴾ ﴾ (الجاثية)، کاتیکیش بوترایە: بێگومـان بـەڵێنی خـوا ڕاسـتە و ڕۆژی قیامەت هەر دێت و گومانی تیادا نیە، ئێوە لە وەڵامدا دەتانوت: ئێمە هـەر نـازانین ڕۆژی قیامەت چیە؟! ئێمە هەر گومان دەبەین و دڵنیا نین!! هەروەها دەفەرموێ: ﴿ بَلِ ٱدَّٰرَكَ عِلْمُهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ ۚ بَلْ هُمْ فِى شَكٍّ مِّنْهَا ۖ بَلْ هُم مِّنْهَا عَمُونَ ﴿٦٦﴾ ﴾ (النمـــل)، نـــەخێر، ئەوانـــە زانیاری و زانستیان دەربارەی قیامەت کۆتا و کـەم و کورتـە، بـەڵکو ئـەوان لـە گومانـدان دەربارەی، بەڵکو هەر کوێرن لە ئاستیدا و دڵیان نابینایە.

---

٣٨- القيامةالكبرى، د.عمر سليمان الأشقر، مرجع سابق، ص٧٧-٨١بتصرف.

قورئان لـه چـەند جێگایەکدا دوپـاتی کردۆتـەوە کـە ئەوانـەی زیندوبوونـەوەو ڕۆژی دوایی بە ئەستەم دەزانن ئەوان لە وەهم و گومڕایدا دەژین، وەك دەفەرموێ: ﴿ أَفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَم بِهِۦ جِنَّةُۢۗ بَلِ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ فِي ٱلۡعَذَابِ وَٱلضَّلَٰلِ ٱلۡبَعِيدِ ﴿٨﴾ ﴾ (سـبأ)، ئایـا درۆ بەدەم خواوە هەڵدەبەستی، یـا شـێت بـووە؟! (نـەخێر..!!) ئەوانـەی کـە باوەڕیـان بـە ڕۆژی دوایی و قیامەت نیە، لە سزای سەختا دەبێ ژیان بەرنەسەر (چـونکە لـەدنیادا) زۆر گومڕاو سەرلێشێواوبوون.

هـــەروەها دەفـــەرموێ: ﴿ ..أَلَآ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُمَارُونَ فِي ٱلسَّاعَةِ لَفِي ضَلَٰلِۭ بَعِيدٍ ﴿١٨﴾ ﴾ (الشورى)، ئاگاداربن لە ڕاستیدا ئەوانەی موجادەلە لەسـەر قیامـەت دەکـەن و بـەگومانن لێی، لەبزر بوون و سەرلێشێواویەکی قووڵدا ڕۆچوون.

بێگومان ئەوانە لە نەزانین و گومڕایدا دەژین، چونکە ئەوەی توانیبێتی ئاسمانەکان و زەوی دروست بکات ، ئەوا ئەولاتر و ئاسانترە بتوانێ مردو زیندو بکاتەوە.

**بە کورتی:**

* بەدیهێنەری شتێك لە نەبوونـەوە بەتوانایـە لەسـەر دووبـارە زیندوکردنـەوەی پـاش لەناوچوونی.

* نکوڵیکار لە ژیاندنەوەو زیندوکردنەوەی دروستکراوەکان لە ڕۆژی دوایدا لە خەیاڵ و گومڕاییـدا دەژی، نمونـە لەسـەر ئـەوە جۆراوجـۆرو بەڵگـەش لەوبارەیـەوە زۆرە، لەوانـە زیندوکردنەوەی زەوی پاش وشك بـوونی – مـردن زینـدو دەکرێتـەوە بـە بـارینی هەنـدێ باران بەسەریدا.

* مەودایـەکی زۆر هەیـە لـە نێـوان حەقیقـەتی زیندوکردنـەوەو ئەفسـانە و داسـتاندا، بێگومان هەندێ لە مرۆڤەکان شایەت حـاڵی – لـەماوە جیاجیاکـانی مێـژوودا گێڕانـەوەی ژیان بوون بۆ جەستە مردوو ڕزیوەکان لە قورئانیشدا ئەو جیرۆکانە باسـی لێـوەو کـراوە، وەك کوژراوەکەی(بنی اسرائیل) وە وەك ئـەو کەسـەی گـوزەری کـرد بـەلای گوندەکـەدا،

**هەروەها چیرۆکی (ابراهیم)و چوار باڵندەکە، وە زیندوکردنـەوەی مـردو لەلایـەن(عیسـی) علیه السلام بە ئیزنی خودا (جل جلاله).**



## گومانی هەشتەم

### بـانگەشەکردن بـەوەی بتـەکان و پەیکەرەکـان خـوان لای خودا(جـل جلالە)تکـا دەکەن و لەویان نزیک دەکەنەوە[٣٩].

**ناوەڕۆکی گومانەکە:**

موشریکەکان لەگەڵ خودادا(جـل جلالە)خودایـەکی تـر دەپەرسـتن، بانگەشـەی ئـەوە دەکـەن کـە تکـای ئـەو پەرسـتراوانە سـودی هەیـە بۆیـان لـەلای خـودا(جـل جلالـە) لەسەرخستنیان و ڕۆزیدانیان و ئەو شتانەی کە دێتە ڕێگایان لە کاروباری دونیا هـەروەها دەڵێن: ئەم پەرستراوانە لە خودایان نزیك دەکاتەوە ، وەك خودا(جل جلالە) دەفـەرموێ: ﴿...وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ أَوْلِيَاءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَى إِنَّ اللَّهَ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ فِي مَا هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي مَنْ هُوَ كَاذِبٌ كَفَّارٌ ﴿٣﴾﴾ (الزمـر)، ئاگـاداربن: دینی پاك و خاوێن تەنها بۆ خوایە، ئەوانەش جگە لەو زاتە کەسانی ترو شتی تر دەکەنـە پشتیوانی خۆیان دەڵێن: ئێمە ئەم بت و شتانە ناپەرسـتین تـەنها لەبـەر ئـەوەی لـە خـوا نزیکمان بخەنەوە، لەکاتێکدا ئەوان لەخواوە نزیکترن، بێگومـان خـوا داوەری دەکـات لـە نێوانیاندا، لـەو شـتانەدا کـە کێشـەیان لەسـەری هەیـەو ڕایـان دەربـارەی جۆراو جۆرە، بەڕاستی خوا ئەو بیروباوەڕ چەوتەیان لێوەرناگرێت و هیدایەت و ڕێنمـوویی ئـەو کەسـانە ناکات کە درۆزن و بێ باوەڕن.

هــەروەها دەفــەرموێ: ﴿..وَيَقُولُونَ هَؤُلَاءِ شُفَعَاؤُنَا عِندَ اللَّهِ ..﴿١٨﴾﴾ (یـونس) دەشڵێن: ئا ئەو بت و شتانە تکا کارمانن لای خوا.

---

٣٩- الأيتان اللتان وردت فيها الشبهة (يونس: ١٨)، (الزمر:٣)

الأيتان التي ورد فيها الرد على الشبهة (يونس: ١٨، الزمر: ٣، الرعد: ١٦، الاسراء ٤٣-٤٢).

بۆیە لەسەردەمی نەفامیدا لەکاتی حەجکردندا دەیانووت : پەروەردگارا گوێڕایەڵم، هیچ شەریکێکت نیە جگە لە شەریکێ نەبێ کە خۆت هەتە، ئەو شەریکە و موڵکەکەشی هەر هی تۆیە، خوا بەرز و بڵندە لەو شتانەی خەڵکی بۆی هەڵئەبەستن.

**ڕێگاکانی پوچەڵکردنەوەی گومانەکە:**

١. پەرستنی جگە لە خودا داهێنراوەو کارێکە مرۆڤەکان خۆیان دروستیان کردووە

٢. ئەو پەرستراوانەی کە موشریکەکان دەیانپەرستن نە سود دەگەیەنن نە زیان و خاوەنی هیچ شتێك نین.

٣. سەرجەم دروستکراوەکان مل کەچن بۆ خودا(جل جلاله).

٤. ئەگەر لەگەڵ خودادا پەرستراوێك هەبوایە — وەك ئەوەی موشریکەکان دەیڵێن لێی نزیك دەبوونەوە دەیانپەرست.

٥. خودا(جل جلاله)پاك و بێگەردە لە شیرك.

**درێژەی بابەتەکە:**

**یەکەم: پەرستنی جگە لە خودا داهێنراوە ..**

ئەوەی وای لە موشریکەکان کردووە کە بتەکان بپەرستن، ئەوەیە کە پێشتر فریشتەیان پەرستوە، بۆ ئەوەی تکایان بۆ بکەن لەلای خودا(جل جلاله) لەسەر خستنیان و ڕۆزی دانیان و هەرشتێك کە دێتە ڕێگایان لە کاروباری دونیا، بەڵام دانیان بە زیندوکردنەوەدا نەدەناو باوەڕیان پێی نەبوو، وەك چۆن بتەکانیان دەپەرست بۆ ئەوەی هاوشێوەی فریشتەکان لە خودا یان نزیك بکاتەوە . خودا(جل جلاله) لەبارەیانەوە دەفەرموێ: ﴿... وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلْفَىٰٓ ...﴿٣﴾﴾ (الزمر): ئەوانەش جگە لەو زاتە کەسانی ترو شتی تر دەکەنە پشتیوانی خۆیان دەڵێن: ئێمە ئەم بت و شتانە ناپەرستین تەنها لەبەر ئەوەی لە خوا نزیکمان بخەنەوە.

بۆیە لەسەردەمی نەفامیدا لەکاتی حەجکردندا دەیانووت: مل کەچ و گوێڕایەڵم خۆم سپارد بە تۆ، هاتم بە دەم فەرمانتەوە هیچ شەریکت نیە جگە لە شەریکێ خۆی و ئەوەشی هەیەتی هەر هی تۆیە ، ئەم بانگەشە کردنە موشریکەکان پشتیان پێ بەستبو لە دێر زەمان و بە ئێستاشەوە، پێغەمبەران هاتوون – علیهم الصلاة و السلام بۆ ڕەتکردنەوەو ڕێگریکردن لەو کارە، یەکێك لە ئامانجی پێغەمبەران بانگکردنی بەندەکان بووە بۆ یەکتاپەرستی، هەروەها ڕونکردنەوەی ئەو بابەتە شەریك بۆ خودا بڕیاردان – لەلایەن خودی موشریکەکانەوە داهێنراوەو خودای گەورە ڕێگای پێ نەداون و ڕازیش نیە پێی ، بەڵکو بوغزاندویەتی و ڕێگری لێ کردووە، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَۖ ..﴿٣٦﴾ ﴾ (النحل) سوێند بە خوا بێگومان ئێمە لەناو هەر گەل و نەتەوەیەکدا پێغەمبەرێکمان ڕەوانەکردووەو پێمان ڕاگەیاندووە کە پێیان بڵێت: تەنها خوا بپەرستن، خۆتان دوورە پەرێز بگرن لە هەموو پەرستراوێکی تر.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ ﴿٢٥﴾ ﴾ (الانبیاء)، ئێمە پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێکمان ڕەوانە نەکردووە، کە وەحیمان بۆ نەناردبێت بەوەی کە: بێگومان هیچ خوایەك نیە جگە لە من و دەبێت هەر من بپەرستن.

پاشان خودای گەورە هەواڵ دەدات کە ئەم شرکە داهێنراوە لە نێو خەڵکدا پاش ئەوەی کە بوونی نەبووەو سەرجەم خەلکان لەسەر یەك ئاین بوون کە ئەویش ئیسلام بووە دواتر جیاوازیان تێکەوتووەو پارچە پارچە بوون، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ ٱلنَّاسُ إِلَّآ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ فَٱخۡتَلَفُواْۚ ...﴿١٩﴾ ﴾ (یونس)، خەڵکی لەسەرەتای پەیدا بوونیاندا بەش بەش نەبوون بەڵکو تەنها یەك پارچەبوون، یەك ئاین بوون، یەك بیرو باوەڕ

بـوون، جـا كـه (زهمـان تێپـهڕی و زۆر بـوون و لهسهرچـاوهی نـووری پێغهمبهرایـهتی دوورکهوتنهوه) ناکۆکی و جیاوازی لهنێوانیاندا پهیدا بوو بهش بهش بوون.

**دووهم: ئهو خودایـانهی که موشـریکهکان دهیانپهرسـت نه سـودی پـێ دهگهیانـدن نه زیـان خاوهنی هیچ شتێک نهبوون.**

ئهو موشریکانهی کـه لهگـهڵ خـودادا شـتی تریـان دهپهرست بهبههانـهی ئـهوهی کـه شفاعهتی ئهو خودایانه سودی دهبێت بۆیان لـهلای خـودا. خـودای گـهوره ئـهم بههانهیـه ڕهتدهکاتهوهو ڕایدهگهیهنێت که ئهو خودا بانگهشه بۆ کراوانه نـه زیـان دهگهیـهنن و نـه سود نه خاوهنی هیچ شتێکن، وه هیچ شتێك لهوانـهی بانگهشـهی بـۆ دهکـهن ڕونـادات و هەرگیز ئهو کاره نایهتهدی ، خودای گهوره دهفهرموێ:

﴿ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِ ۚ قُلْ أَتُنَبِّـُٔونَ ٱللَّهَ بِمَا لَا يَعْلَمُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿١٨﴾ ﴾ (یونس).

(بێ باوهڕان وخوانهناسان) شتێك دهپهرستن لهجیاتی خوا نـه زیانیـان پێدهگهیـهنێت نه قازانج، دهشڵێن: ئا ئهو بت و شـتانه تکاکارمـانن لای خـوا، پێیـان بڵـێ ئـهی محمد ﷺ باشه ئایا ئێوه خوا ئاگادار دهکهنهوه بهشتێك که لهئاسمانهکان و لهزهویدا هـهبێت و خـوا نـهیزانێت؟! پـاك و بێگـهردهو بـهرزو بڵنـدهو دووره لـهوهی کهنـهفامان دهیکـهن بههاوهڵی.

بهو مانایهی: ئێوه ههواڵدهدهن بـه خـودا بـهوهی کـه جـی لـه ئاسمانـهکان و زهویـدا ڕوودهدات؟

هــهروهها خــودای گــهوره دهفــهرموێ: ﴿ قُلْ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ قُلِ ٱللَّهُ ۚ قُلْ أَفَٱتَّخَذْتُم مِّن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ لَا يَمْلِكُونَ لِأَنفُسِهِمْ نَفْعًا وَلَا ضَرًّا ۚ قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ أَمْ هَلْ تَسْتَوِى ٱلظُّلُمَٰتُ وَٱلنُّورُ ۗ

﴿ أَمْ جَعَلُوا لِلَّهِ شُرَكَاءَ خَلَقُوا كَخَلْقِهِ فَتَشَابَهَ الْخَلْقُ عَلَيْهِمْ ۚ قُلِ اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ ﴿١٦﴾ ﴾ (الرعد)، (ئەی محمد ﷺ به خوانەناسان) بلّێ: کێ پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەویە؟ (ئەگەر ئەوان بێ دەنگ بوون) تۆ بلّێ: الله پەروەردگاریانە، (چونکە ئەوانە کەڕ کوێرو لاڵن لەوانەیە دان بەو ڕاستیەدا نەنێن) پاشان پێیان بلّێ: ئایا ڕەوایە جگە لەو خوایە پشت بە شتانی تر ببەستن و بیانکەنە پشتیوان و خۆشەویست، کە ئەوانە تەنانەت بۆ خۆشیان قازانج و زەرەریان بەدەست نیە؟! هەروەها بلّێ: باشە ئاخر کوێر و چاوساغ وەك یەکن؟! تاریکی و ڕووناکی چوونیەکن؟! (دیارە خوانەناسی و بێ دینی کوێری و تاریکیە، ئیمان و باوەڕو خواناسیش چاو ساغی و ڕووناکیە)، بەڵکو چەند هاوبەشێکیان دانـاوە بـۆ خـوا، کەشـتیان دروسـتکردووە وەك دروسـتکراوەکانی خـواو جـا دروستکراوەکەیان لێ شێواوە، پێیان بلّێ: الله بەدیهێنەرو دروستکاری هەموو شتێکە و ئەوزاتە تاکوتەنهاو بەدەسەڵات و بەهێزو بە توانایە. خودا ڕوونی کردۆتەوە کەوا ئەو خودایانەی ئەوان پشتی پێدەبەستن و دەیانپەرستن توانای هیچی نیە بۆ خۆی و بە تایبەتیش بۆ شوێن کەوتەکانیان واتە نە سودیان پێ دەگەیەنن نە زیان، ئایا هاوشێوەو یەکسانە کەسێك کە خودا بە تاك و تەنهای بپەرستێ و لەلایەن خوداوە ڕێنمونی کرابێ، یاخود کەسێك کە ئەو خودا دەستکردانە بپەرستێ کە لە تاریکی و گومڕایدایە و لێی نایەتە دەرەوە؟!

وەك دەفەرموێ: ﴿ ...أَمْ جَعَلُوا لِلَّهِ شُرَكَاءَ خَلَقُوا كَخَلْقِهِ فَتَشَابَهَ الْخَلْقُ عَلَيْهِمْ... ﴿١٦﴾ ﴾(الرعد)، واتە ئایا موشریکەکان لەگەڵ خودای گەورەدا چەند هاوبەشێکیان بۆ خوا داناوە گوایە وەك دروستکراوانی خوایان دروستکردبێ و دروستکراوەکانیان لێ شێواوە کارەکە بەو شێوازە نیە، پاك و بێگەردی بۆ ئەو خودایەی هاوتاو هاوشێوەی هیچ شتێك نیە و هاوچەشن و کوڕو وەزیری نیە، گەورەیی و پاك و بێگەردی بۆ خودا، بەڵکو موشریکەکان ئەو خودایانەیان پەرستوە لەگەڵ ئەوەی کە دان بەوەدا دەنێن کە ئەوانە دروستکراوێکن

له دروستكراوه‌كانی خودا، بۆیه خودای گه‌وره زاتی پیرۆزی خۆی پاك ڕاده‌گریّ له شـیرك و بێباوه‌ڕییـــان و ده‌فـــه‌رمویّ: : ﴿ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِ ...﴿١٨﴾ ﴾ (یونس)، (بیّ باوه‌ڕان وخوانه‌ناسان) شتێك ده‌په‌رستن له‌جیاتی خوا نه زیانیان پێده‌گه‌یه‌نێت نه قازانج، ده‌شڵێن: ئا ئه‌و بت و شتانه تكا كارمانن لای خوا.

**سێیه‌م: سه‌رجه‌م دروستكراوه‌كان مل كه‌چن بۆ خودا (جل جلاله).**

قورئانی پیرۆز دوپاتی ده‌كاته‌وه كه سه‌رجه‌م دروستكراوه‌كان مل كه‌چن بـۆ خـودا و هیچ كه‌سێكیان بوێری ئه‌وه‌یان نیه شفاعه‌ت بكه‌ن به‌بیّ ئیزنی خودا، فریشـته نزیكـه‌كان لـه ئاسمانه‌كانـداو دروسـتكراوه‌كانی تـریش هـه‌موویان به‌نده‌یـه‌كی مـل كه‌چـن بـۆ خـودا شفاعه‌ت ناكه‌ن لای خودا مه‌گه‌ر خۆی‌ڕازی بێت ڕێگـه‌یان پێبـدات، ئـه‌وان لای خـودا وه‌ك ئه‌میره‌كان نین لای پادشـاكانیان، واتـه بـه‌بیّ ئیزنـی پادشـاكانیان شـفاعه‌ت ده‌كـه‌ن بـۆ كه‌سانێك كه پادشا خۆشی بویّ یاخود ڕقی لێبیّ.

خودای گـه‌وره ده‌فـه‌رمویّ: : ﴿ ...مَن ذَا ٱلَّذِى يَشْفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ ...﴿٢٥٥﴾ ﴾ (البقـرة) كیّ یه ئه‌وه‌ی (ده‌توانێت) تكا بكات له لای ئه‌و، به‌بیّ مۆڵه‌تی خۆی..

هـه‌روه‌ها ده‌فـه‌رمویّ: ﴿ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرْتَضَىٰ وَهُم مِّنْ خَشْيَتِهِۦ مُشْفِقُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾ (الانبیاء): هه‌ر خوا ده‌زانێـت ئـه خه‌ڵكـه لـه ڕابـوردوودا چـیان ئه‌نجامداوه و له داهاتووشدا چی ئه‌نجام ده‌ده‌ن (دنیا و قیامه‌ت، ڕابوردوو و داهاتوو، بـۆ ئه‌و زاته چوونیه‌كه)، فریشته‌كانیش تكاكار نابن ته‌نها بۆ ئـه‌و كه‌سـانه نـه‌بێت خـوا پێـی ڕازییه و ئه‌و فریشتانه له ترسی ئه‌و زاته ناوێرن هیچ سه‌رپێچیه‌ك ئه‌نجام بده‌ن.

داواكردنـی شـفاعه‌ت له‌لایـه‌ن موشـریكه‌كانه‌وه له‌وپـه‌ڕی گومڕایدایـه كـه چـاوه‌ڕێی شفاعه‌تن له داهاتوودا له‌لای كه‌سێك كه نه سودی هه‌یه‌و نه زیان له حاڵی حازرللح

**چوارەم: ئەگەر لەگەڵ (الله)دا خودایەکی تر هەبوایە وەک ئەوەی موشریکەکان بانگەشەی بۆ دەکەن ئەوە لێی نزیک دەبوونەوەو دەیانپەرست.**

یەکێکی تر لە وەڵامەکانی قورئان بۆ موشریکەکان فەرمودەی خودایە کە دەفەرموێ: ﴿ قُل لَّوْ كَانَ مَعَهُۥٓ ءَالِهَةٌ كَمَا يَقُولُونَ إِذًا لَّٱبْتَغَوْا۟ إِلَىٰ ذِى ٱلْعَرْشِ سَبِيلًا ﴿٤٢﴾ ﴾ (الاسراء)، (ئەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بەو موشریکانە) بڵێ: ئەگەر خوای تریش هەبوایە لەگەڵ خوای پەروەردگاردا هەروەکو ئەوان دەڵێن.. ئەو کاتە هەموان هەوڵیاندەدا بۆ ئەوەی دەسەڵات لە خاوەنی عەرش و تەختی فەرمانڕەوایەتی بسەنن و لێی زەوت بکەن،

ئەمە یانی: ئەی محمد بەو موشریکانە بڵێ کە بانگەشەی خودایەك دەکەن لەگەڵ خودادا و دەیپەرستن بۆ ئەوەی لەویان نزیك بخاتەوە: ئەگەر کارەکە بەو شێوازە بوایە کە ئێوە دەیلێن کە خودایەکی لەگەڵدایە دەپەرستێ بە مەبەستی نزیك بوونەوەو تکاکردن دەبوایە ئەو پەرستراوانە خودایان بپەرستایە و لێی نزیك ببونایەتەوە و داوای پلەوپایەو نزیکیان بکردایە، ئێوە تەنها ئەو خودایە بپەرستن کە خواکانتان دەیپەرستن، ئیتر پێویستتان بە پەرستراوێك نیە کە نێوەند گیریتان بۆ بکات، چونکە خودای گەورە بەو کارە ڕازی نیەو پێی خۆش نیە، بەلکو ڕقی لێی دەبێتەوەو ڕەتی دەکاتەوە و لەسەر زاری سەرجەم پێغەمبەران نەهی لەو کارە کردووە وە لەڕووی بەڵگە هێنانەوەوە ئێوە ئەوانتان کردۆتە خواو دەڵێن : تەنها بۆ ئەوە دەیانپەرستین کە تکامان بۆ بکەن لای خودا، جا ئەگەر ئەوانە خواین وەك ئەوەی ئێوە سیفەتی خوایەتیان پێدەدەن ، ئیتر ئەوان پێویستیان بە مل کەچ کردن نەدەبوو بۆ خوای گەورە، ئەوەندە بەس بوو بۆ ووتە ناماقوڵە کانتان، ئەگەر خوایەتی بەو شێوازە بێت کە پێویستی بە کەسانی تر نەبێت، دەبوایە ڕێڕەوی قسەکەتان بەم جۆرە بوایە کە ئەوانە خوا نین بەڵکو بەندەی ڕێزلێ گیراوی خودان، ئەمەیان زیرەکانەتر بوو لەوەی یەکەم ، ئاوات خواستن بۆ ئەو خواستە

خۆشەویستی و ڕەغبەتـە وەك دەفـەرموێ: ﴿إِنَّ هَٰذِهِۦ تَذْكِرَةٌ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا ﴿١٩﴾﴾ (المزمل)، بەڕاستی ئـەم سوورەتەش یادخـەرەوەو ئامۆژگاریـە، بـۆ ئـەو کەسەی دەیەوێت ڕێگە بەرەو پەروەردگاری بگرێتەبەر.

ڕێگا بۆ گەیشتن بەم واتا مەجازیە باشترە لە پەنا بۆ بردن و هەوڵدان بـۆ ڕازیکردنـی. وە ئەگەری هەیە مەبەست لە ڕێگـا ڕێگـای هەوڵدان بێـت بـۆ زاڵ بـوون و زۆرداری، واتـە داوای سـەرکەوتنیان دەکـرد بەسـەر خـوای گـەورەدا، ئـەو فەرمایشـتەی خـودا کـە دەفـــــەرموێ: ﴿مَا ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ مِن وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُۥ مِنْ إِلَٰهٍ ۚ إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَٰهٍۭ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٩١﴾﴾ (المؤمنون)، هەرگیز خوا کەسی نەکردووە بە ڕۆڵەی خۆی و هیچ خوایەکی لەگەڵدا نی یە، چونکە ئـەو کاتـە هـەر خوایـەك دەچـوو بەلای دروستکراوانی خۆیەوەو هەندێکی خۆی بڵند دەکرد بەسەر هەنـدێکی تـردا (ئەوسـا بوونەوەر تێکدەچوو)، پاکی و بێگەردی بۆ زاتی خوایە لە بەرامبەر ئەو شتانەوە کە (خوا نەناسان) هەڵی دەبەستن و دەیڵێن.

واتە هەوڵی زاڵبونیان دەدا بەسەر یەکتردا بـە هێـرش بردنـە سـەر یـەکتر، چـونکە وا باوە کە دەسەڵاتدارەن بۆ فراوانکردنی سـنوری دەسـەڵاتەکەیان گەلـە کۆمـە دەکـەن لـە دەسەڵاتداری سەرەکی بۆ دەست بەسـەرداگرتنی موڵکەکـەی یـاخود بەشـێکی ، شـۆڕش لـەو شـێوازە زۆرە کـە فـەرمانڕەواو دەسـەڵاتدارەکان چـاویان بڕیوەتـە پادشـایەك و شانشـینەکەیان زەوت کـردووە، جـا ئەگـەر خـودای گـەورە خـودای تـری لەگـەڵ بوایـە بەهەمان شێوە دەبوو...

جیهـانی ڕووبـەڕووی تێکچـوون و هەڵوەشـان دەکـردەوە بـەهۆی سـەرقاڵبونی بەڕێوەبەرانی بـە کوشـت و کوشـتارەوە بـە هـەمان شـێوازی (میثولوجیـا الیونـان)[٤٠] لـە

---

٤٠- المیثولوجیا: علم الأساطیر والخرافات، المتصلة بالألهة وأنصاف الألهة عند شعب من شعوب.

زاڵبوونی خاوەندارەکان و پیلان گێڕییان لە دژی یەکتر، ئەم ئایەتە پیرۆزەش هەمان مانا دەگەیــــەنێت: ﴿ لَوْ كَانَ فِيهِمَآ ءَالِهَةٌ إِلَّا ٱللَّهُ لَفَسَدَتَا ۚ فَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾ (الانبیاء)، ئەگەر لـە هەردووکیانـدا (لـە ئاسمـان و زەویـدا) چـەند خوایـەکی تـر هەبوایـە غەیری (الله)، ئەوە کاول و وێران دەبوون و تێك دەچوون بەسەر یەکدا، پاکی و بێگەردی بۆ خوا کە پەروەردگاری عەرشە.

ئەو نیشانەو بەڵگە لە زانستی ئوصوڵدا بەبەڵگەی (تمانع) ناودەبرێ، رێگا بۆ گەیشتن بەو واتایە واتایەکی مەجازیە لەسەر توانای زاڵبون بەسەر مەبەستدا زاڵبـون بەسـەر ئـەو کارەدا زاڵبونە بەسەر پێگەدا ، ئەوەش لە رێگەی دژایەتی و زۆرە ملێوە.[41]

**پێنجەم: خودا (جل جلاله) پاک و بێگەردە لەوەی هاوبەشی هەبێت.**

لـە کۆتـایی کۆتایهێنـان بـە پروپاگەنـدەی موشـریکەکان خـودا خـۆی پـاك و بێگـەرد ڕادەگـرێ لــە بانگەشــەکانیان و دەفــەرموێ: ﴿ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَقُولُونَ عُلُوًّا كَبِيرًا ﴿٤٣﴾ ﴾ (الاسراء)، ستایش و پاکی و بڵندی بۆ ئەو پەروەردگارەیە (کـە ئـەو نەفامانـە دەربـارەی ئەو هەموو ناڕەواییە دەڵێن) و ئەو زاتە زۆر بەرزو بڵندو گەورەترە (لە بۆچوونی ئەوان).

پاشان لە میانەی فەرمایشتەکانی دا وێنایەکی بێ هاوتا بۆ بوونەوەرو ئەوەش تێیدایە دەکێشێ، لەژێر عەرشدا ، کە چۆن سەراپای بوونەوەر ڕوو لە خودا دەکەن و تەسبیحاتی دەکـەن و لێـی نزیـك دەبنــەوە: ﴿ تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ ٱلسَّبْعُ وَٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ ۚ وَإِن مِّن شَىْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِۦ وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ ۗ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا ﴿٤٤﴾ ﴾ (الاسراء)، هەر حەوت ئاسمانـەکان و زەوی و هەموو ئەوانەی کە تیایاندا هەن، تەسبیحات و ستایشی ئـەو زاتـە دەکـەن، هـیچ شتێك نی یە لەم بوونەوەرەدا کە تەسبیحات و ستایش و سوپاسی ئەو زاتە نەکات، بەڵام ئێوە لە تەسبیحات و ستایشی ئەو شتانە تێناگەن، بەڕاستی ئەو زاتە هەمیشەو بەردەوام

---

٤١- التحرير والتنوير: الطاهر ابن عاشور، مرجع سابق، ج (٧، ١٥)،(صلى اللهعليهوالهوسلم)١١١- ١١٣

خۆگرو بە حەوسەڵەیە (لە بەرامبەر لادانی خەڵکیەوە) لێخۆشبووەو چاوپۆشی دەکات (ئەگەر ڕووی تێبکەن و باوەڕی پێ بهێنن.

بەو دەستەواژە سەرجەم گەردیلەکانی نێو ئەم بونەوەرە گەورەو گرانە دڵیان لێدەداتپل دەدەن و دەبنە ڕۆحێکی زیندو بۆ تەسبیحاتی خودای گەورە، گەردون جوڵەو ژیانی تێدەکەوێت و سەرجەم بوونەوەر پێکەوە هێدی هێدی سەرقاڵی تەسبیحاتن، ئەو تەسبیحاتە بەرز دەبێتەوە لە گەورەیی و مەزنی دا بۆ لای خالقی تەنها و گەورە..

ئەوە دیمەنێکە بۆ گەردونێکی بێ هاوتا کاتێك عقڵ وێنای هەموو بەرد و دەنکۆڵەو گەڵاو گوڵ و بەروبووم و درەخت و نەمام و هەموو مارو مێرو خشۆك و گیانلەبەرو مرۆڤ و هەموو ئەوانەی بەسەر زەویدا دەڕۆن و هەموو ئەوانەی سەرقاڵی تەسبیحاتن لە ئاوو وشکانیدا وە لەگەڵیشی دا سەرجەم دانیشتوانی ئاسمانەکان هەمویان تەسبیحاتی خودا دەکەن وە دەگەڕێنەوە بۆ لای ئەو: (وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ) تەسبیحات دەکەن بە ڕێگاو زاراوەی جیاواز(وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ) ئێوە لێی حاڵی نابن چونکە ئێوە دابڕێنراون و زیاتر هۆگری سیفەت و خەسڵەتە وەڕینەکەی خۆتانن واتە دوورن لە عالەمی ڕۆحانی وە لەبەر ئەوەی بە دڵ گوێتان لە نهێنییە شاراوەکانی بونەوەر نەگرتووە غافڵ بوون لەو یاساو ڕێسا گەردونیانەی کە هەموو گەردیلەکانی ئەم بونەوەرە گەورە بەرەو خۆی کەمەندکێش دەکات بەرەو ئاراستەی بەدیهێنەرەکەی ئاراستەی دەکات.

(إِنَّهُ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا) لێرەدا باس لە ئارامگرتن و لێبوردەیی دەکات لە کاتێکدا ئادەمیزاد کەمتەر خەمە لە ئاست ئەو ئاپۆڕا گەردونیەدا کە تەسبیحاتی حەمدی خودا دەکەن لە کاتێکدا هەندێکیان سەرقاڵی دەرپێچی کردنن ، هەیانە شەریك بۆ خودا بڕیار دەدات ، و هەیانە کچان دەدەنە پاڵ خودا ، وە هەیانە بێ ئاگایە لە سوپاس کردن و تەسبیحاتکردنی . لەگەڵ ئەوەی ئادەمیزاد لە هەموو دروستکراوەکانی تر لە پێشترە بۆ یەکتا پەرستی و خودا ناسی و تەسبیحات و سوپاسگوزاری خودا.

ئەگەر لێبوردەیی و ئارامگری خودا نەبایە ئەوا بەهیلاکدا دەچوو، بەڵام خودای گەورە مۆڵەتیان پێ دەدات و ئامۆژگاریان دەکات و وەبیریان دەهێنێتەوەو دەیان ترسێنێ(إِنَّهُ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا).

**بە کورتی:**

* لە بنچینەدا مرۆڤەکان لەسەر سروشتێکی ڕاست و دروست بوون پاشان دوچاری شیرك بوون خوای گەورەش لەهەر نەتەوەیەکدا پەیامبەرێکی ناردووە بۆ گێڕانەوەی مرۆڤەکان بۆ سروشتی خۆیان کە ئەویش ئیمان و یەکتا پەرستیە.

* ڕووداوەکان ئەوە دەسەلمێنن ئەو خودایانەی کە مرۆڤەکان دەیانپەرستن توانای ڕەتکردنەوەی زیانیان نیە لەسەر خۆیان و بەهەمان شێوە توانای سود گەیاندنیان نییە بە خۆیان چ جای سودیان بۆ شوێنکەوتوانیان هەبێت.

* هەموو ئەوانەی لە ئاسمانەکان و زەویدان مل کەچن بۆ خودا وە هیچ کەس توانای سود و زیان گەیاندنی نیە کەسیش توانای تکاکردنی نیە بەبێ ئیزنی خودا.

* خودای گەورە پاك و بێگەردە لە شیرك ئەگەر خودایەکی تر بونی هەبوایە — وەك ئەوەی بانگەشەی بۆ دەکەن تەنها ئەوەیان بۆ دەمایەوە کە لە خودا نزیك ببنەوە ئیتر پێویستی نەدەکرد ئەو خودا داهێنراوە بکەنە تکاکار.

## گومانی نۆیەم

## بانگەشەی خوایەتی گوێرەکە[٦٢]

**ناوەڕۆکی گومانەکە:**

کاتێك خودای گەورە بەنی ئیسراسیلی لە دەست فیرعەون ڕزگارکرد، بەلای گەلێکدا تێپەڕین کە بتیان دەپەرست داوایان کرد لە موسی(علیە السلام) کە خودایەکیان بۆ دیاری بکات هاوشێوەی ئەوان، داواکەی ڕەتکردنەوەو گومڕایی ئەو گەلەی بۆ ڕوونکردنەوە پاشان فیتنە (شەیدای) گرتنی بەو دراوسێیانەی کە مانگایان دەپەرست، ئەمەش پاڵی بە سامرییەوە نا لە غیابی موسادا گوێرەکەیەکیان بۆ دروست بکات کە کون و دەلاقەی هەبێت، کاتێك هەوای پێدا تێپەڕیبوایە دەنگێکی دەردەکرد وەك دەنگی بۆڕەی مانگا، کاتێك دەیبۆڕاند سوجدەیان دەبرد و جارێکی تر کە دەیبۆڕاندەوەو سەریان بەرزدەکردەوە. سامیری پێی ووتن: ئەمە خودای ئێوەو خودای موسایە ، بەردەوام بن لەسەر پەرستنی و خۆشتان بوێت. خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَأَخْرَجَ لَهُمْ عِجْلًا جَسَدًا لَّهُ خُوَارٌ فَقَالُوا هَٰذَا إِلَٰهُكُمْ وَإِلَٰهُ مُوسَىٰ فَنَسِيَ ﴿٨٨﴾﴾ (طـه)، بەو زێـرو زیـوە پەیکەری گوێرەکەیەکی بۆ دروست کردن (جارجار) بۆڕەیەکی دەکرد، (سامیری و بێ دینەکان بێ شەرمانە) وتیان: ئەمە خوای ئێوە و خوای موسایە، ئەو لە بیری چووە و (بەشوێنیدا دەگەڕێت). ﴿وَاتَّخَذَ قَوْمُ مُوسَىٰ مِن بَعْدِهِ مِنْ حُلِيِّهِمْ عِجْلًا جَسَدًا لَّهُ خُوَارٌ ۚ أَلَمْ يَرَوْا أَنَّهُ لَا يُكَلِّمُهُمْ وَلَا يَهْدِيهِمْ سَبِيلًا ۘ اتَّخَذُوهُ وَكَانُوا ظَالِمِينَ ﴿١٤٨﴾﴾ (الاعراف)، جا لە دوای چوونی موسا (بۆ کێوی تور) قەومەکەی پەیکەری گوێرەکەیەکیان لە خشڵەکانیان دروست کرد، کە بۆڕەیەکی هەبوو! ! ئایا ئەوان نەیانزانی کە ئەوە بەڕاستی قسەیان لەگەڵدا ناکات و ڕێنموییان ناکات بۆ هیچ ڕێیەك، (سەیرە لەگەڵ ئەو هەموو کەم و کوڕیانەشدا) کردیان بەخوای خۆیان، ئەوانە ستەمکار بوون.

**ڕێگاکانی پوچەڵکردنەوەی گومانەکە:**

١. سروشتی شکست خواردووی بەنی ئیسرائیل و تامەزرۆیی بەردەوامیان بۆ پەرستنی خوایەکی بەرجەستەو بینراو لە بەردەمیاندا وای لێکردن بکەونە داوی پەرستنی گوێرەکەوە

٢. گوێرەکە توانای سود و زیان گەیاندنی نیەو توانای ئاخاوتنیشی نیە ئیتر چۆن دەبێتە خوا؟!

٣. ڕاستیەکان ئەوە دەسەلمێنن کە گوێرەکە توانای چاودێری و پەرستشی ئەو کەسانەی نیە کە دەیپەرستن ، یاخودا ناتوانێ ئەو کەسانەی کە دروستیان کردوە وەستاکان لەسزای خودا بیان پارێزێت، تەنانەت توانای پارێزگاری لە خۆکردنی نیە لە سوتان و تیاچوون.

پاك و بێگەردی بۆ خودا هیچ خودایەك نیە جگە خودای تاك تەنها.

**درێژەی بابەتەکە:**

**یەکەم: سروشتی شکست خواردووی بەنی ئیسرائیل تامەزرۆیی بەردەوامیان بۆ پەرستنی خودایەکی بەرجەستە و بینراو لە بەردەمیاندا وای لێ کردون بکەونە داوی پەرستنی گوێرەکە.**

قورئانی پیرۆز سروشتی لادەری بەنی ئیسرائیلی ڕوونکردۆتەوە،سروشتی شکست خواردویان. لەبەرامبەر ئەو بەرانەتەی کە خوای گەورە سروشتی مرۆڤی لەسەر داناوە هەر ئەوەش خستنیە داوی پەرستنی گوێرەکە، بێگومان قورئان بۆی گێڕاوینەتەوە کە بەنی ئیسرائیل ماوەیەکی زۆر لە نارەحەتیدا ژیاون، بت پەرستی فیرعەونپەرستنی فیعەون فیرعەون کوڕەکانی دەکوشت و دەست درێژی دەکردە سەر ئافرەتەکانیان، کاتێك ئەو جۆرە دڕندەیی و ترس و تۆقاندنە بە شێوازێکی ناشیرین تیایاندا بڵاو بووەوە، لەهەموو حاڵەتێکدا بەسەر شۆڕی و بێگاری و ڕاونان ژیانیان بەڕێ دەکرد، سروشت و ناخیان بۆگەنی کرد و بۆچونەکانیان دوچاری لادان بوو، ناخیان پڕاوپڕ بوو لە سەرشۆڕی و چاوچنۆکی لەلایەك ، لەلایەکی تریشەوە دوچاری دڵ ڕەقی و ڕق و کینە بوونەوە.

ئەم دوو لایەنە پێکەوە بەستران و لەدەروونی مرۆڤایەتیدا و بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ دوچاری ترس و تۆقاندنی کردبوون.

خودای گەورەش دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِي ٱلْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ طَآئِفَةً مِّنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَآءَهُمْ وَيَسْتَحْيِۦ نِسَآءَهُمْ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٤﴾ ﴾(القصص)، بێگومان فیرعەون زاڵ و دڕندە بوو لە وڵتەکەیدا، خەڵکەکەی پارچە پارچە کرد (جیاوازی خستە نێوانیانەوە)،دەستەیەکیانی دەچەوساندەوە و لوازی دەکردن، منداڵە نێرینەکانی سەردەبڕین، کچان و ئافرەتانی (بەزەلیلی دەهێشتەوە)، بەڕاستی ئەو ستەمکارە یەکێك بوو لەوانەی تۆوی خراپی دەچاند.

خودای گەورە منەتی خستە سەر بەنی ئیسرائیل و لەو نارەحەتیە ڕزگاری کردن: ﴿ وَلَقَدْ نَجَّيْنَا بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ مِنَ ٱلْعَذَابِ ٱلْمُهِينِ ﴿٣٠﴾ مِن فِرْعَوْنَ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَالِيًا مِّنَ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿٣١﴾ ﴾ (الدخان)، پاشان ئێمە نەوەی ئیسرائیلمان لە سزای چەوسێنەرەوەی فیرعەون ڕزگارکرد..بەڵێ، لەدەست فیرعەون کە زۆر خۆی بەگەورە دەزانی و بەتەواوی لەسنووری دەرچوو بوو..

خودای گەورە بە موعجیزەیەکی گەورە ڕزگاری کردن وەك دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ فَرَقْنَا بِكُمُ ٱلْبَحْرَ فَأَنجَيْنَٰكُمْ وَأَغْرَقْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ﴿٥٠﴾ ﴾ (البقرة)، یادی ئەو نیعمەتە بکەنەوە کە لەبەر خاتری ئێوە دەریاکەمان لەت کرد، ئینجا ڕزگارمان کردن، دارو دەستەی فیرعەونمان نغرۆ کرد، لەکاتێکدا ئێوە بەچاوی خۆتان بینیتان و تەماشاتان دەکردن.

بەم موعجیزەیە ژیانی بەنی ئیسرائیل قۆناغی ترس و سەرشۆڕی و بە پەنگ بوویان کۆتایی پێهات، و ڕزگاریان بوو لەو زەویەی کە پڕاوپڕ بوو لە زۆرداری و سەرشۆڕی بۆ بیابانێکی سەربەست و بەرەو شوێنێکی پیرۆز قودس، بەڵام ئەو گەلە دەروونیان هۆگری

بتپەرستی و سیرك بوویەوە بە بینینی گەلێك كە بتیان دەپەرست، و ئەو بیروباوەڕە یەكتا پەرستیەی كە موسا (علیه السلام) بۆی هێنابوون لێك ترازاو لەجێگەی خۆی نەما لەگەڵ ئەوەی كە ماوەیەكی كەم تێپەڕ بووبوو بەسەر ئەو موعجیزەی كە لە سایەی خوداوە ڕزگار بووبوون.

خودای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَجَٰوَزۡنَا بِبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱلۡبَحۡرَ فَأَتَوۡاْ عَلَىٰ قَوۡمٖ يَعۡكُفُونَ عَلَىٰٓ أَصۡنَامٖ لَّهُمۡۚ قَالُواْ يَٰمُوسَى ٱجۡعَل لَّنَآ إِلَٰهٗا كَمَا لَهُمۡ ءَالِهَةٞۚ قَالَ إِنَّكُمۡ قَوۡمٞ تَجۡهَلُونَ ﴿١٣٨﴾ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ مُتَبَّرٞ مَّا هُمۡ فِيهِ وَبَٰطِلٞ مَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١٣٩﴾ قَالَ أَغَيۡرَ ٱللَّهِ أَبۡغِيكُمۡ إِلَٰهٗا وَهُوَ فَضَّلَكُمۡ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٤٠﴾ وَإِذۡ أَنجَيۡنَٰكُم مِّنۡ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ يَسُومُونَكُمۡ سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِ يُقَتِّلُونَ أَبۡنَآءَكُمۡ وَيَسۡتَحۡيُونَ نِسَآءَكُمۡۚ وَفِي ذَٰلِكُم بَلَآءٞ مِّن رَّبِّكُمۡ عَظِيمٞ ﴿١٤١﴾ ﴾ (الاعراف).

لەوەودوا ئەوەی ئیسرائیلمان لە دەریاكە پەڕاندەوە، دوای تاوێك ڕێیان كەوت لە خەڵكێك كە بەدەوری بتەكانیاندا دەخولانەوەو دەیانپەرستن، (دەستەیەكیان) وتیان: ئەی موسا خوایەكیش بۆ ئێمە ساز بكە وەكو ئەوانە چەند خوایەكیان هەیە!! موسا پێی وتن: بەڕاستی ئێوە قەومێكن نەدەزانن و نەدەفامن...بێگومان ئائەوانە ئەوەی تێدا دەژین لەناوچووە و، پووچەڵە ئەوەی ئەوان دەیانكرد.موسا وتی: ئایا كەی ڕەوایە بێجگە لە خوا خوایەكی ترتان بۆ بخوازم، لەكاتێكدا كە ئەو زاتە لەناو خەڵكی ئەم جیهانەدا هەڵی بژاردوون و ڕێزی زیاتری لێناوون.یادی ئەو كاتەش بكەن كە ڕزگارمان كردن لە دارو دەستەی فیرعەون كاتێك كە ناسۆرترین ئەشكەنجەیان دەدان، بەشێوەیەكی دڕندانە زۆرینەی كوڕەكانی ئێوەیان دەكوشت وئافرەتەكانی ئێوەشیان دەهێشتەوە (بۆ كەنیزەكی)، لەوەشدا بەڵاو تاقیكردنەوەیەكی گەورە هەیە بۆتان لەلایەن پەروەردگارتانەوە (بۆچی زوو فەرامۆشتان كرد.

ئەمـە سروشـتی گـەلێکی سەرپێچـی کارەکـە باگراونـدی ئـەو لادانـە لەمێژووەکەیـدا ماوەتەوە. زۆری نەخایاندا بەسەر ژیانی کوله مەرگی لەژێرسایەی بت پەرستی و نەفامیدا و لـەژێر دەسـتەلاتی فیرعەونـدا و ئەوکاتـەی کـە پێغەمبـەرو سـەرکردەیان موسـا (علیـە السلام) بەناوی پەروەردگارەوە ڕزگاری کردن و دوژمنەکەیان لەناوبردو دەریـای بـۆ لـەت کردن و قوتاری کردن لەو سزا دڕندانەی کە دەیان چەشت، تازە بەتازە سەرفراز بووبوون و لەمیسرو بت پەرستیەکەی هاتبوونەدەر.

بەڵام هەر ئەوان بوون کە دەریاکەیان تێپەڕاند چاویان چووەسەر گەلێکی بت پەرست کـە بتـەکانیان دەپەرست و سـەرقاڵی مەراسـیمی بـت پەرسـتیان بـوون، داوا لـە موسـا پەیامبەر خودا کە لەژێر ناوی ئیسلام و یەکتاپەرستی لەمیسر ڕزگاری کردن، داوا دەکەن پەیکـەرێکیان بـۆ دابـنێ و سـەرلەنوێ بیپەرسـتن لـەکێش داوا دەکـەن.. لـە موسـا کـە بەدەستی خۆی بتیان بۆ دروست بکات.

ئەم کارە ئەگەر خۆیان بۆ خۆیان جێ بەجێیان بکردایـە جێگـەی سەرسـوڕمان نـەبوو بەئەندازەی ئەوەی لە پێغەمبەرێکی داوا بکەن.

موسا زۆر توڕەبوو، وەڵامێکی دانەوە کە شایەنیان بـوو (إِنَّكُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ) پاشـان خراپی ئەو جۆرە عیبادەتەو گومڕایی و سەرلێشێواوی ئەوانەی بـۆ ڕوون کردنـەوە: ﴿ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ مُتَبَّرٌ مَّا هُمْ فِيهِ وَبَٰطِلٌ مَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿١٣٩﴾ ﴾ (الاعراف) بێگومان ئائەوانە ئەوەی تێـدا دەژین لەناوچووە و، پووچەڵە ئەوەی ئەوان دەیانکرد.

پاشـان توشـی سەرسـوڕمان بـوو لـە ئاسـت ئـەو گێلـی و نـەفامی و گەمـژەییان کـە خودایەکیان بۆ دیاریی بکـات جگـە لـە خـودای تـاك و تـەنها لـە کاتێکـدا ئـەوان تـەراتێن دەکەن لە نیعمەت و بەخشندەیی پەروەردگاردا؟.

لەهەمان کاتدا ئەو موعجیزەی وەبیر دەخستنەوە کە هێشتا لە بیرەوەریاندا نوێ بوو، تەنها ئەو موعجیزە بەس بوو بۆ ئەوەی سوپاسی خودا بکەن: ﴿ قَالَ أَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْغِيكُمْ إِلَٰهًا وَهُوَ فَضَّلَكُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٤٠﴾ ﴾ (الاعراف)، موسا وتی: ئایا کەی ڕەوایە بێجگە لە خوا خوایەکی ترتان بۆ بخوازم، لەکاتێکدا کە ئەو زاتە لەناو خەڵکی ئەم جیهانەدا هەڵی بژاردوون و ڕێزی زیاتری لێناوون.

پاشان موسا بەجێیان دێڵێ و دەچێت بەدەم وادەو داوای پەروەردگارەوە و هاروون پێغەمبەریش دەکاتە جێنشینی خۆی بۆ ئەوەی گومڕا نەبن وە ئامۆژگاری کردن بە پەرستنی خودای تاك و تەنها.

بەڵام ئەوە سروشتی نەبی ئیسرائیلە کە هەنگاوێکی ڕاستیان هاویشبێ خێرا پاشگەز بوونەتەوەو لایان داوە، هەروەها لەبەر ئەوەی مادیانە بیریان کردۆتەوە و ئیمانەکەیان دانەمەزراوە هەر کە دەستان لێ بەربدایەو ئامۆژگارییان لەسەر نەمایە بە ئاسانی توشی لادان دەبوون: ﴿ وَٱتَّخَذَ قَوْمُ مُوسَىٰ مِنۢ بَعْدِهِۦ مِنْ حُلِيِّهِمْ عِجْلًا جَسَدًا لَّهُۥ خُوَارٌ ۚ أَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّهُۥ لَا يُكَلِّمُهُمْ وَلَا يَهْدِيهِمْ سَبِيلًا ۘ ٱتَّخَذُوهُ وَكَانُوا۟ ظَٰلِمِينَ ﴿١٤٨﴾ ﴾ (الاعراف)، جا لە دوای چوونی موسا (بۆ کێوی گور) قەومەکەی پەیکەری گوێرەکەیەکیان لە خشڵەکانیان دروست کرد، کە بۆڕەیەکی هەبوو! ! ئایا ئەوان نەیانزانی کە ئەوە بەڕاستی قسەیان لەگەڵدا ناکات و ڕێنموویان ناکات بۆ هیچ ڕێیەك، (سەیرە لەگەڵ ئەو هەموو کەم و کوورپیانەشدا) کردیان بەخوای خۆیان، ئەوانە ستەمکار بوون [٤٢]

ئەمە ئەو ژێردەستەیی و سەرشۆڕییەیە کە لە سایەی دەسەڵاتی فیرعەوندا بۆیان بەجێ مابوو کە هۆکارێك بوو بۆ تێك دان و ناشیرین کردنی سروشتیان و دوچاری لاوازی نابەرپرسیارێتی کردبوون لە ئاست ئەو کارانەی پێیان دەسپێردرا، هەروەها بێ وەفا

٤٢ – في ظلال القران سيد قطب – مرجع سابق – ج٣ – ص١٣٦٤ – ١٣٧٣ بتحرف

بوون بەرامبەر بەڵێنەکانیان و سیفەتی ئارامگری و دامەزراوییان لەدەست دابوو، ناخیانی دوچاری لێك ترازان و سەرپێچی و لاسایی کردنەوەی کوێرانە بوو بوو.

هەر ئەوەندەی موسا بۆ ماوەیەکی کورت و کەمێك لێیاندووردەکەوێتەوە خێرا بیروباوەڕەکەیان لێك دەترازێ و شکست دێنن لەبەردەم یەکەم تاقیکردنەوەدا. [٤٣]

پێشتر لە پەیامبەرەکەیان خواستبوو کە خوایەکیان بۆ دیاری بکات و بیپەرستن تەنها بە بینینی گەلێك بتیان دەپەرست، پەیامبەرەکەیان بەشێوازێکی توند ڕووبەڕووی ئەو خەیاڵەیان بوویەوە، بەڵام کاتێك کە تەنها مانەوەو گوێرەکەی ئاڵتونیان بینی کە سامیری بۆی دروست کردبوون بە شێوازێك کە ئەو دەنگەی لێوە دەردەچوو.

بەبینینی گوێرەکەکە بە هەلە داوان ڕووبەڕووی ڕۆشتن و خۆیان پیاهەڵزنیپەلاماریان دا سامیریش پێی وتن: ﴿ ..هَٰذَآ إِلَٰهُكُمۡ وَإِلَٰهُ مُوسَىٰ ..﴿٨٨﴾ ﴾ (طـه)، (سامیری و بێ دینەکان بێ شەرمانە) وتیان: ئەمە خوای ئێوە و خوای موسایە.

موسا پێی وتبون دوای سێ ڕۆژ دەگەڕێتەوە ، بەڵام بە فەرمانی خودا دە ڕۆژی تری بۆ زیادکرا.

سامری دواکەوتنی موسای بەهەل زانی و بەگەلەکەی ووت ئەمە ئەو خودایەیە کە بڕیارە موسا بێت بۆ دیدار و بینینی بەڵام کاتەکەی لەیاد کردووە.

بەنی ئیسرائیل بیریان لە ئامۆژگارییەکانی پەیامبەرەکەیان نەکردەوە ، سەبارەت بە پەرستنی ئەو پەروەردگارەی کە نابینرێت و بیریان لە حەقیقەتی ئەو گوێرەکە نەکردەوە کە لەسەر دەستی کەسێکی هاوشێوەی خۆیان دروستکراوە، بەسەرهاتی پەرستنی گوێرەکەکە دووبارە لە قورئاندا دەگێڕدرێتەوە بۆ موشریکەکانی مەککە کە ئەوانیش بتیان دەپەرست.

---

٤٣- المرجع السابق، ج٤ ، ص٢٣٤٦

**دووەم: گوێرەکە نە سود دەگەیەنێ و نە زیان ئیتر چۆن دەبێتە خوا؟**

یەکێك لەو بەڵگە سەلمێنەرانەی قورئان هێناویەتی لەسەر پوچەڵکردنەوەی پوچیلکردنەوەی پەرستن و شوێنکەوتنی گوێرەکەو هاوشێوەکانی.

خودای گەورە(جل جلاله)ڕێنمونیان دەکات بە تێفکران و بیرکردنەوە، ئایا گوێرەکە وەڵامیان دەداتەوە کاتێك داوای شتێکی لێ دەکەن ، یاخود توانای سود و زیان گەیاندنی هەیە بە دونیاو دوا ڕۆژیان؟

وەك دەفەرموێ: ﴿ أَفَلَا يَرَوْنَ أَلَّا يَرْجِعُ إِلَيْهِمْ قَوْلًا وَلَا يَمْلِكُ لَهُمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا ﴿٨٩﴾ ﴾ (طـه)، جا ئایا ئەو نەفامانە نازانن ئەو گوێرەکەیە وەڵامی هیچ قسەیەکیان ناداتەوە، هیچ زەرەر، یان قازانجێکی بۆتان نیە؟

ئەگەر ئەمە حاڵی بێت ئیتر چۆن دەبێتە خودا، ئەو گەلە بۆ ژیرانە بیر لە بیروباوەڕیان ناکەنەوەو تێناگەن لەوەی کە دەیڵێن.

ئەو خودایەی کە فیرعەون و دارو دەستەکەی لەناوبردو بەنی ئیسرائیلی لەو ئەشکەنجەو ناڕەحەتییە ڕزگارکرد، تەنها ئەوە توانای سود و زیان گەیاندنی هەیە، سزاو پاداشت و پێدان و گرتنەوە لە توانای ئەودایە.

بەڵام ئەو گوێرەکە دەستکردە خودی شایەت حاڵەکان ئاماژە بە دەستەوسانی و بێ توانای دەکەن، ئیتر چۆن باوەڕ بە خوایەتی ئەو دەکەن.

ئەوە بەڵگەیەکی عەقڵییە : هەر کەسێ سیفەتەکانی ژیری لەدەست دا لە ئاخاوتن و بیستن و بینین ئیتر چۆن دەکرێتە خوا؟!

ئەوان شکۆدار و سوپاس و سەنای دەکەن و لێی دەپاڕێنەوە، ئەویش بێ دەنگ نە دەست خۆشییەك نە بەڵێنێك بۆ داواکانیان ، بە پێچەوانەی کاری خودایەکی کامڵ کە سوپاس کرا یاخود داوای لێ کرا وەڵام دەداتەوە.

بەڵام ئەو دەنگەی لە گوێرەکەکەوە دەردەچوو تەنها حیلەو فێڵێك بوو لەلایەن ئەو کەسانەوە کە گوێرەکەکەیان دروست کرد بە هەڵکۆڵینی قورگی گوێرەکەکە و دروستکردنی دەچەیەك بۆ تێپەڕبوونی هەواو دەرکردنی ئەو دەنگە. ابن عباس(خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: بەخوا ئەوە بۆڕاندنە تەنها چوونەژوورەوەی هەوا بوو لە پاشەڵی گوێرەکەکەو دەرچوونی لە دەمییەوە ئەو دەنگەی لێ دەبیسترا.[٤٤]

ئەم ڕێنمایی کردنەی خودا بۆ گومڕاکان هەمان بەڵگەو نیشانەیە کە (ابراهیم)(علیه السلام) بۆ گەلەکەی هێنایەوە کە بتیان دەپەرست، کاتێك پێی فەرموون: ﴿ قَالَ أَفَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكُمْ شَيْـًٔا وَلَا يَضُرُّكُمْ ﴿٦٦﴾ أُفٍّ لَّكُمْ وَلِمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۖ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٦٧﴾ ﴾ (الانبياء)، ئیبراهیم وتی: باشە، ئاخر، چۆن شتێك دەپەرستن لە جیاتی خوا کە ناتوانێت هیچ جۆرە قازانج یان زیانێکتان پێ بگەیەنێت، (تەنانەت ئەوەتا نەیانتوانی بەرگری لە خۆشیان بکەن).ئۆف لە دەستتان و لەو شتانەش کە لەجیاتی خوا دەیپەرستن، جا ئایا ئەوە تێناگەن و بیرو هۆشتان ناخەنەکار؟!.

ئیبراهیم (علیه السلام) ئیقامە حوجەی لەسەر کردن: ﴿ وَتِلْكَ حُجَّتُنَآ ءَاتَيْنَٰهَآ إِبْرَٰهِيمَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ ۚ نَرْفَعُ دَرَجَٰتٍ مَّن نَّشَآءُ ۗ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ ﴿٨٣﴾ ﴾ (الانعام)، ئەو وتو وێژو لێکۆڵینەوانە بەڵگە و نیشانەی ئێمە بوو، کاتێك بەخشیمانن بە ئیبراهیم لەسەر گەلەکەی و زاڵ بوو بەسەریاندا، قسەو بیروباوەری بەسەر قەومەکەیدا سەرکەوت، جا هەر کەسێك بمانەوێت و (خۆیشی شایستە بێت) چەندەها پلەوپایەی بەرز دەکەینەوە، بەڕاستی پەروەردگاری تۆ دانا و کار بەجێ یە و زانایە بەهەموو شتێك.

---

٤٤- ذكره ابن كثير في تفسيره (٣/ ٢١٧)

مەبەست لە فەرمایشتی پەروەردگار کە دەفەرموێ: ﴿ أَفَلَا يَرَوْنَ أَلَّا يَرْجِعُ إِلَيْهِمْ قَوْلًا وَلَا يَمْلِكُ لَهُمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا ﴿٨٩﴾ ﴾ (طه)، جا ئایا ئەو نەفامانە نازانن ئەو گوێرەکەیە وەڵامی هیچ قسەیەکیان ناداتەوە" هیچ زەرەر، یان قازانجێکی بۆتان نیە؟

تەنانەت ئەو گوێرەکەیەکی زیندوش نیە کە گوێی لە داواکانیان بێت و وەڵامیان بداتەوە وەك گوێرەکەیەکی ئاسای، چونکە ئەو پلەیەك لەخوار پلەی گیانلەبەریشەوەیە ، وەك حاڵەتێکی سروشتی توانای سود و زیانی نیە لە ئاسانترین شێوازدا ، ئەو توانای قۆچە وەشاندن و ئاش گێڕان و ئاودێری کردنیشی نیە جەستەیەکی بێ گیان و ڕۆح، ئیتر بە چ عەقڵێکەوە خودایان لەیاد کردووە ئەو خودایەی ڕزگاری کردن لە زەلیلی، گێلانەو بێ بیرکردنەوە شوێنی کەوتن: ﴿ وَاتَّخَذَ قَوْمُ مُوسَىٰ مِنْ بَعْدِهِ مِنْ حُلِيِّهِمْ عِجْلًا جَسَدًا لَهُ خُوَارٌ أَلَمْ يَرَوْا أَنَّهُ لَا يُكَلِّمُهُمْ وَلَا يَهْدِيهِمْ سَبِيلًا اتَّخَذُوهُ وَكَانُوا ظَالِمِينَ ﴿١٤٨﴾ ﴾ (الاعراف)، جا لە دوای چوونی موسا (بۆ کێوی گور) قەومەکەی پەیکەری گوێرەکەیەکیان لە خشڵەکانیان دروست کرد، کە بۆڕەیەکی هەبوو! ! ئایا ئەوان نەیانزانی کە ئەوە بەڕاستی قسەیان لەگەڵدا ناکات و ڕێنموییان ناکات بۆ هیچ ڕێیەك، (سەیرە لەگەڵ ئەو هەموو کەم و کووڕیانەشدا) کردیان بەخوای خۆیان، ئەوانە ستەمکار بوون.

کێ لەوە ستەمکارترە دروستکراوێکی دەستی مرۆڤ بپەرستێ، لەکاتێکدا خودا هەمووانی دروست کردووە؟!

هارون و پیاوماقوڵانیش لەگەڵیان دەژیان هیچ وەڵامێکیان پێ نەبوو تەنانەت توانای جڵەو گرتنی گەلەکەیان نەبوو لەسەر ئەو گومڕایی و لادانە.

هارون کە ئەویش پەیامبەریان بوو وە جێگری پەیامبەرە ڕزگاریخوازەکەیان بوو ، ئاگاداری کردنەوە کە ئەوە فیتنەو تاقیکردنەوەیە: ﴿ وَلَقَدْ قَالَ لَهُمْ هَارُونُ مِنْ قَبْلُ يَا قَوْمِ إِنَّمَا فُتِنْتُمْ بِهِ ۖ وَإِنَّ رَبَّكُمُ الرَّحْمَٰنُ فَاتَّبِعُونِي وَأَطِيعُوا أَمْرِي ﴿٩٠﴾ ﴾ (طه)، بێگومان پێشتریش هاروون

پێی وتن: ئەی قەومی من" ئێوە بەم گوێرەکە زێرینە تووشی تاقیکردنەوەیەکی سەخت بوون و تیایدا دەرنەچوون، دڵنیابن کە پەروەردگارتان خوایەکی میهرەبانە، شوێنی من بکەون و گوێڕایەڵی فەرمانی من بن.

بەهەمان شێوە ئامۆژگاری کردن بە شوێن کەوتن و گوێڕایەڵی کردنی وەك ئەوەی پەیمانیان بە موسا دابوو، موسا گەڕایەوە لە ژوانەکەی لەگەڵ خودا لە شاخی (تور) ئەوان لە ئامۆژگاریەکەی دەرچووبوون و لەو پەیمانەش کە پێیان دابوو: ﴿ قَالُواْ لَن نَّبْرَحَ عَلَيْهِ عَـٰكِفِينَ حَتَّىٰ يَرْجِعَ إِلَيْنَا مُوسَىٰ ﴿٩١﴾ ﴾ (طـه)، کەچی وتیان: هەرگیز وازی لێ ناهێنین و بەدەوریدا دێین و دەیپەرستین هەتا موسا خۆی دەگەڕێتەوە ! !

موسا بە تووڕەیی و دڵشکاوییەوە گەڕایەوە گوێی لە بیانوەکانیان گرت کە بەڵگە بوو لەسەر ترازانی باوەڕ و گەمژەییان لە بیرکردنەوەدا ، تەمبێی کردن و تۆڵەی بۆ دیاری کردن پاشان ئاوڕی دایەوە بەلای براکەیدا لە حاڵەتی تووڕەییەکی توندا و قژ و ڕیشی گرت و بە تووڕەیی و هەڵچوونەوە: ﴿ قَالَ يَـٰهَـٰرُونُ مَا مَنَعَكَ إِذْ رَأَيْتَهُمْ ضَلُّوٓاْ ﴿٩٢﴾ أَلَّا تَتَّبِعَنِ ۖ أَفَعَصَيْتَ أَمْرِى ﴿٩٣﴾ ﴾ (طه)، (موسا، کە گەڕایەوە بە تووڕەییەوە) وتی: ئەی هاروون، چی وای لێ کردیت (بێ دەنگ بیت) و هیچ نەکەیت، کاتێك بینیتن ئاوا گومڕا بوون؟

چی وای لێ کردیت پەیڕەوی من نەکەیت؟! ئایا لە فەرمانی من یاخی بوویت؟!، هاروون هەر ئەوەندەی لەدەست هات بە درێژی مەسەلەکەی بۆ باس بکات: ﴿ قَالَ يَبْنَؤُمَّ لَا تَأْخُذْ بِلِحْيَتِى وَلَا بِرَأْسِىٓ ۖ إِنِّى خَشِيتُ أَن تَقُولَ فَرَّقْتَ بَيْنَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَلَمْ تَرْقُبْ قَوْلِى ﴿٩٤﴾ ﴾ (طه)، هاروون وتی: کوڕی دایکم (بۆ ئەوەی سۆزی بجوڵێنێت) ڕیشم مەگرە و قژم ڕامەکێشە، (من بۆیە زۆر لەسەری نەچووم) بێگومان ترسام دوایی پێم بڵێیت: تۆ جیاوازیت خستە ناو نەتەوەی ئیسرائیلەوە و گوێت بەقسەی من نەدا.

له سورەتێکی تـردا: ﴿ ..قَالَ ٱبْنَ أُمَّ إِنَّ ٱلْقَوْمَ ٱسْتَضْعَفُونِي وَكَادُواْ يَقْتُلُونَنِي فَلَا تُشْمِتْ بِيَ ٱلْأَعْدَآءَ وَلَا تَجْعَلْنِي مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٥٠﴾ قَالَ رَبِّ ٱغْفِرْ لِي وَلِأَخِي وَأَدْخِلْنَا فِي رَحْمَتِكَ وَأَنتَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿١٥١﴾ ﴾ (الاعراف)، جا کاتێـك موسـا گەڕایـەوە بـۆ لای قەومەکـەی (زانـی بووی خەریکی گوێرەکە پەرستین) زۆر بەتوڕەیی و پەستی و غەمباریەوە وتی: بەڕاسـتی دوای ڕۆشـتنی مـن جێنشـینیەکی خراپـی منتـان کـرد، ئـەوە پەلـەتان کـرد لـە وادەی پەروەردگارتاندا؟ (ئیتر لەداخی ئەو لادان و سەرگەردانیە) تابلۆکـانی (تـەورات)ی فڕێـداو پەلاماری قژی (هاروون)ی برای داو ڕای کێشا بۆ لای خۆی، (هاروون) وتی: کـوڕی دایکـم (خەتای من نەبوو، من زۆر هەوڵمدا بەڵام بێ سوود بوو) بە ڕاستی ئەو خەڵکە زۆریـان بـۆ هێنام و هێزیان لێسەندم، خەریك بوو بشمکوژن (کاکە گیان) کەوابوو دوژمنـانم پـێ شـاد مەکە و لەگەڵ قەومی ستەمکاردا حسابم بۆ مەکە.

(ئەوسا ئیتر موسا بەخۆیدا هاتەوە و) وتی: پەروەردگارا لـە خـۆم و براکەشـم خـۆش بە و هـەردووکمان بخـەرە نێـو ڕەحمـەت و میهرەبـانی خۆتـەوە و تـۆ لـە هـەموو کـەس بەسۆزتر و میهرەبانتریت.

پاشان سامیری دەرکردو گوێرەکەکەی سوتاندو فڕێی دایە نـاو ئـاوەوە، بـەو شـێوازە بەنی ئیسرائیل ڕزگاریان بوو لە گوێرەکە پەرستی.

**سێیەم: شـایەتحاڵەکان دەستەوسـانی گـوێرەکەکە لە چـاودێری کردنـی شـوێنکەوتوانی دوپـات دەکەنەوە، یاخود سەرخستنی دروستکەرەکانی لە سزای خودا، تەنانەت پارێزگـاری کردنـی خۆشی لە سوتان و نیستن لە ئاودا.**

لـەو بەڵگـە زانسـتیانەی کـە قورئـان هێناویـەتی لەسـەر پوچـەڵکردنەوەی پەرسـتنی گوێرەکەو یەکلاکردنەوەی پەرستنی خودای باڵادەست، قورئـان ئـەوەی ڕوون کردۆتـەوە کە شایەت حاڵەکان دوپاتیانکردۆتەوە کە ئـەو گوێرەکـە ئەگـەر خـوا بوایـە دەستەوسـان

نەدەبوو لە چاودێری کردنی شوێنکەوتوانی و لە پارێزگاری کردنیان لە سزای پەروەردگار کە دابەزییە سەریان، بە هەمان شێوە دەیتوانی پارێزگاری لە دروستکەرەکانی بکات، تەنانەت پارێزگاری لە خۆی بکات لە سوتاندن و فڕێ دانە نێو ئاو، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ ٱلْعِجْلَ سَيَنَالُهُمْ غَضَبٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَذِلَّةٌ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُفْتَرِينَ ﴿١٥٢﴾ ﴾ (الاعراف)، بەڕاستی ئەوانەی کە گوێرەکەکەیان پەرست، لەئایندەدا لەلایەن پەروەردگاریانەوە خەشم و قینیان دەگاتێ و زەلیلی و خەجاڵەتییش بەشیان دەبێت لە ژیانی دنیادا، هەر بەو شێوەیەش پاداشتی ئەوانە دەدەینەوە کە درۆ بەدەم خواوە هەڵدەبەستن.

خوای گەورە بەڵێنی داو فەرمانی دەرکرد... ئەو گەلەی کە گوێرەکەیان پەرستوە لە پەروەردگاریانەوە سزایان بۆ دادەبەزێت و زەلیلیان دەکات لە ژیانی دونیادا، ئەمە یاسایەکی هەمیشەیی کارپێکراوە: ئەوانەی کە تاوان ئەنجام دەدەن پاشان تەوبە دەکەن خوای گەورە بە بەزەیی خۆی لێیان خۆش دەبێت.

کەواتە خوای گەورە دەیزانی ئەوانەی کە گوێرەکەیان پەرستووە تەوبەی هەمیشەیی ناکەن، ئەوان بەردەوام کارێك دەکەن کە لەو یاسایە بچنە دەرەوە بێ گومان هەر واش بوو.

بەنی ئیسرائیل بەردەوام بوون لە ئەنجامدانی تاوان لەدوای تاوان و خوداش جار لەدوای جار لێیان خۆش دەبوو تا بە سزاو لەعنەتی خودا کۆتاییان هات: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ ٱلْعِجْلَ سَيَنَالُهُمْ غَضَبٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَذِلَّةٌ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُفْتَرِينَ ﴿١٥٢﴾ ﴾ (الاعراف)، بەڕاستی ئەوانەی کە گوێرەکەکەیان پەرست، لەئایندەدا لەلایەن پەروەردگاریانەوە خەشم و قینیان دەگاتێ و زەلیلی و خەجاڵەتییش بەشیان دەبێت لە ژیانی دنیادا، هەر بەو شێوەیەش پاداشتی ئەوانە دەدەینەوە کە درۆ بەدەم خواوە هەڵدەبەستن.

سزای درۆهەڵبەستان لە ڕۆژی دوایدایە... ئەوە سزایەکی دووبارە بووەوەیە دووبارە دەبێتەوە لەگەڵ دوبارە بوونەوەی تاوانی درۆکردن لەسەر خودا ئەم سزایە بۆ بەنی ئیسرائیل و غەیری بەنی ئیسرائیلە ، بەڵێنی خودا بۆ بێباوەڕان ڕاست و دروستەو پێچ و پەنای تێدا نیە، خودای گەورە سزاو زەلیلی لەسەر گوێرەکە پەرستان نوسیوە، کۆتا شت کە بەڵێنی داوە ئەوەیە کەسانێکیان بۆ بنێرێ کە سزای توند و پەندیان پێ بچێژێ ، جا ئەگەر دەرکەوت ماوەیەك بۆ ماوەیەکی تر لە مێژوودا دوچاری سەرپێچی کردن بوون لەسەر زەویداو دەسەڵاتی خۆیان بەکارهینا دژی خەڵکانی ئاسای و ژێر دەستە یاخود وەك ئەوەی لە تەلمودی (جریم) باسی لێوە کراوە ! ! کە دەڵێن دەسەڵاتیی دارای و دەسەڵاتی ڕاگەیاندنیان بەدەستەوەیە، و ئەوان کاروباری دەسەڵاتداران بەڕێوە دەبەن و هەچییەکیان بوێت هەر ئەوە دەبێت، و بەشێوازێکی دڕندانە هەر نەتەوەیەکی بی دەسەڵات لەسەر خاك و ئاو و نیشتیمانیان وەدەردەنێن و وڵاتانی گومڕاو ستەمکاریش پشتگیری و لایەنگرییان دەکات، وەك ئەوەی لەم سەردەمەدا دەیبینین... ئەمەی کە پێی هە/لدەستن پێچەوانە نیە لەگەڵ بەڵێنی خودا بۆیان، ئەوان بەم سیفەت و کردارانەیان ڕق و کینەی خەڵکیان بۆ کەڵەکە دەبێت و باڵانسی تورەیی و ستەم لە دژیان بەرزدەبێتەوە کە هۆکاری لەناوبردنیانە.[٤٥]

وەك دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكَ لَيَبْعَثَنَّ عَلَيْهِمْ إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَن يَسُومُهُمْ سُوءَ الْعَذَابِ ۗ إِنَّ رَبَّكَ لَسَرِيعُ الْعِقَابِ ۖ وَإِنَّهُ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٦٧﴾ ﴾ (الاعراف)، یادی ئەو کاتەش بکە پەروەردگارت (ئەی محمدﷺ) بڕیاریدا و ڕایگەیاند بەڕاستی کەسانێك دەنێرێتە سەریان تا ڕۆژی قیامەت، ئەشکەنجەو ئازاری سەختیان بدات، چونکە بەڕاستی پەروەردگارت زۆر بەخێرایی تۆڵە دەسێنێت ( لە ستەمکاران)، هەروەها بێگومان لێخۆشبوو میهرەبانیشە ( بۆ تەوبەکاران و ئیمانداران).

---

٤٥- المرجع السابق، ص١٣٧٥

ئەمە بەڵێنێکی ئەبەدیەو لەبواری جێبەجێکردندایە لەو ساتەی کە دەرچووە، خودای گەورە لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر کەسانێك دەنێرێ کە سزای توندو بەد بە جولەکە بچێژێ هەرکات ستەم لادانەکانیان لە ڕادە بەدەر بوویێ بەردەوام خودای گەورە ملۆزمێکی بۆ ناردوون.

چونکە ئەوان لە تاوانێکەوە بۆ تاوانێکی تر و بەردەوام کاری دڕندانەو ستەمکارانەیان کردۆتە پیشە و ژیانی خۆیانیان لەسەر داڕشتووە.[٤٦] مەبەستەکە لەوەدایە پەرستنی گوێرەکە نەك سودی نەبووە بۆیان بەڵکو غەزەب و سزای خودای بۆ هێناون کە بەردەوام لە بەدیهاتن دایە، ئەگەر گوێرەکەکەیان خوا بوایە دەیپاراستن لە خەشم و غەزەبی خودا بەڵام ئەو تەنها بتێکە نە سود دەگەیەنێ نە زیان.

یەکێکی تر لەو بەڵگانەی کە قورئان هێناویەتی لەسەر پوچەڵکردنەوەی گوێرەکە پەرستیو شایەت حاڵەکانیش هەمان شت دوپات دەکەنەوە ئەوەیە : ئەو گوێرەکە دەستەوسانبووە لە لە پارێزگاری کردن لە دروستکەرەکەی –سامیری لەسزای خودا، تەنانەت ڕزگارکردنی خۆی لە سوتان و فڕێدانە ناو ئاوەوە، موسا کردنەدەرەوەی سامیری لە کۆمەڵی بەنی ئیسرائیل ڕاگەیاند بۆ هەتا هەتایەو حەواڵەی دەستی پەروەردگاری کرد، ئەمە جگە لەوەی زۆر بە تواندی ڕووبەڕووی وەستایەوە لەسەر ئەو کارە قێزەونەی کە کردیدروستکردنی گوێرەکە بۆ ئەوەی نیشان گەلەکەی بدات و بیسەلمێنێ کە گوێرەکە خودا نیەو توانای پارێزگاری کردنی نیە نە لە خۆی نە لە وەستاکەی: ﴿ قَالَ فَٱذۡهَبۡ فَإِنَّ لَكَ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ أَن تَقُولَ لَا مِسَاسَۖ وَإِنَّ لَكَ مَوۡعِدٗا لَّن تُخۡلَفَهُۥۖ وَٱنظُرۡ إِلَىٰٓ إِلَٰهِكَ ٱلَّذِي ظَلۡتَ عَلَيۡهِ عَاكِفٗاۖ لَّنُحَرِّقَنَّهُۥ ثُمَّ لَنَنسِفَنَّهُۥ فِي ٱلۡيَمِّ نَسۡفًا ﴿٩٧﴾ ﴾ (طـه)، (موسا بە سامیری) وت: دەبڕۆ تا ماوی لە ژیاندا (هەر کەسێك نزیکت کەوتەوە دەبێت)

---

٤٦– المرجع السابق، ص١٣٨٦

بڵێیت: بە هیچ شێوەیەك بەریەککەوتن نی یە (دیارە کە دەست هەرکەسی بەریکەوتبێت تووشی ئازارێکی زۆر بووە)، دڵنیاش بە کە کاتێکی تریشت بۆ دیاری کراوە، کە هەرگیز ناتوانیت لێی دەرباز ببیت، سەرنجی خواکەشت بدە کە بەدەوریدا دەسوڕایتەوە و دەتپەرست، دەبێت بیسوتێنین و هەلا هەلای بکەین و بیخەینە ناو دەریاوە. سامیری دەرکرایە دەرەوە سزاکەشی ئەوە بوو هیچ کەسێك نە بە چاك نە بە خراپ لێی نزیك نەکەوێتەوەو ئەویش لە کەس نزیك نەکەوێتەوە دەستی بەر دەستی کەس نەکەوێت چونکە دەستی بەر دەستی هەر کەسێك بکەوتایە توشی لەرزو تای دەکرد، بۆیە بەردەوام هاواری دەکرد(لامساس ، لامساس) واتە دەستم لێ مەدەن، ئەمە یەکێك بوو لەو سزایانەی کە لە ئاینی موسادا پەیڕەو دەکرا. ئەمە تەنها سزای دنیایە سزای دوارۆژیشی لای پەروەردگارە ، پاشان بە بێزاری و توڕەییەوە فەرمانی کرد گوێرەکەکە بسوتێنرێ و فڕێ بدرێتە نێو ئاوەوەو نقوم ببێ ، ئەم توڕەیی و هەڵچونە بۆ پارێزگاریکردنە لە دینی خودا کە پێویست بە بڕیارو سزای یەکلاکەرەوە دەکات . پاش ئەوەی موسا هێورو ئاسایی بووەوە ئەو تەختانەی (الألواح) کە تەوراتیان لەسەر نوسرا بوویەوە کۆی کردنەوە دەستی کردەوە بە ئامۆژگاری و ڕێنمونی کردنی گەلەکەی:

﴿ إِنَّمَآ إِلَٰهُكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ وَسِعَ كُلَّ شَيۡءٍ عِلۡمٗا ﴿٩٨﴾ ﴾ (طـه)، خەڵکینە: ئێوە دڵنیابن کە پەروەردگارتان تەنها زاتی (الله) یە، جگە لەو خوایەکی تر نیە، زانیاری و زانستی ئەو زاتە هەموو شتێکی گرتۆتەوە [٤٧]

---

٤٧- المرجع السابق: ج٤، ص٢٣٤٩ بتصرف

**بەكورتی:**

بـەنی ئیسـرائیل ئـالودەو شـەیدای پەرسـتنی گوێرەكـە بـوون ، ئەمـەش نـەفامی و هەڵگەڕانـەوەیان بـوو لـە شـەریعەتی موسـا پێغەمبـەر (علیـه السـلام) وێـڕای پەرۆشـی بەردەوامیان بۆ پەرستنی خوایەكی بەرجەستە واتە پەیكەرێك بێت لە بەردەمیاندا.

موسا(علیه السلام) لەڕووی ئەو ئالوودەبوونەدا وەستا بە وەسف كردنیان بە گـەلیكی نـەفام ونـەزان و خواكەشـیان نـە سـود و نـەزیان ناگەیـەنێ و هۆكـاری بەدبـەختی و لەناوچوونیانە لە دونیاو دوا ڕۆژدا.

گوێرەكەكەی سامیری توانای چاكەو خراپەی نیە ئیتر چۆن دەكرێتە خوا؟!

لـەناوبردنی گوێرەكەكـەو هاویشـتنە نێـو ئـاوەوە لەلایـەن موسـاوە بەڵگەیـە لەسـەر پوچەڵی و هیچ تیا بەسەر نەبووی ئەو خوایە.

※※ ※※ ※※

## گومانی دەیەم

## بانگەشەکردنی (نەمروودی کوڕی نوعمان) کە توانای زیندوکردنەوەو مراندنی هەیە.

**ناوەڕۆکی گومانەکە:**

(نەمرودی کوڕی کەنعان) لەڕووی عینادی و خۆ لووت بەرزییەوە بانگەشەی دەکرد کە توانای مراندن و زیندوکردنەوەی هەیە ئەویش لە کاتێکدا (ابراهیم) (علیه السلام) خوایەتی ئەوی ڕەتکردەوە ڕازی نەبوو سەری بۆ ئەوی بکات و فەرمووی: ﴿... رَبِّيَ ٱلَّذِي يُحْيِۦ وَيُمِيتُ ... ﴿٢٥٨﴾﴾ (البقرة)، (نەمروود لە وەڵامیدا) وتی: جا منیش ژیان دەبەخشم و مردنیشم بەدەستە.

(نەمرود)یش دوو پیاوی هێنا یەکێکیانی کوشت و ئەوی تریانی ئازاد کرد ، و وای خستە ڕوو بەو جۆرە دەتوانێ بمرێنێ و بژێنێ، خودای گەورە دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِي حَآجَّ إِبْرَٰهِـۧمَ فِي رَبِّهِۦٓ أَنْ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلْمُلْكَ إِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّيَ ٱلَّذِي يُحْيِۦ وَيُمِيتُ قَالَ أَنَا۠ أُحْيِۦ وَأُمِيتُ ۖ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَأْتِي بِٱلشَّمْسِ مِنَ ٱلْمَشْرِقِ فَأْتِ بِهَا مِنَ ٱلْمَغْرِبِ فَبُهِتَ ٱلَّذِي كَفَرَ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِي ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٥٨﴾﴾ (البقرة)، ئایا نەتبیستووە و نەتڕوانیوەتە ئەو کەسەی دەمەقاڵەی دەکرد لەگەڵ ئیبراهیمدا لە بارەی پەروەردگاریەوە لەبەر ئەوەی خوا پاشایەتی پێبەخشی بوو، (لە جیاتی باوەڕهێنان و سوپاسگوزاری کەچی دەمە دەمێی دەکرد لەگەڵ ئیبراهیمدا)، (ئەم لووت بەرزیەشی کاتێك بوو بە هەواو فیزاوە پرسیوویەتی لە ئیبراهیم کە پەروەردگاری تۆ کێیە؟ ئەویش لە وەڵامدا وتی: پەروەردگاری من ئەوزاتەیە کە ژیان دەبەخشێت و مردنیشی بەدەستە، (نەمروود لە وەڵامیدا) وتی: جا منیش ژیان دەبەخشم و مردنیشم بەدەستە، (ئینجا فەرمانیدا هەندێك لە نەیارانی بکوژن

گوایە ئەوە دەیانمرێنێت، هەندێکیشی نەکوشت گوایە ئەوە ژیانی پێبەخشین! ! )، ئەوسا ئیبراهیم وتی: بەڕاستی خوا خۆر لە ڕۆژهەڵاتەوە دەهێنێت جا (ئەگەر تۆ دەتوانیت) لە ڕۆژئاواوە بیهێنە، ئینجا ئەو بێ باوەڕە ڕەنگی پەڕی و دەمکوت کراو وەڵامی نەما، بێگومان خوا هیدایەتی قەومی زاڵم و ستەمکار نادات.

**دوو ڕێگا بۆ پوچەڵکردنەوەی گومانەکە:**

١) لاوازی بەڵگەکەی (نەمرود)و حاڵی نەبوون لە مەبەستەکەی (إبراهيم)(عليه السلام).

٢) ئیبراهیم (نەمرود)ی بەزاند و کۆڵی پێ دا بەوەی داوای لێ کردن ئاڕاستەی خۆر بگۆڕێت.

**درێژەی بابەتەکە:**

**یەکەم: لاوازی بەڵگەکەی نەمرود و چەواشەکاری و راکردنی لە راستی.**

کاتێك (نەمرود) پاشا دەمەدەمەی لەگەڵ (ئیبراهیم) کرد دەرهەق بە پەروەردگاری، تەنها ئینکاری بوونی خودای نەدەکرد بەڵکو تاك و تەنهای خودای لە(ئولوهییەت و ربوبییەت) و بەڕێوەچوونی گەردونیشی ڕەت دەکردەوە، لێرەدا داهێنانەوەی بەڵگەو ڕووبەڕوو بوونەوە پێویستە لە نێوان(إبراهيم)و ئەودا بە شێوازێك بەڵگەکان لە بەربەرەکانێیەکدا بچەسپێنرێ، (نەمرود)داوای لە (إبراهيم) کردبوو کە بەڵگەیەکی لەسەر بوونی ئەو پەروەردگارە بۆ بهێنێتەوە کە بانگەشەی بۆ دەکات ، (إبراهيم) فەرمووی: ﴿... رَبِّيَ ٱلَّذِي يُحۡيِۦ وَيُمِيتُ... ﴿٢٥٨﴾﴾ (البقرة)، (نەمروود لە وەڵامیدا) وتی: جا منیش ژیان دەبەخشم و مردنیشم بەدەستە، واتە : بەڵگە لەسەر ڕوودانی ئەم شتانە: بینینی شتێکی نادیارو نەمانی شتێکی دیارە، ئەمەش دەبێتە بەڵگە لەسەر بکەرێك(فاعل): چونکە ئەو شتە لە خۆیەوە ڕوونادات، هەر دەبێ بەدیهێنەرێك بەدیهێنابێت، ئەویش خودای تاك و تەنهاو بێ هاوتایە کە بانگەشە بۆ پەرستنی دەکەم.

لـەو كاتـەدا (نـەمرود)ووتـی: (أنَـا أُحْيِـي وأُمِيـتُ) واتـە: منـیش ژیـان دەدەم و ژیـان دەسێنم، ئەویش بە هێنانی دوو پیاوی زیندانی کە بڕیاری لە سێدارەدانیان بۆ دەرکرابـوو ، فەرمانی کرد بە کوشتنی یەکێکیان و پیاوەکەی تری ئـازاد کـرد، بـەلای ئـەوەوە ئەمـە مانای ژیاندن و مراندنە، لەڕاستیدا ئەمە وەڵام نەبوو بۆ(إبراهيم)(عليـه السـلام) و ئـەوەی کە (إبراهيم) (عليه السلام)مەبەستی بوو، یاخود ئەوەتا لە (إبراهيم )(عليه السلام) حـاڵی نەبووە، چـونکە وەڵامەکـەی نابێتـە بەڵگـەو هـیچ پەیوەندییـەکی بـە مەسـەلەکەوە نیـە، چونکە ئەو ویستی هۆکارێك بێت بۆ ژیانـدن و مرانـدن، قسـەکەش لەسـەر دروسـتکردن و داهێنانە، نەك گرتنە بەری ڕێگایەك بۆ لای بەدیهێنراوەکە، مەبەست لەوەی کە دەژێنێ و دەمرێنێ ئەو زاتەیە کە ژیان دەکات بە بەری سەرجەم گیانلەبەران و ڕووەکەکاندا.

وە ژیانیان لێ دەستێنێتەوە بە مردن، ئـەوەی کـە ئـەو بانگەشـەی بـۆ دەکـات لـەناو گەلەکەیداو وایمەی کردووە کە توانای ژیاندن و مراندنی هەیە تەنها لەڕووی سەرکەشـی و خۆ بەزلزانینەوەیە.

**دووەم: بەزاندن و کۆڵپێدانی (إبراهيم) (عليه السلام) بۆ (نەمرود).**

(إبراهيم) (عليه السلام) کە بۆی دەرکەوت (نەمرود) لە مەبەستەکەی حاڵی نەبووە کە داهێنـــان چـــاوگی ژیانـــدن و مراندنـــە، بـــە زیندووهێشـــتنەوەی هـــەموو زیندوویـــەك زیندوکردنەوەیەتی و مردنیشـی بـە جیاکردنـەوەی ژیانـە لێـی، هـەروەها (إبـراهيم)(عليـه السـلام) ئـەو خـۆ بەگـەورە زانینـەی لـێ بـینی فـەرمووی: ﴿ .. فَإِنَّ ٱللَّهَ يَأۡتِي بِٱلشَّمۡسِ مِنَ ٱلۡمَشۡرِقِ فَأۡتِ بِهَا مِنَ ٱلۡمَغۡرِبِ .. ﴿٢٥٨﴾ ﴾ (البقرة)، ئەوسا ئیبراهیم وتی: بەڕاستی خـوا خـۆر لـە ڕۆژهەڵاتەوە دەهێنێت جا (ئەگەر تۆ دەتوانیت) لە ڕۆژئاواوە بیهێنە.

لەڕاستیدا ئەمە ڕونکردنەوەیـەك بـوو لەلایـەن (إبـراهيم)(عليـه السـلام) بـۆ مەسـەلەی یەکەم، واتە تۆ کە بانگەشەی ئەوە دەکەیت توانای ژیاندن و مراندنت هەیە، ئەوەشی کە

ژیـان و مردنـی بەدەسـتە هـەر ئـەویش جڵـەوی گـەردونی بەدەسـتە لـە دروسـتکردنی گەردیلەکان و هەڵسوڕانی هەسارەکان و جوڵاندنیان ، پەروەردگاری من بـەتوانا و زانـایی خۆی ژیـان دەبەخشـێت و دەیگرێتـەوە، ئـەو پێکهێنـەری بوونـەوەرە لەسـەر یاسـایەکی دیـاریکراو کـە دەبینرێـت و هەسـتی پـێ دەکرێـت، خـودای گـەورە ڕۆژ لـە ڕۆژهەڵاتـەوە هەڵدێنێ هەموو ڕۆژێکیش هەر بەو جۆرەیە ، ئەگەر تۆ خوای وەك ئەوەی دەیڵێیـی تـۆ لـە ڕۆژئاواوە ڕۆژ هەڵبێنەو یاسای هەڵهاتنەکەی بگۆڕە بـۆ ئاراسـتەی پێچـەوانە، (نـەمرود)ی بێ باوەڕ تووشی شۆك و سەرسوڕمان بوو لەجێگای خۆیدا وشك بـوو، لاڵ بـوو لـە ئاسـت بەڵگە ڕوون و ئاشکراکەی (إبراهیم) هیچ وەڵامێکی پێ نەبوو، چونکە بـۆی دەرکـەوت کـە چەند دەستەوسانەو پـەردە لەسـەر نـەفامی و درۆو بانگەشـە بـێ بنـەماکانی لابـرا، ئـیتر توانای لووت بەرزی نەماو زمانی بەستراو بەڵگەکانی بەسەردا چەسپێنرا.

ئەوەی کە خرایە ڕوو لەڕووی ماناوە باشترو بەهێزترە لەوەی کە (زانایـاني ئوصـول و مەنتیقییەکان) دەیڵێن: گوایـە لادانـی (إبـراهیم ) (علیـە السـلام) لـە مـەقامی یەکـەم بـۆ مـەقامی دووەم گواسـتنەوەیە لـە بەڵگەیەکـەوە بـۆ بەڵگەیـەکی ڕوونـتر، یـاخود ئـەوە وەڵامێکی ترە، یاخود کاتێك (إبراهیم)(علیە السلام) وەسفی پەروەردگارەکەی دەکات کە توانـای ژیـان و مرانـدنی هەیـە ئەمـە کارێکـە حەقیقـەت و مـەجاز هەڵدەگرێ، مەبەسـتی (إبراهیم)(علیە السلام) حەقیقەت بوو بەڵام (نەمرود) پەنای بردە بەر مـەجاز و گەلەکـەی چەواشە کرد، دواتر (إبراهیم)(علیە السلام) گفتوگۆکەی بادایەوەو لـە نمونـەی یەکەمـەوە چـووە سـەر نمونـەی دووەم ئـەمجارە پێشـنیارێکی کـرد کـە دووربێـت لـە مـەجاز، وە بەڵگەیـەکی یەکلاکـەرەوە کـە (نـەمرود) نـەیتوانی بڵـێ: مـن دەتـوانم ڕۆژ لـە ڕۆژئـاواوە هەڵبێنم، چونکە خەڵکانی ژیرو عاقڵ بە درۆیان دەخستەوە.

لەڕاستیدا بابەتەکە بەو شێوازە نیە کە (زانایانی ئوصول) باسی لێوە دەکەن،بەڵکو مەقامی یەکەم سەرەتایە کە بۆ دووەم و بانگەشەی (نەمرود) ڕووندەکاتەوە، هەر کەس لە مانای ئایەتەکە حاڵی بوویێت وەك ئەوەی لەسەرەتاوە باسمان کرد تێدەگات لەوەی کە جێگای گومانی تێدا نابێتەوە، وەك ئەوەی هەندێ کەس دەیڵێن لەسەر بەڵگەکەی (إبراهیم)(علیه السلام)ئەویش ئەوەیە (نەمرود) دەیتوانی بڵێ: پەروەردگاری تۆ ڕۆژ لە ڕۆژهەڵاتەوە هەڵدێنێ لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانێ ئەوەی لە منی داواکردووە کە هەڵهێنانی ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە ڕۆژێك ئەو کارە بکات، هەندێك لە (کەسانی لاساکەرەوە)دەڵێن (إبراهیم)(علیه السلام) ناتوانێ ئەو داوایە لە پەروەردگاری بکات، چونکە جیهان تێك دەچێت، وە هەندێك لە (کەسانی خانەگومان) دەڵێن: ئەگەر (نەمرود) ئەو داوایەی بکردایە دەبوایە بۆی جێبەجێ بکرایە، بەڵام لە ڕاستیدا (نەمرود) لەگەڵ سەرکەشی و لوت بەرزییەکەدا لە خەڵکانی تر زیاتر لە بەڵگەکان حاڵی بوو بوو، لە مەبەستەکەی (إبراهیم)(علیه السلام) حاڵی بوو کە ئەو سیستەمەی ڕۆژی لەسەر بەڕێوە دەچێت هەر دەبێت داهینەرێکی دانای لە پشتەوە بێت، ناگونجێ ئەم شتانە بەڕێکەوت و سوتفە بێنلح

ئەو خودایەی کە من دەیپەرستم ئەو داهێنەرە داناو زانایەیە کە تەنها لە دانایی ئەو دەوەشێتەوە ڕۆژ بەم شێوازە بێت کە دەیبینین ، ئەو کەسەی لەم مەسەلە حالّی ببێت ئیتر ناتوانێ بڵێ: با ئەو دانایە لە دانای خۆی پاشگەزبێتەوەو یاسا کەونیەکان هەڵبوەشێنێتەوە.

**به كورتى:**

* پێداگرى و لوت بەرزى (نەمرود)و هەڵاتنى لە بەڵگەكانى(إبراهيم)(عليه السلام) لاوازى بەڵگەكانى خۆى بوو چونكە ئەو دەيزانى كەس تواناى ژياندن و مراندنى نيە جگە لە خودا، خۆ ئەگەر (إبراهيم)(عليه السلام) داواى لێ بكردايە ئەو كابرا زيندو بكاتەوە كە كوشتويەتى بێگومان نەيدەتوانى.

* مەبەست لە بەڵگە بەزێنەرەكەى (إبراهيم)(عليه السلام)بۆ (نمرود)ئەوە بوو پێى ڕابگەيەنێ كە ئەو سيستەمەى ڕۆژى لەسەر بەڕێوە دەچێت، دەبێت داهێنەرێكى داناى لە پشتەوە بێت كە ئەويش خوداى گەورەيە.



# گومانی یازده

## بیانووهێنانەوە بە چارەنووس لەسەر شەریک بریاردان بۆ خوا و رەتکردنەوەی هیدایەت *[48]

**ناوەڕۆکی گومانەکە:**

هەندێك لە موشریکەکان وایان نیشان ئەدا کە کە شەریك بریاردانیان بۆ خوا چارەنووسێکە و لەسەرەتاوە لەسەریان نووسراوە، خواش رازیە بەو کارە، ئەگەر بێزار بوایە ئەوە رێگەی پێنەئەدا، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا عَبَدْنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَىْءٍ نَّحْنُ وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَىْءٍ ۚ كَذَٰلِكَ فَعَلَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ فَهَلْ عَلَى ٱلرُّسُلِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿٣٥﴾﴾ (النحل)، ئەوانەی هاوەڵیان داناوە بۆ خوا دەڵێن: ئەگەر خوا ویستی لەسەر بوایە هیچ شتێکمان لە جیاتی ئەو نەدەپەرست، نە ئێمەو نە باوو باپیرانمان، هیچ شتێکیشمان لە خۆمان حەرام نەدەکرد بە بێ ئەو، خوا نەناسانی پێش ئەمانیش هەروایان دەکردو هەر وایان دەوت، مەگەر ئەرکی سەرشانی پێغەمبەران هەر ئەوە نیە کە ئایینی خوا بە روونی رابگەیەنن؟

**رێگەکانی پووچکردنەوەی ئەم گومانە:**

١خوای گەورە پەیامبەرانی ناردووە و فەرمانی پێکردوون کە فەرمان بەخەڵکی بکەن تا خوای تاك و تەنیا بپەرستن، پێغەمبەرانیش تەنیا گەیاندنیان لەسەرە، بەمەش خوا بیانووی نەهێشتووەتەوە بۆ خەڵکی.

٢هیچ بیانوویەکیان نیە لە ویستی خوادا لە رووی شەرع و یاسای گەردوونیشەوە، چونکە خوای گەورە بێباوەڕی قەبوڵ نیە بۆ بەندەکانی.

---

٤٨ئەو ئایەتانەی کە باس لەم گومانە ئەکەن بریتین لە:(النحل/٣٥،الانعام/١٤٨،الزخرف/٣٠، ئەو ئایەتانەش وەلامی ئەم گومانە ئەدەنەوە بریتین لە:(النحل/٣٧،٣٥، الانعام/١٤٨،٢٤٩، الزخرف/٣٠، الزمر/٧).

٣موشریکەکان هیچ زانیارییەکیان نیە پشتی پێ ببەستن لەم بانگەشەیاندا بەڵکو تەنیا لووتبەرزی و یاخیبوونە.

**درێژەی بابەتەکە:**

**یەکەم: هەڵوەشاندنەوەی بیانوو بە ناردنی پێغەمبەران.**

موشریکەکان بەهانەیان بەوە ئەهێنایەوە کە شیرك لە چارەنووسیان نووسراوە، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُواْ لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا عَبَدْنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَىْءٍ نَّحْنُ وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَىْءٍ كَذَٰلِكَ فَعَلَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَهَلْ عَلَى ٱلرُّسُلِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿٣٥﴾ ﴾ (النحل)، ئەوانەی هاوەڵیان داناوە بۆ خوا دەڵێن: ئەگەر خوا ویستی لەسەر بوایە هیچ شتێکمان لە جیاتی ئەو نەدەپەرست، نە ئێمەو نە باوو باپیرانمان، هیچ شتێکیشمان لە خۆمان حەرام نەدەکرد بە بێ ئەو، خوا نەناسانی پێش ئەمانیش هەروایان دەکردو هەر وایان دەوت، مەگەر ئەرکی سەرشانی پێغەمبەران هەر ئەوە نیە کە ئاینی خوا بە ڕوونی ڕابگەیەنن؟ نمونەیان بە(بەحیرە)و (سائبە)( وەصیلە)[٤٩]، لەکاتێکدا خوای گەورە نەیفەرمووە سوودیان لێوەرمەگرن، بەڵکو خۆیان ئەو شتەیان داهێناوە، خوای گەورەش بە توندی ئەو گومانەی ڕەتکردووەتەوە، نەهی لێکردوون لەسەر ئەو کارەیان، پاشان خوای گەورە بۆ هەموو گەل و سەردەمێك پەیامبەرانی ناردووە کە سەرجەمیان بانگەوازیان کردووە بۆ یەکتاپەرستی، ڕێگرییان کردووە لە پەرستنی غەیری خوا، وەك ئەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُواْ لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا عَبَدْنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَىْءٍ نَّحْنُ وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَىْءٍ كَذَٰلِكَ فَعَلَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَهَلْ عَلَى ٱلرُّسُلِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿٣٥﴾ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِى

---

٤٩- (بەحیرە) ئەو حوشترەیە کە پێنج سکی کردبێت و پێنجەمی نێر بێت، ئەو کاتە گوێیان لەت ئەکرد و بەرەڵایان ئەکرد، (سائیبە)ش ئەو هوشترە بوو کە دە تا ١٢ سکی بکردایە تۆیەمیان مێینە بوایە،( وەصیلە)ش ئەو هوشترە بوو کە یەکەم سك و دووەم سکی مێینە بوایە.

﴿ كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلطَّٰغُوتَ ۖ فَمِنْهُم مَّنْ هَدَى ٱللَّهُ وَمِنْهُم مَّنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ ٱلضَّلَٰلَةُ ۚ فَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿٣٦﴾ ﴾ (النحـل)، ئەوانـەی هاوەڵیان داناوە بۆ خوا دەڵێن: ئەگەر خوا ویستی لەسەر بوایە هیچ شتێکمان لـە جیـاتی ئەو نەدەپەرست، نـە ئێمـەو نـە بـاوو باپیرانمـان، هـیچ شتێکیشـمان لـە خۆمـان حـەرام نەدەکرد بە بێ ئەو، خوا نەناسانی پێش ئەمانیش هـەروایان دەکـردو هـەر وایـان دەوت، مەگەر ئەرکی سەرشانی پێغەمبەران هەر ئەوە نیە کە ئایینی خوا بە ڕوونی ڕابگەیەنن؟

سـوێند بـە خـوا بێگومـان ئێمـە لـەناو هـەر گـەل و نەتەوەیەکـدا پێغەمبـەرێکمان ڕەوانەکردووەو پێمان ڕاگەیاندووە کە پێیان بڵێـت: تـەنها خـوا بپەرسـتن، خۆتـان دوورە پەرێز بگرن لە هەموو پەرستراوێکی تر، جا هـەبوو لـەو خەڵکـە (کـە بـیرو هـۆش و ژیـری خۆی خستەکارو بەشوێن ڕاستیدا دەگـەڕا) خـوایش هیدایـەتی دەدا، هەشـیان بـوو خـۆی شایستەی گومڕایی دەکردو بەسەریدا دەچەسپا، کەوابوو بگەڕێن بەسەر زەویـداو سـەرنج بدەن، بزانن چۆن بوو سەرەنجامی ئەو کەسانەی بڕوایان بە بەرنامەی ئێمە نەبوو.

خوای گەورە بەردەوام پەیامبەرانی ناردووە بۆ سەرخەڵکی لەو کاتەی شیرك داهاتووە و دەستی پێکردووە لەنێو ئادەمیزادەکاندا، لەسەردەمی گەلی نووحەوە کـە خوا(نـوح)ی بۆ نـاردن، ئـەوە یەکـەم پەیامبـەر بـووە کـە خـوا ناردوویـەتی بـۆ سـەر زەوی تـا کۆتـا پەیامبەر کە موحەممەدە ﷺ، کە ئینسان و جنۆکە سەرجەمیان لە ڕۆژهـەڵات و ڕۆژئـاوای زەویدا پێڕەوییان لە پەیامەکی کردووە، وەك خوای گـەورە ئەفـەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِىٓ إِلَيْهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعْبُدُونِ ﴿٢٥﴾ ﴾ (الانبیاء)، ئێمە پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێکمان ڕەوانە نەکردووە، کە وەحیمان بۆ نەناردبێت بـەوەی کـە: بێگومـان هـیچ خوایەك نیە جگە لـە مـن و دەبێـت هـەر مـن بپەرسـتن.هەروەها ئەفـەرموێ: ﴿ وَسْـَٔلْ مَنْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رُّسُلِنَآ أَجَعَلْنَا مِن دُونِ ٱلرَّحْمَٰنِ ءَالِهَةً يُعْبَدُونَ ﴿٤٥﴾ ﴾ (الزخـرف)، تـۆ لـەو

پێغەمبەرانەی کە ناردوومانە پێش تۆ بپرسە، ئایا جگە لە خوای میهرەبان خوای ترمان دیاری کردووە کە بەندایەتی بۆ بکرێت. (مەبەست ئەوەیە کە سەرچاوەی هەموو پێغەمبەران یەکێکە.)، ئیتر کەی گونجاوە بۆ موشریکەکان کە قسەی وا بکەن و بڵێن: ﴿..لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا عَبَدْنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَىْءٍ نَّحْنُ وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَىْءٍ..﴿٣٥﴾﴾ (النحل)، ئەگەر خوا ویستی لەسەر بوایە هیچ شتێکمان لە جیاتی ئەو نەدەپەرست، نە ئێمەو نە باوو باپیرانمان، هیچ شتێکیشمان لە خۆمان حەرام نەدەکرد بە بێ ئەو؟!

پاش ئەوەی کە خوا -جل جلالە هەواڵیداوە بە دواخستنی سزا لە دونیادا پاش ئاگادارکردنەوەی پێغەمبەران بۆیان دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِى كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلطَّٰغُوتَ ۖ فَمِنْهُم مَّنْ هَدَى ٱللَّهُ وَمِنْهُم مَّنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ ٱلضَّلَٰلَةُ ۚ فَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿٣٦﴾﴾ (النحل)، سوێند بە خوا بێگومان ئێمە لەناو هەر گەل و نەتەوەیەکدا پێغەمبەرێکمان ڕەوانەکردووەو پێمان ڕاگەیاندووە کە پێیان بڵێت: تەنها خوا بپەرستن، خۆتان دوورە پەرێز بگرن لە هەموو پەرستراوێکی تر، جا هەبوو لەو خەڵکە (کە بیرو هۆش و ژیری خۆی خستەکارو بەشوێن ڕاستیدا دەگەڕا) خوایش هیدایەتی دەدا، هەشیان بوو خۆی شایستەی گومرایی دەکردو بەسەریدا دەچەسپا، کەوابوو بگەڕێن بەسەر زەویداو سەرنج بدەن، بزانن چۆن بوو سەرەنجامی ئەو کەسانەی بڕوایان بە بەرنامەی ئێمە نەبوو.

واتە پرسیار لەوانە بکەن کە سەرپێچی پێغەمبەرانیان کرد وەو ڕاستییان بەدرۆخستووەتەوە، چۆن ﴿دَمَّرَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ ﴿١٠﴾﴾ (محمد)، لەناوی بردن، هەروەها ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ ﴿١٨﴾﴾ (الملك)، سوێند بەخوا بێگومان خەڵکانی تری پێش ئەمان بڕوایان بەپێغەمبەرانی ئێمە نەکرد ئاشکرایە چ بەڵایەکم بەسەرهێناون و چۆن تەمێمکردن.

پاشان خوای جل جلاله پێغەمبەرەکەی کە موحەممەدەﷺ ئاگادارکردووەتەوە کە سووربوونی ئەو لەسەر هیدایەتدانی خەڵکی هیچ سوودێکی نیە بۆیان، ئەگەر خوا ئیرادەی گومڕابوونی ئەوان هەبووبێت، وەك ئەفەرموێ:

﴿ ۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ لَا يَحْزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْكُفْرِ مِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِأَفْوَٰهِهِمْ وَلَمْ تُؤْمِن قُلُوبُهُمْ ۛ وَمِنَ ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ ۛ سَمَّٰعُونَ لِلْكَذِبِ سَمَّٰعُونَ لِقَوْمٍ ءَاخَرِينَ لَمْ يَأْتُوكَ ۖ يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ مِنۢ بَعْدِ مَوَاضِعِهِۦ ۖ يَقُولُونَ إِنْ أُوتِيتُمْ هَٰذَا فَخُذُوهُ وَإِن لَّمْ تُؤْتَوْهُ فَٱحْذَرُوا۟ ۚ وَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ فِتْنَتَهُۥ فَلَن تَمْلِكَ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَمْ يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يُطَهِّرَ قُلُوبَهُمْ ۚ لَهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا خِزْىٌ ۖ وَلَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٤١﴾ ﴾ (المائدة).

ئەی پێغەمبەر ! با غەمبارت نەکات ئەوانەی کە بەپەلە بەدەم بێ باوەڕی و بێ دینیەوە دەچن، لەوانەی کە بەدەم و زار دەڵێن: باوەڕمان هێناوە، بەڵام دڵیان باوەڕی نەهێناوە، هەروەها لەوانەش کە بوونەتە جولەکە و زۆر گوێگرن بۆ درۆو دەلەسە، زۆر گوێبیستن بۆ خەڵکی تریش (کە خوانەناسن و) نەهاتوون بۆ لات، قسە دەگۆڕن و قسە وەکو خۆی ناگێڕنەوە، یاخود ئاوەژووی دەکەن، دوای ئەوەی جێی خۆی گرتبوو (ئەوانەی کە خەڵك دەنێرن بۆ لای پێغەمبەرو پێی) دەڵێن: ئەگەر ئاوا بڕیاریدا لێی وەربگرن، ئەگەر وانەبوو هوشیار بن، جا ئەوەی خوای گەورە بیەوێت تووشی تاقیکردنەوە و سزای بکات، ئەوە هەرگیز تۆ خاوەنی هیچ شتێك نابیت لەلایەن خواوە بۆ ڕزگار بوونی ئەو، ئائەوانە ئەو کەسانەن خوا نەیویستووە دڵیان پاك و خاوێن بکاتەوە (چونکە خۆشیان مەبەستیان نەبووە) ئەوانە لە دنیادا سەرشۆڕیی و شەرمەزاریی بەشیانە، لە قیامەتیشدا سزای سەخت و گەورە چاوەڕێیانە.

بەهانەی موشریکەکان لەسەر ویست و قودرەتی خوا بۆ شەریکدانان بۆ خوا هاوشێوەی ئەوەیە کە خوا ئەفەرموێ: ﴿ قَالَ ٱدْخُلُوا۟ فِىٓ أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِكُم مِّنَ ٱلْجِنِّ

وَٱلْإِنسِ فِى ٱلنَّارِ كُلَّمَا دَخَلَتْ أُمَّةٌ لَّعَنَتْ أُخْتَهَا حَتَّىٰٓ إِذَا ٱدَّارَكُوا۟ فِيهَا جَمِيعًا قَالَتْ أُخْرَىٰهُمْ لِأُولَىٰهُمْ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ أَضَلُّونَا فَـَٔاتِهِمْ عَذَابًا ضِعْفًا مِّنَ ٱلنَّارِ قَالَ لِكُلٍّ ضِعْفٌ وَلَٰكِن لَّا تَعْلَمُونَ ﴿٣٨﴾ ﴾ (الاعـــــراف)، (ئەوسا خوا فەرمانیدا) و فەرمووی: دە بچنە ریزی ئەو کۆمەڵانەوە کە پێش ئێوە هەبوون (لەگومڕاکان) لەدەستەی پەری و ئادەمیزادەکان لەناو دۆزەخدا، هەر کاتێك هەر کۆمەڵ و دەستەیەك دەچنە ناوی نەفرین دەکەن لە هاوئاین و هاو بیرانیان، هەتا ئەو کاتەی هەموویان کۆ دەکرێنەوە و بەسەریەکدا دەدرێن لە ناویدا، شوێنکەوتەکان ڕوو بەگەورەکانیان دەڵێن: پەروەردگارا ئا ئەوانە ئێمەیان گومڕاکرد، دە تۆش لەناو دۆزەخدا سزای دوو بەرامبەریان بدە ! ! (خوای گەورەش فەرمووی): بۆ هەموو لایەك (سزاو تۆڵە) دوو بەرامبەرە بەڵام ئێوە پێی نازانن.

**دووەم: خوا جل جلاله ڕازی نیە بەندەکانی بێ باوەڕ بن.**

ویست و ئیرادەی شەرعی خواجل جلالە لەو بارەوە بوونی نیە،چونکە فەرمانی پێکردوون بەنەکردنی لەسەر زاری پێغەمبەرانی، سەبارەت بە ویست و ئیرادە کەونیەکەی خوای گەورەش کە قەدەری خودایە لە ڕێگەپێدانیان هیچ بەهانەیەکیان نیە، چونکە خوای گەورە ئاگرو دانیشتوانەکەی لە بێباوەڕ و شەیتانەکان دروستکردووەو بە کوفری بەندەکانی ڕازی نیە، لەوەشدا بەڵگەیەکی بەهێز و حیکمەتێکی یەکلاکەرەوەی تێدایە وەك ئەفەرموێ: ﴿ إِن تَكْفُرُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ عَنكُمْ ۖ وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلْكُفْرَ ۖ وَإِن تَشْكُرُوا۟ يَرْضَهُ لَكُمْ ۗ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۗ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرْجِعُكُمْ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٧﴾ ﴾ (الزمـر)، گەر خۆتـان بـێ بـاوەڕ بکـەن، بێگومـان خـوا بـێ نیـازە لێتـان، هەرچەندە ڕازی نابێت کە بەندەکانی بێ باوەڕبن و ڕێبازی خوانەناسی بگرن ، بەڵام ئەگەر ڕێبازی سوپاسگوزاری بگرنە بەر، بەو کارەتان ڕازی دەبێت، دڵنیاش بن کە هیچ کەس کوڵی گەناهی کەسی تر هەڵناگرێت، پاشان گەرانەوەتان بۆ لای پەروەردگارتانە،

ئەوسا هەواڵی هەموو ئەو کاروکردەوانەتان پێدەدا کە ئەنجامتان دەدا، چونکە ئەو زاتە زانایە بە هەموو ئەو شتانەی، لە سینە و دڵ و دەروونەکاندا حەشاردراون.

خوای گەورە لە عیلمی وسبەقی خۆیدا پێش ئەوەی بەندەکانی دروست بکات بە حاڵیان ئاگاداربووە، لە داهاتووشیان ئاگادارە چۆن بڕیار ئەدەن، پاشان مرۆڤەکانی خستە سەر زەوی، بۆ ئەوەی ئەو نهێنیانە ئاشکرا ببن، کە خوا پێشتر ئاگاداری بوو، ئاشکراکردنی ئەم نهێنیانەش لە ڕێگای تاقیکردنەوە و فەرمانکردن بە چاکە و نەهیکردن لە خراپەوە دەبێت، لە ڕێگەی ئەو کردەوەو ڕەفتارانەوە کە پەیوەندی بە عیلمە موسبەقەکەوە هەبووە، و شایستەی پیاهەڵدان و سەرزەنشتکردن و پاداشت و سزاوە بوون، بەو شێواز و شایستەی ئەو کارانە دەبوون کە لە عیلمی پەنهانی خودا دا بووە پێش ئەوەی خۆیان بیزانن، بۆیە پەیامبەرانی نارد و پەڕاوی بۆ دابەزاندن بۆ ئەوەی بیانوویان نەمێنێت، و ئیقامە حوججە بکات لەسەریان، بۆ ئەوەی نەڵێن: چۆن سزامان ئەدەیت لەسەر ئەو زانیاریانەی کە هەتە لەسەرمان، ئەم کارە لەگەڵ کردەوەو ئیرادەی ئێمەدا یەکناگرێتەوە، بەڵام کاتێك بەناردنی پێغەمبەران و پەڕاوەکانیش ڕێگای ڕاستیان هەڵنەبژارد ئەوکات زانیاریە شارەوەکانی خودا ئاشکرا ئەبێت لەسەریان و کە بە تاقیکردنەوەش ناگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردگار،[٥٠] مەبەستەکە لەوەدایە: ئیرادەی خواجل جلالە دابەش دەبێت بەسەر ئیرادەیەکی کەونی کە مەبەست لێی ویستی خودایە وەك ئەفەرموێ:

﴿ ۞ تِلْكَ ٱلرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ مِّنْهُم مَّن كَلَّمَ ٱللَّهُ وَرَفَعَ بَعْضَهُمْ دَرَجَٰتٍ وَءَاتَيْنَا عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَيَّدْنَٰهُ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا ٱقْتَتَلَ ٱلَّذِينَ مِنۢ بَعْدِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ وَلَٰكِنِ ٱخْتَلَفُوا۟ فَمِنْهُم مَّنْ ءَامَنَ وَمِنْهُم مَّن كَفَرَ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا ٱقْتَتَلُوا۟ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ

---

٥٠- عقيدة اهل السنة و الجماعة،د.احمد فريد، مكتبة فياض،مصر،ص٢٠٣

يَفۡعَلُ مَا يُرِيدُ ﴿٢٥٣﴾ (البقره)[٥١] ئـەو پێغەمبەرانـەی (باسـكران) ڕێـزی هەنـدێكيانمان داوە بەسەر هاندێكی ترياندا، هەيانە خوا گفتوگۆی (يەكسەری) لەگەڵدا كردووە (وەك موسا) و پلەوپايەی هەنـدێكيانی بـەرز كردۆتـەوە بـە چـەندەها پلـە (وەك محمـد ﷺ و چـەندەها بەڵگەی ڕوون و ئاشكرامان بەخشيووە بەعيسای كـوڕی مەريـەم، (وەك زيندووكردنـەوەی مردوو، چاكردنەوەی نەخۆشی زگماك،.. هتد بەويستی خـوا) و پشـتگيريمان كـردووە بـە فريشتەی سرووش كە (جوبرەئيل)ە، خۆ ئەگەر خـوا ويسـتی لەسـەر بوايـە (ئـەو خەڵكـە هەمووی باوەڕدار دەبوون)، دوای هاتنی پێغەمبەرەكانيان جـەنگيان دژبەيـەك نـەدەكرد، پاش ئەوەی چەندەها بەڵگەی ئاشكرايان (لەسەردەستی پێغەمبەران) بـۆ هـاتبوو، بـەڵام دووبەرەكی كەوتە نێوانيانـەوە، هەنـدێكيان ئيمـان و بـاوەڕی هێنـاو، هەندێكيشـيان بـێ بـاوەڕ بـوو، ئەگـەر خـوا ويسـتی لەسـەر بوايـە جـەنگيان دژ بەيـەك نـەدەكردو يـەكتريان نەدەكوشـت، بـەڵام خـوا هەرچيەكی بوێـت هـەر ئـەوە ئـەنجام دەدات هـەر ئـەوە پـێش دەهێنێت. بێباوەڕی و دووڕوويی و تاوان بەستراوە بە ويستی خواوە لەگەڵ ئەو شـتانەی پەيوەنديان بە خۆشەويستی و ڕەزامەندی و كاروباری دينەوەيە.

بەشی دووەم لە ئيرادە: ئيرادەی دينيە، كە مەبەست لێی شەرعی خوايە، لەسەر زاری پەيامبەرانيسەلامی خوايان لێبێت وەك ئەفـەرموێ: ﴿ إِن تَكۡفُرُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنكُمۡۖ وَلَا يَرۡضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلۡكُفۡرَۖ وَإِن تَشۡكُرُواْ يَرۡضَهُ لَكُمۡۗ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٞ وِزۡرَ أُخۡرَىٰۗ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرۡجِعُكُمۡ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَۚ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٧﴾ (الزمر)، گەر خۆتان بێ باوەڕ بكـەن، بێگومـان خـوا بـێ نيـازە لێتـان، هەرچـەندە ڕازی نابێـت كـە بەنـدەكانی بـێ بـاوەڕبن و ڕێبـازی خوانەناسـی بگـرن، بـەڵام ئەگـەر ڕێبـازی سـوپاسـگوزاری بگرنەبـەر، بـەو كارەتـان ڕازی دەبێـت، دڵنيـاش بـن كـە هـيچ كـەس كـۆڵی گـەناهی كەسـی تـر هـەڵناگرێت، پاشـان

---

٥١- هەمان سەرچاوەی پێشوو،ص٢١٥.

گەرانەوەتان بۆ لای پەروەردگارتانە، ئەوسا هەواڵی هەموو ئەو کاروکردەوانەتان پێدەدا کە ئەنجامتان دەدا، چونکە ئەو زاتە زانایە بە هەموو ئەو شتانەی، لە سینە و دڵ و دەروونەکاندا حەشاردراون. ﴿ وَإِذَا تَوَلَّىٰ سَعَىٰ فِي ٱلۡأَرۡضِ لِيُفۡسِدَ فِيهَا وَيُهۡلِكَ ٱلۡحَرۡثَ وَٱلنَّسۡلَۚ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلۡفَسَادَ ﴿٢٠٥﴾ ﴾ (البقرة)، هەر کاتێك ئەو جۆرە کەسە پشتی هەڵکردو دەسەڵاتی پەیدا کرد" هەوڵ و کۆشش دەدات لە زەویدا تا ئاشوب بەرپا بکات و خراپە بڕوێنێت و کشتوکاڵ لەناو ببات و پاکتاو کردنی ڕەگەزی ئەنجام بدات، بێگومان خوا فەسادو خراپە و تاوانی ناوێت.

بەمەش بۆ ئەوانەی بە چارەنووس بەهانە دێننەوە، لەسەر بێباوەڕبوونیان روون ئەبێتەوە کە کار و کردەوەکانیان دەچێتە ژێر ئیرادە و چارەنووسی کەونی خوای گەورەوە: خۆ ئەگەر خوا ڕێگای پێداون بەو کارانە و توانای پێبەخشیوون لە ڕێگەی ئیرادە و ویستی خۆیەوە، بەلاَم رازی نیە لە کردەوەکانیان و پێی ناخۆشە، چونکە مەرج نیە هەر شتێك خوداجل جلالله خەلقی کردبێت لێی رازی بێت و پێی خۆش بێت، لە هەمان کاتدا خوای گەورە رازییە بە بوونی شیرك و کوفر و گوناه وتاوان، بەلاَم رقی لێیەتی و رەتی ئەکاتەوە..[52]

**سێیەم: موشریکەکان هیچ بەڵگەیەکیان نیە لەسەر بانگەشەکەیان.**

هەر بۆیە ئەوە گومانێکی بەتاڵە و لە نەفامی و نکولیکردنەوە سەرچاوەی گرتووە، چونکە موشریکەکان لە قورئان و لەوانەش کە پەیامبەران هێناویانە سەبارەت بە یەکتاپەرستی رەتیان کردووەتەوە و لایان داوە لێی، تەنانەت بیریان لەو سزاو تۆڵانەش نەکردووەتەوە کە بەسەر گەلەکانی پێش خۆیاندا هاتووە، بەڵکو لەسەر لادان و عینادیکردن بەردەوام بوون، تا بە سزای خوا گەیشتوون، ئەوانە هیچ عیلمێکیان

---

٥٢- القضاء و القدر،د.عمر سليمان الاشقر،دار الاسلام،القاهرة،٢٠٠٥،ص٨٢.

لەبەردەستدا نەبووە کە پشتی پێ ببەستن لە شیرکەکەیاندا، بەڵکو تەنیا شوێن گومان و خەملاندن کەوتن، بۆیە خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿ سَيَقُولُ الَّذِينَ أَشْرَكُوا لَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا أَشْرَكْنَا وَلَا آبَاؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن شَيْءٍ ۚ كَذَٰلِكَ كَذَّبَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ حَتَّىٰ ذَاقُوا بَأْسَنَا ۗ قُلْ هَلْ عِندَكُم مِّنْ عِلْمٍ فَتُخْرِجُوهُ لَنَا ۖ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَإِنْ أَنتُمْ إِلَّا تَخْرُصُونَ ﴿١٤٨﴾ قُلْ فَلِلَّهِ الْحُجَّةُ الْبَالِغَةُ ۖ فَلَوْ شَاءَ لَهَدَاكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿١٤٩﴾ ﴾ (الانعام)، لەمەودوا موشریك و هاوەڵگەران دەڵێن: ئەگەر خوا بیویستایە هاوەڵمان بۆ بڕیار نەدەدا!! باوو باپیرانیشمان موشریك نەدەبوون!! هیچ شتێکیشمان لە خۆمان حەرام نەدەکرد!! (ئەمانە هەمووی قسەی بەتاڵە و هەرگیز خوای گەورە زۆر لە کەس ناکات بۆ باوەڕ هێنان یان بێ باوەڕی) هەر بەو شێوەیە ئەوانەی پێش ئەمانیش درۆ و بوختانیان هەڵدەبەست، هەتا تووشی بەڵای ئێمە بوون و سزای ئێمەیان چەشت، پێیان بڵێ: ئایا هیچ زانیاری و زانستیەکی خوایتان لەلایە، تا نیشانمان بدەن و بۆمان دەربخەن؟ ئێوە شوێنی هیچ شتێکی تر ناکەون جگە لەگومان و ئێوە هیچ شتێکی تر ناکەن مەگەر ئەوە نەبێت کە درۆ دەکەن.

ئەی پێغەمبەر! پێیان بڵێ: کەوابوو هەر بۆ خوایە خۆی بەڵگە تێرو تەواوەکان، جا ئەگەر بیویستایە ئەوە هەمووتانی بەتەواوی هیدایەت دەداو بە ناچاریی هەمووان بڕوادار دەبوون (بەڵام ڕێزی لێگرتوون و سەرپشکی کردوون). واتە: بە ئەو نەفامانەی کە بناغەی ئایینەکەیان لەسەر خەملاندن بنیاتناوە بڵێ: ئەوە لاوازترین گومانە پاش ئەوەی لە لایەن تۆوە دەمکوت کران لە هێنانی بچوکترین بەڵگە یان قسەیەك کە تۆزقاڵێك بۆنی عیلمی لێبێت، پێیان بڵێ: ئەگەر ئێوە زانیاریتان نیە سەبارەت بە دینەکەتان ئەوا خوای تاك وتەنیا بەرزترین پلەی عیلمی لەلایە لەسەر ئەو دینە راست و دروستەی کە منی وەك پەیامبەرێك بۆ رەوانەکردووە، ئەوەش بەڵگەیەکی بەهێزە بۆ کەسێك کە راستی بچەسپێنێت و نارەواییەکان پووچەڵ بکاتەوە.

دەرەنجامی ئەو بەهانەیە: ئەوان بەهانە ئەهێننەوە بۆ پێغەمبەرﷺ کە ئەوەی ئەوان شوێنی کەوتوون ئەگەر خودا رازی لەسەر نەبوایە ئەیگێڕانەوە و رێگری لێئەکردن و کارئاسانی بۆ نەئەکردن، ئەان بۆ بێدەنگکردنی پێغەمبەرﷺ و هەڵوەشانەوەی ئەو حوکمە وا دەڵێن کە بڕوای گومڕابوونیان بەسەردا دراوە، ئەمە گومانی ئەو کەسانەیە کە عەقڵیان تەواو نیە، ئەوانەی جیاوازی ناکەن لە راپەڕاندنی خودا بۆ داهێنان و دیاریکردن (الخلق و التقدیر)، لەگەڵ پاراستنی یاساکانی بوونەوەر، کە ئەویش ئەو راپەڕاندنەیە کە ئێمە پێی دەڵێین ویست و ئیرادە، لە نێوان راپەڕادنی فەرمان و نەهیکردن، ئەویش ئەوەیە کە ئێمە پێیدەڵێین خۆشەویستی و رەزامەندی، یەکەمیان راپەڕاندنی دروستکردنە، دووەمیان راپەڕاندنی پیێ سپاردنە، ئەوان وای دادەنێن توانایان لەسەر دانانی بنەمای شیرك و حەرامکردن و حەلاڵکردنیان تەنیا ئەوەیە کە خوا ئەو توانایەی پیێ بەخشیوون، ئیتر وای دادەنێن کاتێك کە خوا دەستی نەگرتوون لەو کارە ئەوە دەگەیەنێت رازییە لەو کارانە کە دەیکەن، ئەگەر رازی نەبوایە دەستەوسان نەدەبوو لە سەندنەوەی تواناکانیان، جا ئەگەر کارەکە بەو شێوەیە بوایە کە ئەوان دەیڵێن ئەوا رەواو نارەوا(الحق و الباطل) یەك شت دەبوو..ئەوان کە دەڵێن: ئەگەر خوا ویستی لەسەر بوایە ئەوە شەریکمان بۆی بڕیار نەئەدا، بێ ئاگان لەوەی کە لە لایەن پێغەمبەرەوەﷺ پێیان بووترێت: ئەگەر خوا ویستی لەسەر بێ پێم نەدەگووتن کە کردوەکانتان گومڕاییە، ئەو کاتە بەپێی گومانەکەیان خوای گەورە شتێکی دەوێت لەگەڵ هاودژەکەی. ئەویش ئەوەیە لە یەك کاتدا ویستی لەسەر بووە شەریکی بۆ بڕیار بدەن و ویستی ئەوەشی بووە کە پێغەمبەرﷺ پێیان بڵێ: شەریك بۆ خوا بڕیار مەدەن بەمەش پلانی گومڕاکان ئاشکرا بوو لە نێوان ویستی خوا و ویستی بەندەکانی، لەبەر ئەوە وەلاٚمیان نەداتەوە..ئەو ویستەی ئەوان دەیکەنە بیانوو ویستێکی شاراوەیە و عەقڵی

مرۆڤەکان دەرکی پێناکات، بۆیە لۆمە و سەرزەنشتیکردن لەسەر پشت بەستنیان پێیەوە لەبەر بێئاگاییانە لە ناوەڕۆکەکەی.[٥٣]

واتە وەك کردەوەی ئەوانەی پێش خۆیان، مەبەست لەوانەی پێش خۆیان عاقیبەت و سەرەنجامەکەیانە، ئەگەر کارەکان جێگای ڕەزامەندی بوونایە خودا بە هیلاکی نەئەبردن، ئەی بۆچی بەهیلاك چوونی ئەوان ناکەنە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە خوا لە کارەکانیان ڕازی نەبووە، چونکە بەڵگەی لەناوچوون بەهێزترە لە بەڵگەی مۆڵەت پێدان و هێشتنەوەیان.

**بە کورتی:**

- مەبەستی سەرەکی لەناردنی پێغەمبەرانسەلامی خوایان لێبێت ناساندنی خوایەجل جلالە، بۆ ئەوەیە رایبگەیەنن کە تەنیا ئەو شایانی پەرستنە، هەروەها خودا بە شیرك و بێباوەڕی بەندەکانی ڕازی نیە.
- بەهانەهێنانەوەی موشریکەکان بە چارەنووس لەسەر شیرك دانان بۆ خوا یەك ناگرێتەوە لەگەڵ نەهیکردن لەشیرك لەسەر زاری پێغەمبەران.

ویست و ئیرادەی کەونی خوا بەڵگەیە لەسەر عیلمی ئەزەلی خواجل جلالە بەڵگە نیە لەسەر ڕازیبوونی بە کوفر و تاوان، خوا ئەفەرموێ: ﴿ إِن تَكْفُرُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنكُمْ وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ الْكُفْرَ وَإِن تَشْكُرُوا يَرْضَهُ لَكُمْ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرْجِعُكُمْ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ ﴿٧﴾ ﴾ (الزمر)، گەر خۆتان بێ باوەڕ بکەن، بێگومان خوا بێ نیازە لێتان، هەرچەندە ڕازی نابێت کە بەندەکانی بێ باوەڕبن و ڕێبازی خوانەناسی بگرن، بەڵام ئەگەر ڕێبازی سوپاسگوزاری بگرنە بەر، بەو کارەتان ڕازی دەبێت، دڵنیاش بن کە هیچ کەس کۆڵی گەناهی کەسی تر هەڵناگرێت، پاشان

---

٥٣- التحرير و التنوير، الطاهر بن عاشور، سەرچاوەی پێشتر،ج٥-٨،ص١٤٨،١٤٧، بە دەستکارییەوە.

گەرانەوەتان بۆ لای پەروەردگارتانە، ئەوسا هەواڵی هەموو ئەو کاروکردەوانەتان پێدەدا کە ئەنجامتان دەدا، چونکە ئەو زاتە زانایە بە هەموو ئەو شتانەی، لە سینە و دڵ و دەروونەکاندا حەشاردراون.

**بەشی دووەم**

**گومان و قسە بێبناغەکان سەبارەت بە خواجەل جلالە لە دەرەوەی بابەتی ئولوهییەتدا**



## گومانی دوازده

## جولەکەکان بانگەشەی ئەوەیان ئەکرد کە خوای گەورە هەژار و دەست قوچاوە و ئەوانیش دەوڵەمەندن *[٥٤]

**ناوەرۆکی گومانەکە:**

جولەکەکان دەڵێن: گوایە خوا هەژارە و خۆیان دەوڵەمەندن، ئەمەش دوای دابەزینی ئەم ئایەتە بوو کە ئەفەرموێ: ﴿ مَن ذَا ٱلَّذِي يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥٓ أَضْعَافًا كَثِيرَةً ۚ وَٱللَّهُ يَقْبِضُ وَيَبْصُۜطُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢٤٥﴾ ﴾ (البقرة)، کێیە ئەو کەسە قەرز دەدات بەخوای پەروەردگار بە قەرزێکی چاك (بەخشراوەکە لە ماڵی حەڵاڵ و بێ منەت و نازدار بێت)، خوایش بەو هۆیەوە بۆی چەند بەرامبەر دەکات و پاداشتی بێ سنووری پێ دەبەخشێت، (بەڕاستی خوایەکی بەڕێزو دلۆڤانمان هەیە، جێگەی سەرسوڕمان و سەرنجە ئەو شێوازەی کە هانی ئیمانداارانی پێ دەدات، بۆ بەخشین بە یەکترو بۆ بەخشین بۆ ڕزگاری گرۆی ئادەمیزاد)، خوایش ڕزق و ڕۆزیی و دەرامەت دەگرێتەوە و فراوانی دەکات (بە حیکمەت و ویستی خۆی) هەر بۆ لای ئەو زاتەش دەگەڕێنەوە.کە ئەم ئایەتە دابەزی جولەکەکان وتیان: موحەممەد! پەروەردگارەکەت هەژار بووە و داوای قەرزمان لێئەکات، فەنحاص کە ڕێبەری گەورەی زاناکانیان بوو وتی: ئێمە کە دەوڵەمەندین پێویستمان بە خوایەکی هەژار نیە، ئەو کە هەژارە پێویستی بە ئێمەی دەوڵەمەندە! ئێمە لەو خوا نزیك نابینەوە، وەك ئەو ئەیەوێ لێمان نزیك ببێتەوە، ئەگەر پێویستی بە ئێمە نەبوایە داوای قەرزی لێنەئەکردین، جا ڕووی کردە موسڵمانەکان و وتی: نەهی لە ئێوە ئەکات سوو بخۆن، بەڵام ڕێگە لە ئێمە ناگرێ و سوومان ئەداتێ، ئەگەر دەوڵەمەند بوایە سووی

---

٥٤ - ئەو دوو ئایەتی کە باسی ئەم گومانە ئەکەن بریتین لە:(ال عمران/١٨١،المائدة/٦٤)، ئەو ئایەتانەش کە وەڵامی ئەم گومانە ئەدەنەوە بریتین لە:(ال عمران/١٨١، المائدة/٦٤، الاسراء/١٠٠).

نەئەداینێ! جارێکی تر جولەکەکان وەسفی خوا بە دەستنوقاوی ئەکەن و ئـەڵێن دەست بەوەوە ئەگرێ کە هەیەتی، پاك و بێگەردی بۆ خوا لەو قسانەی جولەکە بەرانبـەر خـوای گـەورە ئەیکـەن،خوای گـەورە ئەفـەرموێ: ﴿ لَّقَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ ۘ سَنَكْتُبُ مَا قَالُوا۟ وَقَتْلَهُمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَنَقُولُ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴿١٨١﴾ ﴾ (ال عمران)، سوێند بێت بێگومان خوای پەروەردگار گوفتاری (نابـەجێی) ئـەو (جولەکانـەی) بیست کە وتیان: خوا هەژارە و ئێمە دەوڵەمەندین! ! ئێمە ئەو گوفتارانە یاداشت و تۆمار دەکەین لەسـەریان، هـەروەها کوشـتنی پێغەمبـەران بـە دەسـتی ئـەوان بـە ناحـەق، (لـە دۆزەخیشدا) پێیان دەڵێین: بچێژن سزای ئاگری سوتێنەر...هەروەها ئەفەرموێ:

﴿ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ يَدُ ٱللَّهِ مَغْلُولَةٌ ۚ غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُوا۟ بِمَا قَالُوا۟ ۘ بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ يُنفِقُ كَيْفَ يَشَآءُ ۚ وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم مَّآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ طُغْيَٰنًا وَكُفْرًا ۚ وَأَلْقَيْنَا بَيْنَهُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ كُلَّمَآ أَوْقَدُوا۟ نَارًا لِّلْحَرْبِ أَطْفَأَهَا ٱللَّهُ ۚ وَيَسْعَوْنَ فِى ٱلْأَرْضِ فَسَادًا ۚ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٦٤﴾ ﴾ (المائدة)،

ئـەو جولەکـە (نـەفام و خوانەناسـانە) دەیـانوت: خـوا دەسـتی دەسـتی بەسـتراوە و خێـری لەدەسـت نابێتـەوە! ! دەك دەسـتیان بەسـتراو و بـێ خێـرو کەلەپچـە و تووشـی شەلەل بێت، دەك نەفرینیان لـێ بێـت، بـۆ خۆیـان و قسـەیان، نـەخێر، وانیـە بـەڵکو دوو دەستەی (پڕ لە بەرەکەتی پـەروەردگار) هەمیشـە و بـەردەوام کراوەیـە، چۆنی بوێـت و چەندی بوێت دەیبەخشێت! سوێند بێت زۆربەیان ئەوەی نێردراوەتە خـوارەوە بـۆت کـە قورئانە لەلایەن پەروەردگارتەوە یاخی بوون و ستەمیان زیاد دەکات و نغرۆیان دەکات لە کــوفردا، ئێمـــەش هـــەتا ڕۆژی قیامـــەت دوژمنایـــەتی و ڕق و کینـــەمان لەنێوانیانـــدا بەرپاکردووە، هەر کاتێك دەیانەوێت جەنگ بەرپا بکەن و ئاگری شەڕ هەڵبگیرسێنن خـوا دەیکوژێنێتـەوە و نایـەڵێت تەشـەنە بکـات، ئەوانـە زۆر بەپەلـە و بەگـەرمی هـەوڵی بڵـاو

بوونەوەی فەسادو تاوان دەدەن لە زەویدا، خوایش ئەو کەسانەی خۆش ناوێت کە تۆوی خراپە دەچێنن.

**ڕێگاکانی پووچەڵکردنەوەی ئەم گومانە:**

١. بێ حەیایی جولەکە لە وەسفکردنی خوادا بە شێوازێك کە لەگەڵ گەورەیی و مەزنی خوای پەروەردگاردا ناگونجێت..

٢. ئەوە نەفامی و نەزانی جولەکەیە کە بەو شێوەیە لە مانای قەرزدان بەخوا گەیشتوون، و ئیجازە بەخۆیان ئەدەن سوکایەتی بە ئیسلام و پێغەمبەرەکەی بکەن.

٣. فەزڵ و بەرەکەتی خوا فراوانە و چۆنی بوێت لێی ئەبەخشێت، جولەکە بەر نەفرینی خوا کەوتوون لە دونیا و لە دوارۆژیشدا و سزایەکی سەخت چاوەڕوانیان ئەکات.

دریژەی بابەتەکە:

**یەکەم: بێ حەیایی جولەکە لەبەرانبەر خوادا.**

هەندێ لە جولەکەکان زۆر چاونەترسانە وەسفی خوا ئەکەن، وەك فەنحاص کە سەرگەورە و زانای ناویان بوو، هەروەها حوییەی کوڕی ئەختەب، ئەڵێن گوایە خوا هەژارە و داوای قەرز لە بەندەکانی ئەکات، ئەمە بوختانێك و قسەیەکی زۆر نابەجێیە، خوا لەسەر ئەم قسەیە هەڕەشەیان لێئەکات و ئەفەرموێ:

﴿لَّقَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ ۘ سَنَكْتُبُ مَا قَالُوا۟ وَقَتْلَهُمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَنَقُولُ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴿١٨١﴾﴾ (ال عمران).

سوێند بێت بێگومان خوای پەروەردگار گوفتاری (نابەجێی) ئەو (جولەکانەی) بیست کە وتیان: خوا هەژارە و ئێمە دەوڵەمەندین! ! ئێمە ئەو گوفتارانە یاداشت و تۆمار دەکەین لەسەریان، هەروەها کوشتنی پێغەمبەران بە دەستی ئەوان بە ناحەق، (لە دۆزەخیشدا) پێیان دەڵێین: بچێژن سزای ئاگری سوتێنەر..خوا لای شاراوە نەبوو،

هەروەها بەسەریدا تێنەپەڕی و قسەی ئەو چاوقایمانەی بیست، هەر خۆشی پاداشتی ئەو بوختان و بێ حەیاییانەیان ئەداتەوە، ئەمە بەڵێنی خوایە کە ئەفەرموێ:( سَنَكْتُبُ مَا قَالُوا)، ئەوەی وتیان بۆیان ئەنووسین،ئەمە بەڵێن و هەڕەشەیە، جولەکەکان بەرنەفرەتی خوا بکەون کاتێك ئەو قسەیان کرد کە ئایەتی سەدەقەکردن دابەزی.وەك خوای گەورە ئەفـــــــەرموێ: ﴿ مَّن ذَا ٱلَّذِى يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥٓ أَضْعَافًا كَثِيرَةً ۚ وَٱللَّهُ يَقْبِضُ وَيَبْصُۜطُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢٤٥﴾ ﴾ (البقـرة) ، کێیـە ئـەو کەسـە قـەرز دەدات بـەخوای پەروەردگار بە قەرزێکی چاك (بەخشراوەکە لە ماڵی حەڵاڵ و بێ منەت و نازدار بێت)، خوایش بەو هۆیەوە بۆی چەند بەرامبەر دەکات و پاداشتی بێ سنووری پێ دەبەخشێت.

ئـەم قسانەیان بۆ چەواشـەکردنی خەڵکە بێ دەسـەڵاتەکە بوو، ئـەوان مەبەستیان ئەوەبوو کە گومان بخەنە دڵی بێ دەسەڵات و موسڵمانەکانەوە، لەگەڵ بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەردا ﷺ، یانی: لەسـەر قسـەی موحەممـەد خـوا هـەژارە، چـونکە داوای قـەرزی لێکردووین، ئەوەی ئەم قسەیەی کرد حوییەیی کوڕی ئەختەب بوو، کە زانای ناویان بوو، کاتێك گوێی لـە ئایەتەکـە بوو وتـی: هـەژار داوای قـەرز لـە دەوڵەمەند ئـەکات، هەندێك دەڵێن: فەنحاصی کوڕی عازورا ئـەو قسـەیەی بـە ئەبوبەکری صـدیق وتـووە، کاتێك پێغەمبەر ﷺ ئەبوبەکری نارد بۆ لای جولەکەکانی بەنوقەینوقاع کە بانگیان بکات بۆ لای ئیسلام کاتێك لە قوتابخانەکانیاندا بوون، بینی هـەموویان لـە فـەنحاص کۆبوونەتـەوە، ئەبوبەکر بانگی کرد بۆ لای ئیسلام، فـەنحاص وتـی: پێویسـتمان بـە خـودا نیـە، ئـەو هەژارە و پێویستی بە ئێمە هەیە، ئەگەر دەوڵەمەند بووایە ئەوە لەسەر زاری هاوڕێکەتان داوای قەرزی لێنەئەکردین،ئەبوبەکر تووڕە بوو لـە فـەنحاص و هەوڵیدا لێـی بدات، ئـەم ئایەتە پاش ئەو رووداوە دابەزی و قسەکان لەناو جولەکەدا بڵاوبوویەوە.

ئـەو ئایەتـەی کـە ئەفـەرموێ: ﴿ لَّقَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ ...﴿١٨١﴾ ﴾ (ال عمران)، هەڕەشەیە و ئەوە رائەگەیەنێت کە ئەو چاوقاییمیەکی گەورەیە و ئاماژەیە بۆ ئەوەی ئەوان مەبەستیان پێی هەڵوەشاندنەوەی قورئانە، چونکە ئەوان ئـەو دەربڕینـەیان بـە بـێ هـەڵاوێردن بـەکار هێنـاوە، لەبـەر ئـەوەی سـوکایەتیکردن بـە پێغەمبەرﷺ و بـە قورئان تـاوانێکی گەورە و کوفرە بـەدوای کـوفرا، بۆیـە ئـەفەرموێ: ﴿ لَّقَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ ...﴿١٨١﴾ ﴾ (ال عمران)، کە مەبەست لێی هەڕەشەیە بۆ قسەیەکی بێ مانا.

بێگومان شوێنکەوتەی ئایینەکانی تر ئەزانن کە خـوا ئاگـادارە لـە چـاوە ناپاکـەکان و ئاگادارە بەوەی ئەیشارنەوە لە دڵەکانیاندا، دیارە خوا مەبەستی ئەوە نیە بفەرموێ: خوا ئەو شتەی بیست و زانی، بەڵکو بە ئایەتی دوای ئەودا کە ئەفەرموێ:( سَنَكْتُبُ مَـا قَـالُوا) ئەمـە روون ئەبێتـەوە، مەبەست لـە نووسـینی ئـەو قسـەیە یـان ئەوەیـە کـە لـە نامـەی تاوانەکانیاندا ئەنووسرێت، خۆ کەس نیە ئەوە بە خەیاڵیدا بێت کە ئەو قسەیە لـە نامـەی چـاکەکانیدا ئەنوسـرێت! یـان مەبەسـت ئەوەیـە کـە نابەخشـرێن لـەو قسـەیە، بـەڵکو لەسەریان ئەچەسپێنرێت و سـزا ئـەدرێن لەسـەری، نووسـین کینایەتـە بـۆ سـزادان، واتـە بەشی یەکەمی ئایەتەکە بەڵێنە و بەشی دووەمی هەڕەشەیە.[٥٥]

**دووەم: حاڵێنەبوونی جولەکە لە مانای قەرزدان بەخوا جلالە.**

بێگومانە جولەگە لە مانـای قـەرزدان بـەخوا تێنەگەیشـتبوون، مەبەسـت لـە قـەرزدان بەخوا ئەوە نیە کە ئەو پێویستی پێی هەیە، بـەڵکو قـەرزدان بـە مانـای بەخشـین دێـت و مەبەست دەستگرتنی هەژاران و خـاوەن پێداویسـتیەکانە و بەخشـینی سـامانە لـە پێنـاو خوادا کە لـە فـەرموودەی قودسـیدا هـاتووە کـە ئەفـەرموێ: ( يَـا ابْـنَ آدَمَ، مَرِضْـتُ فَلَـمْ

٥٥- التحرير و التنوير، الطاهر بن عاشور، سەرچاوەی پێشتر،ج٣-٤،ص١٨٤،١٨٣، بە دەستکارییەوە.

تَعُدْني، فَيَقُولُ: يَا رَبِّ، وَكَيْفَ أعُودُكَ وَأَنْتَ رَبُّ الْعَالَمِينَ؟ فَيَقُولُ: أَمَا عَلِمْتَ أَنَّ عَبْدِي فُلَانًا مَرِضَ، فَلَمْ تَعُدْهُ، أَمَا عَلِمْتَ أَنَّكَ لَوْ عُدْتَهُ لَوَجَدْتَني؟ وَيَقُولُ: يَا ابْنَ آدَمَ اسْتَسْقَيْتُكَ فَلَمْ تَسْقِنِي، فَيَقُولُ: يَا رَبِّ، كَيْفَ أَسْقِيكَ وَأَنْتَ رَبُّ الْعَالَمِينَ؟ فَيَقُولُ: أَمَا عَلِمْتَ أَنَّكَ لَوْ سَقَيْتَهُ لَوَجَدْتَ ذَلِكَ عِنْدِي؟ يَا ابْنَ آدَمَ اسْتَطْعَمْتُكَ فَلَمْ تُطْعِمْنِي، فَيَقُولُ: يَا رَبِّ، وَكَيْفَ أُطْعِمُكَ وَأَنْتَ رَبُّ الْعَالَمِينَ؟ فَيَقُولُ: أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ عَبْدِي فُلَانًا اسْتَطْعَمَكَ فَلَمْ تُطْعِمْهُ؟ أَمَا إِنَّكَ لَوْ أَطْعَمْتَهُ وَجَدْتَ ذَلِكَ عِنْدِي».[٥٦]

ئەی نەوەی ئادەم! نەخۆش کەوتم نەهاتی بۆ لام! وتی: ئەی پەروەردگار! چۆن بێم بۆ لات تۆ پەروەردگاری هەموو جیهانەکانی؟ فەرمووی: ئەی نەتزانی فلانە بەندەم نەخۆش بوو سەردانت نەکرد، ئەی نەتزانی ئەگەر سەردانی ئەوت بکردایە منت لای ئەو ئەبینیەوە!؟ ئەی نەوەی ئادەم! ئاوم پێدایت، تۆ ئاوت پێنەدام، ئەی پەروەردگار! چۆن ئاوت پێ بدەم کە تۆ پەروەردگاری هەموو جیهانەکانی؟ فەرمووی: ئەی نەتزانی فلانە بەندەم داوای ئاوی لێکردی تۆ ئاوت پێ نەدا، ئەی نەتزانی ئەگەر ئاوت بە ئەو بدایە ئەوە ئەوەت لای من ئەبینیەوە!؟ ئەی نەوەی ئادەم! خواردنم پێدایت تۆ خواردنت پێنەدام، وتی: ئەی پەروەردگار! چۆن خواردنت پێبدەم کە تۆ پەروەردگاری هەموو جیهانەکانی؟! ئەی نازانی فلانە بەندەم خواردنی لێداواکردی تۆ پێت نەدا ئەی نەتزانی ئەگەر خواردنت پێ بدایە ئەوە لای من ئەتبینیەوە؟

خوای گەورە بەخشین دەستکردنەوەی بۆ خەڵکی لە بری قەرزدان بەخۆی داناوە، بێگەردی بۆ ئەو خوایەی کە بێمنەتە لەوەی لای بەندەکانیەتی، چونکە ئەو سامانی ئاسمانەکان و زەمین و ئەوەی لەو نێوانەشدایە هی خۆیەتی، پێویستی بە هیچ شتێك نیە، مەبەست لەو دەستەواژەی رابوورد ئەوەیە خەڵکی هانبدات بۆ بەخشین و

٥٦- اخرجه مسلم في صحيحه،كتاب البر وال صلة و الادب،باب فضل عيادة المريض(٦٧٢١).

دەستدرپینەوە لە هەژاران لەبەر خـوا، وەك ئەفـەرموێ: ﴿ إِن تُقْرِضُوا۟ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا يُضَٰعِفْهُ لَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ۚ وَٱللَّهُ شَكُورٌ حَلِيمٌ ﴿١٧﴾ ﴾ (التغابن)، ئەگەر قەرز بدەن بـە خـوا، بەشـێوەکی چاك (مەبەست بەخشینی مـاڵ و سـامانە لـە پێنـاوە خـوادا) ئـەوە خـوا چـەند بەرابـەری دەکات بۆتان، هەروەها لێتان خۆش دەبێت خوایش سوپاسـگوزارە (لەسـەر بەخشـن کـە هەر بەخششی خۆیەتی) و خۆراگرە (مۆڵەتی ڕەزیلەکانیش دەدات تا کاتی خۆی).

بەلاّم جولەکە بەهۆی نەفامی و بێ حەیاییانەوە لە ئاماژە و ماناکانی ئەو ئایەتە حاڵی نەبوون. بەو شێوەیە لە مانا ناسکەکانی ئەو ئایەتە حاڵی نەبوون و گێلانە بۆیان ڕوانیـوە ووتوویانـە: خـوا هـەژارە و ئێمـە دەوڵەمەنـدین، جولەکـە لـەوە تێنەگەیشـتن قـەرزدان بـەخواجل جلالـە سـۆزنواندنی خوایـە لەگـەڵ ئەوانـدا، ئاوەڕدانـەوەی مرۆڤەکانـە بـەلای یەکتریدا، خەڵینە! خوا ئەیەوێ ڕێز لـە هـەوڵ و تێکۆشـانەکانت بگـرێ، ئەگـەر بـووی بـە خاوەنی هەر ماڵ و سامانێك ئەوە بە هی خـۆتی دائـەنێ، خـوا پـێتی نـەوتووە: بیـدە بـە براکـەت! بێگـەردی بـۆ ئـەو خـوا پـەروەردگارە، سـۆز ئـەنوێنێت بـۆ بەنـدەکانی و بـە بەندەکانی ئەفەرموێ: قەرزم پێ بدەن! بۆ ئەوەی گـرەنتی بـدات بـە مرۆڤـەکان ئـەوەی پێی بەخشیوون لە لایەن خواوە بووە، بەلاّم نەوەکانی ئیسرائیل زۆر ڕووقایمن لەبەرانبەر خوادا.[٥٧]

ئەوە سروشتی جولەکەیە، ئەو ماڵ و سامانەی خوا پێیداون لە فەزلی خۆیەوە، وایـان ئەزانی لە بەرانبەر خوادا ئەوانیش دەوڵەمەندن! و پێویستیان بەوە نیە خـوا چـەند قـات ئەو ماڵەیان بداتەوە کە لە پێناوی خوادا ئەیبەخشن، زۆر بێ ئابڕووانە وتیان: ئـەوە خـوا چییەتی داوامان لێئەکات لە ماڵی خۆمـان قـەرزی پـێ بـدەین؟ ئـەویش پاداشـتی چـەند قاتمان بداتێ، کەچی نەهیشی کردووە لە سووخواردن و قازانجی قەرز کردووە؟!

---

٥٧- تفسیر الشعراوي،محمد متولي الشعراوي، سەرچاوەی پێشووتر،ج٣،ص١٩١٠.

ئەمە گەمەیەکی تری جولەکەیە بە دەستەواژەکان، لە بێحەیایی و چاوقاییمیەوە سەرچاوەی گرتووە، بۆیە لەسەر ئەو کارە سزایان ئەدات، خوا ئەوەی لە یاد ناچێت و وازیان لێناهێنێت، وەك ئەفەرموێ: ﴿لَّقَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَاءُ سَنَكْتُبُ مَا قَالُوا وَقَتْلَهُمُ الْأَنبِيَاءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَنَقُولُ ذُوقُوا عَذَابَ الْحَرِيقِ ﴿١٨١﴾ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيكُمْ وَأَنَّ اللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿١٨٢﴾﴾ (ال عمران)[58] ، سوێند بێت بێگومان خوای پەروەردگار گوفتاری (نابەجێی) ئەو (جولەکانەی) بیست کە وتیان: خوا هەژارە و ئێمە دەوڵەمەندین! ! ئێمە ئەو گوفتارانە یاداشت و تۆمار دەکەین لەسەریان، هەروەها کوشتنی پێغەمبەران بە دەستی ئەوان بە ناحەق، (لە دۆزەخیشدا) پێیان دەڵێین: بچێژن سزای ئاگری سوتێنەر...ئەو سزایە لە دەرەنجامی دەست پێشخەری خۆتاندایە، چونکە بەڕاستی خوا هیچ جۆرە ستەمێك لە بەندەکان ناکات.

**سێیەم: خوا – جل جلاله - خاوەن فەزڵە و نەفرەتی خواش بە شوێن جولەکەوەیە.**

لەو گوناه و تاوانانەی کە قورئان دەیگێڕێتەوە لەسەر جولەکە ئەو نمونە ناشیرینەیە کە لە قسەکانی خۆیانەوە وەرگیراوە: ﴿قَالُوا يَا مُوسَىٰ إِنَّا لَن نَّدْخُلَهَا أَبَدًا مَّا دَامُوا فِيهَا فَاذْهَبْ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَاتِلَا إِنَّا هَاهُنَا قَاعِدُونَ ﴿٢٤﴾﴾ (المائدة)

کەچی وتیان: ئەی موسا دڵنیابە ئێمە هەرگیز ناچینە ئەو شارەوە و ڕووی تێناکەین مادەم ئەو جەنگاوەرانەی تێدا بێت، (ئیتر تۆ کەیفی خۆتە حەز دەکەیت) بچۆ خۆت و پەروەردگارت جەنگ بکەن دژیان، ئێمە بەڕاستی ئا لێرەدا دانیشتووین (چاوەڕێی سەرئەنجامین) !!

---

٥٨-في ظلال القران،سيد قطب، سەرچاوەی پێشتر،ج١،ص٥٣٦.

ئـەم قسـەیەش یـان ئەوەیـە سـوکایەتی و گاڵتـەکردنی تێدایـە بـە موسـڵمانان، وەك ئەگێڕنـەوە: ئـەوان لـە کاتێکـدا ئەمـەیان ووتـووە کـە موسـڵمانەکان سـەرەتای کۆچکردنیان بووە بۆ مەدینە، و لە ژیـانێکی سـەختتدا بوونـە، پێغەمبـەریش صـەدەقەی لەسەر فەرز کردبوون، لەوانەشە پەنای بـۆ جولکـە بردبێـت بـۆ وەرگـرتنی خوێن(دیـات)، ئەوەش هەڵئەگرێ کە لە کاتی دابـەزینی ئـەم ئایەتـەدا بووبێـت کـە ئەفـەرموێ: ﴿مَّن ذَا ٱلَّذِى يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥٓ أَضْعَافًا كَثِيرَةً ۚ وَٱللَّهُ يَقْبِضُ وَيَبْصُۜطُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢٤٥﴾﴾ (البقرة)، کێیە ئـەو کەسـە قـەرز دەدات بـەخوای پـەروەردگار بـە قـەرزێکی چـاك (بەخشراوەکە لە ماڵی حەڵاڵ و بێ منەت و نازدار بێت)، خوایش بەو هۆیەوە بـۆی چـەند بەرامبەر دەکات و پاداشتی بێ سنووری پێ دەبەخشێت. ئەو کاتە وتیان: پـەروەردگاری موحەممەد هەژارە و دەست نوقاوە، یان ئەوەیە کـە لـەکاتی تـووڕەیی و نائومێدیـدا ئـەو قسـەیان کردبێـت، ئەگێڕنـەوە کـە جولەکـە تووشـی نارەحـەتی و برسـێتیەك ی قـورس بوونەتەوە، فەنحاصی کوڕی عازورایش ئەم قسـەیەی کـردووە و جولەکـەکانیش کوێرانـە ئەم قسەیان دووبارە کردووەتەوە. و خوای گەورەش لەسەر ئـەم خەملاندنانـەیان زەمـی کردوون، یەکەمیان سوکایەتیکردنە بە ئیسلام و ئایینەکـەی خۆشـیان، چـونکە پێویسـتە پـەروەردگار بـەرز و پـیرۆز و دوور رابگیرێـت لـەو قسـانە، تەنانـەت ئەگـەر بـە نیـازی دژایەتیکردنی بەرانبـەریش بێـت، دووەم ئـەوەی لێئەخوێنرێتـەوە کـە ئەمـە سـکاڵاکردنە لەدەست خوا! خوای گـەورەش ئـەم قسـەیەی رەتکردووەتـەوە بـەوەی نـزای لێکـردوون، وەك ئەفەرموێ:( غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُوا بِمَا قَالُوا)، دەسـتیان پێوەنـد بێـت و نـەفرەت لـە خۆیان و قسەیان، ئەوەش کە ئەڵێن:( يَدُ اللَّهِ مَغْلُولَةٌ)، دەسـتی خـوا نوقـاوە و پێوەنـدی پێوەیە! ئەوە بەڵگەیە لەسەر بۆچوونی خراپی جولەکە بەرانبەر بـە خـوای پـەروەردگار، وەك پاساوهێنانەوەیەك بۆ دەست نوقاوی خۆیان، بـە قسـەی ئـەوان خـوا مـاڵ و سـامان

نابەخشێ، ئەگەر بشبەخشێ ئەوە کەمێکیان ئەداتێ، ئیتر خەڵك چۆن بتوانێ قەرزی پـێ بدات؟!

ملهوڕی و دڵ ڕەقییان گەیشتبوویە ئاستێك تەنانەت ئەو مانا ناشیرین و درۆینەش بـۆ درۆ بەکارنـەهێنن بـە شـێوازێکی راسـتەوخۆ، بـەڵکو دەسـتەولژەیەکی زۆر لـەو سـوکتر پیستریان هەڵبژاردووە کە وتیان(يَدُ اللَّهِ مَغْلُولَـةٌ)، خـوای گـەورەش بـە جۆرێـك وەڵامیـان ئەداتەوە کە هەمان سیفەت بەسەر خۆیاندا بچەسپێت و نەفرەت و دوورخستنەوەشیان لە سۆزی خوا ببێتە سزای پڕ پێستیان:( غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُوا بِمَا قَـالُوا))، بـەو جـۆرە ئێـستا ئەوان رەزیلترین و دەستنوقاوترین خولقاوەکانی خوان، دوای ئەمە خوای گەورە بۆچوونە ناباو و ناشیرینەکەیان راست ئەکاتەوە و وەسفی بەخشندەیی خۆی ئەکات بۆ بەندەکانی و ئەفـەرموێ:( بَـلْ يَـدَاهُ مَبْسُـوطَتَانِ يُنْفِـقُ كَيْـفَ يَشَـاءُ) خـەڵات و بەخشـینەکانی خـوا نابڕێتەوەو کۆتاییان نایەت، ئەو خەڵاتانەی لەبەرچاوی خەڵکیدان و لەکەس شاراوە نـین، کەسیش لێیان بێ بەش نیە، بەڵام جولەکە چاویان بەرایی نەئەهات ئەو فەزڵ و خەڵاتانە ببیـنن، چـونکە بـەردەوام سـەرقاڵی سـتەم و زۆرداری ئینکـاریکردن بـوون، سـەرەڕای سپڵەیی و بێ ئابڕوییان لە بەرانبەر خوادا.

پاشان خوای گەورە بۆ پێغەمبەرەکەی ئەگێڕێتەوە و باسی باسی ئەو گەلە ئەکات کە چۆن و چییان بەسەردێ بەهۆی رق و کینەو تووڕەییان لـە بەرانبـەر هەڵبـژاردنی ئـەو بـۆ پێغەمبەرایەتی، هەروەها بەهۆی رووهەڵماڵین و ئاشکراکردنی رەفتارەکانیان لە رابردوو و داهاتوودا، لە رێگەی ئەو پەیامـەوە، خـوای گـەورە ئەفـەرموێ: ﴿ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ يَدُ ٱللَّهِ مَغْلُولَةٌ غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُوا۟ بِمَا قَالُوا۟ بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ يُنفِقُ كَيْفَ يَشَآءُ وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم مَّآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ طُغْيَـٰنًا وَكُفْرًا وَأَلْقَيْنَا بَيْنَهُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ كُلَّمَآ أَوْقَدُوا۟ نَارًا لِّلْحَرْبِ أَطْفَأَهَا ٱللَّهُ وَيَسْعَوْنَ فِى ٱلْأَرْضِ فَسَادًا وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٦٤﴾ ﴾ (المائدة)، ئەو جولەکە (نـەفام و خوانەناسـانە)

دەیانوت: خوا دەستی دەستی بەستراوە و خێری لەدەست نابێتەوە ! ! دەك دەستیان بەستراو و بێ خێرو کەلەپچە و تووشی شەلەل بێت، دەك نەفرینیان لێ بێت، بۆ خۆیان و قسەیان، نەخێر، وانیە بەڵکو دوو دەستەی (پڕ لە بەرەکەتی پەروەردگار) هەمیشە و بەردەوام کراوەیە، چۆنی بوێت و چەندی بوێت دەیبەخشێت! سوێند بێت زۆربەیان ئەوەی نێردراوەتە خوارەوە بۆت کە قورئانە لەلایەن پەروەردگارتەوە یاخی بوون و ستەمیان زیاد دەکات و نغرۆیان دەکات لە کوفردا، ئێمەش هەتا ڕۆژی قیامەت دوژمنایەتی و ڕق و کینەمان لەنێوانیاندا بەرپاکردووە، هەر کاتێك دەیانەوێت جەنگ بەرپا بکەن و ئاگری شەڕ هەڵبگیرسێنن خوا دەیکوژێنێتەوە و نایەڵێت تەشەنە بکات، ئەوانە زۆر بەپەلە و بەگەرمی هەوڵی بڵاو بوونەوەی فەسادو تاوان دەدەن لە زەویدا، خوایش ئەو کەسانەی خۆش ناوێت کە تۆوی خراپە دەچێنن.

جولەکە بەهۆی ڕق و کینە و ئابڕووچوونیان زۆربەیان کوفر و سەرپێچیکردنیان زیاتر ئەبێت چونکە ئەوان ئیمانیان قەبوڵ نەکردووە، کەواتە دەبێت لە بەرانبەردا زیاتر دووچاری ڕۆچوون ببنەوە، هەروەها نکولیکردن و خۆهەڵکێشانیان لە زیادبووندایە، بۆیە پێغەمبەرﷺ ڕەحمەتە بۆ ئیمانداران و بەڵاو موسیبەتە بۆ بێباوەڕان.

پاشان خوای گەورە پێغەمبەرەکەیﷺ ئاگادار ئەکاتەوە لەوەی بۆی بڕیارداون لە دوژمنکاری و ڕق و کینە لە نێوان خۆیاندا، ئاگاداری ئەوەشی ئەکات کە پیلانەکانیان پووچەڵ ئەکاتەوە کە ئەمە سەختترین گڕو کڵپەی دەبێت بۆ سەریان.هەروەها گەڕانەوەیان بۆ ڕابووردوویان لە گەمارۆ و پەلاماردان لە ڕێگەی شەڕ و جەنگەوە لە دژی موسڵمانەکان، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿ ... وَأَلْقَيْنَا بَيْنَهُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ ۚ كُلَّمَا أَوْقَدُوا نَارًا لِّلْحَرْبِ أَطْفَأَهَا اللَّهُ ۚ وَيَسْعَوْنَ فِي الْأَرْضِ فَسَادًا ۚ وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُفْسِدِينَ ﴿٦٤﴾ ﴾ (المائـدة)، ئێمەش هەتا ڕۆژی قیامەت دوژمنایەتی و ڕق و کینەمان لەنێوانیاندا بەرپاکردووە، هەر

کاتێك دەیانەوێت جەنگ بەرپا بکەن و ئاگری شەڕ هەڵبگیرسێنن خوا دەیکوژێنێتەوە و نایەڵێت تەشەنە بکات، ئەوانە زۆر بەپەلە و بەگەرمی هەوڵی بڵاو بوونەوەی فەسادو تاوان دەدەن لە زەویدا، خوایش ئەو کەسانەی خۆش ناوێت کە تۆوی خراپە دەچێنن.

ئێستاشی لەگەڵدا بێت تیرەو تایفەکانی جولەکە لە نێوان خۆیاندا دوژمنی یەکترن، لەگەڵ ئەوەی کە ئاشکرا بووە جولەکەی جیهانی پشتیوانی یەکتری ئەکەن بۆ هەڵگیرساندنی شەڕ لە نێو وڵاتە ئیسلامیەکاندا، ئێمە نابێ تەماشای کاتێکی دیاریکراو بکەین یاخود سیما و رووخسارێکی داپۆشراو دوور لە راستی بکەین، زیاتر لە هەزار و چوار صەد ساڵ، بەڵکو پێش هاتنی ئیسلام جولەکە لە دوژمنکاری و بەرەلایی و سەرشۆڕیدا نغرۆ بوون، داهاتووشیان هەر بەو شێوەیە ئەبێت، لەگەڵ ئەوەی پاڵپشتیان زۆرە بەلام کلیلی سەرکەوتن لە هەموو ئەو هەڵوێستانەدا لە دەست گروپێکی ئیمانداردایە کە پەیمانی خوای بۆ دێتە دی، ئەو گرووپە ئیماندارە لەم رۆژگارەدا پەیمانی خوای پێ جێبەجی ئەبێت پارێزگاری لە بەڵێنی خوا ئەکات، خوای گەورەش سەرزەوی و هە شتێك کە ئەیەوێت لەسەر دەستی ئەوانە رزگار ئەکات، ﴿ ... كُلَّمَآ أَوۡقَدُواْ نَارٗا لِّلۡحَرۡبِ أَطۡفَأَهَا ... ﴿٦٤﴾ ﴾ (المائدة)، ئەم تاوان و خراپەکاریەی جولەکە وێنای دەکەن هەر دەبێ خوا یەکێك بنێرێت بۆ وەستاندنی و لەناوبردنی، خودا خراپەکاری ناوێ لەسەر زەویدا، ئەوەشی خوای گەورە خۆشی ناوێت هەر ئەبێ کەسێکی بۆ بنێرێت تا لەناوی ببات،﴿ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿٦٤﴾ ﴾ (المائدة).[59]

---

٥٩–في ظلال القران، سيد قطب، سەرچاوەی پێشتر، ج٣، ص٩٣٠.

**بە کورتی:**

- حاڵینەبوونی جولەکە لە مەبەستی قەرزدان بەخوا، قەرزدان بەخوا مانای ئەوە نیە خوا پێویستی پێیەتی، بەڵکو مەبەست لێی ئەوەیە بدرێت بە هەژاران و کەمدەرامەتەکان و بەخشینەوەی ماڵە لەبەر خوا، چەندین بەڵگەی ئایەت و فەرموودە ئاماژە بەم کارە دەکەن.
- مەبەستی جولەکەکان بۆ ئەو بانگەشەیە گومان دروستکردنە للای ئەو کەسانەی ئیمانیان لاوازە، هەروەها بۆ بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەری خواﷺ ئەوەیان ئەکرد و مەبەستیان بوو بدەن لە موسڵمانەکان لە رێگەی وەھ بیرۆکەیەکەوە.
- بێ ئەدەبی جولەکە لە بەرانبەر خودادا و وەسفکردنی بە شێوازێك کە شیاو نیە بۆ زاتی خوا، وای کرد کە بەرنەفرەتی خوا بکەون و سزا شایشتە ببێت بۆیان.



## گومانی سیازده

## بوختانکردن بەوەی خوا فەرمان بە خراپە ئەکات *[60]

**ناوەرۆکی گومانەکە:**

جگە لە قورەیشیەکان عەرەبەکانی تر تەوافیان بەو جلانەوە نەئەکرد کە پێشتر لەبەریان کردبوو، بەبەهانەی ئەوەی جلێك لەبەرناکەن کە گوناهیان پێوە کردبێت، ئافرەتەکانیشیان بەرووتی تەوافیان ئەکرد، تەنیا عەورەتیان بە شتێك دادەپۆشی، بەزۆریش بە شەودا تەوافیان ئەکرد، بەلگەشیان بەوە دەهێنایەوە کە باوباپیرانیان بەو شێوازە تەوافیان کردووە، رەفتاری باوباپیرانیشیان لە فەرمانی خوداوە سەرچاوەی گرتووە، خوای گەورەش دەفەرمویّ: ﴿ وَإِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً قَالُواْ وَجَدْنَا عَلَيْهَآ ءَابَآءَنَا وَٱللَّهُ أَمَرَنَا بِهَاۗ قُلْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَأْمُرُ بِٱلْفَحْشَآءِۖ أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾ (الاعراف)، کاتێکیش (بێ باوەڕان) تاوان و گوناهێك ئەنجام بدەن دەڵێن: باوو باپیرانیشمان دیوە ئەم کارەیان کردوەو خوای گەورە خۆی فەرمانی پێداوین بیکەین! ! پێیان بڵێ: (نەخێر وانییە) چونکە بەڕاستی خوا فەرمان بەگوناهو تاوان و کاری نابەجێ نادات، چۆن (جەسارەت دەکەن) و شتێك هەڵدەبەستن بۆ خوا کە نازانن وتویەتی یان نا.

ڕێگاکانی پووچەڵکردنەوەی ئەم گومانە:

١. لاساییکردنەوەی باوباپیران ڕێگایەکی هەڵەیە.

٢. خواجل جلالە فەرمان بە خراپە و کاری ناڕەوا ناکات.

٣. نە لەڕێگەی عەقڵ و نە لە ڕێگەی نەقڵەوە ئەوە نەسەلماوە کە خوا فەرمان بە خراپە بکات، یاخود فەرمانی پێکردبن بە رووتی تەواف بکەن.

---

٦٠- ئەو ئایەتەی کە باس لەم گومانە ئەکات بریتیە لە:(الاعراف/٢٨، ئەو ئایەتانەش وەڵامی ئەم گومانە ئەدەنەوە بریتین لە: (الاعراف/٢٩،٢٨،الانعام/١٠١، النحل/٩٠).

٤. خواجل جلاله تەنیا فەرمان بە چاکەیەکی راست و دروست ئەکات، ئەوەی فـەرمان بە خراپە و تاوان بکات تەنیا شەیانە و هیچی تر.

٥. بێگومان خوا (جل جلاله) خراپەکاری قەدەغە کردووە، ئەو خراپانـەی بـە ئاشـکرا ئەنجام ئەدرێن و ئەوانەشی بە نهێنی ئـەنجام ئـەدرێن، هـەروەها تـاوان و جـەور و سـتـەم وشیرکیشی قەدرەغە کردووە.

**درێژەی بابەتەکە:**

**یەکەم: لاساییکردنەوەی باوباپیران ڕێگایەکی هەڵەیە.**

فاحیشه ناوێکه بۆ کردەوەیەکی زەمکراو، له (فوحش)ەوه وەرگـیراوە، زۆر ڕۆچـوونه لـەو کـردەوه زەمکـراوەدا، خراپــه لــه کــردەوه ناشــیرینەکاندا بەشـێوەیەکی ئاســایی زاڵتره،هـەر ئەمـەش وادەکـات کـه سروشـته پاکـەکان لێـی بـەدوور بـن، یـاخوود زەرەرو زیانێکی لێ بەرهەم دێت که کەسه ژیرەکان ئەو کـاره ڕەتئەکەنـەوه، ئەنجامـدەرانی ئـەو کارانه شەرم له دەورو بەر ئەکەن، بۆ نمونه: زینـا، دزی، داوێنپیسـی، زیندەبەچـاڵکردن، که به نهێنی ئەنجام ئەدرێن، ئـەو ڕێسـاو یاسـایانەی پـەروەردگار بـۆ بەنـدەکانی دانـاوه ڕێگری له ئەنجامدانی ئـەو کارانـه دەکـات، کارەکـەش بـه خراپـه وەسـف ئـەکات، پـێش دابەزینی ڕێساو یاساکان هاوشێوەی ئەو کارانه لەسەردەمی نەفامیدا ئەنجام دەدرا وەك: کڕنۆشبردن بۆ پەیکەر و دارو بەرد، تکاکردن لێیان لەگەڵ ئەوەی که بێ گیـانیش بـوون، خۆرووتکردنەوه له کاتی حەجدا، و ناونەهێنانی خوا لەکاتی سـەربڕینی قوربانیەکانـدا و بەناهەقبردنی ماڵی هەتیوو و بێ دەسەڵاتەکان و بێ بەشکردنی کەس و کار لـه میراتـی و دەرەچێکردن بـۆ بـەخت لـەکاتی ئەنجامـدانی یـان ئەنجامنـەدانی کارێکدا، کوشـتنەوەی کەسێکی بێ تاوان تەنیا لەبەر ئەوەی له تیرەی کابرای بکوژه، هـەروەها قەدەغـەکردنی

ئەو شتانەی کە خودا بۆی حەلاڵ کردوون، لەبەرانبەریشدا حەلاڵکردنی ئەو شتانەی کە خوا لێی حەرام کردوون، وەك خواردنی خوێن [٦١] و مردارەوەبوو [٦٢].

لە ئیبن عەبباسەو ئەگێڕنەوە کەئەم خراپەی لێرەدا باسکراوە مەبەست پێی تەوافکردنە بەدەوری ماڵی خوادا بە رووتی. دەشڵێن: بەو جۆرە دایکمان هێناوینێتە دونیاوە ئەوان تەوافیان ئەکرد! یانی بەرووت و قووتی، ئەوەش بەوە لێکئەدەنەوە کە بە جلێکەوە تەواف ناکەن کە تاوانیان پێوە کردبێت، ئەم کارەش داهێنانی خۆیان بوو، بەلاّم ئەگەر پرسیاریان لێبکرایە دەربارەی ئەو کارە لە وەلاّمدا ئەیانووت: شوێن باوباپیرانمان کەوتووین! بڕواشیان وا بوو کە باوباپیرانیشیان شوێن فەرمان و شەرعی خوا کەوتوون لەو کارەیاندا.

قسەکەی ئیبن عەبباس ئەوە ئەگەیەنێت کە خۆڕووتکردنەوە لە حەجدا ئەوە فاحشەکەیە و هەر ئەو مانایەشی هەبوو لە سەرەتادا، بەلاّم ڕێبەرانی شیرك پاسازیان بۆ ئەو کارە هێناوەتەوە و ئەو پاساوەشیان خستووەتە سەر زاری شوێنکەوتەکانیان، پاشان هەموو ئەو کارانەیان داوەتە پاڵ باوباپیرانیان کە بە پێشەنگیان زانیون بۆ نەوەکانی پاش خۆیان.

چونکە باوەڕیان وابوو کە باوباپیرانیان شارەزاترن بە ناوەڕۆك و بەرژەوەندی ئەو کار و کردەوانە.

پاشان ئەو کارانەیان با ئەدایەوە بەلای خوای پەروەردگاردا، گوایە ئەو فەرمانی پێکردوون، یانی باوباپیرانیان ئەو کارانەیان لە خۆڕا نەکردووە بەڵکو بە فەرمانی خوای (عز و جل) پێی هەستاون [٦٣]

---

٦١- خوێن(الدم): مژینی خوێنی دەمارەکانە، ئەمەش لەبەر ئەوەی پیسە حەرام کراوە

٦٢- مردارەوەبوو( المیتە) مردنی ئاژەڵێك بە ڕێگەیەکی ناشەرعی، ئەمەش دیسان حەرام کراوە

٦٣- التحریر و التنویر، الطاهر بن عاشور، سەرچاوەی پێشتر،مج٥،ج٨،ص٨٣، بە دەستکارییەوە

قورئـانی پـیرۆ لـه چـهند جێگایهکـدا ولآمـی لاسـاییکرنهوهی باوبـاپیرانی داوهتـه و بهکارێکی ههڵهی له قهڵهم داوه، بـۆ نمونـه ئهفـهرموێ: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّبِعُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُواْ بَلْ نَتَّبِعُ مَآ أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَآۗ أَوَلَوْ كَانَ ءَابَآؤُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَهْتَدُونَ ﴿١٧٠﴾ ﴾ (البقـرة)، ئهگهر بهو خهڵکه نادانه بوترێت: شوێنی ئهو بهرنامهیه بکهون که لهلایهن خـواوه ڕهوانـه کراوه، دهڵێن: نهخێر، ههر شوێنی ئهوه دهکـهوین کـه بـاوو باپیرانمـان پێـوهی ئـالوودە بوون و لهسهری ڕاهاتوون، ئایا ئهگـهر بـاوو باپیرانیشـیان تـێ نهگهیشـتوو هـیچ نـهزان و ناشارهزاو ڕێنموییش وهرنـهگرن ( ههر شوێنیان دهکهون؟! ).

هــــــهروهها ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْاْ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ قَالُواْ حَسْبُنَا مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَآۚ أَوَلَوْ كَانَ ءَابَآؤُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَهْتَدُونَ ﴿١٠٤﴾ ﴾ (المائدة).

هـهر کاتێـك پێیـان بوترێـت: وهرن بـۆ لای ئـهوهی خـوا دایبهزانـدووه و وهن بـۆ لای پێغهمبهریش (بۆ ئهوهی داوهری بکات له نێوانتاندا) ئهوه دهڵێن: ههر ئهو بهرنامهیـهمان بهسه که باوو باپیرانمان لهسهری بوون و له مامۆستاو ڕابهرانمانهوه فێری بوین و بۆمـان ماوهتهوه، ئایا ئهگهر کاتێکیش باوان و مامۆسـتایانیان هـیچ شـتێك لـه حـهرام و حـهڵاڵ نهزانن و ڕێنموویش وهرنهگرن، ئهوه ههرشوێنیان دهکهون؟!

ڕێچکهی لاساییکردنهوه ڕێچکهیهکی خراپـه، بهڵگهکهشـیان بهڵگهیـهکی بـێ بنهمایـه، قورئان سهرجهم ئهو کارانه ڕهتئهکاتهوه که به ههمان شـێواز بهڵگـهی بـۆ هێنرابێتـهوه، واته ههموو بهڵگهیهك که پشت به شوێنکهوتن و لاساییکردنهوهی باوباپیران ببهستێ لـهو کارانهدا که خراپهو تاوانهکهی ئاشکرا بێت.[٦٤]

---

٦٤- ههمان سهرچاوهس پێشوو،ص٨٤.

**دووەم: خوا – جل جلاله - فەرمان بە خراپە ناکات.**

یەکێکی تر لە وەڵامەکانی قورئان بۆیان فەرمانی خوایە بۆ پێغەمبەرەکەی بۆ پووچەڵکردنەوەی گومانەکانیان کە ئەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا فَعَلُوا۟ فَٰحِشَةً قَالُوا۟ وَجَدْنَا عَلَيْهَآ ءَابَآءَنَا وَٱللَّهُ أَمَرَنَا بِهَا ۗ قُلْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَأْمُرُ بِٱلْفَحْشَآءِ ۖ أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾ (الاعراف)، کاتێکیش (بێ باوەڕان) تاوان و گوناهێك ئەنجام بدەن دەڵێن: باوو باپیرانیشمان دیوە ئەم کارەیان کردووەو خوای گەورە خۆی فەرمانی پێداوین بیکەین! ! پێیان بڵێ: (نەخێر وانییە) چونکە بەڕاستی خوا فەرمان بەگوناهو تاوان و کاری نابەجێ نادات، چۆن (جەسارەت دەکەن) و شتێك هەڵدەبەستن بۆ خوا کە نازانن وتویەتی یان نا.

ئەوەی کە ئێوە ئەیکەن خراپەیەکی نەویستراوە و خوا فەرمان بەو جۆرە کارانە ناکات، قسانێك ئەدەنە پاڵ خوای گەورە کە خۆشیان راستی و ناڕاستی ئەو قسانە نازانن. بەمەش بیانوویەکەیانی هەڵوەشاندەوەو هەموو ئەو بەڵگانەشی رەتکردەوە کە پێشتر پشتیان پێ بەسترابوو.( اللَّـهُ أَمَرَنَـا بِهَـا) (الاعراف:٢٨) کاتێکیش (بێ باوەڕان) تاوان و گوناهێك ئەنجام بدەن دەڵێن: باوو باپیرانیشمان دیوە ئەم کارەیان کردووەو خوای گەورە خۆی فەرمانی پێداوین بیکەین! ! ئەمە قسەهەڵبەستنێکی پووچە، چونکە ئەوان فەرمانی خودایان لە رێگەی پێغەمبەرێکەوە پێگەیشتووە، ئەوان لە بنەڕەتدا پێغەمبەرایەتیان رەتئەکردەوە، ویتر لە کوێوە فەرمانی خوایان وەرگرتووە، ئەو ئایەتەکە کە ئەفەرموێ: ﴿.. قُلْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَأْمُرُ بِٱلْفَحْشَآءِ ۖ أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾ (الاعراف)، پێیان بڵێ: (نەخێر وانییە) چونکە بەڕاستی خوا فەرمان بەگوناهو تاوان و کاری نابەجێ نادات، ئەم ئایەتە ئەو بانگەشەیە پووچ ئەکاتەوە. ئەم وەڵامە وەك تەمێکردنێك وایە بۆیان سەرەڕای بەئاگاهێنانەوەیان، چونکە خوا خاوەنی سیفەتی کەماڵە و فەرمان بە خراپەیەك ناکات کە خاوەن ژیریەکان قەبوڵی نەکەن و رەتی

بکەنەوە،خراپی کارەکە بەسە بۆ ئەوەی بەڵگە بێت لەسەر ئەوەی کەخوا فەرمانی پێ ئەکرد، چونکە خوا خاوەنی کەماڵی تەواوە.[٦٥]

**سێیەم: عەقڵ و نەقڵ رەتی ئەکەنەوە کە خراپە لە لایەن خواوە بێت.**

ئەو ئایەتەی کە ئەفەرموێ: ﴿ .. قُلْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَأْمُرُ بِٱلْفَحْشَآءِ ..﴿٢٨﴾ ﴾ ، خوا فەرمان بە خراپە ناکات، بەدرۆخستنەوەیانە لە رووی عەقڵ و نەقڵەوە، لە رووی عەقڵەوە کەسە ژیرەکان جیاوازی نیە لە نێوانیاندا کە ئەو کارە لە کارە خراپەکانە، واتە: خراپترینی خراپەکان، خواش جل جلالە بە کەماڵی موتڵەقی خۆی پاك و بێگەردە لەوەی فەرمان بەخراپە بکات، بەڵکو ئەوەی فەرمان بەو خراپانە ئەکات ئەوە شەیتانە، کە سەرچاوەی خراپەکاریە، هەروەك خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿ ٱلشَّيْطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِٱلْفَحْشَآءِ ۖ وَٱللَّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلًا ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٦٨﴾ ﴾ (البقرة)، (کاتێ ئێوە لە ماڵ و دارایتان دەبەخشن) شەیتان بەڵێنی هەژاری و نەداریتان پێ دەدات (دەتانترسێنێت بە هەژاری) و فەرمانتان پێ دەدات بەگوناهو تاوان و خراپە و نەبەخشین، خوای گەورەش بەڵێنی لێخۆشبوونێکی تایبەتی خۆیتان پێدەدات لەگەڵ زۆری رۆزی و بەهرەی فراوانداو خوا فراوانگیرو زانایە.) (البقرە:٢٦٨) ﴿ إِنَّمَا يَأْمُرُكُم بِٱلسُّوٓءِ وَٱلْفَحْشَآءِ وَأَن تَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿١٦٩﴾ ﴾ (البقرة)، بێگومان ئەو شەیتانە هەر فەرمان بە خراپەو گوناهو تاوان دەکات و هەروەها هانتان دەدات بۆ وتنی هەندێك شت یان هەڵبەستنی هەندێك گوفتار بەدەم خواوە بێ ئەوەی بزانن (کە سەرئەنجامی ئەو کارەتان چەندە مەترسیدارە).

---

٦٥– هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص٨٤.

له رووی نەقڵیشەوە ئەوەی که دەدرێتە پاڵ خوا له ئەمر و له نەهی تەنیا به قسە هەڵبەستن نابێ، بەڵکو دەبێت له ڕێگەی سروشەوە گەیەنرابێت به پەیامبەرێك که پەیامەکەی سەلمابێت لەلایەن پەروەردگارەوە به ئایەت و بەڵگەی روون و ئاشکرا.

ئەو پرسیارەی له ئایەتەکەدایە که ئەفەرموێ: ﴿أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٢٨﴾﴾ (الاعراف)،ئێوە شتێك ئەڵێن بە ناوی خواوە که زانیاریتان نیە دەربارەی..بۆ رەتکردنەوەیەکی گاڵتەئامێزە، وەلامێکیشە بۆ لاساکەرەوەکان، چونکه ئەوان به شوێنکەوتنی باوباپیران و زاناو شارەزاکانیان له کاروباری ئاییندا که پشتی به وەحی نەبەستووە شتانێك ئەڵێن لەسەر خوا که شەرعی ئەودا نیە و جێگای نابێتەوە.

**چوارەم:خودا فەرمان ناکات به چاکە نەبێ، ئەوە شەیتانە فەرمان به تاوان و خراپە ئەکات.**

پاش ئەوەی که خوای گەورە رەتیکردەوە که له ڕێگەی نەقڵەوە هیچ پاڵپشتێکیان دەست کەوتبێ.

سەرنجی مرۆڤەکان دادەکێشێ بۆ زانینی ئەو کارانەی که خوا فەرمانیان پێ دەکات، له کردەوەی چاکە و رەوشتی بەرز و رەفتاری جوانی، بەشێوازی دووبارەکردنەوە روونی کردووەتەوە که دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ أَمَرَ رَبِّي بِٱلۡقِسۡطِۖ وَأَقِيمُواْ وُجُوهَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ وَٱدۡعُوهُ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَۚ كَمَا بَدَأَكُمۡ تَعُودُونَ ﴿٢٩﴾﴾ (الاعراف)، ئەی محمد! بڵێ: پەروەردگارم فەرمانی به دادپەروەری داوە، لەکاتی هەر پەرستن و نوێژێکدا، له هەموو مزگەوتێکدا، ڕووی دڵ و ڕوخسارتان بەڕاستی له پەروەردگارتان بکەن و بیپەرستن و لێی بپاڕێنەوە، لەکاتێکدا دینداری بێگەردو دڵسۆزانە هەر بۆ ئەو زاتەیە، چونکه هەر چۆن دروستی کردوون له سەرەتاوە، له ئایندەشدا هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە.

ئەمە مانای دادپەروەری و میانڕەوی تێدایە له سەرجەم کارەکاندا، واتە پلەی باشترین له کردەوەدا، خوا فەرمان به بەها باڵاکان و بەو کارانە ئەکات که عەقڵێکی

تەندروست قەبوڵی بکات ، کە ئەویش چاکسازی ریشەیی و راست و رەوا نیە لە رەفتاردا.

لە (ئیبن عەبباس)ەوە گێڕاوەتەوە: دادپەروەری(قسط) وتنی "لا الە الا الله"یە، مەبەست لەوەدایە یەکتاپەرستی گەورەترین دادپەروەرییە، ئەمە پوچەڵکردنەوەی سەرجەم ئەو کارە خراپانەیە کە دەیانگووت خودا فەرمانی پێکردووین و هیچ یەکێك لەو کارە خراپانە دادپەروەری نیە.[٦٦]

ئەوەی خودا فەرمانی پێکردوون بە تەواوەتی پێچەوانەیە لەگەڵ ئەوانەی شوێنی کەوتوون لە رێگەی باوباپیران و یاسا دەستکردەکانی خۆیان و هاوشێوەکانی خۆیان، خوا جلوبەرگێکی بۆ دابەزاندوون کە عەوراتیان بشارێتەوە و پەریش کە خۆیانی پێ برازێننەوە، پێچەوانەی ئەو شیرکەیە کە پەیرەوی دەکەن، ئەوەتا خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿ قُلْ أَمَرَ رَبِّي بِٱلْقِسْطِ ۖ وَأَقِيمُوا۟ وُجُوهَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ وَٱدْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ۚ كَمَا بَدَأَكُمْ تَعُودُونَ ﴿٢٩﴾ ﴾ (الاعراف)، ئەی محمد ! بڵێ: پەروەردگارم فەرمانی بە دادپەروەری داوە، لەکاتی هەرپەرستن و نوێژێکدا، لە هەموو مزگەوتێکدا، رووی دڵ و روخسارتان بەراستی لە پەروەردگارتان بکەن و بیپەرستن و لێی بپارێنەوە، لەکاتێکدا دینداری بێگەردو دڵسۆزانە هەر بۆ ئەو زاتەیە، چونکە هەر چۆن دروستی کردوون لە سەرەتاوە، لە ئایندەشدا هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە.

واتە: روویکەنە خودا و بیپەرستن لە هەموو مزگەوتێکدا و بە نیێتی پاکەوە تەنیا لەو بپارێنەوە، پاڕانەوەکانتان پاك رابگرن لە هەر خەوش و خاڵێك کە ئاماژە بێت بۆ شیرکی گەورە و بچوك.

٦٦- في ظلال القران، سيد قطب، سەرچاوەی پێشتر،ج٣،ص١٢٨١

پاشان قورئان روونیدەکاتەوە کە هەمووان دەگەڕێنەوە بۆ لای خـودا، کۆمـەڵێك هـەن کـە خـوای گـەورە هیدایـەتی داون بـەوەی سـەرجەم فـەرمانبووردەییان بـۆ خوایـە، کۆمەڵێکیش هەن کە گومڕا بوون و فەرمانبووردەییان بۆ شەیتانە. وەك ئەفەرموێ:

﴿ قُلْ أَمَرَ رَبِّي بِالْقِسْطِ وَأَقِيمُوا وُجُوهَكُمْ عِنْدَ كُلِّ مَسْجِدٍ وَادْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ كَمَا بَدَأَكُمْ تَعُودُونَ ﴿٢٩﴾ فَرِيقًا هَدَىٰ وَفَرِيقًا حَقَّ عَلَيْهِمُ الضَّلَالَةُ إِنَّهُمُ اتَّخَذُوا الشَّيَاطِينَ أَوْلِيَاءَ مِنْ دُونِ اللَّهِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ مُهْتَدُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾ (الاعراف).

بڵێ: پەروەردگارم فەرمانی بە دادپەروەری داوە، لەکاتی هەر پەرستن و نوێژێکدا، لـە هەموو مزگەوتێکدا ڕووی دڵ و ڕوخسارتان بەڕاستی لە پەروەردگارتان بکەن و بیپەرستن و لێی بپاڕێنەوە، لەکاتێکدا دینداری بێگەردو دڵسۆزانە هەر بۆ ئـەو زاتەیـە، چـونکە هـەر چۆن دروستی کردوون لە سەرەتاوە، لە ئایندەشدا هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە. جا ئـەو کاتە دەبنـە دوو دەسـتە: دەسـتەیەك هیدایـەت و ڕێنمـووی وەرگرتـووە، دەستەیەکیش بڕیاری گومڕای و سەر لێشێواوی بەسەردا سەلماوە، چـونکە بەڕاسـتی ئەوانـە بێجگـە لـە خوا شەیتانەکانیشیان کردە پشتیوان و خۆشەویسـتی خۆیـان، واش دەزانـن کـە ڕێگـەی ڕاست و دروستیان گرتۆتەبەر.

ئەو گومڕابوانە شەیتانەکانیان کردووەتە دەمڕاستی خۆیان جگە لە خودا، شـەیتانیش فەرمان ناکات بە خراپە و قەدەغەکراوەکان نەبێت، وەك قورئان ئەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا يَأْمُرُكُمْ بِالسُّوءِ وَالْفَحْشَاءِ وَأَنْ تَقُولُوا عَلَى اللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿١٦٩﴾ ﴾ (البقرة)، بێگومان ئـەو شـەیتانە هـەر فەرمان بە خراپەو گوناهو تاوان دەکات و هەروەها هانتان دەدات بۆ وتـنی هەنـدێك شـت یان هەڵبەستنی هەندێك گوفتار بەدەم خـواوە بـێ ئـەوەی بـزانن (کـە سـەرئەنجامی ئـەو کارەتان چەندە مەترسیدارە).

**پێـنجەم: بێگومـان خواجـل جـلالە خراپەكـاری قەدەغە كـردووە، ئەو خراپـانەی بە ئاشـكرا ئەنجام ئەدرێن و ئەوانەشی بە نهێنی ئەنجام ئەدرێن، هەروەها تاوان و جەور و ستەم وشیركیشی قەدرەغە كردووە.**

قورئان لە كۆتاییدا وەلامی ئەو گومانـەی داوەتـەوە و بناغـەی ئـەو حەرامكراوانەشـی روون كردووەتـەوە كـە خـوا حـەرامی كـردوون، لەگـەڵ ئـەوەی كـاری پێـدەكرێ: وەك ئەفـەرموێ: ﴿ قُلۡ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ ٱلۡفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنۡهَا وَمَا بَطَنَ وَٱلۡإِثۡمَ وَٱلۡبَغۡيَ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَأَن تُشۡرِكُواْ بِٱللَّهِ مَا لَمۡ يُنَزِّلۡ بِهِۦ سُلۡطَٰنٗا وَأَن تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾ (الاعـراف)، پێیـان بڵـێ: بەڕاسـتی پەروەردگارم هەرچی گوناهو خراپەیە حەرامی كردووە چ ئەوانـەی ئاشـكران، چ ئەوانـەی پەنهانن، هەروەها هەموو گوناهو داخوازی و دەستدرێژیەكی بەناحـەقی حـەرام كـردووە، شتێك بكەن بەشەریك و هاوەڵ بۆ خوا كە هـیچ دەسـەڵاتی پێنـەداوە، هـەروەها حـەرامی كردووە لە خۆتانەوە بەناوی خواوە، دوور لە هەموو زانیاری و زانستێك شت بڵێن.

ئەمە ئەوانەیە كە خودا قەدەغە و حەرامی كردوون، ئـەو كـارە خراپانـە كـە سـنووری خوا ئەبەزێنن، جا چ ئاشكرا بن یان پەنهان بن، گوناهیش هەموو تاوانێكە كە بەگشـتی و زۆرداریش ستەمێكە پێچەوانەی هەق و دادپەروەرییە، كردن و دانانی شتانێك بە شەریكی خوا كە هیچ هێز و دەسەلاتێك و تایبەتمەندی خوایەتیان پـێ نەبەخشـراوە، یـان شـتانێك بڵێن دەربارەی خوا كە زانیاریتان نیە لەسەری وەك ئەوەی دەیڵێن لە حەرام و لە حـەلاڵ و گێڕانەوەی ئەم كارانە بۆ خودا بە بێ هیچ زانیاری و دڵنیاییەك.[٦٧]

٦٧- في ظلال القران، سيد قطب، سەرچاوەی پێشتر،ج٣،ص١٢٨٣.

**بەکورتی:**

- خـوای گـەورەخاوەنی سـیفەتە تێروتەواوەکانـە، فـەرمان بـە ناتـەواوی ناکـات، خراپەش ناتەواویە، چۆن خوا فەرمان بە ناتەواوی ئەکات؟! لە کاتێکدا ژێرمەنـدان رەتـی ئەکەنەوە!
- ئاشکرایە لە ڕێگـەی هەڵبەسـتنەوە هـیچ شـتێك لەسـەر خـوا ناسـەلمێت، بـەڵکو پێویستە ئەو شتە لە رێگەی نیگاوە بسەلمێنرێت کە بۆ پێغەمبەران هاتووە و ئەبێ بەڵگە و ئایەتێك بێت.
- تەوبــە گەڕانەوەیــە بــۆ لای خــوای پــەروەردگار، ڕێگــاش بــۆ ئــەوە نێــت و کردەوەیە،نەك کارێکی رووکەشی وەك پۆشینی بەرگێك یاخود لابردنی.
- خوای گەورە فەرمان بە دادپەروەری و ئەو کارە ئـەکات کـە لـە عەقڵدا جێگـای ئەبێتەوە و خێر و چاکەی بەندەکانی تێدا بێت، ئەگـەر ئـەوان لـە حیکمەتەکەشـی حـاڵی نەبن، بەڵام شەیتان فەرمان بە هەموو خراپە و قەدەغەکراوێك ئەکات.



## گومانی چوارده

### گاور و جولەکە ئەڵێن: ئێمە مناڵ و خۆشەویستانی خواین جل جلالە *[٦٨]

**ناوەڕۆکی گومانەکە:**

گاورەکان و جولەکەکان بانگەشەی ئەوەیان ئەکرد گوایە ئەوان مناڵ و خۆشەویستانی خوان، چونکە ئەوان رەچەڵەکیان دەچێتەوەسەر پێغەمبەرەکانیان، ئەمان نەوەی ئەوانن و لە لایەن ئەوەوە سەرپەرشتی ئەکرێن و خۆشیانی ئەوێ، جولەکە لەسەر ئەم قسە هەڵبەستراوەیان بەڵگە بەوە دێننەوە کە لە کتێبەکەیاندا هاتووە خوا بەبەندەیەکی ئیسرائیلی ئەڵێت:تۆ کوڕی نۆبەرەی منی! گاورەکانیش دەگێڕنەوە کە لە کتێبەکەیاندا هاتووە: عیسا پێی وتوون: من دەچم بۆ لای باوکم و باوکتان! خوای گەورەش ئەفەرموێ:

﴿ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ وَٱلنَّصَٰرَىٰ نَحْنُ أَبْنَٰٓؤُا۟ ٱللَّهِ وَأَحِبَّٰٓؤُهُۥ ۚ قُلْ فَلِمَ يُعَذِّبُكُم بِذُنُوبِكُم ۖ بَلْ أَنتُم بَشَرٌ مِّمَّنْ خَلَقَ ۚ يَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ ۚ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ۖ وَإِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٨﴾ ﴾ (المائدة).

جوولەکەو گاور دەیانوت: ئێمە رۆڵەی خواو خۆشەویست و نزیکی ئەوین، پێیان بڵێ: کەواتە بۆچی لەسەر گوناهو تاوانتان سزاتان دەدات (لە دنیادا بەئاشکرا بەڵاو ناخۆشیتان بۆ پێش دەهێنێت، سزای قیامەتیش با لەولاوە بوەستێت، ئێوە خۆتان ئاوا بەگەورەو نازدار دامەنێن و خۆتان جیا مەکەنەوە) نەخێر وانیە، چونکە ئێوەش بەشەر و ئادەمیزادێکن لەو خەڵکەی کە دروستی کردووە، ئەوەی خوا بیەوێت لێی خۆش ببێت، لێی خۆشدەبێت، ئەوەش کە بیەوێت سزای بدات سزای دەدات (ئەڵبەتە لە چوارچێوەی

---

٦٨- ئەو ئایەتەی کە باس لەم گومانە ئەکات بریتیە لە:(المائدة/١٨، ئەو ئایەش وەڵامی ئەم گومانە ئەداتەوە بریتیە لە: (المائدة/١٨).

دادپەروەریدا) هەرچیش لە ئاسمانەکان و زەوی و نێوانیاندا هەیە هەر خوا خاوەنیانە، گەڕانەوە و سەرئەنجامیش بۆ لای ئەو زاتەیە.

ڕێگاکانی پووچەڵکردنەوەی ئەم گومانە:

١. وەڵامی پیاوە ژیرەکانی جولەکە که موسڵمان بوون بۆ ئەم ئەو لێکدانەوە نەشیاو و لادەرانەی جولەکە هەیانبوو.

٢. بانگەشەی تایبەتمەندی و جیایی لەدروستکراوەکانی تر هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە.

٣. ئەگەر بەراستی منداڵ و خۆشەویستی خوان ئەی بۆچی بەهۆی تاوانەکانتانەوە خوا سزاتان ئەدات.

٤. گاور و جولەکە مرۆڤن وەك هەموو مرۆڤەکانی تر، هیچ فەزڵ و تایبەتمەندیەکیان نیە جیا لە بەندەکانی تری خوا، تەنیا تەقوا و کردەوەی چاك سەنگی مەحەککە.

**درێژەی بابەتەکە:**

**یەکەم: وەڵامی پیاوە ژیرەکانی جولەکە کە موسڵمان بوون بۆ ئەم ئەو لێکدانەوە نەشیاو و لادەرانەی جولەکە هەیانبوو.**

ئەم گومانە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە، قسە هەڵبەستنێکی بێ بنەمایە لە لایەن گاورەکان و جولەکەکانەوە وتراوە، بانگەشەی ئەوە ئەکەن کە ڕۆڵە و خۆشەویستی خوان! و ڕەچەڵەکیان ئەگەڕێتەوە سەر پێغەمبەرەکانیان کە ئەوانیش نەوەی خوان و خوا گرنگی زۆریان پێئەدات و سەرپەرشتیان ئەکات، جولەکە بەڵگەیان بە کتێبەکەیان ئەهێنایەوە کە خوا –جل جلاله بە بەندەی خۆیئیسرائیلی وتووە:(تۆ نۆبەرەی منی) (التکوین:٤٩:٣)، گاورەکانیس بەڵگەیان بەکتێبەکەی خۆیان ئەهێنایەوە کە لە کتێبەکەیاندا هاتووە: عیساسەلامی خوای لێبێت پێی وتوون: (من بەرزدەبمەوە بۆ لای باوکم و باوکتان، خودای من و خودای ئێوە)(یوحەننا:٢٠:١٧)، ئەمەیان دەستکاری

کردووەو بەشێوەیەکی تر لێکدانەوەیان بۆ کردووە، کۆمەڵێك لە پیاوە ژیرەکانیان وەڵامیان داونەتەوەو وتوویانە: ئەم دەستەواژانە لای ئەوان بۆ رێز و تەشریفە، لەم روانگەشەوە ئەو جولەکانی بانگی "عیسا"یان ئەکرد و دەستەواژەی "ئیبنولاّ"یان بەکارئەهێنا وشەیەکی نامۆ نەبوو لایان، بەڵکو دەستەواژەیەکی بەربلاّو بەکاهاتوو بوو لایان، بەو مانایەی کە باسمان کرد، بۆ نمونە: یەکێك لە زاناکانی جولەکە کە ناوی "نەسنائیل"بوو گوێی لە هاورێیەکی بوو کە ناوی "فیلیبس" بوو ئەیووت: لە "شاری ناصیرە پێغەمبەرێك پەیدا بووە، لەسەرەتادا ئەوەی رەتکردەوە، بەڵام دواتر کە چوو بۆ ئەوەی بەچاوی خۆی عیسا ببێنێت: ( عیسای ناسیەوە، "فیلیبس" گەڕا و "نەسنائیل"ی دۆزییەوە و پێی وت: ئەوەمان دۆزییەوە کە موسا لەباسی ناموس و پێغەمبەراندا شتی دەربارەی نووسیوە، "یەسوعی کوڕی یوسف" کە خەڵکی ناصیرەیە، نەسنائیل پێی وت: ئایا دەگونجێ لە نێو ناصیرەدا شتێکی باش هەڵبکەوێ؟ "فیلیبس" پێی وت: وەرە و ببینە ! یەسوع "نەسنائیل"ی بینی وا دێت بەرەو رووی، پێی وت:" هوزای ئیسرائیلی راستەقینەیە و گزی تێدا نیە".

نەسنائیل پێی وت: تۆ لە کوێوە من ئەناسی؟ یەسوع وەڵامی دایەوەو وتی: "پێش ئەوەی فیلیبس بانگت بکات لە ژێر دار هەنجیرەکەدا بینیمیت، نەسنائیل وەڵامی دایەوەو وتی: ئەی مامۆستا ! تۆ کوڕی خوای، تۆ پاشای ئیسرائیلی"(یوحەننا:٤٩٤٥).

گومانی تێدا نیە کە مەبەستی "نەسنائیل" وەك جولەکەیەکی ئیسرائیلی یەکخواپەرست و شارەزا لە کتێبی پیرۆزلە دەستەواژەی"کوڕی خوا" ئەوە نیە بڵێ: تۆ کوڕی خوایت لە ئەو بووی!و خوا لە تۆدا بەرجەستە بووە، مەبەستیشی ئەوە نیە کە بڵێ: تۆ ئەو قاڵبەئەقنومەی کە خوا تێیدا دەرکەوتووە، چونکە ئەم بیروبۆچوونانە لەو کاتانەدا هیچ بوونی نەبووە، تەنانەت عیسا خۆشی لەو بایەوە هیچی نەوتووە، لەبەر

ئەوەی ئەم ڕووداوە دوای ڕۆژی دووەمی پێغەمبەرایەتیەکەی عیسا ڕوویداوە، بۆیە ڕوونە مەبەستی "ئەسنائیل" ئەوەیە لە دەستەواژەی کوڕی خوا: تۆ هەڵبـژاردەی خوایت، یـان تۆ لە لایەن خواوە نێردراوی و خۆشەویستی ئەوی، یان تۆ پێغەمبەرێکی پـیرۆزی چـاك و گوێڕایەڵی..و بەو شێوەیە.

ئەوەی ئەو مانایانە ئەسەلمێنێ ئەوەیە دەسـتەواژەی کـوڕی خـوا لـە ئینجیلیشـدا بـۆ هــەموو کەسـێکی چـاك و گوێڕایــەڵ بــەکارهێنراوە بـۆ جگـە لـە عیسـاش، وەك چـۆن دەستەواژەی کوڕی شەیتان بەکارهێنراوە بۆ هەموو کەسێکی بەد و خراپ.[٦٩]

**دووەم: بانگەشەی تایبەتمەندی و جیایی لەدروستکراوەکانی تر هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە.**

جولەکەکان بڕوایان وایە کە ئەوان گەلی هەڵبـژێرراوی خـوان، و تایبـەتبوونێکی هەیـە بەسەر هەموو مرۆڤەکاندا، ئیمکانی نیە هیچ گەلێکی تر هاوشانیان بێت لای خوا، تەنانەت ئەگەر لە ئەوان باشتر و بەدینتریش بن! ئەوان لە ئاییندا شوێن جگـە لـە خۆیـان ناکـەون، ڕاست نیە شوێن موحەممەدﷺ بکەون چونکە ئەو عەرەبە وئیسرائیلی نیە، بـەرای ئـەوان باشترین نابێت شوێن باشتر بکەوێت، خواش لێیان ناگرێت ئەگەر کافر ببن پێـی! چـونکە ئەوان گەلی تایبەتی خوان و خۆشەویستی ئەون، خوا بەشێوەیەك مامەڵە لەگـەڵ ئەوانـدا ئەکات وەك باوك و کوڕ، کوڕێکی بەڕێز و خۆشەویست لای خۆشەویستەکەی..

گەورەکانیش ئەڵێن گوایە مەسیح خۆی کردووە بە قوربانی بـۆ ئـەوان و ئـەوان کـوڕی خوان بە لەدایکبوونی ڕۆح و مەسیح کوڕە ڕاستەقینەکەی خوا! کە قسـەش لەگـەڵ خـوادا هەر ئەکەن بە باوکە ناوی ئەبەن، بیروڕایان وایە کە پێویسـتیان بـەوە نیـە چاکسـازی لـە دونیـا و لـە ئایینەکەیانـدا بکـەن، هــەر بۆیــە کــە پێغەمبــەرﷺ بـانگی کـردن بـۆ لای یەکخواپەرستی بێ غەل ە غەش و بۆ لای کاری چاکە ڕەتیان کردەوە.[٧٠]

---

٦٩- المناظرة الكبرى، علاء ابوبكر، مكتبة وهبة، القاهرة، ط١، ١٤٢٦هـ/٢٠٠٥م، ص١٧٨،١٧٧،

٧٠- تفسير المنار، محمد رشيد رضا، سەرچاوەی پێشووتر، ج٦،ص٢١٦.

ئەم بانگەشەیەی گاور و جولەکەکان پشت بە هیچ بەڵگەیەك نابەستێت نە لە ڕێگەی نیگاوە نە لە ڕێگەی زانیاریکەوە کە لە کتێبەکانیاندا باسکرابێت، بەڵکو مژدەی هاتنی موحەممەدﷺ لە کتێبەکانیاندا باسکراوە، ئاشکراشە ئەوان ڕاهاتوون لەسەر دەستکاریکردنی قسەکان و لە جێی خۆیدا جێگۆڕکێ پێ بکەن و درۆ بە دەم خواوە بکەن و خۆشیان بزانن کە ئەوە درۆیە، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يُزَكُّونَ أَنفُسَهُم ۚ بَلِ اللَّهُ يُزَكِّي مَن يَشَاءُ وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٤٩﴾ انظُرْ كَيْفَ يَفْتَرُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ ۖ وَكَفَىٰ بِهِ إِثْمًا مُّبِينًا ﴿٥٠﴾ ﴾ (النساء)، ئایا نەتڕوانیووەتە ئەو کەسانەی خۆیان خۆیان بە چاك دەدەنە قەڵەم (دەڵێن ئێمە هەڵبژاردەی خواین) ئەوە وا نیە، بەڵکو خوا (بەندەکانی دەناسێت)و هەرکەس (شایستە بێت، پەسەندی دەکات)و دڵ و دەروونی خاوێن دەکات و ئەوانە بە قەدەر تاڵی ناوکی خورما ستەمیان لێ ناکرێت. سەرنج بدەو تەماشا بکە چۆن (خاوەنانی کتێبی ئاسمانی) درۆ بە دەم خواوە دەکەن (بێباکانە دەڵێن: عوزەیر یان مەسیح کوڕی خوان) ئەو تاوان و گوناهەیان بەسە (بۆ سزادانیان چونکە تاوانێکی زۆر گەورە)ی ئاشکرایە.

**سێیەم: خوا – جل جلاله- خۆشەویستانی خۆی سزا نادات.**

بێگومان خوا لەم ئایەتەدا وەڵام داونەتەوە: ﴿ قُلْ فَلِمَ يُعَذِّبُكُم بِذُنُوبِكُم ﴿١٨﴾ ﴾ (المائدة)، پێیان بڵێ: کەواتە بۆچی لەسەر گوناهو تاوانتان سزاتان دەدات (لە دنیادا بەئاشکرا بەڵاو ناخۆشیتان بۆ پێش دەهێنێت، سزای قیامەتیش با لەولاوە بوەستێت، واتە ئەگەر بابەتەکە بەو جۆرەیە کە ئێوە بانگەشەی بۆ ئەکەن گوایە منداڵ و خۆشەویستی خوان ئەی بۆچی خوا سزای داون لە دونیادا، وەك لەمێژووی خۆتاندا ئاماژەی پێکراوە، بەوەی لێتان بووە بە مەیمون و بەراز ، چەندین کەس زاڵبووە بەسەرتاندا و سزای داون و چەوساندوونیەتەوە، یان وەك ئەوەی لە مێژووی ئێستاتاندا

دەیبینن، لەو سزایانە تێکدانی مزگەوتی گەورەی جولەکە لە لایەن بتپەرستەکانەوەو شکستهێنان بە دەسەلاتیان لەسەر زەویدا.[71]

هەروەها چەوسانەوەی گاورەکان لە لایەن گەلانی ترەوە و ئابڕووبردنیان هەندێکیان و کردنیان بە پەند، بەو مانایەی: بۆچی خوا ئاگری جەهەننەمی ئامادەکردووە بۆتان لەسەر ئەو کوفر و درۆ وبوختانانەتان؟ وەك جوولەکە ئەمە ئەسەلمێنن و دان بەوەدا ئەنێن کە خوا چەند رۆژێکی دیاریکراو ئەیانخاتە ناو ئاگر وەك قورئان لێیان ئەگێڕێتەوە و ئەفەرموێ: ﴿ وَقَالُواْ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامًا مَّعْدُودَةً ۚ قُلْ أَتَّخَذْتُمْ عِندَ ٱللَّهِ عَهْدًا فَلَن يُخْلِفَ ٱللَّهُ عَهْدَهُۥٓ ۖ أَمْ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٨٠﴾ ﴾ (البقرة)، جوولەکەکان دەڵێن: (چەندە گوناهبارببین) تەنها چەند رۆژێکی کەم لە دۆزەخدا دەمێنینەوە!! پێیان بڵێ: باشە، ئێوە پەیمانتان لە خوا وەرگرتووە، تا هەرگیز خوای گەورە پەیمان شکێنی نەکات؟! یان هەر دەتانەوێت شتێك بڵێن بەدەم خواوە کە هیچ بناغەیەکی نیەو هەر نازانن (چی دەڵێن) !!

ئەوەی ئاشکرایە کە خۆشەویست ئازاری خۆشەویستی خۆی نادات، باوکیش ئازاری رۆڵەی خۆی نادات، کەواتە ئێوە منالْ و خۆشەویستی خوا نین! ئەمەش بەڵگەی قسە و بوختانەکەیانە و ئەم شێوازەش لە وەڵامدانەوە لای زانایانی مەنتیق پێی ئەوترێت"بورهانی خولف" واتە نەهاتنە جێی بەڵێنەکان.

**چوارەم: باوەڕ و کردەوەی چاکە مرۆڤەکان لای خوا ئەبەنە پێشەوە.**

خوا روونی کردوەتەوە کە ئەوانیش مرۆڤن وەك هەموو مرۆڤەکانی تر، خوا فەرمانڕەوای دادپەروەرە، کەس ناباتە پێشەوە لەسەر حسابی کەسێکی تر، نەئێوەو نە جگە لە ئێوە ئیمتیازی تایبەتیتان نیە، وە هیچ خزمایەتیەکتان لەگەڵ خوادا نیە، چونکە

---

71- سەرچاوەی پێشوو، ص٣١٥.

سەرجەم دروستکراوەکان لە یەك ئاستدان، خوای گەورە لەو کەسانە خۆش دەبێت کە شایستەی لێخۆش بوون بن،هەروەها سزای ئەو کەسانەش ئەدات کە شایانی سزا بن، خوا بە پێی کردەوەکانتان مامەڵەتان لەگەڵدا ئەکات، وەك سەرجەم مرۆڤەکانی تر، بۆیە واز لەو لووتبەرزی و لەخۆڕازیبوونە بهێنن، وەك خوای گەورە ئەفەرموێ:

﴿ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ وَٱلنَّصَٰرَىٰ نَحْنُ أَبْنَٰٓؤُا۟ ٱللَّهِ وَأَحِبَّٰٓؤُهُۥ ۚ قُلْ فَلِمَ يُعَذِّبُكُم بِذُنُوبِكُم ۖ بَلْ أَنتُم بَشَرٌ مِّمَّنْ خَلَقَ ۚ يَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ ۚ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ۖ وَإِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٨﴾ ﴾ (المائدة).

جوولەکەو گاور دەیانوت: ئێمە ڕۆڵەی خواو خۆشەویست و نزیکی ئەوین، پێیان بڵێ: کەواتە بۆچی لەسەر گوناهو تاوانتان سزاتان دەدات (لە دنیادا بەئاشکرا بەڵاو ناخۆشیتان بۆ پێش دەهێنێت، سزای قیامەتیش با لەولاوە بوەستێت، ئێوە خۆتان ئاوا بەگەورەو نازدار دامەنێن و خۆتان جیا مەکەنەوە) نەخێر وانیە، چونکە ئێوەش بەشەر و ئادەمیزادێکن لەو خەڵکەی کە دروستی کردووە، ئەوەی خوا بیەوێت لێی خۆش ببێت، لێی خۆشدەبێت، ئەوەش کە بیەوێت سزای بدات سزای دەدات (ئەڵبەتە لە چوارچێوەی دادپەروەریدا) هەرچیش لە ئاسمانەکان و زەوی و نێوانیاندا هەیە هەر خوا خاوەنیانە، گەڕانەوە و سەرئەنجامیش بۆ لای ئەو زاتەیە.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾ ﴾ (الحجرات).

ئەی خەڵکینە بێگومان ئێمە هەمووتانمان لەنێرو مێیەك دروستکردووە (کەباوکەئادەم و دایکە حەوایە) و کردوومانن بەچەندەها گەل و تیرە و هۆزی جۆربەجۆر، تا یەکتر بناسن و پەیوەندیتان خۆش بێت بەیەکەوە ... بەڕاستی بەڕێزترینتان لای خوا ئەو کەسانەتان کەزۆرتر لەخواترسەو فەرمانبەرداری خوایە، بێگومان خوا زاناو ئاگایە بەهەمووان.

**بە کورتی:**

- تێڕوانینی گاور و جولەکە کە تایبەتمەندیان هەیە بەسەر دروستکراوەکانی تردا تێڕوانینێکی هەڵەیە، و هیچ بەڵگەی لەسەر نیە، ئەسڵ لە جیاکاری و نزیکی لە خواوە تەقواو کردەوەی چاکەیە.
- ئەگەر گریمانی ئەوەمان دانا کە گاور و جولەکە منالّ و خۆشەویستی خوان، ئایا باوکێك هەیە سزای منالّەکانی بدات و لەناویان ببات لەسەر گوناهەکانیان، لەگەلّ ئەوەشدا خۆشیانی بوێت و بەسۆز بێت بەرانبەریان؟
- ئەوەی گاور و جولەکە بەڵگەی پێدەهێننەوە لە کتێبە دەستکاریکراوەکانیاندا بەڵگەهێنانەوەیەکی هەڵەیە و تەئویلێکی بەد و خراپە و لە لایەن بیرمەند و پیاوە ژیرەکانیانەوە ئەو راستیەیان ئاشکرا کردووە.



# گومانی پازده

## جــولەکە بانگەشــەی ئەوە ئەکەن کە ژیــانی دوارۆژ تــایبەتە بەوان و کەس هاوبەشییان ناکات [72](R)

**ناوەڕۆکی گومانەکە:**

جولەکـەکان بانگەشـەی ئـەوە ئەکـەن کـە ژیـانی دوارۆژ تایبـەتکراوە بـە ئـەوان نـەك خـەڵکی تـر، چـونکە ئـەوان دۆسـتانی خـوان، ئەشـڵێن: ئـەوان لەسـەر ڕێگـەی ڕاسـتن و موحەممەدﷺ و هاوڕێکانی لەسـەر ڕێگـەی گومڕایین.خـوای گـەورە ئەفـەرموێ: ﴿ قُلْ إِن كَانَتْ لَكُمُ الدَّارُ الْآخِرَةُ عِندَ اللَّهِ خَالِصَةً مِّن دُونِ النَّاسِ فَتَمَنَّوُا الْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٩٤﴾ ﴾ (البقرة)، (ئەی محمد! پێیان بڵێ: ئەگەر ڕاست دەکەن و باوەڕتان وایە کـە مـاڵی ئەو دنیا (بەهەشت) لای خـوا تایبەتمەنـدە بـە ئێـوە نـەك خـەڵکی تـر، دە ئـاواتی مـردن بخوازن ئەگەر ڕاست دەکەن (تا زوو بچنە ناو بەهەشت)!!

ڕێگاکانی پووچەڵکردنەوەی گومانەکە:

١ئەم بانگەشەیە پووچ و بەتاڵە چونکە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە.

٢ئاوات نەخواستنیان بۆ مردنکە دەیانگەیەنێتە ژیانی ئەو دنیا بەڵگەیە لەسەر درۆزنی و پووچی بانگەشەکەیان.

٣خۆبەدوورگرتنیان لە(موباهەلە)[73] بەهۆی هۆگرییان بە ژیانەوەو ترسیان لە عاقیبەت شەڕییان بەڵگەیە لەسەر گومڕایی و بوختانچێتییان.

---

٧٢–ئەو ئایەتەی کە بـاس لـەم گومانـە ئـەکات بریتیـە لـە:(الجمعـة/٦، ئـەو ئایەتانـەش وەڵامـی ئـەم گومانـە ئەدەنەوە بریتین لە:(الجمعة/٦و٨،ال عمران/٦١،مريم/٧٠).

R بۆ وەڵامدانەوەی ئەو لافلێدانەی جولەکەکان و گاورەکان گوایە کەس ناچـێتە بەهەشـتەوە تـا شـوێن ئـەوان نەکەون گومانی حەڤدە لەم بەشەدا بخوێنەوە.

**درێژەی بابەتەکە:**

**یەکەم: پووچی و بەتاڵی بانگەشەکەی جوولەکە.**

ئەمە بانگەشەیەکە لە بانگەشە پووچەکانی جولەکە، کە چەندین بانگەشەی تریان لە پێش و لە پاشی ئەم بانگەشەدا راگەیاندووە، بۆ نمونە: ﴿ وَقَالُوا۟ لَن يَدْخُلَ ٱلْجَنَّةَ إِلَّا مَن كَانَ هُودًا أَوْ نَصَـٰرَىٰ ...(١١١) ﴾ (البقرة)، (جوولەکە و گاورەکان) دەڵێن: هەرگیز کەس ناچێتە بەهەشتەوە بێجگە لە جوولەکە یان گاور، هەروەها ئەڵێن: ﴿ .. نَحْنُ أَبْنَـٰٓؤُا۟ ٱللَّهِ وَأَحِبَّـٰٓؤُهُۥ ..(١٨) ﴾ (المائدة)، جوولەکەو گاور دەیانوت: ئێمە رۆڵەی خواو خۆشەویست و نزیکی ئەوین،یان ئەیانووت: ﴿ ..لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامًا مَّعْدُودَةً ..(٨٠) ﴾ (البقرة) جوولەکەکان دەڵێن: (چەندە گوناهباربین) تەنها چەند رۆژێکی کەم لە دۆزەخدا دەمێنینەوە!! هەروەها ئەڵێن: ﴿ ..كُونُوا۟ هُودًا أَوْ نَصَـٰرَىٰ تَهْتَدُوا۟ ..(١٣٥) ﴾ (البقرة)، دەڵێن: وەرن ببنە جولەکە یان گاور تا بکەونە سەر رێگەی راست!!

ئەوان لێرەدا دەڵێن گوایە لە دوارۆژدا کە دیارە مەبەستیان بەهەشتە تایبەتە بەوان و کەس هاوبەشییان ناکات تێیدا، بە بێ هیچ خەوش و خاڵێك نازو نیعمەتەکانی بەهەشت تایبەتە بە خۆیان، چونکە ئەوان دۆستانی خوان جیا لە خەڵکانی تر، ئەم بەڵگەیە وەك دەبینن پەیوەندی بە بوونی ئیمان و پاداشتەوە هەیە لە رۆژی دوایدا، ئەمەش هەواڵێکە بەڵگە نیە لەسەر راستێتی، بەڵکو حاڵ و واقیعی جولەکە و ئەو بانگەشانە بە درۆ ئەخەنەوە..

---

٧٣-موباهەلە: کۆبوونەوەی خەڵکە کاتێك راجیاوازی پەرەئەسەنێت لەناویاندا لەسەر بابەتێکی دیاریکراو، جا ئەڵێن: نەفرەت لەوەمان بێت درۆزنە و ستەمکاری ناومانە.

**دووەم: بەڵگەی درۆزنی جولەکەکان.**

خوای گەورە وەڵامیان ئەداتەوە و ئەفەرموێ: ﴿قُلْ إِن كَانَتْ لَكُمُ الدَّارُ الْآخِرَةُ عِندَ اللَّهِ خَالِصَةً مِّن دُونِ النَّاسِ فَتَمَنَّوُا الْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٩٤﴾﴾ (البقرة)، ئەی محمد ﷺ پێیان) بڵێ: ئەگەر ڕاست دەکەن و باوەڕتان وایە کە ماڵی ئەو دنیا (بەهەشت) لای خوا تایبەتمەندە بە ئێوە نەك خەڵکی تر، دە ئاواتی مردن بخوازن ئەگەر ڕاست دەکەن (تا زوو بچنە ناو بەهەشت)!

یانی ئەگەر بانگەشەکەتان دروستە و ڕاست ئەکەن لەوەدا کە ئەڵێن ڕۆژی دوایی تایبەتە بە ئێمە جیا لەخەڵکانی تر، چونکە دۆست و ئەولیای خواین، ئەوەی لەسەر ڕێبازی خۆتان نەبێت ناچێتە بەهەشت! ئێوە گەلی هەڵبژێرراوی خوان، ئاگریش ناتان سووتێنێت بۆ چەند ڕۆژێکی ژمێردراو نەبێت کە زیاتر نیە لەو ڕۆژانەی کە گوێرەکەتان تێدا پەرستووە، دەی کە وایە ئاوات بۆ مردن بخوازن کە دەتانگەیەنێتە ئەو نیعمەتە نەبڕاوە کە لەودا ڕکابەر و هاوبەش و بێزارکەرتان لەگەڵ نیە! ئەگەر ئاوات بۆ مردن نەخوازن کەواتە ئێوە دڵنیا نین و درۆ دەکەن، چونکە ناچێتە عەقڵەوە مرۆڤ حەزی لەبەختەوەری بێت و نارەحەتی و بەدبەختی بۆ خۆی هەڵبژێرێت! لێرەدا بەڵگەیەکی گەورە بەدەست موسڵمانەکانەوە هەیە لەسەر جولەکە بۆ پووچەڵکردنەوەی قسەکانیان.

لێکدانەوەیەکی ئەم مشتومڕە ئەوەیە هەرکەس باوەڕی وایە ئەهلی بەهەشتە ئەوە مردن خۆشترە لە لای لە مانەوە لە ژیانی دونیا و خۆشیەکانی بەبەراورد بە ڕۆژی دوایی، مردنی پێ خۆشتر بێ لە ئازار و نارەحەتیەکانی دونیا، دەی ئەگەر ڕاست ئەکەن ئاوات بە مردن بخوازن، ئەم ئایەتەش بانگهێشتکردنە بۆ داوایەکی ڕەوا و دادپەروەرانە، بۆ جیاکردنەوەی ئەوان و ئیمانداران لە و خیلاف و ڕا جیاییە، ئەگەر ڕاست بکەن لەوەدا کە ئەیڵێن و بەراستیانە کە لە خواوە نزیکن ئەوە مردن زیانی نیە بۆیان، بەڵام لە ڕاستیدا

درۆدەکەن و هیچ کەسێك لەوان ئاواتی مردن ناخوازێت لە ترسی سزای خوا و لە ترسی عاقیبەت شەڕییان، چونکە خۆیان ئەزانن چ کردەوەیەکی بەد و خراپیان ئەنجام داوە، خۆ ئەگەر داوای مردن بکەن ئەوە لە دونیا و لە دوارۆژیشدا تیائەچن، بۆیە خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿ وَلَن يَتَمَنَّوْهُ أَبَدًا بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ ﴿٩٥﴾ ﴾ (البقرة)، (بەڵام ئەوانە) هەرگیز بەهۆی ڕەفتاری نادروست و دەست پێشخەری ناپەسەندیانەوە ئاواتی مەرگ ناخوازن، خوایش چاك ئاگادارە لە حاڵی ستەمکاران.

دەی بە خۆدوورگرتنیان لەمە پووچی بانگەشەکەیان دەرئەخەن.[٧٤]

**سێیەم: سووربوونیان لەسەر ژیان و خۆبەدوورگرتنیان لە(موباهەلە).**

یەکێکی تر لە وەڵامەکانی قورئان لەسەر ئەم بانگەشەیان ئەوەیە بانگیان ئەکات بۆ دوعا لەخۆکۆدن و پێ وتن: ئەگەر وابیردەکەنەوە کە ئێوە ئەولیای خوان و جیاوازن لە خەڵکانی تر، وە ئێوە منداڵ و خۆشەویستی ئەون و تەنیا ئێوە ئەهلی بەهەشتن و بەرانبەرەکانتان ئەهلی ئاگرن، وەرن دوعا بکەن لەسەر ئەوانەی کە درۆ دەکەن لە خۆتان و لە جگە لە خۆتان، ئەوەش بزانن دوعاکردن ریشەی درۆزن دەردەهێنێت، بەڵام کە دواکەوتن و وەڵامیان نەبوو درۆکەیان ئاشکرا بوو، وەك ئەوەی پێغەمبەرﷺ شاندی نەجرانی بانگ کرد بۆ دوعاکردن لە پاش ئەوەی لە ڕووبەڕووبوونەوەیەکدا ئیقامە حوججەی لەسەرن کردن، بەڵام ئەوان(شاندەکەی نەجران) نکولیان کردوو داواکەیان ڕەتکردەوە، بۆیە خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿ فَمَنْ حَاجَّكَ فِيهِ مِن بَعْدِ مَا جَاءَكَ مِنَ الْعِلْمِ فَقُلْ تَعَالَوْا نَدْعُ أَبْنَاءَنَا وَأَبْنَاءَكُمْ وَنِسَاءَنَا وَنِسَاءَكُمْ وَأَنفُسَنَا وَأَنفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَل لَّعْنَتَ اللَّهِ عَلَى الْكَاذِبِينَ ﴿٦١﴾ ﴾ (ال عمران)، دوای ئەوەی کە هەموو ئەو ڕاستیانەت پێگەیشت

---

٧٤- الجامع لاحكام القران، القرطبي، سەرچاوەی پێشتر،ج٢،ص٣٢و٣٣، بە دەستکارییەوە. في ظلال القران،سيد قطب، سەرچاوەی پێشتر،ج١، ص٨٣و٨٤.

دەربارەی عیسا)، جا ئەگەر کەسانێك هەر موجادەلەیان کردوو لەسەری ڕۆیشتن و شتی ناڕەوایان دەربارەی عیسا وت، تۆیش پێیان بڵێ: وەرن با کوڕانی ئێمە و کوڕانی ئێوە، ئافرەتانی ئێمە و ئافرەتانی ئێوە، خۆمان و خۆشتان بانگ بکەین و ئامادەبین (لە شوێنێکی تایبەتدا)، پاشان لە خوا بپاڕێنەوە و ئینجا داوا بکەین نەفرین و لەعنەتی خوا داببارێتە سەر درۆزنەکان .

کە ئەمەیان بینی بە یەکتریان وت: وەلاَ ئەگەر لە بەرانبەر ئەو پێغەمبەرەدا دوعاتان بکردایە کەستان لێ بەجێ نەئەما چاوی بتروکاندایە ! ئەمە هەر وەك ئەو فەرموودەی خوایە کە بە پێغەمبەرەکەی ئەلێ ﷺ: ﴿ قُلۡ مَن كَانَ فِي ٱلضَّلَٰلَةِ فَلۡيَمۡدُدۡ لَهُ ٱلرَّحۡمَٰنُ مَدًّاۚ حَتَّىٰٓ إِذَا رَأَوۡاْ مَا يُوعَدُونَ إِمَّا ٱلۡعَذَابَ وَإِمَّا ٱلسَّاعَةَ فَسَيَعۡلَمُونَ مَنۡ هُوَ شَرّٞ مَّكَانٗا وَأَضۡعَفُ جُندٗا ﴿٧٥﴾ ﴾ (مریم).

ئەی پێغەمبەر تۆ بڵێ: ئەوەی لە گومڕایی دایە باهەرخوای میهرەبان تەمەنی درێژو ماڵ و سامان و دنیای پێ ببەخشێت (بەچی دەچێت، بۆ کوێی دەبات، ئەوپەڕی ئەوەیە) هەتا کاتێك ئەو هەڕەشانە دەبینن کە لێیان دەکرێت، یان سزاو ئازاری دنیایە، یان بەرپابوونی قیامەتە، جا خوانەناسان لەئایندەدا دەزانن کێ جێگە و ڕێگەی ناخۆشەو کێ لەشکرو سەربازانی لاوازە.

یانی: هەر کەس لە ئێمە و لە ئێوە لەسەر گومڕاییە ئەوە خودا زیاتر گومڕای بکات و بە هیلاکیدا بەرێ. دوعاکردن و موباهەلە بۆ مردن بەو شێوازە بوو، چونکە ژیان لای ئەو کەسانە خۆشەویستە لەبەر ئەوەی ئەزانن داهاتوویان دوای مردن چۆنە چەند خراپە، خوای گەورە بۆیە ئەفەرموێ: ﴿ وَلَتَجِدَنَّهُمۡ أَحۡرَصَ ٱلنَّاسِ عَلَىٰ حَيَوٰةٖ ..﴿٩٦﴾ ﴾ (البقرة).[٧٥] سوێند بێت ئەو جوولەکانە دەبینیت کە لە هەموو خەڵك بە پەرۆشترن لەسەر دنیاو ژیانی دنیا بەهەر جۆرێك بێت..

---

٧٥- التحریر و التنویر، الطاهر بن عاشور، سەرچاوەی پێشتر،مج٣،ج٣ص٢٦٤و٢٦٥، بە دەستکارییەوە.الجامع لاحکام القران، القرطبي،سەرچاوەی پێشتر،ج٤،ص١٠٤، بە دەستکارییەوە.

**بە کورتی:**

- قورئان فەرمانی بە جولەکە کرد کە ئاواتی مردن بخوازن ئەگەر راست ئەکەن لە بانگەشەکەیاندا.
- نەبوونی بەڵگە لەسەر بانگەشەکەیان خۆی لە خۆیدا بەڵگەیە لەسەر درۆکردنیان.
- قورئان جولەکە بانگێشت ئەکات بۆ موباهەلە و دوعا لەیەکتری کردن و رووبەڕووبوونەوە کە خوا رەگی درۆزن ریشەکێش بکات.
- خۆبەدوورگرتنی جولەکە لە دوعاکردن هۆکاری پەیوەستبوونیانە بە ژیانی دونیاوە، هەروەها ترسیان لە عاقیبەت شەڕییان بەڵگەیەکی بەهێزە لەسەر درۆکردنیان..



## گومانی شازده

## گـاور و جـولەکە بانگەشـەی ئەوە ئەکەن کە ئاگریـان لێنـاکەوێ چەنـد ڕۆژێکـی ژمێرراو نەبێ *[٧٦]

**ناوەڕۆکی گومانەکە:**

گاورەکان و جولەکەکان بە درۆ و بە بوختان بانگەشەی ئەوە ئەکـەن کـە گوایـە ئـاگر لێیان ناکەوێت چەند ڕۆژێکـی ژمێـردراو نـەبێ، پاشـان ڕزگاریـان ئـەبێت، وتوویانـە: ئـەم دونیایە حەوت هەزار ساڵە،لەبەرانبەر هەر هەزار ساڵێکدا یەك ڕۆژ بە ئـاگر سـزا ئـەدرێن، کە دەکاتە حەوت ڕۆژی ژمێردراو، خوا لەبارەیانەوە ئەفەرموێ:

﴿ وَقَالُوا۟ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامًا مَّعْدُودَةً ۚ قُلْ أَتَّخَذْتُمْ عِندَ ٱللَّهِ عَهْدًا فَلَن يُخْلِفَ ٱللَّهُ عَهْدَهُۥٓ ۖ أَمْ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٨٠﴾ ﴾ (البقرة).

جوولەکەکان دەڵێن: (چـەندە گوناهبـاربین) تـەنها چـەند ڕۆژێکـی کـەم لـە دۆزەخـدا دەمێنینەوە!! پێیان بڵێ: باشە، ئێوە پەیمانتان لە خوا وەرگرتووە، تـا هـەرگیز خـوای گەورە پەیمان شکێنی نەکات؟! یان هەر دەتانەوێت شتێك بڵێن بـەدەم خـواوە کـە هـیچ بناغەیەکی نیەو هەر نازانن (چی دەڵێن) !!

**ڕێگاکانی پووچەڵکردنەوەی گومانەکە:**

١. خوای گەورە هیچ پەیمانێکی نەداوە بەگاور و جولەکە سەبارەت بەو بانگەشەیان.

٢. ئەم بانگەشەیە نە زانیاری لەسەر هەیە و نە بەڵگە بۆیە پووچە.

٣. پاداشت لە ڕەگەزی کردەوەیە بە بـێ تایبەتمەنـدی و جیاکـاری: بۆیـە جەهەننـەم بـۆ هەتاهەتا هی موشریکەکانە و بەهەشتیش بۆ هەتاهەتا بۆ ئیماندارانە.

---

٧٦ -ئەو دوو ئایەتەی کە باس لەم گومانە ئەکەن بریتین لە:(البقرة/٨٠،ال عمران/٢٤)، ئەو ئایەتانـەش وەڵامـی ئەم گومانە ئەدەنەوە بریتین لە:(البقرة/٨٠و٨٣،ال عمران/٢٤و٢٥).

٤. لووتبەرزی و لەخۆباییبوونی گاور و جولەکە لە دینەکەیاندا وایلێکردوون ئەو جۆرە بانگەشانە بکەن.

**درێژەی بابەتەکە:**

**یەکەم: بوختانی گاور و جولەکە بەدەم خواوە بە بێ هیچ زانیارییەک.**

ئەمە جۆرێکە لە جۆرەکانی لووتبەرزی قسە هەڵبەستن بەدەم خواوە بە بێ هیچ جۆرە زانیاریەك، ئەوان بانگەشەی ئەوە ئەکەن کە چەند ڕۆژێکی ژمێرراو نەبێت ئاگریان لێ ناکەوێ، ئەو ڕۆژانەش بە ئەندازەی ئەو ڕۆژانەیە کە گوێرەکەیان تێدا پەرستووە، هەندێك ئەڵێن حەوت ڕۆژ و هەندێکی تر ئەڵێن: چل ڕۆژ، پاشان لە ئاگر دێنە دەرەوە، ئەم هەواڵەیان بە پێغەمبەری خوداﷺ گەیاند کاتێك کە خەیبەریان رزگار کرد، پێغەمبەرﷺ لە و مەڕەی خوارد کە کە ژەهریان پێوەکردبوو، پێغەمبەری خواﷺ کۆیکردنەوەو پرسیاری لێکردن: کێ ئەهلی ئاگرە؟ وتیان: کەمێك تێیدا ئەمێننەوەو پاشان ئێوە ئەخەنە جێگەمان، پێغەمبەرﷺ فەرمووی:(هەر بحەپێنن تێیدا، وەلا هەرگیز ئێمە ناخەنە جێگەی ئێوە).[٧٧]

وشەی(المس)لە ئایەتەکەدا یانی بەرکەوتنێکی هێواش، یاخود نزیکبوونەوەی شتێك لە شتێکی تر، بەڵام کەسیان هەست بە ئەویتریان نەکەن، جگە لە هەستێکی کەم نەبێت، کە شایانی باسکردن نیە، ماوەکەشی چەند چرکەیەکە، ئیتر چۆن ئەبێتە چەند ڕۆژێك؟ ئەی چۆن ئەو شێوازەی باسی ئەکەن ئەبێتە سزا بۆ تاوانێك کە ئەنجامدرابێت.

جولەکەکان باوەڕیان وایە تەمەنی دونیا حەوت هەزار ساڵە و جولەکەش حەوت ڕۆژ لە ئاگردا ئەمێننەوە، بۆ هەر هەزار ساڵ ڕۆژێك، ئەم هەواڵەش نابێ بووترێت کاتێك نەبێت

---

٧٧- اخرجه البخاري في صحيحه، كتاب الجزية و الموادعة، باب اذاغدر المشركون بالمسلمين هل يعفى عنهم(٢٩٩٨).

كە خوای خاوەنی ڕۆژی دوایی پەیمان و بەڵێنی دابێت، ئەگینا ئەوە شێتی و شەڕەنگێزی نواندنە بەرانبەر بە خوای پەروەردگار، قسەیەکی بێ بنەمایە، بەمەش خوای گەورە وەڵامی داونەتەوەو فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی کردووە لەگەڵیان بدوێ و بڵێ:

﴿ قُلْ أَتَّخَذْتُمْ عِندَ ٱللَّهِ عَهْدًا فَلَن يُخْلِفَ ٱللَّهُ عَهْدَهُۥٓ ۖ أَمْ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٨٠﴾ ﴾ (البقرة)، جوولەکەکان دەڵێن: (چەندە گوناهبارببین) تەنها چەند ڕۆژێکی کەم لە دۆزەخدا دەمێنینەوە ! ! پێیان بڵێ: باشە، ئێوە پەیمانتان لە خوا وەرگرتووە، تا هەرگیز خوای گەورە پەیمان شکێنی نەکات؟ ! یان هەر دەتانەوێت شتێك بڵێن بەدەم خواوە کە هیچ بناغەیەکی نیەو هەر نازانن (چی دەڵێن) !!

بەواتای ئەوەیە: ئەگەر خوا ئەو بەڵێنی لەو جۆرەی پێدابن ئەوە مافی خۆتانە، چونکە خوا بەڵێنی خۆی ئەباتەسەر و لێی پاشگەز نابێتەوە، ئەم پرسیارە بۆ ڕەتکردنەوەیە، واتە: هیچ پەیمانێکتان پێ نەدراوە لە لایەن خواوە.[78]

**دووەم: بانگەشەکەیان نە بەڵگە و نە بورهانی عەقڵی نیە.**

ئەم بانگەشەیە هیچ بەڵگە و سەلمێنەرێکی نیە، بۆیە خوا بەدرۆیان ئەخاتەوە و ئەفەرموێ: ﴿ أَمْ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٨٠﴾ ﴾ (البقرة)، یان هەر دەتانەوێت شتێك بڵێن بەدەم خواوە کە هیچ بناغەیەکی نیەو هەر نازانن (چی دەڵێن)! ئەمە یانی: ئێوە شتێك ئەڵێن کە لە بارەی خواوە کە هیچ زانیاریەکتان نیە لەسەری، زانیاری لەو جۆرەش هەر ئەبێ لە ڕێگەی نیگاوە پێغەمبەرەکەی بیگەیەنێت، قسەکردن لەسەر خوا بە بێ زانیاری چاوقاییمی و ئاماژەدانە بۆ بێ باوەڕی، واتە نابێ لەم دوو حاڵەتە بەدەر بێت، لەگەڵ ئەوەی هیچ ڕاسپێردراوێك لە نێوانیاندا بوونی نیە: جا یان ئەوەتا بەڵێنێکیان لە خواوە وەرگرتووە، یاخود بێ زانیاری قسە دەکەن، بۆیە ئەگەر خوا هیچ بەڵێنێکی

---

٧٨- في ظلال القران، سيد قطب، سەرچاوەی پێشتر،ج١،ص٨٥و٨٦.

پێ نەدابن، تەنها ئەوە ئەمێنێتەوە کە بە بێ زانیاری قسە لەسەر خوا دەکەن، بەمەش پووچەڵی و بێ بناغەیی بانگەشەکەیان روون ئەبێتەوە کە درۆیە. شاعیریش ئەڵێ:

والدعاوى مـــا لم تقيموا عليها

بينات ابناؤها ادعيــــــــــاء[79]

**سێیەم: پاداشت لە رەگەزی کردەوەیە.**

پاش ئەوەی خوای گەورە بانگەشەکەی گاور و جولەکەکانی پووچ کردەوە، هەواڵی پێدان کە سزای ئەوانە دەدات کە هاوبەشیان بۆ بڕیار داوە و باوەڕیان بە پێغەمبەرەکانی ئەو نەهێناوە،هەواڵیان ئەداتێ ئەوانە بۆ هەتا هەتایە لە ئاگری دۆزەخدا ئەمێننەوە، چونکە بەهەشت ئەهلی ئیمان بەخوا و بە پێغەمبەرانی تێدا نیشتەجێ ئەبێت، وەك ئەفـــــەرموێ: ﴿ بَلَىٰ مَن كَسَبَ سَيِّئَةً وَأَحَٰطَتۡ بِهِۦ خَطِيٓـَٔتُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٨١﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٨٢﴾ ﴾ (البقـرة)، نـەخێر وانییـە، ئـەو کەسـەی گونـاهو تـاوان ئـەنجام بـدات و تاوانـەکانی هەموولایەکی دابگرێت (ئاشکراو نادیاری) ئەو جۆرە کەسانە نیشتەجێی ئاگری دۆزەخن و بۆ هەمیشـەیی تیایـدا دەمێننـەوە (لـە هـەر نەتـەوەو هـۆزو تـیرەو تایەفەیـەك بـن). ئـەو کەسانەش باوەڕیان هێناوەو کردەوە چاکەکان ئـەنجام دەدەن، هـەر ئـەوانن نیشـتەجێی بەهەشتن و تیایدا ژیانی هەتا هەتایی دەبەنە سەر (لە هەر چین و توێژو رەگەزێك بن).

بەم وەڵامە یەکلاکـەرەوەو قسـەبڕە بانگەشـەکەیان هەڵئەوەشـێتەوە و بەڵگەکەشـیان پوچـەڵ ئەبێتـەوە، ئەمـە وێنایـەکی گشـتییە لـە تێڕوانینـە گشـتگیرەکانی ئیسـلام کـە

79-هەر بانگەشەیەك ئەگەر بەڵگەی بۆ نەهێنرایەوە ئەوە خەیاڵپلاوی و لافلێدانە

هەڵقوڵاوی بۆچوونە گشتیەکەیە لەسەر بوونەوەر و ژیان و مرۆڤ: کە پاداشت لە ڕەگەزی کردەوەیە و بەپێی کردەوە پاداشت وەردەگیرێ.[80]

**چوارەم: لووتبەرزی جولەکە.**

خوای گەورە روونیکردووەتەوە کە سەرچاوەی ئەم قسە هەڵبەستراوانە بابەتی بەڵگە و زانیاری نیە، بەڵکو سەرچاوەکە لەخۆباییبوونیانە لە دینەکەیاندا، چونکە بڕیارێکی لەو جۆرە لە رێگەی راوبۆچوونەوە نازانرێت، لەبەر ئەوەی ئەوە کارێکی غەیبیە، تەنیا لە رێگەی نیگای ئاسمانیەوە ئەزانرێت، نیگاش پشتگیری ئەو بابەتە ناکات، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿..وَغَرَّهُمْ فِي دِينِهِم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴾ (ال عمران)، ئەوەی لە ئاینەکانیاندا بۆ خۆیان هەڵبەستبوو، سەری لێ شێواندن و تەفرەی دان.

ئەمەش ئاماژەیە بۆ لادان لەخۆباییبوون و سەرپێچیکردنیان لە قسە هەڵبەستراوەکانیاندا، وەك قورئان ئەفەرموێ: ﴿..نَحْنُ أَبْنَٰٓؤُا۟ ٱللَّهِ وَأَحِبَّٰٓؤُهُۥ.. ﴾ (المائدة)، ئێمە منالی خوا و خۆشەویستانی ئەوین! چەندین قسەی تری لەو بابەتە..[81]

**بەکورتی:**

- (المس) واتە بەرکەوتنێکی هێواش، یاخود نزیکبوونەوەی شتێك لە شتێکی تر کەسیان هەست بە ئەوی تر نەکات هەستێکی کەم نەبێت، کە شایانی باس نەبێت، ماوەکەشی چەند چرکەیەك تێناپەڕێت، ئیتر چۆن دەبێتە چەند رۆژێکی ژمێردراو؟! ئەی ئەم شێوازە چۆن ئەبێتە سزا بۆ تاوانێك کە ئەنجام درابێت؟

---

٨٠- في ظلال القران، سيد قطب، سەرچاوەی پێشتر،ج١،ص٨١. التحرير و التنوير، الطاهر بن عاشور، سەرچاوەی پێشتر، مج١،ج١ص٥٨٠و٥٨١، بە دەستکارییەوە

٨١- الجامع لاحكام القران، القرطبي، سەرچاوەی پێشتر،ج٤،ص٥١، بە دەستکارییەوە

- بۆچوونی جولەکە بۆ ئەو سزا کەمە سەرچاوەکەی دوو شتە: یەکەمیان شەیتانە، کە ئەم بۆچوونەی بۆ رازاندوونەتەوە، دووەمیان: لووتبەرزی خۆیانە.
- هەواڵدانی خوای گەورە لەسەر زاری پێغەمبەرەکەیﷺ کە موشریك و بێ باوەڕەکان هەتاهەتایە لە ئاگردا ئەمێننەوە جولەکەش ئەگرێتەوە، چونکە جولەکە تەنیا سەرپێچیکارنین، بەڵکو موشریك و بێ باوەڕیشن.



## گومانی حەڤدە

## بانگەشـەی ئەوەی هەرکەس لەسـەر رێچـکەی گـاور و جـولەکە نەبێـت نـاچێتە بەهەشت *[٨٢](R)

### ناوەڕۆکی گومانەکە:

هەر دوو تاقمی گاور و جوولەکە دەڵێن گوایە هەر کەس لەسەر رێچکەی ئـەوان نـەبێت ناچێتە بەهەشت، ئەمەش بۆچوونیانە تا رۆژی دوایی، خوا ئەفەرموێت:

﴿ وَقَالُوا۟ لَن يَدْخُلَ ٱلْجَنَّةَ إِلَّا مَن كَانَ هُودًا أَوْ نَصَٰرَىٰ ۗ تِلْكَ أَمَانِيُّهُمْ ۗ قُلْ هَاتُوا۟ بُرْهَٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١١١﴾ ﴾ (البقرة).

(جوولەکە و گاورەکان) دەڵێن: هەرگیز کەس ناچێتە بەهەشتەوە بێجگە لـە جوولەکـە یان گاور، جا ئەوە ئاوات و خەیاڵی خۆیانە (تـۆش ئـەی محمـد ﷺ، یـان ئـەی ئیمانـدار) پێیان بڵێ: ئەگەر راستگۆن، بەڵگەتان لەسەر ئەم قسەیە بهێننە مەیدانەوە (ئەگـەر ئێـوە بەهەشتی بن، ئەوا موسوڵمانانیش بەهەشتیە چونکە باوەڕیان بە موسا و عیسا هەیە).

### رێگاکانی پووچەڵکردنەوەی گومانەکە:

١ئەم بانگەشە تەنیا ئاوات خواستنێکە کـە پێـی ناگـەن، چـونکە پێویسـتە بەڵگەیـەك بهێنن و ئەوەی پێ بسەلمێنن، چونکە بانگەشەی بێ بەڵگە وەرناگیرێت.

٢بەهەشت کراوەیە بۆ هەرکەسێك کاری بۆ بکات، دەستی بەسەردا نەگیراوە لە لایـەن تاقمێکەوە جیا لە خەڵکانی تر، ئەوەشی داوەری ئەکات لەنێوان خەڵکدا بریتیە لە خـوای پەروەردگار و ئەویشجل جلالە ئەزانی کێ خاوەن هەقە.

---

٨٢– ئەو ئایەتەی کە باس لەم گومانە ئـەکات بریتیـە لـە:(البقـرة/١١١، ئـەو ئایەتانـەش وەلامـی ئـەم گومانـە ئەدەنەوە بریتین لە: (البقرة/١١٣،١١١).

R لە "وەلامی قورئان بۆ ئەو بانگەشانەی جولەکە گوایە بەهەشت هەر هـی ئەوانـە نـەك خـەڵکی تـر" گومـانی پازدە بخوێنەوە لەم بەرگەدا.

**درێژەی بابەتەکە:**

جولەکە و گاور فریویان خواردووە بەوەی لەناویدان، دەڵێن گوایە هەرکەس لەسەر ڕێچکەی ئەوان نەبێت ناچێتە بەهەشتەوە، ئەمە بیروباوەڕیانە تا ئەمڕۆشی لەگەڵدا بێت، قورئان لێیانەوە دەگێڕێتەوە کە وتوویانە: ﴿ ..نَحْنُ أَبْنَٰٓؤُاْ ٱللَّهِ وَأَحِبَّٰٓؤُهُۥ ..﴿١٨﴾ ﴾ (المائدة)، جوولەکەو گاور دەیانوت: ئێمە ڕۆڵەی خواو خۆشەویست و نزیکی ئەوین. بێگومان خوای گەورەش بەدرۆی خستوونەتەوە و هەواڵی ئەوەی پێداون کە لەسەر تاوانەکانیان لە دواڕۆژدا سزایان ئەدات، ئەگەر بەو شێوەیە بێت کە ئەوان ئەیڵێن کارەکە بەو جۆرەی لێنەئەهات، هاوشێوەی ئەوەش ئەو بانگەشەیانە کە دەڵێن: ئاگر لێمان ناکەوێ چەند ڕۆژێکی ژمێرراو نەبێت، پاش ئەوە ئەگوازرێینەوە بۆ بەهەشت! خوای گەورەش وەڵامیان ئەداتەوەو ئەفەرموێ: ﴿ وَقَالُواْ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامًا مَّعْدُودَةً ۚ قُلْ أَتَّخَذْتُمْ عِندَ ٱللَّهِ عَهْدًا فَلَن يُخْلِفَ ٱللَّهُ عَهْدَهُۥٓ ۖ أَمْ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٨٠﴾ ﴾ (البقرة)، جوولەکەکان دەڵێن: (چەندە گوناهبارین) تەنها چەند ڕۆژێکی کەم لە دۆزەخدا دەمێنینەوە!! پێیان بڵێ: باشە، ئێوە پەیمانتان لە خوا وەرگرتووە، تا هەرگیز خوای گەورە پەیمان شکێنی نەکات؟! یان هەر دەتانەوێت شتێك بڵێن بەدەم خواوە کە هیچ بناغەیەکی نیەو هەر نازانن (چی دەڵێن)!!.

**یەکەم: خواستێکی بێ بەڵگە.**

خوای گەورە وەڵامی ئەو قسە هەڵبەستانەی دایەوە کە ئەوە تەنیا خواستێکە و پێی ناگەن﴿ ... تِلْكَ أَمَانِيُّهُمْ ...﴿١١١﴾ ﴾ ( البقرة)، ئەمە بانگەشەیەکی بێ بنەما و بێ بەڵگەیە، لێرەوە قورئانی پیرۆز بڕیار لەسەر یاسایەکی گرنگ ئەدات کە لە هیچ پەڕاوێکی ئاسمانی تردا بوونی نیە، ئەویش ئەوەیە کە قسە لەکەس وەرناگیرێت بە بێ بوونی

بەڵگە، بریار لەسەر بانگەشەی هیچ کەسێك نادرێت بە بێ بوونی بەڵگەیەك کە پشتڕاستی بکاتەوە:

والدعاوى ما لم تقيموا عليها
بينـات ابنـــاؤهـــا ادعياء[83]

ڕۆشنکردنەوەی ئەوەش ئەمەیە کە ئوممەتە پێشووەکان کە پەڕاوی ئاسمانیان بۆ هاتووە و ئەوانیان دوواندووە ئامادەییان تێدا نەبووە کە هزر و هۆشیان بخەنە کار و لە ڕێگەی بەڵگە و سەلماندنەوە کاروبارەکانیان ببەن بەڕێوە، بۆیە هەر ئەوەندەیان لێداواکراوە کە چاو لە پێغەمبەرەکانیان بکەن هەرچیان پێوتن با بەڵگەکانیشی نەزانن، ئەوان ئەرکی سەرشانیان بووە کە ئەوەی پێیان وتراوە جێ بەجێی بکەن، ئیتر بەڵگەکانیان زانیبێت یان نەیانزانیبێت، بەڵام قورئان بەشێوەیەکی تر خەڵك ئەدوێنێ و ئەفــــەرموێ: ﴿ قُلْ هَٰذِهِۦ سَبِيلِىٓ أَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ ۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِى ۖ وَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٨﴾ ﴾ (یوسف)، (ئەی پێغەمبەر تۆ) بڵێ: ئا ئەمە ڕێگەو ڕێبازمە: من و شوێنکەوتوانم بانگ دەکەین بۆ لای خوای پەروەردگار لەسەر بنچینەو بناغەیەکی ڕوون و ئاشکرا، پاکی و بێگەردیش بۆ زاتی پەروەردگارە، من هیچ کاتێك لە موشریك و هاوەڵگەران نیم.

وشەی"البصیرە" بەبەڵگەی ڕوون مانا کراوە، ئەمە ڕتمی قورئانە کاتێك باس لە تاك و تەنیایی و دەسەڵات و زانایی و دانایی خوا ئەکات بەڵگەی عەقڵی و بەڵگەی گەردوونی و بەڵگەی تیۆری و پراکتیکی ئەهێنێتەوە.

قورئان شوێنکەوتووانی فێرئەکات کە داوای بەڵگە بکەن لەو خەڵکانەی کە قسە هەڵدەبەستن، چونکە قورئان ئەوانی خستووەتەسەر بەرنامەیەکی بەڵگەدار، ئەو

---

٨٣- هەر بانگەشەیەك ئەگەر بەڵگەی بۆ نەهێنرایەوە ئەوە خەیاڵپڵاوی و لافلێدانەی خاوەنەکانیەتی.

کەسەشی خۆی یەقینی پێیە مافی خۆیەتی کە داوای بەڵگەش لە بەرانبەرەکەی بکات، لەسەر ئەم شێوازە پێشینانی ئەم ئوممەتە هەنگاویان ناوە، بەبەڵگە قسەیان کردووە، رێگرییان کردووە لە هەر شتێك کە بێ بەڵگە بووە.

**دووەم: بەهەشت کراوەیە بۆ هەر کەسێک کە کاری بۆ بکات.**

دووبارە خوای گەورە وەڵامیان ئەداتەوەو ئەفەرموێ: ﴿ بَلَىٰ مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَلَهُۥٓ أَجْرُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١١٢﴾ ﴾ (البقرة)، نەخێر وانییە، هەرکەس بەڕاستی خۆی بداتە دەست خواو لەهەمان کاتدا چاکەکارو موسوڵمان بێت، ئەوە پاداشتی خۆی لای پەروەردگاری دەست دەکەوێت و نەترسیان دەبێت و نەغەم و پەژارە دایان دەگرێت.

ئەمەش یانی: ئەوانەشی کە گاور و جوولەکە نین دەچنە بەهەشتەوە، چونکە رەحمەتی خوا تایبەت نیە بە گەلێکەوە جیاواز لە گەلانی تر، بەڵکو دەبەخشرێتە هەرکەس کە داوای بکات و کاری بۆ بکات، بەوەی تەنیا رووبکاتە خواو پەرستشەکان تەنیا بۆ ئەو بێت، ئەوە پاداشتی تەواوی خۆی وەرئەگرێت و رووبەڕووی ترس و نارەحەتی نابێتەوە.

بەمەش قورئان بنەمایەك دائەمەزرێنێت وەك بەشێك لە بینشی ئیسلامی ئەویش ئەوەیە کە پاداشت بەپێی کردەوە ئەدرێتەوە، دوور لە لاگیری بۆ ئوومەتێك یان تاقمێك یان تاکێکی تایبەت، ئەوەی پێوەرە موسڵمانبوون و چاك رەفتارکردنە نەك ناو و ناونیشان: ﴿ بَلَىٰ مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَلَهُۥٓ أَجْرُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١١٢﴾ ﴾ (البقرة)، نەخێر وانییە، هەرکەس بەڕاستی خۆی بداتە دەست خواو لەهەمان کاتدا چاکەکارو موسوڵمان بێت، ئەوە پاداشتی خۆی لای پەروەردگاری دەست دەکەوێت و نەترسیان دەبێت و نەغەم و پەژارە دایان دەگرێت.

پێشتریش هەمان بنەمای سەلماندووە بۆ سزادانیش وەك وەڵامێك بۆ ئەو قسەی ئەیانووت: ﴿ .. لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامًا مَّعۡدُودَةً ..(٨٠) ﴾ (البقرة)، فەرمووی:

﴿ بَلَىٰ مَن كَسَبَ سَيِّئَةً وَأَحَٰطَتۡ بِهِۦ خَطِيٓـَٔتُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ (٨١) وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ (٨٢) ﴾ (البقرة).

نەخێر وانییە، ئەو کەسەی گوناهو تاوان ئەنجام بدات و تاوانەکانی هەموولایەکی دابگرێت (ئاشکراو نادیاری) ئەو جۆرە کەسانە نیشتەجێی ئاگری دۆزەخن و بۆ هەمیشەیی تیایدا دەمێننەوە (لە هەر نەتەوەو هۆزو تیرەو تایەفەیەك بن). ئەو کەسانەش باوەڕیان هێناوەو کردەوە چاکەکان ئەنجام دەدەن، هەر ئەوانن نیشتەجێی بەهەشتن و تیایدا ژیانی هەتا هەتایی دەبەنە سەر (لە هەر چین و توێژو ڕەگەزێك بن).

ئەوە تاکە بنەمایە کە هەردوو لایەنی پاداشت و سزای ڕێکخستووە، هەردوو لایەن بە یەکسانی: ﴿ .. مَن كَسَبَ سَيِّئَةً وَأَحَٰطَتۡ بِهِۦ خَطِيٓـَٔتُهُۥ ..(٨١) ﴾ ( البقرة)، لەبەرانبەریدا ﴿ .. مَنۡ أَسۡلَمَ وَجۡهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحۡسِنٞ ..(١١٢) ﴾ ( البقرة)، دوو جۆر کەس ئەمیان خۆی بۆ خوا یەکلا کردووەتەوە و هەرچی سۆز و هەستەکانی هەیە ڕووی کردووەتە ئەو زاتە پاکە، لەبەرانبەریشدا کەسەکەی تر خۆی یەکلاکردووەتەوە بۆ گوناه و تاوانکاری.

گاور و جولەکە ئەو بانگەشە گەورە و گرانەیان ئەکرد، لە کاتێکدا هەر لایەکیان بەویتری ئەوت: تۆ لەسەر هیچ نیت! لە هەمان کاتدا موشریکەکانیش ڕووبەڕووی هەردولایان ئەبوونەوەو و ئەیانووت: ﴿ وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ لَيۡسَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ عَلَىٰ شَيۡءٖ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ لَيۡسَتِ ٱلۡيَهُودُ عَلَىٰ شَيۡءٖ وَهُمۡ يَتۡلُونَ ٱلۡكِتَٰبَۗ كَذَٰلِكَ قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ مِثۡلَ قَوۡلِهِمۡۚ فَٱللَّهُ يَحۡكُمُ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُواْ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ (١١٣) ﴾ ( البقرة)، جولەکە دەڵێن: گاورەکان لەسەر هیچ بنەماو ڕاستییەك نین، گاورەکانیش دەڵێن جوولەکە لەسەر هیچ بنەماو ڕاستییەك نین، لە کاتێکدا ئەوانە کتێبی (تەورات و ئینجیلیش دەخوێننەوە) هەروەها ئەوانەش کە هیچ

نازانن (له بتپەرستانی عەرەب) هەروا دەڵێن (بڕوایان بەئایینی ئیسلام و ئەوانەش نیە) خوایش له ڕۆژی قیامەتدا دادگایی نێوانیان دەکات لەوەی که ناکۆکن تیایدا.

مەبەست بە(الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ) عەرەبە نەخوێندەوارەکانە که خاوەنی پەڕاوی ئاسمانی نەبوون، که گاور و جولەکەکانیان ئەبینی دەستە دەستەو کۆمەڵ کۆمەڵ بەرانبەر یەکتر وەستابوون و یەکتریان تۆمەتبار ئەکرد و دەستیان بە هەندێ ئەفسانەوە گرتبوو کە زۆر له حەکایەت و ئەفسانەکانی عەرەبەکان بەرزتر نەبوون له بابەتی شیرك بڕیاردان بۆ خواو کوڕو کچ دانە پاڵ خواجل جلاله، بۆیە دەستبەرداری ئایینی گاور و جولەکەکان بوون و ئەیانووت: ئەمانەش لەسەر هیچ نین! قورئانیش هەموو ئەو شتانەی تۆمارکردووە کە لەسەر یەك وتوویانە، پاش ئەوەی ئەوە ڕەتئەکاتەوە کە گاورو جولەکە بانگەشەی تایۆبوونی بەهەشت ئەکەن لەسەر خۆیان، داوەری نێوانیشیان جێدەهێڵێ بۆ خوای گەورە، وەك ئەفەرموێ: ﴿ .. فَٱللَّهُ يَحۡكُمُ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُواْ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ ﴿١١٣﴾ ﴾ (البقرة).. خوایش له ڕۆژی قیامەتدا دادگایی نێوانیان دەکات لەوەی کە ناکۆکن تێیدا. خوا بڕیارەکانی دادپەروەرانەیە و دادوەرێکی پاکە و هەموو کارەکان بۆ ئەو ئەچنەوە..ئەم هەواڵەکردنی کارانە تەنیا بۆ لای خوا هەر ئەوە بەسوودە و تاکە ڕێگەیە لەگەڵ خەڵکانێکدا کە بڕیار و یاساکانیان لە مەنتیقەوە سەرچاوەی نەگرتبێت و پشت بە بەڵگە نەبەستن، پاش ئەوەی کە بانگەشەیان و بەرینەکەیان پووچ ئەکەیتەوە گوایە بەهەشت بە تەنیا هی ئەوانە و هەر ئەوان خەڵکی هیدایەتدراون.[٨٤]

---

٨٤- في ظلال القران، سید قطب، سەرچاوەی پێشتر،ج١،ص١٠٤.

**بەكورتی:**

- خوای گەورە گاور و جولەكەی بەدرۆخستووەتەوە كە دەیانووت: ئەوەی لەسەر رێچكەی ئەوان نەبێت ناچێتە بەهەشت! روونیشی كردەوە كە ئەوە تەنیا قسەیە و هیچ بەڵگەیەكیان نیە بۆی، تەنیا خواستێكە و كاریان بۆی نەكردووە، بۆیە پێی ناگەن.
- بەهەشت لە لایەن هیچ تاقمێكەوە دەستی بەسەردا نەگیراوە جیاواز لە خەڵكانی تر، بەڵكو بەهەشت هی هەموو كەسێكە كە كاری چاكەی بۆ بكات و رووی خۆی تەسلیم بە خوا بكات و كارچاك بێت.



## گومانی هەژدە

## بەخراپ زانینی ئەوەی قورئان بەشبەش هاتووەتە خوارەوە و هەمووی بەیەک جار نەهاتووەتە خوارەوە *[85](R)

### ناوەرۆکی گومانەکە:

موشریك و بێ باوەڕەکان رەخنە لە دابەزینی قورئان ئەگرن گوایە بۆچی بەش بەش هاتووەتە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەرﷺ [86]، وتیان: بۆچی قورئان بەیەك جار دانەبەزیوە بۆ سەر موحەممەدﷺ، وەك چۆن پەڕاوەکانی پێش ئەو بە یەك جار دابەزیوە وەك"تەورات، ئینجیل، زەبوور" و پەڕاوەکانی تریش، خوای گەورە ئەفەرموێ:﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوۡلَا نُزِّلَ عَلَيۡهِ ٱلۡقُرۡءَانُ جُمۡلَةٗ وَٰحِدَةٗۚ كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِۦ فُؤَادَكَۖ وَرَتَّلۡنَٰهُ تَرۡتِيلٗا ﴿٣٢﴾ ﴾ (الفرقــان). کافرەکان (بیانوویەکی تریان گرت و) وتیان: ئەوە بۆ قورئان بە یەك کەڕەت بۆی ڕەوانە ناکرێت، بێگومان ئێمە هەر بەو شێوەیە ڕەوانەی دەکەین، تا دڵی تۆ زیاتر دڵنیا بکەین، بەردەوام بەجوانی دایدەڕێژین و دەیگەیەنین.

### رێگاکانی پووچەڵکردنەوەی گومانەکە:

١. پەڕاوە ئاسمانیەکان بەیەکجار دانەبەزیوون.

٢. دابەزینی قورئانی پیرۆز بە بەش بەش(پارچە پارچە) هۆکاری هەیە:

---

٨٥-ئەو ئایەتەی کە باس لەم گومانە ئەکات بریتیە لە:(الفرقان/٣٢، ئەو ئایەتانەش وەڵامی ئەم گومانە ئەدەنەوە بریتین لە: (الفرقان/٣٢ ،٣٣، الاسراء/١٠٦).

R لە بابەتی "حیکمەت لە دابەزینی قورئاندا بە بەش بەش" رێگەی یەکەم لە وەڵامی گومانی پازدەدا لە بەشی نۆ (بەراوردی ئایینەکان) بخوێنەرەوە.

٨٦- بەش بەش بە زمانی عەرەبی پێی ئەوترێت"مونەججەم": مەبەست پێی ئەوەی کە قورئان بەش بەش و بەپێی بۆنە و رووداوەکان هاتووەتە خوارەوە کە لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) روویان داوە، یان بە پێی پێویستی خەڵکی دابەزیوە.

- دابەزینی قورئان بە بەش بەش بە پێی ڕووداوەکان بووە بۆ دامەزراندنی و دڵدانەوەی پێغەمبەری خوا بووەﷺ و هۆکارێکیش بووە بۆ باشتر حاڵیبوون و لەبەرکردنیان.
- بۆ ئاسانکردنی کارپێکردن بووە لە لایەن موسڵمانانەوە، چونکە ئەگەر بەیەکجار داببەزیایە ئەوا نەیاندەتوانی هەموو ئەو شتانەی کە فەرزکراوە جێبەجێ بکەن.
- دابەزینی قورئان بە بەش بەش بە پێی ڕوودانی ڕووداوەکان موعجیزەیە و لەبارە بۆ پڕکردنەوەی پێویستیەکان.
- وەڵامدانەوەی پێغەمبەرﷺ لە کاتی پرسیار لێکردن و دروستبوونی مشت و مڕ لەم حاڵەتەدا قورئان کێشەکانی یەکلا ئەکردەوە.

**درێژەی بابەتەکە:**

**یەکەم: پەڕاوە پێشووەکانیش بە یەکجار دانەبەزیوون.**

ئەم گومانە یەکێکە لە پەڵپ و بیانووە نابەجێك و خراپەکانی موشریکەکان، تانەیان لە قورئان ئەدا کە بۆچی بە بەش بەش هاتووەتە خوارەوە، ئەیانووت: ئەگەر قورئان لە لایەن خواوە هاتبێتە خوارەوە دەبوایە بە یەکجار بهاتایە، ئەمەش بێئاگایی ئەوان نیشان ئەدات سەبارەت بە پەڕاوی پێغەمبەران، چونکە ئەوانیش بە یەك جار دانەبەزیوون، بەڵکو ئەوانیش نیگایەکی بچڕبچڕ بوون، تەورات کە دابەزیوە بۆ موساسەلامی خوای لێبێت دە ڕستە بووە بە ئەندازەی سوورەتی"اللیل" بووە لە قورئاندا، ئینجیل پێش دەستکاریکردنەکەی تەنیا کۆمەڵە وتەیەك بووە و عیسا لە ناو خەڵکدا ئەبووتنەوە، بە هەمان شێوەش زەبوور بە پارچەپارچەیی دابەزیوە، موشریکەکان ئەمەیان لە یادکردووە یان هەر بێ ئاگا بوون لێی، ئەیانووت: ئەوە بۆ قورئان بە یەك جار دانەبەزی بۆ موحەممەدﷺ تا بڕوامان پێی بکردایە کە لە خواوە بۆی هاتووە! هەندێك ئەڵێن: ئەمە

قسەی جولەکە و گاورەکـان بـووە، ئەگـەر ئـەوە راسـت بێـت ئـەوە بوختانیـان کـردووە، چونکە ئەوان دەزانن کە تەورات و ئینجیل و زەبوور بـە بـەش بـەش دابـەزیوون و هـەموو بەشەکانی بەیەك کتێب دانەبەزیوون.[87]

**دووەم: هۆکارەکانی دابەزینی قورئان بە بەش بەش.**

- دامەزراندنی دڵی پێغەمبەرﷺ :

خـوای گـەورە وەڵامـی رەخنـەی بـێ بـاوەڕان و پـەڵپ و بیانووەکـانی موشـریکەکان ئەداتەوە سەبارەت بە دابەزینی قورئان بە بەش بەش و لە ماوەی بیست و سێ ساڵدا کـە ئەو شتە هیچ پەیوەندیەکی بەوانەوە نیە ئەمە بۆ دامەزرانـدنی دڵـی پێغەمبـەرﷺ بـووە، واتە بۆ بەهێزکردنی دڵی بووە تا بەرگەی ئەم قورئانە بگرێت و باش لێی تێبگات، خـوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿ ..كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِۦ فُؤَادَكَ ..(٣٢) ﴾ تا دڵی تـۆ زیـاتر دڵنیـا بکـەین (الفرقان).

"فوئاد" لێرەدا مەبەسـت پێـی ژیریيـە، ئـەم شـێوازە دابەزینـەش وا ئـەکات کـە دڵـی پێغەمبـەر دامـەزراو بێـت و دەربڕینـەکانی چەسـپاوتر بێـت و تووشـی شـڵەژان نـەبێت، حیکمـەت و فەلسـەفەی ئـەم جـۆرە دابەزینـە بـەم ئایەتـە کورتـە دەرئـەخات:( لِنُثَبِّتَ بِهِۦ فُؤَادَكَ )، چونکە بەرژەوەندی ژیری ئەوە ئـەخوازێت کـە دڵ و دەروون دامـەزراو بـن، وەك زەمەخشـەری تەفسـیرزان ئـەڵێت:" حیکەمـەت لـەم بـەش بەشـە بـەهێزکردنی عەقڵـە، بۆئەوەی لەبەری بکەیت و لێی حاڵ ببیت، چونکە فێرخواز ئەگەر جار دوای جـار و بـەش دوای بـەش زانسـتەکە وەربگرێـت مێشـك و دڵ بـەهێز دەبێـت بـۆ وەرگـرتنی، هـەروەها دابەزاندنی بە بەش بەش یارمەتیدەرە بۆ ئەو کەسانەی لەبەری دەکەن و لێـی رائـەمێنن، بەو جۆرە دابەزینە ماناکانی لای گـوێگر زیـاتر بەناخیـدا ئەچـێتە خـوارەوە، بۆیـە خـوای

٨٧- التحرير و التنوير، الطاهر بن عاشور، سەرچاوەی پێشتر، مج ١٩، ص١٨، بە دەستكارییەوە.

گەورە ئەفەرموێ: ﴿ وَقُرْءَانًا فَرَقْنَٰهُ لِتَقْرَأَهُۥ عَلَى ٱلنَّاسِ عَلَىٰ مُكْثٍ وَنَزَّلْنَٰهُ تَنزِيلًا ﴿١٠٦﴾ ﴾ (الاسراء)، ئێمە قورئانیشمان بەش بەش کردووە تا بە شێنەیی و بە ئارامی بیخوێنیتەوە بەسەر خەڵکیدا، هەر ئێمەش بەو شێوەیە دامانبەزاندووە (کە تۆ رایدەگەیەنیت).

● کارپێکردنی ئاسانترە:

یەکێکی تر لەو حیکمەتە گرنگانەی کە خوا -جل جلالە باسی کردووە لەسەر دابەزینی قورئان بە بەش بەش ئەوەیە کە قورئان ناسیخ و مەنسوخی تێدایە، هەندێکی تری وەڵامە بۆ پرسیارێکی دیاریکراو، بەش بەشمان کردووە تاپێغەمبەرﷺ باشتر لێی حاڵی ببێت، لە هەمان کاتدا بۆ ئەوەی ئاسانتر بێت بۆ ئەوانەی کاری پێ ئەکەن، بۆیە بەش بەشمان کردووە چونکە هەرکات نیگای نوێ دابەزیایە دڵی بەهێزتر ئەبوو بۆ وەرگرتنی،خوای گەورەش ئەفەرموێ: ﴿ ..وَرَتَّلْنَٰهُ تَرْتِيلًا ﴿٣٢﴾ ﴾ (الفرقان) ﴿ وَقُرْءَانًا فَرَقْنَٰهُ لِتَقْرَأَهُۥ عَلَى ٱلنَّاسِ عَلَىٰ مُكْثٍ وَنَزَّلْنَٰهُ تَنزِيلًا ﴿١٠٦﴾ ﴾ (الاسراء).

ئەمە یانی: بەش بەش دامانبەزاندووە چونکە بەرژەوەندی تێدایە، خۆ ئەگەر لە یەك کاتدا سەرجەم فەرزکراوەکان بدرایە بەسەر شانباندا ئەوە بەرگەیان نەدەگرت لێی هەڵئەهاتن، بەهەمان شێوە دابەزین بە پێی وەڵامی پرسیار و رووداوەکان بۆ ئەوەیە باشتر لێی حاڵی بن، چونکە تا زیاتر لێی حاڵی بن باشتر کاری پێئەکەن.

● گونجانی لەگەڵ دۆخەکاندا:

یەکێکی تر لەو بەرژەوەندیانە ئەگەر بەرەبەرە دانەبەزیایە بەپێی رووداوەکان ئەوا لە زۆربەی ئایەتەکاندا گونجانی لەگەڵ بارودۆخەکاندا نەئەبوو، ئەمەش ئەوپەڕی موعجیزە بوونە، پاشان تەحەداکردنیشیانە بەوەی با ئەوانیش بەو بەش بەشە نووسراوێك وەك ئەو بهێنن، هەر جارەو بەشێك دانەبەزی موعجیزەبوونی ئاشکراتر ئەکرد بەراوورد بە یەك جار دابەزینی،خوای گەورە ئەفەرموێ:﴿ ..وَنَزَّلْنَٰهُ تَنزِيلًا ﴿١٠٦﴾ ﴾ (الاسراء). ، واتە:بەرەبەرە

دامانبەزانـدووە، بەدارِشـتنێکی جـوان، بەبەڵگـەی روونـەوە، وشـەو ماناکـانی پێکـەوە گرێدراون،بەسەریەکدا کەڵکە نەبووە، لـە چـەند کـاتێکی جیـاوازدا دابـەزیوە، دواتـر کـە سورەتێك تـەواو دابـەزیوە ئایەتـەکانی بـە شـێوازێك رێکخـراوە وا دەزانرێـت بـە یـەکجار دابەزیووە، ئەمانەش بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە قورئـان لـە لایـەن خواوەوەیـە، چـونکە سروشتی نووسین و دارِشتنی مرۆڤـەکان بـە جۆرێکـە ئەگـەر لـە چـەند کـاتێکی جیـاوازدا نووسراوێك بنووسن ئەوە گرێدان و کۆکردنەوەی ئاسان نابێت بۆیان، بە روونی هەست بە بچرِبچرِی ئەکەیت تێیدا.[88]

- پێغەمبەرﷺ فێری بەڵگەکان ئەکات:

یەکێکی تر لە حیکمەتی دابەزاندنی قورئان بە بەش بەش ئەوەیە دڵنیایی دەبەخشێتە پێغەمبەرﷺ بـە بەڵگـەی بـەهێز هاوکـاری ئـەکات لـە کـاتی مشـتومرِ و گفتوگۆدا، یـان لەکاتی کردنی پێشنیارێکدا یان لەکاتی رەخنەگرتنێکدا، خوای گـەورە ئەفـەرموێ: ﴿وَلَا يَأْتُونَكَ بِمَثَلٍ إِلَّا جِئْنَاكَ بِالْحَقِّ وَأَحْسَنَ تَفْسِيرًا ﴿٣٣﴾﴾ (الفرقـــــان)، خوانەناســــــان هـــــیچ رەخنەیەکت لێ ناگرن، لە بەرامبەریەوە ئێمە حەقیقەت و راستیمان بۆ تـۆ نـەهێنا بێـت و بەجوانی هەموو شتێکت بۆ روون نەکەینەوە.

ئەوان بە شتی بەتاڵ و پرِووپووچ مشـت و مـرِ ئەکـەن، خـوای گـەورەش بـە بەڵگـەی بەهێز ئەو شتە پرِوپووچانەیان بەتاڵ ئەکاتەوە، راسـتی یەکێکـە لـە ئامانجـە بـەرزەکانی ئـەم قورئانـە و ئەیـەوێت بیچەسـپێنێ، نـەك تـەنیا بـۆ بردنـەوەی گفتووگـۆ و بەزانـدنی بەرانبەرەکان، بەڵکو راستی خۆی لە خۆیدا بەهێزە و خۆی ئەسەلمێنێ، و هیچ ناراستی و ناهەقیەك ناتوانێ خۆی پێوە ببپێچێت، خوای گـەورە بـەڵێن ئەداتـە پێغەمبەرەکـەی ﷺ کە پشتیوانی بکات لە هەر مشتومرِێکدا کە لەنێوان و ئەو و قەومەکەیـدا روونـەدات، خـوا

---

٨٨- سەرچاوەی پێشتر،ص٣٠، بەدەستکارییەوە.

هـەقێكی وای بـۆ ئـەنێرێت كـە ناهـەقی هـەموو ئەسـڕێتەوە، دەی ئـیتر ناهـەقی چـۆن ئەتوانێت لەبەرانبەر هەقێكدا كە خوا لە لایەن خۆیەوە بینێرێت خۆی رابگرێت.[89]

خـوا ئەفـەرموێت: ﴿ وَبِٱلْحَقِّ أَنزَلْنَٰهُ وَبِٱلْحَقِّ نَزَلَ ۗ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا مُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴿١٠٥﴾ ﴾ (الاسـراء)، ئێمە قورئانمـان لەسـەر بنچینەی حـەق و ڕاسـتی دابەزانـدووە، بـۆ چەسپاندنی حـەق و ڕاستیش دابەزیوە، ئێمە تۆمان ڕەوانە نەكردووە تەنها بۆ ئەوە نـەبێت كـە مـژدە بـەخش بیت (بە ئیمانـداران) و ترسـێنەر بیـت (بـۆ خوانەناسـان). ﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ۙ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ﴿٨٢﴾ ﴾ (الاسـراء)، ئێمـە لـە قورئـان ئایـەت و سوورەتانێك دادەبـەزێنین، كـە ببێتـە هـۆی شیفاو چارەسـەر بـۆ نەخۆشـیە دەروونـی و جەسـتەییەكان هــەروەها ڕەحمــەت و میهرەبــانیش، بــۆ ئیمانــداران، بــۆ ســتەمكارو خوانەناسـانیش تـەنها زیـادكردنی زەرەرو زیـان نـەبێت هیچـی تـر نـی یـە، هـیچ بـەهرەو سوودێكی لێ نابەن.

ئەمە حیكمەتی دابەزینی قورئانە بە بەش بەش، هەر جارەو چارەسەرێك دائەبـەزێنێت بۆ ئیمانداران، كاتێـك كـە شـتێك لـە شـەهەوات یـان لـە شـوبوهات ڕێگـەیان پێئـەگرێت و نارەخەتیان ئەكات، ستەمكارانیش جار دوای جار وێلتر ئەبن و مایەپووچتر ئەبن!

---

٨٩- في ظلال القران،سيد قطب، سەرچاوەی پێشتر،ج٥،ص٢٥٦٣.

**بەکورتی:**

- قورئان بە بەش بەش دابەزی بۆ ئەوەی ئاسانکاری بێت بۆ کارپێکردن، بۆ ئەوەش دڵی پێغەمبەرﷺ دامەزراوتر بکات.
- چی روویئەدا ئەگەر موسڵمانان بەیەکجار هەموو فەرزەکان دابەزیایەتە سەریان؟ ئایا نەئەبووە هۆی بێزاربوون و توانا نەمانیان بۆ جێبەجێکردنی ئەو فەرزانە؟
- ئەو کەسەی کەم کەم زانستی پێ ئەدەیت لەبەرکردن و تێگەیشتنی بەهێزتر ئەبێت، پێغەمبەریشﷺ بەو شێوازە مامەڵەی لەگەڵ هاوەڵاندا کردووە.
- دابەزینی قورئان بە پارچە پارچەیی رەچاوی بارودۆخی ئیماندارانی تێدایە و گونجاوە بۆ پلەی جێبەجێکردنی شەریعەت هەنگاو بە هەنگاو.



# گومانی نۆزدە

## بانگەشـەی ئەوەی قورئـان یاسـاکانی دژ بەیەکتـرین و مانـای دژ بەیەکتریـان تێدایە*[٩٠]

### ناوەڕۆکی گومانەکە:

موشریك و دووڕووەکان تانەیان لە قورئان ئەدا بەوەی لە نێوان یاساو ئەحکامەکانیـدا دژبەیەکی(تناقض) هەیە و ماناکانیان دژایەتی یەکتر ئەکەن، هەندێکیان هەنـدێکی تریـان بەدرۆ ئەخەنەوە.

### دوو ڕێگا بۆ پووچەڵکردنەوەی گومانەکە:

١. بانگکردنیان بۆ تێگەیەشتن و تێڕامان لـە قورئـان و حـاڵیبوون لـە حـوکم و ماناکـانی، ئەگەر قورئان لە جگە لە خـواوە بهاتایـە ئەبوایـە نـاکۆکی و شـتی پێچـەوانەی زۆری تیـا دەبوو.

٢. قورئانی پیرۆز هیچ جۆرە نـاکۆکی و پێکدادانێکی تێـدا نیـە و سـەلامەتە لـەو شـتانە، ئەوەی کە خەڵك لێی حاڵی نابێ کورتبینی خۆیانە.

### درێژەی وەڵامەکە:

#### یەکەم: هەر کەس لە قورئان تێبگات دەزانێ کە لە لایەن خواوە هاتووە.

قورئان بانگی موشریك و دووڕووەکان ئەکات تا لە قورئان رابمێنن، و لەوە حاڵی بـبن کە خوا کردوویە بە بەڵگە بۆیان و پێویستە شوێن پێغەمبەرەکەی بکەونﷺ، بـۆ ئـەوەی بۆیان دەربکەوێ کە قورئان لای خواوە هاتووە، بەبەڵگەی ئەوەی واتاکانی ورد ڕێکخراون و و مانا و یاساکان یەکتری تەواو ئەکەن و شایەتی بـۆ یـەکتری ئـەدەن بـە توێژینـەوەی

---

٩٠-ئـەو ئایەتانـەی وەڵامـی ئـەم گومانـە ئەدەنـەوە بـریتین لـە:(النسـاء/٨٢الکهـف/١،فصـلت/٤٢، البقـرة/٢٢، الطارق/١٣،١٤، الزمر/٣).

ورد، دەی ئەگەر ئەمە لەلایەن جگە لە خواوە بوایە ئەوە یاساکانی پشتیان لەیەکتری ئەکردو ماناکانیان دژ بەیەکتری ئەوەستانەوەو ئەمیان خراپی ئەویتریانی دەرئەخست و لە کۆتاییدا جیاوازییەکی زۆری تێدا ئەبوو.

(قەتادە) رەحمەتی خوای لێبێت دەڵێت: لەم ئایەتەدا فەرموودەی خوا ناکرکی تێدا نیە، بەڵکو راست و رەوایە و دوورە لە ناڕەوایی، ئەوە قسەی مرۆڤەکانە جیاوازی تێدەکەوێت، خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَۚ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُوا۟ فِيهِ ٱخْتِلَـٰفًا كَثِيرًا ﴿٨٢﴾ ﴾ (النساء)، ئەوە بۆ ئەوانە سەرنجی قورئان نادەن و لێکی نادەنەوەو لێی وردنابنەوە؟ خۆ ئەگەر لە لایەن کەسێکی ترەوە بوایە جگەلە خوا بێگومان جیاوازی و دژایەتیەکی زۆریان تێدا دەدۆزیەوە.

ئەوانەی بەراستی راماون لە قورئان دەزانن کە لەلایەن خواوە هاتووە، ئەگەر لە لایەن جگە لە خواوە بهاتایە دەبوایە جیاوازی و ناکۆکی زۆری تێدا ببینرایە، بەهۆی دەستەوسانی لە هێنانی هاوشێوەی ئەو لە وێناکردنی وێنەکان بە بێ جیاوازی و دەقاودەق، چ لە گێڕانەوەی رووداوەکانی رابردوو کە موحەممەدﷺ نەیبینیوون، چ لە هەواڵدان بە کۆمەڵە بابەتێکی زۆر لە داهاتوو کە رێك بەو جۆرە بەو جۆرە هەواڵی لەسەر دراوە هاتوونەتە دی، هەروەها روونکردنەوەی نهێنیەکانی ئێستا لە رازی دڵ و نهێنی ویژدان، نە موحەممەدﷺ نە جگە ئەویش توانای هێنانی هاوشێوەی ئەویان نیە لە بەیانکردنی بنەمای بیروباوەڕ و بناغەی دەستوور و فەلسەفەی رەوشت و ئاکار، سیسەتی گەل و نەتەوەکان و بابەتە کۆمەڵایەتیەکان و شیّ، ازەکانی پەندهێنانەوەو لە جیاوازیەکانی ناو دروستکراوەکان و نمونەهێنانەوە و دووبارەکردنەوەی چیرۆکێك بە چەند شێوازێکی کاریگەر، لەسەر ئەمانەشەوە قورئان پڕیەتی لە زانستی خودایی و هەواڵ لە جیهانی نادیار و رۆژی دوایی و ئەوەشی لەوێ ئەگوزەرێت لە هەژمارکردنی کردەوەکان و دیاریکردنی پاداشت..سەرجەم ئەمانە لەگەڵ سروشتی مرۆڤەکاندا یەك ئەگرنەوە،

هەروەها گرێدانی ئایەتەکان پێکەوە ئامانجێکە لە ئامانجەکان لای ئەوەی خاوەنی حیکمەت و کوت و پووختبێژییە، بەم جۆرە تەدەبور و رامانە لە قورئان خاوەنەکەی حاڵی ئەکات کە قورئان لە لایەن خواوە هاتووە.[91]

**دووەم: گێل و بێئاگایە ئەو کەسەی دەڵێ قورئان لە جگە لە خواوە هاتووە.**

بێ ئاگایی خەڵك لە بارەی قورئانەوە دەگەڕێتەوە بۆ بێ عەقڵی و کاڵفامیان، چونکە ئایەتە"موحکەمەکان" و ئایەتە "موتەشابیهەکان"یش هەر لە لایەن خواوە هاتوون و راست و رەوانن، بەریەککەوتن نیە لە نێوانیاندا ئەوەی کە خەڵك نایزانێ لە بابەتی قورئاندا پێویستە بگەڕێنرێتەوە بۆ شارەزایان لە قورئاندا، بۆیە خوا ستایشی شارەزایان لە قورئاندا ئەکات کاتێك کە ئەڵێن: ﴿ .. كُلٌّ مِّنْ عِندِ رَبِّنَا .. ﴿٧﴾ ﴾ (آل‌عمران)، هەموویان هەر لە خواوە هاتوون، واتە موحکەمە و موتەشابیهەکانیش هەموو راست و رەوانن، بۆیە ئەو شارەزایانە موتەشابیهیان گەڕاندووەتەوە بۆ ژێر موحکەمەکان و بەوەش هیدایەتیان دەست کەوتووە.

هەروەها خوای گەورە زەمی ئەوانە ئەکات کە لە راستی لایانداوە و دوای موتەشابیهات کەوتوون و بۆ نانەوەی گێچەڵ و فیتنە و موحکەمیان بردوەتەوە بۆ ژێر موتەشابیهات و بەو شێوەیە لە رێگەی راست لایانداوە.

یەکێکی تر لە وەڵامەکانی قورئان لەسەر ئەم بانگەشە ئەوەیە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ ٱلْحَدِيثِ كِتَـٰبًا مُّتَشَـٰبِهًا مَّثَانِىَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهْدِى بِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴿٢٣﴾ ﴾ (الزمر)، خوا جل جلا لە جوانترین و پیرۆزترین فەرمایشتی ناردۆتە

---

٩١- التحرير و التنوير، الطاهر بن عاشور، سەرچاوەی پێشتر،مج٣،ج٥،ص١٣٧و١٣٨، بە دەستكارییەوە. الجامع لاحكام القران، القرطبي، سەرچاوەی پێشتر،ج٥،ص٢٩٠، بە دەستكارییەوە.

خوارەوە کە ئەم قورئانەیە، (لە جوانی دارشتندا) بابەتەکانی لە یەك دەچن، هەندێك باسیشی بەشێوازی جیاواز تیادا دووبارە بۆتەوە، جا کارکردی ئەم قورئانە ئەوەیە کە: تەزوو دەهێنێت بە گیان و پێستی ئەوکەسانەدا کە ترسی پەروەردگاریان لە دڵ و دەروونداهەیە، پاشان گیان و پێست و دڵیان نەرم و ئامادە و چالاك دەبێت بۆ یادی خواو خواپەرستی ئا ئەوە هیدایەت و ڕێنموویی خوایە کە هەر کەس شایستە بێت هیدایەت و ڕێنموویی دەکات بۆ پلەو پایە بەرزانە، ئەوەش کە ڕێبازی خوا ون بکات کەس نیە ڕێنموویی بکات..قورئان باشترین فەرموودەیە هیچ کتێبێك لەو باشتر نیە،بۆیە ناکرێ باشترین فەرموودە شپرزی و شتی ناکۆکی لەگەڵ یەکی تێدا بێت، مانای"موتەشابیە" لێرەدا مەبەست لێی قورئانە، کە هاوشێوەی یەکترن لە ڕێکخستن و و ڕەوانبێژی و و ئەو ئامانجانەی کە هەوڵی بۆ ئەدات، نە شێوازەکەی و نە واتاکانی جیاوازی و ناکۆکی تێدا بەدی ناکرێت، بۆیە هەندێکیان لە هەندێکی تریان ئەچن، لە جوانی و داناییدا، وەهەندێکیان ئەوانی تریان پشت ڕاست ئەکەنەوە بەو پەڕی زمان پاراوی و ڕەوانبێژی و مەزنی.

بەهەمان شێوە خوای گەورە نەفی هەموو جۆرە گومان و دوودڵییەکی کرد سەبارەت بە کتێبە پیرۆزەکەی و فەرمووی: ﴿ ذَٰلِكَ ٱلْكِتَٰبُ لَا رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٢﴾ ﴾ (البقرة)، ئەو قورئانە کتێبێکە هیچ گومانێکی تێدا نیە، (کە لە لایەن خوای پەروەردگارەوە ڕەوانە کراوە بە جبرەئیلدا بۆ پێغەمبەر ﷺ کە مایەی ڕێنمووی و سەرچاوەی هیدایەتە بۆ خواناسان و پارێزکاران (کە ئەوانەن فەرزەکان جێبەجێ دەکەن و لە حەرام خۆیان دەپارێزن، لە ڕووی بیروباوەڕو کردارو گوفتارەوە).

خوای گەورە بەم وشانە کتێبە پیرۆزەکەی ئەکاتەوەو و کێبەرکێ ڕائەگەیەنێت لەبەرانبەر هەرکەسێکدا کە ئەیخوێنێتەوە، هەڵە یان گومان و دوو دڵی تیابدۆزێتەوە، بە پێچەوانەی سروشتی مرۆڤەکان کە کتێبەکانیان بە هێنانەوەی پۆزش دەست پێئەکەن،

له بوونی هەڵە و کەم و کورتی داوای لێبووردن لەو هەڵە و کەموکورتیەکانیان ئەکەن کە ئەنجامیان داوە، بەڵام قورئان خوار و خێچی و کەم و کورتی لە ڕێکخستنیدا نیە و ماناکانی جیاوازییان تێدا نیە، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبۡدِهِ ٱلۡكِتَٰبَ وَلَمۡ يَجۡعَل لَّهُۥ عِوَجَاۜ ۝١ ﴾ (الكهف)، سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی ئەم کتێبە کە قورئانە بۆ سەر بەندەی خۆی (محمد ﷺ) دابەزاندووە، هیچ کەم و کووڕی و ناتەواویەکیشی بۆ ڕەوا نەداوە.

بەم جۆرە هیچ ڕێگەیەك بۆ ناڕەوابوونی، چونکە لە لایەن پەروەردگاری جیهانیانەوە دابەزیوە، خوا ئەفەرموێ: ﴿ لَّا يَأۡتِيهِ ٱلۡبَٰطِلُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَلَا مِنۡ خَلۡفِهِۦۖ تَنزِيلٞ مِّنۡ حَكِيمٍ حَمِيدٖ ۝٤٢ ﴾ (فصلت)، هیچ ناحەقی و نادروستی و ناتەواویەك ڕووی تێ ناکات لە هیچ کاتێکدا و لەهیچ لایەکەوە ڕەوانەکراو و نێردراوی زاتێکە کە خاوەنی حیکمەت و داناییە و شایانی سوپاس و ستایشە. ئەم قورئانە کتیبێکی مەزن و جیاکەرەوەیە، وەك ئەفەرموێ: ﴿ إِنَّهُۥ لَقَوۡلٞ فَصۡلٞ ۝١٣ وَمَا هُوَ بِٱلۡهَزۡلِ ۝١٤ ﴾ (الطارق)، بەڕاستی ئەم قورئانە گوفتارێکی جیاکەرەوەیە (جیاکەرەوەی حەق و ناحەق، ڕاست و درۆ، چاك و خراپ و، ... هتد). ئەم قورئانە گوفتارێکی گاڵتە نیە.[٩٢]

**بەکورتی:**

- قورئان نیگای پەروەردگارە بۆیە لە ناکۆکی و شپرزەیی، ئەگەر لە لایەن جگە لە خواوە بهاتایە ئەوە جیاوازی و بەریەککەوتنی زۆری تێدا ئەبوو.
- خەیاڵکردنی نەفامەکان لە بوونی بەریەککەوتن لە حوکمەکانی قورئاندا و جیاوازی لە ماناکانیدا ئەگەڕێتەوە بۆ کاڵفامی و تێنەگەیشتن و حاڵینەبوون لە ماناکانی.

٩٢-التحرير و التنوير، الطاهر بن عاشور، سەرچاوەی پێشتر، مج١ج١،ص٢٢٣-٢٢٤.

- سەرجەم ئایەتەکانی قورئان ئاماژەیە بۆ مەبەستەکەی، ئەگەر ئەو کینە لە دڵانە تێڕابمانایە ڕێگەی ڕاستیان ئەدۆزیەوە و تووشی خێر دەبوون، ڕزگاریشیان دەبوو لەو فیتنە و گێچەڵەی کە لە بێباوەڕییانەوە سەرچاوەی گرتووە.

*** *** ***

## گومانی بیست

## بانگەشــەکردنی ئەوەی کە قورئـــان جـــادوویەکی ئاشــکرایە و مـــوحەممەدﷺ هێناویەتی *[93]

**ناوەڕۆکی گومانەکە:**

موشریکەکان ئەڵێن: گوایە ئەو قورئانەی موحەممەدﷺ هێناویەتی تەنیا جادوویەکە و موحەممەد لە کەسانی ترەوە وەریگرتووە و ئەیگوازێتەوە: ﴿ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٧﴾ ﴾ (الاحقـاف)، لـە کاتێکـدا ئایەتـە ئاشــکراو ڕوونەکانی ئێمە بەسەریاندا بخوێنرێتەوە، ئەوانەی کەبێ باوەڕ بوون بەو حەق و ڕاستیەی کەبۆیان دێت دەڵێن : ئەمەجادوویـەکی ئاشـکرایە، هـەروەها ئەفـەرموێ: ﴿ أَكَانَ لِلنَّاسِ عَجَبًا أَنْ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ رَجُلٍ مِّنْهُمْ أَنْ أَنذِرِ ٱلنَّاسَ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَنَّ لَهُمْ قَدَمَ صِدْقٍ عِندَ رَبِّهِمْ ۗ قَالَ ٱلْكَٰفِرُونَ إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ مُّبِينٌ ﴿٢﴾ ﴾ (یـونس)، ئایـا چ ســەر ســوڕمانێکی بـۆ خــەڵکی تێدایەکەوەحی و نیگامان نارد بـۆ پیاوێـك لـەخۆیان کـە: خـەڵکی بێـدار بکـەرەوەو دایـان بچڵەکێنە (تا خواناس و خواپەرەست بن) و مژدەبدەبەوانەی باوەڕیان هێناوەکـەبێگومان پلەو پایەی بەرزو بڵندیان بۆ هەیەلای پەروەردگاریان وتیان: بەڕاستی ئەم (محمـد نـاوە) جادووگەرێکی ئاشکرایە.

**ڕێگاکانی پووچەڵکردنەوەی گومانەکە:**

١. هەڵیت و پەڵیتە بێ بنـەماکانی موشـریکەکان سـەبارەت بـە قورئـان و موحەممـەدﷺ بەڵگەیە لەسەر درۆکانیان.

---

٩٣- ئەو ئایەتانەی کە باس لەم گومانە ئەکەن بریتین لە:(الصافات/١٥،المدثر/٢٤،سبا/٤٣، الاحقـاف/٧، ئـەو ئایەتانەش وەڵامی ئەم گومانە ئەدەنەوە بریتین لە:(الاسراء/٨٨، هود/١٣،یونس/٣٨).

٢. روونكردنەوەی حەقیقەتی جادوو و پووچەڵكردنەوەی ئەو بانگەشەی گوایە قورئانیش جادوو بێت.

٣. ئەگەر قورئان جادوو بوایە ئەوا ئەوانیش خۆیان فێری جادوو ئەكرد و هاوشێوەی قورئانیان ئەهێنا، بەلاّم دەسەوسان بوون لە ركابەرێتی كردنیان بۆ قورئان تەنانەت بۆ كورتترین سوورەتیش.

٤. موشریكەكان هیچ بەڵگەیەكیان نیە لەسەر بانگەشەكەیان بۆیە قسەكەیان پووچە.

٥. قورئان بانگی موشریكەكان ئەكات بۆ بەكارهێنانی پرۆگرامێكی راست لە لێكۆڵینەوە و دووركەوتنەوە لە بڕیاردانی بێ بنەما.

٦. قورئان هەڕەشەی لە موشریكەكان كردووە لەسەرەنجامی درۆو قسە هەڵبەستەكانیان.

**درێژەی بابەتەكە:**

**یەكەم: هەڵێت و پەڵێتی موشریكەكان.**

موشریكەكان جاریّ بوختان بۆ قورئان ئەكەن كە جادووە، جارێكی تر بوختان ئەكەن بۆ موحەممەد ﷺ كە جادووگەرە! خوای گەورەش ئەفەرمویّ: ﴿ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٧﴾ ﴾ (الاحقاف)، لە كاتێكدا ئایەتە ئاشكراو روونەكانی ئێمە بەسەریاندا بخوێنرێتەوە، ئەوانەی كەبێ باوەڕ بوون بەو حەق و ڕاستیەی كەبۆیان دێت دەڵێن : ئەمەجادوویەكی ئاشكرایە، هەروەها ئەفەرمویّ: ﴿ أَكَانَ لِلنَّاسِ عَجَبًا أَنْ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ رَجُلٍ مِّنْهُمْ أَنْ أَنذِرِ ٱلنَّاسَ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَنَّ لَهُمْ قَدَمَ صِدْقٍ عِندَ رَبِّهِمْ ۗ قَالَ ٱلْكَٰفِرُونَ إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ مُّبِينٌ ﴿٢﴾ ﴾ (یونس)، ئایا چ سەرسوڕمانێكی بۆ خەڵكی تێدایەكەوەحی و نیگامان نارد بۆ پیاوێك لەخۆیان كە: خەڵكی بێدار بكەرەوەو دایان بچڵەكێنە (تا خواناس و خواپەرەست بن) و مژدەبدەبەوانەی باوەڕیان هێناوەكەبێگومان

پلەو پایەی بەرزو بڵندیان بۆ هەیەلای پەروەردگاریان وتیان: بەڕاستی ئەم (محمد ناوه) جادووگەرێکی ئاشکرایە.

دەی ئەمە سەرلێشێواوی و هەڵیت و پەڵیت ووتنە لەبارەی قورئان و پێغەمبەری خواوەﷺ، ئەو ئایەتی پێشوویسوورەتی(یونس) "لَسَاحِرٌ" هەریەك لە(ئەبوعامیر و ئەبو عەمر و نافع و یەعقوب و ئەبوجەعفەر) بە(لَسِحرٌ)خوێندوویانەتەوە، ئەوانیتر بە "لَسَاحِرٌ" خوێندوویانەتەوە، مەبەست لێی ئەوەیە کە قورئان جادووە و موحەممەدیشﷺ جادووگەرە! هەردوو خوێندنەوەکە هاتووە، هەردوو خوێندنەوەکەش بەڵگەیە لەسەر سەلماندنی پەیامی پێغەمبەرﷺ.

گوتووشیانە(سحر مبین)، چونکە ئەو ئەیلێت سەرسوڕهێنەرە، بەلأم وا باشتر بوونەگەر تێڕامانیان هەبووایەبیانوتایە: موحەممەد پێغەمبەرە و نیگای بۆ دێ، چونکە ئەوەی کە دەیلێ موعجیزەیە و کەس ئەوەی ئەوی پێناوترێ، لەبەرانبەردا جادوو راستیە گەردوونیە گەورەکان لە خۆناگرێت، یان بەرنامەکانی ژیان و رێبازی رێنماییکردن و یاسادانان بۆ کۆمەڵگەیەکی پێشکەوتوو ناگرێتەخۆی، کە پشت بە رێبازێکی تاقانە ببەستێت.

نیگاوەحیلای ئەوان لەگەڵ جادوودا تێکەڵ ئەبوو، چونکە ئایین و جادوو لە ئایینی بتپەرستیدا تێکەڵ بووبوون بەیەکتری.[٩٤]

**دووەم: جادوو جیاوازە لە قورئان.**

ئەو قسەیان کە دەڵێن: قورئان جادووەو جادووگەرێك هێناویەتی، ئەو قسەیان دانپێدانانێکە بەوەی ئەو دوانە لە ئاستی مرۆڤی ئاسایی بەرزترن، ئەوەی زانراو بوو لایان ئەوەبوو کە ئەو شتانە لەتوانای بەشەری ئاساییدا نەبوو، بۆیە ئەم قورئانەشیان ناو نابوو

٩٤–في ظلال القران، سيد قطب، سەرچاوەی پێشتر، ج٣، ص١٧٦١.

جادووسحر چونكه له دەرەوەی سروشت و باوی خەڵكدا بوو، هێزێكی كەمەندكێشی وای هەبوو دڵ و دەروونەكانی ڕائەكێشا بۆ لای خۆی و بۆ ئیمانهێنان! دەروونەكانی فێری ئەوە ئەكرد دونیایان لە لا هیچ بێت و چێژە دونیاییەكانیان لە بەر خوا بەلاوە گرنگ نەبێت، تەنانەت برا لە براو لە دایك و لە باوكی و لە ژنی كە دالّدەی ئەدات لە یەكتری جیائەكاتەوە، جادوو چەند شتێكی شاراوەی تایبەتە خەڵك لە یەكترییەوە فێری دەبن، جا یان ئەوەتا فێڵ و چاوبەستكردنە، یاخود چەند شتێكی زانستی تایبەتە و نادیارە لای بینەر، یان كاریگەریەكی قوڵە لەسەر دەروون و بەجۆرێك ئیرادەی خاوەنەكەی تەسلیم بەو حاڵەتە ئەبێت، ئەمانە كۆمەڵە رایەكی هاوبەشن لە نێوان ئەو كەسانەی شارەزان و سەرقاڵی ئەو كارەن..

**سێیەم: دەستەوسانی موشریكەكان لەبەرانبەر ڕووبەڕووبوونەوەی قورئان.**

بۆ عەرەب و ناعەرەب ئاشكرا بوو كە قورئان جادوویەكی كاریگەر نیە لە ڕێگەی فێربوونەوە وەربگیرێت، بەڵكو قورئان كۆمەڵێك زانستی باڵایە لە بواری بیروباوەڕو یاساو دەستوور و ئاكاردا، عەقڵەكان بەرز رائەگرێت و دەروونەكان خاوێن ئەكاتەوەو گونجاوە بۆ خەڵك، مرۆڤ دەستەوسانە لە بەرانبەر شێواز و ڕێكخستن و داتا و ڕێنمونی و یاسادانان و هەواڵدانی لەنادیارەكان و موحەممەدیش ﷺ دەیگەیەنێت، ئەو توانای بەسەر هیچ شتێكدا نیە، بێگومان جگە لەویش دەسەوسانن لەو كارە، خوای گەورە بە قورئان كێ بەركێی لەگەڵ عەرەبەكاندا ئەكات و داوایان لێئەكات هاوشێوەی ئەو، یاخود"دە" سوورەتی هەڵبەستراو یاخود سورەتێك بهێنن ، كەچی هەر دەستەوسان بوون.خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿ قُل لَّئِنِ ٱجْتَمَعَتِ ٱلْإِنسُ وَٱلْجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأْتُوا۟ بِمِثْلِ هَـٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِۦ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا ﴿٨٨﴾ ﴾ (الاسراء) ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: سوێند بە خوا ئەگەر هەموو ئادەمیزادو پەریەكان كۆ ببنەوەو (هەوڵی بەردەوام بدەن تا)

قورئانێکی وەکو ئەمە دانێن و بیهێننە (مەیدان) ناتوانن کاری وابکەن و ناتوانن لە وێنەی بهێنن، ئەگەر چی هەموو لایەکیان ببنە پشتگیرو یارمەتیدەری یەکتر. ﴿أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ قُلْ فَأْتُوا بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِ مُفْتَرَيَاتٍ وَادْعُوا مَنِ اسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿١٣﴾﴾ (هود)، (لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگانەدا) ئەوانە دەڵێن کە محمد قورئانی هەڵبەستووە، پێیان بڵێ: جا ئێوەش دە سوورەتی هەڵباستراو وێنەی ئەم قورئانە بهێنن، هەر کەسیش لە خوا گەورە بەدەر، دەتوانن، بانگ بکەن (بۆ هاوکاریتان پەنای بۆ بەرن) ئەگەر ڕاست دەکەن. ﴿أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ قُلْ فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّثْلِهِ وَادْعُوا مَنِ اسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٣٨﴾﴾ (یونس)، بەڵکو (لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگانەدا) ئەوانە دەڵێن کە محمد ﷺ قورئانی هەڵبەستووە، بڵێ: دەئێوەش سوورەتێك وەك سوورەتەکانی داڕێژن و بیهێنن، داوا بکەن لەهەر کەسێکی تر کە دەتوانن جگە لەخوا (کەیارمەتیتان بدات) درێغی مەکەن ئەگەر ڕاستگۆن.

ئەگەر قورئان جادوو بوایە، دەیانتوانی فێری ببن و هاوشێوەی یاخود هەندێ سوورەت بهێنن، بەڵام هەموویان دەستەوسن بوون لەو کێبەرکێیەدا، کەواتە سەلما کە موحەممەدﷺ پێغەمبەری خوایە و ئەوەشی کە هێناویەتی نیگایە لەیەن خواوە.

**چوارەم: بانگەشەی موشریکەکان بێ بەڵگەیە.**

لە وەڵامێکی تری قورئاندا روونی کردووەتەوە کە ئەوان بوختان و درۆی بێ بنەما دەکەن، هیچ زانیاری و بەڵگەیەك پاڵپشتی بانگەشەکەیان ناکات کە دەڵێن: قورئان جادوویەکی ئاشکرایە، ئەوە درۆ هەڵبەستنێکە هەوڵیانداوە لەو ڕێگەیەوە گەورەیی و پیرۆزی قورئان لە دڵەکاندا نەهێڵن، بە هەمان شێوەی تۆمەتەکانی دیکەیان کە گومانیان وابوو توانای ڕووبەڕووبوونەوەی بەڵگە روون و ئاشکراکانی قورئان ببنەوە و بکەونە نێ،ان قورئان و دڵی مرۆڤەکانەوە،هەوڵەکانیان تەنیا کۆمەڵێك درۆی هەڵبەستراو بوو بۆ

چەواشەکردنی جەماوەر ئەوانەی ئەو قسانەیان دەکرد خانەدانەکان بوون، دڵنیا بوون لەوەی کە قورئان لە سەرووی توانای مرۆڤەوەیە، بۆ ئەم مەبەستەش کۆمەڵێ لەو پیاوماقوڵانە لە نێوان خۆیاندا لە بارەی قورئان و موحەممەدەوەﷺ راوێژیان کردووە پاشان ئەم پیلانەیان دارشتووە، بۆ دوورخستنەوەی جەماوەر لە و قورئانەی کە دڵەکانی کەمەنکێش کردووەو دەروونەکانی پابەندی خۆی کردووە.

قورئان کارەکانی ئاشکرا کردن و بڕیاری لەسەر نەخوێندەواریان داوە کە نەیانتوانیوە کتێبێك بهێنن و بەراووردی بکەن بە کتێبەکانی تر و لە رێگەیەوە نیگای خوا بناسن، فەتوا بدەن ئەوەی کە ئەمڕۆ بۆیان دابەزیوە نە کتێبە و نە وەحی، وە لە لایەن خواوە نیە و لە لایەن پێغەمبەرەوە بۆیان نەهاتووە، کەواتە ئەوانە وڕێنە بە شتێکەوە ئەکەن کە هیچ زانیارییەکیان نیە لەسەری و هیچی لەبارەوە نازانن، خوا ئەفەرموێ: ﴿ وَمَآ ءَاتَيْنَٰهُم مِّن كُتُبٍ يَدْرُسُونَهَا ۖ وَمَآ أَرْسَلْنَآ إِلَيْهِمْ قَبْلَكَ مِن نَّذِيرٍ ﴿٤٤﴾ ﴾ (سبأ) (جا خۆ ئێمە) هیچ کتێب و نامەیەکمان بۆ نەناردوون تا بیخوێنن (تا لەڕووی ئەوەوە تۆ بەدرۆ بخەنەوەو بڕوات پێ نەکەن)، وە پێش تۆش هیچ پێغەمبەرێکمان بۆ ڕەوانە نەکردوون (تا لە سزای بێ ئیمانی بیانترسێنێت).

**پێنجەم: قورئان داوایان لێئەکات لەسەر پرۆگرامێکی راست و دروست بەدوای راستیەکان بکەون.**

قورئان وەڵامی داونەتەوەو بانگی کردووەن بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر راستیەکان لەسەر بنەمای پرۆگرامێکی راست و دروست و بێ لایەن و بە شێوازێکی بابەتیانە و دوور لە هەواو ئارەزوو و تێکەڵ بە بڕیارە پێشووەکانیان، ئەمە بانگێهێشتکردنە بۆ پێڕەوکردنی میتۆدێکی لەو شێوەیە بۆ لێکۆڵینەوە لە هەق و راستی و جیاکردنەوەی راست و درۆ و هەڵسەنگاندنی ئەو واقیعەی کە رووبەڕووی دەبنەوە بە بێ ساختەکاری و دوودڵی، خوا

ئەفــــــەرموێ: ﴿ ۞ قُلْ إِنَّمَآ أَعِظُكُم بِوَٰحِدَةٍ ۖ أَن تَقُومُوا۟ لِلَّهِ مَثْنَىٰ وَفُرَٰدَىٰ ثُمَّ تَتَفَكَّرُوا۟ ۚ مَا بِصَاحِبِكُم مِّن جِنَّةٍ ۚ إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ لَّكُم بَيْنَ يَدَىْ عَذَابٍ شَدِيدٍ ﴿٤٦﴾ ﴾ (سبأ) (پێیان) بڵـێ: مـن یەك ئامۆژگاری ئێوە دەكەم، كە، بۆ خـواو لەبـەر خـوا، دوو قـۆڵی و بەتـەنهایی، وەرن و بیركەنەوە (لەم قورئانە، لەم پێغەمبـەرە، لـەم بەرنامەیـە) ئـەم هاوەڵـەی ئێـوە (محمـد) شێت نیە، بەڵكو ئەو تەنها ترسێنەری ئێوەیە پێش ئەوەی سزایەكی سەخت ڕووبەڕووتان ببێت..

ئەوە بانگەوازێكە بۆ گەڕانەوە بۆ لای خـوا دوور لـە هـەواو ئارەزووپەرسـتی، دوور لـە بەرژەوەندی، دوور لەو شتانەی پەیوەندن بە سەر زەویـەوە، دوور لـە پسكەپسـك و ئـەو پاڵنەرانەی كە دڵ تووشی ناكۆكی ئەكەن و لە خودای دوور ئەخەنەوە، دوور لە كاریگەری تەوژمە باوەكانی ژینگەكەی خۆی و كاریگەری شتە بەربڵاوەكانی نێو كۆمەڵگە.

ئەمـە بانگكردنـە بـۆ مامەڵـەكردن لەگـەڵ واقیعێكـی سـادەدا، نـەك لەگـەڵ كێشـە و بانگەشە باوەكاندا، یان لەگـەڵ قسـە لاسـتیكیەكاندا كـە دڵ و عـەقڵ دوورئەخەنـەوە لـە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ڕاستیە سادە و ساكارەكاندا.

بانكردنە بۆ دەنگی هێمن و بێ خەوشی سروشـت، دوور لـە ژاوەژاو و چەواشـەكاری و هەڵخەڵەتاندن، دوور لە بۆچوونە شڵەژاوەكان و تۆز لەسەر نیشـتووەكان كـە ڕاسـتی لێـڵ ئەكات و ئەیكات بەژێرەوە.

لە هەمان كاتدا ئەمە میتۆدێكە بـۆ لێكۆڵینـەوە لـە ڕاسـتیەكان، میتـۆدێكی ئاسـان و سادە كە پشت بە خۆبەدوورگرتن دەبەستێت لەتەپ و تۆزی شتەباوەكان و ڕەچـاوكردنی چاودێری خوای پەروەردگار و ترسان لە ئەو زاتە پاكە.

ئەم بانگەوازە تاقانە كە ئەگەر هاتـەدی ئـەوە بەرنامەیەكـە ڕاسـتیەكان دەرئـەخات و ڕێگەكەش ڕاست ئەكاتەوە، بانگەوازەكەش ئەوەیە بۆ خوا قسە بكەی – نەك خاتری ئەم

و ئەو بگری و بەلای ئەم و ئەودا دابیتاشی..نابێ بەلای خۆتدا یان بەلای بەرژەوەندی ئەم یـان ئەویـدا بخـەی..بێ لایەنانە..دڵپاکانە..پاشـان بـە بیرلێکردنـەوەو رامانـەوە بـەبێ کاریگـەری لـە دەرەوەی ئـەو واقیعـەی کـە کەسـە بـێ لایـەن و بـۆ خـوا سـوڵحاوەکان رووبەڕووی ئەبنەوە..

(أَنْ تَقُومُوا لِلَّهِ مَثْنَىٰ وَفُرَادَىٰ) بۆ خـوا و لەبـەر خـوا وەرن دوو دوو، یـەك یـەك، کـە ئەفـەرموێ( مَثْنَـىٰ..) دوو دوو، مەبەسـتی ئەوەیـە بگەڕێنـەوە بـۆ رای یـەکتر..زانیاری لێوەربگرێت و زانیاریشی پێ بدات..دوور لە کاریگەری عەقڵییەتی جـەماوەر کـە هەمیشـە پشت بە هەڵچوونە کتوپڕەکان ئەبەستێت بە بێ چـاوەڕێکردن و شـوێنکەوتنی بەڵگـەکان بە هێمنی.. (فُرَادَىٰ)ش واتە لەگەڵ دەروونی خۆتدا و رووبەڕوو خەریکی تەتەڵـەکردنێکی هێمنانەی قووڵ بە..

(ثُمَّ تَتَفَكَّرُوا ۚ مَا بِصَاحِبِكُمْ مِنْ جِنَّةٍ ۚ)، پاشان قوڵببنەوە و بیربکەنەوە: ئـەم هاوەڵـەی ئێوە جنۆکە دەستی لێنەوەشاندووە و شێت نیە!..

ئێوە جگە لە ژیری و رامان و لەسەرخۆیی چیترتان لەو بینیـوە، شـتێکی نەفـەرمووە مایەی ئەوە بێت گومانی لە عەقڵ و لە کەماڵی ئەو بکەن، قسەکانی هەمیشـە موحکـەم[٩٥] و بەهێز و رۆشن بوون..

﴿ .. إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ لَكُمْ بَيْنَ يَدَيْ عَذَابٍ شَدِيدٍ ﴿٤٦﴾ ﴾ (سـبأ)، ئـەو تـەنها ترسـێنەری ئێوەیە پێش ئەوەی سزایەکی سەخت ڕووبەڕووتان ببێت.. وەك ئەو ئامێرە ورياكەرەوەی لە ماڵاندا ئاگادارت ئەکاتەوە لە کەوتنەوەی ئـاگر، نزیکـە هـەموو ئـەوەی هەڵنەیـەت لـە ئاگرەکە بیسووتێنێت، ئەم وێناکردنە لەسەروو ئەوەوە کـە راسـتەقینەیەکە وێنـاکردنێکی زۆر جوان و بزوێنەریشە..

---

٩٥- موحکەم: یانی قسەیەك کە گوێگرەکەی پێویستی بەوە نەبێت کـە خـۆی مانایـەکی دووری لێدەربهێنێت، یان ئەوەیە کە بە رواڵەتی قسەکەوە مەبەستەکە دیارە، یان بەڵگەیەکی وای تێدایە تۆ ماناکەی بۆت ئاشکرایە.

دوای ئەوەی کە بانگیان ئەکات بۆ بیرکردنەوەی هێمنانە کە(مَا بِصَاحِبِكُمْ مِنْ جِنَّةٍ)، پاشان قوڵبینەوە و بیربکەنەوە: ئەم هاوەڵەی ئێوە جنۆکە دەستی لێنەوەشاندووە و شێت نیە!.. بانگیشیان ئەکات بۆ ئەوەی بیربکەنەوە لەوەی ئەبێ بەرژەوەندی چی بێت؟ پاڵنەری چی بێت؟ چ سوودێکی لەمە چنگ بکەوێت؟ قورئان فەرمانیان پێ ئەکات تا دەست بخەنە سەر ویژدانیان و بە ئاگا بێنەوەو رووبکەنە ئەو راستیەی کە ئەفەرموێ:

﴿ قُلْ مَا سَأَلْتُكُم مِّنْ أَجْرٍ فَهُوَ لَكُمْ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى اللَّهِ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ ﴿٤٧﴾ ﴾ (سبأ) پێیان بڵێ: هەرچی پاداشت و کرێیەکم داواکردووە هەر بۆ خۆتان، من پاداشتم تەنها لەسەر خوایە، ئەو خوایەش شایەتە بەسەر هەموو شتێکەوە.

ئەو ئەبینێ و ئەبیسێ و هیچ شتێکی لێ لا شاراوە نیە، ئاگاداری هەموو شتەکانە، لەوەی لە نیازدایە و لەوەشی دەیکەم و دەیڵێم.. ﴿ قُلْ إِنَّ رَبِّي يَقْذِفُ بِالْحَقِّ عَلَّامُ الْغُيُوبِ ﴿٤٨﴾ ﴾ (ئەی محمد!) بڵێ: بەڕاستی پەروەردگارم (سەرئەنجام) حەق دەماڵێ بەسەر (بەتاڵ و ناحەقیدا) بەڕاستی ئەو زاتە زۆر شارەزایە بە نهێنی و شاراوەکان.

ئەوەی کە بۆم هێناون ئەو هەق و راستیەیە بەهێزەیە کە خوا ئەیگرێتە ناهەقی.. ئەو (عَلَّامُ الْغُيُوبِ)ە لە رووی زانینەوە هەق ئەگرێتە ناهەقی، بە زانینێ ئاراستەی ئەکات..هیچ ئامانجێکی لێ ون نابێت، هیچ مەبەستێکی لێ بزر نابێت، هیچ کەسێکی رەخنەگر ناتوانێت بووەستێت لەبەردەم ئەو هەقەدا کە خوا ئەیگرێتە ناهەقی ..بۆیە ﴿ قُلْ جَاءَ الْحَقُّ وَمَا يُبْدِئُ الْبَاطِلُ وَمَا يُعِيدُ ﴿٤٩﴾ ﴾ (سبأ)، بڵێ: حەق و راستی هات و بەتاڵ و ناحەقی بوونی نەما.. نە دەتوانێ دەست پێبکاتەوە، نە دەتوانێ بگەڕێتەوە دۆخی جارانی.

لەو کاتەوەی قورئان دابەزیوە میتۆدی هەق و راستی دامەزراوە و روون بووەتەوە و باتڵ و ناهەقیش تەنیا چاولێکەرییەکە لە بەرانبەر راستیەکی روونی قسەبڕی دڵنیاکەرەوە.. ﴿ قُلْ إِن ضَلَلْتُ فَإِنَّمَا أَضِلُّ عَلَىٰ نَفْسِي وَإِنِ اهْتَدَيْتُ فَبِمَا يُوحِي إِلَيَّ رَبِّي إِنَّهُ سَمِيعٌ

قَرِيبٌ ﴿٥٠﴾ ﴾ (سبأ) بلّێ: ئەگەر من گومڕابم ئەوە گومڕاییەکەم زەرەری بۆ خۆم هەیە، خۆ ئەگەر ڕێگەی هیدایەتم گرتبێت ئەوە بەهۆی نیگاو وەحیی پەروەردگارمەوەیە، بەڕاستی ئەو زاتە زۆر بیسەرو نزیکە.

کەواتە ئێوە هیچ زیانێك ناکەن ئەگەر من ڕێگەش ون بکەم، ئەوکاتە من خۆم ئەدۆڕێنم، خۆ ئەگەر بەرچاوڕوونیش بم ئەوە خوا بەم نیگا ئاسمانیە بەرچاوی ڕوونکردوومەتەوە، دەسەڵاتی هیچ شتێکم نیە بۆ خۆم خوا ئیزنی لەسەری نەبێت، من لەژێر ویستی ئەودام و بەندی منەتی زۆری ئەوم.. (إِنَّهُۥ سَمِيعٌ قَرِيبٌ ) (سبأ:٥٠) بەڕاستی ئەو زاتە زۆر بیسەرو نزیکە.

**شەشەم: داهاتووی درۆزن و بوختانچییەکان.**

قورئان ئاگاداریان ئەکاتەوە لە ئەنجامی درۆکردنیان بە ئایەتەکانی خوا و قسەهەڵبەستنیان لەسەر خواجل جلالە کە ئەیانووت: قورئان جادووە و پێغەمبەریش جادووگەرە، بۆیە ئاگاداریان ئەکاتەوە لە ئاکامی ئەوانەی پێش خۆیان کە ئەمان دەیەکی ئەوان زانست و هێز و سامان و ئاوەدانیا پێنەدراوە، ئەوەبوو کە پێغەمبەرانیان بەڕاست نەزانی سزای ناگەهان گرتنی و تۆڵەی سەختیان لێکرایەوە، وەك ئەفەرموێ: ﴿ وَكَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ وَمَا بَلَغُواْ مِعۡشَارَ مَآ ءَاتَيۡنَٰهُمۡ فَكَذَّبُواْ رُسُلِيۖ فَكَيۡفَ كَانَ نَكِيرِ ﴿٤٥﴾ ﴾ (سبأ)، ئەو خەڵکەی پێش ئەمانیش (پێغەمبەرانی خوایان) بەدرۆ خستەوە بە مەرجێك بەقەدەر دەیەکی ئەوانە، ئەمانە دەسەڵاتدارو خاوەن دارایی نین، کەچی پێغەمبەرەکانی منیان بەدرۆ خستەوە، ئایا نابینن چۆن تۆڵەم لێ سەندن و چیم بەسەرهێنان؟!

لەراستیدا تۆڵەکەیان ترسێنەر و تۆقێنەر بوو،(قورەیش) سەرەنجامی هەندێك لەو گەلانەی ئەزانی کە کە لە دوورگەی عەرەبیدا بوون، ئەم بیرخستنەوەیە بەسە و ئەم پرسیارە گاڵتەئامێزەیەش لێیان(فَكَيۡفَ كَانَ نَكِيرِ )، نابینن چۆن تۆڵەم لێ سەندن و چیم

بەسەرهێنان؟ پرسیارێکە دڵی ئەوەی گوێی لێدەبات ئەبات بۆ لای ئەو بەسەرهاتانە کە ئەوان ئاگایان لە و تۆڵانە هەیە کە سەنراوە لەو ستەمکارانە.

لە کۆتاییدا وەڵامی ئەو ستەمکارانە کە پێغەمبەریانﷺ بەراست نەئەزانی و بوختانیان بۆ ئەکردن و ئەیانووت: جادووگەرە و ئەوەشی هێناویەتی جادووە، قورئان دوای ئەم وەڵامە پاشکۆیەك لە دیمەنەکانی ڕۆژی قیامەت ئەخاتە پێش چاویان کە ئەو درۆو بوختانانەیان بۆ پێغەمبەرﷺ بەکەڵکیان نایەت، نەك ئەوە بەڵکو ئەبێتە مایەی داخ و پەشیمانی بۆیان کە ئەو ڕۆژە پەشیمانی دادیان نادات، لە کاتێکدا ئەیانتوانی، ئیمان بهێنن لە ژیانی دونیادا، چونکە هەل لە بەردەستتان هەبوو، بەڵام ئەوان درۆیان ئەکرد و ئەیانووت: جادو و جادووگەر!

﴿ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ فَزِعُواْ فَلَا فَوْتَ وَأُخِذُواْ مِن مَّكَانٍ قَرِيبٍ ﴿٥١﴾ وَقَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِهِۦ وَأَنَّىٰ لَهُمُ ٱلتَّنَاوُشُ مِن مَّكَانٍ بَعِيدٍ ﴿٥٢﴾ وَقَدْ كَفَرُواْ بِهِۦ مِن قَبْلُ وَيَقْذِفُونَ بِٱلْغَيْبِ مِن مَّكَانٍ بَعِيدٍ ﴿٥٣﴾ وَحِيلَ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ مَا يَشْتَهُونَ كَمَا فُعِلَ بِأَشْيَاعِهِم مِّن قَبْلُ إِنَّهُمْ كَانُواْ فِى شَكٍّ مُّرِيبٍ ﴿٥٤﴾ ﴾(سبأ).

(ڕۆژێك دێت کافران) دەبینیت لەترسا خەریکن زیرە دەکەن، دڵنیان کە لە دەست دەرناچن و ڕزگار بوونیان ئەستەمە، ئیتر هەر لە نزیکەوە دەستگیر دەکرێن و باڵبەست دەکرێن. ئەو کاتە (بە ناچاریی) دەڵێن: ئیمانمان (بە پەروەردگارمان) هێنا، بەڵام لەو شوێنە دوورەوە ئیمان چۆن دەستدەکەوێت (تازە کار لەکار ترازراوە). ئەوانە کاتی خۆی باوەڕیان بەخوا نەبوو، هەر لەدوورەوە باسی نهێنی و شاراوەکانیان دەکردو، دەمیان لێدەدا. و (ئەوسا ئیتر) لەنێوان ئەمان و ئارەزوکانیاندا (بەربەست دانرا)، هەروەکو پێشتر بە هاوشێوەی ئەمان کرا، بەڕاستی ئەوانە هەمیشەو بەردەوام لە گومان و دوودڵیدا بوون (بەرانبەر ئیمان و خۆیان بۆ دینداری یەکلایی نەدەکردەوە).

توانـای رزگاربوونیـان نیـە.. وَأُخِذُواْ مِن مَّكَانٍ قَرِيبٍ .. ئـەڵێن: آمَنَّـا بِـهِ..ئێسـتا؟ دوای نەمانی هەل و کات.. وَأَنَّىٰ لَهُمُ ٱلتَّنَاوُشُ مِن مَّكَانِۭ بَعِيدٍ .. لەو شوێنەوە چۆن ئیمان ئەهێنن؟ شوێنی ئیمان هێنان دونیا بـوو..زۆر دوورن لـەوێ! لـە دەسـتیان دەرچـوو، ئـەوان کـافر بـوون بـە ئیمـان پـێش ئێسـتا..لەوێ بێبـاوەڕبوون پێـی، ئـەیانووت: ئـەم پێغەمبـەرە جادووگـەرە، ئـەم پەیامـە ئاسمانیـە جـادووە! ئەمـە قسـەی هەڵبەسـتراوە..ئەمە ئەمـە حیکایەتی پڕو پیرژنەکانی کۆنە..دەی ئیتر کارەکە تەواو بوو، دەرفەت نەماوە بۆ ئەوەی ئـەمڕۆ بـۆ هـەلێکی تـری وا بگـەڕێن.. وَحِيلَ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ مَا يَشْتَهُونَ .. بەربەسـت دائـەنرێ لـە نێوان ئەمان و حەزەکانیان بـۆ ئیمـان هێنـان لـە کـاتی غـەیری خۆیـدا..إِنَّهُمْ كَانُواْ فِى شَكٍّ مُّرِيبٍ ..دەی ئەوەتا ئەوە بە یەقین سەرەنجامی خۆیان و ئەو قسانەش پێغەمبەران بۆیان ئەکردن ئەبینن بێ هیچ گومان و دوودڵییەك...[96]

**بەکورتی:**

- جادوو چەند شتێکی شاراوەی تایبەتە خەڵك لە یەکتربیەوە فێری دەبن، جا یـان ئەوەتا فێڵ و چاوبەستکردنە، یاخود چەند شتێکی زانستی تایبەتە و نادیارە لای بینـەر، یان کاریگەریـەکی قوڵـە لەسـەر دەروون و بـەجۆرێك ئـیرادەی خاوەنەکـەی تەسـلیم بـەو حاڵەتە ئەبێت، هـەموو ئەمانـە چـەند شـتێکی دەسـتکەوتن و ئـەکرێ ئەوانـەی حـەز بـەو کارانە ئەکەن فێری بن.
- قورئان کۆمەڵێك زانستی باڵایە لە بواری بیروبـاوەڕو یاسـاو دەسـتوور و ئاکـاردا، عەقڵەکان بەرز رائەگرێت و دەروونەکان خاوێن ئەکاتەوەو ئیسلاحی خـەڵك ئـەکات، فرت و فێڵ و تەڵەکەبازی نیە.

---

٩٦–هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص٢٩١٦، بەدەستکارییەوە.

- ئەگەر قورئان جادوو بێت وەك ئەڵێن ئەوا ئەبوو ئـەوانیش هـەوڵیان بدایـە فێـری بن و هاوشێوەی ئەو بهێنن، یـان سـوورەتێك بهێـنن، بـەڵام ئـەوان لـەوەدا دەسـتەوسـان بوون و دەرکەوت کە ئەوەی موحەممەدﷺ هێناویەتی نیگای خوایە و ئەویش پێغەمبەری خوایە.
- قورئـــان نیگـــای خوایـــە و لـــە لایـــەن ئـــەوەوە رەوانـــە کـــراوە و پـــەیامێکی سەرسوڕهێنەرە لە شێواز و لە هۆنینەوە و لـە مانـا و لـە هیدایـەت و لـە یاسـاکانیدا و لـە هەواڵدانەکانی بۆ نادیارەکان، دەی دوای ئەمە ئیتر کەس بیانووی بەدەستەوە نیە بڵێـت: موحەممەد خۆی دایناوە یان یەکێکی تر دایناوەو موحەممەد لە ئەو وەریگرتووە.



# گومانی بیست و یەک

## بانگەشـــەکردنی ئەوەی کە قورئـــان جـــادوویەکی ئاشـــکرایە و مـــوحەممەدﷺ هێناویەتی *[٩٧]

### ناوەڕۆکی گومانەکە:

موشـریکەکان ئـەڵێن گوایـە ئـەم قورئانـە کـە موحەممـەدﷺ هێناویـەتی داسـتانی پێشووەکانە، لە چیرۆکی رابردووە کۆنەکانەوە سەرچاوەی گرتووە، موحەممەد کۆپیـانی کردووە و بەیانیان و ئێواران بۆی دەخوێنرێتەوە، خـوای گـەورەش ئەفـەرموێ: ﴿ وَقَالُوٓاْ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ٱكۡتَتَبَهَا فَهِيَ تُمۡلَىٰ عَلَيۡهِ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلٗا ۝٥ ﴾ (الفرقـان)، هـەروەها وتویانە: ئەم قورئانـە داسـتانی پێشـینەکانەو داوای نوسـینەوەیانی کـردووە، بـەیانیان و ئێواران بەسەریدا دەیخویننەوە!!

### رێگاکانی پووچەڵکردنەوەی گومانەکە:

١. ئەم بانگەشەیە سەرچاوەی لە بێ باوەڕی و کەللەڕەقییەوە گرتووە.

٢. وەبیرهێنانەوەی هاوشێوەکانی قورئان لە کتێبە پێشوەکاندا.

٣. شـاهیدیدانی شـایەتە بـەنی ئیسـرائیلیەکان و کتێبـە پێشـووەکان لەسـەر راسـتی و راستگۆیی قورئان.

٤. رامان لە قورئان دڵنیایی دەدات لەسەر خاڵیبوونی لـە درۆ و لـە نـاکۆکی، چـونکە لـە لایەن خواوە دابەزیوە.

٥. لووتبەرزی و دەمەدەمێی بێ بنەمای موشریکەکان رێگرن لەوەی شوێن هەق بکەون.

---

٩٧- ئەو ئایەتانەی کە باس لەم گومانە ئەکەن بریتین لە:(القلم/١٥، الاحقـاف/١١،١٧، الفرقـان/٥، الانفـال/٣١، المؤمنون/٨٣،الانعام/٢٥، ئەو ئایەتانەش وەڵامی ئەم گومانە ئەدەنەوە بریتین لە:(الفرقان/٦،الاحقاف/١٢).

**درێژەی بابەتەکە:**

**یەکەم: ئەم بانگەشەیە سەرچاوەی لە بێ باوەڕی و کەللەڕەقییەوە گرتووە.**

موشریك و بێ باوەڕەکان بوختانی ئـەوە ئەکـەن کـە قورئـان داسـتانی پێشـووەکانە، موحەممـەدﷺ وەریگرتـووەو لێـوەی فێردەبێـت و دەیخوێنێتـەوە بـۆ خـەڵك، ئـەوەش درۆیەکی ئاشکرا و بوختانی روون و بانگەشەیەکی رووتە، بەدڵنیاییـەوە ئـەم قسـەیان لـە چەندەها ئایەتی قورئانیدا دووبارە بووەتەوە، وەك ئەفەرموێ: ﴿ وَقَالُوٓاْ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ٱكۡتَتَبَهَا فَهِيَ تُمۡلَىٰ عَلَيۡهِ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلٗا ۝٥ ﴾ (الفرقـان) هـەروەها وتويانـە: ئـەم قورئانە داستانی پێشینەکانەو داوای نوسینەوەیانی کردووە، بەیانیان و ئێواران بەسەریدا دەیخوێننەوە ! ! جارێکی تر ئەڵێن: ﴿ هَٰذَآ إِفۡكٞ قَدِيمٞ ۝١١ ﴾ دەڵـێن : ئەمـە هەڵبەسـتراو و ئەفسانەیەکی کۆنە ! !) (الاحقاف:١١).

خوای گەورە وەڵامی ئەم قسە هەڵبەستنانەیان ئەداتـەوەو روونـی ئەکاتـەوە کـە ئـەم بوختانانە لە بێ باوەڕی و یاخیبوونیانەوە سەرچاوەی گرتووە، بەبەڵگەی ئەم ئایەتە کـە ئەفـــــــەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَوۡ كَانَ خَيۡرٗا مَّا سَبَقُونَآ إِلَيۡهِۚ وَإِذۡ لَمۡ يَهۡتَدُواْ بِهِۦ فَسَيَقُولُونَ هَٰذَآ إِفۡكٞ قَدِيمٞ ۝١١ ﴾ (الاحقـاف)، ئەوانـەی کـەبێ بـاوەڕن دەربـارەی ئەوانـەی ئیمان و باوەڕیان هێناوە دەڵێن : ئەگەر باوەڕهێنان بە قورئـان و بـە محمد چـاك بوایـە، ئەوانـە پـێش ئێمـە نەدەکـەوتن ! ! جـا چـونکە خۆیـان هیدایـەت و ڕێنمـوویی قورئـان وەرناگرن دەڵێن : ئەمە هەڵبەستراو و ئەفسانەیەکی کۆنە ! !

ئەمەش بەهۆی ئەو لووتبـەرزی و کینـە زۆریـە کـە سـەبارەت بەئیسـلام و موسـڵمانان هەیانە.

**دووەم: وەڕاستگێڕانی قورئان بۆ کتێبە پێشووەکان.**

یەکێکی تر لە شێوازەکانی پووچکردنەوەی قورئان بۆ ئەم بانگەشەیە بیرهێنانەوەیانە بۆ ئەو کتێبانەی تر کە وەك قورئان بوون، کە ئەو بابەتە لایان زانراو بووە، بۆ نمونە: تەورات، کە قورئان بە بەباشی باسی ئەکات و ئاماژەش بە تایبەتمەندی قورئان ئەکات، خـوای گـەورە ئەفـەرموێ: ﴿ وَمِن قَبۡلِهِۦ كِتَٰبُ مُوسَىٰٓ إِمَامٗا وَرَحۡمَةٗۚ وَهَٰذَا كِتَٰبٞ مُّصَدِّقٞ لِّسَانًا عَرَبِيّٗا لِّيُنذِرَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ وَبُشۡرَىٰ لِلۡمُحۡسِنِينَ ١٢ ﴾ (الاحقاف) خـۆ پـێش ئـەم قورئانـە، تەوراتی موسا ڕەوانەکراوەتا پێشەواو ڕەحمەت بێت لـەکاتی خۆیدا ... ئـەم قورئانـەش پەیامێکە سەلمێنەری پەیام و کتێبەکانی پێش خۆیەتی و، ڕێکـە لەگەڵیانداو بـەزمانێکی عـەرەبی پـاراوی ڕەوان هـاتووەبۆ ئـەوەی ئەوانـەی سـتەمیان کردووەبێـداریان بکاتەوەمژدەبەخشیشە بەچاکەکاران.

لە تەوراتیشدا پیاهەڵدانی تێدایـە بـۆ پێغەمبـەرﷺ و بـۆ بڕواپێهێنـانی، وازیـان لـەوە هێناوەو هیدایەتیان پێ وەرنەگرتووە بەهۆی لوتبەرزی و یاخیبوونیانـەوە، تەنانـەت ئـەو کتێبـە پیرۆزەشـیان دەسـتکاری کـردووە بـۆ ئـەوەی گـومڕا بـن و خـەڵکانی تـری بـەنی ئیسرائیلیش گومڕا بکەن، لە ڕاستی و دروستی قورئانی پیرۆز.

**سێیەم: دانپیانانی شایەتحاڵەکان:**

دیسان یەکێکی تر لە وەڵامەکانی قورئان شایەتیدانی ئـەو کتێبـەکانی پـێش قورئانـە، هەروەها شایەتیدانی شایەتحاڵەکانی نەوەکانی ئیسرائیلە بۆ ڕاستی ئـەم قورئانـە، خـوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿ ... وَشَهِدَ شَاهِدٞ مِّنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ مِثۡلِهِۦ فَـَٔامَنَ وَٱسۡتَكۡبَرۡتُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ١٠ ﴾ (الأحقاف) ، هەروەها پێیان بڵێ : هەواڵم بـدەنێ، باشـە، ئـەی ئـەوە چۆنە وحاڵتان چۆن دەبێت ئەگەر ئـەم قورئانـە لەلایـەن خواوەبێـت و، ئێـوە ئـاوا بـڕوای پێنەکەن ؟! هاوکات لەگەڵ ئەوەدا کەشایەتێك لەنـەوەی ئیسـرائیل شـایەتی داوە کـە چ

تەورات و، چ قورئان لەیەك سەرچاوەوە هاتوون، ئەوە باوەڕی هێنا و ئێوەش لووتتان کرد بە ئاسماندا و باوەڕتان نەهێنا... بێگومان خوا هیدایەت و ڕێنمویی دەستەی ستەمکاران ناکات .

ئەهلی کتێب باوەڕیان بە هاتنی پەیامە ئاسمانیەکان هەیە بۆ سەر پێغەمبەران، جولەکەکان هەواڵی هەندێك لە پەیام و کتێبەکەی موسایانسەلامی خوای لێبێتبۆ موشریکەکان ئەگێڕایەوە، ئەمەش پووچەڵکردنەوەی بانگەشەی موشریکەکانە بە دڵنیاییدان لەسەر ئەوەی هاتنی نیگای خوا سووننەتێکی خواییە و پێشتر شتێکی زانراو بووە، لە بەناوبانگترین ئەو کتێبانە تەوراتەکەی موسایەسەلامی خوای لێبێت و لە لایەن جولەکەشەوە هەواڵی ئەو کتێبەیان پێگەیشتووە، بۆیە خوای گەورە ئەفەرموێ:

﴿ وَمِن قَبْلِهِۦ كِتَٰبُ مُوسَىٰٓ إِمَامًا وَرَحْمَةً ۚ وَهَٰذَا كِتَٰبٌ مُّصَدِّقٌ لِّسَانًا عَرَبِيًّا لِّيُنذِرَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ وَبُشْرَىٰ لِلْمُحْسِنِينَ ﴿١٢﴾ ﴾ (الاحقاف)، خۆ پێش ئەم قورئانە، تەوراتی موسا ڕەوانەکراوەتا پێشەواو ڕەحمەت بێت لەکاتی خۆیدا ... ئەم قورئانەش پەیامێکە سەلمێنەری پەیام و کتێبەکانی پێش خۆیەتی و، ڕێکە لەگەڵیانداو بەزمانێکی عەرەبی پاراوی ڕەوان هاتووەبۆ ئەوەی ئەوانەی ستەمیان کردووەبێداریان بکاتەوەمژدەبەخشیشە بەچاکەکاران.

**چوارەم: قورئان لە لایەن خواوەیە کە نهێنی ئاسمانەکانی و زەوی لەبەردەستدایە.**

هەر خودی قورئان رووکارە دەرەکیەکەی پێچەوانەیە بەو بوختانەی ئەوان ئەیکەن، قورئان هیچ درۆو قسەیەکی هەڵبەستراوی تێدا نیە، هیچ عەرەبێك ناتوانێت کە کتێبێکی عەرەبی وا زمان پاراو و رەوان و بە ئاست بهێنێت کە گەیشتووەتە سنووری موعجیزە، بۆیە خوا پێغەمبەرﷺ فێرئەکات تا وەڵامی ئەو قسەهەڵبەسانە بداتەوە بەوەی کە قورئان لە لایەن خواوە دابەزیوە بۆ پێغەمبەرەکەیﷺ، چونکە ئەو شارەزای سەرجەم نهێنیەکانە، وەك ئەفەرموێت: ﴿ قُلْ أَنزَلَهُ ٱلَّذِى يَعْلَمُ ٱلسِّرَّ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ

غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٦﴾ ﴾ (الفرقان). تۆ ئەی محمد ! بڵێ: ئەو زاتەی ئەم قورئانەی دابەزاندووە بە هەموو نهێنییەك دەزانێت لە ئاسمانەكان و زەویدا، هەر ئەویش هەمیشەو بەردەوام لێخۆشبوو میهرەبانە.

ئەمەش بۆ ئەوەیە هۆشیان بهێنێتەوەو رابمێنن لە قسەكەی خۆیان گوایە قورئان درۆیە یان داستانی پێشووەكانە، سەرنجیان بۆ ئەوە رائەكێشێت كە قورئان پڕە لە راستی رۆشن كە جگە لە خوا كەس ئەو زانیاریان نازانێت، ئەوە نهێنی ئاسمانەكان و زەوی لایە، بەمە ئەیەوێ بگەنە ئەو دڵنیاییەی كە قورئان نابێ لە جگە لە ئەو خودایەوە هاتبێت، ئەستۆپاكی پێغەمبەریشیان بۆ دەربكەوێ لە ئەو بانگەشەی بۆی ئەكەن گوایە لە خەڵكی ترەوە وەریگرتبێت..

**پێنجەم: لووتبەرزی و مشتومڕی بێ بنەمای موشریكەكان بەربەستە لە رێگەی شوێنكەوتنی هەق و راستیدا.**

یەكێكی تر لە وەڵامەكانی قورئان بۆ ئەوانەی تانە لە قورئان ئەدەن و ئەڵێن: قورئان داستانی پێشووەكانە! ئەوەیە ئەمانە هەوڵی بێ بەڵگە دەدەن و هیچیان بۆ ناسەلمێنرێ، ئەوەشی وایان لێئەكات شوێن هەق نەكەون خۆ بەگەورەكردنە كە لەراستیدا ئەوان لەو خۆبەزلزانینە بچوكتر و كرگنەترن، خوا ئەفەرموێ: ﴿ مَا يُجَٰدِلُ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَلَا يَغۡرُرۡكَ تَقَلُّبُهُمۡ فِي ٱلۡبِلَٰدِ ﴿٤﴾ ﴾ (غافر)، هیچ كەس لە بەرامبەری ئایەت و فەرمانەكانی خواوە موجادەلە و دەمەدەمێ ناكات، جگە لەوانەی كە بێ بڕواو خوانەناس بوون، ئەی پێغەمبەر ﷺ كەواتە دەسەڵات و سەرمایە و هێزیان فریوت نەدات. هەروەها ئەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ بِغَيۡرِ سُلۡطَٰنٍ أَتَىٰهُمۡ إِن فِي صُدُورِهِمۡ إِلَّا كِبۡرٞ مَّا هُم بِبَٰلِغِيهِۚ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ﴿٥٦﴾ ﴾ (غافر) بەڕاستی ئەوانەی كە موجادەلە و گفتوگۆی سەركەشانە دەكەن و، بە نەشارەزایی لە ئایەتەكانی خوا دەدوێن

بێ ئەوەی بەڵگەیەکی بەهێزیان پێ بێت، ئەوانە تەنها لە سینەیاندا خۆ بەل زانین هەیە، بەمەرجێك هیچ کات ناگەنە ئەو ئامانجەی کە هەیانە، کەواتە تۆ پەنا بگرە بە خوا لە شەڕی خوانەناسان چونکە بەڕاستی ئەو زاتە بیسەر و بینایە.

مرۆڤ خۆی بە گەورە ئەزانێ و مشتومڕ ئەکات لە ئایەتەکانی خوادا، ئەو ئایەتانەی کە زۆر روون و پاراون و تەعبیر لە پاك و بێ گەردی دەکەن، بە زمانێکی پاك و بێ گەرد، ئەم مرۆڤانە بانگەشەی ئەوە ئەکەن: بۆیە موناقەشە ئەکەین چونکە هێشتا قەناعەتمان نەکردووە! دەمێ دەمێ ئەکات گوایە هێشتا ماویەتی یەقین پەیدا بکات، بەلأم ئەو خوایەی کە بەندەکانی خۆی ئەناسێت قسەیان ئەبیسێت و ئەیانبینێت و ئاگای لە شاراوەکانیان هەیە ئەفەرموێ ئەوانە لووتبەرزن! تەنیا لووتبەرزییە کە دڵی تەنیوون و پەلکێشیان ئەکات بۆ ئەوەی ئەو هەمووە جەدەلە بکەن لە شتێکدا کە جەدەل هەڵناگرێت ئەوەندە روونە، هەر ئەو لووتبەرزییەیە کە هەڵیانئەنێت بۆ خۆهەڵکێشان و دەرچوون لە قەبارەی راستەقینەی خۆیان، و چوونە شوێنێك کە هی ئەوان نیە، مل بەرەو پلەیەك ئەنێ کە شایستە بەو نیە، مشتومڕ لە شتێکدا ئەکات کە بەڵگەی بەدەستەوە نیە تەنیا خۆهەڵکێشان و لووتبەرزی نەبێت.[98]

راستی روونە بەلأم بێ باوەڕان مشتومڕی بێ هودە ئەکەن بۆ ئەوەی راستی ببەزێنن و هەڵیوەشێننەوە، ئەوان کاتێکیش داوای موعجیزە و دابەزینی سزا ئەکەن تەنیا سوکایەتی و گاڵتەکردنیان بە ئایەتەکانی خوا مەبەستە، وەك ئەفەرموێ:

﴿ .. وَيُجَٰدِلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِٱلْبَٰطِلِ لِيُدْحِضُواْ بِهِ ٱلْحَقَّۖ وَٱتَّخَذُوٓاْ ءَايَٰتِي وَمَآ أُنذِرُواْ هُزُوٗا ﴿٥٦﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ فَأَعْرَضَ عَنْهَا وَنَسِيَ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُۚ إِنَّا جَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ وَفِيٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرٗاۖ وَإِن تَدْعُهُمْ إِلَى ٱلْهُدَىٰ فَلَن يَهْتَدُوٓاْ إِذًا أَبَدٗا ﴿٥٧﴾ ﴾ (الكهف).

---

٩٨- في ظلال القران،سيد قطب، سەرچاوەی پێشتر،ج٥، ص٣٠٨٩.

ئەوانەی کافرو بێ باوەڕ بوون هەر موجادەلەو دەمبازی دەکەن بە بەڵگەی پڕوپووچ، بۆ ئەوەی حەق و ڕاستی بەتاڵ بکەنەوەو بیترازێنن، هەروەها ئایەت و فەرمانەکانی من و ئەوەی ئـەوانی پـێ هۆشیار کراوەتـەوە کردویانـە بەگاڵتـە. کـێ لـەوە ستەمکارترە کە یادەوەری کرابێت بە ئایەت و فەرمانەکانی پەروەردگاری، کەچی ڕووی لـێ وەرگێـڕاون و لووتی بەرز گرتووەو ئەوەشی لە یاد کردووە کە چ دەستپێشکەریەکی کردووە لە گونـاهو تاوان، ئێمە بەڕاستی پەردەمان هێناوە بەسەر دڵیاندا تا لە ئایەتەکانی ئێمـە تێنەگـەن و قورسی و کەڕیشمان کردۆتە گوێیانەوە، خۆ ئەگەر بانگیان بکەیت بۆ ڕێبـازی هیدایـەت و دینداری، ئەوە هەرگیز ئەوانە ئەو هیدایەتە وەرناگرن.

ئەوانەی سوکایەتی بە ئایەتەکانی خـوا و ئاگادارکردنـەوەکانی ئـەو ئەکـەن ئومێـدیان لێناکرێ کە لـە قورئـان تێبگـەن و سـوودی لـێ ببیـنن، بۆیـە خـوای گـەورە پەردەیـەکی کێشاوە بە بەسەر دڵیاندا، کە بوەتە بەربەست بۆیان و گوێیان لـە ئاسـت هـەق و ڕاسـتی قورس بووە و نابیستن، بڕیاری ئەوەی بۆ داون ویڵ و سەرگەردان بن بەهۆی گاڵتەکردن و سـوکایەتیکردنیان بـە دیـن کەواتـە هـەرگیز بەرچـاو ڕوون نـابن، چـونکە هیدایـەت و بەرچاوڕوونی بە چاوی کراوەو دڵی ئامادەوە وەرئەگیرێت.[99]

خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا الْقُرْآنِ مِن كُلِّ مَثَلٍ ۚ وَلَئِن جِئْتَهُم بِآيَةٍ لَّيَقُولَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ أَنتُمْ إِلَّا مُبْطِلُونَ ﴿٥٨﴾ كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ اللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾ (الروم).

سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە لەم قورئانەدا لە هـەموو بابـەتێك نموونـەمان بـۆ خـەڵکی هێناوەتـەوە، کەچـی هـەر ئایەتێکیشـیان بـۆ بهێنیـت و بەسـەریاندا بخوێنیتـەوە، ئـەوە بێگومان ئەوانەی کە بێ باوەڕن دەڵێن: ئێوە تەنها پێشـێلکەری حـەقن و هیچـی تـر نـین

---

٩٩-هەمان سەرچاوەی پێشوو، ج٤، ص٢٢٧٦.

! !ئا بەو شێوەیە خوا مۆر دەنێت بەسەر دڵی ئەوانەدا کە نازانن و بەشوێن حەق و ڕاستیدا ناگەڕێن، (شوێن ڕاستی و حەقیقەت ناکەون).

قورئان لە هەموو نمونەیەکی تێدایە، چەندین شێوازی دەربڕینی لە خۆگرتووە، چەندین کەرەسەی تێدایە بۆ بە ئاگاهێنانەوەی عەقڵ و دڵ، دەستی بردووە بۆ چەندین بابەت کە قوڵ کاریگەری خۆی دائەنێت لە کاتێکدا قسە بۆ هەموو دڵەکان و هەموو عەقڵەکان ئەکات، لە هەموو ژینگەیەکدا و لە هەموو کۆمەڵگەیەکدا، هەر قورئان لەو کاتانەدا قسە لەگەڵ دەروونی ئەم مرۆڤەدا ئەکات لە هەموو حاڵەتەکانیدا، لە هەموو قۆناغەکانیدا، کەچی ئەواندوای ئەم هەمووە شتە بڕوا بە هیچ ئایەتێك ناکەن، تەنیا ئەمەش نا، بەڵکو خۆیان هەڵئەکێشن و زماندرێژی ئەکەن لەبەرانبەر خوادا، بۆیە خوای گەورەش بە دوای ئەم کوفر و زماندرێژیەیاندا ئەفەرموێ: ﴿ كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾ (الروم)، ئا بەو شێوەیە خوا مۆر دەنێت بەسەر دڵی ئەوانەدا کە نازانن و بەشوێن حەق و ڕاستیدا ناگەڕێن، (شوێن ڕاستی و حەقیقەت ناکەون).

**بەکورتی:**

- ئەم قسانە لە بێ باوەڕی کافران و عینادی و خۆبەگەورەزانتر لە ڕاستی سەرچاوەی گرتووە، هیچ بەڵگەیەکیشیان پێ نیە بۆ ئەو قسانە.
- قورئان کتێبەکانی پێش خۆی پشتڕاست ئەکاتەوە، کەوایە قورئانیش وەك ئەوان نیگای خوایە و چاودێریشە بەسەر ئەو کتێبانەی ترەوە.
- دانپێدانانی شایەتحاڵەکانی ناو (بەنی ئیسرائیل) بەوەی کتێبە پێشووەکان مژدەی هاتنی پێغەمبەریﷺ داوە، شایەتیشە بۆ ئەوەی قورئان لە لایەن خواوە دابەزیوە.

- قورئان چۆن ئەبێتە درۆ و داستان لە کاتێکدا ئـەوەی دایبەزانـدووە نهێنیـەکانی ئاسمانـەکان و زەمـین هـەمووی لەبەردەسـتیدایە؟ هەرکەسـیش لێـی رابمێنێـت و بـەدڵ بیخوێنێت ڕێگەی نامێنێ ئەوە نەبێت دان بەوەدا بنێت کە قورئان حەتمەن قسەی خوایە.



## گومانی بیست و دوو

## بانگەشەکردنی بەوەی ئــەوەی کە مـوحەممەدﷺ هێنـاویەتی هـیچ نـیە جگە لە شیعر و خەوی تـێکەڵ و پـێکەڵ نەبێـت، مـوحەممەد خۆشـی شـاعیر و فـاڵچیە و نوقڵانەلێدەرکاهینەو هیچی تر.*[100]

**ناوەرۆکی گومانەکە:**

موشریکەکان بانگەشەی ئەوە ئەکەن کە گوایە ئەوەی پێغەمبەرﷺ هێناویەتی جگە لە شیعر و فاڵ و خەوی تێکەڵ و پێکەڵ نەبێ یچی تر نیە، ئەو قورئانەی موحەممەد هێناویەتی لە لایەن شەیتانەکانەوە بۆی هاتووە، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿ بَلۡ قَالُوٓاْ أَضۡغَٰثُ أَحۡلَٰمِۭ بَلِ ٱفۡتَرَىٰهُ بَلۡ هُوَ شَاعِرٞ فَلۡيَأۡتِنَا بِـَٔايَةٖ كَمَآ أُرۡسِلَ ٱلۡأَوَّلُونَ ٥ ﴾ (الانبیاء)، بەڵکو (شتی تریشیان) دەوت: (وەك ئەوەی کە گوایە ئەم قورئانە): خەوو خەیاڵی بێ سەر و بنە، یاخود خۆی هەڵی بەستووە، بەڵکو ئەو کەسێکی شاعیرە، دەبا بەڵگە و موعجیزەیەك بهێنێت وەك پێغەمبەرانی پێشوو!!

**ڕێگاکانی پووچکردنەوەی ئەم گومانە:**

١. دوودڵی موشریکەکان و هەنگاونانی کوێرانە سەبارەت بە قورئان بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هیچ لە قورئان نازانن و زۆر وێڵن.

٢. قورئانی پیرۆز قسەی خوایە لە ڕێگەی نیگاوە دابەزیوە بۆ پێغەمبەرەکەی.

٣. شەیتانەکان توانا و دەسەڵاتی دابەزاندنی قورئانیان نیە.

---

١٠٠–ئەو ئایەتانەی کە باس لەم گومانە ئەکەن بریتین لە:(الانبیاء/٥،الصافات/٣٦،الحاقة/٤٢،٤١،الطور/٣٠، ئەو ێ ئایەتانەش وەڵامی ئەم گومانە ئەدەنەوە بریتین لە (النجم/٢،٤، الحاقة/٤٧،٤١، الشعراء/٢١٢،٢١٠، الفرقان،٩، التکویر/٢٥،٢١،١٩،الاسراء/٤٨).

**درێژەی بابەتەکە:**

**یەکەم: نەفامی و گومڕایی موشریکەکان.**

ئـەم قسـەیە بەڵگەیـە لەسـەر بـێ بڕوایـی و کەڵلـەڕەقی و پارادۆکسـی و نـاکۆکی موشریکەکان لە هەڵوێست وەرگرتن لـە قورئـان، بەرانبـەر قورئـان دوودڵ و سـەرگەردان بوون، جارێ ئەیانووت ئەمـە جـادووە، وەك قورئـان ئەیگێڕێتـەوە ﴿ وَلَوْ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ كِتَٰبًا فِى قِرْطَاسٍ فَلَمَسُوهُ بِأَيْدِيهِمْ لَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٧﴾ ﴾ (الانعـام)، خـۆ ئەگـەر نووسراوێکمان بۆ تۆ لەناو کاغەزێکدا دابەزاندایە، ئـەوجا دەستیشـیان لـێ بدایـە، ئـەوە ئەوانەی کە بێ بڕوا بوون دەیانوت: ئەمە جگە لـە جادوویـەکی ئاشـکرا هـیچ شـتێکی تـر نیـە ! ! (هـەر بـاوەڕ نـاهێنن).هـەروەها ئەفـەرموێ: ﴿ وَقَالُوٓا۟ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ ﴾ (الصافات)، دەشیانوت: ئەمەی ئێمە دەیبینین و دەیبیستین جگە لە جادوویەکی ئاشـکرا شتێکی تر نیە... ! ! هـەروەها ئەفـەرموێ: ﴿ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٧﴾ ﴾ (الاحقـاف)، لـە کاتێکـدا ئایەتـە ئاشـکراو ڕوونـەکانی ئێمـە بەسەریاندا بخوێنرێتەوە، ئەوانەی کەبێ باوەڕ بوون بەو حەق و ڕاسـتیەی کـەبۆیان دێـت دەڵـێن : ئەمەجادوویـەکی ئاشـکرایە.بەهەمان شـێ،ە ئەفـەرموێ: ﴿ فَقَالَ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ يُؤْثَرُ ﴿٢٤﴾ ﴾ (المـدثر)، بەهـەموو عەقڵیـەوە وتـی! ! ئـەم قورئانـە جگـە جـادوو نـەبێت کـە وەردەگیرێت هیچی تر نی یە! !...

جـارێ ئـەیانووت: ئەمـە شـیعرە، ﴿ أَمْ يَقُولُونَ شَاعِرٌ نَّتَرَبَّصُ بِهِۦ رَيْبَ ٱلْمَنُونِ ﴿٣٠﴾ ﴾ (الطـور) خوانەناس و دڵڕەقەکان دەڵێن: ئەمەشاعیرێکە و چاوەڕوانی مەرگی دەکەین ! !هـەروەها ﴿ بَلْ قَالُوٓا۟ أَضْغَٰثُ أَحْلَٰمٍۭ بَلِ ٱفْتَرَىٰهُ بَلْ هُوَ شَاعِرٌ فَلْيَأْتِنَا بِـَٔايَةٍ كَمَآ أُرْسِلَ ٱلْأَوَّلُونَ ﴿٥﴾ ﴾ (الانبیاء)، بەڵکو (شتی تریشیان) دەوت: (وەك ئـەوەی کـە گوایـە ئـەم قورئانـە): خـەوو

خەیاڵی بێ سەر و بنە، یاخود خۆی هەڵی بەستووە، بەڵکو ئەو کەسێکی شاعیرە، دەبا بەڵگە و موعجیزەیەك بهێنێت وەك پێغەمبەرانی پێشوو! ! ﴿ وَيَقُولُونَ أَئِنَّا لَتَارِكُوٓاْ ءَالِهَتِنَا لِشَاعِرٍ مَّجْنُونٍ ٣٦ ﴾ (الصافات)، دەیانوت: ئێمە چۆن واز لە خواکانمان دەهێنین بۆ شاعیرێکی شێت؟!

جارێ ئەیانووت:ئەم قورئانە خەوی تێکەڵ و پێکەڵە، وەك لە سورەتی (الانبیاء)دا ئاماژەی پێکراوە. جارێکی تر ئەیانووت: ئەمە قسەی هەڵبەستراوە، وەك ئەفەرموێ:

﴿ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۖ قُلْ فَأْتُواْ بِسُورَةٍ مِّثْلِهِۦ وَٱدْعُواْ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ٣٨ ﴾ (یونس)، بەڵکو (لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگانەدا) ئەوانە دەڵێن کە محمد ﷺ قورئانی هەڵبەستووە، بڵێ: دەئێوەش سوورەتێك وەك سوورەتەکانی دابڕێژن و بیهێنن، داوا بکەن لەهەر کەسێکی تر کە دەتوانن جگە لەخوا (کەیارمەتیتان بدات) درێغی مەکەن ئەگەر ڕاستگۆن، هەروەها ئەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ إِفْكٌ ٱفْتَرَىٰهُ وَأَعَانَهُۥ عَلَيْهِ قَوْمٌ ءَاخَرُونَ ۖ فَقَدْ جَآءُو ظُلْمًا وَزُورًا ٤ ﴾ (الفرقان)، ئەوانەی بێ باوەڕ بوون وتویانە: ئەم قورئانە درۆیەك نەبێت کە (محمد ﷺ) خۆی هەڵیبەستووە، شتێکی تر نییە، کەسانی تریش یارمەتیانداوە، بە ڕاستی ئەوانە (بەو گوفتارەیان) ستەم و بوختانێکی گەورە دەکەن و قسەیەکی ناڕەوایان کردووە.

بەم هەڵیت و پەڵیتانە وەسفی قورئان ئەکەن، کە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر گومڕایی و ونەفامیان، لەبەر ئەوە چەندین نمونە ئەهێننەوە و ڕێگای ڕاستیش نادۆزنەوە، بۆیە خوای گەورە وەڵامی نەفامی و گومڕایی و هەڵیت و پەڵیتەکانیان ئەداتەوەو ئەفەرموێ: ﴿ ٱنظُرْ كَيْفَ ضَرَبُواْ لَكَ ٱلْأَمْثَالَ فَضَلُّواْ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ سَبِيلًا ٤٨ ﴾ (الاسراء)، سەرنج بدە چۆن تۆ دەکەن بە نموونە (تاوێك دەڵێن: جادووگەر، دەمێك دەڵێن: شاعیر....هتد) سەرئەنجام خۆیان گومڕا کردووەو ناتوانن ڕێگەو ڕێبازێکی چاك و دروست بگرنەبەر.

**دووەم: قورئانی پیرۆز قسەی خوایە لە ڕێگەی نیگاوە دابەزیوە بۆ پێغەمبەرەکەی.**

وەلآمێکی تری قورئان ئەوە روون ئەکاتەوە کە ئەم قورئانە لە لایەن پەروەردگاری جیهانیانەوە دابەزێنراوە و پێغەمبەرێکی بەرێز رایدەگەیەنێت نە قسەی شەیتانی نەفرەتلێکراوە، نە شاعیر و نە فالچی وەك ئەوەی بانگەشەی بۆ دەکەن، بەڵکو نیگا و سروشی خوایە، جوبرەئیلسەلامی خوای لێبێت دەیگەیەنێت بە موحەممەدی پێغەمبەرﷺ، وەك ئەفەرموێ: ﴿ وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَاعِرٍۚ قَلِيلًا مَّا تُؤْمِنُونَ ﴿٤١﴾ وَلَا بِقَوْلِ كَاهِنٍۚ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٤٢﴾ تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٣﴾ ﴾ (الحاقە)، دڵنیابن کە ئەم قورئانە گوفتاری شاعیر نیە، ئەوە بۆ زۆر کەمتان باوەڕ دەهێنن؟! گوفتاری فالچی و زێوانیش نیە، ئەوە بۆ زۆر کەمتان یادەوەری وەردەگرن؟! بەڵکو ئەم قورئانە لەلایەن پەروەردگاری جیهانەکانەوە ڕەوانەکراوەو نێردراوەتە خوارەوە.

**سێیەم: ئەگەر موحەممەدﷺ لە ڕێگەی قورئانەوە درۆی بەدەم خوداوە بکردایە ئەوا دەستبەجێ تۆڵەی لێدەکرایەوە.**

خوای گەورە پاش ئایەتەکانی تر ئەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ ٱلْأَقَاوِيلِ ﴿٤٤﴾ لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِٱلْيَمِينِ ﴿٤٥﴾ ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ ٱلْوَتِينَ ﴿٤٦﴾ فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَٰجِزِينَ ﴿٤٧﴾ ﴾ (الحاقە)

خۆ ئەگەر محمد ﷺ هەندێك قسەو گوفتار بەدەم ئێمەوە هەڵبەستایە. ئەوە بەهێزو دەسەڵاتی خۆمان دەمانگرت.لەوەودوا ڕەگی دڵی دەپچڕێنین و دەیمرێنین. ئەوسا هیچ کەسێك نییە لە ئێوە بەربەست و بەرگری بکات لە ئێمە.

ئەمە یانی: ئەگەر موحەممەدﷺ درۆی بەدەمەوە بکردینایە وەك ئێوە دەڵێن و قسەی هەڵبەستایە بەناوی ئێمەوە و زیادەی بخستایەتەسەر پەیامەکانی ئێمە یان لێی کەم بکردایەتەوە یان شتێکی خۆی بووتایە و بیدایەتە پاڵ ئێمەکە وانیەئەوە بەپەلە تۆڵەمان لێئەسەندو هیچ یەکێکیش لە ئێوە نەیدەتوانی بکەوێتە نێوانمانەوە ئەگەر

نیازێکی لەو جۆرەمان هەبوایە، تیانەبردن و تۆڵەنەکردنەوەلێی بەڵگەیە کە پێغەمبەرﷺ درۆی بەدەم خواوە نەکردووە، بەمەش روون دەبێتەوە ئەگەر درۆ و قسەی بەدەم خواوە هەڵبەستایە رێگەی پێ نەئەدرا، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە کەسێکی راستگۆ و گوێڕایەڵ و پێگەیشتووە. چونکە خوا ئەوەی ئەو ئەیگەیەنێت بۆی ئەسەلمێنێت، پشتیوانیشی لێئەکات بە موعجیزەی ئاشکراو بەڵگەی سەلمێنەر، کەواتە ئەوەی موحەممەدﷺ هێناویەتی نەشیعرە و نە فاڵە و نە خەوی ناڕێك و پێکە، بەڵکو لە لایەن پەروەردگاری جیهانیانەوە بۆی هاتووە.

**چوارەم: شەیتانەکان توانا و دەسەڵاتی دابەزاندنی قورئانیان نیە.**

ئەو بوختانەی کە ئەڵێن شەیتانەکان ئەو قورئانەیان دابەزاندووە کە موحەممەدﷺ هێناویەتی بوختانێکی بێ بنەما و قسەهەڵبەستنێکی نابەجێیە، خوای گەورە لە چەند روویەکەوە رێگری لە شەیتانەکان دەکات کە ئەو کارە بکەن:

١. ئەو کارە بەوان ناکرێت، واتە لەگەڵ ئامانج و داخوازی ئەواندا یەك ناگرێتەوە، چونکە سیفەتی ئەوان هەوڵدانە بۆ خراپەکاری و لە خشتەبردنی بەندەکان، ئەم قورئانەش فەرمان بە چاکە ئەکات و رێگری لە خراپە ئەکات، و پڕە لە رووناکی و رێنمایی و هیدایەت و بەڵگەی گەورە، بۆیە ئەفەرموێ: ﴿ وَمَا يَنۢبَغِي لَهُمۡ وَمَا يَسۡتَطِيعُونَ ﴿٢١١﴾ ﴾ (الشعراء). شتی وا بەوان ناکرێت و هەرگیز ناتوانن بە کاری وا هەستن.

٢. ئەگەر رێگەشیان پێبدرایە هەر توانا و دەسەڵاتیان نەبوو، وەك خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿ لَوۡ أَنزَلۡنَا هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ عَلَىٰ جَبَلٖ لَّرَأَيۡتَهُۥ خَٰشِعٗا مُّتَصَدِّعٗا مِّنۡ خَشۡيَةِ ٱللَّهِۚ وَتِلۡكَ ٱلۡأَمۡثَٰلُ نَضۡرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ ﴾ (الحشر)، ئەگەر ئەم قورئانەمان دابەزاندایە سەر کەژو کێوێك، دەتبینی ملکەچ دەبوو، وردو و خاش دەبوو، شەق و پەق دەبوو، لە ترسی فەرمانی خوا، لە هەیبەتی گەورەیی و دەسەڵاتی خوا، ئێمە ئەم نموونانە

دەهێنینەوە بۆ خەڵکی بۆ ئەوەی بیربکەنەوە و ژیرییان بخەنە کار و شوێن قورئانی پیرۆز بکەون، هەروەها ئەفەرموێ: ﴿ .. وَمَا يَسْتَطِيعُونَ ﴿٢١١﴾ ﴾ (الشعراء).

٣. ئەگەر دەستی بدایە بۆیان و توانای هەڵگرتن و گەیاندنیشیان هەبوایە نەیانئەتوانی پێ بگەن، چونکە ئەوان بەرەبەستێکیان بۆ دانراوە لە بیستنی قورئان لە کاتی دابەزینیدا، چونکە ئاسمان پڕیەتی لە لە پاسەوانی بەهێز و تیری ئاگرینی ئەستێرەکان لەکاتی دابەزینی قورئاندا بۆسەر پێغەمبەرﷺ، بۆیە هیچ یەکێك لە شەیتانەکان توانای بیستنی یەك پیتیشیان نیە، بۆ ئەوەی کارەکە گومان و چەواشەکاری تێکەڵ نەبێت، ئەمەش لە بەزەیی خواوەیە بۆ بەندەکانی بۆ پاراستنی ئایینەکەیان، پاڵپشتیەکیشە بۆ قورئان و پێغەمبەرەکەیﷺ، وەك ئەفەرموێ: ﴿ إِنَّهُمْ عَنِ ٱلسَّمْعِ لَمَعْزُولُونَ ﴿٢١٢﴾ ﴾ (الشعراء)، بێگومان ئەو شەیتانانە لە بیستنی وەحی و فەرمانەکانی خوا کە ڕادەگەیەنرێت بە فریشتەکان دوور و بەرکەنارن.

هەر قورئان دەربارەی جنۆکە ئەفەرموێ: ﴿ وَأَنَّا لَمَسْنَا ٱلسَّمَآءَ فَوَجَدْنَٰهَا مُلِئَتْ حَرَسًا شَدِيدًا وَشُهُبًا ﴿٨﴾ وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَٰعِدَ لِلسَّمْعِ ۖ فَمَن يَسْتَمِعِ ٱلْـَٔانَ يَجِدْ لَهُۥ شِهَابًا رَّصَدًا ﴿٩﴾ ﴾ (الجن)، ئێمە جاران لە هەندێك شوێنی ئاسماندا خۆمان حەشاردەدا بۆ گوێگرتن و دەنگوباس بیستن، بەڵام ئێستا ئەوەی بیەوێت گوێ بگرێت یەکسەر نەیزەکێکی بۆ ئامادەیەو بۆی دەهاوێژرێت و لەناوی دەبات. جا بەڕاستی ئێمە نازانین ئایا نەخشەیەکی شەڕو وێرانکاری کێشراوە بۆ دانیشتوانی سەر زەوی، یاخود پەروەردگاریان دەیەوێت ڕێنموویی و هیدایەتیان بدات بۆ دینداری و سەرفرازی.

ئەمە باشترین وەڵامە بۆ ئەوەی کە بە پێغەمبەر ئەڵێن تۆ فاڵچی و کاهینی(غەیب ئەخوێنیتەوە)، گوایە ئەوەی کە ئەم قسانەی بۆ دێنێ شەیتانە ! چونکە بە بۆچوونی ئەوان فاڵچیەکان شەیتان قسەیان بۆ ئەهێنن، لە ڕاستیدا ئەو کاهینانە قسەی خۆیانە و

ئەیاندەنە پاڵ شەیتان –بەحسێبی خۆیان، قورئان ئەمە پووچنەکاتەوە کە قورئان ئەو جۆرە شتانە بێت، فاڵچیەکان هاوشێوەی قورئانیان پێ ناوترێت، شەیتانی فاڵچیەکانیش توانای ئەوەیان نیە هاوشێوەی قورئان بخەنە دڵی شوێنکەوتەکانیان، فاڵچێتی ساختەچێتی ودرۆو دەلەسە و چەواشەکاریە و قسەکانیان هەموو حەکایەتخوانیە و تا بێت ئەیدەنە دەمی و فراوانی ئەکەن.

**بەکورتی:**

- ئەم قسە و قسەڵۆکانە بەڵگەن لەسەر گومڕایی موشریکەکان و خۆپەرستی و لووتبەرزیان لەبەرانبەر هەق و راستیدا، قورئان کەلامی خوایە و لە رێگەی نیگاوە ناردوویەتی بۆ پێغەمبەرەکەیﷺ، نە شیعرە و نە فاڵە، ئەوان خۆشیان هیچ جۆرە شتێکیان لەو شتانە لە پێغەمبەرﷺ نەبینیوە تەنانەت پێش پێغەمبەرایەتیەکەشی.
- ئەگەر پێغەمبەرﷺ درۆی بەدەم خواوە بکردایە دەستبەجێ تۆڵەی لێئەکرایەوە کەسیش نەیدەتوانی لەسەری هەڵبداتێ، تۆڵە لێنەکردنەوەی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە قورئان دانراوی ئەو نیە و بەڵگەشە لەسەر دانپێدانانی خوا بۆ ئەو.
- شەیتانەکان ناتوانن قورئان دابەزێنن، چونکە ئەوەی لە قورئاندا هاتووە لەگەڵ سروشتی ئەواندا یەك ناگرێتەوە، ئەوان سروشتیان بە خراپەکاری و تاوان ناسراوە، قورئانیش پڕ لە رووناکی و رێنمایی و بەزەیی، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان رێگرییان لێکراوە لە بیستنی قورئان لە کاتی دابەزینیدا.

## گومانی بیست و سێ

### بانگەشەکردن بەوەی کە قورئان هەڵبەستراوی موحەممەد خۆیەتی ﷺ :*[101]

**ناوەڕۆکی گومانەکە:**

موشریکەکان بانگەشەی ئەوە ئەکەن کە قورئان دانراوی موحەممەدە ﷺ، خۆی هەڵیبەستووەو داویەتە پاڵ خواجل جلالە، خوای گەورە ئەفەرموێ : ﴿ وَإِذَا رَأَوْكَ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا أَهَٰذَا ٱلَّذِى بَعَثَ ٱللَّهُ رَسُولًا ﴿٤١﴾ ﴾ (الفرقان)، ئەوانەی بێ باوەڕ بوون وتویانە: ئەم قورئانە درۆیەك نەبێت کە (محمد) خۆی هەڵیبەستووە، شتێکی تر نییە، کەسانی تریش یارمەتیانداوە، بە ڕاستی ئەوانە (بەو گوفتارەیان) ستەم و بوختانێکی گەورە دەکەن و قسەیەکی ناڕەوایان کردووە، هەروەها ئەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالُوا۟ مَا هَٰذَآ إِلَّا رَجُلٌ يُرِيدُ أَن يَصُدَّكُمْ عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ ءَابَآؤُكُمْ وَقَالُوا۟ مَا هَٰذَآ إِلَّآ إِفْكٌ مُّفْتَرًى ۚ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٤٣﴾ ﴾ (سبأ)، جا ئەگەر ئایەتە ئاشکەاو ڕوونەکانی ئێمە بەسەریاندا بخوێنرێتەوە، (کافران) دەڵێن: ئەمە کابرایەکەو دەیەوێت لە ڕێگەو ڕێبازی باوانتان وێڵتان بکات، هەروەها دەڵێن: ئەمە شتێکی دەستهەڵبەست و هەڵبەستراوە، ئەوانەش کە کافرن دەربارەی ئەو حەق و ڕاستییەی کە بۆیان هاتووە دەڵێن: ئا ئەمە سیحرو جادوویەکی ئاشکرایە ! !.

---

١٠١-ئەو ئایەتانەی کە باس لەم گومانە ئەکەن بریتین لە:(هود/١٣، یونس/١٥،٣٨،سبأ/٤٣، الفرقان/٤، الطور/٣٣، المدثر/٣٥، الانبیاء/٥، السجدة/٣)، ئەو ئایەتانەش وەڵامی ئەم گومانە ئەدەنەوە بریتین لە:(البقرة/٢٣، هود/١٣،١٤، القصص/٤٩،الاسراء/٨٨،یونس/١٥،١٦،٣٧،٣٨، الحاقة/٤٣،٤٤).

**ڕێگاکانی پووچەڵکردنەوەی ئەم گومانە:**

١. نەخوێندەواری پێغەمبەرﷺ لە پێش دابەزینی قورئان و دوای دابەزینی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی قورئان نیگای خوایە و لە ئەوەوە هاتووە.

٢. موشریکەکان بەڵگەیان نیە لەسەر بانگەشەکەیان بەڵکو شوێن گومان کەوتوون.

٣. دەستەوسانی موشریکەکان لە ڕووبەڕووبوونەوەی قورئان بە هێنانی دە سوورەت یاخود یەك سوورەت هاوشێوەی قورئان سەلمێنەری بێبنەمایی و پووچی بانگەشەکەیانە.

٤. ئەگەر موحەممەدﷺ درۆی بەدەم خواوە بکردایە دەستبەجێ تۆڵەی لێئەکرایەوە.

**یەکەم: نەخوێندەواری پێغەمبەرﷺ لە پێش دابەزینی قورئان و دوای دابەزینی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی قورئان نیگای خوایە و لە ئەوەوە هاتووە.**

قورئانی پیرۆز موشریکەکانی دەمکوت ئەکردو بەبەڵگەی سەلمێنەر کۆتی کردن، وەڵامی بانگەشەکەیان ئەداتەوەو کە قورئان دانراوی موحەممەد بێت، وەڵامێك چەسپێنەری بەڵگەکان بێت، بەڵگەی ئاشکرای پێشکەش کردن لەسەر ئەوەی قورئان تەنیا لە لایەن خواوەیە، موحەممەدیش وەك هەموو ئادەمیزادەکانی تر دەستەوسانە لە لە هێنانی هاوشێوەیەکی قورئان کە وەك ئەو ڕێنمایی و بابەتی زانستی و زمانی پاراو لە خۆی بگرێت، بەڵگەی بەهێزی بۆ هێنانەوە لەسەر ئەوەی کە قورئان نیگای خوایە، لەڕێگەی ئەو پێشنیارەوە کە موشریکەکان کردیان بۆ پێغەمبەر و داوای ئەوەیان لێکرد کە ئەم قورئانە بگۆڕێت بۆیان، یان شتێکی تری جگە لە قورئانیان بۆ بهێنێت.

قورئان هەندێ شێوازی بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەریان لێدەگێڕێتەوە کە قورئان نیگای خوا بێت بۆ ئەو هاتبێت، ئەوان وا ئەهات بە خەیاڵیاندا کە موحەممەدﷺ خۆی ئەم قورئانەی داناوە، بۆیە یەکێك لە درۆکانیان ئەوە بوو کە پێیان ئەوت: ﴿...ٱئْتِ

بِقُرۡءَانٍ غَيۡرِ هَٰذَآ أَوۡ بَدِّلۡهُۚ ...﴿١٥﴾ ﴾ (يونس)، قورئانێکی تر بهێنە جگە لەمە، یان بیگۆڕە..
بە تەمای ئەوەی ئەگەر موحەممەدﷺ قورئانێکی تری هێنا یاخود جێگۆڕکێی پێکرد ئەوە بڕوای پێ ئەهێنن، ئەگەر لەگەڵ هەواو ئارەزووی ئەواندا یەکی گرتەوە.

واتای(غَيۡرِ هَٰذَآ ) یانی پێچەوانەی ئەم قورئانە، مەبەست لێی بە تەواوەتی پێچەوانەی قورئان بێت، یانی پشت بکاتە قورئان و بە کتێبێکی تر دەست پێبکاتەوە، بە شێوازێکی تر، وەك کتێبەکانی فارسەکان و شانامەکایان.

واتە کتێبێکی تر کە پێچەوانە نەبێت لەگەڵ ئارەزووەکانی ئەماندا و ئەمان رقیان لێی هەڵنەسێت، مەبەست بە( أَوۡ بَدِّلۡهُۚ ) لە ئایەتەکەدا ئەوەیە کە دەستکاری ئەم قورئانە بکات ئەو ئایەتانەی کە سەرزەنشتی موشریکەکان دەکات بیگۆڕێت بە باسی چاکەیکانیان و ئەو دەستەواژانەش کە سەرزەنشتی بتەکانیان ئەکات بیگۆڕێت بە سوپاس و سەناکردنیان، ئەو دەستەواژەنەش باسی زیندووبوونەوەو هەستانەوەی قیامەت ئەکات بیانگۆڕی بە شتانێکی تر پێچەوانە بێت، ئەو دەستەواژانەشی هەڕەشە لەوان ئەکات بیانگۆڕێت بە دەستەواژەی مژدەبەخش و دڵخۆشکەر بۆیان.[١٠٢]

(موجاهید)ی قوتابی ئیبن عەبباسی تەفسیرزان ناوی پێنج کەس لەوانە ئەبات کە ئەم قسەیان لە رووی پێغەمبەردا کردووەﷺ، کە ئەمانەن:عەبدولاّی کوڕی ئومەییە،وەلیدی کوڕی موغیرە،میکرەزی کوڕی حەفص،عومەری کوڕی عەبدولاّی کوڕی ئەبی قەیس،عاصی کوڕی عامیر، ئەمانە وتیان بە پێغەمبەرﷺ قورئانێکمان بۆ بێنە کە باسی وازهێنان لە بتی تێدا نەبێت باسی لات و عوززا و مەنات وهوبەل بە خراپە نەکات و زەمیان نەکات..[١٠٣]، خوای گەورە ئەفەرموێت:

---

١٠٢- التحرير و التنوير، الطاهر بن عاشور، سەرچاوەی پێشتر،مج٢،ج١١،ص١١٦، بە دەستکارییەوە.

١٠٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص١١٨.

﴿ ٱئۡتِ بِقُرۡءَانٍ غَيۡرِ هَٰذَآ أَوۡ بَدِّلۡهُۚ قُلۡ مَا يَكُونُ لِيٓ أَنۡ أُبَدِّلَهُۥ مِن تِلۡقَآيِٕ نَفۡسِيٓۖ إِنۡ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّۖ إِنِّيٓ أَخَافُ إِنۡ عَصَيۡتُ رَبِّي عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ ﴿١٥﴾ قُل لَّوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَا تَلَوۡتُهُۥ عَلَيۡكُمۡ وَلَآ أَدۡرَىٰكُم بِهِۦۖ فَقَدۡ لَبِثۡتُ فِيكُمۡ عُمُرٗا مِّن قَبۡلِهِۦٓۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴿١٦﴾ فَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوۡ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓۚ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴿١٧﴾ ﴾ (یونس)

کاتێکیش ئایەتەکانی ئێمە کە ڕوون و ئاشکرایە بەسەریاندا بخوێنرێتەوە، ئەوە ئەوانەی کە بەتەمانین ئامادەی بەردەم بارەگای ئێمە ببن دەڵێن: قورئانێکی جگە لەمە بهێنەو بیخوێنەرەوە، یان بیگۆڕە (بەشێوەیەکی تر)، تۆیش ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: من بۆم نیە لەخۆمەوە ئەوە بیگۆڕم، من شوێنی هیچ شتێك ناکەوم جگە ئەوە نەبێت کە بەوەحی پێم دەگات، بەڕاستی من دەترسم ئەگەر یاخی بم لە پەروەردگارم و نا فەرمانی بکەم گیرۆدەی سزایەکی سەختی ڕۆژێکی زۆر گەورەببم. پێیان بڵێ (ئەی پێغەمبەر ﷺ) ئەگەر خوا بیویستایە ئەوە قورئانم بەسەردا نەدەخوێندەوە، خوایش ئاگاداری نەدەکردن پێی، چونکە بەڕاستی ئاشکرایە کەمن تەمەنێکی دوورو درێژم لەناوتاندا بەسەر بردووە پێش هاتنی قورئان (بێ ئەوەی وشەیەك لەم قورئانە بزانم) کەواتە بۆچی عەقڵ وبیرو هۆشتان ناخەنەکار (کەسێکی نەخوێندەوار تا تەمەنی چل ساڵی هیچ نەڵێت، بەمەرجێك ناو بانگی دەرکرد بێت بەڕاستگۆیی و ئەمینداری، کەچی لەو تەمەنە بەدواوە ئەم قورئانە ڕێك و پێکە ڕابگەیەنێت، ئایا ڕەوا نیە هەر کەس دەیبیستێت خێرا بڕوا بهێنێت بەنێرەری قورئان و ئەو کەسەش کە بۆی ڕەوانەکراوە؟) جا کێ لەوە ستەمکارترە کە درۆ بە دەم خواوە هەڵدەبەستێت، یاخود ئایاتەکانی بە درۆ بزانێت و بڕوای پێی نەبێت، بەڕاستی تاوانباران سەرفراز نابن.

لەم چەند ئایەتەوە خاڵی دەسپێکی ئەو حەکایەتە دەرئەکەوێت کە کۆمەڵێ کەس دێنە لای پێغەمبەر و ئەو پێشنیارە نابەجێیە ئەکەن قورئان بە شێوەی هەواڵێك ئەیگێڕێتەوە کە دوو سوودی تێدایە:

یەکەمیان: ڕووەرگێڕانی ئاشکرا لێیان وەك ئەوەی کە هەر بوونیان نەبێت چونکە ئەوان شایستەی ئەوە نین خوا قسەیان لەگەڵدا بکات.

دووەمیان: تەڵقینکردنی پێغەمبەرﷺ بەوەلامدانەوەیان بە دەستەواژەی کاریگەر، واتە: ئەگەر قورئان بۆ ئەو نەتەوە بخوێنرێتەوە لە ساتی دابەزینیدا بەو شێوازە روون و ئاشکرایە لەبەرزترین پلەی رەوانبێژیدا(قَالَ الَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَاءَنَا)، ئەوانەی کە بەتەمانین ئامادەی بەردەم بارەگای ئێمە بن دەڵێن: قورئانێکی جگە لەمە بهێنەو بیخوێنەرەوە، ئەوەی دەردەکەوێت لە هۆی ووتنی ئەم قسانەدا ئەوەیە کە پێغەمبەرﷺ پێی ڕاگەیاندوون کە ئەم قورئانە لە لایەن خواوە بە شێوەی نیگا بۆی دابەزیوە، تا ئاگاداریان بکاتەوە، تەحەداشی کردن کە هاوشێوەی قورئان بهێنن ئەگەر گومانیان لەو قسەیە هەیە، بەلام ئەوان دەستەوسان بوون، وە گومانیان وا بوو کە قورئان نیگای خوا نیە و هی موحەممەدﷺ خۆیەتی، بەلام خۆ موحەممەد لە رەوانبێژیدا لەسەروو ئەوانەوە نەبوو، لە زانستیشدا بە هەمان شێوە لەپێش ئەوانەوە نەبوو،تەنانەت لە ریزی شاعیر و وتاربێژە رەوانبێژ و بە تواناکانی سەردەمی ئەوانیشدا نەبوو، بۆیە ویستیان تاقیبکەنەوە و داوایان لێکرد کە قورئانێکی تر بهێنێت جگە لەمەی کە هەیە، جیاواز بێت لە شێواز و هۆنینەوە و پەیامەکەیدا، یاخود بێت و دەستکاری بکات و هەندێ گۆڕانکاری پێویستی تێدا بکات و ئەو شتانەی ئەوان بێزار ئەکاتوەك سوکایەتیکردن بە بت و بتپەرستی و کافرکردنی خۆیان و باوباپیرانیان لای بەرێت و بیگۆڕێت! جا کە هات و ئەمەی کرد ئەوە بانگەوازەکەی کە ئەڵێ قورئان نیگای خوایە لە بناغەوە هەڵئەوەشێتەوە، ئەوپەڕی ئەوەیە کە قسەکانی ئەو لە قسەو شیعرەکانی ئەمان

بـەهێزترە و لـە ڕووی کاریگەریـەکی دەروونیەوەکـە لـە ئـەمان شـاراوەیە لـەمان زیـاتر کاریگـەری دروسـتئەکات، وەك جادووگەرییـەك نـەك وەك نیگایـەکی خـوایی، ئەمـە هـەر ئەوەیە کە هەندێ لە ئیفرەنجیەکان و لاساکەرەوەکانیان لـەم ڕۆژگـارەدا بانگەشـەی بـۆ ئەکەن.[١٠٤]

لەکاتێکدا پێشنیارەکەیان مانایەکی بێ پەردەی تێدابوو کـە هێنـانی قورئـانێکی تـرە یان گۆڕینی ئەم قورئانەیە، لە هەمان کاتدا مانایـەکی تـری ژێـر پەردەشـی تێـدا بـوو کـە ئەوەیە ئەیانەوێ بیسەلمێنن قورئان هی خوا نیە و هی موحەممەدە ﷺ خۆیەتی و نێرراوی خوا نەیهێناوە! بۆیە وەلامی قسەکەیان دوو وەلامە:

یەکەمیان:ئەوەیە کە خـوا فێـری ئـەکات تـا بلـێ: ﴿ ... قُلْ مَا يَكُونُ لِيٓ أَنْ أُبَدِّلَهُۥ مِن تِلْقَآيِٕ نَفْسِيٓ ... ﴿١٥﴾ ﴾ (یونس)، پێیان بلێ: من بۆم نیە لەخۆمـەوە ئـەوە بیگۆڕم..ئەمـە وەلامی پێشنیارە بێپەردەکەیانە.

دووەمیان: خوا فێری ئەکات بلێ: ﴿ قُل لَّوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا تَلَوْتُهُۥ عَلَيْكُمْ وَلَآ أَدْرَىٰكُم بِهِۦ ... ﴿١٦﴾ ﴾ (یونس)، پێیان بلـێ (ئـەی پێغەمبـەر) ئەگـەر خـوا بیویسـتایە ئـەوە قورئـانم بەسـەردا نەدەخوێنـدەوە، خـوایش ئاگـاداری نـەدەکردن پێـی. ئەمـەش وەلامـی نیـازە شاراوەکەیانە(کە پێشنیارەکەیان لەخۆیی ئەگرێت).

ئـەوە وەلامێکـە کـە پرسـیارەکەی ئـەوان ئـەیخوازێت،وەلامی پێشـنیارەکەیان بـە وتەیەکی کۆکراوە ئەداتەوە، بە دەربڕینێکی کورت و پوخت کە دەریدەخات کە وەلامەکە لـە خـودی پرسـیارەکەدایە، بۆیـە هەسـتیان بـەوە کـرد کـە گـۆڕینی قورئـان لـە لایـەن پێغەمبەرەوە محاڵە و ئەم وەلامەش بەسە بۆیان، چونکە گۆڕین یانی هێنـانی قورئـانێکی تـر و گۆڕانکـاریکردن تێیـدائیتر لـە دەربڕینەکانیـدا بێـت یـان لـەو پەیامانـەدا بێـت کـە

---

١٠٤– تفسير المنار،محمد رشيد رضا، سەرچاوەی پێشووتر،ج١١،ص٣١٩.

هێناویەتینەمە کارێکی محاڵە، دەی گۆڕینی محاڵ بێت کە بەشێکیەتی، ئەوە گۆڕینی هەمووی زیاتر مەحاڵ و نەگونجاوە، وەلأمەکە بەجوانترین دەربڕین بۆ رەتکردنەوەصیغ النفی داڕێژراوە، وەك ئەفەرموێ:( مَا يَكُونُ لِيَ أَنْ أُبَدِّلَهُ ) ئیمکان نیە بۆ من بیانگۆڕم!یانی توانای ئەوەم تێدا نیە بیانگۆڕم.

مانای(مِن تِلْقَآيِ نَفْسِيٓ ) یش ئەوەیە لە لە لایەن نەفس و خودی خۆمەوە، رستەی(إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ )، شەرحەو هۆی روونکردنەوەیە بۆ رستەی(مَا يَكُونُ لِيَ أَنْ أُبَدِّلَهُ )، ماناکەی ئەوەیە کە: من تەنیا شوێن ئەو نیگایانە ئەکەوم کە لە خواوە بۆم دێن، لە ئیمکانی مندا نیە دەستکاریان بکەم، شوێن کەوتنی نیگاش ئەوەیە ئەوەی بۆی هاتووە شوێنی بکەوێت و ئەو راسپاردە خواییانە بگەیەنێت.

رستەی ﴿ إِنِّيٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٥﴾ ﴾ وەك شەرح و باسکردنی هۆیە بۆ رستەی﴿ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ ﴾، واتە: ئەگەر سەرپێچی خوا بکەم و قورئانێکی تری جگە لەم قورئانە بهێنم، ئەمەش یانی: بەتاڵکردنەوەی ئەم قورئانە و قەرەبووکردنەوەی بە کتێبێکی تر، یان گۆڕینی بە کتێبێکی تر، یانی: گۆڕینی ئەو مانا و راستیانەی کە لەخۆی گرتووە، هەموو ئەمانە محاڵن، بۆیە ئەوەی نەخستووەتە دەمی پێغەمبەر کە بڵێ: کاتێك نەبێت خوا بیەوێ، یان شتێك لەو جۆرە.[١٠٥]

مەبەست ئەوەیە: پێیان بڵێ ئەی پێغەمبەرەکەی خوا: ئەوە نە کاری منە و نە پەیامەکەشم رێگەی ئەوەی پێداوم لە خۆمەوە گۆڕانکاری تێدا بکەم، یانی هەروا خودسەری کاری وا بکەم، من هەر ئەوە کارمە کە شوێن ئەو نیگایانە بکەوم کە خوا بۆمی ئەنێرێت و لەژێر رۆشنایی ئەو نیگایانەدا بجولێم، ئەگەر خوا شتێکی لێ بگۆڕێ بەوەی نەسخی بکاتەوە(سنووری بۆ دابنێ و تایبەتی بکات بە کەسێك یان حاڵەتێك) من

١٠٥- التحرير و التنوير، الطاهر بن عاشور، سەرچاوەی پێشتر، مج٦، ج١١، ص١١٩،١١٧، بەدەستکارییەوە.

ئەوە ئەگەیەنم، چونکە من تەنیا گەیاندنم لەسەرە، من لە سەرپێچیکردنی خوا ئەترسم، ئیتر هەر جۆرە سەرپێچیکردنێك بێت ئەترسم تووشی سزای رۆژێکی گەورە ببم، ئیتر چۆن ئەتوانم سەرپێچی بکەم لە گۆڕینیدا لەبەر حەز و ئارەزووی ئێوە، ئەوە وەڵامی بەشی دووەمی پێشنیارەکەیانە.[١٠٦]

پاشان خوای گەورە بە درێژتر وەڵامی لەتی یەکەمی پرسیارەکەیان ئەخاتە دڵی پێغەمبەرﷺ بەهۆی گرنگی بابەتەکەوە و ئەفەرموێ: ﴿ قُل لَّوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا تَلَوْتُهُۥ عَلَيْكُمْ ﴾ یانی: ئەگەر خوا ویستی وابوایە کەمن ئەم قورئانە نەخوێنمەوە بۆ ئێوە ئەوە نەمئەتوانی بیخوێنمەوە بۆتان، بەڵکو من بە فەرمانی ئەو بۆتانی ئەخوێنمەوە، و ویستی ئەو جێبەجێ ئەکەم، ﴿ وَلَآ أَدْرَىٰكُم بِهِۦ ﴾ یانی: ئەگەر خوا ویستی نەبوایە ئەوە نە منی ئەنارد و نە ئاگاداریشی ئەکردن لەم قورئانە، بەڵام ویستی وابووە کە منەتی خۆی برژێنێت بەسەرتانا و لە ئەم زانستە بەرزە ئاگادارتان بکات، بۆ ئەوەی ئێوەش لەژێر رۆشنایی ئەودا بجولێن، وەك ئەفەرموێ: ﴿ لَّٰكِنِ ٱللَّهُ يَشْهَدُ بِمَآ أَنزَلَ إِلَيْكَ أَنزَلَهُۥ بِعِلْمِهِۦ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَشْهَدُونَ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴿١٦٦﴾ ﴾ (النساء)، (ئەی محمد ﷺ)، هەرچەندە ئەو خەڵکە باوەڕت پێناکەن) بەڵام خوا خۆی شایەتە لەسەر ئەو قورئانەی کە ڕەوانەی کردووە بۆت، بەئاگاداری و زانیاری خۆیشی ڕەوانەی کردووە، فریشتەکانیش شایەتی دەدەن (لەسەر ئەوە، هەرچەندە) خوا خۆی بەسە بۆ ئەو شایەتییە. هەروەها ئەفەرموێت: ﴿ وَلَقَدْ جِئْنَٰهُم بِكِتَٰبٍ فَصَّلْنَٰهُ عَلَىٰ عِلْمٍ هُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٢﴾ ﴾ (الاعراف)، سوێند بێت بەخوا بەڕاستی ئێمە کتێبێکمان بۆ هێنان هەموو شتێکمان لەسەر بنچینەی زانستی و زانیاری تێدا ڕوون کردۆتەوە، هیدایەت و ڕەحمەت و ڕێنموویشە بۆ ئەو کەسانەی کە باوەڕی پێدەهێنن.

---

١٠٦- تفسير المنار، محمد رشيد رضا، سەرچاوەی پێشووتر، ج١١، ص٣١٩.

بێگومان ئەوەی کە قورئانی دابەزاندووە زانایە بەوەی کە هەموو ئەو شتانەی ئێوەی پێویستتانە لە هۆکارەکانی بەختەوەری و هیدایەت لە قورئاندا هەیە، وە فەرمانی پێکردووم بە گەیاندنی بە بێ ئەوەی هیچ زانیاریەکی پێش وەختم هەبێت،( فَقَدْ لَبِثْتُ فِيكُمْ عُمُرًا مِنْ قَبْلِهِ)، یانی: من پێشتر تەمەنێکی زۆرم لە نێو ئێوەدا بەسەر بردووەچل ساڵ نە سوورەتێکی هاوشێوەی ئەوەم پێ وتوون، نە ئایەتێك لە ئایەتەکانی قورئان بچێت، وە نەعیلم و عیرفانێکی وام هەبووە و نە رەوانبێژی و قسە رەوانیم هەبووە﴿ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٦﴾ ﴾ (یونس)، دەی عەقڵتان بەوە ناشکێت، ئەوەی چل ساڵ ژیابێت لەناوتانا و کتێبێکی نەخوێندبێتەوە، لە لایەن هیچ زانایەکەوە فێر نەکرابێت، چاوی لە هیچ ئایینێك نەکردبێت، هیچ شەریعەتێکی نەناسیبێت، هیچ هونەرێکی رەوانبێژی تاقینەکردبێتەوە لە شیعر و پەخشان و و وتار و زانست و دانایی، چۆن ئەوتوانێت لە خۆیەوە قورئانێکی موعجیزە بهێنێت کە کەس نەتوانێت وەك ئەو بڵێت؟! نەك ئەوە بەڵکو هەموو خەڵکی و تەنانەت هەموو ئەوانەی کە توێژینەوە لە ئایینەکاندا ئەکەن و لێکۆڵینەوە لەکتێبی فەلسەفە و مێژوودا ئەکەن ناتوانن هاوشێوەی قورئان بهێنن، دەی ئیتر چۆن پێشنیار بۆ کەسێکی وەك من ئەکەن کە قورئانێکی تر جگە لەم قورئانە دابنێم؟؟![١٠٧]

ئەمە بەڵگەیەکی عەقڵییە، شایەتی پووچی ئەو بانگەشەیە ئەدات کە داوای هێنانی قورئانێکی تریان لە پێغەمبەری خواﷺ ئەکرد، زانایانی ئەم سەردەمەش بەهۆی ئەو ئاستە بەرزەیان لە زانستی دەروونناسی و کۆمەڵناس و ناسینی سروشت و رەوشتی مرۆڤەکاندا ئەوەیان سەلماندووە کە ئامادەیی مرۆڤ بۆ هەڵکەوتوویی ویلیمەتبوون لە رووی عەقڵی و نەفسیەوە لە کاتی گرێی دووەم و سێیەمی تەمەنیدا دەرئەکەوێت، ئەوان

---

١٠٧- هەمان سەرچاوەی پێشوو،ص٢٣٠ بەدەستکارییەوە.

ئەوەیان ساغکردووەتەوە کە ئامادەیی عەقڵی مرۆڤ بۆ وەرگرتنی زانست و ئامادەیی دەروونی بۆ ئەنجامدانی کارە نەتەوەییە گەورەکان، یان کارە گەورە جیهانیەکان لەسەرەتای پێگەیشتنیەوە دەرئەکەوێت، مرۆڤ کە گرێی دووەم و سێیەمی تەمەنی ئەکاتەوە ئیتر ئەگاتە ترۆپکی ئامادەییەکانی، جا ئەگەر گەیشتە س و پێنجی تەمەنی و هیچ نیشانەیەکی بلیمەتی و هەڵکەوتوویی لێوە دەرنەکەوت لەو زانستانەی کە پێشتر خەریکیان بووە، یان شانی نەدابێتە ژێر کارێکی گشتی کە ملی بۆی بەرزئەکردەوە، ئیتر ئەوە محاڵە دوای ئەو تەمەنە نە لە میاندا و نە لەویاندا هەڵبکەوێت سەرلەنوێ، یان سەرکەوتنی گەورە بەدەست بهێنێت.

بە دڵنیاییەوە قورئان هاتووە بۆ ئەوەی هەرچی راستی هەیە بیدات لە بێژنگ چ زانستە ئایینیەکان بێت یان زانستە یاساییەکان بێت، ئەو زانستانەی کە چاکبوون و خێرو خۆشی مرۆڤەکانی لەسەر راوەستاوە، پێغەمبەریشﷺ کە خوا قورئانی بۆ ناردووە هەستاوە بە جێبەجێکردنی ئەو چاکسازیانە و رووی زەوی گۆڕی لە کاتی خۆیدا، بارودۆخی میللەتانی گۆڕی بۆ باشتر لەوەی تێیدا بوون، ئەمەشی دوای ئەوە کرد کە گرێی چوارەمی تەمەنی کردبووەیە و چل ساڵیبە نەخوێندەواریش تێپەڕاندبوو، ئەم زانستە تازەش ئەو بەڵگە عەقڵییەی قورئان پشتڕاست ئەکاتەوە لەم سەردەمەدا و ئەیسەلمێنی قورئانیش لەو زانستانەی تێدایە.[١٠٨]

ئەم وەڵامە ئەو بەڵگەی تێدایە کە پێغەمبەرﷺ لە لای خواوە رەوانە کراوە، قورئانیش دانراوی ئەو نیە، بەبەڵگەیەك کە چەندین بەڵگەی تر ئەگرێتە خۆی، بلگەکەش بە شێ، ازێك دارێژراوە کە داواکراوەکە ئەسەلمێنێ بە نەفیکردنی پێچەوانەکەی، ئایەتی(لَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا تَلَوْتُهُ) بەم شێوەیە تەقدیر ئەکرێت: ئەگەر خوا ویستی وا بێت بۆتان نەخوێنمەوە ئەوە بۆتانم نەئەخوێندەوە، چونکە کرداری ویست کارپێکراو

---

١٠٨- هەمان سەرچاوەی پێشوو،ص٢٣٠ بەدەستکارییەوە.

ئەسڕێتەوە، لە رستەی مەرجدا، بۆ ئەوەی بەڵگە بێت بۆ پاداشتەکەی، بەڵکو بەڵگە لەسەر نەبوونی ویستی خوا بنیاتنراوەکە نەفی خوێندنەوە بکات، چونکە ئەوە بانگەشەی بێ باوەڕەکانە کە لە لایەن خوداوە نیە، لەسەرەتاوە بەڵگەکە پووچکەرەوەی بانگەشەکەیانە، وە چەسپاندنی بانگەوازەکەیە لە داهاتوودا، کۆکردنەوەی ئەم دوو کارە بەهێزی و جوانی بەڵگەهێنانەوەکە ئەخاتە روو، واتە ئەگەر خوا ویستی وانەبوایە ئەم قورئانەتان بۆ بهێنم منی وەك پێغەمبەرێك رەوانە نەئەکرد بۆی، منیش لەسەر حاڵەتی ئاسایی خۆم ئەمامەوە.

بەڵگەی دووەم پێچراوەیە: ئەویش وەڵامی(لو) ئەیخوازێت، چونکە وەڵامی(لو) ئەخوازێت راستەوانەبێت لەگەڵ ماناکەیدا، یانی ئەبێ پێچەوانەی مانا داواکراوەکە بسەلمێنێت، وەلامی (لو) هەندێ جار ئەوترێت و هەندێ جار حەزف ئەکرێت،مەبەستەکە لێرەدائەوەیە: ئەگەر خوا ویستی لەسەر بوایە بۆم نەدەخوێندنەوە، بەڵام ئەوە بۆم خوێندنەوە، دەی ئەم خوێندنەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی قورئان پەیامی خوایە ! چونکە خوێندنەوەکە ئیعجازێکی زانستی لە خۆ دەگرێت، ئەویش ئەوەیە کەسێك قورئانی هێناوە بۆ لاتان کە ئەهلی رەوانبێژی وفەلسەفە نیە، هەروەها کتێبێکی هێناوە کە شارەزایانی زمانەوانی و رەوانبێژی بە جیاوازی ئاستەکانیانەوە دەسەوسان کردووە، هیچ دروستکراوێك نیە لە هەمووان باشتر بێت و قسەکانی بە جۆرێك بێت کەسی تر نەتوانێ هاوشێوەی ئەو بهێنێت.

لەبەر ئەوە لقێك بۆ بەڵگەهێنانەوەکە زیادکراوە ئەویش رستەی ﴿.. فَقَدْ لَبِثْتُ فِيكُمْ عُمُرًا مِّن قَبْلِهِۦٓ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ١٦﴾ (یونس)، ئەمە بیرخستنەوەیە بۆیان: لە رابووردوودا حاڵ و ژیانی بۆ ئێوە ئاشکرا بووە، یەکێك لەوانە نەخوێندەوارییەکەی، واتە من ماوەیەکی درێژ لەناو ئێوەدا بووم، ماوەی چل دانە ساڵ هەموو قۆناغەکانی ژیانی

منتان بینیوه، له هیچ قۆناغێکدا حاڵەتی مەزنایەتی و عەبقەریبوونتان لە مندا بەدی نەکردووه، وەك ئەو حاڵەی کە بە هاتنی نیگای خوا بۆ من دروست بووه، نە روانبێژ بووم لە قسەکردندا ونە ناوبانگیشم هەبوو لە رەوانبێژی و وتاردان و شیعر وتندا، بە جۆرێگ هاوشێوەی ئەم قسانە بێت کە بەهۆی نیگای خواوە ئەیانخوێنمەوە، ئەم حاڵەتەی کۆتایی بەڵگەیە لەسەر ئەو پەڕی بەندایەتیبوونی، ئەم کەلامەش نیگای خوایە و لە لای ئەوەوە بۆی هاتووە، خودی خۆی هیچ کارێکی تێدا نەکردووە..ئەمە روونکردنەوەی ئەو رێکوپێك و تێر و تەسەلییەیە کە ئەم بەڵگەیە گرتوویەتیە خۆی.

ئەم بەڵگەیە سەرەنجامەکەی ئەوەیە کەملیان پێبدا بۆ ئەوەی قورئان موعجیزەیە، وشەی(تَلَوْتُهُ) لە واقیعدا تەنیا قورئان ئەگرێتەوە نەك جگە لە قورئان، چونکە ئەم وشەیەی سێ شتی تێدایە (خوێنەرێك)، (خوێنراوەیەك)، (هاندەرێك بۆ ئەو خوێندنەوە).

بە یەکەمیان ئاماژە بۆ موعجیزەیەك ئەکات کە خوێنەرێك کتێبێك ئەخوێنێتەوە لەگەڵ ئەوەدا کە هەموو ئەزانن نەخوێندەوارە! چونکە خوێندنەوەی کتێبی ئایینی جیایە لە خوێندنەوەی وتار و شیعر کە عەرەب پێی ئاشنا بوون، بەدووەمیان ئاماژە بۆ ئەم قورئانە ئەکات کە خۆی بۆ خۆی موعجیزەیەکی ئاشکرایە و بەڵگەیە لەسەر راستگۆیی ئەو کەسەی هێناویەتی، لەبەر ئەو هەمووە راستی و رێنماییە ئایینیانەی لەخۆیی گرتووە، ئەمە هەڵسوکەوتی پێغەمبەرانی خاوەن پەیام و زاناکانی پەیامە ئایینیەکانە، وەك خـوا ئەفـەرموێ: ﴿ وَمَا كُنتَ تَتْلُواْ مِن قَبْلِهِۦ مِن كِتَٰبٍ وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَ ۖ إِذًا لَّٱرْتَابَ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾ (العنکبوت)، تۆ ئەی پێغەمبەر! پێش ناردنی ئەم قورئانە هیچ کتێبێکت نەدەخوێندەوە، بە دەستی خۆیشت هیچ شتێکت نەنووسیووە، (چونکە نەخوێندەوار بوویت) خۆ ئەگەر شتیکی وات ئەنجام بدایە، لەو کاتەدا نەفام و دەم بە تاڵەکان دنیایان پڕ دەکرد لە شك و گومان (کە گوایە قورئان لە دانان و داڕشتنی تۆیە).

به سێیەمیشیان ئاماژە بۆ ئەوە ئەکات کە قورئان کەلامی خوایە، کەواتە بەم بەڵگەیە ڕاستگۆیی پێغەمبەرﷺ لە پەیامەکەیدا ئەسەلمێنیٚ!

کاتێك بیانووی بڕین و بەڵگەی تەواوی دا بە دەستیانەوە کە قورئان لە لای خواوە هاتووە و ئەو ناتوانیٚ لە خۆیەوە هاوشێوەی قورئان بهێنێت ئەوە ئەم قسە لقێکی لیٚ دروست ئەبێت ئەویش ئەوەیە: کەسێك بوختان بۆ خوا ئەکات بەدرۆ، کەسێکیش ئایەتەکانی خوا بەدرۆ ئەزانیٚ هەردووکیان ستەمکارترین کەسن، کەس لە ئەوان ستەمکارتر نیە!

ئەم شێوازە ڕۆیشتنە لەگەڵ ناحەزەکەی بەرانبەرتا تا بخلیسکیٚ و تیٚ بکەویٚ، سەرەتا وا تێئەگەی کە هەردوولا یەکسانن، بەڵام کاتێك ماناکە ڕۆشن ئەبێتەوە دەرئەکەوێت کە بەرانبەر تێکەوتووە، خوای گەورە ئەفەرمویٚ: ﴿ فَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوۡ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓۚ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴿١٧﴾ ﴾ (یونس). جا کیٚ لەوە ستەمکارترە کە درۆ بە دەم خواوە هەڵدەبەستێت، یاخود ئایاتەکانی بە درۆ بزانێت و بڕوای پێی نەبێت، بەڕاستی تاوانباران سەرفراز نابن.[١٠٩]

ئەمەش هەر وەك تەواوکەرێك وایە بۆ وەڵامی پێشنیاری موشریکەکان، لەڕاستیدا قورئان وەڵامی قسەبڕیان ئەداتەوە:

یەکەم: ڕوونکردنەوەی ئەوەی هەیە لە واقیعەکەدا، ئەویش ئەوەیە کە گۆڕینی قورئان کاری خودی پێغەمبەر نیەﷺ، خواش ئیزنی ئەو کارەی پێنەداوە، بەڵکو ئەگەر کاری وابکات خوا سزای توندی ئەدات و تۆڵەی لیٚ ئەسەنێت، چونکە ئەوە قسەی تایبەتی خوایە.

---

١٠٩- التحرير و التنوير، الطاهر بن عاشور، سەرچاوەی پێشتر، مج٦، ج١١، ص١٢٣،١٢٠، بە دەستکارییەوە.

دووەم: بە هێنانەوەی بەڵگەی عەقڵی لەسەر ئەوەی قورئان تەنیا کەلامی خوایە، پێغەمبەرﷺناتوانێ وەك قورئان بهێنێت، دوای ئەم دوو بەڵگە بەبەڵگەی سێیەم ئەم دوانە پشت قاییم ئەکات کە ئەویش ئەوەیە خراپترین جۆرەکانی ستەم لە نێ‌ان مرۆڤەکاندا دوو شتە:

یەکەمیان: درۆکردنە بەدەم خواوە، کە ئەوان بە هۆی رقەوە ئەو پێشنیارەیان کرد بۆ پێغەمبەرﷺ.

دووەمیان: بەدرۆزانینی ئایەتەکانی خوا، کە ئەوان بەهۆی تاوانەکانیانەوە کەوتبوونە ناوی..خوای گەورە ئەم کارەیان بەشێوەی پرسیاری ئینکاری دەرئەخات، یانی: هیچ کەسێك ستەمکارتر نییە لای خوا و شایانی غەزەب و سزای خوا نیە جگە لەو دوو تاقمە ستەمکارە، من لۆمەی خەڵك ئەکەم بۆ خاڵی دووەم ئیتر چۆن رێگە بەخۆم ئەدەم بەخاڵی یەکەم کە لە ئەو خراپترە؟! ئەم تاوانە گەورەیە چ سوودێکی بۆ من هەیە لە کاتێکدا من ئەمەوێ چاکسازی بکەم! لەو پێناوەشدا سەختیەکان قەبوڵ ئەکەم و دەشزانم کە﴿ ...لَا يُفْلِحُ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿١٧﴾ ﴾ (یونس). ستەمکار سەرکەوتوو نابێت، واتە داواکاریەکەیان سەرکەوتوو نابێت کە لەرێگەی درۆ و شایەتی ناهەقەوە هەوڵی بۆ ئەدەن.[١١٠]

پاشان قورئان بەڵگەیەکی ئاشکرا و بەرجەستە دەخاتە روو بۆ موشریکەکان ئەویش ئەوەیە کە پێغەمبەرﷺ بە نەخوێندەواری لەناویاندا ژیاوە، نە خوێندوویەتی و نە نووسیویەتی، تەنانەت دێڕێکیشی نەنووسیوە بە دەستی خۆی، ئیتر چۆن ئەم شتانە لە کتێبە پێشووەکانەوە فێر بووە؟

---

١١٠- تفسير المنار، محمد رشيد رضا، سەرچاوەی پێشووتر، ج١١، ص٣٢٣،٣٢٢.

ئەمە ئاشکراترین بەڵگەیە کە قورئان لە لایەن خواوەیە، وەك ئەفـەرموێ: ﴿ وَمَا كُنتَ تَتْلُواْ مِن قَبْلِهِۦ مِن كِتَٰبٍ وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَ ۖ إِذًا لَّٱرْتَابَ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴿٤٨﴾ بَلْ هُوَ ءَايَٰتٌۢ بَيِّنَٰتٌ فِى صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْعِلْمَ ۚ وَمَا يَجْحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾(العنكبـوت)، تـۆ ئـەی پێغەمبەر! پێش ناردنی ئەم قورئانە هیچ کتێبێکت نەدەخوێندەوە، بە دەستی خۆیشت هیچ شتێکت نەنووسیووە، (چونکە نەخوێندەوار بوویت) خۆ ئەگەر شتیکی وات ئـەنجام بدایە، لەو کاتەدا نەفام و دەم بە تاڵەکان دنیایان پڕ دەکرد لە شك و گومـان (کـە گوایـە قورئان لە دانان و داڕشتنی تۆیە). نەخێر هـی تـۆ نییـە، بـەڵکو قورئـان چـەند ئایـەتێکی ڕوون و ئاشکران لە سینەو دڵ و دەروونی ئەو کەسانەدا عیلم و زانستیان پێبەخشـراوە و لەبەریانە، بەڕاستی جگە لە ستەمکاران، کەس بەرهەڵستی و نکوڵی لـە ئایەتـەکانی ئێمـە نیە. ئەمە یانی: ئـەی موحەممـەد تـۆ تەمـەنێك لـە نێو گەلەکەتدا ژیـاوی پـێش ئـەوەی قورئانت بۆ داببەزێت، نە کتێبێکت خوێندووەتەوە نە نووسینێکیشت خوێندووەتەوە، نـە نووسینیشــت زانیــوە، بــەڵکو هەریــەکێك لــە گەلەکــەت زانیویانــە کــە تــۆ پیــاوێکی نەخوێندەواری، ئەمەش سیفەتی پێغەمبەرە لە کتێبە پێشووەکاندا، وەك ئەفەرموێ:

﴿ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِىَّ ٱلْأُمِّىَّ ٱلَّذِى يَجِدُونَهُۥ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ يَأْمُرُهُم بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَىٰهُمْ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَٱلْأَغْلَٰلَ ٱلَّتِى كَانَتْ عَلَيْهِمْ ۚ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَٱتَّبَعُواْ ٱلنُّورَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ ۙ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٥٧﴾ ﴾ (الاعراف)

ئەوانەی کـە شـوێنی ئـەم (محمـدﷺ پێغەمبـەرە هەواڵـدەرە نەخوێنـدەوارە دەکـەون ئەوەی کە (گـاورو جـوو، نـاوو نیشـانیان) دەسـتیان دەکـەوێت نووسـراوە لای ئـەوان لـە تەورات و ئینجیلدا، فەرمانیان پێدەدات بەچاکەو قەدەغەی گوناهو خراپەیان لێدەکات و هەرچیەك پاکو چاکە بۆیان حەڵاڵ دەکات و هەرچی پیس و ناپوختە لێیان حەرام دەکات

و ئەرکە قورس و سەنگینەکان لەسەرشانیان لادەبات، ئەو کۆت و زنجیرانەش کە لەسەریان بوو لای دەبات (وەك خۆ کوشتن لەکاتی تەوبەدا... هتد)، جا ئەوانەی باوەڕیان پێ هێناوە و پشتیوانیان لێکردوە و پشتگیریان کردووە و شوێنی ئەو نوورە کەوتوون (کە قورئانە) و هاوڕێ لەگەڵیدا ڕەوانە کراوە، هەر ئەوانە سەرفرازو ڕزگارن.

ئەمە ژیانی پێغەمبەر بووەﷺ و ژیانیشی وا ئەبێت تا ڕۆژی قیامەت نە پیتێك و نە نە رستەیەك بە دەستی خۆی نانووسێت، بەڵکو نووسەری زۆری لابووە و هەم نیگای پێ نووسیوونەتەوەو هەم نامەی پێ نووسیوون بۆ هەرێمە جیاجیاکان.

بەم شێوازە قورئان شوێن گومانەکانیان دەکەوێت، تەنانەت گومانی منداڵانە و ساویلکەش، پێغەمبەرﷺ ماوەیەکی زۆری ژیانی لە نێو ئەواندا بە نەخوێندەواری بەسەر بردووە، نە نووسیویەتی و نەخوێندوویەتیەوە، پاشان ئەم کتێبە سەرسوورهێنەرەی هێناوە کە نووسەرە شارەزاو زاناکانیشی دەستەوسان کردووە، لەوانەیە گومانەکەیان لە جێگەی خۆیدا بوایە ئەگەر پێشتر خوێندەوار بوایە، بەڵام گومان لە چی ئەکەن کە ئەوە رابردووی ئەوە لە نێوانیاندا؟

ئەوە گریمان پێغەمبەرﷺ خوێندەواریش بوو ئەینووسی و ئەیخوێندەوە، هەر دروست نەبوو ئەو گومانە بەرن، چونکە خودی قورئان شایەتی ئەدات کە دانراوی دەستی مرۆڤ نیە، ئەو زۆر لە تواناو لە زانست و لە ئاسۆی مرۆڤەکان گەورەتر و باڵاترە، ئەو راستیانەش کە لەم قورئانەدا راستی رەهان وەك چۆن راستیەکانی ئەم گەردوونە راستی رەهان، هەر هەڵوێستەیەك لەبەردەم دەقەکانی ئەم قورئانەدا نیگا بۆ دڵ ئەکات کە لە پشت ئەم فەرمایشتانەوە هێزێك بوونی هەیە، دەربڕینەکانی دەسەڵاتیان بەسەر دڵەوە هەیە، ئەم دوانەش لە قسەی بەشەرەکاندا نین.[111]

---

١١١- في ظلال القران، سيد قطب، سەرچاوەی پێشتر، ج٥، ص٢٧٤٦.

بەڵگەهێنانەوە بە نەخوێندەواری پێغەمبەرﷺ کە بەوە ناسراو بوو، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە نیگای خوایی بۆ هاتووە، لە چەند جێگای قورئاندا بەڵگە بەمە هێنراوەتەوە، وەك ئەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ وَلَٰكِن جَعَلْنَٰهُ نُورًا نَّهْدِى بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَا ۚ وَإِنَّكَ لَتَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٢﴾ ﴾ (الشورى)، ئەی محمد! ئا بەوشێوەیەی کە وتمان ئێمە قورئانمان بۆ ڕەوانە کردیت لە لایەن خۆمانەوە (کە ژیانبەخشە بە ڕوح و گیان و عەقڵ)، تۆ نەتدەزانی قورئان چیە و ئیمان چیە، بەڵام ئێمە ئەم قورئانەمان کردە ڕوناکی ونورێك کە هیدایەت و ڕێنمویی هەر کەس کە بمانەوێت لە بەندەکانمانی پێ دەکەین، (ئەوانەی دڵی بۆ دەکەنەوە و بەچاکی گوێ بۆ دەگرن)، بێگومان تۆ ئەی پێغەمبەر ﷺ ڕێنیشان دەریت و ڕێنموی دەکەی بۆ ڕێگە و ڕێبازێکی ڕاست و دروست... ﴿ ... فَقَدْ لَبِثْتُ فِيكُمْ عُمُرًا مِّن قَبْلِهِۦٓ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٦﴾ ﴾ (یونس)،[112] بەڕاستی ئاشکرایە کەمن تەمەنێکی دوورو درێژم لەناوتاندا بەسەر بردووە پێش هاتنی قورئان (بێ ئەوەی وشەیەك لەم قورئانە بزانم) کەواتە بۆچی عەقڵ وبیرو هۆشتان ناخەنەکار ﴿ بَلْ هُوَ ءَايَٰتٌۢ بَيِّنَٰتٌ فِى صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ ۚ وَمَا يَجْحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾ (العنکبوت)، نەخێر هی تۆ نییە، بەڵکو قورئان چەند ئایەتێکی ڕوون و ئاشکران لە سینەو دڵ و دەروونی ئەو کەسانەدا عیلم و زانستیان پێبەخشراوە و لەبەریانە، بەڕاستی جگە لە ستەمکاران، کەس بەرهەڵستی و نکوڵی لە ئایەتەکانی ئێمە نیە.

ئەوانە کۆمەڵە بەڵگەیەکی ئاشکران لە دڵی ئەو کەسانەی کە خوا زانستێکی پێ بەخشیوون هیچ ساختەکارییەك و چەواشەکاریەکی تێدا نیە، وە گومان و دوودڵیشی تێدا نیە، کۆمەڵە بەڵگەیەك لە دڵیاندا ئەوەندە روونە دڵیان ئارام ئەگرێت پێی و داوای بەڵگەی

---

١١٢- التحرير و التنوير، الطاهر بن عاشور، سەرچاوەی پێشتر،مج١٠،ج٢١،ص١٠، بە دەستکارییەوە.

تر ناکات، چونکه ئەوە خۆی بەڵگەی حاشاهەڵنەگرە، زانیاریە بە مانای وشەی زانیاری، ئەو زانیاریەی کە دڵی مرۆڤ ئەبینێ لە خواری خوارەوەی ناخیدا جێگیر بووەو لەوێوە هەڵئەقوڵێت، و چرای بۆ هەڵئەکات و رێگەی بۆ روونئەکاتەوە تا خۆی پەیوەست بکات بەو داوەوە کە لەوێدایە، ﴿وَمَا يَجْحَدُ بِـَٔايَـٰتِنَآ إِلَّا ٱلظَّـٰلِمُونَ ﴿٤٩﴾﴾ (العنكبوت)، بەڕاستی جگە لە ستەمکاران، کەس بەرهەڵستی و نکوڵی لە ئایەتەکانی ئێمە نیە.

ئەوانەی کە دادپەروەر نین لە سەلماندنی راستیەکاندا، ئەوانەی کە بازئەدەن بەسەر راستیەکانداو خۆیان دوور ئەگرن لە رێگای راست! [113] (R)

**دووەم: موشریکەکان پشت بەبەڵگە نابەستن لە بانگەشەکەیاندا.**

قورئان روونی کردووەتەوە کە موشریکەکان پشت بەبەڵگە نابەستن، بەڵکو تەنیا شوێن گومان ئەکەون کە دوورە لە راستی، ﴿وَمَا يَتَّبِعُ أَكْثَرُهُمْ إِلَّا ظَنًّا ۚ إِنَّ ٱلظَّنَّ لَا يُغْنِى مِنَ ٱلْحَقِّ شَيْـًٔا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِمَا يَفْعَلُونَ ﴿٣٦﴾ وَمَا كَانَ هَـٰذَا ٱلْقُرْءَانُ أَن يُفْتَرَىٰ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَـٰكِن تَصْدِيقَ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ ٱلْكِتَـٰبِ لَا رَيْبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٣٧﴾ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۖ قُلْ فَأْتُوا۟ بِسُورَةٍ مِّثْلِهِۦ وَٱدْعُوا۟ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿٣٨﴾ بَلْ كَذَّبُوا۟ بِمَا لَمْ يُحِيطُوا۟ بِعِلْمِهِۦ وَلَمَّا يَأْتِهِمْ تَأْوِيلُهُۥ ۚ كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٣٩﴾﴾ (يونس)، زۆر بەیان شوێنی هیچ شتێك ناکەون تەنها گومان نەبێت، بەڕاستی گومانیش هیچ سوودێك بەخاوەنەکەی ناگەیەنێت لەبارەی حەق و ڕاستیەوە، بەڕاستی خوا زانایە بەهەموو ئەو کارو کردەوانەی کەئەنجامی دەدەن.

---

١١٣- في ظلال القران، سيد قطب، سەرچاوەی پێشتر، ج٥، ص٢٧٤٦>

(R) بۆ بابەتی"نەخوێندەواری پێغەمبەر (ﷺ) شێوازی دووەم لە گومانی نۆیەم لە بەرگی شەشەمدا (بیروباوەڕی ئیسلامی و بابەتەکانی یەکخواپەرستی).

وەنەبێت ئەم قورئانە لەلایەن کەسێکەوە داڕێژرابێت و هەڵبەسترابێت جگە لەخوا، بەڵکو ڕاستی و ڕەوانی کتێبە ئاسمانیەکانی پێش خۆشی دووپات دەکاتەوە، هەروەها ڕوونکەرەوەی بیرو باوەڕو ئەرکەکانە، بەڕاستی هیچ گومان لەوەدا نیە کە ئەم قورئانە لەلایەن پەروەردگاری هەموو جیهانەوە ڕەوانەکراوە. بەڵکو (لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگانەدا) ئەوانە دەڵێن کە محمد قورئانی هەڵبەستووە، بڵێ: دە ئێوەش سوورەتێك وەك سوورەتەکانی داڕێژن و بیهێنن، داوا بکەن لە هەر کەسێکی تر کە دەتوانن جگە لەخوا (کە یارمەتیتان بدات) دریغی مەکەن ئەگەر ڕاستگۆن. بەڵکو سەرەڕای ئەو هەموو بەڵگانە ئەوانە بڕوایان بە قورئان نەکردووە کە هیچ شتێکیان نەزانیووە دەربارەی، هێشتا بۆیان نەهاتووە سەرئەنجامی ئەو بەڵێنانەی کە بەڵێنی پێداون، هەر بەو شێوەیە ئەوانەی پێش ئەمان بەرنامەی خوایان بە درۆ زانی و بڕوایان پێی نەبوو، دەتەماشا بکە و سەرنج بدە بزانە سەرئەنجامی ستەمکاران چۆن بووە.

پاش ئەوەی سەلماندی کە قورئان لای خواوە هاتووە و موحەممەدیش ﷺ دەستەوسانە وەك هەموو کەسێکی تر لە هێنانی هاوشێوەی ئەو قورئانەی لێوان لێوە لە هیدایەت و زانست و شێوەزمانەکەیدا، حاڵی ئەوانەشی ڕوونکردووەتەوە کە زۆربەیان دوای بچوکترین گومانی لاواز کەوتوون لە بیروباوەڕیاندا، پاشان گەڕاوەتەوە بۆ هەڵوەشاندنەوەی بۆچوونە ناوبۆشەکەیان لە تانەدانە لەم قورئانە، تەنیا لەبەر گومانێکی لاواز کە هی زۆربەیانە، و کەمینیەیەکیشیان هەر کەللەرەقی و عینادی ئەکەن وەك سەرکردە لووتبەرزەکانیان [١١٤].

ئەمەش پاش ئەوەی کە سەرسڕمانی موشریکەکانی بەم نیگاخواییە بۆ پێغەمبەر ﷺ پووچەڵکردەوە، و ڕوونی کردەوە کە ناتوانن لە ڕۆشنایی ئەم قورئانە لە ئایەتە ڕوونەکانی کە بەڵگەن بۆ ئەوەی ئەم قورئانە ئاسمانیە سوود ببینن، یان لەوە رابمێنن کە

---

١١٤- تفسير المنار،محمد رشيد رضا، سەرچاوەی پێشووتر،ج١١،ص٣٦٧.

لە ژیانی پێغەمبەرﷺ وردببنەوەو تێبگەن کە ئەم ژیانەی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەم قورئانەی لە خواوە بۆ هاتووە، کەچی هەر داوای ئەوەی لێئەکەن کە قورئانێکی تریان بۆ بهێنێت یان بۆیان بگۆڕێت کە گونجاو بێت لەگەڵ حەزو ئارە زووەکانیاندا، چار نیە ئەبێ بگەڕێتەوە بۆ پووچکردنەوەی قورئان لەو رووەوە کە ئەوان تەنیا شوێن گومانێکی ناهەق کەتوون و هیچی تر، ئەویش ئەوەیە وا گومان ئەبەن نیگا و حاڵەتەکانی پێغەمبەرایەتی بە باو وخووەکانی خۆیان ئەپێون..بۆیە ئایەتەکە زەنگیان بۆ لێئەدات و باسی سیفەتەکانی قورئانیان بۆ ئەکات لە خودی خۆیدا، کە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە ئەم قورئانە هەقە و تەحەدداشی کردوون کە کتێبێك وەك قورئان دابنێن.

خوای گەورە روونی کردەوە کە ئەوان لە کاروباری پێغەمبەرایەتی و خوایەتیدا بە گومان کاردەکەن، وەك ئەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ أَن يُفْتَرَىٰ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ ٱلْكِتَٰبِ لَا رَيْبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٣٧﴾ ﴾ (یونس)، وەنەبێت ئەم قورئانە لەلایەن کەسێکەوە داڕێژرا بێت و هەڵبەسترا بێت جگە لەخوا، بەڵکو راستی و رەوانی کتێبە ئاسمانیەکانی پێش خۆشی دووپات دەکاتەوە، هەروەها روونکەرەوەی بیرو باوەڕو ئەرکەکانە، بەڕاستی هیچ گومان لەوەدا نیە کە ئەم قورئانە لە لایەن پەروەردگاری هەموو جیهانەوە رەوانەکراوە.

ئەم قسانە بۆیە ئەهێنرێت تا بێسەلمێنێت قورئان موعجیزەیە و دانراوی خوایە، بۆیە ئەوترێ تا نەفی ئەوە بکات ئەم قورئانە لە جگە لە خواوە هەڵبەسترابێت، واتە هی خوا نەبێت و درابێتە پاڵ خوا، چونکە تەنیا قورئان خۆی ئەو قسەیە پووچئەکاتەوە و هەر خۆی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەڵبەستراو نیە و مرۆڤ داینەناوە[115].

---

١١٥- التحرير و التنوير، الطاهر بن عاشور، سەرچاوەی پێشتر، مج٦،ج١١،ص١٦٨،١٦٧.

واتــە ئەگــەر کەسـێکی ژیــر بــە راسـتگۆیانە رابمێنێـت لــە سـوورەتەکانی قورئــان و وردببێتــەوە ئــەوە ئــەزانێت لــە لایــەن خــواوە هــاتووە و نــاکرێ و نــابێ قورئــان بــە و ئاستەبەرزەیەوە مرۆڤ دایبنابێت، قورئانێك بەم شێواز و دارشتنە ناوازەیەوە بـەم هـەمووە زانیاریە بەرز و پڕ لە فەلسەفەوە، پـڕ لـەو یاسـا دادپـەرانـەوە، تێـر لـە ئەتـەکێتی راقـی، ناکرێ قورئان بـەم هـەمووە راسـتیە گـەردوونی وکۆمەلایـەتی و هەواڵدانـەی لـە نادیـار و مێژووی رابردوو و پێشهاتەکانەوە، کە مەبەستی لە چاکسازیەکان شوێنکەوتنی راسـتی و هیدایـەت بێـت و خـۆدوورگرتن بێـت لـە گومڕایی و هەوەسپەرسـتی و پشـت بەسـتن بـە بەڵگەی دروستی زانستی ..ئەمانە هەمووی ئەوە ئەسـەلمێنن کـە نـاکرێ و نـابێ و راسـت نیــە و شــتێکی ژیرانــە نیــە بووترێــت ئەمــە درۆیەکــە و کەسـێکی تــر بــەدەمی خــواوە هەڵیبەستووە، چونکە جگە لەخوا هیچ کەسێك نـاتوانێ شـتی وا دابنێـت، خـۆ ئەگـەر لـە ئیمکانـدا بێـت مرۆڤێـك شـتی وا دابنێـت ئـەوە ئـەبێ ئـەو کەسـە لـە هـەموو زانـا و دانـاو خوێنەوارەکان و لە هەموو پێغەمبەران و فریشتەکانی خوا بە توانـاتر بێـت، دەی کەسـی واش درۆ ناکات بە دەمی خـواوە! نـەك ئەمـە بـەڵکو سەرسـەخترینی دوژمنـانی خـوا کـە ئەبوجەهلبەنـەفرەت بێـت ئـەیوت: لەراسـتیدا موحەممـەد درۆی بـەدەمی خـەڵکی تـرەوە نەئەکرد ئەی چۆن درۆ بەدەم خواوە ئەکات؟

﴿ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ ﴿٣٧﴾ ﴾ (یونس)، ئەمە یانی: ئـەم قورئانـە پەسـەندکردنی پەیامەکانی تری خوایە بە گشتی کە بـۆ پێغەمبـەرانی تـر هـاتوون، وەك نـوح و ئیـبراهیم وموسا و عیسا –سەلامی خوایان لێبێتئەم قورئانە بانگی خەڵکی ئـەکات بـۆ بنچـینەکانی ئایینی ئیسلام کە ئەوانیش بانگەشەیان بۆ کردووە، وەك باوەڕهێنـان بـە خـواو بـە رۆژی دوایی و کـردەوەی چـاك، پـاش ئـەوەی کـە هەنـدێ لـە شـوێنکەوتەی ئـەو ئایینانـە ئـەو راسـتیەیان لـەیاد کـردووەو هەندێکیشـیان رێگەکـەیان ون کـردووەو بــە داب و نــەریتی داهێنــراو بیروباوەڕەکــەیان شــێواندووە، کــە موحەممــەدێکی نەخوێنەوار(صــلی

اللهعليهوالهوسلم) ئەمانەی نەدەزانی، یاخود پەسەندکردنی ئەوەی لە ئایینی ئیبراهیمدا هاتووە و لە حەرەمدا بانگەوازی بۆ کردووە، یان ئەوەی کە موساو عیسا و پێغەمبەرانی تر لەسەری بوون، ئەکریٚ"تصدیق"ە هەردوو ماناکەش بگەیەنێت.

﴿ وَتَفْصِيلَ ٱلْكِتَٰبِ ﴾ (یونس٣٧)، مەبەست پەیامە خوداییەکانە، ئەو کتێبانەش خوا دایناون تا بنووسرێنەوەو ببنە هیدایەت بۆ مرۆڤەکان، کە کۆمەڵێك لە بیروباوەڕ و یاسا و پەند و ئامۆژگاری و کاروباری کۆمەڵایەتی و دەستووراتی خوایی و لە دروستکراوەکانیدا ئەگرێتە خۆی، ﴿ لَا رَيْبَ فِيهِ ﴾ (یونس:٣٧) بوار بۆ گومان و دوودڵی نامێنیٚ، چونکە راستی و هیدایەتی تێدایە، ﴿ مِن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٣٧﴾ ﴾ (یونس)، نیگای ئەوە، کەس ناتوانیٚ بیگاتیٚ، ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ ۚ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُوا۟ فِيهِ ٱخْتِلَٰفًا كَثِيرًا ﴿٨٢﴾ ﴾ (النساء)، ئەوە بۆ ئەوانە سەرنجی قورئان نادەن و لێکی نادەنەوەو لێی وردنابنەوە؟ خۆ ئەگەر لە لایەن کەسێکی ترەوە بوایە جگەلە خوا بێگومان جیاوازی و دژایەتیەکی زۆریان تێدا دەدۆزیە.[116]

پاش ئەوەی قورئان کێبەرکێیان لەگەڵ ئەکات کە سورەتێکی هاوشێوەی قورئان بهێنن وەك ئەفەرمویٚ: ﴿ فَأْتُوا۟ بِسُورَةٍ مِّثْلِهِۦ وَٱدْعُوا۟ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٣٨﴾ ﴾(یونس) ، بڵیٚ: دەئێوەش سوورەتێك وەك سوورەتەکانی داڕێژن و بیهێنن، داوا بکەن لەهەر کەسێکی تر کە دەتوانن جگە لەخوا (کە یارمەتیتان بدات) درێغی مەکەن ئەگەر ڕاستگۆن.

پاش ئەم کێبەرکێیە سیاقی گفتوگۆیەکە ئەگۆڕێت، بۆ ئەوەی بڕیار بدات کە ئەوان دوای گومان کەوتوون و هیچی تر، ئەوان بڕیار لەسەر شتێك ئەدەن کە نایزانن، بڕیاردانیش پێویستی بە زانیاری پێش وەخت هەیە، نابیٚ تەنیا پشت بە هەواو ئارەزوو یاخود بە گومان ببەسترێت.

---

١١٦- تفسیر المنار،محمد رشید رضا، سەرچاوەی پێشووتر،ج١١، ص٢٣٩٨بە دواوە.

ئەوەی لێرەدا حوکمیان بەسەردا داوە بریتیە لە نیگاکانی قورئـان و ئـەو راسـتیانەی کە تیایەتی لە بەڵێن و هەڕەشەکان، ئەمەیان بەدرۆ ئەزانی، کەچی هیچ زانیاریەکیان لـەو بارەوە نەبوو کە ئەم درۆیەی بنێنەبان، ﴿بَلْ كَذَّبُوا۟ بِمَا لَمْ يُحِيطُوا۟ بِعِلْمِهِۦ وَلَمَّا يَأْتِهِمْ تَأْوِيلُهُۥ ﴿٣٩﴾﴾ (یونس)، بەڵکو سەرەڕای ئەو هەموو بەڵگانە ئەوانە بڕوایان بە قورئان نـەکردووە کـەهیچ شتێکیان نەزانیووە دەربارەی، هێشتا بۆیان نەهاتووە سـەرئەنجامی ئـەو بەڵێنانـەی کـە بەڵێنی پێداون.

حاڵیــان لــەم درۆکردنــەدا وەك حــاڵی درۆزنــەکانی پــێش خۆیانــە، ســتەمکارە موشریکەکان، ئەوانەی رائەمێنن با لـەوە رابمێـنن کـە دەرەنجـامی ئـەوانی پێشـوو چـۆن بووە تا بزانین راسـتی سـەرەنجامی ئـەوانیش هـەر وا دەبێـت، وەك ئەفـەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٣٩﴾﴾ (یــونس)،[117] هــەر بــەو شـێوەیە ئەوانـەی پـێش ئـەمان بەرنامـەی خوایـان بـەدرۆزانی و بڕوایـان پێـی نـەبوو، دەتەماشا بکەو سەرنج بدە بزانە سەرئەنجامی ستەمکاران چۆن بووە.

یانی: ئەوان پەلەیان کردووە لـە بـەدرۆزانینی قورئـان، راسـتەوخۆ بـە بیسـتنی پـێش ئەوەی لێی تێبگەن و بزانن ناوەڕۆکەکەی چی تێدایە، یـان لێـی رابمێـنن، بـە دڵنیاییـەوە ئەم شێوازی بەدرۆخستنەوە لە دژایەتی و لووتبەرزیدایە نەك لە لەوەوە سەرچاوە بگرێت کە بڕوایان پێی نیە و بەدرۆی ئەزانن، پاشان نەبوونی زانیاریان دەربـارەی زانسـتی خـوا جیاوازە، هەندێکیان نازانن کە ئـەوە حـاڵی کەسـە گێلەکانـە، وە هەندێکیشـیان زانیـاری ناتەواویان هەیە ئەویش ئەوانەن کە گومان و دوودڵیان هەیە، یـاخود لەگـەڵ ئـەوەی کـە بەراستی دەزانن، بەڵام ئەوە نـازانن کـە بـەدرۆزانینی ئـەم قورئانـە چ سـزایەکی سـەختی بەدوادا دێت. نمونەی ئەم ئایەتە لە سـوورەتی (النمل)کـە ئەفـەرموێ: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُو قَالَ

---

117- في ظلال القران، سيد قطب، سەرچاوەی پێشتر، ج٣، ص١٧٩٤.

﴿أَكَذَّبْتُم بِـَٔايَٰتِي وَلَمْ تُحِيطُواْ بِهَا عِلْمًا أَمَّاذَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٨٤﴾﴾ (النمل)، هەتا ئەو کاتەی دێنە پێشەوە بۆ لێپرسینەوە، خوا دەفەرموێت: ئایا ئەوە ئێوە بڕواتان بە ئایەتەکانی من نەهێنا لە کاتێکدا ئێوە هیچ زانست و زانیاریەکتان دەربارەی نەبوو؟ یاخود ئێوە خەریکی چی بوون؟ چیتان دەکرد بە ئایەتەکانی ئێمە؟

ڕستەی﴿ وَلَمَّا يَأْتِهِمْ تَأْوِيلُهُۥ ﴾(یونس:٣٩) ، هێشتا بۆیان نەهاتووە سەرئەنجامی ئەو بەڵێنانەی کە بەڵێنی پێداون.ئەم ڕستەیە پەیوەندە بە پێش خۆیەوە، واتە: شتێك بەدرۆ ئەزانن کە هێشتا سەرەنجامەکەی نەهاتووە بۆ لایان، ئەمەش ناساندنی ئەوانە کە چەندە کەم ئارام و خۆنەگرن، واتە ئەگەر چاوەڕێیان بکردایە تا تەئویل و سەرەنجامی قورئانیان بۆ بهاتایە یانی ئەوەی کە ئەکرێ سەرەنجامەکەی ببینن باشتر بوو، بەلاَم ئەوان سووربوون لەسەر درۆکردن پێش بینینی سەرەنجامەکەی.

مەبەست بە تەئویل لەم ئایەتەدا ئەکرێ تەفسیر و شەرحی ئەوانە بێت کە شاراوەیە لە ئەوان، یاخود ئاشکراکردنی ئەو سزایە بێت کە ئاگادارکراونەتەوە لێی، لەوانەشە مەبەستەکە هەردووکیان بگرێتەوە، واتە کاتێك تەئویلی ئەو شتانەیان بۆ دەکرێت کە بە حسابی خۆیان لێی حاڵی نەبوون لە مانای ئایەتەکان چونکە بە شێوازەکانی قورئان ئاشنا نەبوون وەك حیکمەت و فەلسەفەی تەشریعی ئیسلامی، یان بابەتی زیندووبوونەوە، یان بەڕێزسەیرکردنی زیاتری ئیماندارە لاوازەکان لە چاو موشریکە خانەدانەکاندا، هاتنەخوارەوەی قورئان بەبەش بەش و ئەو جۆرە بابەتانە، ئەوان تەنیا لەگەڵ شتی مادیدا ڕاهاتبوون، بۆیە هەموو ئەو شتانەیان بەو پێوەرە مادیانە گەزو پێوانە ئەکرد، شتی نادیاریان بە شتە دیارو مادیەکان ئەپێوا، ئیتر ئەو شتانەیان بەدرۆ ئەزانی بەر لەوەی تەفسیر یان سەرەنجامی ئەو شتانەیان بۆ دەربکەوێ، خۆ ئەگەر ئارامیان بگرتایە و پابەندی پێغەمبەر بوونایەﷺ ئەوە یەك دوای یەك هەموو ئەوانەیان بۆ ڕوون

ئەبوویەوە، ئیتر کە تەفسیر و سەرەنجامی بەپەلەی ئەو شتانەیان زوو بۆ دەرنەئەکەوت وایان ئەزانی ئەو شتانە درۆن! خوا ئەفەرمووێت: ﴿ وَإِذْ قَالُواْ ٱللَّهُمَّ إِن كَانَ هَٰذَا هُوَ ٱلْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ أَوِ ٱئْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣٢﴾ ﴾ (الانفال) یادی ئەو کاتە بکەرەوە کە بێ باوەڕان وتیان: خوایە ئەگەر ئەم دین و بەرنامە و قورئانە ڕاستە، لەلایەن تۆیشەوە ڕەوانە کراوە، ئەوە بەرد لە ئاسمانەوە ببارێنە بەسەرماندا، یان بەڵاو سزایەکی بەئێشمان بۆ بهێنە ! !.

وایان گومان ئەبرد کە ئەگەر ئەوان خوای گەورە تووڕە بکەن ئیتر بەپەلە سزایان بۆ ئەنێرێت، بۆیە کە سزا بەپەلە نەئەهات بۆیان ئەیانووت کەواتە قورئان ڕاست نیە و لەلای خواوە نەهاتووە، هەر بۆیە داوای ڕووداوی ناسروشتیشیان ئەکرد لە پێغەمبەرﷺ، وەك قورئان ئەفەرموێ: ﴿ وَقَالُواْ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ تَفْجُرَ لَنَا مِنَ ٱلْأَرْضِ يَنۢبُوعًا ﴿٩٠﴾ ﴾ (الاسراء) (هەندێکیان بیانوویان گرت و) وتیان: هەرگیز ئێمە باوەڕ بە تۆ ناکەین تا کانی و سەرچاوەیەکمان لە زەویەوە بۆ هەڵنەقوڵێنیت. ئەگەر موسڵمان ببونایە و لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ بژیانایە دەیانزانی کە خوا گوێ بە پێشنیاری لادەر نادات، مەبەست بە چواندنی ئەمان بە درۆزنەکانی میللەتانی پێش خۆیان کە قورئان ئەفەرموێ: ﴿ .. كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ .. ﴿١٤٨﴾ ﴾ (الانعام)، چەند شتێکە:

- ئەمە خووی هەموو کەسێکی نکولیکارە، تا بزانن ئەمانیش وەك ئەوانن و تا پەند وەربگرن..

- ئاماژەیان پێئەدات کە سزا بۆ ئەمانیش دائەبەزێت وەك چۆن بۆ ئەوان دابەزی کە ئەمان هەواڵیان لێیان هەیە و داهاتووی هەندێکیانیان بینیوە.

- دڵدانەوەی پێغەمبەرﷺ بەوەی ئەوەی تووشی ئەم هاتووە بە هەمان شێوە تووشی پێغەمبەرانی پێش ئەویش بووە بەدەست قەومەکانیانەوە، بۆیە لقێك ئەکاتەوە

لـەم چـواندنەوەو ئەفـەرموێ: ﴿.. فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٣٩﴾﴾ (يـونس)، تەماشا بکەو سەرنج بدە بزانە سەرئەنجامی ستەمکاران چۆن بووە. یانی وردبـەرەوە لـە چارەنووسـی ئـەو میللەتـە پێشـووانە کـە سـتەمیان کـردو پێغەمبـەرانیان بـە راسـتگۆ نەئەزانی.[118]

**سێیەم: دەسەوسانیان لە بەرانبەر ئاڵینگاری قورئاندا.**

قورئـان کـێ بـەرکێی لەگـەڵ ئـەو موشـریکە بوختانچـیانەدا کـردووە کـە بانگەشـەی ئەوەیان ئەکرد قورئان هەڵبەستراوە، داوای ئەکرد کتێبێك هاوشێوەی قورئان بهێنن، یان دە سوورەت بهێنن، یاخود تەنیا سـوورەتێك بهێـنن، وەك ئەفـەرموێ: ﴿ قُل لَّئِنِ ٱجۡتَمَعَتِ ٱلۡإِنسُ وَٱلۡجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأۡتُواْ بِمِثۡلِ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ لَا يَأۡتُونَ بِمِثۡلِهِۦ وَلَوۡ كَانَ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٖ ظَهِيرٗا ﴿٨٨﴾﴾ (الاسراء)، ئەی محمد ! پێیـان بڵـێ: دڵنیـابن، ئەگـەر هـەموو ئـادەمیزادو پەریـەکان کـۆ ببنەوەو (هەوڵی بەردەوام بدەن تـا) قورئـانێکی وەکـو ئەمـە دانـێن و بیهێننـە (مەیـدان) نـاتوانن کـاری وابکـەن و نـاتوانن لـە وێنـەی بهێـنن، ئەگـەر چـی هـەموو لایـەکیان ببنـە پشتگیرو یارمەتیدەری یەکتر. هەروەها ئەفەرموێ: ﴿أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُۖ قُلۡ فَأۡتُواْ بِعَشۡرِ سُوَرٖ مِّثۡلِهِۦ مُفۡتَرَيَٰتٖ وَٱدۡعُواْ مَنِ ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿١٣﴾﴾ (هـود)، لەگـەڵ ئـەو هەموو بەڵگانەدا) ئەوانە دەڵێن کە محمد قورئانی هەڵبەستووە، پێیان بڵـێ: جـا ئێـوەش دە سوورەتی هەڵباستراو وێنەی ئەم قورئانە بهێنن، هەر کەسیش لە خوا گـەورە بـەدەر، دەتوانن، بانگ بکەن (بۆ هاوکاریتـان پـەنای بـۆ بـەرن) ئەگـەر ڕاسـت دەکـەن، هـەروەها ئەفـــــەرموێ: ﴿ أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُۖ قُلۡ فَأۡتُواْ بِسُورَةٖ مِّثۡلِهِۦ وَٱدۡعُواْ مَنِ ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٣٨﴾﴾ (یونس)، بەڵکو (لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگانەدا) ئەوانە دەڵـێن کـە محمـد ﷺ

١١٨- التحرير و التنوير، الطاهر بن عاشور، سەرچاوەی پێشتر، مج٦، ج١١، ص١٧٢،١٧٣، بەدەستكارييەوە.

قورئانی هەڵبەستووە، بڵێ: دەئێوەش سوورەتێك وەك سوورەتەكانی دارێژن و بیهێنن، داوا بكەن لەهەر كەسێكی تر كە دەتوانن جگە لەخوا (كەیارمەتیتان بدات) درێغی مەكەن ئەگەر ڕاستگۆن.

دەی كەواتە كاتێك دەسەوسانن لە هێنانی یەك سورەت كە وەك قورئان بێت لە ڕێنمای و لە رەوانبێژیداكە خۆتان سوارچاكی ئەو مەیدانەن و سەردەمەكەشتان پێشكەوتووترین سەردەمی زمان پاراوییە و زۆربەتان بەوە ناوبانگتان دەركردووە و دەستپێشخەرن لەو مەیدانەدا و موحەممەدﷺ لەو كەسانە نەبووە كە پێشبڕكێتان لەگەڵدا بكات لەو بوارەدا، چونكە ئامادەیی دەروونی تێدا نەبووەو مەشقی لەسەر ئەوە نەكردووە بۆ هەڵدانی بنەماڵەكەی و ئاگادارن كە نەخوێندەوارە دەی كەواتە ئێستا كە دەسەوسانن لە هێنانی شتێكی وەك قورئاندا پاش ئەوەی موحەممەد دوای چل ساڵ تەمەن لەناوتاندا تەحەدای كردن بە هێنانی هاوشێوەی قورئان دەی ئیتر دان بەوەدا بنێن كە ئەمە نیگای خواییە و كۆمەكی ئاسمانە بۆی، چونكە ڕێی تێناچێ پێغەمبەر چووبێتە ئەو ئاستەو ئەوەندە بەرزبووبێتەوە بگاتە ئاستی قورئان لە چنین و شێوازی دەربڕیندا.

ئەمەی كە خوا ئەفەرموێ: ﴿ أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ ...﴿٣٨﴾ ﴾ (یونس) بەڵكو (لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگانەدا) ئەوانە دەڵێن كە محمد قورئانی هەڵبەستووە)، ئەمە گواستنەوەی باسەكەیە لەوەوە كە قورئان زۆر لەوە بەرزترە كە بوختانی بۆ بكرێت و بووترێت هەڵبەستراوە، لەبەر ئەوەی هەموان دەستەوسانن لە هێنانی هاوشێوەیەكی قورئان، لەمەوە ئەگوازێتەوە بۆ پووچی ئەو بانگەشەیەی كە موحەممەد بە دانەری ئەم قورئانە بزانرێت! ئەو پرسیارەش بۆ نكولی و ڕێخۆشكردنە بۆ ئەوەی بانگیان بكات و دەستەوسانیان بسەلمێنێ وەك ئەفەرموێ: ﴿ قُلْ فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّثْلِهِ ﴿٣٨﴾ ﴾ (یونس)، بڵێ: دەئێوەش سوورەتێك وەك سوورەتەكانی دارێژن و بیهێنن..

واته له شێواز و له کاریگەری و له ڕێنمایی و له زانستەکانیدا

وەك ئەو بێت، بابەتەکەی هەڵبەستن و پابەندیش مەبن بەوەوە ڕاستە یان نا، ﴿ أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُۖ قُلۡ فَأۡتُواْ بِسُورَةٖ مِّثۡلِهِۦ وَٱدۡعُواْ مَنِ ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ٣٨ ﴾ (یونس)، بەڵکو (لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگانەدا) ئەوانە دەڵێن کە محمد قورئانی هەڵبەستووە، بڵێ: دەئێوەش سوورەتێك وەك سوورەتەکانی داڕێژن و بیهێنن، داوا بکەن لەهەر کەسێکی تر کە دەتوانن جگە لەخوا (کەیارمەتیتان بدات) درێغی مەکەن ئەگەر ڕاستگۆن.

لەو کارەشدا داوای کردووە هاوکار و پشتیوان لەخوار خواوە بۆ خۆیان پەیدا بکەن، بێگومان سەرجەم دروستکراوەکان وەك ئێوە دەستەوسانن لەو کارەدا، ئەمە وەك ئەو فەمایشتەی خوایە کە ئەفەرموێ: ﴿ قُل لَّئِنِ ٱجۡتَمَعَتِ ٱلۡإِنسُ وَٱلۡجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأۡتُواْ بِمِثۡلِ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ لَا يَأۡتُونَ بِمِثۡلِهِۦ وَلَوۡ كَانَ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٖ ظَهِيرٗا ٨٨ ﴾ (الاسراء)، ئەی محمد ! پێیان بڵێ: دڵنیابن، ئەگەر هەموو ئادەمیزادو پەریەکان کۆ ببنەوەو (هەوڵی بەردەوام بدەن تا) قورئانێکی وەکو ئەمە دانێن و بیهێننە (مەیدان) ناتوانن کاری وابکەن و ناتوانن لە وێنەی بهێنن، ئەگەر چی هەموو لایەکیان ببنە پشتگیرو یارمەتیدەری یەکتر. ئەم ئایەتە پیرۆزەی سورەتی ئیسرا لە پێش سوورەتی یونسەوە دابەزیوە،( إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ) ئەگەر ڕاست ئەکەن من ئەم قورئانەم هەڵبەستووە.

ئاشکرایە کەسێکی ژیری وەك پێغەمبەرﷺ ئەو کێبەرکێییەی لەگەڵ نەدەکردن ئەگەر بەتەواوەتی دڵنیا نەبوایە لەوەی کە ئینسان و جنۆکە ناتوانن هاوشێوەی ئەم قورئانە بهێنن، نە هەمووی و نە سوورەتێکی وەك ئەو، نە بەتەنیا و نەبە کۆمەڵیش، زاناو ڕەوانبێژەکانیان ئەگەر بشکرێ کۆببنەوە و هاوکار و پشتیوانی یەکتری بکەن،ئەگەر ئەو بە بۆچوونی تۆ دایڕشتبێ بۆ بەرژەوەندی خەڵك هەر وەك چۆن ئەوانەی سەرسامن بە ژیری و زیرەکی و بیروراکانی لە فەیلەسوف و زانا مادییەکانی ئەم دواییەدائەوە ژیری و

زیرەکی و هەڵوێستەکانی ڕێگر دەبوون لەبەردەمیداله بڕیاردان بەدەستەوسانی عـاقڵترین دروستکراوەکان لە زانا نادیارەکانی ئینس و نادیارەکانی جنۆکـە لـە هێنـانی سـورەتێکی وەك ئەوەی کە خۆی هێناویەتی، هەموو کەسێکی ژیر کە زیرەکیەکی مامناوەندی هەبێت دەزانێـت کـە هـەر کارێـك ئـەو بتوانێـت جیبـەجێی بکـات بـۆ غـەیری ئـەویش بـە هـەمان شێوەیە، بەڵکو دڵنیا نیە لەوەی کەسێکی لەو بەتواناتر بوونی هـەبێت، ئەمـە بەڵگەیەکـە بۆ عـەقڵی دەسـەلمێنێت کـە پێغەمبـەرﷺ دڵنیـابووە کـە قورئـان لـە لایـەن خوداوەیـە، ئەویش وەك هـەر کەسـێکی تـر وەك خـۆی ناتوانێـت هاوشـێوەی قورئـان بهێنێـت، ئەمـە یەکێکە لە بەڵگەکان بۆ ئەوانەی کە دەڵێن:ناچێتە عەقڵەوە کە درۆزن بێت و بوختانی بـۆ بکات.

ئەگەر وترا ئەکرێت بڕوا بهێنرێت بە دەسەوسانی خۆی و غەیری خۆی لە کاتێکدا کـە قورئان نیگای خوا بێت، دەڵێین:

یەکەم:بانگەشەی ئیلهامی دەروونی بەتاڵە بە زۆر بەڵگە(*)[119].

دووەم: دەسەوسانی ئەوانەی غەیری ئەو کە لەو زمان پـاراوتر بـوون بەڵگەیـە لەسـەر دەسەوسانی ئەویش.[120]

ئەمە لە ڕاستیدا بەگژاچوونەوەی خوای دەسەوسانکەرە بۆیان کە دەفـەرموێ: ﴿ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ وَلَن تَفْعَلُواْ فَاتَّقُواْ النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ ﴿٢٤﴾ ﴾ (البقـرة) خـۆ ئەگەر نەتانتوانی و هەرگیز نایشتوانن (کەواتە باوەڕبهێنن و) خۆتان بپارێزن لەو ئاگرەی: سووتەمەنیەکەی خەڵکی و بەردە، کە بۆ بێ باوەڕ و خوانەناسان ئامادە کراوە.

---

119* بۆ پووچکردنەوەی نیگای دەروونی (شێوازی شەشەم، گومانی بیستەم، بەرگی حەوت"بڕواو ئایینداری" و گومانی سێ لەبەرگی یازدە "پارێزراوی قورئانی پیرۆز" بخوێنەرەوە.

١٢٠- تفسير المنار، محمد رشيد رضا، سەرچاوەی پێشووتر، ج١١، ص٣٦٧،٣٧٠.

بەم شێوازە بەگژیاندا ئەچێتەوە بە هاوشێوەی ئەم ئایەتە جیاکەرەوانە کە جوامێری ئەوروژێنێت و غیرەتیش هەژێنێت، لەگەڵ بڵندی شکۆداریان لە رەوانبێژیدا و بەهێزیان لە شێوازەکانیدا کە هونەرەکانی رەوانبێژی ئەو رۆژە دەوڵەت و دەسەڵاتی گەیشتبوویە چڵە پۆپە، سەردەمی وای بەخۆیەوە نەدیبوو،تەنانەت خۆیان هەڵئەکێشا و پێشبڕکێیان دەکرد و کۆڕبەندیان بۆ دەگێڕا و بازاڕیان بۆ ساز دەکرد، هەواڵەکانیانم هەڵدەفڕاند بە ئاسۆکاندا، لەگەڵ ئەوەشدا یەکێکیا نەیانتوانی، لە ڕوویدا بوەستن و بەرهەڵستی بکەن، رەوانبێژێك هەڵنەسایەوە و لە روویدا بوەستێت.

نەك ئەوە، بەڵکو خوای بەهەق تەحەدایان ئەکات کە کتێبێك بهێنن لە لایەن خواوە کە لە قورئان و تەورات ڕێنماییکەرتر بێت و لە لایەن خواوە بیهێنن تا ئەو شوێنی بکەوێت:
﴿ قُلْ فَأْتُوا بِكِتَابٍ مِّنْ عِندِ اللَّهِ هُوَ أَهْدَىٰ مِنْهُمَا أَتَّبِعْهُ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٤٩﴾ ﴾ (القصص)، (ئەی پێغەمبەر! پێیان بڵێ: دە باشە، ئێوە کتێبێکی تر بهێنن لەلایەن خواوە کە باشترو چاکتر بێت لەو دووانە (واتە قورئان و تەورات)، ئەوە منیش شوێنی دەکەوم، ئەگەر ئێوە ڕاستگۆن.

واتە: ئەی موحەممەد! بەوانە بڵێ: کە ئەڵێن کتێبە ئاسمانیەکان کە دابەزیوون جادوونئیتر مەبەستیان قورئان بێت یان تەورات یان ئینجیل پێیان بڵێ: دەی کتێبێك بهێنن لە لایەن خواوە هیدایەتی باشتری تێدا بێت لەوانە، تا شوێنی بکەوم ئەگەر راست ئەکەن لە وەسفکردنتانبۆ کتێبەکان کە دەڵێن ئەوانە جادوون و هەق و راستی لەغەیری ئەواندایە..

**چوارەم: سزای ئەوانەی درۆ بەدەم خواوە ئەکەن.**

وەڵامەکانی قورئان ئەوە دووپات ئەکەنەوە کە ئەگەر پێغەمبەرﷺ شتێك بەدەم خواوە بڵێ کە بۆی نەهاتبێت ئەوە دەست بەجێ سزای ئەدات، وەك ئەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ

تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ الْأَقَاوِيلِ ﴿٤٤﴾ لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِالْيَمِينِ ﴿٤٥﴾ ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ الْوَتِينَ ﴿٤٦﴾ فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَاجِزِينَ ﴿٤٧﴾ ﴾ (الحاقة) ، خۆ ئەگەر محمد هەندێك قسەو گوفتار بەدەم ئێمەوە هەڵبەستایە.ئەوە بەهێزو دەسەڵاتی خۆمان دەمانگرت. لەوەودوا ڕەگی دڵی دەپچڕێنین و دەیمرێنین. ئەوسا هیچ کەسێك نی یە لە ئێوە بەربەست و بەرگری بکات لە ئێمە.

ئەم ئایەتانە بە پێی مەزهەبی زانستی کەلام بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە قورئان لە لایەن خوداوە دابەزێنراوە. ئەوە بەڵگەیە لە زیهنی هەمووواندا چەسپاوە کە خودا عیلم و دەسەلأتی فراوانە، کەس ناتوانێ قسەیەك لەوەوە بکات کەنەیگوتبێت، ئەگەر موحەممەدﷺ بانگەشەی ئەوەی بکردایە کە قورئان دانراوی خۆیەتی لەسەری نەئەوستاین و دەستبەجێ بە هیلاکماندا دەبرد، لەناونەبردنی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی درۆی بەدەم خواوە نەکردووە، چونکە(لَوْ) نەفی ناوەڕۆکی مەرجەکەئەکات و بە هەمان شێوە نەفی ناوەڕۆکی وەلأمەکەش ئەکات، لەم قسانەدا دوو مەبەستی گرنگ دێتە پێشەوە:

یەکەمیان: بۆ ئەوانەی پێشەوە دەگەڕێتەوە، واتە: زیاد لەوەش، قسە هەڵبەستراوەکانی موشریکەکان بەتاڵ ئەکاتەوە، کە گوایە قورئان هۆنراوەیە یان فاڵچێتییە، یانی هەر دوو جۆرە قسە ناهەقەکە پووچ ئەکاتەوە: یانی ئەم قورئانە پێچەوانەیە لەگەڵ ئەم دوو جۆرە قسەدا، ئێوەش ئەو هەمووە شاعیر و کاهینانەتان بینیوە کەسیان قسەکانی خۆیان نادەنە پاڵ خوا!

دووەمیان: بانگەشەیەکی تریان بەتاڵ ئەکاتەوە کە دەریان نەبڕیوە! کە قسەی هەندێکیانە کە ئەڵێن:( افْتَرَاهُ)، یانی بەدرۆ داویەتە پاڵ خوا! خواش ئەفەرموێ: ﴿ أَمْ يَقُولُونَ تَقَوَّلَهُ ۚ بَل لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾ (الطور)، یان دەڵێن: ئەم قورئانەخۆی هەڵیبەستووەو دایڕشتووە، نەخێر ئەوانە، هەر ئیمان و باوەڕیان نیە (ئەگینا چۆن وا دەڵێن)، خوای

گەورە ئەوە روون ئەکاتەوە ئەگەر ئەمە بوختان بوایە بەدەم خواوە خوا قەبوڵی نەئەکرد لێی، پاشان ئەم مەبەستە شتێکی تر بەدوای خۆیدا ئەهێنێ ئەویش ئەوەیە: نائومێدیان ئەکات لەوەی کە بتوانێ قورئانێك بێنێت بۆیان پێچەوانەی ئاییی باوی ئەوان نەبێت، خەون و بتەکانیان بەسووك سەیرنەکات، ئەوەتا ئەفەرموێ: ﴿قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ لِقَآءَنَا ٱئۡتِ بِقُرۡءَانٍ غَيۡرِ هَٰذَآ أَوۡ بَدِّلۡهُۚ ...﴿١٥﴾﴾ (یونس).

مانای(لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِالْيَمِينِ) بەهێزو دەسەڵاتی خۆمان دەمانگرت، مەبەستی ئەوەیە کە بەهێز تۆڵەمان لێئەکردەوەو مۆڵەتمان پێ نەئەدا شتی وا بکات، پیتی(ب) بۆ سەبەبییەت بەکار ئەبرێت، ئەوەش کە ئەفەرموێ: (ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ الْوَتِينَ) وەتین دەمارێکە پەیوەستە بە دڵەوە و پێی ئەوترێت"نیاط" برینی دەمار لەکاتی سەربڕینی هوشتردا ناوئەبرێت، ئەو کەسەی کە بوختان بەدەم خواوە ئەکات چواندوویەتی بە هوشترێك کە دەماری ملی ئەبڕی لەکاتی سەربڕیندا. بەڵام شوێنی هاتنی ئەم ئایەتە﴿ فَمَا مِنكُم مِّنۡ أَحَدٍ عَنۡهُ حَٰجِزِينَ ﴿٤٧﴾﴾ (الحاقة)، زۆر گرنگە و پەیوەندە بەوەی لە فەرزێکدا ئەگەر بەدەم ئێمەوە شتێکی وتکە نەمان ناردبێت بۆی نائومێدیان ئەکات کە ناتوانێ قورئانێکیان بۆ بهێنێ کە رەخنەیان لێنەگرێت، جا لەهەر حاڵێکدا کە قسەی بەدەممانەوە هەڵبەست ئەوە﴿ لَأَخَذۡنَا مِنۡهُ بِٱلۡيَمِينِ ﴿٤٥﴾ ثُمَّ لَقَطَعۡنَا مِنۡهُ ٱلۡوَتِينَ ﴿٤٦﴾﴾ (الحاقة)، کەواتە هیچ کەسێك لە ئێوەو لە جگە لە ئێوەش ناتوانێت ببێتە بەربەست لە هاتنی ئەو سزایە.[١٢١]

ئەم هەڕەشە ترسێنەرە بۆ ئەو کەسەیە کە درۆ بەدەم خواوە بکات لە کاروباری عەقیدەدا، هەڕەشەیەکە جیددی و شۆخیکردنی تێدا نیە، بۆ ئەوە هاتووە تەنیا یەك ئەگەر هەیە و هیچ تر نیە بیسەلمێنێت ئەویش ئەوەیە کە پێغەمبەرﷺ راستگۆیە و دەستپاکە لە گەیاندنی نیگای خوادا، بە شایەتی ئەوەی کە خوا سزای نەداوەو

---

١٢١-التحرير و التنوير، الطاهر بن عاشور، سەرچاوەی پێشتر، مج١٤، ج٢٩، ص١٤٧،١٤٤، بە دەستکارییەوە.

نەیگرتووە کە ئەگەر لایبدایە ئەیگرت و بەوشێوەیە ئەیکوشت کە ئایەتەکان باسی ئەکات، کە ئەمە روونەداوە، کەواتە پێغەمبەرﷺ راستگۆیە.

شێوازی دەربڕینی ئایەتەکان ئاماژەیە بۆ جیددییەتی ئەو کارە کە هیچ لێخۆشبوون و موجامەلەیەکی تێدا نیە، بۆ هیچ کەسێك تەنانەت ئەگەر ئەو کەسە موحەممەدی بەرێز و خۆشەویستی لای خواش بێت.[122]

**بەکورتی:**

- قورئان لە لایەن خواوە دابەزیوە، پێغەمبەرﷺ وەك هەر کەسێکی تر دەستەوسانە لە هێنانی هاوشێوەی قورئان، و لە توانای ئەودا نیە و ئەو تەنیا گەیەنەرێکە بۆ نیگاکانی خوا.
- پێغەمبەرﷺ تەمەنێکی دوورو درێژ لەناویاندا ژیاوە و بەوە ناسراوە کە پیاوێکی نەخوێندەوار بووە، ئیتر لە کوێوە ئەم قورئانەی بەم دامەزراویە هێناوە لە رووی رەوانبێژی و تەشریعات و یاساوە، ئەگەر خوا راینەسپاردبێت بەوە؟!
- ئەگەر پێغەمبەرﷺ کتێبی بخوێندایەتەوە و نووسینی بزانیبایەلەوانەبوو گومانەکەیان جێگەی هەبوایە کە قورئان خۆی داینابێت، لەگەڵ ئەوەدا کە قورئان خۆی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەلە لایەن خواوە هاتووە و لە تاقەت و توانای بەشەردا نیە کتێبی وا دابنێت.
- قورئان تەحەدای کردوون کە هاوشێوەیەکی ئەو بهێنن، یان دە سوورەتی وەك ئەو، یان تەنانەت یەك سوورەت، کەچی هەموو دەستەوسان بوون لەوەدا.
- ئەوەی درۆ بەدەم خواوە بکات سزاکەی تیاچوونە، کەسیش ناتوانێ بەرگری لێ بکات، تەنانەت ئەگەر پێغەمبەریش بێتﷺ، کە ئەمەش خۆی بۆ خۆی سەلماندنی ئەوەیە کە قورئان نیگای خوایە و ئەو گەیاندوویەتی.

---

١٢٢–في ظلال القران، سيد قطب، سەرچاوەی پێشتر، ج٦، ص٣٦٨٩.

## گومانی بیست و چوار

### بانگەشەی ئەوەیان ئەکرد کە کابرایەکی ناعەرەب قورئانی فێری موحەممەدﷺ کردووە *[123]

**ناوەڕۆکی گومانەکە:**

موشریکەکان ئەڵێن گوایە موحەممەدﷺ ئەم قورئانەی کە دەیخوێنێتەوە لە مرۆڤی وەرگرتووە، ئاماژە بۆ کۆیلەیەکی رۆمی ناعەرەب ئەکەن کە کۆیلەی پیاوێکی قورەیشی بووە،پێغەمبەرﷺ لە لای ئەوەستاو بانگی ئەکرد بۆ ئیسلام، بۆیە ئەیانووت: موحەممەد لەوەوە فێر ئەبێت، ئەو کۆیلەش ئەیووت: لەلام ئەوەستێت و فێری ئیسلامم ئەکات، خـوای گـەورەش فـەرمووی: ﴿ وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُ بَشَرٌ لِّسَانُ الَّذِي يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِيٌّ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِيٌّ مُّبِينٌ ﴿١٠٣﴾ ﴾ (النحل)، سوێند بە خوا ئێمە بەڕاستی دەزانین بێ باوەڕان دەڵێن: ئەم قورئانە تەنها کەسێك فێری دەکات، (بەمەر جێك) زمانی ئەو کەسەی ئەوان دەڵێن قورئان فێری محمد دەکات، عەجەمیەو عەرەبی نیەو ڕەوان نیە، لەگەڵ ئەوەدا ئەم قورئانە بە زمانی عەرەبی و پاراوو ڕوون و ئاشکرا دارێژراوە.

**ڕێگەی پووچکردنەوەی ئەم گومانە:**

هۆکاری گومانەکە بوختانکردنەو لە نەزانینیشەوە سەرچاوەی گرتووە، ئەگینا چۆن مەحەممەد ئەم قورئانە عەرەبیە ڕەوانە لە کەسێکی ناعەرەبەوە وەرئەگرێت؟

---

١٢٣- بۆ پووچی ئەم گومانە گوایە پێغەمبەر(ﷺ) قورئانی لە کۆیلەیەکی رۆمی وەرگرتووە ڕێگەی شەشەم لە گومانیسی و حەوت لە بەرگی یازدە بخوێنەرەوە بەناوی(پارێزراوی قورئانی پیرۆز).

**درێژەی بابەتەکە:**

**ئایا پێغەمبەرﷺ قورئان لە منالێکی ناعەرەبەوە فێربووە؟**

هۆکاری ئەم گومانە بوختانکردنەو لە نەزانینیشەوە سەرچاوەی گرتووە، خوای گەورە لەم بارەیەوە بەدرۆیان ئەخاتەوە و ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُ بَشَرٌ لِّسَانُ ٱلَّذِى يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِىٌّ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِىٌّ مُّبِينٌ ﴿١٠٣﴾﴾ (النحل)، سوێند بە خوا ئێمە بەڕاستی دەزانین بێ باوەڕان دەڵێن: ئەم قورئانە تەنها کەسێك فێری دەکات، (بەمەر جێك) زمانی ئەو کەسەی ئەوان دەڵێن قورئان فێری محمد دەکات، عەجەمیەو عەرەبی نیەو ڕەوان نیە، لەگەڵ ئەوەدا ئەم قورئانە بە زمانی عەرەبی و پاراوو ڕوون و ئاشکرا داڕێژراوە.

ئەمەش یانی: ئەرێ هەر خۆتان نازانن ئەمە درۆیە! ئەو زمانەی ئێوە ئاماژەی بۆ ئەکەن ناعەرەبە، گوایە ئەم قورئانە عەرەبیەی فێری موحەممەد کردووە؟ ئەوان ئەیانگوت ئەوەی موحەممەد فێری ئەم قورئانە ئەکات ئەو کۆیلە ڕۆمیە ناعەرەبیە کە خەریکی شمشێر دروستکردن بوو لە مەککەدا، ئەڵێن: پێغەمبەرﷺ جارجارە ئەچوویە لای و بانگی ئەکرد بۆ لای ئیسلام.. لەڕاستیدا قورئانیش بە ڕوونترین شێواز ئەم چەواشەکاریەی ئاشکرا کردووە بە وتەیەکی کورت و پووخت دوور لە دادرێژی، ئەفەرموێ: ﴿لِّسَانُ ٱلَّذِى يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِىٌّ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِىٌّ مُّبِينٌ ﴿١٠٣﴾﴾ (النحل)، زمانی ئەو کەسەی ئەوان دەڵێن قورئان فێری محمد دەکات، عەجەمیەو عەرەبی نیە، لەگەڵ ئەوەدا ئەم قورئانە بە زمانێکی عەرەبی و پاراو داڕێژراوە.

ئەمە باشترین وەڵامە بۆ ئەو بوختانەیان، ئاخر چۆن کەسێکی ناعەرەب توانی ئەم قورئانەی بەو هەمووە ڕەوانبێژی و زمانپاراوی و پڕمانا و گشتگیریە کە پڕماناترین کتێبە بە بەراورد بەو کتێبانەی بۆ پێغەمبەرانی تر دابەزیووەفێری موحەممەد بکات کە خۆی

ناعەرەب بێت؟! هەر کەسێك تۆسقاڵێك عەقڵی هەبێت ئەم قسەیە ناکات، بەتایبەتی ئەو موشریکانە کە خاوەنی زمانی عەرەبی بوون و پیاوی ئەو مەیدانە و پێشەنگی رەوانبێژی بوون، لەراستیدا دەسەوسان بوون لە رووبەڕووبوونەوەی سورەتێکی قورئاندا، ئیتر چۆن موحەممەد لەو گەنجە ناعەرەبەوە فێری ئەم قورئانە سەرسووڕهێنەرە بووە؟ بەم شێوازە قورئان بە کورتی و بە روونی چەواشەکاریەکانیان ئەخاتە روو، چۆن ئەو ناعەرەبە ئەم قورئانە فێری ئەو ئەکات کە خەریکە خۆی نەزانێ دەربیبڕێت، لە کاتێکدا قورئان بەزمانێکی عەرەبی روون و رەوان و دەسەوسانکەر وتراوە!

پاش ئەم وەڵامە قسەبڕە قورئان بەپاشکۆیدا ئەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ لَا يَهْدِيهِمُ ٱللَّهُ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٠٤﴾ ﴾ (النحل)، بەڕاستی ئەوانەی کە بڕوایان بە ئایەتەکانی خوا نیە، خوای گەورە هیدایەت و ڕێنموویان ناکات، بەڵکو سزای بە ئێشی بۆ ئامادە کردوون.

ئەو موشریکانە بەوە ناسراو بوون کە دژایەتی توندی پێغەمبەریان ئەکرد، زۆر رەق و توند بوون لە رووبەڕووبوونەوە و رووەرچەرخاندنی رووی خەڵکی لێی، بەجۆرێك بێباوەڕیەکەیان گەیشتبووە ئاستێك کە ئاستی تری لەسەرەوە نەبوو، ئەو فەرمایشتەی خوا هاتەدی کە ئەمانە ئیتر بڕواناهێنن..[١٢٤]

وە ئەوانەی کە ئیمان ناهێنن بەراستی درۆزنن و بوختانی درۆ بەدەم خواوە ئەکەن، وەك ئەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا يَفْتَرِى ٱلْكَذِبَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰذِبُونَ ﴿١٠٥﴾ ﴾ (النحل)، بێگومان هەر ئەوانە درۆ هەڵدەبەستن کە باوەڕیان بە ئایەتەکانی خوا نیە، هەر ئەوانیش درۆزنن و درۆیان کردۆتە پیشە .

---

١٢٤- التحرير و التنوير، الطاهر بن عاشور، سەرچاوەی پێشتر، مج٧، ص٢٨٨، بەدواوە.

به سیغەیەك ئەیفەرموێ تا دەستكۆتایان بكات و وازیان پێ بهێنێ لەو هەمووە بوختانەی ئەیكەن، چونكە كرداری رانەبووردووی بەردەوام ئەو ئاماژەیە ئەگەیەنێت كە بەردەوام خەریكی بوختان تاشینن.

خوای گەورە لە جێگایەكی تردا وەڵامی داونەتەوە كە ئەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ نُصَرِّفُ ٱلْأَيَٰتِ وَلِيَقُولُوا۟ دَرَسْتَ وَلِنُبَيِّنَهُۥ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿١٠٥﴾ ﴾ (الانعام)، هەر بەو شێوەیە (ئەی محمد ﷺ ئایەتی جۆراو جۆرت بۆ ڕەوانە دەكەین لە هەموو بارەیەكەوە، دە با هەر بڵێن خوێندووتە و بەدەرس پێت وتراوە (ئێمە دەمانەوێت) بەڕاستی ڕوونی بكەینەوە بۆ كەسانێك كە بزانن و تێبگەن.

ئەمە یانی: بەو شێوەیە بە چەندین شێوە ئایەت و بەڵگەی خۆمانیان بۆ ئەمدیودیو ئەكەین تا ئەوانەیان كە ئامادەیی ئیمانیان تێدایە هیدایەت وەربگرن بە پێی جیاوازیەكانی نێوان تێگەیشتن و عەقڵیان و ئەوانەش كە موشریك و كەللە رەقن هەر بڵێن: موحەممەد تۆ ئەمەت لای كەسی تر خوێندووەو و پێشتر فێری بوویت، ئەمە نیگای خوا نیە وەك تۆ بانگەشەی بۆ ئەكەیت، بە دڵنیاییەوە ئەم درۆ و بوختانەیان زۆر جار كردووە، وەك چۆن لە سوورەتی (النحل)دا بۆمان ئەگێڕێتەوەو پاشان ئەفەرموێ: (وَلِنُبَيِّنَهُ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ) واتە: ئەمە ڕوونئەكەینەوە بۆ قەومێك كە هەق بناسن و شوێنی بكەون و ناهەقیش بناسن و لێی دووربكەونەوە..خوای گەورە حیكمەتێكی لە رادەبەدەری هەیە لەوەدا ئەمانە وێڵ ئەكات و هەقیش بۆ ئەوانە ڕوون ئەكاتەوە. پاشان فەرمانی سەرەوە بۆ پێغەمبەری بەڕێزﷺ دەردەچێت خوای گەورە ئایەتەكانی بەم دیو بەو دیودا ڕوون ئەكاتەوە بۆیان و خەڵكی ئەبنە دوو بەرە لەبەرانبەر قورئاندا..فەرمان دەردەچێت بۆ پێغەمبەرﷺ كە شوێن نیگای خوا بكەوێت و لە موشریكەكان دووربكەوێتەوە، گوێیان پێنەدات و گوێ بە دەمەدەمێ و بەو قسە پووچانەشیان نەدات كە ئەوان دەیكەن، بێگومان ڕێبازی ئەو ئەوەیە كە شوێن نیگای خوا بكەوێت و ژیانی

بەپێی ئەو نیگایە ڕەنگرێژ بکات و ژیانی شوێنکەوتەکانیشی هەر بە پێی ئەو نیگایە ئاراستە بکات، ئەو کاری بەسەر موشریکەکانەوە نەبێت، بەڵکو هەر بە شوێن ئەو نیگایەدا بڕوات کە ئەو خوایە بۆی ناردووە کە هیچ خوایەکی بەهەقی تر نیە ئەو نەبێت، ئەو چ کارێکی هەیە بەسەر ئەوانەوە کە بوونەتە کۆیلەی ئارەزووەکانیان؟ ﴿ٱتَّبِعْ مَآ أُوحِىَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ۖ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٦﴾﴾ (الانعام)، (تۆ ئەی محمد! شوێنی ئەو بەرنامەیە بکەوە کە لەلایەن پەروەردگارتەوە بە نیگا و (وحی) پێت ڕاگەیەنراوە، جگە لەو هیچ خوایەکی تر نیە، گوێ مەدەرێ و پشت هەڵکە لە موشریك و هاوەڵگەران.[125]

**بە کورتی:**

قورئان کارەکەی لە دوو ڕستەدا کورت کردووەتەوە و لادان گومرابوونی موشریکەکانی لەوەدا کە شوێن ئارەزووەکانیان کەوتوون ئاشکرا کردووەو وەڵامی گومانەکەشی داونەتەوە، ئەو دوو ڕستەش بریتین لە:

- ﴿لِّسَانُ ٱلَّذِى يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِىٌّ ﴿١٠٣﴾﴾ (النحل)، زمانی ئەو کەسەی ئەوان دەڵێن قورئان فێری محمد دەکات، عەجەمیەو عەرەبی نیەو ڕەوان نیە..
- ﴿وَهَـٰذَا لِسَانٌ عَرَبِىٌّ مُّبِينٌ ﴿١٠٣﴾﴾ (النحل)، لەگەڵ ئەوەدا ئەم قورئانە بە زمانی عەرەبی و پاراوو ڕوون و ئاشکرا داڕێژراوە.

دەی پێغەمبەرﷺ چۆن ئەم قورئانە پیرۆزە کە هەموو کەس لەبەردەمیدا دەستەوسانە ئەی ڕابەرانی ڕەوانبێژی و قسەڕەوانەکان! و ئەوانەی هاوکارتانن و دژ بە قورئانن چۆن لە کەسێکی ناعەرەبەوە فێر ئەبێت، کە هیچ پەیوەندیەکی بە فەساحەت و ڕەوانبێژییەوە نیە؟!

---

١٢٥- في ظلال القران، سيد قطب، سەرچاوەی پێشتر، ج٣، ص١١٦٨.

## گومانی بیست و پێنج

### جولەکەکان ئەڵێن گوایە باوەڕهێنان بەوەی کە بۆ ئەوان دابەزیوە بەسە بۆیـان و بێ باوەڕبوون بە غەیری ئەوە زیانیان پێ ناگەیەنێت *[126]

**ناوەڕۆکی گومانەکە:**

جولەکە و هاوشێوەکانیان لە ئەهلی کتێب ڕەتی دەکەنەوە ئیمان بەو شتە بهێـنن کـە بۆ موحەممەدﷺ دابەزیوە، بیـانوو بـەوە ئەهێننـەوە کـە ئیمانهێنـان بـەوەی بـۆ خۆیـان دابەزیوە بەسـە بۆیـان، پێویست ناکـات ئیمـان بـە جگـە لـە کتێبەکـەی خۆیـان بهێـنن، باوەڕنــەبوونیان بــە غــەیری ئــەوەی خۆیــان زیانیــان پــێ ناگەیــەنێت، خــوای گــەورە ئەفـــــەرموێت: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ ءَامِنُوا بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُوا نُؤْمِنُ بِمَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا وَيَكْفُرُونَ بِمَا وَرَآءَهُۥ وَهُوَ ٱلْحَقُّ مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَهُمْ ۗ قُلْ فَلِمَ تَقْتُلُونَ أَنۢبِيَآءَ ٱللَّهِ مِن قَبْلُ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٩١﴾ ﴾ (البقره)، کاتێك پێیان دەوترێت باوەڕ بهێنن بـەوەی کـە لـە لایـەن خـواوە ڕەوانـەکراوە، دەڵێن: ئێمە تەنها باوەڕمان بەوە هەیە کە بۆ ئێمە ڕەوانەکراوە و باوەڕ ناهێنن بە هەموو ئەوانەی کە دوای (تـەورات) هـاتووە وەکـو (ئینجیـل و قورئـان) لەکاتێکدا کـە هـەر ئـەو قورئانە حەق و ڕاستی یەو بەڕاست دانەری (تەورات)ی ئەوانیشە، پێیان بڵێ: ئەی کەواتە بۆچی پێشتر پێغەمبەرەکانی خواتان دەکوشت ئەگەر ئێوە ئیماندارن بە تەورات؟!

**ڕێگاکانی پووچەڵکردنەوەی ئەم گومانە:**

١. بانگەشەکردنیان بە ئیمانهێنان بەوەی بۆیان دابەزیوە تەنیا سەرزارەکییە، چـونکە ئەوان پێچەوانەی ئەوە هەڵسوکەوت ئەکەن کە لە کتێبەکەیاندایە.

١٢٦- ئەو ئایەتەی کە باس لـەم گومانـە ئـەکات بریتیـە لـە:(البقـرة:٩١)، ئـەو ئایەتانـەش وەڵامـی ئـەم گومانـە ئەدەنەوە بریتین لە: (البقرة/١٤٦،٩١،الاعراف/١٥٧، الانعام/٣٠).

٢. ئــەهلی کتێــب هەمیشــە راســتیەکان دەشــارنەوە، بێباوەڕبوونیــان بــەوەی بــۆ موحەممەدﷺ دابەزیوە حەسوودیبردنیانە بـە غـەیری خۆیـان و لادان و نکولیکردنـە لـەو راستیانەی کە لە کتێبەکەیاندا درکێنراوە.

٣. نکولیکردن لە کوشتنی پێغەمبەران لەگەڵ ئەوەی کە لەو تەوراتەی ئەواندا شـوێنی کەوتوون قەدەغەکراوە.

**درێژەی وەڵامەکە:**

**یەکەم: درۆی جولەکە و پێچەوانەوە جوڵانەوەیان بۆ کتێبەکەیان.**

لە سەردەمی دابەزینی قورئانـدا هەنـدێك لـە جولەکـەکان داوای لێبـووردن دەکـەن لـە بەرانبەر باوەڕنەهێنانیان بەوەی دابەزیوە بۆ موحەممـەدﷺ بـە بیـانووی ئـەوەی ئـەوان تەوراتیان هەیە و ئەوەش بەسە بۆیان، بەو جۆرە ئەهلی کتێبـەکانی تـریش هاوشـێوەی ئەوانن، ئەوان دان بە هیچی تردا نانێن جگە لـەوەی خۆیـان ئـەیلێن: (نُؤۡمِنُ بِمَآ أُنزِلَ عَلَيۡنَا )(البقرة)، بڕوامان بەوە هەیە کە بۆ خۆمان دابەزیوە!

نــەوەکانی ئیسـرائیل بەهانــەیان ئــەوەبوو کــە شــوێن ئیســلام نەدەکــەوتن و رازی نــەدەبوون بێنــە بازنــەی ئیسـلامەوە، ئـەوەی کـە هەیانـە بەسـە بۆیـان، لـە رێنمـایی پێغەمبـەرەکانیان، ئەوانـە بـە شـەریعەت و رێنماییـەکانی ئـەوان بـەڕێوە ئەچـن، لێـرەدا قورئـان ئابڕوویـان ئـەبات و راسـتی مامەڵەیانبەرانبـەر پێغەمبـەران و شـەریعەتەکانیان و رێنماییەکانیان دەخاتە روو، ئەوەش دەسەلمێنێ کە ئـەوە ئـەوان بـوون رووبـەڕووی ئـەو راستیانە دەبوونەوە کـە لەگـەڵ هـەواو ئارەزوویانـدا یـەکی نەدەگرتـەوە، لـە بابەتـەکانی پێشــوودا چــۆنێتی مامەڵــەی ئــەوانی لەگــەڵ پێغەمبەرەکەیان(موسا)ســەلامی خــوای لێبێتخستە روو، کە خوا کتێبێکی بۆ ناردبوو، لێرەدا باس لەوە ئەکات کە پێغەمبـەرانیان بەدوای یەکدا بۆ هاتوون، هەنـدێکیان لـەوانی تـر لـە پێشـتر بـوون، کـە دوا پێغەمبـەریان

عیسای کوڕی مەریەم بوو کە خودای گەورە موعجیزەی روون و ئاشکرای پێدابوو، لەگەڵ پشـتیوانی بـەهێزی جوبرەئیـل، بەدەمەوەچـوونیان بـۆ ئـەو کۆمەڵـە پێغەمبـەرە کەکۆتاییەکەیان عیسای بوو چۆن بوو؟

ئەمە ئەو کارە بوو کە رەتی دەکردەوە لە بەرانبەریان، ئەوانیش توانای نکولیکردنیان نەبوو، تەنانەت کتێبەکانی خۆشیان ئەو شـاهیدیەی بـۆ دەدان، ﴿أَفَكُلَّمَا جَآءَكُمۡ رَسُولُۢ بِمَا لَا تَهۡوَىٰٓ أَنفُسُكُمُ ٱسۡتَكۡبَرۡتُمۡ فَفَرِيقٗا كَذَّبۡتُمۡ وَفَرِيقٗا تَقۡتُلُونَ ٨٧﴾ (البقرة)، ئایا چۆن دەبێت هـەر کاتێك پێغەمبەرێکمان رەوانە کردبێت، بەڵام لەگەڵ ئارەزووەکانی ئێوەدا نـەگونجا بێـت، خۆتان بەزل زانیوەو لووتتان بەرز کردۆتـەوەو بڕواتـان نـەهێناوە، ئەوسـا دەسـتەیەکتان (بەرنامەی خواتان) بە درۆ زانیووەو هەندێکیشتان پێغەمبەرانتان دەکوشت.

هەوڵدان بۆ ئەوەی رێنمایی و شـەریعەتەکان بخرێتـە ژێـر رکێفـی هـەواو ئارەزوویـەکی ناجێگیر و کاتی دیاردەکە بەدیار ئەکەوێت هەر کات سروشت و ژیـری مرۆڤـەکان تووشـی لادان بوون و لە رێگەی راست و دادپەروەری و مرۆڤایـەتی لایانـدا ئـەو ژیرییـە ئـەخوازێت شـەریعەت بگەڕێتـەوە بـۆ سەرچـاوە نـەگۆڕەکانی خـۆی، نـەك سەرچـاوە ئینسـانیە ناجێگرەکە، سەرچاوەیەك مەیلی بۆ هەوا و ئارەزوو نەبێ، خەونی ئەرخەوانی زاڵ نـەبێت بەسـەریدا، خـەڵکان بگەڕێنێتـەوە بـۆ ئـەو پێـوەرە نـەگۆڕەی کـە لـەکاتی تـووڕەیی و رازیبوونـدا پێوانـەکانی نـاگۆڕێن وە لـە کـاتی سـاغی و نەخۆشـیدا وە لـە کـاتی هـەواو ئارەزووودا نەك ئەوەی ئەمان پێوەرەکە بخەنە ژێر رکێفی حەز و ئارەزووەکانیانەوە.[127]

خـوای گـەورە وەڵامـی ئـەم بەهانانـە ئەداتـەوە بـە ئاشـکراکردنی راسـتەقینەیی کارەکانیان، ئەویش ئەوەیە ئەوان تەنیا بەسەر زارەکـی بانگەشـەی ئـەو ئیمانـە ئەکـەن، وەك ئەفەرموێ: ﴿وَيَكۡفُرُونَ بِمَا وَرَآءَهُۥ وَهُوَ ٱلۡحَقُّ مُصَدِّقٗا لِّمَا مَعَهُمۡۗ ٩١﴾ (البقرة)، بـاوەڕ

---

١٢٧- في ظلال القران، سيد قطب، سەرچاوەی پێشتر، ج١، ص٨٨ و٨٩.

ناهێنن بە هەموو ئەوانەی کە دوای (تەورات) هاتووە وەکو (ئینجیل و قورئان) لەکاتێکدا کە هەر ئەو قورئانە حەق و ڕاستی یەو بەڕاست دانەری (تەورات)ی ئەوانیشە..بۆ نمونە وەك مژدەدان بە هاتنی پێغەمبەری ئیسلامﷺ لە نەوەی براکانیان، واتە کوڕانی ئیسماعیلسەلامی خوای لێبێت ئەوەی پێغەمبەرایەتی موحەممەد بسەلمێنێ یەکسان و هاوتایە بەوەی پێغەمبەرایەتی موسا سەلامی خوای لێبێت ئەسەلمێنێ، ئەمەش شوێنکەوتنی موحەممەدﷺ پێویست ئەکات، بە هەمان شێوە شوێ،کەوتنی موسایە، چونکە بەڵگە بۆ هێنراوە هەمیشە بەشوێن بەڵگەکەیدا ئەڕوات، لە هەموو سەردەم و لە هەموو بابەتێکدا، ئەوان کافرن بەوەی پشتی ئەو پەیامە ئەگرێت کە بۆیان هاتووە، کە بریتیە لە هەق و ڕاستی لە ڕووی ئەوەوە کە ئەو پەیامەی ئەوان ئەسەلمێنێ کە لەبەردەستیاندایە، دەی ئەمە بەڵگە و عەقڵی ئەوانیش پشتڕاستس ئەکاتەوە، کەواتە بیانوویان ئەبڕێت و بەهانەیان ناهێڵێ.

**دووەم: جولەکەکان ڕاستی ئەشارنەوە بەهۆی لادان و حەسوودیانەوە.**

قورئان ڕوونی دەکاتەوە کە ئەهلی کتێب لە حەسوودیاندا ئیمان بەو ڕاستیە ناهێنن بەوەی کە بۆ موحەممەدﷺ دابەزیوە، ئەوان ئەوە ئەزانن کە ئەوەی بۆ موحەممەدﷺ دابەزیوە ڕاستیە و لە تەورات و لە ئینجیلیشدا ئاماژەی پێکراوە، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَـٰهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ يَعْرِفُونَهُۥ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمْ ۖ وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنْهُمْ لَيَكْتُمُونَ ٱلْحَقَّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٤٦﴾ ﴾ (البقرة)، ئەوانەی کتێبمان پێ بەخشیوون پێغەمبەر دەناسن هەروەك چۆن نەوەکانی خۆیان دەناسن، بێگومان دەستەیەك لەوان ئەو ڕاستییە دەشارنەوە، لەکاتێکدا دەشزانن محمد فرستادەی خوایە.هەروەها ئەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِىَّ ٱلْأُمِّىَّ ٱلَّذِى يَجِدُونَهُۥ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ يَأْمُرُهُم بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَىٰهُمْ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَـٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ ٱلْخَبَـٰٓئِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَٱلْأَغْلَـٰلَ

ٱلَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْۚ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَٱتَّبَعُواْ ٱلنُّورَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٥٧﴾ ﴾ (الاعـراف)، ئەوانـەی کـە شـوێنی ئـەم پێغەمبـەرە هەواڵـدەرە نەخوێندەوارە دەکـەون ئـەوەی کـە (گـاورو جـوو، نـاوو نیشـانیان) دەسـتیان دەکـەوێت نووسـراوە لای ئـەوان لـە تـەورات و ئینجیلـدا، فـەرمانیان پێـدەدات بەچـاکەو قەدەغـەی گوناهو خراپەیان لێدەکات و هەرچیەك پاکو چاکە بۆیان حەڵاڵ دەکات و هەرچی پیس و ناپوختە لێیان حەرام دەکات و ئەرکە قورس و سەنگینەکان لەسەرشانیان لادەبـات، ئـەو کۆت و زنجیرانەش کە لەسـەریان بـوو لای دەبـات (وەك خـۆ کوشـتن لـەکاتی تەوبـەدا... هتد)، جا ئەوانەی باوەڕیان پێ هێناوە و پشـتیوانیان لێکـردوە و پشـتگیریان کـردووە و شوێنی ئەو نوورە کەوتوون (کە قورئانە) و هـاوڕێ لەگەڵیـدا ڕەوانـە کـراوە، هـەر ئەوانـە سەرفرازو ڕزگارن.

ئەوان ڕاستگۆ نین لەوەی کە دەیانگوت، چونکە خوای گەورە لـە ڕێگـەی ئـەو نیگـای بـۆی نـاردووە بـەڵێنی لێوەرگرتـوون کـە بـاوەڕ بـە موحەممـەدﷺ بهێـنن، بەمـەش بەشێوەیەکی توند ڕووبەڕوویان دەبێتەوە لەسەر ئەوەی کە گوتوویانە و لەسەر ئـەوەش کـە کردوویانـە، پـەردەیان لەسـەر لائـەدات و لـەو بەڵگـە و بەهانانـە دایانئـەماڵێت کـە خۆپەرستی و لووتبەرزی خۆیان پێ داپۆشیووە، ئەوەیان دەرئەخات کـە چـەندە خۆیـان دابڕیوە لە خەڵکی و چەندە ڕقیـان لـەوە ئەبێتـەوە خـەڵکی تووشـی خێـر بـبن و چـەندە حەسوودی ئەبەن بەوانەی خوا لە فەزڵی خۆی بەشـیان بـدات، ئەمـەش هـەمووی بـەهۆی ئەوەوەیە کە هەڵوێستێکی نکولیکەریان گرتووە لە ئیسلام و لە پێغەمبەرە بەڕێزەکەی.

خوای گـەورە ئەفـەرموێ: ﴿ وَقَالُواْ قُلُوبُنَا غُلْفُۢۚ بَل لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفْرِهِمْ فَقَلِيلًا مَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٨٨﴾ ﴾ (البقرة)، هەروەها (جولەکەکانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ وتیان: دڵەکانمان داخراوە ( لە گوفتاری تۆ، تێناگەین) نـەخێر وانـی یـە، ئەوانـە خـوا نفرینی لێکـردوون بـەهۆی کـوفرو خوانەناسیانەوە، کەوابوو بە کەم شت بڕوا دەکەن.

دەیـانگوت: دڵـەکانمان داخـراوە و بـۆ بانگـەوازێکی تـازە ناکرێتـەوە، گـوێ بـۆ بانگـەوازێکی تـازەش ناگرێـت، ئەمانـەیان ئـەگوت بـۆ نائومێـدکردنی موحەممـەد ﷺ و هەروەها موسڵمانانیش تا بانگیان نەکەن بۆ لای ئەم ئایینە تازەیە، یـان وەك بیانوویـەك ئەیانبینی بۆ وەڵامنەدانەوەی بانگەوازەکەی پێغەمبەرﷺ خوای گـەورەش لـە وەڵامیانـدا ئەفـەرموێ: (بَـلْ لَعَـنَهُمُ اللّـهُ بِكُفْـرِهِمْ) واتـە بـەهۆی بێباوەڕییانـەوە لـە هـەق و هیدایـەت دەریکردوون و دووری خستوونەتەوە، چونکە ئەمانە هەر لە سەرەتاوە بـڕوادار نـەبوون و خواش بەوشێوەیە پاداشتی داونەتەوە کە دەریـان بکـات و سـوود لـە هیدایـەت نەبـەن،( فَقَلِيلًـا مَـا يُؤْمِنُـونَ)، واتـە زۆر بـە کـەمی ئیمـان ئـەهێنن بـەهۆی ئـەو سـزایەی دراوە بـە کۆڵیاندا، کـە دوورخسـتنەوەیانە لـە هیدایـەت، کـە هـەر لـە دێرزەمانـە لەبـەر بێبڕواییـان نەفرەتیان لێکراوە، یان ماناکەی ئەوەیە کە: حاڵیان بەردەوام وایە: لەبەر ئەوەی کـافرن کەم هەڵئەکەوێ لەناویانا ئیمان بهێنێت، ئەمە حاڵەتێکی نەگۆڕە لەناویاندا، ئەمەش بۆیە باس ئەکات تا حەقیقـەتیان بـۆ خـەڵکی دەربکـەوێت، هـەردوو ماناکـەش یەکنەگرنـەوە و گونجاون لەگەڵ بابەتەکەدا.

لەراستیدا ئەم بێباوەڕیەی جولەکە شـتێکی زۆر ناشـیرینە، چـونکە ئـەوە بێبڕوابوونـە بـەو پێغەمبـەرەی کـە چـاوەڕوانکراو بـووە، خۆیانیـان بەسـەر کافرانـدا هەڵئەکێشـا و ئەیانووت با ئەو پێغەمبەرە چاوەڕوانکراوە بێت ئێمـە شـوێنی ئەکـەوین و بەسـەرتانا زاڵ ئەبین، کەچی بەو کتێبە راستەوە هات بۆ لایـان کـە پشـتیوانی لـە کتێبەکـەی خۆشـیان نـەکرد، بـەڵام ئـەوان بڕوایـان پـێ نـەکرد، ﴿ وَلَمَّا جَآءَهُمْ كِتَٰبٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ وَكَانُواْ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُواْ كَفَرُواْ بِهِۦ فَلَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٨٩﴾ ﴾ (البقرة)، کاتێك لە لایەن خواوە کتێبێك (قورئان) هات بۆیـان، کـە: ئـەو کتێبانەی ئەوانیش پەسەند دەکات و بەڕاستی دەزانێت، ئەوان پێشتر داوای سەرکەوتن و

زاڵ بونیان بەسەر ئەوانەی بێ باوەڕ بوون لە خوا دەکرد بە هۆی شوێنکەوتنیان بۆ پێغەمبەر ﷺ، کەچی کاتێك ئەو پێغەمبەرەیان بۆ هات کە دەیانناسی، بڕوایان پێ نەکرد، کەواتە با نەفرین و لەعنەتی خوا لەسەر کافران بێت.

ئەو ڕەفتارە ناقۆڵاو ناشیرینە شایانی دەرکردن و نەفرەتلێکردنە..پاشان جێگەی ئەوەیە نەفرەت بکەوێتە شوێنیان ﴿فَلَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ٨٩﴾ (البقرة)

بەهۆی ئەو هەڵوێستە ئابڕووبەرەیان کە کە هەڵ،ێستێکی شاراوە بوو گرتبوویانەبەر ڕسوای کردن، پاش بڕیاردانی زەرەرمەندبوونیان لەو مامەڵەی هەڵیانبژاردووە، وەك ئەفەرموێ: ﴿بِئۡسَمَا ٱشۡتَرَوۡاْ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمۡ أَن يَكۡفُرُواْ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بَغۡيًا أَن يُنَزِّلَ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦۖ فَبَآءُو بِغَضَبٍ عَلَىٰ غَضَبٖۚ وَلِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٞ مُّهِينٞ ٩٠﴾ (البقرة) (ئەو جوولەکانە) خۆیان بەشتێکی ناپەسەند فرۆشت (هەڵوێستێکی نادروستیان نواند) کاتێك کافر بوون بەو قورئانەی خوا ناردوویەتی، (لە حەسوودی)و سەرکەشیدا (ڕەخنەیان گرت و وتیان): بۆچی خوای گەورە دەرگای فەزڵ و لای ڕەحمەت دەکاتەوە لە هەرکەسێك بیەوێت لە بەندەکانی! ! ئەوسا ئیتر دووچاری یەك لە دوای یەکی ڕق و خەشمی خوا بوون (چونکە وەنەبێت تەنها کافر بوو بن بە محمد ﷺ و بەقورئان، بەڵکو کافربوون بە موساو تەوراتیش کە داوای شوێنکەوتنی محمدیان لێدەکات)و بۆ کافرو خوانەناسان سزایەکی ڕسواکەر ئامادەیە.

(بِئۡسَمَا ٱشۡتَرَوۡاْ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمۡ أَن يَكۡفُرُواْ )، خۆیان بەشتێکی ناپەسەند فرۆشت، کاتێك کافر بوون بەو قورئانەی خوا ناردوویەتی! وەك ئەوەیە کە ئەو کوفرەیان وەرگرتبێت لەبەرانبەر خۆفرۆشتنیاندا! مرۆڤ گیانی خۆی دەخەملێنێت بە نرخێك یان زیاد دەکات یاخود کەم، بەلاَم ئەگەر خەملاَندی بە بێباوەڕی ئیتر ئەوە قەڵبترین و زەرەرمەندترین مامەڵەیە، دەی ئەوەش ڕاستی مەسەلەکەیە لە واقیعدا.

ئەگەر ئەمە تەنیا نمایشێکیش بێت بێگومان خۆیان دۆڕاندووە لە دونیادا بە پەیوەندینەکردنیان بە کۆمەڵی موسڵمانانەوە، هەروەها گیانی خۆیانیان دۆڕاندووە لە قیامەتدا بە شایستەبوونیان بەو سزا ئابڕووبەرەی کە چاوەڕوانیان ئەکات، لە کۆتاییشدا چییان دەست کەوت؟ تەنیا دەستکەوتیان ئەو بێ باوەڕییە بوو کە بۆیان مایەوە!

هەموو ئەو شتانەی دووچاری ئەم حاڵەتەی کردن حەسوودیبردنیان بوو بە پێغەمبەری خواﷺ، کە خوای گەورە هەڵیبژارد بۆ پێغەمبەرایەتی کە ئەوان چاوەڕوانی بوون سەرهەڵبدات، هەروەها رق و کینەیان بەرانبەر هەر کەسێك کە خوا فەزڵێکی خۆی بەسەردا رشتبێت و نیگایەکی بۆ دابەزاندبێت، ئەمەش زوڵم و ستەمە ئەوان دەستیان داوەتێ، دەستکەوتیان لەم زوڵم و ستەمە ئەوە بوو خوا غەزەبی بەسەر غەزەبدا لێگرتن، لەو لاشەوە سزایەکی رسواکەر چاوەڕوانیان ئەکات لەبەر ئەو لووتبەرزی و حەسوودی و ستەمە بێزراوەی دەستیان داوەتێ.[128]

**سێیەم: جولەکەو پێغەمبەر کوشتن.**

بە لەبەرچاوگرتنی لووتبەرزی و نکولیکردنیان هیچ نەماوەتەوە ئەوە نەبێ رووشکێن بکرێن بە بەڵگەی ئەو بێ حورمەتیکردنەیان کە ئەنجامیان داوە بەرانبەر ئەوەی دابەزیوەتە سەریان، بۆ ئەوەی بزانرێ ئەوانە شوێن هەواو ئارەزووی خۆیان کەوتوون، و ئارەزووی خۆیان کردووە بە حاکم، بۆیە خوای گەورەش قسەیان ئەبڕێت و ئەفەرموێ: ﴿ قُلْ فَلِمَ تَقْتُلُونَ أَنبِيَاءَ اللَّهِ مِن قَبْلُ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٩١﴾ ﴾ (البقرة)، پێیان بڵێ: ئەی کەواتە بۆچی پێشتر پێغەمبەرەکانی خواتان دەکوشت ئەگەر ئێوە ئیماندارن بە تەورات؟!

---

١٢٨- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص٨٩و٩٠.

یانی: ئەگەر راست ئەکەن لەوەی باوەڕتان هەیە بەوەی بۆتـان دابـەزیوە ئـەی بۆچـی ئەو پێغەمبەرانـەتان ئەکوشت کـە بـۆ سـەلماندنی تـەورات ئـەهاتن کـە کـاری پێبکـەن و نەیانسڕنەوە، خۆشتان ئەتانزانی ئەو پێغەمبەرانە راستگۆن؟!

چۆن پێغەمبەرانتان ئەکوشت لەکاتێکدا ئـەوە حـەرامکرابوو لەسـەرتان؟ لـە تەوراتـدا هیچ فەرمانێك نیە بە کوشتنیان، لێرەدا گوتارەکە بۆ ئەوانەیـە کـە موحەممەدیان(صـلی اللەعلیەوالەوسلم)دەناسی و مەبەستیش باوباپیرانیانە، ئەمە سەرزەنشتیکردنی ئەو بـەنی ئیسرائیلیانەیە کە لە سەردەمی پێغەمبەردا بوونﷺ، چونکە رەواییان ئەدا بـە کوشـتنی پێغەمبەران، پشتیوانیان لەوانە ئەکرد کە ئەو پێغەمبەرانەیان شەهید کردبوو، رەخنـەیان لەو کارانە نەئەگرت، خوای گەورە ئەفەرموێ:

﴿ تَرَىٰ كَثِيرًا مِّنْهُمْ يَتَوَلَّوْنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ لَبِئْسَ مَا قَدَّمَتْ لَهُمْ أَنفُسُهُمْ أَن سَخِطَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ وَفِى ٱلْعَذَابِ هُمْ خَـٰلِدُونَ ﴿٨٠﴾ وَلَوْ كَانُوا۟ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلنَّبِىِّ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مَا ٱتَّخَذُوهُمْ أَوْلِيَآءَ وَلَـٰكِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُمْ فَـٰسِقُونَ ﴿٨١﴾ ﴾ (المائدة).

زۆربەیان دەبینیت ڕازین بەخۆشەویستی و پشتیوانی ئەوانـەی کـە بـێ بـاوەڕ بـوون، سوێند بە خوا دەست پێشکەرییەکی خراپیان بۆ خۆیان ئەنجامداوە کە خوایان لە خۆیان تووڕە کردووە (بەو کارەیان)، (لە قیامەتیشدا) لەناو سزای دۆزەخدا دەبێت بـۆ هەمیشـە بمێننەوە. خۆ ئەگەر ئەوانە باوەڕیان بەخواو بەم پێغەمبەرەو ئەو قورئانە ببوایە کە بۆی دابەزیوە، ئەوە ئەوانـەیان نـەدەکرد بەخۆشەویسـت و سەرپەرشـتیاری خۆیـان، پشـتیان بەوان نەدەبەست، بەڵام زۆربەیان تاوانبارو لادەرو یـاخین و (حـەق و ڕاسـتی مەبەسـتیان نیە، بەڵکو بەردەوام دژایەتی ئاینی ئیسلام دەکەن).

ئەوەش ئاشكرایە ئەو جولەكانەی لەسەردەمی پێغەمبەرداﷺ ژیاون هەوڵی كوشتنی ئەویشیان داوە! ئەوانەی رووی گوتاریان تێكراوە بە هەمان شێوەی باوباپیرانیان بوون، چونكە بە هەڵوێستەكانی ئەوان رازی بوون.

ئەم خیتابە لە لایەن خواوە بۆ سەرزەنشتكردن و و رەخنە و عەیبداركردنیانە، چونكە یانی چی پێغەمبەرانی خوا ئەكوژن! لە كاتێكدا خوا لەو كتێبەدا كە بۆی ناردوون ئەو كارەی حەرامكردووە لەسەریان، نەك ئەوە بەڵكو فەرمانیان پێكراوە كە قسەكانیان بسەلمێنن و شوێنیان بكەون، كەچی ئەوان هیچ هەڵوێستێكیان نەبوو ئەوە نەبێت كە پەلاماریان دان و لە عینادی و لووتبەرزی خۆیان شەهیدیان كردن.

خاوەنی تەفسیری"في ظلال القران" ئەڵێ: قورئان سەرسامی دەردەبڕێ لەم هەڵوێستەیان، و لەو بێباوەڕییەیان بەو پەیامەی بۆیان دابەزیوە، كە خوا دەربارەی ئەفەرموێ: ﴿وَيَكْفُرُونَ بِمَا وَرَآءَهُۥ وَهُوَ ٱلْحَقُّ مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَهُمْ ۗ قُلْ فَلِمَ تَقْتُلُونَ أَنۢبِيَآءَ ٱللَّهِ مِن قَبْلُ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٩١﴾﴾ (البقرة) .. و باوەڕ ناهێنن بە هەموو ئەوانەی كە دوای (تەورات) هاتووە وەكو (ئینجیل و قورئان) لەكاتێكدا كە هەر ئەو قورئانە حەق و ڕاستی یەو بەڕاست دانەری (تەورات)ی ئەوانیشە.

ئەوان و راستی كوجا مەرحەبا! ئەوان هەقیان چیە بەسەر ئەوەوە كە قورئان تەورات بەراست بزانێت و بیسەلمێنێت یان نا؟! ئەوان خۆیان ئەپەرستن، عەبدایەتی نەژادپەرشتی بۆ خۆیان ئەكەن، نەك ئەمە بەڵكو ئەوان ئارەزووی خۆیان ئەپەرستن، بێگومان ئەوان پێشتر باوەڕیان نەهێناوە بەوەی كە پێغەمبەرەكانیان بۆیانی هێنابوو..خوای گەورە تەلقینی پێغەمبەرەكەی ئەكاتﷺ كە بەو راستیە رووبەڕوویان ببێتەوە، بۆ ئاشكراكردنی هەڵوێستیان و رسواكردنی بانگەشەكەیان: ﴿قُلْ فَلِمَ تَقْتُلُونَ أَنۢبِيَآءَ ٱللَّهِ مِن قَبْلُ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٩١﴾﴾ (البقرة) بۆچی پێغەمبەرانی خودا ئەكوژن

ئەگەر باوەڕتان هەیە بەوەی کە هێناویانە بۆتان؟ ئەو پێغەمبەرانە ئەوانەن کە ئەو شتانەیان بۆ هێناون کە بانگەشەی ئەوە ئەکەن ئێوە بڕواتان پێی هەیە؟نا..بەڵکو ئێوە بڕواتان نیە بەوەی موساسەلامی خوای لێبێت بۆی هێنابوون، ﴿ ۞ وَلَقَدْ جَآءَكُم مُّوسَىٰ بِٱلْبَيِّنَٰتِ ثُمَّ ٱتَّخَذْتُمُ ٱلْعِجْلَ مِنۢ بَعْدِهِۦ وَأَنتُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿٩٢﴾ ﴾ ( البقرة) سوێند بە خوا بەڕاستی موسا نیشانەی فرەو موعجیزەی بۆ هێنان، کەچی (کاتێ کەچوو بۆ نزای پەروەردگار، لە کێوی تور) ئێوە گوێرەکەکەتان پەرست، بەڕاستی ئێوە ستەمکارن.

ئەی ئایا ئەو گوێرەکە پەرستنەتان دوای ئەوەی موسا سەلامی خوای لێبێت پەیامی ئاسمانی بۆ هێنان و هەر لە ژیانی ئەودا بەڵگەی ئاشکرا نیە نیە لەسەر ئەوەی ئیمانتان پێی نەبووە؟ ئایا ئەو کارەتان یەکنەگرێتەوە لەگەڵ ئەم ئەم بانگەشەیەتان کە ئەڵێن: ئیمان ئیمانمان بەوە هەیە کە بۆ خۆمان دابەزیووە؟ ئەوە نیگای ئاسمان بوو کە گوێرەکە بپەرستن؟

ئەمە یەکەم بەڵێن نەبوو کە شکانتان، بەڵکو جارێکی تر و لەژێر گابەرەدەکەدا بەڵێنتان دا، کەچی جارێکی تریش یاخی بوون و بێگوێیتان کرد: ﴿ وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ ٱلطُّورَ خُذُوا۟ مَآ ءَاتَيْنَٰكُم بِقُوَّةٍ وَٱسْمَعُوا۟ ۖ قَالُوا۟ سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا وَأُشْرِبُوا۟ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْعِجْلَ بِكُفْرِهِمْ ۚ قُلْ بِئْسَمَا يَأْمُرُكُم بِهِۦٓ إِيمَٰنُكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٩٣﴾ ﴾ (البقرة) (یادیان بێنەرەوە ئەو سەردەمەی) کە پەیمانمان لێ وەرگرتن و کێوی گورمان بەسەردا بەرزکردنەوە و (فەرمانمان پێدان): ئەوەی پێمان بەخشیوون (لە تەورات) بە توندی بیگرن و لێی لامەدەن و گوێ بیستبن، (بەدەم) وتیان: گوێڕایەڵین، (بەڵام بەکردەوە) پێچەوانەیان کردو یاخی بوون و گوێرەکە پەرستی لە دڵ و دەروونیاندا ڕوابوو بە هۆی بێ باوەڕییانەوە، پێیان بڵێ: ئیمانەکەتان شتی ناڕەواتان پێ دەکات ئەگەر ئێوە ئیماندارن؟! (باوو باپیرانتان گوێرەکە پەرست و پێغەمبەر کوژ، ئێوەش سەرسەخت و بێ باوەڕ).

لێرەدا سیاقی ئایەتەکان دەگۆڕدرێت لە وتاردانەوە بۆ چیرۆك گێڕانەوە، قسە لەگەڵ نەوەکانی ئیسرائیلدا ئەکات و پاشان ڕووئەکاتە ئیماندارەکان و خەڵکی بەگشتی و خەبەرداریان ئەکات لەوەی ئەوان لەسەری کاریان کردووە، دوای ئەوەش تەڵقینی پێغەمبەرﷺ ئەکات کە ڕووبەڕوویان ببێتەوە بەوەی ئەو هەڵوێستانەیان ڕەزلیل بکات و بە ناشیرین ئەو جۆرە ئیمانهێنانە سەیرە پیشانی خەڵکی بدات کە بانگیان ئەکات بۆ ئەو بێباوەڕیە ڕووتە، ﴿ قُلْ بِئْسَمَا يَأْمُرُكُم بِهِۦٓ إِيمَـٰنُكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٩٣﴾ ﴾ (البقرة)، پێیان بڵێ: بەراستی ئەم ئیمانەتان شتی ناڕەواتان پێ دەکات ئەگەر ئێوە ئیماندارن؟! (باوو باپیرانتان گوێرەکە پەرست و پێغەمبەر کوژ، ئێوەش سەرسەخت و بێ باوەڕ).[129]

خاوەنی کتێبی "التحرير و التنوير" ئەڵێ: (ئەمەی کە خوا ئەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ ءَامِنُوا۟ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُوا۟ نُؤْمِنُ بِمَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا وَيَكْفُرُونَ بِمَا وَرَآءَهُۥ وَهُوَ ٱلْحَقُّ مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَهُمْ ۗ قُلْ فَلِمَ تَقْتُلُونَ أَنۢبِيَآءَ ٱللَّهِ مِن قَبْلُ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٩١﴾ ﴾ (البقرة) کاتێك پێیان دەوترێت باوەڕ بهێنن بەوەی کە لە لایەن خواوە ڕەوانەکراوە، دەڵێن: ئێمە تەنها باوەڕمان بەوە هەیە کە بۆ ئێمە ڕەوانەکراوە و باوەڕ ناهێنن بە هەموو ئەوانەی کە دوای (تەورات) هاتووە وەکو (ئینجیل و قورئان) لەکاتێکدا کە هەر ئەو قورئانە حەق و ڕاستی یەو بەڕاست دانەری (تەورات)ی ئەوانیشە، پێیان بڵێ: ئەی کەواتە بۆچی پێشتر پێغەمبەرەکانی خواتان دەکوشت ئەگەر ئێوە ئیماندارن بە تەورات؟!

ئەم ئایەتە بچڕاوە لەوەی پێش خۆی، چونکە پێشتر وەسفی نەوەکانی ئیسرائیل کردووەو ئێستا ڕەخنەیان لێئەگرێت، مەبەستیش ئەوەیە وەڵامی ئەو بانگەشەیان بداتەوە کە بەهانەی پێ ئەهێننەوە، بۆ ئەوەی دەریان بخات ئەمانە هەر باوی ناویان بووە کە دژایەتی پێغەمبەرانی خوا بکەن! ئەوەش کە ئەڵێن: (نُؤْمِنُ بِمَا أُنزِلَ عَلَيْنَا)

---

١٢٩- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص٩١.

تەنیا درۆیەکە، ئەگەر راست بوایە پێشینەکانیان ئەو پێغەمبەرانەیان نەئەکوشت کە لە نەتەوەی خۆشیان بوون، ئەوان بانگیان ئەکردن بۆ ئەوەی شوێن تەورات بکەون و کار بەو تەعلیماتانە بکەن کە تێیدا هاتووە، بەڵام ئەوان رووبەڕووی هەر شتێك ئەبنەوە کە پێچەوانەی ئارەزووەکانیان بێت، ئەمەش وەخاخ رۆشنکردنەوەی باوباپیرانیانە، چونکە ئەمانیش هەر هەمان کردەوەی ئەوان زیندووئەکەنەوە و بەراستی ئەزانن، ئەم کردارەش کە بە صیغەی موزاریع هێناویەتی(تَقْتُلُونَ) لەگەڵ ئەوەدا کە کردارە لە رابووردوودا روویداوە وەك ئەفەرموێ:( مِنْ قَبْلُ) بۆ ئەوەیە ئەو کارە قێزەونە بەردەوام لەبەر چاو بێت..

ئەوەش کە ئەفەرموێ: ﴿ ۞ وَلَقَدْ جَآءَكُم مُّوسَىٰ بِٱلْبَيِّنَـٰتِ ثُمَّ ٱتَّخَذْتُمُ ٱلْعِجْلَ مِنۢ بَعْدِهِۦ وَأَنتُمْ ظَـٰلِمُونَ ﴿٩٢﴾ ﴾ (البقرة)، عەتفی کردووەتە سەر رستەی ﴿ فَلِمَ تَقْتُلُونَ أَنۢبِيَآءَ ٱللَّهِ مِن قَبْلُ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٩١﴾ ﴾ (البقرة)، بەمەبەستی ئەوەی لە گفتوگۆ لەگەڵیاندا بگوازێتەوە بۆ زیاتر پووچکردنەوەی ئەو بانگەشەیە کە گوایە ئیمانیان بەو کتێبە تایبەتە هەیە کە دابەزیوەتە سەریان، دوای ئەوەی کە بە ئایەتی ﴿ فَلِمَ تَقْتُلُونَ أَنۢبِيَآءَ ٱللَّهِ مِن قَبْلُ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٩١﴾ ﴾ (البقرة)، بەدرۆیان ئەخاتەوە وەك روونمان کردەوە، جا باسەکە بەرزئەکاتەوە بۆ ئاستی ئەوەی کە باسی ئەوەیان ئەکات ئەوان لەبەرانبەر بانگەوازی موساشدا کە ئەوان بانگەشەی ئەوە ئەکەن تەنیا باوەڕیان بەوە هەیە کە بۆ موسا هاتووەتە خوارەوە هەر سەرپێچیکەر بوون و باوەڕیان بەوە نەبووە هاتووەتە خوارەوە بە قسەش و بە کرداریش، جا ئەگەر بانگەوازی موحەممەد ﷺ رەتبکەنەوە بە بەهانەی ئەوەی تەنیا بڕوا بەوە ئەهێنن کە بۆ خۆیان هاتووەتە خوارەوە، دەی کەواتە بۆچی دوای پێغەمبەر موسا بەکوشتن رووبەڕووی پێغەمبەرەکانیان ئەبوونەوە؟ یان بۆچی بەوشێوەیە رووبەڕووی بانگەوازی موسا

بوونەوە؟ ئەمەیە مەبەستی هێنانی ئەم ئایەتانە لەم شوێنەدا هەرچەندە هاوشێوەی ئەم ئایەتانە پێشتر باسیان هاتووە، باسکردنەوەیان لێرەدا بۆ مەبەستێکی تازەو شێوازێکی تری گفتوگۆیە.[130]

**بەکورتی:**

بانگەشەی جولەکە بەوەی تەنیا بڕوایان بەوە هەیە کە بۆ خۆیان دابەزیوە و هەر ئەوەش بەسە بۆیان و پێویستیان بە باوەڕهێنان نیە بە کتێبێکی تر بانگەشەیەکی بەتاڵەو قورئان لە چەند روویەکەوە وەڵامی ئەم بانگەشەیەی داوەتەوە:

- بانگەشەیان بەوەی کە باوەڕیان هەیە بەو کتێبەی بۆیان دابەزیوە بانگەشەیەکی درۆیە، چونکە ئەوان پێچەوانەی ئەوە هەڵسوکەوت دەکەن کە لەو کتێبانەدا هاتووە و فەرمانیان پێ ئەکات.
- بانگەشەکانیان لە حەسوودی و و ئیرەییەوە سەرچاوەی گرتووە، رقیان لە جگە لە خۆیانە، کە خوا فەزڵی خۆی ببەخشێ پێیان.
- ئەو مژدەی لە کتێبەکەیاندا هاتووە سەبارەت بە پێغەمبەرﷺ و پەیامەکەی شاردوویانەتەوە.
- قورئان کوشتنی پێغەمبەران ئیدانە ئەکات، لەگەڵ ئەوەی لە تەوراتدا قەدەغەکراوە لێیان.

---

١٣٠- التحرير و التنوير، الطاهر بن عاشور، سەرچاوەی پێشتر، مج١، ج١، ص٦٠٨،٦٠٩، بە دەستکارییەوە.

# گومانی بیست و شەش

## ئەهلی کتێب بانگەشەی ئەوە ئەکەن کە کتێبەکەیان باشترینە لەناو کتێبەکاندا، پێغەمبەرەکەشیان باشترینە لەناو پێغەمبەراندا.*[131](R)

**ناوەڕۆکی گومانەکە:**

ئەهلی کتێب بانگەشەی ئەوە ئەکەن کە کتێبەکەیان باشترینە لەناو کتێبە ئاسمانیەکاندا، پێغەمبەرەکەشیان باشترینە لەناو پێغەمبەراندا، خۆیان هەڵئەکێشن بەسەر موسڵماناندا کە پێغەمبەرەکەیان پێش پێغەمبەری ئیسلام هاتووە، کتێبەکەشیان پێش کتێبەکەی ئەوان هاتووە، بەمەش کۆتایی ئەهێنن بە موناقەشەکە و ئەڵێن بەو شێوەیە ئێمە لە ئێوە شایستەترین بە خوا!

**ڕێگەکانی پووچەڵکردنەوەی ئەم گومانە:**

١. بیانووبڕینی موسڵمانان بۆ ئەوانەیان کە دوژمنایەتی موسڵمانانیان ئەکرد لە ناویاندا.

٢. دینداری بە خۆزگەخواستن و لەخۆرازیبوون نیە،بەڵکو پێویستە لەدڵدا جێگیر ببێت و کردەوەکانیش بیسەلمێنن، گەیشتن بەو شتەی کە بانگەشەی بۆ ئەکەن تەنیا بە بانگەشە پێی ناگەن.

٣. کردەوەی چاکە بە بێ بوونی ئیمان وەرناگیرێت.

٤. هیچ دینێك باشترین نیە لەو کەسەی کە بە نێتی پاکەوە خواپەرستی ئەکات و شوێن ئایینی حەنیفی ئیبراهیم ئەکەوێت.

---

١٣١- ئەو ئایەتانەی کە باس لەم گومانە ئەکەن بریتین لە:(النساء/١٢٥،١٢٣،ال عمران/٦٨،٦٧،الزمر/٦٥).

R لە باسی(ئایا هیدایەت لە شوێنکەوتنی جوولەکەدایە؟) برگەی گومانی دووەم لەبەرگی نۆدا(بەراوردی ئایینەکان) بخوێنەرەوە.

**درێژەی بابەتەکە:**

**یەکەم: نەمانی بەهانە لەبەرانبەر موسڵماناندا.**

لەم خاڵەدا ئاییندارەکان ناکۆکن، جولەکەکان بە موسڵمانەکان ئەڵێن: ئێمە لە ئێوە باشترین، لەبەر ئەوەی ئایینەکەمان پێش ئایینەکەی ئێوە هاتووە، وە کتێبەکەشمان پێش کتێبەکەی ئێوە هاتووە، پێغەمبەرەکەشمان پێش پێغەمبەرەکەی ئێوە نێردراوە، ئێمە لەسەر ئایینی ئیبراهیمینسەلامی خوای لێبێت، ئەوەی جولەکە نەبێت ناچێتە بەهەشت، کەسیشمان بە ئاگر سزا نادرێت چەند رۆژێکی دیاریکراو نەبێت، خواش سزامان نادات چونکە ئێمە منداڵ و خۆشەویستی ئەوین، گاورەکانیش هەمان قسەیان ئەکرد، موسڵمانەکانیش ئەیانووت: کتێبەکەی ئێمە پاش کتێبەکەی ئێوە هاتووە و کتێبەکەی ئێوەی سڕیوەتەوە، پێغەمبەرەکەشمان پاش پێغەمبەرەکەی ئێوە هاتووە و ئایینەکەمان دوای ئایینەکەی ئێوە هاتووە، فەرمانتان پێ کراوە کە واز لە ئایینەکەتان بهێنن و شوێن ئایینەکەی ئێمە بکەون، ئێمە لە ئێوە باشترین،ئێمە لەسەر ئایینی ئیبراهیم و ئیسماعیلینسەلامی خوایان لێ بێت هیچ ئایینێك لەکەس وەرناگیرێت جگە لە ئیسلام، و ئەوەشی لەسەر ئایینەکەی ئێمە نەبێت ناچێتە بەهەشتەوە، لەمەوە ناکۆکی نێوان ئەهلی کتێب و موسڵمانان سەریهەڵدا، ئەهلی کتێب خۆیان بەسەر موسڵماناندا هەڵدەکێشا، لەراستیدا خوای گەورە بەهانەی موسڵمانەکانی سەرخست بەسەر ئەوانەی خۆیان دەنواند لە ئاییندارەکانی تر، چونکە قورئان سەرجەم کتێبەکانی تری سڕیوەتەوە. پێغەمبەری خواش کۆتا پێغەمبەرەﷺ و فەرمان بە ئەهلی کتێب کردووە باوەڕ بە خۆی و کتێبەکەی بهێنن و کار بە ناوەڕۆك و فەرمانەکانی بکەن.

**دووەم: دینداری بە خۆزگەخواستن نیە، بەڵکو بە ئیمان و کردەوەی چاکەیە.**

لەم باسەدا خوای گەورەجل جلالەداوەری ئەکات لە نێوان ئایینەکاندا و ئەفەرموێ:

﴿ لَّيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ۗ مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ وَلَا يَجِدْ لَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿١٢٣﴾ ﴾ (النساء)، (پاداشت و ڕێزو نرخ) نە بە ئارەزووی ئێوەیە، نە بە ئارەزووی خاوەنانی کتێبە، ئەوەی خراپەو گوناهێك بکات، ئەوە بەهۆیەوە سزا دەدرێت و هیچ کەس و هیچ هێزێکی تری دەست ناکەوێت جگە لە خوا پشتگیریی بکات و یارمەتی بدات.

واتای ئایەتەکە بەم جۆرەیە: دینداری بە خۆزگە خواستن و لەخۆباییبوون نیە،بەڵکو ئیمان ئەوەیە کە لە دڵدا جێگیر ئەبێت و کردەوەی چاك ئەیسەلمێنێت، هەر کەسێك بانگەشەی هەر شتێکی کرد تەنیا بە بانگەشە پێی ناگات، هەر کەس بڵێ من لەسەر هەقم گوێی لێناگیرێ تەنیا لەبەر ئەو قسەیە، کاتێك نەبێت لە خواوە بەهانەو بەڵگەیەکی بۆ هاتبێت، کەواتە کەس رزگاری نابێ بە ئاواتخواستنی تەنیا،ئەوەی حسێبی بۆ ئەکرێت خواپەرستی و شوێنکەوتنی شەرعی خوایە، کە لەسەر زمانی پێغەمبەرەکانی باسی کردوون، بۆیە ئەفەرموێ: ﴿ مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ ﴿١٢٣﴾ ﴾ (النساء)، ئەمەش هەر وەك ئەو ئایەتەیە کە ئەفەرموێ: ﴿ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ﴿٧﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ﴿٨﴾ ﴾ (الزلزلة)، جا ئەوەی بەقەدەر سەنگی گەردیلەیەك خێرو چاکەی ئەنجام دابێت دەیبینێتەوە.ئەوەش کە بەقەدەر سەنگی گەردیلەیەك شەڕو خراپەی هەبێت، دەیبینێتەوە. زانایان ئەڵێن: ئەم ئایەتە(لَيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ) رووی لە موسڵمانەکان کردووە، هەندێکیش ئەڵێن رووی لە موشریکەکان کردووە، لەوانەیە دووەمیان راستتر بێت، چونکە لە ئایەتەکانی پێش ئەم ئایەتەدا باسی خۆزگەخواستنی موسڵمانان نەکراوە، هەروەها خوا بەڵێنی ئەوەی داوە لە گوناهی ئیماندارەکان خۆش

ئەبێت وەك ئەفەرموێ: ﴿ وَالَّذِينَ ءَامَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَنُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَحْسَنَ الَّذِي كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿٧﴾ ﴾ (العنكبوت)، ئەوانەی کە ئیمان و باوەڕیان هێناوە و کار و کردەوە چاکەکانیان ئەنجام داوە، بەڕاستی هەڵە وگوناهەکانیان دەسڕینەوە و بەچاکتر لەوەی کە دەیانکرد پاداشتیان دەدەینەوە .

**سێیەم: بوونی ئیمان مەرجە بۆ وەرگرتنی کردەوەی چاکە.**

خوای گەورە ڕوونی کردووەتەوە کردەوە چاکەکان وەرناگیرێن بە بێ بوونی ئیمان، چونکە شیرك هەرچی کردەوەیە پووچی ئەکاتەوە، وەك ئەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ ﴿٦٥﴾ ﴾ (الزمر)، سوێند بەخوا بادڵنیابن کە وەحی و نیگا نێردراوە بۆ تۆو بۆ ئەوانەی پێش تۆش: ئەگەر هاوەڵگەر بیت و شەریك بۆ خوا بڕیار بدەیت کاروکردەوە چاکەکانیشت پووچە و دەچیتە ڕیزی خەسارەتمەند و زەرەرمەندانەوە.

ئەوەش لەبەر ئەوە بوو کە موشریکەکان خۆیان هەڵئەکێشا بە خزمەتکردنی ماڵی خواوە، گوایە ئاو و نان بە حاجیانی ماڵی خوا ئەدەن و خزمەتی کەعبە ئەکەن، جولەکە و گاورەکانیش شانازیان بەوەوە ئەکرد کە ئەمان پێش موسڵمانەکان ئایینیان بۆ هاتووە، خوای گەورەش فەرمووی: ﴿ وَمَن يَعْمَلْ مِنَ الصَّالِحَاتِ مِن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُولَٰئِكَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ وَلَا يُظْلَمُونَ نَقِيرًا ﴿١٢٤﴾ ﴾ (النساء)، ئەوەش کردەوە چاکەکان ئەنجام بدات نێر بێت یان مێ لەکاتێکدا ئیماندار بێت، جا ئەوانە دەچنە بەهەشتەوەو بەقەدەر پەردەی ناوکی خورما ستەمیان لێناکرێت.

**چوارەم: ئیسلام ئایینی راستەقینەیە.**

یەکێکی تر لە وەڵامەکانی قورئان ئەوەیە خێرترین ئایینی دیاریکردووە، ئەوتا ئەفەرموێ: ﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ وَٱتَّبَعَ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا ۗ وَٱتَّخَذَ ٱللَّهُ إِبْرَٰهِيمَ خَلِيلًا ﴿١٢٥﴾ ﴾ (النساء)، کێ هەیە ئاینی چاکترە پەسەندترو جوانتر بێت لەو کەسەی رووی کردۆتە خوا و خۆی تەسلیمی ئەوزاتە کردووەو لەکاتێکدا کارجوان و کار پەسەندەو شوێنی ئاینی ئیبراهیمی ملکەچ و فەرمانبەردار کەوتبێت، کە خوا ئیبراهیمی کردۆتە خۆشەویستی خۆی رێزداری کردووە.

هیچ کەس ئاینەکەی باشترە نیە لەو کەسەی کە نیێتی پاك و ساغە و بۆ خوداجل جلالە کارئەکات و لە کارەکانیدا شوێن ئەو شەرعە ئەکەوێت کە خوا بۆ ئیبراهیمی ناردووە کە دوورە لە شیرك، ئەو کەسانەش بریتین لە موحەممەد و شوێنکەوتەکانی تا رۆژی قیامەت، خوا ئەفەرموێ: ﴿ إِنَّ أَوْلَى ٱلنَّاسِ بِإِبْرَٰهِيمَ لَلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ وَهَٰذَا ٱلنَّبِيُّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۗ وَٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٦٨﴾ ﴾ (ال عمران)، نزیکترین کەس لە ئیبراهیمەوە: ئەو کەسانەن کە لە سەردەمی خۆیدا شوێنی کەوتبوون، هەروەها ئەم پێغەمبەرەش ﷺ و ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە (بە پێغەمبەرایەتی ئیبراهیم و موسا و عیسا و محمد و هەموو پێغەمبەران بەگشتی علیهم السلام)، بێگومان خوا یارو یاوەرو پشتگیری ئیماندارانە.[132]

**بەکورتی:**

بەدڵنیاییەوە خوای گەورە داوەری کردووە لە نێوان ئایینەکاندا، سەبارەت بەوەی کامیان لەسەر رێبازی راستن، هەمووشیانی گێڕاوەتەوە بۆ ترازوویەك و کردوویەتی بە پێوەرێك بۆ ئەو شتانەی لای خوا قەبوڵن، ئەویش ئیمان و کردەوەی چاکە، ئەو کردەوانەی بە بێ ئیمان ئەنجام بدرێن هیچ بایەخێکیان نیە لای خوا.

---

١٣٢- التحرير و التنوير، الطاهر بن عاشور، سەرچاوەی پێشتر، مج٣،ج٥،ص٢٠٨. في ظلال القران، سيد قطب، سەرچاوەی پێشتر، ج٣،ص٧٦٣.

- ئایینی راستەقینە ئیسلامە کە لەسەر رێبازی ئیبراهیم پێغەمبەرەسەلامی خوای لێبێت باشترین کردەوەش ئیحسانە، ئەویش پەرستنی خودایە وەك ئەوەی ببینی، خۆ ئەگەر تۆ ئەو نەبینی ئەو ئەو تۆ ئەبینێت.
- ئاییندارى بە خۆزگەخواستن و لە خۆباییبوون نییە، بەڵکو ئەبێت لە دڵدا جێگیر ببێت و کردەوەی چاکیش بیسەلمێنێت، وە ئەبێ پاك و ساغ بێت بۆ خودا و لەژێر ئایینی دوور لە شیرکدا بێت کە ئایینی ئیبراهیمەسەلامی خوای لێبێت



## گومانی بیست وحەوت

## بانگەشەکردن بە توانای هێنانی هاوشێوەی قورئان [133]

**ناوەکی گومانەکە:**

کۆمەلیك جولەکە هاتنە خزمەتی پێغەمبەری خوا "سەلات وسەلامی خودای لەسەربێت"و بانگەشەی ئەوەیان ئەکرد کە توانای هێنانی هاوشێوەی قورئانیان هەیە و پێیان ووت: ئێمەش بۆت دەهێنین هاوشێوەی ئەوەی بۆت هێناوین:

﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا أَوْ قَالَ أُوحِيَ إِلَيَّ وَلَمْ يُوحَ إِلَيْهِ شَيْءٌ وَمَن قَالَ سَأُنزِلُ مِثْلَ مَا أَنزَلَ اللَّهُ وَلَوْ تَرَىٰ إِذِ الظَّالِمُونَ فِي غَمَرَاتِ الْمَوْتِ وَالْمَلَائِكَةُ بَاسِطُو أَيْدِيهِمْ أَخْرِجُوا أَنفُسَكُمُ الْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ الْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ غَيْرَ الْحَقِّ وَكُنتُمْ عَنْ آيَاتِهِ تَسْتَكْبِرُونَ (٩٣) ﴾ (الانعام). واتە: کێ لەوە ستەمکارترە کە درۆ بۆ خوای گەورە هەڵدەبەستێت ، یاخود بەدرۆوە دەڵێت: منیش وەحی و نیگام بۆ هاتووە لەحاڵێکدا هیچ جۆرە وەحی و نیگایەکی بۆ نەهاتبێت ، هەروەها ئەو کەسەش کە بە چاوی گومانەوە سەیری قورئان بکات و بڵێت: منیش کتێبێکی وەك ئەوەی خوای گەورە نازڵی کردووە دادەرێژم ، جا ئەگەر ئەو ستەمکارانە ببینیت لە سەرەمەرگدا چ گیرێکیان خواردووە ، فریشتەکانیش دەستیان لی دەکەنەوە و لێیان دەدەن و بەتورەییەوە پێیان دەڵێن ئادەی گیانتان بدەن بە دەستەوە ، ( مژدەتان لی بێت ) لە مڕۆ بەدواوە لە تۆڵەی خوانەساسی و یاخی بون و ستەمتاندا سزا و ئەشکەنجە و ئازاری شەرمەزاری و ریسواکەر دەدرێن ، چونکە کاتی خۆی شتی ناحەقتان بە ناوی دینەوە بۆ خوا هەڵدەبەست ، وە لە بەرامبەر ئایەت و فەرمانەکانی خوادا لوت بەرز بوون فیزتان دەنواند ، بە بەرنامەی دوور لە زانست و زانیاری ناوزەدتتان دەکرد.

---

١٣٣ – الايتان التي وردت فيهما الشبهة : الانعام/ ٩٣، الانفال ٣١. الايات التي وردت فيها الرد على الشبهة: الإسراء/ ٨٨، الرعد/ ٣١، هود/١٣، يونس/ ٣٨.

وتراوه ئەم گفتگۆیە لەگەڵ موشریکەکانی مەککە کراوە: ﴿ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتُنَا قَالُوا۟ قَدْ سَمِعْنَا لَوْ نَشَآءُ لَقُلْنَا مِثْلَ هَـٰذَآ ۙ إِنْ هَـٰذَآ إِلَّآ أَسَـٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٣١﴾ ﴾ (الانفال) . واتە: کەچی نەفامان هەرکاتێك ئایەتەکانی ئێمەیان بەسەردادەخوێندرێتەوە دەڵێن: ئەمە داستانی سەردەمەکانی زووەو بەسەر چووە !! ( نەفامانی ئەم سەردەمەش جار جارێك ئەوە دەڵێن !! )

**رێگاکانی پوچەڵ کردنەوەی گومانەکە:**

یەکەم: بانگەشەکردن بەبێ بوونی بەڵگە دانامەزرێ.

دووەم: ئەم بانگەشەکردنەی موشریکەکان بۆ چەواشەکردنی عەرەبەکان بو بەگشتی.

سێیەم: بێباوەربوونی موشریکەکان بەرامبەر قورئان دەگەرێتەوە بۆ لوت بەرزییان.

چوارەم: قورئان موعجیزەیەکە ئینس وجین ئەگەرکۆش ببنەوە توانایان بەسەرییدا ناشکێت.

**درێژەی بابەتەکە:**

**یەکەم: بانگەشەکردن بەبێ بوونی بەڵگە دانامەزرێ.**

بانگەشەکردنی کۆمەلیك جولەکە کە توانای هێنانی هاوشێوەی قورئانیان هەیە بانگەشەیەکی بێ بنەمایە، سەرچاوەکەی دەگەرێتەوە بۆ نکۆلی کردن لە راستی و دەستەوسانیان لە بردنەوەی گرەو" بێگومان لە نێو موشریکەکانیش دا (النضربن الحارث) هەمان شتی ووت، بازەرگانێك بوو تێپەری بەلای کۆمەلیکدا کە ئینجیلیان دەخوێند، هات بۆ مەککەو بینی کە موحەمەد "سەلات وسەلامی خودای لەسەر بێت" قورئانی بۆ دابەزیوە ووتی: ﴿ قَالُوا۟ قَدْ سَمِعْنَا لَوْ نَشَآءُ لَقُلْنَا مِثْلَ هَـٰذَآ ﴿٣١﴾ ﴾ (الانفال). هەروەها دەیوت: ئەمە هۆنراوەی ئەهلی (حیرە) یەو وتیشی: ئەمە نوسراوی کتێبە

پێشوەکانە، بە هەمان شێوە (عبدالله بن سعد بن أبي سرح)یش کە وەحی بۆ پێغەمبەر" سەلات وسەلامی خوای لەسەربێت " دەنوسیەوە ووتی ئەگەر موحەمەد وەحی بۆکرابێت بێگومان منیش هاوشێوەی ئەوەم دابەزاندوە، وتراوە ئەوەی ئەم قسەی کردوە (مسیلمة الكذاب) بووە، هەروەهاوتراوە: (الاسود العنسي) و (سجاح) ژنی (مسیلمة) و هەو ئەوانەی بانگەشەی ئەوەیان کردووە کە خودا وەحی بۆ ناردوون هەمان قسەیان دووبارە کردوەتەوە،وە دەشێن ئەم ئایەتە بۆ هەموو ئەوانەی کە دژایەتی وەحی دەکەن دابەزیوە.

**دووەم:بانگەشەیەکی بەتاڵە بۆ چەواشەکردن وبەرهەڵستی کردنە لە ئاینی ئیسلام:** ئەم درۆو دەلەسەیە لە چەواشەکارییەکانی ئەهلی شیرکە، بێگومان پێغەمبەریان " سەلات وسەلامی خودای لەسەربێت" بەدرۆ تۆمەتبار دەکرد، لەوبارەیەوە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ قَدْ نَعْلَمُ إِنَّهُۥ لَيَحْزُنُكَ ٱلَّذِى يَقُولُونَ ۖ فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ وَلَـٰكِنَّ ٱلظَّـٰلِمِينَ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾ (الانعام). واتە: لە ڕاستیدا ئێمە بەتەواوی ئاگادارین لە قسە و گوفتاری نادروستی خوانەناسان کە هەمیشە غەم و پەژارە و دڵتەنگیت بۆ دروست دەکەن ، جا دڵنیابە ئەوانە وەنەبێت تەنها دژایەتی تۆ بکەن ، باوەڕیە تۆ نەکەن ، بەڵکو ئەو ستەمکارانە دژایەتی سەرجەم ئایەت و فەرمانەکانی خوا دەکەن و ئینکاری ودژایەتیەهمووی دەکەن ! !

بەلکو ئەوخەیالەیان لای عەرەبەکان بەگشتی دروست کردبوو کەگوایە موحەمەد ئەوشتانەی دروست کردوەتەوە و نوسیویەتیەوە بۆئەوەی دەرخی بکات وبیپارێزێت، هەموشیان دەیانزانی کە ئەو نەخوێندەوارەوە هیچ شتێك فێرنەبووە، لەنێو خۆیانا پرس و ڕایان کرد شتێك بلێن کە عەرەبی پێ دوور بخرێتەوە لە قورئانی پیرۆز، ئەوە قسە هەڵبەستراوەکەبوو، خودای گەورەش بە درۆی خستنەوە بەبێ ئەوەی توانای چەسپاندنی

قسەکەی خۆیانیان هەبێت، وەك دەفـەرموێ: ﴿ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۖ قُلْ فَأْتُوا۟ بِسُورَةٍ مِّثْلِهِۦ وَٱدْعُوا۟ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٣٨﴾ ﴾ (یونس). واتە: یاخود ناحەزو بڕ دینەکان لـە هەموو سەردەمێکدا دەڵێن: ئەم قورئانە محمد "سەلات و سەلامی خودای لەسـەر بێـت" خۆی هەڵی بەستووە و خۆی دایڕشتووە ، تۆیش پێیان بڵـێ: دەی خـۆ ئێـوەش بەشـەرێکن وەکـو مـن ، دەی ئێـوەش سـورەتێك لـە وێنـەی سـورەتێکی ئـەم قورئانـە دابڕێـژن و هـەر کەسیش جگە لە خوای گـەورە بۆتـان دەکرێـت بـانگی بکـەن و داوای یارمـەتی لـێ بکـەن ، ئەگەر ئێوە لەو بوختانەتاندا ڕاست دەکەن ! ! ( ئەم تەحـەدا قورئانیـە بەسورەتێك دوو جـار لـە قورئانـدا هـاتووە و تـا کۆتـایی دنیـاش بەردەوامـە ، کـافرانیش نـەیانتوانیوە و نایشتوانن جورئەت بدەن بە خۆیـان سـورەتێکی وەکـو سـورەتی ( الکـوثر ) داڕێـژن بـە مەرجێك عەرەب بەناوبانگن لە زمانەوانی و ڕەوانبێژی و وێژە و شـیعر و پەخشـان و ..... هتد ) دا. .هەروەها فـەرموێ: ﴿ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۖ قُلْ فَأْتُوا۟ بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِۦ مُفْتَرَيَٰتٍ وَٱدْعُوا۟ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٣﴾ ﴾ ( هـود). واتـە: یـاخود هەنـدێکی تریـان دەڵـێن: ئـەم قورئانـە محمـد"سـەلات و سـەلامی خـودای لەسـەر بێـت" هـەر خـۆی هەڵیبەستووە ، پێیان بڵێ: باشە دە ئێوەش دە سورەتی وێنەی ئەم قورئانـە هەڵبەسـتن ، داوای کۆمەکیش بکـەن لـە هەرکـەس کـە دەتـوانن جگـە لـە خـوای گـەورە(بـۆ ئـەوەی هاوکاریتان بکات) ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن(لەو بوختانەدا) .

ئەوە بەلگە بووو لەسەر ئەو قسـەی کـەکردیان قسـەیەکی بـێ بنـەماو بـێ کـردار بـوو ئەگەر نـا خـودای گـەورە چـەند جارێك تەحـەدای نـەدەکردن کـە سـورەتێکی هاوشـێوە بهێنن؟ بەلام هیچ ڕێگایەکیان بۆ ئەو مەبەسە نەدۆزییەوەکە دەربازیان بکات،ئەم قانەیان بۆ هەڵخەلەتاندنی خۆیان و شوێن کەوتوانیان دەکرد کە لەسەر بـیروو بـاوەڕێکی پوچـەل بوون، خودای گەورە لەسەر ڕێزو گەورەیی ئەم قورئانـە ئاگـاداری کردونەتـەوە و هـەوالی

بێداون ئەگەر ئینس وجینیش کۆبێتەوە و ڕێك بکەون کە هاوشێوەی قورئـان بهێـنن، لـەو پێناوەشدا هاوکاری یەکتربن و دەست لەناو دەست بن لە نێوان خۆیاندا هێز و توانای ئەو شتەیان نیە، چونکە ئەوە کارێکە توانا بەسەریدا ناشکێت،چون قسەی خەڵك دەچـوێنرێ بەکـەلامی خـودا (جـل جلالـە) کـە هاوتــاو هاوشـێوەی نیـە؟ ئـەم ڕووبەڕوبونــەوە بەدرۆخستنەوەیانە لەلایەن خوداوە بۆیان: ئەگەر ڕاستگۆ بن لەبانگەشەکەیاندا بەلگـەیان دەهێنا بۆ پالپشتیکردنی قسەکانیان.

والدعاوي مالم تقيموا عليها

بينات أبناؤها أدعياء

**سێیەم: نکولی کردن ولوت بەرزی موشریکەکان.**

پاش ئەوەی کە قورئان باسی وتەکەی کردن:﴿ لَوْ نَشَآءُ لَقُلْنَا مِثْلَ هَٰذَآ ﴿٣١﴾ ﴾(الأنفال). ڕێرەوی قسەکانیان دەگۆردرێت بـۆ سـەمەرەی سـەمەرەکان لـە نکولی موشـریکەکان لـە ڕووی حەق و ڕاستی کە زۆرانیان لەگەڵ دەکات و دەیانبـەزێنێ لـە کاتێکدا ئـەو خۆبـەزل زانینــە ڕێگریــان لێـدەکات لــە لــە خۆبەدەســتەوەدان پێــی و مــل کــەچ بــوون بــۆ دەستەلاتەکەی، لەگەڵ ئەوەشدا داوا دەکەن لە خودا ئەگەر ئـەوە ڕاسـتە لـە ئاسمانـەوە بەردیان بو داببارێنێ یاخود سزایەکی سـەختیان بـۆبنێرێ ئەمـە لـە بـری ئـەوەی داوا لـە خودای گەورە بکەن شوێن کەوتنی حەق و وەستان لــە ڕیـزی حـەقیان پـیچ ببەخشـێت: ﴿ وَإِذْ قَالُوا۟ ٱللَّهُمَّ إِن كَانَ هَٰذَا هُوَ ٱلْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ أَوِ ٱئْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣٢﴾ ﴾ (الأنفـال). واتـە: یـاخود دەڵـێن: توخـوا خوایـە ئەگـەر ئـەم قورئان و دینە ڕاستە و لەلایەن تۆوە هاتووە ، داواکارین لـە ئاسمانـەوە بـەرد دابارێنیتـە سەرمان و بەرد بارانمان بکەیت ، یا خود با سـزایەکڕ بـە ئـێش لەلایـەین تـۆوە یەخـەمان بگرێت !! ( لەباترِ ئەوەڕ کافر و موشریکان داوای هیدایەت بکەن ئا بـەو شـێوەیە داوای تیا چوونڕ خۆیان دەکەن !! )

ئەوە پاڕانەوەیەکی سەیرە کە وێنای حاڵەتی نکوڵی کردنێك دەکات کەلەناوچونی پێ باشترە لە ملکەچ بوون بۆ حەق، سروشتی ساغ و تەندروست کاتێك گومانی بۆ دروست دەبێت لە خودا دەپاڕێتەوە کە ڕووی ڕاستی نیشان بدات و ڕێنمونی بکات بۆ ئەو ڕاستیە،لەوەشدا هیچ سوکایەتی و ناتەواویەك نابینێ، بەڵام کاتێك بەهۆی لوت بەرزیەوە لێی دەشێوێ لوت بەرزیەکەی پڕاوپڕی لەیاخی بوون بەرەوە نەفس بەرزی دەبات بۆ ئاسایی بونەوەی تاوان لەلای، تا دەگاتە ئەو ئاستەی سزاو تیاچوونی پێ باشتر بێت لە ملکەچ بوون بۆ ڕاستی لە کاتێکدا ڕاستەکانیشی بە ڕونی بۆ مەعلوم بوو، لەم جۆرە نکوڵی کردنە موشریکەکانی مەککە ڕوبەڕوی بانگەوازی پێغەمبەر " سەلات وسەلامی خودای لەسەربێت" دەبوونەوە بەڵام لە کۆتاییدا هەر ئەو بانگەوازە سەرکەوت بەسەر ئەو نکوڵی کردن و یاخی بونەدا. [١٣٤]

**چوارەم: موعجیزەی قورئان بۆیان.**

لە وەلامەکانی قورئان بۆ ئەو بوختانە کەلامی خودایە کە دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنَّ قُرْءَانًا سُيِّرَتْ بِهِ ٱلْجِبَالُ أَوْ قُطِّعَتْ بِهِ ٱلْأَرْضُ أَوْ كُلِّمَ بِهِ ٱلْمَوْتَىٰ ۗ بَل لِّلَّهِ ٱلْأَمْرُ جَمِيعًا ۗ أَفَلَمْ يَا۟يْـَٔسِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن لَّوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَهَدَى ٱلنَّاسَ جَمِيعًا ۗ وَلَا يَزَالُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ تُصِيبُهُم بِمَا صَنَعُوا۟ قَارِعَةٌ أَوْ تَحُلُّ قَرِيبًا مِّن دَارِهِمْ حَتَّىٰ يَأْتِىَ وَعْدُ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ ﴿٣١﴾﴾ (الرعد).

واتە: خۆ ئەگەر ئەم قورئانە بەشێوەیەك بوایە کە کارکردی لەسەر کێوەکان بوایە و هەڵیبکەندنایە و بڕۆشتنایە بە ئاسماندا ، یان زەوی پێ پارچە پارچە و لەت لەت بکرایە ، یان مردووی پێ زیندو بکرایەتەوە و قسەی پێ بکردایە(خوانەناسان هەر باوەڕیان پێ نەدەکرد و ئیمانیان نەدەهێنا).شایانی باسە هەموو ئەو شتانە و هەموو کار و فەرمانێك هەر بەدەست خوای گەورەیە ، باشە ئەوە ئیمانداران نائومێد نەبوون(لە کافر و

---

١٣٤- في ظلال القران ، سید قطب، مرجع سابق، ج:٣، ص:١٥٠٥.

خوانەناسان)ئەڕ دڵنیاش نەبوون لەوەڕ کە ئەگەر خوای گەورە بیویستایە سەرجەم خەڵکی ناچار دەکرد کە ئیمان و باوەڕ بهێنن(بەڵام خوای گەورە ویستی وایە کە خەڵکی ئازاد و سەرپشك بکات لە ڕوی ئیمان و بیروباوەڕ و کاروکردەوەوە)بەڵام کافران هەر لە دنیادا هەندێ جار توشی بەڵاو ناخۆشی دەبن ، یان لە نزیکیانەوە سەرهەڵدەدەیت و دەبیتە مەترسی بۆسەریان هەتا وادە و بەڵێنی خوای گەورە دێتە دی بەشکست هێنان بەدەسەڵاتڕ خوانەناسان چونکە لە ڕاستیدا خوای گەورە وادە و پەیمانی خۆی دەباتە سەر و پێچەوانەکەی ناکات.

ئەگەر لە کێشە پێشووەکاندا کتێبێك هەبوایە شاخەکانی لە جێگای خۆی بگواستایەتەوە، یاخود زەووی لەت بکردایە، یان قسەی لەگەڵ مردوو پێ بکرایە لەگۆڕەکەیدا ئەوە قورئانەکە وەسفکراوە بەوشتانەی لە غەیری خۆی، یا خود بلێن قورئان لە پێشترە کە ئەوانە لە خۆی بگرێ لە ڕێگەی موعجیزەکانیەوە کە ئینس و جن هەمویان کۆببنەوە ناتوانن هاوشێوەی یان دە سورەتی لێ بهێنن، تەنانەت توانای هێنانی سورەتێکیشیان نیە، لەگەڵ ئەوەشدا موشریکەکان بەهۆی لووت بەرزی و لادانیانەوە باوەڕی پێ ناهێنن."[135]

**بەکورتی:**

- ئەمە بانگەشەی ئەوانەیە کە دەیانەوی تانە لە پێغەمبەر"سەلات وسەلامی خوای لەسەربێت" و فەرمودەکانی بدەن و پشێوی و نائارامی دروست بکەن، پێغەمبەر"سەلات وسەلامی خوای لەسەربێت" لە ڕوویاندا دەوەستا بە ڕوبەڕوکردنەوەیان بە قورئان، بێگومان دەستەوسان بوون لەو کارە.

---

١٣٥- المرجع السابق، ص:١٥٠٣–١٥٠٥، التحرير والتنوير، الطاهر بن عاشور، مرجع السابق، مج:٥، ج:٥، ص:٣٢٩وما بعدها.

- سەرچاوەی ئەم قسە هەڵبەستنە نکوڵی کردن و لوت بەرزییە لە قەبول کردنی راستی بە بەڵگەی ئەوەی داوایان لە خودا کرد کە ئەگەر ئەم قورئانە ڕاستە و لەلایەن خوداوەیە لەئاسمانەوە بەردیان بەسەردا ببارێنێ لەبری ئەوەی داوای هیدایەت بکەن.
- ئامانج لەم قسە هەڵبەستنە دروستکردنی پشێوی بو بۆ سەر خەڵك بەگشتی و بۆ دروستکردنی کاریگەری خراپ لەسەر ئەو دڵانەی مەیلیان بۆ قورئان هەیە.
- حەق و راستی گرەنتی هەڵوەشانەوەی ئەم قسە هەڵبەستنە دەکات لە کاتێکدا ئەوان ناتوانن هاوشێوەی ئەو بڵێن – وەك ئەوەی بانگەشەیان دەکرد بۆیە درۆکەیان ئاشکرابوو.



## گومانی بیست و هەشت

### بیانو هێنانەوە بەوەی ئەگەر قورئان باش بوایە سەرەتا بانگی بێ دەسەلات و کۆیلەو کەنیزەکەکان نەدەکرا کە باوەڕی پێ بهێنن.[136]

**ناوەڕۆکی گومانەکە:**

بێباوەڕەکان بانگەشەی ئەوەیان کرد کە قورئان ڕاست نیە، ئەگەر ئەو قورئانە بەڕاستی باش بوایە بێ دەسەلات و کۆیلەو کەنیزەك و هاوشێوەکانی ئەوان لەسەرەتاوە باوەڕیان پێ نەدەهێنا، مەبەستیان لەوە:(خباب و بلال و صهیب و عمار) بوو خوایان لێ ڕازی بێت، چونکە موشریکەکان بەلای خۆیانەوە باوەڕیان وابوو کە خاتریان هەیەو خودا گرنگیان پێ دەدات، ئیتر چۆن سەرەتا هیدایەتی ئەو بێ دەسەلاتانە دەدات بەسەر خانەدان و خاوەن پلەدا؟ کەی ئەوانە یەسانن بەیەك؟ وەك دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَوْ كَانَ خَيْرًا مَّا سَبَقُونَآ إِلَيْهِ ۚ وَإِذْ لَمْ يَهْتَدُواْ بِهِۦ فَسَيَقُولُونَ هَٰذَآ إِفْكٌ قَدِيمٌ ﴿١١﴾ ﴾ (الاحقاف). واتە: سەیرە! هێشتا کافرەکان بە ئیمانداران دەڵێن کە ئەگەر ئەم ئیسلام و ئەم قورئانە چاك بوایە ، ئەو خەڵکە (ڕەش و ڕوتە) پێش ئێمە پەیڕەوییان نەدەکرد و شوێنی نەدەکەوتن ، جا چونکە خۆیان هیدایەت و ڕێنمونی وەرناگرن و دڵیان داخراوە ، دەڵێن: ئەمە شتێکی هەڵبەستراوو ئەفسانەیەکی کۆنە ! !.

**ڕێباکانی پوچەڵ کردنەوەی گومانەکە:**

یەکەم: خودای گەورە منەتی خۆی دەخاتە سەر ئەوەی کە خۆی ویستی لەسەریەتی بۆ ئەوەی بەیەکتر تاقیان بکاتەوە.

---

١٣٦- الايتان التي وردت فيهما الشبهة (الاحقاف /١١، الانعام/٥٣). الايات التي وردت فيها الرد على الشبهة (مريم/٧٤، الانعام/٥٣، الحقاف/١١).

دووەم: کەمو کوڕی نیە بۆ بانگەواز لەوەی بێ دەسەلاتەکان باوەڕ بهێنن، بەلکو حیکمەتی ئیلاهی لەو کارەدایە.

سێیەم: ئەم گومانە قسەی زۆر لە درۆزنەکانی پێشووە.

چوارەم: سەرچاوەی ئەم قسانە لوت بەرزی و لە خۆبای بوونە.

پێنجەم: رزق و رۆزی لە دونیادا پەیوەست کراوە بە کومەلی هۆکار کە خودا خۆی تەقدیری کردوە.

شەشەم: مەرج نیە هەرکەس مال و سامانی زۆر بێت دینداریيەکەی ڕاست بێت.

**درێژەی بابەتەکە:**

یەکەم: ئەگەر موشریکەکانی قورەیش بۆخۆیان وادەبینن کە خاوەنی ڕێزو پلەو پایەو دەسەلاتن و لەلایەن خوداوە چاودێری و گرنگی زیاتریان پێ دەدرێ، لەسەر ئەو بنەمایە باوەڕیان وایە کەقورئان و ئەوەشی موحەمەد "سەلات وسەلامی خودای لەسەربێت" بانگەشەی بۆدەکات ئەگەر باش بوایە ئەو کۆیلەو بێ دەسەلاتانە پێشیان نەدەکەوتن، ئەگەر کارەکە بەو جورە بێت، ئەوا قورئان بۆیان روون دەکاتەوە کە لەو بۆچونەدا هەلەیەکی گەورەیان ئەنجام داوە و لە بیرو بۆچونەکەیاندا هەلەیەکی ئاشکرایان کردووە، خودای گەورە منەت دەخاتە سەر هەر بەندەیەك کە خۆی ویستی لەسەر بێت، وە بە ویستی خۆی ڕێنمونی بەندەکانی دەکات و بە ویستی خۆشی گومڕایان دەکات، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لِّيَقُولُوٓاْ أَهَٰٓؤُلَآءِ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنۢ بَيْنِنَآۗ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَعْلَمَ بِٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٥٣﴾ ﴾ ( الانعام). واتە:ئێمە هەمیشە ئەو خەلکە بەیەکتر تاقی دەکەینەوە ( هەندی هەژار دەکەین و هەندێك دەولەمەند ، هەندێك دەستەلاتدار و هەندێك بێ دەستەلات ، هەندێ لەش ساغ و تەندروست، هەندێك نەخۆش و کەفتەکار.... هتد ) ئەوسا دەبینیت بێ باوەڕو دنیاپەرستان ( بە چاوێ سوك دەڕوانن بۆ ئەو هەژار و ڕەش و

ڕوت و نەدارانەڕ کە ئیمان و باوەڕیان هێناوە و بەسەرسامیەوە ) دەڵێن: ئا ئەوانە خوا ڕێزداری کردوون لە نێو ئێمەدا ؟! ئەوانە عەقڵیان کولە و نازانن مەگەر هەر خواڕ گەورە خۆڕ تەواو زانا نیە بە سوپاسگوزاران ... (بۆچڕ خواڕ گەورە حساب تەنها بۆ ڕواڵەت دەکات و ناخ و دڵ و دەروون و ئیمان و باوەڕ و کارو کردەوە ڕەچاو ناکات ؟! )

**دووەم: بێ دەستەڵاتەکان بانگەواز عەیبدار ناکەن.**

کەم و کوڕی نیە بۆ بانگەوازەکەی موحەمەد "سەلات وسەلامی خودای لەسەربێت" کە بێ دەستەلاتەکانی هاوشێوەی:(خبّاب و بلال و صُهیب و عمّار وسمیة) سەرەتا هیدایەت وەربگرن، بەلکو خودای گەورە ئەوەی وەك تاقیکردنەوەی مرۆڤەکان لە نێوان خۆیاندا داناوە، خودا ئاگادارە بە سوپاسگوزارو ڕێنمونی کراو و سەرکەوتوەکانیان، ئەو ئاگادارە بەسەر گوفتارو کردارو ویژدان و حالیانداو هیدایەتیان دەدات بو سەر ڕێگەی ڕاست، ئەوە گرەنتی ئیمانە بێ هیچ مەرامێکی دونیای و مادی لەگشت ئیمانەکەیانەوە باوەڕیان هێناوە. کەواتە مایەی سەرسامی نیە بۆ گالتەپێکردنی موشریکەکان بەرامبەر خەڵکانی بێ دەستەلات لە گیاوان و ئافرەتان و کۆیلەو کەنیزەکەکان.

سێیەم: زۆر لەو گەلانەی کە پێغەمبەرەکانیان بە درۆ خستوەتەوە ئەم جۆرە گمانەیان وروژاندوە، دەیانگوت: ﴿ ۞ قَالُوٓاْ أَنُؤۡمِنُ لَكَ وَٱتَّبَعَكَ ٱلۡأَرۡذَلُونَ ١١١ ﴾، (الشعراء) واتە: ﴿ وَٱصۡنَعِ ٱلۡفُلۡكَ بِأَعۡيُنِنَا وَوَحۡيِنَا وَلَا تُخَٰطِبۡنِي فِي ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ إِنَّهُم مُّغۡرَقُونَ ٣٧ ﴾ ( هود). واتە: ئینجا دەست بکە بە دروستکردنی کەشتیەك لە ژێر چاودێری و ڕێنمونی و وەحی ئێمەدا ، کاتێکیش کە زریان و تۆفانەکە بەرپا بوو ئەوە تکا مەکە بۆ ئەوانەی کە ڕیبازی ستەمکارییان گرتۆتە بەر ، چونکە بە ڕاستی ئەوانە دەبێت بخنکێن(لە زریانەکەدا) ، چونکە ئیتر شایستەڕ ژیان و بەزەیی خواوەندڕ میهرەبان نین).

بەهەمان شێوە پێغەمبەری خودا "سەلات وسەلامی خودای لەسەربێت" خەڵکانی پلەو پایە بەکەمی شوێنی کەوتبون، بەزۆری بێ دەستەلاتەکان باوەڕیان پێ هێنا، بۆیە کاتێك (هرقل) پادشای ڕۆم پرسیاری لە (ئەبو سفیان) کرد – پێش موسوڵمان بوونی لە بارەی هەندێ بابەتەوە پێی وت: خانەدانەکان شوێنی کەوتوە یان بێ دەستەلاتەکان؟ وتی بێ دەستەلاتەکان،(هرقل) وتی ئەوانە شوێن کەوتەی راستەقینەی پێغەمبەرن.

چوارەم: لوت بەرزی و لە خۆ بایی بوون گرنگترن هۆکاری گومڕاین:

ئەم گومانە خۆی لە خۆیدا هەڵەیەکە لە هەڵەی موشریکەکان و یەکێکە لە بیانوە پوچەل و هەڵوەشاوەکانیان، سەرچاوەی ئەم هەڵەیەش لەخۆڕازیبون و لە خۆ بایی بونە، ئیتر چۆن بەلگە بەوە دێننەوە کە ئیسلام و قورئان باش نین لەبەر ئەوەی کە بێ دەستەلاتەکان دەست پێشخەریان کردووە لە وەرگرتنیدا، لەکاتێکدا ئەوان زۆر لە خوار ئاستی خۆیانەوە دەیانبینن لە پلەو پێگەدا؟ بۆیە خودای گەورە سەرچاوەی بانگەشەکەیانی ڕوون کردوەتەوە کە بێباوەری و لوت بەرزی هۆکارەکەیەتی، بۆیە دەفەرموێ{وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا}، وە دەفەرموێ: (واستكبرتم) ، وە هەروەها دەفەرموێ: ﴿إِلَيْهِ ۚ وَإِذْ لَمْ يَهْتَدُوا بِهِ فَسَيَقُولُونَ هَٰذَا إِفْكٌ قَدِيمٌ ﴿١١﴾﴾ (الاحقاف). واتە ئەگەر هیدایەتیان بە قورئان وەرنەگرت بەردەوام دەبن لەسەر بوختانە کۆنەکەیان و هیچ ئومێدێك نابێت لە دورخستنەوەیان لە گومڕایی بە تێبینی کردنی لوت بەرزی و نکولی کردن و خۆ بەگەورە زانینیان.

پێنجەم: هۆکارەکانی ڕزق دیاری کراون و پەیوەندیان نیە بە بە کوفرو ئیمانەوە:

فەرمایشتی خودای گەورە لە دوای ئەو گومانە﴿ أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَعْلَمَ بِالشَّاكِرِينَ ﴿٥٣﴾﴾ (الانعام). وەلامیکە بۆ گومانەی دوو شتی جیاوازی تێکەل کردووە لە هۆکارەکاندا، گومانی بۆ موشریکەکان دروست کردوە لەسەر پاداشتی ئیمان و ئەوەشی خودا بۆ خاوەن باوەڕی ئامادە کردووە لە نازو نیعمەت لە دوا ڕۆژدا، ئامادە کراوە بۆی لەسەر

ئامادەکردنی هۆکار لەسەر ئەو هۆکارەی حیکمەتی خودای لە سەر دانراوە، بە ڕزق و ڕۆزی لە لە دونیادا ئامادەکراوە لە سەر هۆکارە دونیاییەکانی وەك بازرگانی و دەستکەوت و میراتی و دیاری، بۆیە ڕزق و ڕۆزی لە دونیادا هۆ دروستکردنی ناویّ لەنێوان ئەو و حالەتی هۆزەکەیدا، بەلکو هۆکارەکانی حالەتە مادییەکەیە،خودا زاناترینە بە سوپاسی سوپاسگوزاران، بێگومان پاداشتی بۆ ئامادە کردوون لە بری سوپاسەکەیان وە زاناترینیشە بە ڕۆزی ڕۆزی دراوان، تێککەلکردنی ئەم ڕیّ و شوێنانە ئەگەڕێتەوە بۆ لاوازی هرزو هەڵوێستیان کە لە تێڕوانینی خراپ و تێڕانەمانیان لە ڕاستیەکان و هۆکارەکانی سەرچاوەی گرتوە.

شەشەم: زۆری مال و سامان بەلگە نیە لەسەر ڕازیبونی خودا:

خودای گەورە ئەم گومانە لە چەند جێگایەکی تردا پوچەل دەکاتەوە، وە بۆ موشریکەکانی ڕوون دەکاتەوە کە ئەو گومانە بیّ بنەمایە، واتە هەرکەس سامانی زۆربوو مەرج نیە دینەکەی ڕاست بێت، وەنەئەو کەسەش دەست و پێوەندی کەم بێت ئیتر دینەکەی بەتالە،وەك ئەوەی ئەوانە لەنێو بیّ باوەڕەکاندا هەژارییان نەدیبیّ و لە ناو ئیماندارەکانیشدا دەولەمەندیان نەبینیبیّ، زۆربەی ئەو بێباوەڕانەی لە سەدە ڕابردووەکاندا ژیاون خاوەنی باشترین شمەك و پلەو پایەو جوانترین دیمەن و خۆشترین ژیاندا بوون، خودای گەورە لەناوی بردوونو کۆتایی بە مال و سامانەکەشیان هێنا وەك دەفەرمویّ: ﴿ وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ هُمْ أَحْسَنُ أَثَاثًا وَرِءْيًا ﴿٧٤﴾ ﴾ (مريم). واتە: ئەوانە بیر ناکەنەوە کە ئێمە چەندەها دەستە و تاقم لە خەلکی نالەبار و بیّ دینمان پێش ئەمان لەناو داوە ، کەل و پەل و ناومالیان چاکتر بووە ، سیما و قیافەشیان لەمان ڕێکوپێکتر بووە(کوان؟..لە کوێن؟..بۆ دیار نین؟.

پاشان فەرموی: ﴿ قُلْ مَن كَانَ فِي الضَّلَالَةِ فَلْيَمْدُدْ لَهُ الرَّحْمَٰنُ مَدًّا ۚ حَتَّىٰ إِذَا رَأَوْا مَا يُوعَدُونَ إِمَّا الْعَذَابَ وَإِمَّا السَّاعَةَ فَسَيَعْلَمُونَ مَنْ هُوَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضْعَفُ جُندًا ﴿٧٥﴾ ﴾ ( مريم). واتە: ئەی پێغەمبەر

"سەلات و سەلامی خودای لەسەر بێت" تۆ پێیان بڵێ:ئەوەی کەلە گومڕایی و بێ دینیدا دەژێ با هەرخواری میهرەبان تەمەن درێژی بکات و ماڵ وسامانی زۆریشی پێببەخشێت (بەچی دەچێت؟!بۆ کوێی دەبات؟! هەرگیز تاسەر بەخەستی نایخوات)ڕۆژێك دێت هەڕەشەکانمان دێتەدی،یاسزای تیاچون ومالّکاولی یە لەدنیا،یان بەرپاکردنی قیامەتە،جالەئایندەدا دەزانن کێ جێگەو ڕێگەی ناخۆشەو کێ لەشکروسەربازانی لاوازە و بێ دەسەڵاتە!! ئرمە وەلامی قسەکەی پێشویانە، خودای گەورە تەلقینی پێغەمبەرەکەی "سەلات و سەلامی خودای لەسەربێت" کردوە بۆ ئاشکراکردنی گومان و حالەکانیان، وە فێری ئەوەشی کردن کە ئەوەی ئەوانی تیایە لە نازو نیعمەتی دونیا ئەوە مۆلەت پێدانیانە لەلایەن خوداوە چونکە خۆشگوزەرانی بێباوەڕان مۆلەت پێدانێکە تا کاتی لێپرسینەوە[137]

**بەکورتی:**

- کەمو کوڕی نیە بۆ بانگەواز ئەگەر بێ دەستەلاتەکان پێشتر بکەون لە باوەڕهێنان، بەلکو خودا منەتی خۆی دەخاتە سەر هەربەندەیەکی کە خۆی ویستی لەسەربێت،مەبەست لێی تاقی کردنەوەی بەندەکانە بەیەکتر و ئیمانیش گەورەترین بەخشیشی خودایە.
- سەرچاوەی ئەم بیرو بۆچونە لوت بەرزی و لەخۆبایی بونە، ئەو قسە هەڵبەستانە خۆیان بە چینێکی جیاواز دەبینن لە بەرامبەر غەیری خۆیاندا، نەك هەرئەوە بەلکو هەر لەگۆشە نیگاوە بڕیاریشیان لەسەر قورئان داوە،بڕیارێك کە هەڵەی زۆر گەورەی تێدایە.
- ئەگەر ئەوانە شانازی بە زۆری مال و سامان و دەست و پەیوەندەوە دەکەن، ئەوە مال و دەست و پەیوەند پێوەر نیە بۆ وەرگرتنی ئیمان و کردەوە، بەلکو پێوەر تەقواو کردەوەی چاکەیە.

---

١٣٧– للمزيد انظر : التحرير والتنوير، الطاهر بن عاشور، مرجع سابق،مج:٨، ج:١٦، ص: ١٥٣، بتصرف. تفسير المنار محمد رشيد رضا ، مرجع سابق، ج:٧،ص: ٤٣٣. في ظلال القران، سيد قطب، مرجع سابق، ج:٢،ص:١١٠٣،، ج:٦،ص:٣٢٥٨.



# تەوەری سێیەم

## گومانە پەیوەندی دارەکان بە یاسادانان و فەرمانەکانیەوە

**یەکەم: ئەو گومانــانەی پەیوەنــدیان بە ڕەخنەگــرتن لە یاســاکانی خودا(جــل جلالە).**



## گومانی بیست و نۆ

## بانگەشە کردن بەوەی کە فرۆشتن وەک ڕیبایە.[138]

### ناوەڕۆکی گومانەکە:

موشریکەکان ڕەخنە لە فەرمانەکانی خودا (جل جلاله) دەگرن لەو فەرمایشتەدا کە دەفەرموێ{وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلْبَيْعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰا۟ }( البقرة). وە ڕیباش حەڵاڵ دەکەن و بە جۆرێك لە جۆرەکانی فرۆشتنی دادەنێن، خودای گەورە دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ ٱلرِّبَوٰا۟ لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِى يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيْطَٰنُ مِنَ ٱلْمَسِّ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوٓا۟ إِنَّمَا ٱلْبَيْعُ مِثْلُ ٱلرِّبَوٰا۟ ۗ وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلْبَيْعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰا۟ ۚ فَمَن جَآءَهُۥ مَوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ فَٱنتَهَىٰ فَلَهُۥ مَا سَلَفَ وَأَمْرُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ ۖ وَمَنْ عَادَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٧٥﴾﴾ (البقرة). واتە: بەڵام ئەوانەی کە سوو دەخۆن ، کەلە گۆڕەکانیان دێنەدەرەوە لەکاتی زیندووبوونەوەدا دەڵێی شێتن ، هەروەها ئەو کۆمەڵگەو خەڵکانەی کە سوخۆری تیایاندا دەبێتە شتێکی ئاسایی ، خەڵکەکە وەکو شێت و سەرخۆش دێنە بەرچاو ، دەڵێی شەیتان دەستی لێ وەشاندوون ، کەس بەکەس نیە ، سۆز و بەزەیی بۆ یەکتر نیە ، هەمووی خۆپەرست و دنیا پەرستە ، ئەم حاڵەتەش بۆیە بەسەریاندا دێت ، چونکە دەڵێن مامەڵەی سوو هەروەکو کڕین وفرۆشتن حەڵاڵە ، بەمەرجێك خوای گەورە کڕین و فرۆشتنی حەڵاڵ کردووە ، بەڵام سوو خۆری لەسەر هەموو کەس حەرام کردوە ، جائەوەی پەیام و ئامۆژگاری خوای گەورەی پێگەیشت ، کۆڵیداو کۆتایی پێهێنا ، ئەوە هەرچی دەست دەکەوێتەوە بۆی حەڵاڵە و کاری لێپرسینەوەو لێپێچانەوەی بەدەست خوایە ، بەڵام ئەوەی تێهەڵچێتەوە ، ئائەوانە نیشتەجێی ناو ئاگر دۆزەخن و بۆ هەمیشە و هەتاهەتایی بەزیندوویتێیدا دەمێننەوە.

---

١٣٨- الاية التي وردت فيها الشبهة: (البقرة /٢٧٥). الاية التي وردت فيها الرد على الشبهة (البقرة/ ٢٧٥).

**ڕێباكانی پوچەڵكردنەوەی گومانەكە:**

یەكەم: لە بنچینەدا فرۆشتن جیاوازی هەیە لەگەڵ ڕیبا، فرۆشتن ئاڵوویرە لەنێوان دوشتدا، ڕیبا زیادەیەكە بەبێ بەرامبەر، بۆیە هەموو ئاڵوویرێك دروستەو خالیە لە خواردنی مالی خەڵك بە هەوانتە ئەوە فرۆشتنێكی حەڵاڵە زیادەیەكیش كە بێ بەرامبەر بێ ئەوە ستەم و مالی خەڵكە بە هەوانت، بۆیە خودای گەورە قەدەغەی كردوە.

دووەم: زیانەكانی ڕیباو خراپیەكانی ڕیبازی سوخۆرەكان هۆكارێكن بۆ قەدەغەكردنی.

سێیەم: سزای ئەوانەی مامەڵە بەڕیبازەكە دەكەن هەڵگرتنی بەرەكەتە لە مالی دونیادا، كە بەجۆرێكی لێ دێ دەلێی جنۆكە دەستی لێ وەشاندوە لەگەڵ سزای سەخت و بە ئازار لە دوا رۆژدا، ئەوەش بۆئەوەیە بە خواردنی ڕیبا شەڕی لە دژی خودا و پێغەمبەرەكەی " سەلات و سەلامی خودای لەسەر بێت" هەڵگیرساندووە.

**درێژەی بابەتەكە:**

**یەكەم فرۆشتن جیاوازە لە ڕیبا:**

موشریكەكان بەلگە بۆ گومانەكەیان دەهێننەوە كە گوایە فرۆشتن وەك ڕیبایە، مەبەستیان لەوەیە ئەو زیادەی كە بەتەواوبوونی ماوەی دیاریكراو دەچێتە سەری وەك ئەسلی نرخەكەیە لەسەرەتای گرێبەستەكەدا، چونكە عەرەب ڕیبای نەدەزانی بەوە نەبێت، لەسەر دەمی نەفامیدا ئەگەر ماوەی قەرزەكە تەواو ببوایە قەرزارەكە بە خاوەن قەرزەكەی دەوت: ناوەكەم بۆ درێژ كەرەوە منیش پارەكەت بۆ زیاد دەكەم، ئەگەر بەو شێوازەیان بكردایە پێی دەوترا: ئەمە ڕیبایەو حەڵاڵ نیە. ئەگەر ئەوەیان پێ بوترایە دەیانگوت: بۆ ئێمە وەك یەكە ئەو زیادەیە لەسەرەتای فرۆشتنەكەوە وەربگرین یاخود لە كاتی پێرانەوەی پارەكە، خودای گەورە ئەوەی لێ قەدەغە كردن و وەلامی دانەوە و

فــــەرموی: {وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلْبَيْعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْ }( البقــــرة :٢٧٥). خــــودای گـــەورە ئەوەشــــی روونکـردەوە ئەگـەر ماوەکـە تـەواو بـوو بـەلام نـەیبو بیداتـەوە بـا چـاوەڕێی بکـات تـا دەبێت[١٣٩]

{ وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلْبَيْعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْ }واتاکەی ئەوەیە خـودای گـەورە قـازانجی لـە بازرگـانی و کڕین و فرۆشتندا حەڵاڵ کردووە و ڕیبای حەرام کردووە، ئەوەش لەبەر ئـەو زیـادەی کـە دەچێتە سەر ئەو پارە ئەسلیەکە لە کاتێکدا ماوەی دیاریکراوی قەرزەکە تەواو دەبێت و قەرزارەکە نیەتی قەرزەکە بداتـەوە، خـودای گـەورە ئاگاداری کردونەتـەوە کـە ئـەو دوو زیادەیە کە یەکێکیان لە ڕێگەی فرۆشتنەوەیە ئەوی تریان لەڕێگەی دواخسـتنی پارەکـەو درێژکردنی ماوەکەوەیە وەك یەك نین، لەبەر ئەوە بڕیاری حـەرام کردنـی یـەکێك لـەو دوو زیادەیەی داوە کە ئەوەیانە لە ڕێگەی دواخستنی پارەو درێژکردنەوەی ماوەکەیـەتی، وە ئەویتریانی حەڵاڵ کردووە، ئەویش ئەو زیادەیەیە کە دەچێتە سەر ئەو دەست مایەی کـە بـە هـۆی فرۆشـتنی کاڵاکـەوە چـوتە سـەری و قازانجەکـەی هەڵدەگرێ، خـودای گـەورە ئاگاداری داوە کە: زیادەی سەر فرۆشتن وەك زیادەی ڕیبانیە،چونکە من فرۆشتنم حەڵاڵ کردوە و ڕیبام حەرام کردووە، فەرمان فەرمانی منـەو، دروسـتکراوەکانیش دروسـتکراوی منن،فەرمانڕە واییان دەکەم بەو شێوازەی کـە ویسـتم لەسـەریەتی، وە بەندایـەتیان پـێ دەکەم بەو شێوازەی کە دەمەوێت، وە بۆ هیچ کەسێکیان نیە ڕەخنـە لـە بڕیـارم بگرێـت یاخود بێ فەرمانیم بکات، بەڵکو لەسەریانە گوێرایەلیم بکەن و ملکەچی فەرمانەکانم بن.

لەوەلامی قورئانەوە هەڵەی موشریکەکانمان بـۆ دەردەکـەوێت کاتێـك ڕیبایـان حـەڵاڵ کردووە وەك فرۆشتن مامەڵەیان لەگەڵ دەکرد، ئەو وەك فرۆشتن نیە، فرۆشتن ئالووێرێکە لـەنێوان دوو شـتدا، بـەلام ئـەو ڕیبایـەی کـە دەیـانخوارد زیادەیـەك بـوو دەچـووە سـەر

١٣٩ – للمزيد انظر تفسير المنار، محمد رشيد رضا ، مرجع سابق ، ج٣:، ص: ٩٦، ج:٧ ، صص: ٤٢٣.

قەرزەکەیان لە کاتێکدا کە دوا بکەوتایە و هیچ بەرامبەرێکی نەبوو، هەر شتێکیش بەبێ بەرامبەر وەربگیرێ بەتالە، لەبەر ئەوە خودای گەورە ڕیبای حەرام کردوە، ئەگەر هاوشێوەی یەکتر بونایە حوکمەکانیان جیاواز نەدەبوو لەلای دادپەروەرێنی دادپەروەرەکان، هەموشتێك بە ئالوویرێکی دروست بکرێ و دور بێت لە خواردنی مالی خەلك بەناڕەواکە هیچ بەرامبەرێکی نەبێت ئەوە فرۆشتنێکی حەلالە، بەلکو ئەو زیادەیە حەرام کراوە کە بە بێ بەرامبەر لە خاوەن قەرز وەردەگیرێ تەنها بە هۆی دواکەوتنی قەرزەکەوەیە ئەویش ستەمە.[١٤٠]

خاوەنی ( التحرير و التنوير) باسی دەکات کە بنەمای ئەو گومان بێژانە: ﴿إِنَّمَا ٱلۡبَيۡعُ مِثۡلُ ٱلرِّبَوٰاْۗ ﴿٢٧٥﴾ ﴾ ( البقرة)، لەوەدایە کە لە بازرگانیدا زیادەیەك دەچێتە سەر سەر نرخی فرۆشراوەکان بەمەبەستی سودبۆ بازەرگانەکە لە بەرامبەر دەست خستن و هێنانی کالا بۆ کڕیارەکان لە فرۆشتنی حازردا (الحاضر)، پاشان لەپێناو چاوەڕێ کردنی وەرگرتنی نرخی کالا لە فرۆشتنی دواخەر (المؤجل) ، بە هەمان شێوە ئەگەر دە درهەمی قەرز کرد لەسەر ئەوەی کە پانزدە درهەم بۆ بگێرێتەوە ئەو درهەمە زیادەی پێ دا لە پێناوی ئەوەی ئەو پارەکەی بۆ قەرزارەە ئامادەکردووە، چونکە خاوەن قەرز هەستاوە بە ئامادەکردنی پارەو پێدانی قەرز لە بەر خاتری ئەو، پاشان لە پێناو چاوەڕێ کردنی تەواو کردنی ماوەی دیاریکراو بۆ ڕەواندنەوەی ئەم گومانە کۆمەلێك لە زانایانی موسولمان هەستاون بە دەربڕینی ڕاکانیان، هەندێکیان دەلێن: هەرکەس جلێك کە نرخەکەی دە رهەم بێت و بە بیست درهەم بیفرۆشێت، ئەوە ئو جلەی بە بیست درهەم خەملاندوە، ئەگەر هەردوو لا ڕازی بوون لەسەر ئەو خەملاندنە ئەوە بیست درهەمەکە دەبێتە نرخی جلەکە، لەم حالەتەدا خاوەن قەرزەکە دە درهەمی زیادەی لە کڕیارەکە

---

١٤٠- تفسير المنار، محمد رشيد رضا، مرجع سابق،ج:٣، ص:٩٦،٩٧، بتصرف.

وەرنەگرتوە بەبێ بەرامبەر، بەلام ئەگەر دە درهەمی بە بیست درهەم لەسەر حساب کرد ئەوە خاوەن قەرز دە درهەمی زیادەی بە بێ بەرامبەر وەرگرتوە، ناشگوترێ: ئەم زیادەیە لەبری مۆلەت پێدانە، مۆلەت پێدانیش پارەیەك یاخود شتێك نیە کە دیاری بکرێت تا بخرێتە بری ئەو دە درهەمە زیادەیە، سەرچاوەی ئەم راجیایە تەنها دەستەواژەیەکی وەهمیە، وەهەنێکیان ئاماژە بە ڕاجیاییەکی تر دەکەن لەکاتی خستنە ڕووی حیکمەتی حەرام کردنی ڕیبا، حاسڵەکەی ئەوەیە ئەو کەسەی شتێکی دەدرهەمی بە پانزدە درهەم دەفرۆشێت سودی بە کڕیارەکە گەیاندوە بەرامبەر ئەو کاڵای کە کڕیویەتی، ئیتر یان بە خودی کاڵاکە سودی پێ گەیاندوە یاخود بە بازرگانی کردن بەکاڵاکەوە، ئەو زیادەیە لە پێناو ئەو سودەدایە، ئەمەش نیازمەندو پێویست بە هەندێ قازانج دەکات، بەلام ئەوەی درهەمێکی بەزیادە بەخشیوە لەبری قەرزەکە قەرزارەکە تەنها بە قەدەر دە درهەم سودی بینیوە، ناکرێ بوترێ: ئەو مۆلەت پێدانەی کە پێی دراوە بازرگانی پێوە دەکرێت و قازانجی لێ وەردەگیرێت، چونکە ئەو سود وەرگرتنەکە مۆلەت پێدانەکەیە و شتێکی وەهمیە (خەیالیە) هیچی لێ وەرناگیرێ، بەلام وەرگرتنی زیادەکە کارێکە هاتوەتە جێ بەوەرگرتنی، ئەم ڕاجیاییە گونجاوترە لە ڕاجیای یەکەم، بەلام پەسەند نیە، سود وەرگرتنی قەرزارەکە لە جێ بەجێ کردنی پێداویستیەکانیەتی، ئەوەش هەروەك سود وەرگرتنی کڕیارە لە کاڵاکەی، بەلام هەستان بە بازرگانی کردن بەپارەی قەرز یان بەکاڵایەك کە کراوەتەوە ئەوە شتێکی دەگمەنە.

(ابن عاشور ) لە قسەکانی بەردەوام دەبێت، لە جیاوازی کردن لەنێوان فرۆشتن و ڕیبا سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی گومان دەبرێت ڕەچاوی جیاوازی نێوان دۆخی قەرزارو خاوەن قەرز بکرێت، قەرزکردنەکە بۆ جێ بەجێ کردنی پێویستس قەرزارەکە بوە بۆ مەسرەف کردنی خۆی و ماڵ و منداڵەکەی، چونکە قەرز کردن بەلایانەوە جێگەی

نیگەرانی و خەم خەفەتە، پێغەمبەریش " سەلات وسەلامی خودای لەسەر بێت" پەنای گرتوە بە خودا لێی، دۆخی بازرگانی دۆخی چاکەو مرۆڤایەتی نواندنە.

بە هەمان شێوە جیاوازی دۆخی خاوەن قەرز و فرۆشیار ، لە دۆخێکدا ماڵەکەی بەخشیوە بە خاوەن پێداویستیەکان بۆئەوەی سودمەندبن لەوەی کە دەیدەنە ڕیبا ئەمەش تەنگانەکەیان زیاتر دەکات چونکە ئەوەی قەرزی کردوە گومان دەکریت پێویستی بەو پارە هەیە، ئایا نابینی هیچ پارەیەکی بەدەستەوە نەماوە، حالی فرۆشیاری کەل وپەلی بازرگانی بریتیە لە هەوڵ و ماندوبوون لە پێناو بەدەست هێنانی ئەو کەلوپەلەی کەپارەدار پێویستی پێی بوو وە داوایان کرد لە بەرامبەر پێدانی ئەو پارەیەی کە پێیانە، بەم پێیە بازرگانی مامەڵەیەکە لەنێوان دوو هەبودا (کەل وپەل و پارە) بۆیە دەبینین کە هەردوو لایان ئەوە دەبەخشن کە پێویستی نیەو لە بەرامبەر ئەوە وەردەگریَ کە پێویستیەتی.

بۆیە پالنەری قەرزوەرگر هەژارییە لەکاتێکدا پالنەری کڕیار لێ زیادبوونە هەر بۆیە سود حەرام کراوە چونکە قۆستنەوەی پێویستی نەبونی هەژارەکانە لە بەرامبەردا فرۆشتن حەڵاڵ کراوە، چونکە هاوکاریکردنی خاوەن پێویستیە بەم قەرز پێدانە کە جۆرێکە لە چاکەو دڵدانەوە، وە ئەرکی سەرشانی چاکەکەرە وەك (واجب) یان (مندوب) لە هەردوو حالەکەشدا دروست نیە بۆ قەرز پێدەر لە بەرامبەر ئەو چاکەیەدا کریَ وەربگرێت.

بەلام ئەو کەسەی داوای قەرز دەکات بۆ ئەوەی بازرگانی پێوە بکات یان بازرگانیەکەی فراوان بکات ئەوە لەبەر نەبونی نیە بۆیە چاکە کاران لەسەریان نیە چاکەی لە گەڵدا بکەنبۆیە ئەرکی پارە داران نیە قەرزی پیَ بدەن ئەگەر ئەو کارەشی لەگەڵ کرد ئەوە بە چاکەیەکی زیادە هەژمار دەکرێت.

مەبەست ئەوەیە ئەو گومانەی کە گشتیان پـێ بەسـتوە لـە قسـەکەیاندا ﴿إِنَّمَا ٱلْبَيْعُ مِثْلُ ٱلرِّبَوٰاْ ﴿٢٧٥﴾﴾ ( البقرة)، ئەوەیە کەفرۆشتن سـودو قـازانجی هەیـە هـەروەك چۆن ڕیبـا سـودو قـازانجی هەیـە، ئـەوە گومـانێکی لاوازە ئـالو وێـرە بازرگانیـەکان ئەگـەرو قـازانج وزیانیان هەیە و لێهاتوی و هەوڵدانی کەسەکەو بارودۆخی ژیانی ڕۆژانە ئەمانەن کـە بڕیـار لەسـەر قـازانج و زەرەر دەدەن، بـەلام ئـالوویرە ڕیبەوییـەکان لـە هـەموو حالەتێکـدا قازانجەکەی دیارکراوە،ئەم جیاوازی سەرەکی و هۆکاری حەڵاڵ کردن و حەرام کردنە.

هەموو کردارێك کـە گـرەنتی قـازانجی تیابێـت لـە هـەموو حالەتێکـدا ئـەوە کردارێکـی ڕیبەویە و حەرامە بە هۆی گرەنتی پێدانی قازانج و دیاریکردنی، هـیچ بوارێـك بـۆ دەسـتی دەستی پـێ کردن و پێچ پیاهێنانێك نیـە لـەم بـوارەدا، ﴿وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلْبَيْعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْ ﴿٢٧٥﴾﴾ (البقرة)، بەلەناوبردنی ئەم ڕەگەزە لە فرۆشتندا هۆکاری تریش زۆرە کە وادەکات کـردارە بازرگانیەکان لە بنچینەدا سودیان بۆ ژیانی مرۆڤایـەتی هـەبێت و کردارەکـانی ڕیبـاش لـە بنچینەدا زیانیان بۆ ژیانی مرۆڤایەتی هەبێت.[١٤١]

لەبەر ئەوە قورئان گـرنگترین بنچـینەی سـامانی نەتـەوەی دارشـتوە لـەم ئایەتانـەدا، پاش ئەوەی بـە گـەورەترینی ئـەو بنچـینانە دەسـتی پـێ کـرد کـە دامەزرانـدنی سـامانی نەتەوەیە، ئـەوەش مایـەی ڕاوەسـتاوی کاروبـاری ئومەتـە، ئـەوەی لـە دەولەمەنـدەکان زیـادە بەشـێوازێکی دادگەروەرانـە وەردەگیرێـت و پێویسـتە بـدرێت بـە خـەڵك، واتـە لەدەولەمەندەکان وەردەگیرێت و دەدرێـت بـە هـەژارەکان، ئـیتر ئەگـەر لەشێوەی قـەرز دابێت وەك زەکات یاخود بەخشینی پـارە بێتلـە شـێوەی خێـرو سـەدەقەدا، قورئـان زۆر داکۆکی لەم کارەکردووە و هانیداونلـە ڕێگـەی پاداشـتەوە، ئاگاداریشـی کردونەتـەوە لـە گرتنـەوەی، ئەمـە پەنـدی تێدایـە بـۆ کەسـێك پەنـد وەربگرێت،باسـەکە دەگازێتـەوە بـۆ

---

١٤١- في ظلال القران، سيد قطب، مرجع سابق، ج:١، ص:٣٢٧.

پوچەڵ کردنەوەی وەسیلەیەك کە هۆکاری دەست بەسەراگرتنی دەولەمەندەکانە بۆ مالی هەژارەکان ئەویش مامەڵەکردنە بە ڕیبا کە پێغەمەرمبەر" سەلات و سەلامی خودای لەسەر بێت " بەڕیبای جاهیلی ناوزەدی کردووە بەوەی قەرزارەکان پارەیەکی زیادە بدات بە خاوەن قەرزەکە بەپێی قەرزەکە لە پێناو چاوەڕوانکردنیدا، ئەگەر ماوە دیاریکراوەکە کۆتایی هات و قەرزەکەی نەدایەوە پارەکەی دەچێتە سەری، دەلێن: یان قەرزەکە بدەرەوە یان ڕیبا بخەرە سەری، زاناکان دەلێن ئەوە لەسەردەمی نەفامیدا باو بووە.

ئاشکرایە ئەوان ڕیباین لە قەرزارەکە وەرگرتوە لەو کاتەوە کە قەرزەکەی کردوە وهەر کاتێك داوای درێژ کردنەوەی کردبێت ڕیبای تری چووەتە سەر، لەوانەشە هەندێکیان چاوگۆشیان کردبێت لەوە، (عباس بن عبدالمطلب) ناوبانگی هەبوە لەسەردەمی جاهیلیدا بە ڕیبا خۆری، لە وتاری (حجة الوداع) داهاتوە ڕیبای سەردەمی جاهیلی کۆتایی هات، وەیەکەم ڕیبا کۆتایی پێ دەهێنرێت ڕیباکەی، (عباس بن عبدالمطلب).

زاناکان لە زاراوەی شەرعیدا سێ جۆر ڕیبایان باس کردووە کە ئەمانەن:

یەکەم: ڕیبای جاهیلی: ئەوە زیادەیەکە دەچێتە سەر قەرزەکە لە بری دواکەوتنی.

دووەم: ڕیبای فەزل: ئەوە زیادەیەکە دەچێتە سەر یەکێك لەو دوو شتەی کە ئالوگۆری پێکراوە لە فرۆشتنی جۆرێك لە کالا. لە فەرمودەی (أبي سعد الخدري) هاتوە کە دەلێت: پێغەمبەر" سەلات و سەلامی خودای لەسەر بێت " فەرموی : (ئالتون بە ئالتون، زیو بە زیو، گەنم بەگەنم، جۆ بەجۆ، خورما بە خورما،خوێ بە خوێ،، وەك یەك بن، دەست بەدەست هەرکەس زیادی کردو زیادەی خستە سەر ئەوە ڕیبای ئەنجام داوە، بەخشەرو وەرگر لە داواکەیاندا یەکسانن).[١٤٢]

١٤٢- صحيح، أخرجه أحمد في مسنده، وصححه الالباني في صحيح الجامع (٥٠٨٩).

ئیمامی مالك جۆری چوارەمی زیادکردوە: ئەویش یەکێکە لە شێوازەکانی حیلـە کـردن بە ڕیبا، لە ژێر ناوی فرۆشتن بە قەرز بۆماوەیەکی دیاریکراو، بەلگەی مالیك بۆ ئەم جۆرە فەرمودەکەی (العالیة) یە.

(ابن العربی) یەکێکە لەو زانایانەی کە دەلێن وشەی ڕیبا هـەموو مامەڵەیـەکی خـراپ و نادروسـت دەگرێتـەوە پشـتی بەسـتوە بـە فەرمودەکـەی خـاتوو (عائشـة) کەباسـی حەرامکردنی بازرگانی بە عارەقەوە دەکات.

سەبارەت بە حەرام کردنی ڕیبا پێغەمبـەر" سـەلات و سـەلامی خـودای لەسـەر بێـت" دەفـەرموێت:( لعـن الله الرّبـا اکلـە و مؤکلـە وشـاهدیە) واتـە: خـودا نـەفرەتی لـە ڕیبـاو بخۆرەکەی و بریکارەکەی و شاهیدەکەی کردوە. ئـەو فەرمایشـتەی خـودای گـەورە کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلۡبَيۡعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْۚ ﴿٢٧٥﴾ ﴾ (البقـرة)، وەلامێکـە بـۆ ئـەوان و بـۆ موسوڵمانان، ئەوە خۆ بە دوور گرتنە لە موجادەلە کردن لەگـەڵیان چـونکە سـودی نیـە، ئـەوان کـە ئـەو قسـەیان کـردووە لـە بێبـاوەری و دوو ڕوییانەوەیـەو لەوانـەش نـین کـە حوکمەکانی ئیسلام بیانگرێتەوە، ئەوە بۆ باوەر پێهێنانی موسوڵمانانە لە بەرامبـەر ئـەو گومانـەی کـە بێباوەڕەکـان وروژاندویانـە کـە گومـانێکی بـیٚ بنەمایـە،خوای زانـا ڕێگـەی بەمـەداوە و ئـەوی تـری حـەرام کـردووە ئـەوەش لەبـەر حیکمـەتێك و جیاوازییـەکی ڕەچاوکراوە ئەگەر کەسانی ورد بین لێی وردببنەوە جیاوازی نێوان فرۆشتن و ڕیبایـان بـۆ دەردەکەوێ، ئەم وەلامەی قورئان هەڵمالینی ئەو گومانانـە نیـە، چـونکە خـودای گـەورە ئـەو کارەی بـۆ زانـایانی ئـەهلی ئیمـان بـە جـیٚ هێشـتوە، لـەگەڵ ئـەوەشدا نـاوبردنی حەرامکردنی ڕیبا پاش هاندانی مال بەخشین ئاماژەیەکە بۆ هەڵمالینی ئەو گومانانە.[١٤٣]

---

١٤٣- التحریر والتنویر، الطاهر بن عاشور، مرجع سابق، مج :٣،ج:٣،ص:٨٤.

**دووەم: هۆکارەکانی حەرامکردنی ڕیبا.**

ترسناکی هیچ کارێکی سەردەمی جاهیلی کە ئیسلام هەوڵی بۆ پوچەڵ کردنەوەی داوە نەگەشتوەتە نەگەشتوەتە ئەندازەی ترسناکی ڕیبا، وە ئەو هەڕەشانەشی تا ئێستە لە قورئان دا هاتووە ژ لە دەستەواژە ژ لە مانادا نەگەشتوەتە ئاستی ئەو هەڕەشانەی سەبارەت بە ڕیبا کراوە لەم ئایەتانەو غەیری ئەم ئەمانەش کە لە چەند جێگایەکی تردا ئاماژەی پێ کراوە، ڕیبا لەسەردەمی نەفامیدا زیان و خرابەی زۆری هەبوو، بەلام ڕووە ناشرینە چاوچنۆکەکانی لەگەڵ ڕوکارە مرومۆچەکەی سەرجەمیان ڕوون و ئاشکرا بوون لە کۆمەلگای جاهیلیدا هەروەك چۆن لە سەردەمی ئێستەدا ڕووی لەسەر هەڵمالراوە، بە هەمان شێوەی دەرکەوتنی زیپکەو پەڵە لەو ڕوخسارە ناشرین ونابوتەدا لە کومەلگا پێشکەوتوەکەی خۆماندا بەدی دەکرێت ، ئەمە هێرشێکی ترسناکی ئاشکرایە لەم ئایەتانەدا بەرامبەر بەو ڕیبازە چەپەڵە، ئەمڕۆ حیکمەتەکانی دەردەکەوێت لە سایەی ڕۆژگارێکی دڵتەزێنی ژیانی مرۆڤایەتی، ڕونتر لەوەی کە لە سەردەمی جاهیلیدا بەدی دەکرا،ئەو کەسەی دەیەوێت لە حیکمەتی خوداو گەورەیی ئەم دینە حالی بێت تێدەگات لە کاملی ئەم گرۆگرامەو وردبینی ئەم ڕیبازە، لەم ڕۆژپارەدا ئەم شتانە زیاتر هەستیان پێ دەکرێتبە بە بەراورد لەگەڵ ئەو کەسانەی کە لەسەرەتاوە ڕوبەڕووی ئەم دەقانە بونەتەوە.

ڕوداوەکانی ژیانی لە بەردەم دایە کە سەرجەم قسەکان بە ڕاست دەپێرێت بە ڕاست گێڕانێکی زیندوو و ڕاستەوخو، مرۆڤایەتیە گومراکەش کە ڕیبا دەخوات و دەرخواردی خەڵکی دەدات جۆرەها دەردو بەلای لە ناوبەر دەبارێت بەسەریدا لە ئەنجامی ئەو ڕیبازە ڕیبەویەی کە ڕەنگ دانەوەی هەبوە لەسەر دین و ڕەوشت و ئابوریەکەی هەر بە ڕاستی ڕوبەڕوی جەنپێك بووە ئەوە لە لایەن خوداوە کە سزاو تۆلەی بەسەردا دەبارێنێت ... بەتاك و بە کۆمەل، نەتەوە و گەڵان کەبەداخەوە نە بە ئاگادێنەوە نە پەند وەردەگرن!

لەوانەی ڕابردوو دا سورەتی (البقرة) بنەماکانی بەخشینی خستە ڕوو، باسی یاسایەك لـە یاسـاکانی کۆمەڵایـەتی و ئـابوری دەکـات کـە خـودای گـەورە دەیـەوێت کۆمەلگـەی موسوڵمانی لەسەر دابمەزرێت، و حەزدەکات مرۆڤایەتی چێژ لەو ڕەحمەتە وەربگرێـت لـە بەرامبەر ڕێبازەکـەی تـردا کەلەسـەر بنچینەی ڕێبایـەکی سـتەمکاری داپلۆسـێنەر بنیـات نراوە.

ئەو دوانە دوو ڕێبازن بەرامبەر یەکتر: ڕێبازی ئیسلامی، و ڕێبازی ڕیبەوی! ئەوان لـە بۆچوندا یەك ناگرنەوە و لە بنچینەشدا کۆك نـین وەلـە دەرەئـەنجامیش دا ڕێـك ناکـەون، هەریـەکێکیان کۆمەلـە بۆچـونێکی هەیـە بـۆ ژیـان و ئامانجـەکان و مەبەسـتەکان کـە بەتەواوەتی دژ بەوی ترە و بە کۆمـەلێك دەسـتکەوت کۆتـایی پـێ دێـت کـە زۆر جیـاوازە لەوی تر.

ئیسـلام بینـای ڕێبـازی ئـابوری و ڕێبـازی هـەموو ژیـان دەکـات لـە سـەر بۆچـونێکی دیاریکراو کە وێنای حەق وڕاستی بکات لە بونەوەردان بینای دەکات لەسەر ئەو بنەمایەی کە خودا (جل جلاله) بەدیهێنـەری بونـەوەر و وزەی مرۆڤـە... ئـەو بـونی بەخشـیوە بـە هەموو بونەوەرێك.

خـودای گـەورە خـاوەنی هـەموو ئەوانەیـە کـە کەهـەن لەگـەڵ ئـەوەی هـەخۆی بەدیهێنەریانە، ڕەگەزی ئینسانەکانی کردوەتە جێ نشین لە سەر زەوییدا، وە توانای پـێ بەخشیوە لە ڕێگەی ئەو ڕزق و ڕۆزی و وزەو توانایە لەسەر مـەرج و بـەڵێنی خـۆی، ئـەم مولکە فراوانەی بە پشێوی بۆ بەجێ نەهێشتوە هەچیەك و هەرچـۆنێ بـوێ تیـا ئـەنجامی بدات، بەلکو لە شوێنی خۆی کردویەتی بە حێنشین لە چوارچێوەی سنورێکی دیـاریکراو، بەمەرجێك کردویەتی بە جێ نشین کە هەستی بە حێنشینایەتی کردن بـە پێـی پرۆگرامـی خودا و بە پێی شەریعەتەکەی، هەرچیەك لەسەردەستی ڕوویدات لە گرێبەست و ڕەفتار و مامەڵەو ئەخلاق و عیبادەت کە یەك بگرێتەوە لـە گـەڵ بەرنامـەی خـودا ئـەوە دروسـت و

کارپێکراوە، وە هەر کارێك بکات پێچەوانەی مەرجەکانی شەریعەتی خودا بێت ئەوە بەتاڵە و کاری پێ ناکرێت، خۆ ئەگەر بە زۆرو کەمتەرخەمی ئەو کارەی کرد ئەوە ستەم و سنور بەزاندنە و خودا ڕێگەی پێ نادات و ئیماندارانیش ڕێگەی پێ نادەن، دەستەلاتدارێتی لە زەوییدا بەهەمان شێوەی بونەوەر تەنها بۆ خودایە، خەڵکیش – دەستەلاتدارو بێ دەستەلاتیان بەردەوامی بە دەستەلاتیان دەدەن لە ڕێگەی جێ بەجێ کردنی شەریعەتی خوداو پرۆگرامەکەیەوە، بە گشتی بۆیان نیە لێی دەربازبن، چونکە ئەوان وەکالەت و جێنشینایەتیان پێ دراوە لەسەر زەوییدا بە مەرج و بەڵێن، ئەوان بەدیهێنەرو خاوەنی ئەو شتانە نین کە لە ژێر دەستیاندایە، لە نێوان برگەکانی ئەو بەڵێنەدا پێویستە هاوبەرپرسیارێتی هەبێت لە نێوان ئیماندارانەدا بەرامبەر بەخودا، پێویستە هەندێکیان گشتگیر بن بۆئەوانی تر و سودمەند بن لەو ڕزقەی کە خودا پێ بەخشیون لەسەر بنەمای ئەوهاوبەرپرسیارێتیە،نەك لەسەر یاسایەکی هەرەمەکی وەك ئەوەی کە(مارکسیزم) دەیڵێت، بەڵکو لەسەر بنەمای خاوەنداریێتی تاك بەشێوازێکی دیاریکراو.

هەر کەس خودا دەرووی لێ کردەوە و سامانی پێ بەخشی زیادەکەی دەداتە کەم دەست و هەژار، ئەمە لەگەڵ تەکلیف خستنە سەرهەموان بۆ کارکردن هەرکەس و بە پێی توانا و ئامادەگی خۆی، و لە کاتێکدا کە خودا بۆی ئاسان بکات،نابێت کەسێك کە خاوەن توانایە ببێتە بارگرانی بەسەر براکەی یاخود کۆمەڵگا، و زەکاتیشی فەرز کردوە لە مال و سامانێکی دیاریکراودا، بەخشینیشی بە پێی ئارەزوومەندییە بە بێ دیاریکردن، وەبەمەرجی گرتوە لەسەریان کەپابەندبن بە ناوەند گیری و دەست پێوەگرتنەوە، هەروەها خۆیان بەدووربگرن لە دەست بلاوی و زیادەڕەوی لەو ڕزقەی کە خودا پێی بەخشیون، لەکاتی چێژ وەرگرتن لەشتە چاکە حەڵاڵ کراوەکان، وەپاشان پێویستیان بە کاربەرەکانیان هەردەمێنێت لە مال و شتە حەڵاڵ کراوەکان بە دیاری کراوی و لەسنوری

ناوەندگیریدا، و ئەو زیادەیەی کە لە ڕێگەی زەکاتەوە دەبەخشرێت بەردەوام دەبێت لە گەڵ بەخشین بە شێوازی سەدەقە، وە بە شێوازێکی تایبەتی موسوڵمان گابەند کراوە بە وەبەرهێنان و زیادکردنی سەرمایەکەی.

وە بەمەرج گیراوە لەسەریان لەکاتی وەبەرهێناندا گابەند بن بە کۆمەڵێ وەسیلەی شەرعیەوە کە زیان بە خەڵکی تر نەگەیەنن، وە لە گرتنە بەری ڕێکارەکاندا نابێت گەك خستن و و ڕێگری کردنی تێدابێت لە نێوان مرۆڤەکاندا وە پێویستە ئەو پارەو سامانە بە فراوانترین شێواز دەستاو دەست بکات:

﴿ مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡقُرَىٰ فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ كَيۡ لَا يَكُونَ دُولَةَۢ بَيۡنَ ٱلۡأَغۡنِيَآءِ مِنكُمۡۚ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمۡ عَنۡهُ فَٱنتَهُواْۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴿٧﴾ ﴾ (الحشر).

واتە: ئێوە بەزۆری ئەو دەستکەوتانە بدەن بە کۆچبەرانی هەژارو نەدار ، ئەوانەی لە ماڵو حاڵی خۆیان دەربەدەرکران، سامانو دارو نەداریان دەستی بەسەرداگیرا ، ئەوانە کۆچیان کردو دەستبەرداری هەموو شتێکی خۆیان بوون بە ئومێدی بەدەستهێنانی فەزڵو بەخشندەییو ڕەزامەندی خوای گەورە ، ئەوانە هەردەم لە خەمی سەرخستنی ئاینی خواو پێغەمبەرەکەیدا بوون، لەڕاستیدا هەر ئەوانە ڕاستگۆو ڕاستانن.

بەهەمان شێوە دەستپاکی و نیازپاکی لەسەر پێویست کردوون لە کردەوەدا، لەگەڵ پاك و بێگەردی لە هۆکارو ئامانجدا، وە لە گەشە پێدانی ساماندا کۆمەڵێك کۆت و بەندی لەسەر پێویست کردوون کە توانای دەربازبونیان نەبێت لێی، ئەمەش بۆئەوەیە ویژدان و کەسایەتی هیچ کەس و کۆمەڵێك ئازار نەدرێت سەرجەم ئەمانەی لەسەر بنەمای ئەو بۆچونە بنیات ناوە کە وێنای حەقیقەتی بوون دەکات لەم بونەوەرەدا، وەلەسەر بنەمای بەلێی جێ نشینایەتی کردن فەرمان ڕەوای سەرجەم هەڵس وکەوتی مرۆڤی جێنشین دەکات لەم مولکا گان و بەرینەدا.

ڕیبا کردارێکه هەرلەسەرەتاوە بەریەك کەوتنی هەیە لەگەڵ بنەمای بۆچونە ئیمانیەکە بـە شـێوەیەکی گشـتی، ڕیبازێکـە بۆچـونێکی تـر پـەیرەو دەکـات، بۆچـونێك هـیچ ئاوڕدانەوەیەکی تیانیە بۆخودا، لەگەڵ ئەوەشدا ڕەچاوی هیچ بنەمایەکی ئەخلاقی ناکـات کە خـودای گـەورە دەیـەوێت ژیـانی مرۆڤـەکانی لەسـەر بنیـاد بنرێـت، ئـەو لەسـەرەتاوە لەسەر بنەمایەك بنیادنراوە کە هـیچ پەیوەندیـەکی بـە ئـیرادەی خـوداو ژیـانی خەڵکـەوە نـەبێت، مـرۆڤ هەرلەسـەرەتاوە فـەرمانڕەوای ئـەم زەوییـە بـووە، ئـەو پابەنـد نـەکراوە بەبەرنامەی خوداوە هەروەها زۆری لیّ نەکراوە شوێن فەرمانەکانی خودا بکەوێت!

لە ڕیبازی ڕیبەویدا تاك سەربەستە لە گرتنە بەری ڕێگاکانی دەست کـەوتنی سـامان و گەشـەپێدانی، هـەروەك چـۆن ئـازادە لـە چـێژوەرگرتن لێـی، لـەم کارانـەدا هـیچ جـۆرە پابەندبونێکی نیە بە مەرج و بەلێنەکانی خوداوە، بەهـەمان شـێوە خـۆی نەبەسـتوەتەوە بە بەرژەوەندی کەسانی ترەوە، پاشان گرنگ نیە بەلایانەوە لە پێناو زیادکردنی داهات و پاشەکەوتی خۆی بە ملوێنان خەڵك زەرەرمەندبن، هەندیّ جار یاسا دەستکردەکان هەوڵ دەدەن سنورێك بۆ ئازادییەکان دابنێن بۆ نمونە لە دیاریکردنی ڕێژەی قازانج و ڕێگری لیّ دەکەن لە گرتنە بەری جۆرەکانی دەسـت بـڕین و سـاختەکاری وەك فێـل و قۆرخکـاری و دزی و دەست بەسەراگرتن و تالانکاری.

بەلام ئەم دەستێوەردانە دەگرێتەوە بۆئەوەی تا کە چ ئەندازەیـەك خـەڵك پابەنـد بـن پێوەی، وە هەواو ئارەزویان بەرەو کوێیان دەبات، ئەمە بنەمایـەکی چەسپاوی پێویسـن کراو نیە بە دەستەلاتێکی ئیلاهی! بەهەمان شێوە لەسەر بنەمای بۆچـونی هەڵـەو خـراپ بنیات نراوە، ئەویش ئەوەیە ئامانجێك لە ئامانجـەکانی هـەبونی مرۆڤایـەتی گەیشـتنە بـە سامان — بە هـەر ڕێگایـەك بێـت و چـێژ وەرگرتنـە لێـی بـەو شـێوازەی خـۆی ئـارەزوی دەکات!

پاشـان هەڵپـەی کوکردنـەوەی سـامان و هەڵپـەی چـێژ وەرگـرتن دەدات لێـی،وە لـەو ڕێگایەدا پێشێلی سەرجەم بنەماو بەرژەوەندی خەڵکانی تر دەکات! لە کۆتاییدا ڕیبازێـك دێتە ئاراوە مرۆڤایەتی لە ناودەبات و بەدبەختی دەکات لە ژیاندا، ژیانی تـاك و کۆمـەل و گـەلّ و ولات، ئەمـەش لـە بـەر بەرژەوەنـدی کۆمـەلێك لـە ڕیبـا خۆرەکـان، وە لـە ڕووی ئەخلاقی و دەروونیەوە وێرانیان دەکات، هەڵە ڕوو دەدات لە دەستاو دەستکردنی سامان و گەشەکردنی ئابوری مرۆی ، گەشە کردنێکی هێواش تا کۆتـایی پـێ دێـت – وەك چۆن لەم سەردەمەدا کۆتایی پێ هاتوە – تـا دەگاتـە ئـەو ئاسـتەی دەسـتەلاتی ڕاسـتەقینە و توانای مرۆیی دەکەوێتە دەست خراپترین و پیسترین خەلقی خودا، دەستەو کۆمەلێك کـە خاوەنی هیچ بەلێن و پەیمانێك نین.

ئەوانە ئەوانەن کە قەرز دەدەنە تاکەکان هەروەك چۆن قەرز دەدەنە ولاتـان و گـەلان – لـە نـاوخۆی خۆیـان و لـە دەرەوەی ولاتـی خۆشـیان هەرچـی داهـات و قازانجـە کـە بەرهەمی ماندوو بونی خەڵکە دەگەرێتەوە بەردەستی ئەوان، جگە لە ڕەنج و تێکۆشان و عارەقی نێوچاوان خوێنی خەڵك کە لە شێوەی قازانجی ڕیبا دەسـتیان دەکـەوێت بـە بـێ ئەوەی هیچ ڕەنجێکی خۆیانی تیابێت! !ئەوانە تەنها خاوەنی سامان نین بـەلکو خـاوەنی دەستەلاتیشن.

لە کاتێکدا ئەوان هیچ بنەمایـەکی ئـەخلاقی و تێروانینێکـی ئاینیـان نیـە، بـەلکو هـەر گالتەشیان دێت بـە بنـەما وئـایین و ئـەخلاق، ئـیتر بەلایانـەوە حالـەتیێکی ئاسـاییە ئـەو جـەماوەرە زۆرەی کەلـە بەردەسـتیان دایـە بـە کـاری بهێـنن لـە دروسـتکردنی بیرۆکـەو بـارودۆخ و پرۆژەکانیـان بـۆ بەگەڕخسـتنی زیـاتر، وەسـتان نیـە لـە ڕێگـا چاوچـنۆك و ئامانجەکانیاندا... نزیکتریت هۆکار تێك شاندنی ئەخلاقی مرۆڤایەتی و فـرێ دانیـەتی بـۆ ناو زەلکاوی بۆگـەنی هـەواو ئـارەزوو ڕابـواردن کـە زۆربـەی خـەڵك دوا فلسـی خـۆی لـەو پێناوەدا دادەنێت، بەجۆریك ئەو گارانە دەڕژێتە داو و تۆڕێك کە پێشتر بۆی نراوەتـەوە!

ئەمە جگە لە دەستگرتن بەسەر رێڕەوی ئابوری جیهانی بە پیسی بەرژوەندیە سنوردارەکانی خۆیان.

ئەگەر چی ببێتە هۆی تەنگەژە باوو بەردەوامەکان لە جیهانی ئابوریداو ئاراستەکردنی سەرجەم بەرهەمە پیشەسازی و ئابووریەکان ولادانی لە بەرژەوەندی کۆمەلگەی مرۆڤایەتیەوە بۆ بەرژەوەندی ئەو سەرمایەدارە سو خۆرانەی کە سەرەداوی سامانی جیهانیان لەبەردەستدایە !

ئەو کارەساتەی کە لەم سەردەمەدا رویداوە — لەسەردەمی نەفامیشدا بەم شێوازە ناشریتەی ئێستا نەبووە ئەویش ئەوەیە سو خۆرەکانی سەردەمی رابردوو لە شێوەی تاك و خەزێنەی دارایی بچوك کاریان کردوو، ئێستا لە شێوەی دامەزراوەی دارایی — توانیویانە بەر دەستەلاتە ترسناك و فراوانەی لە بەردەستیاندایە بچێتە نێو دەزپاکانی دەستەلات لە ناوخۆ و دەرەوە، وە بەوەشی لە ژێر دەستیان دایە لە هۆکارەکانی راگەیاندن لەسەر زەوییدا لەوانەش رۆژنامەو کتێب و زانکۆکان و مامۆستاکانی زانکۆو وێستگەکانی ناردن و یانەی سینەماو ئەوانیتر... توانیویانە لە نێو جەماوەردا عەقلیەتێکی گشتی دروست بکەن کە ئەو سو خۆرانە لەسەر ئێسك و گۆشتی ئەوان بژین، عارەقی نێوچاوان و خوێنیان بمژن لە سایەی دەستەلاتی سو خۆریدا، ئەم عەقلیەتە گشتی ملکەچە بۆ سەرجەم فەرمانە ژەهراوییەکانیان، کە گوایە ریبازێکی سروشتی و گەسەندە و بنەمایەکی راست و دروستە کە هیچ بنەمایەکی تر نیە بۆ گەشەی ئابوور، و لە سایەی بەرەکەت و چاکەی ئەم ریبازەدا ئەم پێشکەوتنە ژیارییەی رۆژ ئاوا بەدی هاتووە.

ئەوانەی کە دەیانەوێت ئەم ریبازە پوچەڵ بکەنەوە کۆمەڵێك خەڵکی خەیالاوین — کرداری نین ئەوان لە تێروانینەکانیاندا تەنها گشت بە تێروانینی ئەخلاقی و نمونەی دەبەستن کە هیچ رەسیدێکی نیە لە راستیدا، کە ئەویش زامنی تێکدانی ریبازی ئابوورییە

به گشتی ئەگەر ڕێگابدرێت بە دەست تێوەردانی! بۆ ئەوەی ئەوکەسانەی ڕەخنە لە ڕیبازی ڕیبەوی دەگرن لەم ڕووەوە ڕووبەڕوی گاڵتە جاڕی ببنەوە لەلایەن کەسانێکەوە کە لەڕاستیدا خۆیان قوربانیکی کەفتەکاری هەمان ڕیبازن! قوربانیانێك کێشەیان هاوشێوەی ئابووری جیهانیە، کە کۆمەڵگەی سوخۆری جیهانی دەبیەن بە ڕێوە بو ئەوەی بە ڕێرەوێکی ناتەندروست وناناسییدا ببیەن و ڕوبەڕوویی هەڵبەزو دابەزێکی ڕێکخراوەیی بکەنەوە بە جۆریك نایانەوێت سودی بۆ کۆی مرۆڤایەتی تیابێت، تا ئەو کاتەی یەکللا دەبێتەوە بۆ دەستەیەکی کەم لە گورگە برسیەکان.

ڕیبازی ڕیبەوی لە ڕووی ئابوریەکی پوختەوە ڕیبازێکی کەم و کورتەو لە خراپیدا گەشتوەتە ڕادەیەك کە کۆمەڵێك لە پسپۆڕانی ئابووری ڕۆژئاوای لە خودی خۆیان ڕەخنەی لێ بگرن، لەگەڵ ئەوەی کەلە سایەی ئەودا پێگەیشتون، و عەقل و ڕۆشنبیریان بەو ژەهرە ڤیرتاوکراوەکە چەتەکانی دارای بڵاوی دەکەنەوەلە سەرجەم لقەکانی ڕۆشنبیری و تێڕوانین و ئەخلاق.

یەکێك لەو پسپۆڕانەی کە دەست پێشخەر بووە لە عەیبدارکردنی ئەو ڕیبازە لە ڕووی ئابورییەوە (دکتور شاخت) ی ئەلمانی کە بەڕێوەبەری بانکی (الرایخ الالماني) بووە. ئەوەی ئاماژەی پێکرد لە لێدوانێکدا لە دیمەشق ساڵی ١٩٥٢ وتی: بە کردارێکی بیرکاریانەی ناکۆتا ڕوون دەبێتەوە کە هەچی سامانە لە سەرزەوییدا دەگەڕێتەوە لای ژمارەیەکی کەم لە سودخۆرەکان ئەوەش لەو ڕووەوە کە خاوەن قەرزی سوخۆر هەمیشە لە هەموو کردارێکدا قازانج دەکات، لە کاتێکدا کە قەرزار ئەگەری قازانج و زیانی هەیە . وەپاشان سەرجەم سامانەکە لە کۆتاییدا هەردەبێت – بەژماردنی بیرکاری یگەڕێتەوە بۆئەو کەسەی کە بەردەوام قازانج دەکات !

ئەم بیردۆزەیە لەوەدایە بێتە دی و سەربگرێت بە تەواوەتی، بەدڵنیایی ئێستا زۆربەی سامانی زەوی چەند هەزار کەسێك خاوەنداریتی ڕاستەقینەی دەکات! بەلام سەرجەم

خاوەن زەووی و زارەکان و خاوەن کارگەکان ئەوانەی قەرز وەردەگرن لە بانکەکان ، کرێکارەکان و ئەوانی تریش،ئەوانە تەنها بەکرێ گیراون و کار بۆ بەرژەوەندی خاوەن سامانەکان دەکەن، وە بەری رەنجی ماندوو بونیان ئەو چەند هەزار کەسە دەیچننەوە !

ئەمە تەنها ستەمێك نیە کە لە ریباوە سەرچاوەی گرتبێت، بەلکو بنیات نانی ریبازی ئابووری لەسەر بنەمای ریبا پەیوەندی نێوان خاوەن سامان و ئەوانەی لە بازرگانی وو پیشەسازیدا کاردەکەن بەردەوام لە پەیوەندیەکی تورەو رقاوی و لە حالەتی قومارکردندان.

چونکە سوخۆر بەردەوام هەوڵ دەدات زۆرتریت قازانج بەدەست بهێنێت پاشان دەست بەسەر پارەکە دا دەگرێت تا خواستی بازرگانی و پیشەسازی لەسەری بەرز دەبێتەوە و رێژەی قازانج بەرز دەبێتەوە چونکە ئەو دەستکەوتەی کەدەیانەوێت لێیان دەست ناکەوێت و پاشەکەوتیان بۆنامێنێتەوە لەو کاتەدا قەبارەی قەبارەی پارەی بەکارهاتوو کەم دەبێتەوە لەو بوارانەی کە بە ملوێنەها خەڵك پێوەی سەرقالن، بۆیە کارگەکان رێژەی بەرهەمیان تەسك دەکەنەوە و مرێکارەکان گەکیان دەکەوێت و توانا لەسەر کرین کەم دەبێتەوە کاتێك کارەکە دەگاتە ئەم رادەیە، سوخۆرەکان بۆیان دەردەکەوێت کە خواست لەسەر پارەکەم دەبێتەوە یاخود دەوەستێت ، بەناچاری دەگەرێتەوە بۆ دابەزاندنی رێژەی قازانج . دیسانەو بازرگانەکان و خاوەن کارگەکان دەست دەکەنەوە بە راکێشانی قەرز و سوری ژیان دەگەرێتەوە باری هەرزانی، بەو شێوازە بەردەوام قەیرانە ئابوورییە جیهانیەکان سەرهەڵدەدەن و بەردەوام مرۆڤیش هاوشێوەی مالات تیایدا دەسورێتەوە !

پاشان سەرجەم بەکار هێنەرەکان باجێکی ناراستەو خۆ دەدەنە سوخۆرەکان، چونکە بازرگان و خاوەن کارگەکان قازانجی ئەو پارانەی کە قەرزیان کردووە بە ریبا نایدەنەوە لەسەر حیسابی خۆیان بەلکو لەسەر گیرفانی بەکارهێنەرەکان ئەو قازانجە

دەدەنەوە،لەبەر ئەوەی ئەوان ئەو قازانجە دەخەنە سەر نرخی کاڵاکان و پاشـان دابـەش دەبێتەوە بەسەر خەڵکیدا و بۆئەوەی لە کۆتاییدا بچێتەوە گیرفانی سوخۆرەکان.

بەلام ئەو قەرزانەی کـە حکومەتـەکان دەیکـەن بـۆ چاکسـازی و پرۆژەکـانی ئـاوەدان کردنەوە دەبێت هاوولاتیەکان ئەو قازانجە بدەنەوە بە دەزگا ڕیبەوییەکان ، چـونکە ئـەم حکومەتانـە ناچـار دەبـن نرخـی زەریبـەکان بەرزبکەنـەوە لـە پێنـاو بـژاردنی قـەرزو قازانجەکەی، لە کۆتاییدا هەموو تاکێك بەشدار لـە پێدانی سـەرانە بـەو سـوخۆرانە. زۆر بەکەمی کارەکە لەم سنورە دا دەوەستێت بەلکو کارەکە بە داگیرکاری کۆتـایی پـێ دێـت پاشان هەڵگیرسانی شەڕ بە هۆی داگیرکارییەوە !

ئێمە نامانەوێت لێرەدا بـاس لەسـەرجەم کـەم و کوڕییـەکانی ڕیبـازی ڕیبـەوی بکـەین چونکە پێویستی بە توێژینەوەیەکی سەربەخۆ هەیە ، بەم ئەندازە کۆتـایی پـێ دەهێـنین بۆ هۆشیار کردنەوەی ئەوانەی کە دەیانەوێت ببنە موسوڵمان کەکۆمەلێك بنـەمای ڕاسـتی هەن کە هۆکارن بۆ ڕەتکردنەوەی ڕیبازی ڕیبەوی لەلایەن ئیسلامەوە:

ڕاستی یەکەم: کەپێویستە لە ناخیاندا بچەسپێت ئیسلام لە گەڵ بەڕێوەچونی ڕیبـازی ڕیبەویدا نیە لە هـیچ جێگایـەك، جگـە لەمـە هەرشتێك بوترێت لەلایـەن ئەوانـەی ئـەهلی فـەتوان لـە پیـاوانی ئـاینی درۆو فێلکردنـە، بنـەمای تێـڕوانینی ئیسـلامی – ئەوەیـە کـە ڕونمـانکردەوە بەریەککـەوتنی ڕاسـتەوخۆی هەیـە لەگـەڵ ڕیبـازی ڕیبـەوی دا، لەگـەڵ دەرئەنجامە کردارییەکانی لە ژیانی خەڵك و تێڕوانین ئەخلاقیاندا .

ڕاستی دووەم : ڕیبازی ڕیبەوی بەلایە لەسەر مرۆڤایەتی – نەك تەنها لە باوەڕو ئەلاق و تێڕوانینیان بۆ ژیان بـەلکو بەلاشـە بـۆ نـاوەڕۆکی ژیانـە ئـابووری و کرداریەکـەی، ئـەو ڕیبازە خراپترین ڕیبازە کە بەختەوەری لە ژیانی مرۆڤایەتیدا تێك دەشکێنێت، و گەشـەی هاوسـەنگی مرۆڤایـەتی ڕادەوەسـتێنێت، سـەرەڕای ڕوکەشـی دەرەوەی سـاختەکە بەشێوازێك خۆی نمایش دەکات وەك ئەوەی هاوکار بێت بۆ گەشەی ئابوری جیهان !

ڕاستی سێیەم: لە ئیسلامدا ڕێبازی ئەخلاقی و ڕێبازی کردارییە بە تەواوەتی پێکەوە گرێ دراون و مرۆڤ لە سەرجەم ڕەفتارەکانیدا پەیوەستە بە پەیمان و مەرجی جێنشینایەتی و ئەو لەسەرجەم ئەو چالاکیانەی کەلە ژیانیدا پێی هەڵدەستێت لەژێر تاقیکردنەوەو ئەزموندا، وە لە دوا ڕۆژدا پاداشت دەدرێتەوە لەسەری، لێرەدا ڕێبازێکی ئەخلاقی ڕووت نیە بە تەنها، هەروەها ڕێبازێکی کرداری ڕووت نیە بەتەنها، بەڵکو ئەو دووانە پێکەوە چالاکی مرۆڤ ڕادەگرن، هەردوکیشیان پەرەستشن ئەگەر چاکەی کرد پاداشت دەدرێتەوە، ئەگەر خراپەشی کرد سزا دەدرێت، ئابووری ئیسلامی سەرکەوتو بە بێ ئەخلاق ڕاناوەستێت، ئەخلاقیش دەستکەوتێك نیە کە بتوانرێت دەستەبەرداری لێبکرێت پاشان ژیانی کرداری خەڵك سەرکەوتوبێت.

ڕاستی چوارەم: مامەڵەی ڕیبەوی بەبێ لە دەستدانی ویژدان و ڕەوشت و هەستی تاك بەرامبەر براکەی لە کۆمەڵدا نایەتەدی واتە دەبێت ئەو بەو بەها ڕەوشتیانە لە دەست بدات ،هەردەبێت ژیانی مرۆڤایەتی و یەکگرتویی لە ناو ببات بە بلاوکردنەوەی هەستی شەڕەنپێزی و تەماح و تەڵەکەبازی و قومار بازی بە شێوەیەکی گشتی، بەلام لەسەردەمی ئێستادا بە پالنەری یەکەم دادەنرێت بۆ ئاڕاستەکردنی و دەست مایە بۆ نزمترین ئاست لە ڕێپاکانی وەبەرهەمهێناندا بۆ ئەوەوەی خاوەن قەرز بتوانێت دەستکەوتێکی زامنی دەست بکەوێت.

بەمەش قازانجە ڕیبەویەکەی دەست ددەکەوێت و کەمێك بۆ قەرزارەکە بە جێ دەهێلێت پاشان ئەو پێوەری ڕاستەوخۆیە بۆ وەبەرهێنانی سامان لە ڕۆژنامەو فلیمە ڕیسواکان و مەلهاو شوێنی سەماو کۆیلە سگی پێستەکانی تر و ئەو ڕێگایانەی کە ئەخلاقی مرۆڤایەتی تێك دەشکێنن... سامانی قەرزکراو لە ڕێگەی ڕیباوە لە خەمی ئەوەدانیە بەسودترینی پرۆژەکان بنیاد بنێت بەلکو خەمی لەوەدایە کە زۆرترین قازانج بەدەست بهێنێت. تەنانەت ئەگەر قازانجەکە لە قیزەونترین و ناشرینترین کاردا بەدەست

کـەوتبێت... ئەمـەش ڕۆژانـە دەبینرێـت لەسـەر ڕووی زەوی هۆکارەکەشـی مامەڵـەی ڕیبەویە.

ڕاسـتی پێنجـەم: ئیسـلام ڕیبـازێکی موتەکامیلـە، کاتێـك مامەڵـەی ڕیبـەوی قەدەغـە دەکـات ڕیبازەکـانی خـۆی لەسـەر بنـەمای دەسـت بـەرداربوون لـە ڕیبـا بنیـات دەنێـت، سەرجەم ڕووەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی بـە جۆرێـك ڕێـك ەخـات کـە پێویسـتی بـەو جـۆرە مامەڵە نەبێت، بـە بـێ زیـان گەیانـدن بـە گەشـەی ئـابووری و کۆمەڵایـەتی و مرۆڤایـەتی بەدوای یەکتردا.

ڕاستی شەشەم: ئیسلام کاتێك بۆی دەلوێت ژیان بەو شێوازە ڕێك بخـات کـە لـە گـەڵ تێڕوانین و پرۆپرامی تایبەتی خۆیدا بگونجێت ؟ ئیتر لەکاتی هەڵوەشاندنەوەی مامەڵەی ڕیبەویدا پێویستی بە هەڵوەشاندنەوەی دام و دەزگا پەیوەندی دارەکان نیـە لـە گەشـەی ئابوورییەکی هاوچەرخ و ئاسایی و تەندروست بەڕێوە دەبەن.

بەلام تەنها لە پیسی کەم وکوڕییـەکانی ڕیبـا پاکیـان دەکاتـەوە، پاشـان لێدەگـەرێت لەسەر کۆمەلێك بنەمای تەندروست کاربکات، لـە پێشـەنگی ئـەو دام و دەزگایانـەش کـە پێویستی بە گۆڕانکاری هەیە" بانکەکان و کۆمگانیاکان و دام و دەزگا ئابووریەکان.

ڕاستی حەوتەم: ئەمە گرنگترینیانـە ئـەوەی کـە دەیـەوێت موسـوڵمان بێـت پێویسـتە باوەڕی وابێـت کـە ئەسـتەمە لـە ڕووی بـیرو بـاوەڕەوە خـودای گـەورە کـارێکی قەدەغـە کردبێت وا بیر بکاتەوە ژیانی مرۆڤایەتی بنیات نانرێت و پێش ناکەوێت بەو شتە نەبێت ! بەهەمان شێوە ئەستەمە کارێکی قیزەون هەبێت و لـە هـەمان کاتـدا بنیـات نـانی ژیـان و پێشکەوتنی بەسترابێت بەو کارە قیزەونەوە... خـودا خـۆی خـۆی ئـەم ژیانـەی دروسـت کردوەوە مرۆڤی کردوەتە جێنشین، ئەو فەرمان بـە گەشـە پێـدان و بـەرەو پـێش چـونی دەدات، کەواتە موستەحیلە تێڕوانینی موسـوڵمان وابێـت کـە ئـەو شـتە خـودا قەدەغـەی کردووە ژیانی مرۆڤایەتی و بەرەو پێش چونی بە بێ ئـەو شـتە نابێـت، یـا خـود شـتێکی قیزەون ببێتە هۆکاری بنیات نانی ژیان و پێشکەوتنی.

ئەمە تێڕوانینێکی هەڵەو بۆچونێکی خراپ و بانگەشەیەکی بەدی لە خشتەبەرە کە چەندەها نەوەیان لەسەر بلاو کردنەوەی ئەو بۆچونە ڕاهێناوە بەوەی: کە ڕیبازی ڕیبەوی ڕیبازێکی ئاساییە، ئەم بۆچون هەڵخەلەتێنەرەیان لە رۆشنبیری گشتی و سەرچاوەی مەعریفەتی مرۆڤەکان لە رۆژهەلات و رۆژئاوای زەویدا بلاو کردوەتەوە، لەسەر ئەو بنەمایە ژیانی هاوچەرخیان بنیات ناوە ئەویش بە هەولی سوخۆرەکان و خەزێنەی دارایی، قورسە بیر لە بنەمایەکی ت بکرێتەوە بۆ بنیات نانی، ئەو قورسیەش سەرەتا لە بێ باوەرییەوە سەرچاوە دەگرێت، بەهەمان شێوە لەلاوازی بیرکردنەوە و دەستەوسانی لە خۆرزگارکردن لەو وەهمەی کە سوخۆرەکان هەولی بلاوکردنەوەو چەسگاندنیان داوە و ئەو توانای کە هەیانە بۆ رێنمایی کردنی خەلك، لە ڕێگەی ئەو دەستەلاتەی کە هەیانە لە ناو حکومەتەکانی جیهاندا، و لە ڕێگەی ئازارەکانی ڕاگەیاندنی گشتی و تایبەت.

ڕاستی هەشتەم: مەحالە ئەمرۆ و سبەینێ ئابوریی جیهانی بنیات بنرێت لەسەر بنەمایەك جگە لە بنەمای ڕیبەوی... جگە لە ئەفسانە هیچی تر نیە، یاخود رۆیەکی گەورەیە، چونکە ئەو دەزگایانەی کە بەرژەوند خوازەکان بە کاری دەهێنن لە پێناو مانەوی خۆیان دەزگا گەلێکی گەورەن ! بەلام ئەگەر نیازەکان پاك و دروست بن، یاخود مرۆڤایەتی بریار بدات – یاخود ئومەتی ئیسلامی بریار بدات کە جارێکیتر ئازای خۆی بپێرێتەوە لە دەست چەتە سو خۆرەکانی جیهان، و هەلی چاکەو بەختەوەری و بەرەکەت بدات بۆخۆی لەگەڵ خاوێن کردنەوەی ڕەفتاری بەندەکان و پاك کردنەوەی کۆمەلگا لەو تێڕوانینە ناتەدروستانە، بێگومان بوار کراوەیە بۆ بنیات نانی ڕیبازێکی تری تێرو تەسەل، کە خودای گەورە ئەوە دەخوازێت بۆ مرۆڤایەتی، کە پێشتر کاری پێ کراوەو ژیان گەشەی سەندووە لە سایەیدا، وە بەردەوام شایستەی گەشە کردنە لە ژێر چاودێری و سەرگەرەشتی ئەودا ئەگەر خەلك ژیرو هۆشیاربێت.[١٤٤]

---

١٤٤ –في ظلال القران، سيد قطب، مرجع سابق،ج:١، ص: ٣٦٣/٣١٨.

**سێیەم: سزای ئەوانەی مامەڵە بە ڕیباوە دەکەن لە دنیاو دواڕۆژدا.**

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ ٱلرِّبَوٰاْ لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِى يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيْطَٰنُ مِنَ ٱلْمَسِّ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْبَيْعُ مِثْلُ ٱلرِّبَوٰاْ ۗ وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلْبَيْعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْ ۚ فَمَن جَآءَهُۥ مَوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ فَٱنتَهَىٰ فَلَهُۥ مَا سَلَفَ وَأَمْرُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ ۖ وَمَنْ عَادَ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٧٥﴾ ﴾ ( البقرة).

واتە: بەڵام ئەوانەی کە سوو دەخۆن ، کەلە گۆڕەکانیان دێنەدەرەوە لەکاتی زیندووبوونەوەدا دەڵێی شێتن ، هەروەها ئەو کۆمەڵگەو خەڵکانەی کە سوخۆری تیایاندا دەبێتە شتێکی ئاسایی، خەڵکەکە وەکو شێت و سەرخۆش دێنە بەرچاو، دەڵێی شەیتان دەستی لێ وەشاندوون، کەس بەکەس نیە، سۆز و بەزەیی بۆ یەکتر نیە، هەمووی خۆپەرست و دنیا پەرستە، ئەم حاڵەتەش بۆیە بەسەریاندا دێت ، چونکە دەڵێن مامەڵەی سوو هەروەکو کڕین وفرۆشتن حەڵاڵە ، بەمەرجێك خوای گەورە کڕین و فرۆشتنی حەڵاڵ کردووە ، بەڵام سوو خۆری لەسەر هەموو کەس حەرام کردوە ، جائەوەی پەیام و ئامۆژگاری خوای گەورەی پێگەیشت ، کۆڵیداو کۆتایی پێهێنا ، ئەوە هەرچی دەست دەکەوێتەوە بۆی حەڵاڵە و کاری لێپرسینەوەو لێپێچانەوەی بەدەست خوایە ، بەڵام ئەوەی تێهەڵچێتەوە ، ئائەوانە نیشتەجێی ناو ئاگری دۆزەخن و بۆ هەمیشە و هەتاهەتایی بەزیندوویی تێیدا دەمێننەوە.

لێرەدا مەبەست لەوانەی کە ڕیبا دەخۆن ئەوانەن کەلەسەر دینی نەفامی بوون، چونکە ئەم هەڕەشەو ناشرین کردنە گونجاو نیە بۆ ئەوان نەبێت،چونکە ئەوە لە ڕیزبەندی حالەتە بێباوەڕیەکەیاندایەو لێشی لانادەن تا بەردەوام بن لەسەر

---

"في مقاصد الشرعة لتقديم الربا" طالع: الوجه الخاص ، من الشبهة الحادية والعشرين من الجزء الثالث عشر (العبادات و المعاملات الاقتصادية).

بێباوەڕییەکەیا، بەلام موسولمانەکان پێشتر گرۆگرامی قەدەغەکردنی ڕیبایان بۆدانراوە، وەك لەم ئایەتەدا ئاماژەی پێ کراوە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَأۡكُلُواْ ٱلرِّبَوٰٓاْ أَضۡعَٰفٗا مُّضَٰعَفَةٗۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ١٣٠ ﴾ (ال عمران).واتە: خوای گەورە ئەم چەند ئایەتەی تێکەڵ غەزای ئوحود کردووە ، تا بیسەلمێنێت کە ئەم ئاینە هەموو چەمکەکانی ژیانی تاك و کۆمەڵ دەگرێتەوە بۆیە ڕوو بە ئیمانداران دەفەرمووێت ): ئەی ئەو کەسانەی کە ئیمان و باوەڕتان هێناوە ، هەوڵبدەن کە دووره پەرێز بن لە سوو خۆری و بە چەند قات و چەند بەرامبەر مەیخۆن ( ئەمەش قۆناغێك بوو لە قۆناغەکانی حەرام کرنی بە یەکجاریی ) بۆ ئەو مەبەستەش لە خوا بترسن و پارێزکار بن بۆ ئەوەی سەر فراز بن. ئەوان ئەلێن { إِنَّمَا الْبَيْعُ مِثْلُ الرِّبَا }( البقرة /٢٧٥). خودای گەورە ئەم هەڕەشەی لە کۆی جۆرەکانی سزای تایبەت بە بێ باوەڕەکان داناوە لەبەر گەڵ هاوێشتنی بێبارییان بۆ مەسەلەی ڕیبا.

پێش هەموو ئەمانەش قورئان نکولی کردوە لە ئەهلی جاهلیەت لە پێدانی ڕیبا، ئەوە یەکەم شتێکە کە قورئان سەرزەنشتی لەسەر کردوون لەمەککە، لە سورەتی ڕومدا هاتوە: ﴿ وَمَآ ءَاتَيۡتُم مِّن رِّبٗا لِّيَرۡبُوَاْ فِيٓ أَمۡوَٰلِ ٱلنَّاسِ فَلَا يَرۡبُواْ عِندَ ٱللَّهِۖ وَمَآ ءَاتَيۡتُم مِّن زَكَوٰةٖ تُرِيدُونَ وَجۡهَ ٱللَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُضۡعِفُونَ ٣٩ ﴾ ( الروم). واتە: ( خەڵکینە خۆتان دوورە پەرێز بگرن لە سوکاری) چونکە هەر سامانێك بدەن بە سوو تا بە هۆی ماڵی خەڵکەوە دەوڵەمەند ببن ئەوە خوای گەورە بەرەکەت هەڵدەگرێت لە ماڵ و سامانتان ، هەر بۆیە کاتێك کە زەکات دەبەخشن بەو کەسانەی کە پێویستیانەو دیاریکراون ، مەبەستیشتان بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوای گەورەبێت ، ئا ئەو جۆرە کەسانە بەچەند بەرامبەر پاداشتیان دەدرێتەوە لە قیامەتدا و لە دنیاشدا خوای گەورە بەرەکەت دەخاتە سەرووەت و سامانیانەوە . ئەوە خیتابێکە بۆ موشریکەکان چونکە سورەتەکە مەککیەو لەدوای ئەو

ئایەتەشەوە خـودا دەفـەرمێت: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ ثُمَّ رَزَقَكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ هَلْ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَفْعَلُ مِن ذَٰلِكُم مِّن شَىْءٍ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٤٠﴾ ﴾ ( الـــروم).واتـــە: (خەڵکینە دڵنیا بن ) کە هەر خوای گەورە ئێوەی لـە نـەبون هێناوەتـە کایـەوە ، پاشـان رزق و رۆزی هەمەجۆری بۆ دابـین کـردوون ( هـەر لـەو کاتـەوە کـە لەسـکی دایکتانـدان ، قۆناغی شیرخواردنتان ، پاشان ئەو هەموو میوەو خۆراکە هەمە جۆرەی بۆ دابین کردوون ساڵانە بەردەوام تازە بە تازە پێشکەشتان دەکات ) پاشان دوای ماوەیەك دەتان مرێنێت ( بە بەرچاوی یەکترەوە) پاشان زیندوتان دەکاتەوە ( سێ قۆناغی لەبەرچاوەو دیارە دوا قۆناغیش کـە زینـدوو بونەوەیـە زۆر لای خـوای گـەورە ئاسـانە) باشـە ئایـا ئـەو کـەس و شتانەی ئێوە بە دەسەڵاتدارو هاوتای خوای گـەورەی دەزانـن دەتـوانن هـیچ شـتێك لـەو شتانە ئەنجام بدەن ، پاکی و بێگەردی و ستایش و بڵندی بۆ ئەو زاتەیە لە بەرانبـەر ئـەو هەولانـەی کـە خـەڵکی نـەفام ئـەنجامی دەدەن و شـەریك و هـاوەڵ بـۆ ئـەو زاتـە قـایلن( زۆربەی مەسیحی و جولەکە، شەریك بۆ خوای گەورە قایلن، ئـەوە بـوزی و گـا پـەرسـت و شەیتان پەرست و بت پـەرستەکان لەسەر زەویدا چەندەها ملیارن ، دەبـێ ئیمانـداران لـە خەمیاندا بن بەشێوازێکی جوان ئەم پەیامەیان پێ ڕابگەیەنن ) .

یەکێك لە نەریتەکانی قورئانی پیرۆز ئەوەیە کەباسی حالی بێ باوەڕان و تونـدو تیـژی لە بەرامبەریان دەکات. (إبن عباس ) دەڵێت هەرشتێك لە قورئانـدا هـاتوە لـە زەمکردنـی حالی بێ باوەڕان مەبەست لێی ئاگادارکردنەوەی موسوڵمانانە لە هاوشێوەی ئەو شتە لـە ئیسلامدا، بۆیە خودای گەورە دەفـەرموێت: ﴿ ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ ٱلرِّبَوٰا۟ لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِى يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيْطَٰنُ مِنَ ٱلْمَسِّ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوٓا۟ إِنَّمَا ٱلْبَيْعُ مِثْلُ ٱلرِّبَوٰا۟ وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلْبَيْعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰا۟ فَمَن جَآءَهُۥ مَوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ فَٱنتَهَىٰ فَلَهُۥ مَا سَلَفَ وَأَمْرُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ وَمَنْ عَادَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٧٥﴾ ﴾ ( البقرة) . واتە: بەڵام ئەوانـەی کـە سـوو دەخـۆن ، کەلـە گۆڕەکانیـان

دێنەدەرەوە لەکاتی زیندووبوونەوەدا دەڵێی شێتن ، هەروەها ئـەو کۆمەڵگـەو خەڵکانـەی کە سوخۆری تیایاندا دەبێتە شتێکی ئاسایی ، خەڵکەکە وەکو شـێت و سـەرخۆش دێنـە بەرچاو ، دەڵێی شەیتان دەستی لی وەشاندوون ، کەس بەکەس نیە ، سۆز و بەزەیی بـۆ یەکتر نیە ، هەمووی خۆپەرست و دنیا پەرستە ، ئەم حاڵەتەش بۆیـە بەسـەریاندا دێـت ، چونکە دەڵێن مامەڵەی سوو هەروەکو کڕین وفرۆشتن حەڵاڵە ، بەمـەرجێك خـوای گـەورە کڕین و فرۆشتنی حەڵاڵ کردووە ، بەڵام سوو خۆری لەسەر هەموو کەس حـەرام کـردوە ، جائەوەی پەیام و ئامۆژگاری خوای گەورەی پێگەیشت ، کۆڵیداو کۆتـایی پێهێنـا ، ئـەوە هەرچی دەست دەکەوێتەوە بـۆی حەڵاڵـە و کـاری لێپرسـینەوەو لێپێچانەوەی بەدەست خوایـە ، بـەڵام ئـەوەی تێهەڵچێتەوە ، ئائەوانـە نیشـتەجێی نـاو ئـاگری دۆزەخـن و بـۆ هەمیشە و هەتاهەتایی بەزیندوویی تێیدا دەمێننەوە.

هـەروەها دەفـەرموێت: ﴿ يَمْحَقُ ٱللَّهُ ٱلرِّبَوٰاْ وَيُرْبِي ٱلصَّدَقَٰتِۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ كَفَّارٍ أَثِيمٍ ﴿٢٧٦﴾ ﴾ (البقرة).واتە: لەڕاستیدا خوای گەورە هەرچی سوو هەیە تەفروتونای دەکات و بەرەکەتی لێهەڵدەگرێت ، بـەڵام خێـر و سـامان بەخشـین و کاسـپی حەڵاڵـە بەرەکەتـدار دەکـات و برەوی پێدەدات و پاداشتی نەبڕاوە بەخاوەنەکەی دەبەخشێت ، بێگومان ئەو خوایە هیچ کافر و بێباوەڕو تاوانبارو تاوانکـارێکی خـۆش ناوێـت ، ( بۆیـە درەنـگ یـان زوو تۆڵـەیان لێدەسێنێت و مایە پوچیان دەکات ) .

پاشان لادەداتەوە بـۆ خیتـابی موسـوڵمانەکان و دەفـەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَذَرُواْ مَا بَقِيَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓاْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٧٨﴾ ﴾ ( البقـرة). واتـە: ئـەی ئـەو کەسـانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە لەخوا بترسن و پارێزکاربن ، لەئێستە بەدواوە واز لـەپاشماوەی سوو بهێنن ئەگەر ئێوە ئیماندارن و خۆتان بەموسڵمان دەزانن.

لەوانەیە هەندێك لە موسوڵمانان وازیان لە وەرگرتن و پێدانی ڕیبا نەهێنابێت یاخود هەندێکیان بەقسەی بێباوەڕان هەڵخەڵەتابن: کە فرۆشتن وەك ڕیبایە. بۆیە ئایەتەکەی سورەتی ( ال عمران) دەست پێکی قەدەغە کردنەکە بو، ئەم ئایەتەش داخستنی دەرگای بەهانە بوو لە خواردنی ڕیبا و چۆنیەتی ڕونکردنەوەی ئەوەی کە تێپەڕی.

ڕیبا لە دوو ڕوەوە ڕوو دەدات:

یەکەم: قەرزدان و خستنە سەری زیادەیەك لەوەی داویەتی بە قەرز.

دووەم: قەرزدان بە بێ زیادە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو، وانە ئەگەر قەرزارەکە لە ماوەی دیاریکراودا قەرزەکەی نەدایەوە ئەوا زیادەیەك دەچێتە سەر قەرزەکە بەپێی ڕێککەوتنی هەردولا بۆ هەموو دواکەوتنێك.

وە فەرمایشتی (لا یقومون) واتاکە: هەڵناسنەوە ڕۆژێك کە خەڵك هەڵدەستنەوە بۆ پەروەردپاری جیهانیان بە شێوازێك هەڵدەستنەوە ئەڵێی شەیتان دەستی لێ وەشاندون، یان یان بە واتایەکی تر سور بوون و گورج و گۆلییان لە مامەڵەکانی ڕیبا وەك هەستانەوەی شێتە بۆ ناشرین کردنی چاو چنۆکیەکەیان... لەمەوەوە دروستە مانا بە جۆرێك بچوێنرێت کە خەڵك سەرسامی بن لە ڕاوەستانی حالیان، و زۆری سامانیان و بە هێزی بازرگانیەکەیان، بە بەراورد لە دەرکەوتنی حالی کەسێك کە شەیتان دەستی لێ وەشاندووە کە چۆن جولەکانی خێراو بە گەڵەن، لەگەڵ ئەوەی هیچی پێ ناکرێت بۆخۆی، ئایەتەکە لەسەر مانای یەکەم هەڕەشەیە بۆیان بە دەستپێکردنی سزاکەیان لەکاتی هەستانەوەیان بۆحیسابات تا ئەو کاتەی دەچنە ئاگرەوە، ئەوە ڕاستیەکەیەو گونجاوە لەگەڵ فەرمایشتی خودادا:

﴿ ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ ٱلرِّبَوٰاْ لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِى يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيْطَٰنُ مِنَ ٱلْمَسِّ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْبَيْعُ مِثْلُ ٱلرِّبَوٰاْ وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلْبَيْعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْ فَمَن جَآءَهُۥ مَوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ فَٱنتَهَىٰ فَلَهُۥ مَا سَلَفَ وَأَمْرُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ وَمَنْ عَادَ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٧٥﴾ ﴾ ( البقرة).

لەسەر ماناى دووەميش ناشرين كردنە، يا خود بەلێن دانە بە خراپى حاڵيان لە دونياو چەشتنى هيلاكى و ناڕەحەتيەكانى ژيان كە خودى سوخۆر وێناى دەكات ئەوەشى كە شەيتان دەستى لىٚ دەوەشێنيت شتێكە كە دوچار ڤیٚ بوەتەوە و هەڵبەز و دابەزى پىٚ دەكات، ئەگەر ويستى هەستێتەوە دەكەوێتەوە سەرزوى، كاتێك ئەو حالەتەى بەوحالەتەوە چواندوە لە زاراوەكەشدا حالەتى پىٚ چوێنراوى باسكردووە.[١٤٥]

پاشان خوداى گەورە دەفەرموێت: ﴿ ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ ٱلرِّبَوٰاْ لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِى يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيْطَٰنُ مِنَ ٱلْمَسِّ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْبَيْعُ مِثْلُ ٱلرِّبَوٰاْ وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلْبَيْعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْ فَمَن جَآءَهُۥ مَوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ فَٱنتَهَىٰ فَلَهُۥ مَا سَلَفَ وَأَمْرُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ وَمَنْ عَادَ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٧٥﴾ ﴾ ( البقرة).. واتە هەركەسێك قەدەغەكردنى ريباى لەلايەن خوداوە پێگەيشت وبە بىٚ خاوەخاو دوودلى وازيلێهێنا، واز هێنانێك لەبەرئەوەى خودا قەدەغەى كردوە، ئەوە ئەو سامانەى لە ڕێگەى ڕيباوە دەستى كەوتوە بۆخۆيەتى و ڕاناسپێردرێت بۆ ئەو كەسانەى لێى وەرگرتون، بەلكو وازدەهێنێت و پاش پێگەيشتنى هەوالەكە هيچ زيادەيەك ناخاتە سەريان: { وَأَمْرُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ ﴿٢٧٥﴾ }(البقرة). بەدادى خۆى مامەڵەى لەگەڵ دەكات، دادپەروەريشى لەوەدايە كە لێى ناگرێت لەو ڕيبايەى كە خواردويەتى پێش قەدەغەكردن و دابەزينى فەرمانى خودا، بەلام دەستەواژەكە ئەوە دەگەيەنێت كەرێگەدان بە هەرشتێكى خوراو لە ڕابردوو دا ڕوخسەتێكە بۆ زەرورەت، وە ئەوە

١٤٥ – التحرير والتنوير ، طاهر بن عاشور ، مرج سابق، مج:٣، ج:٣، ص:٨٢ بتصرف.

دەگەیەنێت پێڕانەوەی ئەوەی کە وەریگرتوە پێش قەدەغەکردنەکە بۆخاوەنەکانیان کەمترین ئیرادەو خواستە، ئایا نابینی سەبارەت بەو شتەی کە پێشتر ڕێگەی پێ داوە بە (اللام) دەربڕیوە.

ئەی وەك ئەوەی کەوتویەتی لە دوای باسکردنی کەفارەتی ڕاوکردنی قەدەغەکراو (عَفَا اللَّـهُ عَمَّا سَلَفَ) ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡتُلُواْ ٱلصَّيۡدَ وَأَنتُمۡ حُرُمٞۚ وَمَن قَتَلَهُۥ مِنكُم مُّتَعَمِّدٗا فَجَزَآءٞ مِّثۡلُ مَا قَتَلَ مِنَ ٱلنَّعَمِ يَحۡكُمُ بِهِۦ ذَوَا عَدۡلٖ مِّنكُمۡ هَدۡيَۢا بَٰلِغَ ٱلۡكَعۡبَةِ أَوۡ كَفَّٰرَةٞ طَعَامُ مَسَٰكِينَ أَوۡ عَدۡلُ ذَٰلِكَ صِيَامٗا لِّيَذُوقَ وَبَالَ أَمۡرِهِۦۗ عَفَا ٱللَّهُ عَمَّا سَلَفَۚ وَمَنۡ عَادَ فَيَنتَقِمُ ٱللَّهُ مِنۡهُۚ وَٱللَّهُ عَزِيزٞ ذُو ٱنتِقَامٍ ﴿٩٥﴾ ﴾ (المائدة) واتە: ئەی ئەو کەسانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە هەرکاتێك ئێوە ئیحرامتان بەست بە نیەتی حەج یان عومرە نابێت نێچیر ڕاو بکەن ، ئەوەی بە ئارەزوو ، بە ئەنقەست نێچیر ڕاو بکات ، ئەوە دەبێت لە جیاتیدا ئاژەڵێکی وەك نێچیرەکە بکاتە فیدیە ، پەسەندکردنی ئەو ئاژەڵەش دەبێت دوو کەسی شارەزای دادپەروەر لە خۆتان پێی هەستن ، فیدیەکەش دەبێت لە دەور و بەری کەعبەدا ئەنجام بدرێت و ببەخشرێتەوە ، یاخود بەقەدەر نرخی قۆچەکە خواردن بە هەژاران بدرێت، یاخود بەقەدەر ژمارەی هەژاران دەبێ بەڕۆژوو بێت ، تا تاڵاوی سەرپێچی خۆی بچێژێت، هەرچی لە ڕابردوویشدا پێش هاتووە پێش نازڵ بوونی ئەم فەرمانە ئەوە خوای گەورە چاوپۆشی لێ کردووە ، بەڵام ئەوەی ئەو هەڵانە دووبارە بکاتەوە، ئەوە خوای گەورە تۆڵەی لێ دەستێنێت ، چونکە خوای گەورە باڵادەست و تۆڵە سێنەرێکی بە زەبرزە. ( دیارە خوای گەورە بە حەرام کردنی ڕاو لە مەکە و دەور و بەریدا دەیەوێت ڕێزو پیرۆزی ئەو شوێنە بخاتە بەرچاوی سەرجەم نەوەکان ، تا بەشوێنێکی سادەی نەزانن ).

**وە ئەو دوای ئەو ڕێگە پێدانە ئامازەی بە پاداشت کردوە و پێڕاویەتیەوە بۆخـودا، وە لە شێوازەکەیدا وا باوبووە بگاتە ئەوەی کە باسی لێخۆش بوون و بەزەیی بکات، وەك لـە کۆتایی ئایەتی شانزدە قەدەغەکراوەکاندا فەرمویەتی:**

﴿ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَٰتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَٰتُكُمْ وَعَمَّٰتُكُمْ وَخَٰلَٰتُكُمْ وَبَنَاتُ ٱلْأَخِ وَبَنَاتُ ٱلْأُخْتِ وَأُمَّهَٰتُكُمُ ٱلَّٰتِىٓ أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَٰتُكُم مِّنَ ٱلرَّضَٰعَةِ وَأُمَّهَٰتُ نِسَآئِكُمْ وَرَبَٰٓئِبُكُمُ ٱلَّٰتِى فِى حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ ٱلَّٰتِى دَخَلْتُم بِهِنَّ فَإِن لَّمْ تَكُونُوا۟ دَخَلْتُم بِهِنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ وَحَلَٰٓئِلُ أَبْنَآئِكُمُ ٱلَّذِينَ مِنْ أَصْلَٰبِكُمْ وَأَن تَجْمَعُوا۟ بَيْنَ ٱلْأُخْتَيْنِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٢٣﴾ ﴾ **(النساء)،**

**واتە: ئەی گرۆی ئیمانداران ئێـوە ئـەم ئافرەتانـەتان لێ حـەرام کـراوە کـە بیانکەنـە هاوسـەرتان: دایکانتـان ( دایکـی خۆتـان ، باوەژنـەکانتان ) کچـەکانی خۆتـان ، خوشکەکانتان ( باوك و دایکی، یـان تـەنها خوشکی باوکی، یان دایکـی ) پـورەکـانتان ( خوشکانی باوك ) پورەکـانی ترتـان ( خوشـکانی دایـك ) برازاکانتـان، خوشـکەزاکانتان هەروەها ئەو دایکانەی کە شیریان داونەتێ واتە خۆیان و خوشـکە شـیریەکانتان ، دایکـی هاوسـەرانتان ( خەسـوو) ئـەو کچـانەی لـە پیـاوێکی تـرن و ئێـوە دایکیانتـان هێنـاوە و چونەتەلایان ( واتە زڕ کچەکانتان ) خۆ ئەگەر نەچوبنە لایـان پـێش گواسـتنەوە ، تـەڵاق دران و یان مردن ، ئەوە هێنانی کچەکانیان بۆتان دروسـتە و قـەیناکا و گوناهبـار نـابن ، هەروەها حەرامە هاوسەری ئەو کوڕانەتان بێنن کە لە پشتی خۆتانن ( واتە بوکـەکانتان ) هەروەها نابێت دوو خوشك پێکەوە بکەنە هاوسەری خۆتان بێجگە لەو حاڵەتانەی کـە لـە پێش ئیسلامدا هەبوون ، دڵنیاش بن کە خوای گـەورە هەمیشـە و بـەردەوام بـە نیسـبەت ئیماندارانەوە تەواو لێخۆشبوو میهرەبان و دلۆڤانە .**

ڕێگەی دا بە خواردنی ئەوەی ڕابوردو لە پێش قەدەکردن و پاداشتی بخۆرەکەی شاردەوە بەلکو وازبێنێت لە خواردنی ئەوەی کەلە دەستیدایەوببپێرێتەوە بۆ خاوەنەکەی، بەلام توندترین هەڕەشەی خستە ڕوو بۆ ئەوانەی دوای قەدەغەکردنەکە شتێك بخۆن و فەرموی: ﴿ ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ ٱلرِّبَوٰاْ لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِي يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ مِنَ ٱلۡمَسِّۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَالُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡبَيۡعُ مِثۡلُ ٱلرِّبَوٰاْۗ وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلۡبَيۡعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْۚ فَمَن جَآءَهُۥ مَوۡعِظَةٞ مِّن رَّبِّهِۦ فَٱنتَهَىٰ فَلَهُۥ مَا سَلَفَ وَأَمۡرُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِۖ وَمَنۡ عَادَ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٧٥﴾ ﴾ ( البقرة)، بەمانای: هەرکەس بگەڕێتەوە بۆسەر ئەو ڕیبایەی حەرام کراوە لەدوای حەرام کردنی ئەوانە دوورن لە پەند وەرگرتن لە ئامۆژگاری پەروەردگاریان کە شتێکیان لەسەر حەرام دەکات کە زیانی هەبێت بۆیان لە تاکە تاکەو سەرجەمی ئەهلی ئاگر کە هەرگیز لێیان جودا نابێتەوە وەك چۆن هاوڕێیەك وابەستەی هاوڕێکەیەتی و بە هەتاهەتایی تیایدا دەحەسێتەوە.

پاشان خودای گەورە جیاوازی نێوان ڕیباو سەدەقە ڕوون دەکاتەوە، کەباسی سەدەقەو کاریگەرییەکانی کردووە لە دوای باسی ڕیباوە کە دەفەرموێت: ﴿ يَمۡحَقُ ٱللَّهُ ٱلرِّبَوٰاْ وَيُرۡبِي ٱلصَّدَقَٰتِۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ كَفَّارٍ أَثِيمٍ ﴿٢٧٦﴾ ﴾ (البقرة). تەفسیری لەناوبردنی ڕیبایان لەلایەن خوداوە بەوەکردووە کە بەرەکەتی تیانامێنێتەوە و لە ناودەچێت، یاخود تیاچونی ئەو پارەی کە دەخرێتە مامەڵەی ڕیباوە، ئەم هەواڵە وا بلاو بویەوەو دەنگۆی دایەوە تا هەمو کەس لێی ئاگادار بوو، وە بەردەوام هەوالی ئەو کەسانەیان دەگێڕایەوە کە ڕیبایان دەخوارد و مال وسامانیان تیادەچوو وە مال وێران دەبوون، لە فەرمودەی ابن مسعود (خودا لێی ڕازی بێت) کە پێغەمبەر " سەلات وسەلامی خودای لەسەربێت " فەرموی: (الربا وإن كثر فإن عاقبته تصير الى أقل) [146]

---

١٤٦- صحصح: أخرجه أحمد في مسنده ، مسند المكثرين من الصحابة، مسند عبدالله بن مسعود (٣٧٥٤)، وأبو يعلى في مسنده (٤٥٦/٨) برقم (٥٠٤٢)، و صححه الارنوطة في تعليقه على المسند.

(ضحاك) یش وتی: ئەم لەناوبردنە لە دوارۆژدایە، کە ئەوەی لێی وەبەر هاتوە پوچەڵ دەبێتەوە لە بەرامبەر ئەوەی چاوەڕێی سودو قازانج بێت، هیچ شتێك بۆ خاوەنەکەی نامێنێتەوە، ئیمام وتی: مەبەست بەلەناوبردن لەناوبردنی قازانجی سامانەکە نیە، چونکە ئەوە پێچەوانەی بیستراو و بینراوە بەلکو مەبەست لێی دژایەتی خەڵکە کە ڕووبەڕوی ڕیبا خۆر دەبێتەوە، لەگەڵ ئەو وەسوەسە و شتانەی تر کە دوچاری دەبێتەوە، ئەوەی کە دژایەتی خەڵکە ئەوەیە کە ڕیبا خۆر بەدوژمنی سەرسەختی هەژارو کەمدەستە، دژایەتی و ڕق و کینەش سەردەکێشێت بۆ بۆ زیان و خراپەکاری، و دەستدرێژی کردنە سەر بەروبووم و سامان و خاوەنەکەی، کاریگەریەکەشی ئاشکرایە لەسەر ئەو گەلانەی کە ڕیبای تێدا بلاو بووە، و هەژاران هەستاون بە دژایەتی کردنی دەلەمەندان،کرێکارەکان یەکیان دەگرت لە بەرامبەریان تا ئەو ڕادەی بووە مەسەلەیەکی ئالۆز لایان، وە ئەوەشی کە دوچاری دەرونیان دەبویەوە خەیال و وەسوەسە کەس هەستی پیێ نەدەکرد،جگە لەو کەسانەی کە چاودێری حالی ئەو پارە پەرەستانەیان دەکرد،هیچ نمونەیەك لەسەر ئەوە باس ناکەم چونکە هێنانەوەی نمونە بۆ ئەو حالەتە کەمە بەو مانایەی حالەتەکە زۆرلەوە زیاترە بەنمەنە گوزارشتی لیێ بکرێت، هەیانە پارەو پول ئەوەندە سەرقالی کردووە فریای خواردن وخواردنەوەو مال ومندالەکەی ناکەوێت تا دەگاتە ئەو ڕادەی درێغی لە لە مافی خۆی و خێزانەکەی دەکات بەشێوازێك گەڵ کێشی دەکات بەرەوفەوتان و سەرشۆڕی و ریسوای ، هەشیانە ڕێگای قورس وترسناك دەگرێتە بەر بۆ بەدەست هێنانی سامان تالەو پێناوەدا تیادەچێت و دەفەوتێت.

مەبەست لە لەناوبردنی ڕیبا سڕینەوەی ئەو زیادەیەیە کە خەڵك داوای دەکات لە پلەو پایەو خۆشگوزەرانی و لەزەت و ڕابواردن، ئەو زیادەیەی کە لە ڕیباوە دەست دەکەوێت هەموو ئەمانە لەناو دەبات بە هۆی سەرقالی ڕیبا خۆرەوە لە لەزەت بردن ودابەزینی ئاستی بژێوی بە شەیدابوونی بە سامانەکەیەوە،بەهۆی تووڕەی خەڵك و ڕق لێبونیانەوە

بەرامبەری، بەلام نەش ونمای سەدەقات زیادەی قازانج و بەروبومەکەیەتی لەدنیاو پاداشتەکەیەتی لە دوا ڕۆژدا کە خودا بۆی چەند جارە دەکاتەوە.

واتای ئەوەی خودا ڕیبا لەناودەبات ونەش و نما بەسەدەقات دەکات ئەوەیە کە سوننەتی خودا بەرامبەر بەندەی مال وسامان کەبەزەی بە لێقەوماودا نایەتەوە و لەسەر دەست کورت ناوەستێت کە نیەتی قەرزەکەی بداتەوە پارەکەی لەسەر زیاد دەکات بەبێ بەرامبەر خاوەن قەرزیش وەك کەسێکی بەهێز و زرنگ و چاکەکار بێتە بەرچاولەلای خەڵك، چونکە بوەتە سەرچاوەی چاکەکانیان و دەست پێشخەربوە بۆیان لە هاوکاری کردنیان لە کاتی دەردەداریان، بەهەمان شێوە لە دووا ڕۆژدا بێ بەش دەبێت لە پاداشتی سامانەکەی چونکە ئەو سودی لەسامانەکەی وەرنەگرتوە بەم جۆرە سود گەیاندنە وەك ئەوەی سامانەکەی لەناوبراووتیاچو، وەسوننەتی خودا بۆ بەخشەر ئەوەیە سود وەرگرتنی لەسامانەکەی زیاترە لە سەرمایەکەی .

وە لە فەرمودەی أبی هورەیرە کە پێغەمبەر "سەلات و سەلامی خوددای لەسەربێت" فەرموی: (من تیَدق بعدل تمرة من کسب طیب، ولایقبل الله إلا الطیب ، وإن الله تعالر یتقبلها بیمینه ثم یربیها لیَاحبها کما یربِر أحدکم فلوّة[147] ، حتی تکون مثل الجبل)[148]

واتە: هەرکەس بە ئەندازەی دەنکە خورمایەك ببەخشێت لە مالی حەڵاڵ، خودای گەورە خودای گەورە مالی حەڵاڵ نەبێت وەریناگرێت ، ئەوە خودای گەورە وەریدەگرێت بە دەستی ڕاستی خۆی و دواتر بۆی گەروەردە دەکات هەروەك چۆن کەسێك لە ئێوە گوێرەکەیەك بە خێو دەکات تا ئەوەندەی بەئەندازەی شاخێکی لێ دێت.

---

١٤٧- الفلوة: هو المهر أول ما یولد.

١٤٨- أخرجه البخاري في صحیحة ، کتاب الزکاة، باب: لایقبل الله صدقة من غلول ، ولایقبل إلا من کسب طیب (١٣٤٤) .

ئاشکرایە فەرمودەکە لە بابی نمونە هێنانەوەدایە، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ كَفَّارٍ أَثِيمٍ ﴾ (البقرة)، وتیان لایحب: واتەرازی نابێت ، والکفار: واتە ڕێگەپێدەرانی ڕیبان، والأثیم: ئەوانەن کەلەسەر تاوان بەردەوامن. خۆشەویستی خودا بۆ بەندە بەوە دەزانرێت کە یەکێك لە ڕێباکانی بەکارهێنانی بەندەیە لە چەسپاندنی دانایی خودا لە چاکسازی بەندەکانیدا، وە پێچەوانەی ئەم خۆشەویستیەش بە پێچەوانەکەیدا دەناسرێتەوە.

لێرەدا بێباوەڕەکان ڕۆچوون لە کوفری نیعمەتەکانی خودا لەسەریان لەو سامانەی کە پێی بەخشیون، وە لە پێناو خودادا هیچی لێ نابەخشن و دلنەوای نەدارەکانی پێ ناکەن، تاوانباریش ئەو کەسەیە کە سامانی کردوەتە ئەمرازێك بۆ دەستکەوتنی ئەو شتانەی لە دەستی خەڵکدایە بۆخۆی و تەنگانەکانیان دەقۆزێتەوە بۆ سەگاندنی قەرز بەسەریاندا.[149]

پاشان خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَذَرُوا۟ مَا بَقِىَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓا۟ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴾ (البقرة). واتە: ئەی ئەو کەسانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە لەخوا بترسن و پارێزکارین ، لەئێستە بەدواوە واز لەپاشماوەی سوو بهێنن ئەگەر ئێوە ئیماندارن و خۆتان بەموسڵمان دەزانن ..* خۆ ئەگەر واتان نەکرد ئەوە دیارە ئێوە جەنگتان دژی خوا و پێغەمبەرەکەی ڕاگەیاندوە ، بێگومان سەرئەنجامەکەی ئاشکرایە کە هەر سوو خۆران ڕیسوا دەبن ، خۆ ئەگەر تەوبە بکەن و پەشیمان بنەوە لەو تاوانە ، ئەوە سەرمایەکەی خۆتان هەڵبگرنەوە ، ئیتر نەستەم لەقەرزارەکان بکەن بەوەی پارەی زیادیان لێبسێنن نە ستەمیشتان لێدەکرێت و سامانەکەتان زەوت دەکرێت.

---

١٤٩- تفسير المنار، محمد رشيد رضا ، مرجع سابق، ج:٣، ص: ٩٧-١٠١ بتصرف.

(سید قطب) خاوەنی (الظلال) لەبارەی ئەم ئایەتەوە دەڵێت: دەقەکە ئیمانی ئەو کەسانەی کە ئیمانیان هێناوە دەبەستێتەوە بە دەستبەرداربوون لەو ڕیبایەی کەهەیە، ئەوەشی کە تێپەڕی کارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ لای خودا، بەمەش ئیسلام ڕێگری لە شلەقانێکی گەورەی ئابووری و کۆمەڵایەتی کرد لەسەر بنەمای ئەوەی ڕۆی ڕۆی ئەمە سیفەتی هاندانەلە پەناشیدا سیفەتی تۆقاندنە کە دڵەکان دەهەژەێنێت ﴿ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا۟ فَأْذَنُوا۟ بِحَرْبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۖ وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَٰلِكُمْ لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ ﴿٢٧٩﴾ ﴾. (البقرة). جەنپێك لەلایەن خودا و پێغەمبەرەکەیەوە ڕوبەڕوی دەبێتەوە، جەنپێکی ترسناك کە کۆتایەکەی ئاشکرایە، وە ئەنجامەکەشی بڕیاری لەسەر دراوە،مرۆڤێکی لاواز لەکوێی و ئەو هێزە هاڕەڕو لەەناوبەرەدایە؟!

پاش دابەزینی ئەم ئایەتانە کە لەو دواییانەدابەزی پێغەمبەری خودا " سەلات و سەلامی خودای لەسەربێت" فەرمانی بەکاربەدەستانی کرد لە مەککە جەنگ لەگەڵ (المغیرة) دا ڕابگەیەنن ئەگەر دەستیان لە مامەڵەی ڕیبەوی هەڵنەگرت، وە لە وتارەکەیدا لە ڕۆژی ڕزگارکردنی مەککەدا فەرمانی کرد بەلابردنی هەمو ڕیباکانی نەفامی - لەسەروشیانەوە ڕیبای عباسی مامی لەسەرشانی قەرزارەکان کەماوەیەکی دورو درێژ بوو بەسەرشانیانەوەبوو تەنانەت لە پاش هاتنی ئاینی ئیسلامیش بۆماوەیەکی زۆر تا ئەوکاتەی کۆمەڵگای ئیسلامی گەشەی سەند و یاساکانی چەسپێنران، ئیتر کاتی ئەوە هات کە ڕیبازی ئابووری بەتەواوی لە ڕیبا ڕزگار بکرێت،و پێغەمبەر" سەلات وسەلامی خودای لەسەربێت" لە وتارەکانی دا فەرموی: (وربا الجاهلیة موضوع و أول ربا أضع ربانا ربا عباس بن عبدالمطلب) واتە: ڕیبای سەردەمی جاهیلی وەلا خرا یەکەم ڕیبا کەوەلا دەخرێت ڕیبای (عباس بن عبدالمطلب)ە . وە فەرمانیی پێ نەکردن بە پێڕانەوی ئەو زیادانەی کە کە پێشتر وەریانگرتبو لەسەردەمی نەفامیدا.

پێشەوا ڕاسپێردراوە – لەکاتی بەرقەراربونی کۆمەلگای ئیسلامی بە دژایەتی کردنی ئەوانەی کەسورن لە پەیڕەو کردنی ڕیبازی ڕیبەوی، وە سەرپێچی فەرمانی خودا دەکەن،تەنانەت ئەگەر موسولمان بونی خۆشیان ئاشکرا بکەن،وەك ئەوەی (أبوبکري صدیق) جەنگا لەگەڵ ئەوانەی زەکاتیان نەدەبەخشی، لەگەڵ ئەوەی شایەتیان دا بوو بە تاك وتەنهای خوداو پێغەمبەرێتی موحەمەد "سەلات وسەلامی خودای لەسەر بێت" و نوێژیان دەکرد، ئەوە موسولمان نیە ڕازی نەبێت بە جێ بە جێ کردنی شەریعەتی خودا و لە ژیانی ڕۆژانەیدا ڕەفتاری پێ نەکات ! بێگومان ڕاگەیاندنی جەنگ لە لایەن خوداو پێغەمبەرەکەیەوە گشتگیرترە لە شەڕ کردن بە شمشێرو چەکێك کە لەلایەن کاربەدەستەوە جێ بەجێ بکرێت.

ئەمە جەنپێکی ڕاگەیەندراوە – کەخودا خۆی ئاماژەی پێ کردوە بەرامبەر هەر کۆمەلگایەك کە گەیڕەوی ڕیبا بکات لە بنەما ئابوری و کۆمەلایەتەکاندا.ئەوە جەنپێکی ڕاگەیەندراوە لە شێوازە گشتگیرە لەناو بەرەکەیدا، ئەوە جگە لەسەر دل و دەروندا، جەنگە لەسەر بەرەکەت و خۆشگوزەرانی، جەنگە لەسەر ئاسایش و بەختەوەری. جەنگێکە خودا هەندێ لەداورودەستە سەرکەشەکانی زال دەکات و دەیدات بە گژی ەوانی تردا، جەنگی ڕاوەدونان و زۆر هەڵچون، جەنگی ستەم و نادادپەروەری ، جەنگی ترس و دلە ڕاوکێ،لە کۆتایشدا جەنگی چەك و تەقەمەنی لەنێوان گەلان وسوپاو دەولەتاندا.جەنپێکی لەناوبەری فەوتێنەرە کە لە دەرئەنجامی ڕیبازی ڕیبەوی هەڵدەگیرساو دروست دەبوو.

ڕیبا خۆرەکانی خاوەنی دەستمایەی سامانی جیهانی ئەوانەن کەئەم جەنگانە بەرپادەکەن به ڕاستەوخۆ بێت یان ناڕاستەوخۆ. ئەوان کۆڕەکانی خۆیان هەڵدەدەنە کارگەو کۆمپانیانی تێدەکەوێت، پاشان گەلان و دەولەتەکانیشی تێدەکەوێت، پاشان

پـەلاماری نێچـیرەکانی دەدەن و جـەنگ بـەرگا دەبێـت! یـا خـود بـە گشـت ئەسـتوری وڵاتەکانیان شـوێن سـامانەکانیان دەکـون و جـەنگ بـەرگا دەبێـت! یـان باجیـان لەسـەر قورس دەکرێت یان تێچوی دانەوەی سودی قـەرزەکانیان، بەمـەش هـەژاری وقـات وقـڕی لەنێوان وەبەرهێنەرەکاندا بـڵاو دەبێتـەوە، بەمـەش دڵیـان واڵادەکـەن بـۆ بـۆ وەرگـرتنی پڕوپاپەندەی تێکدەرانە وشەڕ بەرگا دەبێت.

ئاسانترین شت کە ڕوو بدات – ئەگەر ئەمانە هەموی ڕوونەدات ئەوەیە کە دەرونـەکان دەڕوخـێن و ڕەوشـتەکان دادەڕمـێن و پێرەشـێوێنی بـەرپادەبێت، کیـانی مرۆڤایـەتی هەرلەبناغەوە هەڵدەوەشێت و تێك دەشـکێنرێت بـەجۆرێك کـە قورسـترین و ترسـناکترین جـەنگ نایگەیەنێتـە ئـەو ئاسـتە! ئـەوە جـەنپێکی بەردەوامـە خـودای گـەورە لـەدژی کارپێکـەرانی ڕیبـا ڕایگەیانـدوە، ئـەو ئێسـتا کلپـەی کـردووە و تـەپو وشـك پێکـەوە دەسوتێنێت لە ژیانی مرۆڤایەتی گومڕادا ، بـێ ئاگایـە وادەزانێـت دەستکەوتی دەبێـت و بـەرەو پێشـەوە دەڕوات هـەرکات ئـەو بەرهەمـە زۆرە مادییـە دەبینێـت کـە کارگـەکان بەرهەمی دەهێنن...

دەکـرا ئـەو بەرهەمـە زۆر شایسـتەی بەختـەوەر کردنـی مـرۆڤ بوایـە ئەگـەر لـە سـەرژاوەیەکی پاکـەوە دەسـت بکەوتایـە، بـەڵام – لەسەرچـاوەیەکی بۆگـەنی ڕیبـاوە دەردەچێت تـەنها کۆمەڵـە شـتێکی کەلەکـە بـووی تیـا بەسـەر نـەبووە کـە هەناسـەکانی مرۆڤایەتی خەفە دەکـات و کۆتـایی پـێ دەهێنێـت، ئـەی بۆنـا لەکاتێکدا تـاقمێکی ڕیبـا خۆری جیهانی لە گشتەوەیە، کە هەست بەو ئازارە سەختەناکات کە ڕوبەڕوی مرۆڤایـەتی دەبێتەوە بەجۆرێك دەناڵێنن لەژێر ئەو بەرهەمە کەلەکە بووە نەفرەتییەدا !

ئیسلام لەسەرەتای هاتنیەوە بە ئێستاشەوە بانگەواز دەکات بۆ گەڕانـەوە بـۆ یاسـای ڕاست و دروست، بۆ تەوبە کـردن لـەتاوان و گونـاه و پـەیرەوی نەشـیاو، خـودای گـەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَٰلِكُمْ لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ ﴿٢٧٩﴾ ﴾. (البقرة).

تەوبــە کردنـــە لـــە هەڵـــە کـــە هەڵـــەی جاهیلیەتـــە، جاهیلیـــەتێك پەیوەنـــدی بەسەردەمێکەوەنیە لە سەردەمێکی تر، وە بە ڕیبازێکەوە لە ڕیبازێکی تر... بەلکو ئـەوە لادانە لە شەریعەتی پەروەردگار و پرۆپرامەکەی لە هەر کوێ و هەرکاتێکدابێت. هەڵەیـەك جێکەوتەی لەسەر هەستی تاکەکان و ڕەوشت و بۆچونیان بۆ ژیان دەبێت ، کاریگەری بە جیّ دەهێلیّ لە ژیانی کۆمەل و پەیوەندیە گشتیەکاندا، کاریگەری لەسەر سەرجەم ژیـانی مرۆڤایەتی بە جیّ دەهێلێت، لەگەڵ گەشە ئابووریەکەی.

هەرچەندە ئەوانەی هەڵخەلەتێنراون باوەڕیان بە بانگەشـەی سـوخۆرەکانیش کردبێـت کەتەنها ئەو بنچینەیەکی گونجاوە بۆ گەشەی ئـابووری ! پێڕانـەوەی دەسـتمایە بەتـەنها دادگەروەریەکە نەخاوەن قەرز و نە قەرزار ستـەمیان لـێ ناکرێـت ، بـەلام گەشـە پێـدانی سامان وەسیلەی پاك  بێگەردی خۆی هەیە، ەسیلەی هەولّی تاکە کەەسی هەیـە، لەگـەڵ وەسیلەی پێکەوە کارکردن لەسەر شێوازی (المضاربة) ئەویش پێدانی پارەیـە بەکەسـێك کەکاری تیادەکات، پاشان دابەشکردنی قازانج و زەرەر، وەسیلەیەکە کۆمپانیاکان گشکی ڕاسـتەو خۆیـان دەخەنـە بـازاڕەوە و لـەو ڕوەوە قـازانجی حـەڵاڵیان دەسـت دەکـەوێت، وەسیلەیەکی تر دانانی سامانە لە بانکدا بەبیّ سود – ئەویش ئەوەیە کە بانکـەکان پشـك ددەدەنە کۆمپانیاکان و کارگـەکان و کارەکـانی بازرگـانی ڕاسـتەوخۆ یـان ناڕاسـتەوخۆ– سودێکی دیاریکراوی نادانیّ پاشان لەنێوان ئەوانەی پارەکەیان داناوە قازانجەکە دابـەش دەکەن لەسەر بنەایەکی دیاریکراو بۆ زیانیش بەهەمان شێوازە.

بانکەکان بۆیان هەیە ئەندازەیەکی دیاریکراو کریّ وەربگرن لە بەرامبـەر بـەڕێوەبردنی ئەوسـامانە . ڕێگـای تـریش زۆرن لێـرەدا فرسـەتی ڕوونکردنـەوەی نیـە. ئـەو ڕێگایانـە هەمویان ئاسانن و مومکنن ئەگەر ئەگەر دلەکان ئیماندارین و نیەتـەکان سـاغ بـن لەسـەر

بـەکارهێنانی سەرچـاوەی پـاك و بێگـەرد و دور کەوتنـەوە لەسەرچـاوەی بۆگـەن و قیزەونەکان ! [150]

**چـوارەم: چارەسـەری نەبـونی لە چاوەڕێکردنـدایە بۆکـاتی هەبـوون نەک لە ڕیبایەکـدا کە کێشەکان قولتر دەکاتەوە:**

ئەم خالە سیاقی ئەو حوکمانە کە پەیوەندیان بە قەرزەوە هەیە لـە حالـەتی نەبونیـدا ڕوون دەکاتەوە، ڕێگەچارە لە ڕیبازی (النسیئة) دانیە: کە دانـەوەی قەرزەکـە دوابخرێـت بەرامبەر خستنەسەری زیادەیەك. بەلکو چاوەڕوانی کردنە تا کاتێك هـەیبێت. وە بـۆ ئـەو کەسانەشی حەزیان لە خێرو پاداشـتی زیـاترە هانیـان دەدات بـۆ بەخشـین و چاوپۆشـی کردن لەوقـەرزە وەك دەفـەرموێت: ﴿ وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَىٰ مَيْسَرَةٍ وَأَن تَصَدَّقُوا خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٨٠﴾ ﴾ ( البقرة). واتە: خۆ ئەگەر قەرزارەکە هەژار و نـەداربوو ، ئـەوە بامۆڵـەتی بـدرێت تـاخوای گـەورە دەرووی خێـری لێ دەکاتـەوە ، خـۆ ئەگـەر قەرزەکەتان بەخشی بەقەرزارەکە ئەوە خێرتان دەگات و دەکرێـت لـەجیاتی خێـر ، یـان زەکات بیدەنێ کەچاکترە بۆیان ، ئەگەر بزانن پاداشتی ئەو کارەتان چەندە بێ سـنوورە ، ئەوە بێگومان بەدڵخۆشیەوە ماڵ و سامانتان دەبەخشن و چاوپۆشی لە قـەرز پێـدراوان دەکەن.

ئەوە ئەو لێبوردەییە تەڕو پاراوەیە کە ئیسلام هێناویەتی بۆ مرۆڤایەتی، ئەوە سـایەو سێبەرێکە کە مرۆڤایەتی هانای بۆدەبـات لـە کـاتی هیلاکـی و قرچـەی گـەرماو ڕەزیلـی و هەڵگـەو پـەلاماری پەرێشـانی، ئـەو سـۆزو بەزەییـە بـۆ قـەرزارو خـاوەن قـەرزو بـۆ ئـەو کۆمەلگایەی کە هەموان دەگرێتە خۆی!

---

١٥٠ –في ظلال القران ، سيد قطب، مرجع سابق، ج:١، ص: ٣٣٢،٣٣٠.

ئێمە دەزانین ئەم وشانە واتایەکی ماقولی نیە لای خەڵکی سەرلێشێواو ئەوانەی نە گرەو گەرمای نەفامی و مادیەتی ئێستادا پێگەیشتون! هەروەها چێژە شیرینەکەی هیچ تامێکی نیە لە هەستی وشك ورەق و ساردو سڕیاندا! بەتایبەتی ئەو سوخۆرو دڕندانەی کە لە هەر گۆشەیەکی ئەم زەوییەدا خۆیان مەلاسە داوە بۆ نێچیرێکی نەدارو نەبو و لێقەوماو کە بەلاو کارەساتیان بەسەرهاتووە و پێویستیان بە پارەو خواردن و جل و بەرگ و دەرمانە، تەنانەت لەهەندێ کاتتدا پێویستیان بە شاردنەوەی مردوەکانیانە، لەم جیهان مادییە هەڵقرچاو و بەرچاو تەنگ و ڕەزیلەدا کەس شك نابەن کە دەستی هاوکارییان بۆ درێژ بکات بە ناچاری پەنا دەبەنەوە بۆ حەشارگەی دڕندەکان، نێچیرێك بەئاسانی ڕادەکات بەرەو تەلەکە، پێویستی پالی پێوە دەنێت و زەرورەت ناچاری دەکات!

ئیتر ئەو دڕندانە تاکەکەس بن یا خود لەشێوازی بانکی ڕیبەوی یان دامەزراوەی دارای. هەمویان یەك شتن ، جگە لەوەش ئەمانە لە نوسینگەی گران بەهاو لەسەر کورسی نەرم وگەرم دانیشتون ولەگشتیشیانەوە کۆمەلێك بیردۆزی ئابوری و نوسراوی زانستی و مامۆستاو گەیمانگاو زانکۆو یاساو دەستورو دادگاو پۆلیس و سوپا گشتگیریان لێ دەکات.

هەمو ئەمانە بنیات نراوە بۆ پاکانە کردن لە تاوانەکانیان و پارێزگاری کردنیان وە دەست بەسەراگرتنی هەر کەسێك کە بوێرێت ئەوە بکات بیانو بهێنێتەوە لە پێڕانەوەی سودی ڕیبا بۆ خەزێنەکانیان بەناوی یاساوە! ئێمە دەزانین ئەم وشانە ناگاتە دلی ئەوجۆرە کەسانە بەلام دەزانین کە ئەم وشانە ڕاست و دروستن و دلنیاین لەوەی بەختەوەری مرۆڤایەتی بەستراوە بە گوێ گرتن لێیان و کارپێکردنیان: ﴿ وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَىٰ مَيْسَرَةٍ وَأَن تَصَدَّقُوا خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٨٠﴾ ﴾ ( البقرة).

له ئیسلامدا کەسی نەبوو ڕاوو دو ناخرێت لەلایەن خاوەن قەرزەوە، یاخود لەلایەن دادگاو یاساوە، بەلکو چاوەڕێ دەکرێت تا کاتێك هەیبێت. پاشان کۆمەلگای موسولمان دەستبەرداری کەسی نەبوو نابێت کە قەرزی لەسەر بێت، بەلکو خوا داوا لە خاوەن قەرزەکە دەکات کە قەرزەکەی ببەخشێت – ئەگەر ئەم چاکەیەی ئەنجام دا ئەوا خێری بۆ خۆی و بۆ قەرزار تێدایە هەروەها خێری هەموو کۆمەلگای تێدایە ، ئەگەر نهێنی ئەو کارەی بزانیایە وەك ئەوەی کە خودا دەیزانێت! کە ئەویش ئەوەیە لە پوچەلّ کردنەوەی ڕیبا بەشێکی زۆری حیکمەتەکەی لە دەست دەدات کە ئەگەر خاوەن قەرز بەردەوام تەنگ بە بە قەرزار هەلّبچنێت بەر بینی بگرێت ، ئەویش نەبووەو ناتوانێت قەرزەکە بداتەوەن کارەکە لێرەدایە لە شێوازی شەرت و وەلّامەکەدایە بە چاوەڕی کردن تا کاتی هەبوون کە بتوانێتقەرزەکەی بداتەوە، هاوکات هانی دەدات بە بەخشینی قەرزەکەی یاخود بەشێکی لەکاتی دەست کورتیدا.

هەروەها لەدەقەکانی تری قورئاندا شەنس دەدات بە خاوەن قەرزی دەست کورت کە گشکی هەبێت لە زەکاتتدا بۆئەوەی قەرزەکانی بداتەوە و ژیانی بۆ ئاسان بکات، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلۡفُقَرَآءِ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡعَٰمِلِينَ عَلَيۡهَا وَٱلۡمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمۡ وَفِي ٱلرِّقَابِ وَٱلۡغَٰرِمِينَ وَفِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِۖ فَرِيضَةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴿٦٠﴾ ﴾ (التوبة). واتە: شایانی باسە، زەکات تەنها بەم جۆرە کەسانە دەدرێت: هەژاران، نەداران، کارمەندانی کۆکردنەوە و دابەشکردنی، نۆ موسولمان تا دلّیان زیاتر خۆش بکەیت، ئازادکردنی بەندەکان، قەرزدارەکان، بەکارهێنانی بۆ بانگەواز لە پێناوی خزمەت و بلّاوکردنەوەی ئاینی خوادا، وە بۆ ئەو ڕێبوارانەی کە پارەیان لیّ دەبرێت و دەستیان بە مالّ و سامانیان ناگات، بێگومان دابەشکردنی زەکات بەو شێوەیە ) فەرزە لە لایەن خوای گەورە وە لەسەر ئیماندا ران، بێگومان ئەو پەروەردگارەش تەواو زانایە لە

بەخشینی ماڵ و سامان و ئەو ڕێژەیەی کە دیاریکردووە بۆزەکات و ئەو بوارانەش کەتێیدا سەرف دەکرێت، هەروەها تەواویش دانایە لەهەموو ڕوویەکەوە .

ئەوانە خاوەن قەرزن کە قەرزەکانیان بۆ هەواو ئارەزوو ڕابواردن سەرف نەکردووە، بەلکو لەشتی چاك و پاکدا واتە بۆ پێویستی سەرفیان کردووە، دواتر باری گوزەرانیان ئالۆز بووەو توانای دانەوەیان نەبووە ! دواتر بەدواداچونێکی قول دێت بۆ ئەو وەحیەی کە دەرونی خاوەن ئیمان دەهەژێنێت، وە ئاواتە خوازە کە دەست لە هەموو قەرزەکە هەڵبگرێت، پاشان بچێتە ریزی ئەوانەی کە ڕزگاریان دەبێت لە ڕۆژی دواییدا وەك دەفەرموێت: ﴿ وَاتَّقُوا يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى اللَّهِ ثُمَّ تُوَفَّى كُلُّ نَفْسٍ مَا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٨١﴾ ﴾ ( البقرة).واتە: خەڵکینە ! لەسزاو تۆڵەی ڕۆژێك بترسن کە تێیدا دەگەڕێنەوە بۆلای خوای گەورە ، پاشان هەموو کەس پاداشتی کارو کردەوەی خۆی وەردەگرێت و ئەو خەڵکە هیچیان ستەمیان لێ ناکرێت .

ئەو ڕۆژەشی دەگەڕێتەوە بۆلای خودا، پاشان هەمو کەس پاداشتی ئەوەی کە ئەنجامی داوە وەریدەگرێت لە ڕۆژێکی سەختتدا، ئەوە کاریگەری هەیە لەسەر دلی ئیماندار، دیمەنەکەی لە وێژدانی ئیمانداردا ئامادەگی هەیە، لەگەڵ ترسان لەوەستان لەبەردەستی گەورەردگار لەو ڕۆژە سامناکەدا کە دەروون و کەسایەتی مرۆڤ دەهەژێنێت !

ئەوە بەدواداچونێکە لەگەڵ شێوازی مامەڵەکاندا یەك دەگرێتەوە، شێوازی پێدان و وەرگرتن، شێوازی دەستکەوت و پاداشت، ئەوە خاوێن کردنەوەیەکی گەورەیە بۆ ڕابردوو ئەوەشی کەتێیدابووە، چەندە شایستەیە کەدلی ئیماندار ترسی لێی هەبێت و خۆی لێ بگارێزێت. تەقوا گاسەوانێکی جێگیرکراوە لەقولای ویژداندا، ئیسلام لەوێدا جێگیری کردوە دل توانای دەرباز بوونی نیە لێی چونکە لەو قولاییەدایە ئەوە ئیسلامە ..

ڕیبازێکی بەهێز.. سۆزو بەزەیی خودا بۆمرۆڤ.. ڕێزگرتنی خودایە بۆ ئینسان، چاکەیەك کە مرۆڤایەتی لێی گەرتەوازەبوون، دوژمنەکانی خوداو دوژمنەکانی ئینسان ڕێگری لەنزیك بوونەوەی دەکەن![151]

**بەکورتی:**

- کڕین و فرۆشتن ئالوویری پارە بە پارە لەسەربنەمای ڕازیبونی هەردولا یاخود دەستاو دەستی پارەیە لەبری کالایەك وەك ئەوەی لەسەر ڕاهاتوین، بە شێوازێکی ڕێگەپێدراو، بەلام ڕیبا زیادەیەك دەخرێتە سەر دەست مایە ئیتر زۆر بێت یاخود کەم ، ئیتر بخرێتە سەرقەرز یاخود کالای فرۆشراو.
- ڕیبا لەسەرجەم ئاینە ئاسمانیەکاندا حەرام کراوە (ئیسلام ، جولەکە ، گاور) هۆکاری حەرام کردنەکەشی: دوژمنایەتی دەخاتە نێوان تاکەکانەوە،هەستی هاوکاری و یەکتر تەواوکردن لەناودەبات، هەروەها هۆکارە بۆ دروستبونی چینێکی خۆشگوزەران لە نێو کۆمەلگەدا لەسەر حیسابی ئەوانی تر بە بێ ماندوو بوون، وە دەستکەوتی توانا مرۆییەکان دەگەڕێتەوە بۆلای ئەو.
- زۆربەی هۆکارو حیکمەتەکانی قەدەکردنی ڕیبا ئاماژەی پێکراوە چەند نمونەیەك لەوانە:

- وەرگرتنی مالی خەلك بەبێ بەرامبەر، پێشتر ئاماژەمان بە جیاوازی ڕیباو کڕین و فرۆشتن کرد، کەئەوەش جیاوازییەکی ناتەندروستە.
- وەرگرتنی ڕیبا ڕێگرە لەبەردەم خەلکدا بۆ گرتنەبەری نارەحەتیەکانی کارو کەسابەت و سەرقال بوون پێیەوە، چونکە خاوەن سامان کە ڕاهات لەسەر وەرگرتنی ڕیبا ئیتر کارو کەسابەتی لەسەر سوك دەبێت، بەومانایەی پێویستی بە هەولدان نامێنێت

١٥١- المرجع السابق، ص: ٣٣٢،٣٣٣.

بۆدەستكەوتنی بژێوی ژیان، ئەم حالەتـە لـە نێـو خەڵكدا بـلاو بویـەوە دەبێتـە هۆكـاری بـڕینی دەسـتكەوتی خـەڵك، چـونكە بەرژەوەنـدی دونیـاو مرۆڤـەكان بـە بازرگـانی و پیشەسازی و ئاوەدان كردنەوە نەبێت نایەتەدی.

- ڕێگرو هۆكارە بۆ بنەبڕكردنی نواندنی چاكە لـەنێوان خەڵكدا لـە ڕێگـەی پێـدانی قەرزەوە.

- واباوە خاوەن خاوەن قەرز دەبێـت دەوڵەمەنـد بێـت و قـەرزاریش دەبێـت هـەژار بێت، ئەگەر ڕیبا ڕێگەی پیٚ بدرێت ئەوا دەوڵەمەند بەردەوام داهـاتی هـەژارەكان بۆخـۆی دەبات لە ڕێگەی پێدانی قەرزەوە و وەرگرتنی زیاددە بە بیٚ بەرامبەر.



## گومانی سی

### جولەکەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە گوایە مەحالە سڕینەوە(النسخ) ڕوو بدات لە ڕوانگەی عەقڵ و نەقڵیشەوە:

**ناوەڕۆکی گومانەکە:**

هەنێك لە جولەکەکان بانگەشەی مەحالێتی ڕوودانی نەسخ دەکەن لە ڕووی عەقل و نەقلیشەوە، بۆیە ئەوان نەسخی حوکمەکانی تەورات ڕەت دەکەنەوە، هەروەها نکولیان لە پێغەمبەرایەتی ( عیسی) سەلامی خودای لەسەربێت و (محمد )" سەلات وسەلامی خودای لەسەر بێت" دەکرد وە دەیانوت: موحەمەد ئەمڕۆ فەرمانێك دەکات بە هاوەڵەکانی سبەینێش قەدەغەی دەکات لێیان !

**ڕێگاکانی پوچەڵ کردنەوەی گومانەکە:**

یەکەم: لەرووی ژیریەوە هیچ شتێك ڕێگر نیە لە ڕێگەگرتن لە نەسخ، خودا خۆی کاری بەندەکانی بەڕێوە دەبات، وە بەندەکانی لە ڕێگەی نەسخەوە تاقی دەکاتەوە.

دووەم: لەمەسەلەی نەسخدا پێشبینی بەرژەوەندی کەسەکان نەکراوە و حیکمەتی زۆری تیایە.

سێیەم: نەسخ و بەدائە دوو شتی جیاوازن.

چوارەم: ڕوودانی نەسخ لە تەوراتدا وەلامە بۆ جولەکەکان لەسەر بانگەشەیان و لەسەر ڕەت کردنەوەیان بۆ ڕوودان و ڕاست و دروستی ئەو کارە.

**درێژەی بابەتەکە:**

**یەکەم: لە رووی ژیریەوە هیچ ڕێگریەک نیە لە ڕوودانی نەسخ، خودای گەورەش بەندەکانی بەوە تاقی دەکاتەوە.**

زۆربەی موسوڵمانان هاوڕان لەسەر ڕێپێدراوی نەسخ لە حوکمەکانی خودادا، بە هۆی ئەو حیکەتە زۆرانەی کە تێیدایە، بێگومان سەلەفی سالح کۆدەنگن لەسەر ڕوودانی نەسخ لە شەریعەتداو ڕێگەپێدانی، کۆمەڵێك لە لە موتأخرین ئەوە ڕەت دەکەنەوە، لەوانە:(أبوالمسلم الاصفهاني) موفەسیر کەوتویەتی: هیچ شتێك لەوبارەیەوە لە قورئاندا ڕووی نەداوە، ئەوەش وتەیەکی لاوازی ڕەتکراوەیە و سەلەف کۆدەنگن لەسەر ڕوودانی نەسخ لە شەریعەتدا بەبەلگەوە، بەهەمان شێوە کۆمەڵێك لە جولەکە ئەوەیان ڕەت کردەوەتەوە، ئەوەشی کە پالی پێوەناون لەسەر قسەوباس کردن لەسەر مەسەلەی نەسخ بێ باوەڕی و یاخی بونیانە، چونکە لە ڕووی ژیریەوە هیچ بەلگەیەك نیە لەسەر ڕێگرتن لە نەسخ لە حوکمەکانی خودادا (جل جلالە)، چونکە هەرچۆن خۆی بیەوێت حوکم دەکات، هەروەك ئەوەی هەر کارێکی بوێت ئەنجامی دەدات، بۆیە دەفەرموێت:

﴿ ۞ مَا نَنسَخۡ مِنۡ ءَايَةٍ أَوۡ نُنسِهَا نَأۡتِ بِخَيۡرٖ مِّنۡهَآ أَوۡ مِثۡلِهَآۗ أَلَمۡ تَعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ﴿١٠٦﴾ أَلَمۡ تَعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٍ ﴿١٠٧﴾ ﴾ ( البقرة). واتە: هەر ئایەتێك بسڕینەوە و لە بیری پێغەمبەری بەرینەوە یاخود بیخەینە بارو دۆخی فەرامۆشیەوە و پشتگوێی بخەین ، چاکتر ، یاخود وێنەی ئەو رەوانە دەکەین ، مەگەر تۆ نازانیت و دڵنیانیت لەوەی کە خوای گەورە دەستەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە (ئەمەش بۆ بەرپەرچ دانەوەی گومان و زمان بەدی جولەکە بوو کە رەخنەیان لە قورئان و حوکمەکانی دەگرت کاتێ کە بە قۆناغبەندی شتێکی حەرام بکردایە) .* مەگەر تۆ نازانیت و دڵنیا نیت کە ئەو خوایەی ئەم قورئانەی رەوانە کردووە

خـاوەنی ئاسمانـەکان و زەوی یـە وە ئێـوە جگـە لـەو خوایـە هـیچ پشـتیوان و یاریـدە دەرێکتان نیە تا لە کـاتی تەنگانـەدا فریاتـان بکـەوێت و لـە پـیلان و نەخشـەی ناحـەزان بتانپارێزێت.

خودای گەورە ڕێنمونی بەندەکانی دەکات بەوەی کە خۆی بەڕێوەبەرە لە کـارو بـاری بەندەکانیدا و ئەوەشی کـەخۆی مـەیلی لەسـەرە، دروسـتکردن و فـەرمان کـردن هـەر بـۆ خۆیـەتی، وەك ئـەوەی دروسـتی کـردوون بـەو شـێوازەی کـە ویسـتویەتی، بەختـەوەری دەکـات ئـەوەی ویسـتی لەسـەربێت، بەدبـەختی دەکـات ئـەوەی ویسـتی لەسـەر بێـت، نەخۆشـی دەخـات ئـەوەی خـۆی بیـەوێت و بەویسـتی خـۆی ئـەوەی بیـەوێت موەفـەقی دەکات، سەرشوڕی دەکات ئەوەی کەبیەوێت، بەهەمان شێوە حوکمی بەندەکانی دەکـات بەو شێوازەی کە ویستی لەسـەرە، واتـە بەویسـتی خـۆی شـتەکان حـەڵاڵ دەکـات و بـە ویستی خۆی حەرامیشی دەکات.

ڕێگە بەکارەکان دەدات بەویستی خۆی و ڕێگریشی لیّ دەکات بەویستی خۆی ، تـەنها ئـەوە چـۆنی بوێـت حـوکم دەکـات، هـیچ بەربەسـتێك نیـە لەبـەردەم چەسـگاندنی حوکمەکانیدا، پرسیاری ئاراستە ناکرێت لەسەر ئەوەی کە ئـەنجامی دەدات بـەلکو خۆیـان لێپرسینەوەیان لیّ دەکرێت، پاك و بێگەردی بۆ ئـەو کـە بەنـدەکانی تـاقی دەکاتـەوە لـە ئەندازەی گوێڕایەلیان بۆ پێغەمبەرەکانیا لە ڕێگەی نەسخەوە، فەرمان بـە شـتێك دەکـات کە بەرژەوەندیـەکی تێدایـە کـە خـۆی دەیزانێـت، پاشـان ڕێگـری لەوشـتە دەکـات لەبـەر ئەوەی کە خۆی دەیزانێت، گوێڕایەلی تەواو لە جیّ بەجیّ کردنی فەرمانەکانیدایـە لەگـەڵ شـوێن کـەوتنی پێغەمبەرەکـەی لـە بـاوەڕکردن و ڕاسـت پێزانـی ئەوشـتانەی هـەوالیان پێداوەو شوێن کەوتنی فەرمانـەکانیان و وازهێنـان لەوشـتانەی کـە قەدەغـەیان کـردووە، خودا (جل جلاله) لە توانایدایە کـە ئایـەتی چەسـپاو (المحکم) بهێنێـت و پـێش ئـەوەی ئایەتی مەنسوخ دابنێت، بەلام سەرەتا ئەمـەیان دەهێنێـت و پاشـان دەیگۆڕێـت بـەویان،

هەر خۆی شارەزایە بەسەرەتاو کۆتایی ، ئەو دەزانێت لە ئێستا دا چی بەرژەوەندی بەندەکانی تێدایەو لەکاتێکی تردا یی بەرژەوەندیانی تێدایە.وە هەرئەو دەزانێت لەئێستادا چی گونجاو شایستەیە بۆ بەندەکانی کە ئەنجامی بدەن و چیش گونجاوە بۆکاتێکی تر.

مەگەر نابینیت کە نەخۆشێك دەچێتە لای پزیشك پێی دەڵێت: گۆشت و ماسی مەخۆ ، شیر مەخۆ، پاش ماوەیەك نەخۆشەکە دێتەوە و پزیشکەکە پێی دەڵێت: گۆشت و شیر بخۆ بەلام ماسی مەخۆ، پاشان ماوەیەکی تریش ڕێگە بە خواردنی هەموو ئەمانە دەدات، نەخۆشەکەش بە گوێی دەکات و ملەجەڕەناکات، بەتایبەتی ئەگەر بزانێت پزیشکەکە زیرەك و متمانە پێکراوەئەوا فەرمانەکانی بە بێ دوو دلی جێ بەجێ دەکات بە دلێکی ئاسودەوە، بەرزو پیرۆزی بۆ خودای بێ هاوتا لە ئاسمانەکان و زەوییدا هەخۆی داناو بە هێزە.

لەم حالەتەدا وەلامێکی گەورەو کاریگەری تێدایە بو بۆ جولەکەو هەڵوەشاندنەوەی بانگەشەکەیان بەنەفرەتی حودا بکەون کە دەلێن: مەحالە نەسخ رویدابێت، لەرووی عەقلەوە ئەمەش بە هۆی بێ باوەڕی و یاخی بونیانەوەیە، بەنیسبەت ڕزنەدانی لە رووی نەقلەوە ئەوە خۆ لالّ کردن و وبوهتان و قسە هەڵبەستنە.

ئایەتەکانی پێشوو لەگەلّ ئەوەی کە هەوال و گوتارێکە لە خوداوە بۆ پێغەمبەرەکەی " سەلات و سەلامی خودای لەسەر بێت" لە رووی هەوالدان بە گەورەیی خودا، لە هەمان کاتتدا بە درۆ خستنەوەی ئەو جولەکانەشی تێدایە کە ڕوودانی نەسخ ڕەت دەکەنەوە لە حوکەکانی تەوراتدا، وە پێغەمبەرایەتی عیسا و موحەمەدیش ڕەت دەکەنەوە بەوەی کەهێناویانەلەلایەن خوداوە بەو گۆڕانکارییەی کە خودا گۆڕیویەتی لە حوکمەکاتی تەوراتدا، خودا هەوالی پێداون کە خۆی خاوەنی ئاسمانەکان و زەوییەو خۆشی خاوەن داریەتیان دەکات، بەندەکانیشی ئەهلی مەملەکەتەکەی ئەون گوێڕایەلی کردنیان بۆی لەو

ڕووەوەیە کە ببیستن و گوێڕایەڵی بن بۆ فەرمانەکان و قەدەغەکراوەکانی، بە ویستی خۆی فەرمانیان پێ دەکات و بەویستی خۆشی شتیان لێ قەدەغە دەکات، لەگەڵ نەسخی هەر شتێك بیەوێت و چەسپاندنی هەرشتێك ە خۆی بیەوێت.

**دووەم:لەنەسخکردندا بەرژەوەندی خەڵک لەبەرچاو گیراوە و حیکمەتی زۆریشی تێدایە.**

گۆڕانکاری جوزئی بە پێی پێداویستی حاڵەتەکان – لەسەردەمی پێغەمبەرایەتیدا لە بەرژەوەندی مرۆڤایەتیە و بۆدەستەبەرکردنی چاکەیەکی گەورەتر کە پێویستی پێیەتی لە قۆناغەکانی ژیانیدا، خودا مرۆڤەکانی دروستکردوەو پێغەمبەرانی ڕەوانەکردوە و ئایەتەکانیشی ناردوەتەخوارەوە، ئەو جێ بە جێ کاری ئەم تەقدیراتانەیە، خۆ ئەگەر ئایەتێکی نەسخکردەوە دەیهاوێتە جیهانی لە بیرکردنەوە ئیتر ئەگەر ئایەتیکی خوێندراویش بوبێت و حوکمێکی لە خۆی گرتنبێت، یاخود ئایەتێك بێت بە واتای نیشانەو دەستەلاتی خۆی کە بە هۆکارێکی کاتی دادەنرێت پاشان دەپێچرچتەوە لادەبرێت، وەك ئەو موعجیزانەی کە پێغەمبەران هێناویانە، خودا گۆڕانکارییان تێدا دەکات ئیتر بە هێنانی لەو باشتر یاخود هاوشێوەی ئەو، هیچ کارێکیش بۆئەو مەحاڵ نیە،ئەو خاوەنی هەموو شتێکە لە ئاسمانەکان وزەوییدا، پاشان ئەم بەدواداچونانە دێنێتە پێشەوە.

﴿ ۞ مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ أَوْ مِثْلِهَآ ۗ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٠٦﴾ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿١٠٧﴾ ﴾ (البقرة).

لێرەدا گوتارەکە بۆئیماندارانەو بۆنی ئاگادارکردنەوەی لێدێت، وە بۆنی وەبیرهێنانەوە کە خودا گشتگیرو یاریدەدەریانە و جگە لەو هیچ گشتگیرو یاریدەدەرێك نیە، دەکرێت ئەمە هۆکاری فریو خواردنی هەندێکیان بێت بەو شالاوە چەواشەکاریانەی کە جولەکە پێی هەڵساوە لەگەڵ شلەژاندنی بۆچونەکانیان بەبەڵگەی بنەماکایان کەوای

کردوە دەست پێشخەرین لە ئاراستە کردنی پرسیار لە پێغەمبەر " سەلات و سەلامی خودای لەسەربێت" کە یەك ناگرێتەوە لەگەڵ متمانە بە خۆبوون و یەقیندا، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەلەم ئایەتەی تردا هاتوە کە زۆربەی نارەزای و ئاگادارکردنەوەی تێدایە:

﴿ أَمْ تُرِيدُونَ أَن تَسْـَٔلُوا۟ رَسُولَكُمْ كَمَا سُئِلَ مُوسَىٰ مِن قَبْلُ ۗ وَمَن يَتَبَدَّلِ ٱلْكُفْرَ بِٱلْإِيمَـٰنِ فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿١٠٨﴾ ﴾ ( البقرة). واتە: ئەی هاوەڵانی محمد ئێوەش دەتانەوێت داخوازی ناقوڵا لە پێغەمبەرەکەتان بکەن وەکو چۆن قەومی موسا لە پێشتردا رۆژانە پرسیاریان دەکردو داخوازی جۆراو جۆریان هەبوو ، جا ئەوەی ئیمان و باوەرەکەی بگۆرێتەوە بە کوفرو بێ دینی و نافەرمانی خوا ، ئەوە بێگومان رێگەو رێبازی راست و دروستی لە دەست داوە .

ئەو نارەزاییە لە چواندنی هەندێك لە ئیمانداراندایە بەگەڵەکەی موسا لە رەخنەگرتن و داوای سەیروسەمەرەو بەلگەو پیاهەڵدانیان بە پێغەمبەرەکەیان هەرکاتێك فەرمانێکی پێ سپاردبن وەك ئەوەی لە زۆر جێگای قورئاندا چیرۆك و بەسەرهاتیانی تێدا باسکراوە.

لە دەرئەنجامدا ئەوە ئاگادار کردنەوەیە بۆیان، ئەوە گومرابونە بە گۆرینەوەی بێباوەری بەباوەر، ئەو دەرئەنجامەی کە بەنو ئیسرائیل پێی گەشتن، ئەوە دەرئەنجامێکە کە جولەکە ئاواتە خوازە بە پەڵکێش کردنی موسوڵمانەکان بۆی.[١٥٢]

وە فەرمایشتی خودا کەدەفەرموێت : ﴿ نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ أَوْ مِثْلِهَآ ﴿١٠٦﴾ ﴾ (البقرة). وەلامی (جوابی) شەرتەو کردویەتی بە وەلامێك کە دەرك بە هەردوو حالەتی ( النسخ والانساء یان النسئ ) بکرێت کە لە دوو حالەت بەدەرنین، ئەوانیش هێنانی شتێکە لەکاتی نەسخدا کەلە مەنسوخەکە باشتر بێت یان هاوتای بێت.

---

١٥٢ – في ظلال القران ، سيد قطب،مرجع سابق، ج:١، ص: ١٠٢.

لێرەدا هەردولایەنی باشتربون و هاوشێوە بوون کۆکراەتەوە تاوەکو زیهنی بیسەر بگەیەنێتە هەموو مەبەستە دوورەکانی ئەم دوو ئایەتە.لایەنی چاکێتی یەکە لەوەدایە گشتگیرەو گونجاوە لە گەڵ بەرژەوەندی خەڵکدا، یاخود زیانێکیان لەکۆل دەکاتەوە، یاخود شتێکیان بۆ دەستەبەر دەکات کە دەرئەنجامێکی باشی هەبێت، یاخود شتێك کە پاداشتێکی زۆری تێدابێت، یاخود نواندنی نەرمونیانی و میهرەبانیە لەکاتی نارەحەتیدا بەرامبەر ئەوانەی تەکلیفیان لەسەرە، ئەکرێت لابردنی نارەحەتی بەرژەوەندی زیاتری تێدابێت، مەبەست لەوەنیە کە هەمو شێوەیەك لە شێوە پێویست کراوەکان لە حالەتی (النسخ الانساء) بریتی بێت لەچاکەو هاوتای پێکەوە، بەلکو مەبەست ئەوەیە هەر شێوەیەك لەو شێوانە خالی نیە لە بەدەست هێنانی چاکە یان هاوتای، بۆیە –أو ی هێناوە لە فەرمایشتەکەدا: (بِخَيْـرٍ مِنْهَـا أَوْ مِثْلِهَـا) هەردوو شتەکە بەسودن لەگەڵ دروستبونی هەردوکیان.

لێکۆلینەوە لەو شتانە بەدەستی خۆتان بۆئەو مەبەستەش باکۆمەلێك نمونە بهێنینەوە بۆئەوەی بمانگەیەنێتە مەبەست و پێویستمان بەشتی تر نەبێت:

- نەسخ شەرعیە لەگەڵ هێنانی باشتر لەخۆی وە نەسخی تەورات و ئینجیل بەئیسلام.
- نەسخ شەریعەتە لەگەڵ هێنانی هاوشێوەی خۆی وەك نەسخی شەریعەتی هود بەشەریعەتی سالح، چونکە هەریەکێکیان سودی هاوشێوەی تێدایە بۆ ئەویتر لە دیاریکردنی ئەحوالی دوو نەتەوەکە عادەت و داب و نەریت و رەفتاریان لەیەکەوە نزیکترە، هود پێغەمبەر سەلامی خودای لەسەربێت نەهی لێکردن کە لە شوێنە بەرزەکاندا (قوله) شوێنی رابواردن دروست بکەن، بەلام سالح پێغەمبەر سەلامی خودای لەسەربێت نەهی ئەو کارەی لێ نەکردوون بە لکو نەهی لێکردوون کە زیان بە حوشترەکە بگەیەنن –کەیەکێك بوو لە موعجیزەکانی سالح پێغەمبەر سەلامی خودای لەسەربێت

● نەسخی حوکمێك لە شـەرعەتدا بەباشـترکردن وەك نەسـخی کەراهـەتی عـارەق بـە حەرامکردنی بە یەکجاری کە لە قورئاندا ئاماژەی پێکراوە و دەفـەرموێت: ﴿ ۞ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ ۖ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا ۗ وَيَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ ٱلْعَفْوَ ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْـَٔايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١٩﴾ ﴾ (البقـرة)، واتـــە: ئەی محمد پرسیارت لێدەکەن درەبارەی عـارەق و قومـار ، کـە حـوکم و بڕیـاری خـوای گەورە چیە دەربارەیان ، پێیان بڵێ ئەو دوو شـتە تـاوان و گونـاهی گـەورە و قێـزەونن ، هەرچەندە هەندێ سودیشیان تێدابێت بۆ هەندی کەس ( وەکو دوکان و بازار گەرم کـردن و بازرگـانی کـردن پێیـان ) بـەڵام دڵنیـابن کـە زیانیـان زۆر زیـاترە لەسـودیان ( ئـەوەش قوناغێك بووە لەقوناغەکانی بەرەو حـەرامکردنیان ) هـەروەها پرسـیارت لێدەکـەن: ئـەی چی ببەخشـین لـەماڵ و سـامان ؟ پێیـا بڵـێ: هەرچـی زیـادەو پێویستیان نیـە دەتـوانن بیبەخشن ، ئا بەو شێوەیە خوای گەورە بەڵگەو فەرمانەکانتان بۆ روون و ئاشکرا دەکـات بۆ ئەوەی بیربکەنەوە ( واز لەو شتانە بێنن کە زیانیان زۆرترە لەسودیان ، وەبەخشینتان زۆر بێت و چی بۆ هەردوو جیهانتان چاکە ئەنجامی بدەن ) . ئەم سڕینەوەیە باشـترە لـە ڕووی بەرژەوەندیەوە بەبێ نەرمی نواندن، لەوانەشە هەنـدێك جـار نـەرمی نوانـدن باشـتر بێت لەکاتی هەڵوەشاندنەوەی حوکمێکی تردا، وەك نەسـخ کردنـی حـەرامێتی خـواردن و خواردنەوەو جوت بوون لەگەڵ هاوسەردا لەشەوانی ڕەمەززان لە دوای ڕۆژو شـکاندن بـەم ئایەتـەی تـر کەدەفـەرموێت: ﴿ أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمْ ۚ هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ ۗ عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتَانُونَ أَنفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنكُمْ ۖ فَٱلْـَٔـٰنَ بَـٰشِرُوهُنَّ وَٱبْتَغُوا۟ مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمْ ۚ وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ مِنَ ٱلْفَجْرِ ۖ ثُمَّ أَتِمُّوا۟ ٱلصِّيَامَ إِلَى ٱلَّيْلِ ۚ وَلَا تُبَـٰشِرُوهُنَّ وَأَنتُمْ عَـٰكِفُونَ فِى ٱلْمَسَـٰجِدِ ۗ تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَقْرَبُوهَا ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ ءَايَـٰتِهِۦ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿١٨٧﴾ ﴾ ( البقـرة)،. واتـە: حـەڵاڵ کـراوە بۆتـان

لەشـەوانی ڕەمەزانـدا ، سـەرجێیی بکـەن لەگـەڵ هاوسـەرەکانتاندا ، چـونکە ئـەوان وەك پۆشاك وان بۆ ئێوەو ئێوەش وەك پۆشاك وان بۆ ئەوان ، خوای گەورە دەیزانی کە ئێـوە دوو دڵ بوون لەسەر جێیی و خـەوتن لەگـەڵ هاوسـەرەکانتاندا ، بۆیـە لەوحاڵـەتان بـوراو لێتان خۆش بوو ، کەواتە لە ئێستە بـەدواوە دەتـوانن بچـنە لایـان و داوا لـەخواش بکـەن کەنـەوەی چـاك و دینـدارتان پـێ ببەخشـێت ، ئینجـا بخـۆن و بخۆنـەوە هـەتا سـپێدەی بەرەبـەیان دیـاری دەدات و هێڵـی سـپی لـە ئاسـۆدا لـەهێڵی ڕەش جیادەبێتـەوە پاشـان دەست لەخواردن و خواردنەوەو سەرجێیی هەڵگرن و بـەڕۆژوبن هـەتا شـەودادێ و بـانگی شێوان دەدەرێت ، بەڵام ئەگەر نیەتی ( اعتکاف ) و مانـەوەتان لەمزگەوتەکانـدا هێنـابوو بۆ زیادە خوا پەرستی ئەوە دەبێ نزیکی هاوسەرەکانتان نەکەون لەو ماوەیەدا ، ئائەوانە سنورەکانی خوای گەورەن ( بۆ تاقیکردنەوەی ئێوە و بەدەست هێنـانی پاداشـت ) بـۆی دیاری کردوون ، نزیکی ئەو سنورانە مەکەون و سنورەکان مەبەزێنن ئا بەوشێوەیە خوای گەورە ئایەت و ڕێنمویەکانی خۆی ڕون دەکاتەوە بۆ خەڵکی بۆ ئەوەی پارێزکاری بکەن و تەقوادار و دینداربن .

- .لە فەرمودەکەدا دەفەرموێت : (ففرحوا بها فرحا شـديدا)[١٥٣] واتـە: زۆر دلخـۆش بوون بەم ئایەتە.

- نەسخی حوکمێك لەشەریعەتدا بە حوکمێکی هاوشێوەی خۆی وەك نەسخ کردنـی وەسیەت بۆ پێدانی بەش بە دایك وباوك وەك کەس وکـار، واتـە مردووەکـە پـێش ئـەوەی بمرێـت وەسـیەتی دەکـرد کـە پـاش مردنـی لـە سـەروەتەکەی بەشـێکی بـدرێت و چـەنی بدرێتێ، ئەمە گۆڕا بەدیاریکردنی بەش بۆ هەریـەکێکیان لەلایـەن خـوداوە، بێگومـان ئـەم دوو حوکمە هاوشێوەن لەڕووی دابەش کردن و وەرگرتنی بەشەوە.

---

١٥٣- أخرجه البخاري في صحيحه ، كتـاب الصـوم، بـاب : قـول الله تعـالى: (أحـل لكـم ليلـة الصـيام الرفـث إلى نسائكم) (البقرة /١٨٧) (١٨١٦).

نمونەیەکی تر نەسخ کردنی واجب بوونی پەنجا نوێژ بە پێنج نوێژ لەگەڵ مانەوەی خێرو پاداشتی پەنجا نوێژەکە، ئەم دوو حالەتە لە ڕووی خێرو پاداشتەوە هاوشێوەی یەکترن.

نمونەیەکی تریش نەسخ کردنی ئایەتی: ﴿ أَيَّامًا مَّعْدُودَاتٍ ۚ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ۚ وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ۖ فَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُ ۚ وَأَن تَصُومُوا خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١٨٤﴾ ﴾ ( البقرة)، واتە: ڕۆژ و گرتنەکەش چەند ڕۆژێکی دیاری کراوە ( کە مانگی ڕەمەزانی پیرۆزە ) خۆ ئەگەر کەسێك نەخۆش بوو ، یان لەسەفەردابوو ، بابەئەندازەی ئەو ڕۆژوانەی کەبۆی نەگیراوە ، لەڕۆژانێکی تردا بیانگرێتەوە ، ئەوانەش کەڕۆژوگرتن بۆیان ئاسان نیە ( لەبەر پیری یان نەخۆشی درێژخایەن ) ئەوە با لەباتی هەرڕۆژێك ژەمێك خواردن ببەخشن بە هەژارێك ، ئەوەی زیاتر ببەخشێت ، ئەوە باشترە بۆی ، بێگومان ئەگەر بتوانن بەڕۆژووبن ئەوە چاکترە بۆتان چونکە پاداشتی ڕۆژوو و بێ سنورە ئەگەر بزانن و دەرکی پێبکەن . خوای گەورە لەفەرمودەیەکی قودسیدا دەفەرموێت ( الصوم لي وانا اجزي بة) واتە ڕۆژو بۆ منەو ریاو فێڵی تێدا ناکرێت ، وە من خۆم دەزانم چۆن پاداشتی ڕۆژوەوان دەدەمەوە .

بەم ئایەتانە: (وَأَنْ تَصُومُوا خَيْرٌ لَكُمْ) (البقرة) وە ئایەتی :

﴿ شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِّنَ الْهُدَىٰ وَالْفُرْقَانِ ۚ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ۖ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ۗ يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ وَلِتُكْمِلُوا الْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُوا اللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَاكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٨٥﴾ ﴾ (البقرة).

واتە: مانگی ڕەمەزانیش ئەو مانگە پیرۆزەیە کە قورئانی تێدا نازڵ کراوە ، قورئانێکی هیدایەت بەخش و ڕێنموکارە بۆ سەرجەم خەڵکی ، بەڵگەی زۆری تێدایە لەسەر ڕاستی و

دروستی پەیامەکەی ، جیاکەرەوەی حەق و ناحەق و ڕەواو ناڕەوایە ، جا هەرکەسێك لەئێوە مانگی یەك شەوەی ڕەمەزانی بینی یان هەواڵی بینینی پێدرا پێویستە ئەو مانگە بەڕۆژوبێت ، ئەوەش کەنەخۆشە ، یان لەسەفەردایە ، بالەرۆژانی تردا ئەو رۆژوانە بگرێتەوە کە لەڕەمەزاندا بۆی نەگیراوە ، لەڕاستیدا خوای گەورە کار ئاسانی بۆ ئێوە دەکات و نایەوێت فەرزەکانتان لەلا قورس و سەنگین بکات ، جا هەوڵ بدەن ئەو مانگە دیاریکراوە بەڕۆژوبن ، هەرگیز گەورەیی خواو سوپاسگوزاری ئەو زاتە فەرامۆش مەکەن کەلە نیعمەتی هیدایەت بۆ ئەم ئاینە پیرۆزە جوانە بەهرەمەندی کردوون، کە مایەی بەختەوەریتانە لە هەردوو جیهاندا . سرودی جەژن: ﴿ الله أكبر، الله أكبر، الله أكبر، لا اله الا الله و، الله أكبر، الله أكبر و، لله الحمد ﴾بەجێهێنانی ئەو فەرمانە پیرۆز و بەنرخەیە .

ئەم دوو حوکمە هاوشێوەن لە گشت ڕاست کردنەوەی ئەوەی کە ڕۆژو گرتنەکە باشترە لە پێدانی فدیە واتە کەفارەتەکەی.

- (إنساء) بەواتای دواخستن لە شەریعەتدا لەگەڵ هێنان و دابەزاندنی لەوباشتر، وەك دواخستنی هاتنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام لە کاتێکدا دینەکانی تری دادەبەزاند و پێشی دەخستن لە ڕووی ناردنەوە بۆ گەلانی پێش ئیسلام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو ئاینانە هەریەکەیان خێرو چاکەی ئەو گەلانەی تێدابووە کە بۆی ڕەوانەکراوە و گونجاو بووە بۆ سەردەمی خۆی، چونکە شەریعەت بە شێوازێك دەنێردێت کە گونجاو بێت لەگەڵ ئەحوالیاندا بە جۆرێك سەرجەم مرۆڤەکان ئامادەگی وەرگرن بۆ قبولکردنی کۆتا شەریعەت کە دینی خودایە، لێرەدا باشتر بوون لە هەندێك ڕووەوە ڕێژەییە. واتە بە ڕێژەی جیاواز سەرجەم ئاینە ئاسمانیەکان باش بوون بەلام ئاینی ئیسلام باشترینە.
- دواخستنی شەریعەت واتە دواخستنی کاتەکەی لەگەڵ بوونی ئیرادەی خودا بە هاتنی لە کاتێکی دیاریکراودا لەگەڵ هێنانی هاوشێوەکەی وەك دواخستنی شەریعەتی عیسا سەلامی خودای لەسەربێت لەهەمان کاتیشدا ناردنی شەریعەتی موسا سەلامی

خودای لەسەربێت کە ئەمەیان باشتر بووە لە ڕووی گشتگیری لەسەرجەم ئەو شتانەدا کە گەلێك پێویستی پێی بووە.

- (إنساء) بەواتی دواخستنی ئەو حوکمەی کە جێگەی مەبەستە لەگەڵ هێنانی حوکمێکی لە خۆی باشتر، وەك دواخستنی حەرامکردنی عارەق لەگەڵ دابەزاندنی حوکمی کەراهەت و حەرامکردنیشی تەنها لەکاتی نوێژەکاندا، بێگومان دابەزاندنی حوکمی کەراهەت باشترە لە لە حەرامکردنی یەکجاری ئەگەر لەو ڕوانگەیەوە تەماشا بکەین کە خەڵك شەیدای خواردنەوەی عارەقن و حەزیان لێیەتی، بەلام ئەم نەرمی نواندنە کاتیەو دواتر حوکمی دواخراو دەچەسپێنێت کە ئەویش حەرامکردنیەتی بە یەکجاری.
- دواخستنی شەریعەت بەواتای مانەوەی هەمان حوکم بەبێ نەسخ کردن بۆماوەیەکی دیاریکراو لەگەڵ هێنانی باشتر، واتە بەرژەوەندی زیاتری تێدابێت و فراوانتربێت و پاداشتیشی زیاتربێت بەلام لەگەلێکی تردا و بۆ سەردەمێکی تر.
- وازهێنان لە ئایەتێکی قورئان بەواتای مانەوی حوکمی ئایەتەکەو نەسڕینەوەی بۆکاتێکی دیاریکراو لەگەڵ هێنانی باشتر لەخۆی لە ڕوانگەیەکی ترەوە، واتە: بەرژەوەندی زیاتر لە خۆ بگرێت یاخود بەرژەوەندی وپاداشتیان هاوشێوەی یەکتربن، ەك حەرامکردنی عارەق تەنها لەکاتی نوێژدا لەهەمان کاتدا حوکمی کڕین و فرۆشتن حەرام دەکرێت لە ڕۆژی هەینی دا بەلام تەنها لەکاتی نوێژی هەینی دا.
- وازهێنان لەشەریعەت وەك بەواتای فەوتان و نەمانی وەك فەوتانی شەریعەتی ئادەم ونوح بە هاتنی شەریعەتی موسا کە فراوانترو باشتر بووە.
- وازهێنان لە شەریعەت بەواتایەکی تر هێنانی باشتر لەخۆی یاخود هاوشێوەی خۆی، وەك ئەو حوکمە کە بەخوارنی دە ژەم شیر مندال دەبوە مندالی شیری دواتر کەم کرایە بۆ پێنج ژەم پاشان واز لە هەردوکیان هێنرا و ئایەتی:

﴿ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَٰتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَٰتُكُمْ وَعَمَّٰتُكُمْ وَخَٰلَٰتُكُمْ وَبَنَاتُ ٱلْأَخِ وَبَنَاتُ ٱلْأُخْتِ وَأُمَّهَٰتُكُمُ ٱلَّٰتِىٓ أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَٰتُكُم مِّنَ ٱلرَّضَٰعَةِ وَأُمَّهَٰتُ نِسَآئِكُمْ وَرَبَٰٓئِبُكُمُ ٱلَّٰتِى فِى حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ ٱلَّٰتِى دَخَلْتُم بِهِنَّ فَإِن لَّمْ تَكُونُوا۟ دَخَلْتُم بِهِنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ وَحَلَٰٓئِلُ أَبْنَآئِكُمُ ٱلَّذِينَ مِنْ أَصْلَٰبِكُمْ وَأَن تَجْمَعُوا۟ بَيْنَ ٱلْأُخْتَيْنِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٢٣﴾ ﴾ ( النساء).

واته: ئەی گرۆی ئیمانداران ئێوە ئەم ئافرەتانەتان لێ حەرام کراوە کە بیانکەنە هاوسەرتان: دایکانتان ( دایکی خۆتان ، باوەژنەکانتان ) کچەکانی خۆتان ، خوشکەکانتان ( باوك و دایکی ، یان تەنها خوشکی باوکی ، یان دایکی ) پورەکانتان (خوشکانی باوك ) پورەکانی ترتان ( خوشکانی دایك ) برازاکانتان ، خوشکەزاکانتان هەروەها ئەو دایکانەی کە شیریان داونەتێ واتە خۆیان و خوشکە شیریەکانتان ، دایکی هاوسەرانتان ( خەسوو) ئەو کچانەی لە پیاوێکی ترن و ئێوە دایکیانتان هێناوە و چونەتەلایان ( واتە زڕ کچەکانتان ) خۆ ئەگەر نەچوبنە لایان پێش گواستنەوە ، تەڵاق دران و یان مردن ، ئەوە هێنانی کچەکانیان بۆتان دروستە و قەیناکا و گوناهبار نابن ، هەروەها حەرامە هاوسەری ئەو کوڕانەتان بێنن کە لە پشتی خۆتانن ( واتە بوکەکانتان ) هەروەها نابێت دوو خوشك پێکەوە بکەنە هاوسەری خۆتان بێجگە لەو حاڵەتانەی کە لە پێش ئیسلامدا هەبوون ، دڵنیاش بن کە خوای گەورە هەمیشە و بەردەوام بە نیسبەت ئیماندارانەوە تەواو لێخۆشبوو میهرەبان و دلۆڤانە... دابەزی بە شێوازێکی موتلەق، هەموشیان هاوشێوەی یەکترن لە چەسگاندنی مەسەلەی شیر پێدانـدا، کارەکە قورس نەکراوە لەسەر مرۆڤەکان ئیتر ژەمێك شیری دابێت یاخود دوو ژەم.

گوتراوە مەبەست لە لە بیرچون وازهێنانە، ئەوەش لەوکاتەدا وێناو ماناکەی دەگەڕێتەوە بۆ مانای (الانساء) کەبەواتای دواخستن دێت. وە مەبەست لە ئایەتی

{نَأْتِ بِخَيْرٍ مِنْهَا أَوْ مِثْلِهَا }( البقرة/١٠٦) ڕوونکردنەوەی ئەوپەڕی حیکمەت و دانایيەو وەلامێکە بۆ ئەوان کە گرنگ نیە بەلایانەوە کە شەریعەتێك نەسخ بکرێتەوە بەشەریعەتێکی تر یاخود حوکمێك لەشەریعەتێکدا بە حوکمێکی تر، ئەوە تانە نیە لەسەر عیلمی خودا و حیکمەت و پەروەردپارێتی ئەوەچونکە ئەو شەریعەت و حوکمێکی نەسخ نەکردووە و وازی لێنەهێناوە مەگەر گۆڕیبێتی بە باشتر و بەسود تر بۆیان یاخود هاوشێوەکەی دابەزاندبێت لە کات وساتێکی تایبەتدا.

بەهەمان شێوە دابەزاندنی هەر حوکمێکی دواخستبێت و پاش ماوەیەك ئاشکرای کردبێت ئیلا قەرەبوی ئەو دواخستنەی بۆ ئاشکراکردوون لەو ڕووەوە کە پێویستیەکانیان دابین بکات بە پێی بارو دۆخیان، ئەوە سیمای گەروەردگارێتیە چونکە ئەو دروستکراوەکانی بەڕێوە دەبات و بەرژەوەندیەکانیان بۆ دەرەخسێنێت لەگەڵ نواندنی سۆزو میهرەبانی بەرامبەریان ، ئیرادەی خوداش لەسەرجەم ئەو کات و ساتە جیاوازانەدا هەیەك شتە، کەئویش پاراستنی گرۆگرامی بونەوەرە لەگەڵ ڕێکخستنی ڕەفتاری مرۆڤەکان بە شێوازێك بیان پارێزێت لەلادان و گومرابوون بە پێی سەردەم و بارودۆخی نەتەوەکان تا ئەو کات و ساتەی کە کۆتا شەریعەتی بۆ ڕەوانەکردون کە ئەوە مەبەست و ئیرادەی سەرەکی خودابوە بۆ مرۆڤ، بۆیە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلْإِسْلَٰمُ ۗ وَمَا ٱخْتَلَفَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُ بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ ۗ وَمَن يَكْفُرْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿١٩﴾ ﴾ (ال عمران). واتە: بە ڕاستی دین و ئاینی پەسەند لای خوای گەورە تەنها ئاینی ئیسلامە ، کۆتا ئاین و کۆتا پەیام کە بەڕاستدانەری ئاینە پێشوەکانە بەتایبەتی ئاینی جولەکە و مەسیحی ، پێش دەستکاری کردنیان ، کەچی ئەوانەی کە کتێبی ئاسمانیان دراوەتێ جیاوازی و ڕای هەمە جۆر لە نێوانیاندا پەیدا بوو ، هەرچەندە زانیاری و زانستی تەواویان دەربارەی محمد ، وە ئیسلام پێدرا بوو ،

ئەمەش بە هۆی دنیا پەرستی و حەسودی و ستەم کردنیان لە نێو یەکتردا ، جا ئەوەی بڕوای بە ئایەت و فەرمانەکانی خوای گەورە نەبێت ، ئەوە خوای گەورە بە خێرایی حسابی لەگەڵ دەکات تا زوو لە دۆزەخ توندی بکات! ! هەروەها دەفەرموێت: ﴿ ۞ شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحًا وَٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ وَمَا وَصَّيۡنَا بِهِۦٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓۖ أَنۡ أَقِيمُواْ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُواْ فِيهِۚ كَبُرَ عَلَى ٱلۡمُشۡرِكِينَ مَا تَدۡعُوهُمۡ إِلَيۡهِۚ ٱللَّهُ يَجۡتَبِيٓ إِلَيۡهِ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِيٓ إِلَيۡهِ مَن يُنِيبُ ۝١٣ ﴾ ( الشورى)، واتە. کەچی ئەو خەڵکە ئەو فەرمان و بێدار کردنەوەیەیان فەراموش کرد و تەفرەقە و جیاوازی هەمە جوریان دروست کرد ، دوای ئەو هەموو زانست و زانیارییەی کە پێیان ڕاگەیەنرا ، هەمویشی بەهۆی ناکوکی ودنیا پەرستیانەوە ، جا ئەگەر بریار دادەی خوای پەروەردگارت نەبوایە ، کە تا کاتێکی دیاریکراو موڵەتیان دەدات ، ئەوە داوەری دەکرد لەنێوانیاندا و هەموو شتێکی یەکلایی دەکردەوە ، جا سەیر لەوەدایە ئەوانەی کە لە نەوەکانی داهاتودا پەیامی خوای گەورەیان پێ گەیی کەوتنە گومان و دوو دڵیەوە ، یاخود کەوتنە دروستکردنی گومان و دوودڵی . ( لەم سەردەمەدا بەئاشکرا دەبینین چۆن دەرون نەخۆش و ناحاڵیەکان ، کە هەندێکیان نەوەی کەسانی زانا و خواناسن بون ، لایانداوە و لە دەریای گومان و دوو دڵیدا دەژین ودژایەتی قورئان و ئیسلام دەکەن و کەوتونەتە داوی ناحەزانی ئەم دینەوە ) .[١٥٤]

**سێیەم: نەسخ و بەدائە دوو شتی جیاوازن.**

ئەوەی کەباسکرا هاوشێوەی (البداء) بۆ دەرکەوتن نیە، بەڵکو ئەوە گواستنەوەی بەندەکانە لە عیبادەتێکەوە بۆ عیبادەتێکی تر، یاخود لە حوکمێکەوە بۆ حوکمێکی تر،

---

١٥٤- التحرير والتنوير، الطاهر بن عاشور، رجع سابق، مج:١،ج:١،ص:٦٥٩،٦٦١.

في "حكم النسخ و مقاصده" طالع الوجه الثالث من الشبهة السابعة عشر،والوجه الثاني من الشبه الحادية والعشرين ، من الجزء الحادي عشر (سلامة القران الكريم) .

لەبــەر دەســت كــەوتنى بەرژەوەنديــەكانى زيــاتر و ڕوون بونــەوەی حيكمــەت و كــەمالی دەستەلاتەكەی، لەو ڕوەشەوە هيچ ناكۆكيەك لە نێوان ژيرو عاقلەكاندا نيە كە مەبەست لــە شــەريعەتی پێغەمبــەران پاراســتنی بەرژەوەنــدی ئــاينی و دونيــايی بەندەكانــە، بــۆ دەركــەوتن كاتێك پێويســت بــوو كــە خــودای گــەورە ســەرەتاو كۆتــايی كاروبارەكــانی لا ئاشــكرانەبوايە، بــەلام شــارەزا لەوشــتانە گوتارەكــانی دەگۆڕێــت بــە پێــی گــۆڕانی بەرژەوەنديەكان، وەك پزيشكێك كە چاودێری بــارو دۆخــی نەخۆشــەكەی دەكــات، پــاك و بێگەردی بۆ خودا كە چاودێری ئەو شتانە دەكات لەكارو باری دروستكراوەكانيدا بەويست و ئيرادەی خۆی، بۆيە گوتاری دەگۆڕێت بــەلام زانست و ئــيرادەی جــێگيرەو ناگۆڕدرێــت چونكە ئەوە مەحالە بۆ خودايەكی بالادەست.

يەكێك لە نەزانی و نەفامی جولەكە ئەوەيە نەسخ و بۆدەركەوتنيان بەيەك شت دانــاوە لەبــەر ئــەوە نەســخيان ڕەت كردوەتــەوەو گومرابــوون،ڕ جيــاوازيش لــە نێــوان نەســخ و بۆدەركەوتن ئەوەيە: نەسخ هەلگرتنی حــوكمێكی شــەرعی يــان بابەتێكــە بــە بەلگەيــەكی شــەرعی دوای خــۆی، لەگــەڵ بــوونی عيلمــی پــێش وەخــتی خــودا بــە هــەلگرتنی حوكمــە لابراوەكە، خودای گەورە ئەو حوكمەی بۆ كاتێكی دياريكراو دانــاوە و لــە عيلمــی ئــەزەلی ئەودا بڕيــار بــووە هــەلبگيرێت، وەك گواســتنەوەی بەنــدەكان لەســەر شــتێكی حــەلاڵ بــۆ شتێكی تر كە دواتر حەرام كــراوە، يــاخود شــتێك كــە پێشــتر حــەرام بــووە دواتــر حــەلاڵ كراوە، بەلام بۆ دەركەوتن:

دەركــەوتنی حيكمــەتێكی تازەيــە كەپێشــتر نــەزانرابێت، ئەمــەش مەحالــە لەگــەڵ خوايەتی خودا يەك بگرێتەوە چونكە ئەو بەديهێنــەری هــەموو شــتەكانە، وە هــەر خوشــی زاناو شارەزايە بە پەنهان و نهێنيەكانيان بــە ئاشــكراو شاراوەكانيشــەوە واتــە هيچــی لــێ شاراوە نيە، بۆ دەركەوتن لە مرۆڤەكاندا ڕوودەدات وەك ئەوەی بڕيار لەسەر كارێك بــدات پاشان ســەبارەت بــەو كــارە شــتێكی بــۆ ڕوون دەبێتــەوە و واز لــە كارەكــەی دەهێنێــت،

یاخود بە کەسێك بلێت: بڕۆ بۆلای فلانە کەس دواتر پاشگەز دەبیتەوەو دەلێیت: مەڕۆ لەبەر ئەوەی شتێکت بیر دەردەکەوێت و پاشگەز دەبیتەوە، بێگومان ئەم حالەتە تایبەتە بە مرۆڤەکان بە هۆکاری ناکاملیان.[155]

جولەکەکان بۆیە بانگەشەی ئەوە دەکەن کە نەسخ لە ئایەتەکاندا نەکراوە دەیانەوێت لەو ڕێگایەوە بگەنە ڕەت کردنەوەو نکولی کردن لە قورئانی پیرۆز، بۆ ئەوەی دلنیای بکەنەوە کە ئەوحوکمانەی کە لە تەوراتدا هاتوە بۆ هەتا هەتایی دەمێنێتەوە نەسخی تێدا نەکراوە، لەو نێوەندەشدا وتویانە: موحەمەد ئەمڕۆ فەرمانێك دەردەکات بۆ هاوەلەکانی سبەینێ لێی پاشگەز دەبێتەوە، تانەکەیان گەورەتر کردەوە کاتێك کە قیبلە لە (بیت المقدس)ەوە گۆڕا بۆ (البیت الحرام)، ئەم ئایەتەش دابەزی کە دەفەرموێت: ﴿ ۞ مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ أَوْ مِثْلِهَآ ۗ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٠٦﴾ ﴾ (البقرة).

بە واتای هەر ئایەتێك کە دەیگۆڕین بە ئایەتێکی تر و حوکمەکەی هەڵدەگرین دەیگۆڕین بە باشتر لەو یان هاوشێوەی ئەو. زانایانیش دوو ڕایان هەیە دەربارەی ( أو ننسها):

ڕای یەکەم: (أو ننسها) لەنسیانەوە هاتوە بەمانای وازلێهێنان، کەماناکەی بەم جۆرەی لێ دێت: نەسخی ئایەتێك ناکەین یاخود وازی لێ ناهێنین بەبێ نەسخ تا لەو باشتر یان هاوشێوەی خۆی نەهێنین، لێرەدا زاناکان وای دادەنێن کە سڕاوەیەك هەیە کە تەقیدەکەی وشەی (حکم)ە، واتە: نەسخی حوکمی ئایەتێك ناکەین یاخود وازلەحوکمەکەی ناهێنین تاوەکو لەوباشتر یان هاوشێوەی ئەو نەهێنن .

---

١٥٥- في (حقيقة النسخ وأنه ليس من البداء) طالع: الوجه الاول من الشبهة السابعة عشر من الجزء الحادي عشر (سلامة القران الكريم).

ئەگەر کەسێك وتی: چۆن ئایەتەکە دەمێنێتەوە — واتە وازی لێ دەهێنرێت و نەسخ ناکرێت — وە دەشگوترێ: لەو باشتر یان هاوشێوەی ئەو دەهێنین؟ بۆوەلامدانەوەی ئەو پرسیارە زاناکان دەڵێن: مەبەست لە (ننسها) واتە دەستەواژەکە دەهێڵینەوەو واز لەحوکمەکەی دەهێنین.

ڕای دووەم: مەبەست لە زاراوەی (ننسها) واتە: دەستەواژەکە هەڵدەگرین بە جۆرێك لە دل و زیهیندا جێگیر نابێت، ئەوەش ئەو لە بیرچونەوەیە کە خەڵك لەسەری ڕاهاتوە ، نمونەی ئەوەش لە (أنس بن مالك) ه وە بە صەحیحی هاتوە دەربارەی ئەوانەی کەلە بیری (معونە) دا کوژران خودای گەورە لە قورئاندا ئامازەی پێکردووە: (أن بلغوا قومنا أن قد لقينا ربنا فرضي عنا وأرضانا) [156] پاش ئەوە نەسخ کرایەوە ماناکەشی : بە قەومەکەمان ڕابگەیەنن کە بە خودای خۆمان شادبوینەوە و لێمان ڕازی بووەو ڕازیشی کردین.

شێوازێکی تری وەلامدانەوەی جولەکەکان کە دەلێن گوایە نەسخ بوونی نیە: ئەوەیە کەئەوتەوراتەی بەردەستیشیان نەسخی هەندێك لە ئەحکامی کتێبەکانی پێش خۆی کردووە.

ڕووە باشەکان لە ئایەتە ناسیخەکاندا لەم ڕوانەوەیە:

- هەنێك جار ئایەتەناسخەکان هەڵگری کۆت و بەندو نارەحەتیەکان بوون لەسەر ئومەتەکانی پێش ئێمە.

- ئایەتە ناسیخەکان ئەگەر چی لە هەندێ کاتدا کارکردن پێیان قورس و نارەحەتترە لە چاو ئایەتە مەنسوخەکاندابەلام پاداشتی کارپێکردنیان زۆر زیاترە لە ئایەتە مەنسوخەکان.

---

١٥٦- أخرجه البخاري في صحيحه ، كتاب الجهاد والسير، باب: من ينكب في سبيل الله (عزوجل) (٢٦٤٧). ومسلم في صحيحه كتاب المساجد، موضوع الصلاةن باب: نهي من أكل ثوما أو بصلا أو كراثا أو نحوها عن حضور المسجد (١٥٧٧).

- ئایەتە ناسیخەکان ئاسانتر و نەرمتر بوون بۆئەوەی دەرخ بکرێن لەلایەن خەڵکەوە لەمەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە ڕووە باشترەکان لە ئایەتە ناسیخەکاندا لەسەرەتاو کۆتاییدا، لەسەرەتاکەیدا ئاسانکاری بەدی دەکرێت کە خودای گەورە لە ئەحکامەکانی دا ئەنجامی داوە، کۆتایەکەشی وەرگرتنی پاداشتی گەورەیە بۆ کارپێکەرو ئەنجامدەرانی.

**چوارەم: بوونی نەسخ لە تەوراتدا وەڵامە بۆ جولەکەکان لەسەر ئەوەی کە دەڵێن نەسخ لە قورئاندا بوونی نیە.**

یەکێك لە وەلامەکانی قورئان بۆ جولەکەکان لەسەر نکولی کردنیان لە ڕوودانی نەسخ و ڕێگەپێدانی، دەقێکە لەتەوراتدا ئەویش ئەوەیە کاتێك (نوح) سەلامی خودای لەسەر بێت لە کەشتیەکە هاتە خوارەوە خودای گەورە سەرجەم گیانەوەری سەرزەوی بۆ حەڵاڵ کرد کە لێی بخوات، پاش ئەوە ئیسرائیل گۆشتی حوشترو شیرەکەی لەسەر خۆی حەرام کرد و کوڕەکانیش شوێنی کەوتن لەو کارەدا، تەورات هات و ئەمەی قەدەغە کرد، ئەمە خۆی بۆخۆی نەسخە، قورئانیش دەیپێرێتەوەو دەفەرموێت: ﴿ ۞ كُلُّ ٱلطَّعَامِ كَانَ حِلًّا لِّبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ إِلَّا مَا حَرَّمَ إِسۡرَٰٓءِيلُ عَلَىٰ نَفۡسِهِۦ مِن قَبۡلِ أَن تُنَزَّلَ ٱلتَّوۡرَىٰةُۚ قُلۡ فَأۡتُواْ بِٱلتَّوۡرَىٰةِ فَٱتۡلُوهَآ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ٩٣ ﴾ (ال عمران). واتە: دیارە جولەکە دەربارەی حەڵاڵ و حەرام ی سەردەمی یعقوب پێغەمبەر دواون کە گوایە کاتی خۆی هەرچی خواردەمەنی و خۆراك هەبوو بۆ نەوەی ئیسرائیل حەڵاڵ بوو ، جگە لەوەی کە ئیسرائیل ( یعقوب پێغەمبەر ) لەسەر خۆی حەرام کردبوو ، بۆیە خوای گەورە وەڵامی داونەتەوە ، تا دەمکوتیان بکات و فەرمویەتی ): پێش ناردنی تەورات ئیستەش بڕۆن تەورات بێنن وبیخوێننەوە ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن و بەشوێن حەقیقەتدا دەگەڕێن.

جولەکە چۆن لەڕوویان دێت ڕەخنە لە بوون و ڕێگەپێدانی نەسخ بگرن، بە دلنیایی ئەو شتە لە کتێبە پێشوەکان و شەریعەتە ڕابردووەکاندا ڕووی داوە، هەروەك ئەوەی خودا ڕێگەی بە ئادەم پێغەمبەر دابو کە کچەکانی مارە بکات لە کوڕەکانی پاشان ئەوەی حەرام کرد، یاخود وەك ئەوەی کەخودای گەورە سەرجەم گیانلەبەرانی سەرزەوی بو نوح پێغەمبەر حەڵاڵ کرد پاشان ئەو حوکمەی نەسخ کردو مەنێکیانی لێ حەرام کرد، هەروەها بۆ ئیسرائیل و کوڕەکانی ڕێگە پێدراوبوو کە دوو خوشك پێکەوە مارەبکەن بەلام ئەوە لە شەریعەتی تەورات و شەریعەتەکانی دوای ئەویشدا قەدەغە کراوە، وە فەرمان کرا بە ئیبراهیم پێغەمبەر کەکوڕەکەی سەر ببڕێت بەلام پێش ئەنجام دانی ئەو حوکمە نەسخ کرا، هەروەها فەرمان کرا بە کوشتنی سەرجەم ئەو بنو ئیسرائیلانەی کە گوێرەکەیان پەرەستبو پاشان ئەو حوکمەیان لەسەر هەڵگیرا بۆئەوەی بەهۆی کوشتنەوە قڕیان تێنەکەوێت.

جولەکەکان خۆشیان ئەم شاهیدیە دەدەن بەلام خۆشیانی لێ لادەدەن بەهۆی لوت بەرزی و بێباوەڕیانەوە، بێگومان هەمو ئەمانە لە تەوراتدا دەقی لەسەر هاتوە مەگەر ئەمە خۆی لەخۆیدا نەسخ نیە؟ بۆیە خودا فەرمانی پێکردوون کەبگەڕێنەوە بۆ تەورات چونکە ئەویش هەمان شتی ئێمە دەسەلمێنێت کە دەیلێین.

بۆیە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَّا يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ وَلَا ٱلْمُشْرِكِينَ أَن يُنَزَّلَ عَلَيْكُم مِّنْ خَيْرٍ مِّن رَّبِّكُمْ ۗ وَٱللَّهُ يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴿١٠٥﴾﴾ ( البقرة)، واتە: لە ڕاستیدا ئەوانەی کە بێباوەڕو حەق پۆشن لە خاوەنانی کتێب ، هەروەها موشریك و هاوەڵگەرانیش کە حەز ناکەن هیچ خێر و بەرەکەتێك لە لایەن پەروەردگارتانەوە ڕووتان تێ بکات ، بەڵام خوای گەورە بە ئارەزوو حەزی ئەوان ناکات ، بەڵکو لە ڕەحمەتی تایبەتی خۆی هەرکەسێك شایستە بێت ئەو زاتە بەهرەمەندی

دەکـات ، چـونکە ئـەو خوایـە خـاوەنی فـەزڵ و بەخششـی گەورەیـە (بەتایبـەت بـۆ باوەڕداران).

خودای گەورە بە ئیمانداران دەفەرموێت: ئەوانەی کە ئاگاداریتان هەیە دەربارەیان لە ڕووی مامەڵە کردنیان لەگەڵ پێغەمبەرەکانیان ئەوانە ئێـرەی دەبـەن، لـوت بـەرزی و بـێ باوەڕیەکەیان زیانتان پێ نەگـەینێت و گـوێ مەدەنـە درۆو دوژمنایـەتیان، ئـەوان بـەهۆی ئیرەبییەکەیانەوە نایانەوێت هـیچ چـاکەیەکتان لەلایـەن خـوداوە بـۆ دابـەزێت، قورئـانیش چاکترینی شتەکانە، چونکە پرۆگرامێکـی تێروتەسـەلە و فـەزلێکی فراوانـە و ڕێنمونیـەکی گەورەیە، و نیشانەیەکی مەزنە کەهـەموتانی کۆکردوەتـەوە پێکـەوە بەیـەکی گەیانـدون، هـۆزو نەتـەوەکانتانی کـردوە بەیـەك مێشـکتانی لـە بـت پەرەسـتی پـاك کردوەتـەوە، دەرونتانی لە پیسـی و چـەپەڵی جاهلیـەت خـاوێن کردوەتـەوە، و لەسـەر سروشـتی پـاك جێگیری کردوون، ڕیبازی حەنەفیەتی پاك و بێگەردی بۆ ڕەخساندون، ئیتر چۆن ئـیرەی جەرگیان ناسـوتێنێت و ڕق و قـین و بوغزیـان بەسـەرتاندا بـەتال ناکەنـەوە، واتـە گـاورو جولەکەو موشریکەکان کەمیان حەزناکەن و پێیـان خـۆش نیـەهیچ چاکەیەکتان لەلایـەن خوداوە بۆ دابەزێنرێت،بەلام ئەهلی کیتاب و بەتایبەتیش جولەکە لە ئیرەییـان بەرامبـەر نەتەوەی عەرەب ئەوەبو کە پەیام و پێغەمبـەریان بۆهـاتبو، کەئـەوان ئەوشـتەیان تـەنها بەشایەنی خۆیان دەزانی و هەوڵی قۆرخ کردنیان دەدا بۆخۆیان.

بەلام موشریکەکان ئیرەبییەکەیان لەو ڕووەوە بوو بە دابەزینی وەحی جارلـەدوای جـار ئیسلام بەهێز و جێگیر دەبوو هەروەها خێـرا تەشـەنەی دەکـرد و ڕەگـی دادەکوتـا ئەمـە خەونـەکانی پوچـەڵ کردبونـەوە و نائومێـدی کردبـون لـەو هـەوڵ و چـاوەڕوانیەی کەنیازمەندی کردوون بۆکۆتایی هێنان بە پێغەمبەرو پەیامەکەی.

پاشان خودای گـەورە وەلامـی دانـەوەو جەهالـەتی ئـەوان و سـەرجەم ئیرەبـەرەکانی خســتە ڕوو وەك دەفـــەرموێت: ﴿ مَّا يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ وَلَا ٱلْمُشْرِكِينَ أَن

﴿ يُنَزَّلَ عَلَيْكُم مِّنْ خَيْرٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَٱللَّهُ يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴿١٠٥﴾ ﴾ ( البقرة)، بەومانایەی کەسی ئیرە بەر بەهۆی دەرونی خراپ و گیلیەوە نارەزایە لە خوداو رەخنە دەگرێت لەوەی کە خودا نیعمەتی دابەزاندوە بۆ سەر کەسی ئیرە پێ براو، نارەزایی نارازییەکان زیان بە خودا ناگەیەنێت، و نیعمەتەکانی ناگرێتەوە بەهۆی ئیرەی ئیرەبەرانەوە، خودای گەورە نیعمەتەکانی تایبەت دەکات بۆ هەرکەسێك کە بیەوێت، خودا خۆی خاوەن فەزلی گەورەو مەزنە، وئەم دووکردارەی بۆخۆی پێڕاوەتەوە، بۆ خستنە رووی ئەوەی کە ئەو کارە تەنها مافی خۆیەتی و هیچ دروستکراوێك کاریگەری نیە لەسەر پێدانیان یاخود گرتنەوەیان.[157] وەك دەفەرموێت:

﴿ وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّنۢ بَعْدِ إِيمَـٰنِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْحَقُّ فَٱعْفُوا۟ وَٱصْفَحُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٠٩﴾ ﴾ ( البقرة).

واتە: زۆربەی خاوەن کتێبەکان (مەبەست گاورو جوەکانە) ئاواتە خوازن کە ئێوە لە ئیمانەکەتان بترازێن و بتانکەنە کافرو بێ باوەڕ ، بە هۆی حەسودی و ناپوختی دڵ و دەرونیانەوە ، هەرچەندە حەق و حەقیقەت و راستیشیان بۆ دەرکەوتوەو (دەزانن کە لە مەرجە سەرەکیەکانی ئیسلام باوەڕ بونە بە سەرجەم پێغەمبەران و کتێبەکان) جا ئێوە لە بەرانبەرەوە چاوپۆشیان لێ بکەن و لێیان ببورن ، تا خوای گەورە (بەهۆی رەفتاری جوانتانەوە) خۆی دێت بە هاناتانەوە و سەرکەوتنی خۆیتان بۆ دەستەبەر دەکات ، چونکە لە راستیدا خوای گەورە دەستەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە .

ئەمە ئەو رق وقینە پێیان دەکات کە دووچاری دەرونیان هاتوە، تامەزرۆی تالانکردن و گرتنەوەی هەرچاکەیەکن کە خەڵکانی تر رێیان لێی کەوتبێت . بۆچی؟ ئەمە نەك

---

١٥٧- تفسير المنار، محمد رشيد رضا، مرجع السابق،ج:١، ص: ٤١٣،٤١٢.

بۆئەوەی ئەو دەرونە شەڕەنپێزانە ڕاستیەکە نازانن، بەلکو لەبەر ئەوەی کە هەمو شتێك دەزانن! (حسدا من عند أنفسهم من بعد ماتبين لهم الحق) ، ئیرەیش ئەو هەڵچونە ڕەش و نامەردانەیە کە دەروونی جولەکەی تەنیوە لە بەرامبەر ئیسلام وموسوڵمانان، ئەو سەرچاوەی دەست کیسەو سەرجەم پیلانەکانیان بە ئێستاشەوە ئائەوەیە کەقورئان دەیخاتە ڕوو بۆ ئەوەی موسوڵمانان لێی ئاگادار بن و بزانن ئەوە هۆکارە شاراوەکەیە لەگشت سەرجەم هەوڵەکانی جولەکە وە بۆ دارمانـدنی بیروباوەڕ لە ناخیاندا و پێڕانەوەیان بۆ ئەو بێباوەڕییەی کەلەسەری بوون، ئەو بێباوەڕییەی کە خودا ڕزگاری کردن لێی بە هۆی ئیمانەوە.

لێرەداو لەوساتەی ئەم ڕاستیە ئاشکرا دەبێت و نیاز پیسی و ئیرەییە گلاوەیان دەخرێتە ڕوو، لێرەوە قورئان داوا لە ئیمانداران دەکات لە ڕووبەڕوو بونەوەی بوغزوکینە بە بوغزوکینە، وخراپە بە خراپە،داوایان لێ دەکات بە لێبوردەیی و چاوپۆشی تا ئەو کاتەی خودا فەرمانی خۆی دادەبەزێنێت.

**بەکورتی:**

- نەسخ بریتیە لە هەڵگرتنی حوکمێکی شەرعی بە بەڵگەیەکی شەرعی کە لە دوای خۆیەوە هاتبێت، ئەمە لەڕووی عەقڵەوە دروستە و ناچێتە قالبی مەحاڵەوە، چونکە بەرژەوەندی بەندەکان دەگۆرێت بە پێی گوزەرانی سەردەمەکان ، ئەمە کارێکی خواکردەو هەرچەکی بوێت ئەنجامی دەدات و فەرمان ڕەوایی بەو شێوازە دەکات کە خۆی ویستی لەسەرە، لە قورئاندا ئاماژەی پێکردوە و دەفەرموێت:

﴿ ۞ مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ أَوْ مِثْلِهَآ ۗ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٠٦﴾ ﴾ ( البقرة).

- بوونی نەسخ لە کتێبە پێشوەکاندا وەلامێکە بۆ بانگەشەی جولەکە لەسەر نەبوونی نەسخ ورێگە پێنەدانی، وێڕای تێکەل کردنی نەسخ وبەدائە (بۆدەرکەوتن) واتە ئاشکرابوونی شتێکی شاراوە کەئەمەش بەرامبەر خودای گەورە مەحالە.
- نەسخ لەگەڵ بنەماکانی عەقل ومەنتیق دا یەك دەگرێتەوە ، خودا لەهەموان زاناترە بە بەرژەوەندی بەندەکانی لەهەموکات و شوێنێکداو سەرجەم دۆخە جیاوازەکاندا.



## گومانی سی ویەک

### نارەزای گۆڕینی قیبلە:[158]

#### ناوەڕۆکی گومانەکە:

خەڵکانێکی گێل هاوشێوەی جولەکەو دوو ڕووەکان و موشریکەکان نارازین بە گۆڕینی قیبلەی موسوڵمانان لە (بیت المقدس)ەوە بۆ (بیت الحرام) وە بەسەر سوڕمانەوە دەڵێن، (ماولاهم عن قبلتهم التي كانوا عليها)، ﴿ ۞ سَيَقُولُ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَ ٱلنَّاسِ مَا وَلَّىٰهُمْ عَن قِبْلَتِهِمُ ٱلَّتِى كَانُوا۟ عَلَيْهَا ۚ قُل لِّلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ ۚ يَهْدِى مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٤٢﴾ ﴾ (البقـرة)، واتـە: نەفام و دەم بەتاڵەکان لەدوای گۆڕینی ڕوگەو (قیبلە) لە قودسەوە بۆ کەعبە دەڵێن: باشە چی وای لەمحمد و پەیڕەوانی کرد کەواز لەڕوگەو قیبلە پێشوەکە بهێنن کە جاران لەنوێژدا ڕوویان تێدەکرد .. تۆش ئەی محمد پێیان بڵێ: ڕۆژهەڵات ورۆژئاواو هەموو لایەك هەر خوا خاوەنیەتی و موڵکی ئەو زاتەیە، هەرکەسێك ئەو زاتە بیەوێت و ئەو کەسەش شایستە بێت ، هیدایەت و ڕێنمویی دەکات بۆ ڕێگە و ڕێباز و بەرنامە و ئاینی ڕاست و درووست ....، بۆچی لەسەر یەك قیبلە دانامەزرێن ؟!

#### ڕێگاکانی پوچەڵ کردنەوەی بابەتەکە:

یەکەم : ڕۆژهەڵات و ڕۆژ ئاوا مولکی خودایەو چۆنی بوێت بە ویستی خۆی هەڵیدەسوڕێنێت.

دووەم: گۆڕینی قیبلە تاقیکردنەوەیەك بوو بۆ ئاشکرا کردنی ئیماندارو دوو ڕوو.

---

١٥٨- الآية التي وردت فيها الشبهة :(البقرة/ ١٤٢).
الآيات التي وردت فيها الرد على الشبهة: (البقرة/ ١٤٢، ١٤٨).
في "تأويل القبلة" طالع: الشبهة السادسة و الثلاثين من الجزء السادس، (العقيدة الإسلامية وقضايا التوحيد)، والشبهة الراعة من الجزء الثالث عشر.

سـێیەم: ئـەم قسـانەی جولەکـەکان لـە ڕق و قـین و شـاردنەوەی ڕاسـتیەکانەوە سەرچاوەی گرتوە.

چوارەم: هەموو میلەتێك قیبلەی تایبەتی بە خۆی هەیە کە ڕووی تێدەکات.

پێنجـەم: نـاوەڕۆکی دینـداری لـە گوێڕایـەلی کردنـی خـودا و شـوێن کـەوتنی فەرمانەکانیدایە.

شەشەم: هەوال دان بەقسەی ئەو پێلانە پێش ئەوەی لە زاری خۆیانەوە ئاشکرابکرێت بەلگەیەکە لەسەر پێغەمبەرێتی موحەمەد" سەلات و سەلامی خودای لەسەر بێت".

**درێژەی بابەتەکە:**

**یەکەم: ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا مولکی خودان.**

ئاشکرایە کە پێغەمبـەری خـودا ڕووی کردوەتـە (بیـت المقـدس) لـە نوێـژدا بۆمـاوەی شانزدە یاخود حەپدە مانگ، بەلام حەزی دەکرد کـە ڕوو لـە کەعبـە بکـات، جولەکـەکان پێیان خۆش بوو کەڕووی دەکردە (بیت المقدس)، کاتێك کە خودای گەورە ئـەم ئایەتـەی دابەزانـــــــد: ﴿ قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي السَّمَاءِ ۖ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَاهَا ۚ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ ۚ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ ۗ وَإِنَّ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ لَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ الْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ ۗ وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ ﴿١٤٤﴾ ﴾ ( البقرة)، واتە: ئەی محمد لەڕاستیدا ئێمە چاوگێڕان و هەلّسورانی ڕوخسارتمان ڕوبە ئاسمان چاك دەبینی ( کەزۆر حـەزت بەروگەیـەکی تایبـەت هەبوو ، ئێمە ئاگاداری نیازی دلّت بوین ) هەر بۆیە ئێمە بڕیارماندا کـە ئـیتر لەمـەودوا ڕو بکەیتـە ئـەو روگەیـەی کـە دلّـت پێـی ئاسـودەیە ، ئـیتر ڕوبکـەرە ( المسـجد الحـرام ) و کەعبەی پیرۆز هەروها ئێوەش ئەی گرۆی ئیمانداران لەهەرکوێیەکی زەویدا بـوون ، ڕووی تێبکەن بێگومان ئەو جولەکە و دیانانەی کە کاتی خۆی کتێبی ئاسمانیان بۆ ڕەوانەکراوە ، چاك دەزانن کەئەم گۆڕانی ڕوگەیە لەسەردەمی پێغەمبەری ئاخر زەمانـدا ، حەقیقەتـەو

خوای گەورە فەرمانی پێدەدات ، و لە کتێبەکانیاندا باسکراوە ، بێگومـان هـەرگیز خـوای گەورە بێئاگانیە لەو نەخشەو پیلان و ئاستەنگانەی کەئەوان دروستی دەکـەن لەبـەردەم شوێنکەوتوانی ئەم ئاینەداو لەدەستی پڕ قودرەتی هەرگیز قوتارنابن.

جولەکـەکان گومانیـان لا دروسـت بـوو وتیـان: ﴿ٱلنَّاسِ مَا وَلَّىٰهُمْ عَن قِبْلَتِهِمُ ٱلَّتِى كَانُوا۟ عَلَيْهَا ﴿١٤٢﴾﴾ (البقـرة)، دوو ڕوەکـانیش دوچـاری گومـان و دوو دلـی و شـلەژان بـوون، پاشـان خودای گەورە وەلامی دانەوە: ﴿۞ سَيَقُولُ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَ ٱلنَّاسِ مَا وَلَّىٰهُمْ عَن قِبْلَتِهِمُ ٱلَّتِى كَانُوا۟ عَلَيْهَا ۚ قُل لِّلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ ۚ يَهْدِى مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٤٢﴾﴾ (البقرة).

سەرجەم ئاڕاستەکان مولکی خودایە وخاوەنداریێتی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئـاواو ئەوەشـی لـە نێوانیاندایە دەگەڕێتەوە بۆخودای گەورە، هەڵسوڕان و فەرمانڕەوایی سـەرجەم کارەکـان لەلایەن خوداوەیە،عیبرەت لـە ڕوو کردنـە ڕۆژ هـەڵات و ڕۆژئـاوا نیـە، بـەڵکو عیـبرەت بـە گوێڕایەلی کردن وشوێن کەوتنی فەرمانەکانی خودایە، وەك دەفەرموێت:

﴿۞ لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَلَـٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَـٰبِ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ وَءَاتَى ٱلْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ذَوِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَـٰمَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَٱلسَّآئِلِينَ وَفِى ٱلرِّقَابِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَـٰهَدُوا۟ ۖ وَٱلصَّـٰبِرِينَ فِى ٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلْبَأْسِ ۗ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾﴾ ( البقرة)،

واتە: ئەی خەڵکینە! ئەی بڕوادران ! چاکەو چاکەخوازی ئەوەنیـە ڕوخسـاری خۆتـان بکەنە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و، بەتەمابن وڵاتان و گەلانی خۆرهەڵات و خۆر ئاوا بەختیاری و کامەرانیتان بۆ دەستەبەر بکـەن، بـەڵکو چـاکەو چـاکەخوازی لەناخـەوە هەڵدەقوڵێ کـە ئەویش بریتیە لەباوەڕی دامەزراو بەخوای گەورە، بەزات و سیفاتی پاشان بەرۆژی دوایـی و قیامەت ، بەبەهەشت و دۆزەخ ، هەروەها بەفریشـتەکان، کـە بەنـدەی ملکەچـی خـوای گەورەن و چرکەیەك نافـەرمانی ناکـەن، هـەروەها بـاوەڕ بەکتێبـەکان کەلەلایـەن خـواوە

ڕەوانەکراون بۆ پێغەمبەران ، وە باوەڕ بە پێغەمبەرانیش کە خوای گەورە لەنێو گرۆی ئادەمیزادا هەڵی بژاردوون .دوای ئەم چەمکانەی باوەڕ: ڕەنگدانەوەی ئیمان لەڕەفتاردا دەبێ دەربکەوێت ، ئەویش بە بەخشینی ماڵ و سامان چەندە خۆشەویست و نازدارە بەخزمانی هەژارو خەڵکی نەدارو کەمدەست و ڕێبواری دابڕاو لەوڵات و سامانی ، هەروەها بۆ ئەو کەسانەی کە ئاتاجی هەن و داوای دەکەن ، هەروەها بۆ ڕزگار کردن و ئازادکردنی گەلان و میللەتان لەدیلی و دەستبەسەری ، پاشان ئەنجامدانی نوێژ بەچاکی وڕێك و پێکی ، بەخشینی زەکاتی ماڵ و سامان و زانست و دەسەڵات و تواناکان ، هەروەها لەچاکەکاری: وەفاکردنی ئەو کەسانەیە بە پەیمان و بەڵێنەکانیان کە هەرکات پەیمان و بەڵێنێکیان دا دەیبەنەسەر ، هەروەها خۆگری و دان بەخۆدا گرتنە لەکاتی تەنگانەو نەخۆشی و ناخۆشی و نەهامەتی ، هەروەها کاتی ڕووبەڕووبەنەوەی دوژمنانی مرۆڤایەتی ، ئائەوانەی کە ئەو سیفاتانەیان تێدایە ، ئائەوانە ئەوانەن کە لەگەڵ بەرنامەی خوادا ڕاستدەکەن و هەرئەوانیشن تەقوادار و دیندار و خواناس ( کە لە ئایندەدا ڕەزامەندی پەروەردگاریان دەستەبەر دەکەن ).

بۆ هەرشوێنێك ڕوومان وەربپێڕن وەریدەپێڕین، گوێڕایەلی لە شوێن کەوتنی فەرمانەکانیدایە،تەنانەت ئەگەر هەر ڕۆژێك فەرمانمان پێ بکرێت ڕوو لە شوێنێك بکەین ئێمە بەندەی ئەوین و لە ژێر فەرمانی ئەوداین وخزمەتکاری ئەوین بۆ هەرکوێ ڕوومان وەربپێڕێت ڕوومان وەردەپێڕین، مافی خۆیەتی بەندەکانی ڕاسپێرێت بە هەرشتێك کە ویستی لەسەریەتی و هەرچیەکیشی بوێت دەیگۆڕێت و دەیسڕێتەوە، بۆ هەموو ئەمانە خودای گەورە حیکەتی تەواو و بیانوی کاریگەری هەیە،سەرجەم ئاڕاستەکان هی خودان هیچ ئاڕاستەیەك وەك خودی خۆی فەزلی بەسەر هیچ ئاڕاستەیەکی تردا نیە، خودای گەورە ویستی لەسەر کامیان بێت هەڵدەبژێرێت و تایبەتی دەکات و دەیکاتە قیبلەی هەرکەسێك کە بیەوێت:

{ قُل لِّلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ } ( البقرة)،بەهەمان شێوە خودای گەورە ویستی ئاگاداری بدات کە گرنگیەکی تایبەتی داوە بە بەندەو نێردراوی خۆی موحەمەد "سەلات و سەلامی خودای لەسەر بێت" و ئومەتەکەی کە رێنمونی کردوون بۆ ئیبراهیم پێغەمبەر و رووی وەرپێڕاون بۆئەو کەعبەی کە ئیبراهیمی خەلیل سەلامی خودای لەسەر بێت دروستی کرد هەربۆیە دەفەرموێت: ﴿ ۞ سَيَقُولُ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَ ٱلنَّاسِ مَا وَلَّىٰهُمْ عَن قِبْلَتِهِمُ ٱلَّتِى كَانُوا۟ عَلَيْهَا ۚ قُل لِّلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ ۚ يَهْدِى مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٤٢﴾ ﴾ (البقرة) .

**دووەم: تاقیکردنەوەی خەڵک و هەڵسەنگاندنیان.**

یەکێکی تر لە وەلامەکانی قورئان بۆجولەکەو موشریك و دوو ڕووەکان ئەوەیە ڕوونی بکاتەوە کە گۆڕینی قیبلە لە (بیت المقدس)ەوە بۆ کەعبە تاقیکردنەوەو هەڵسەنگاندنی خودایە بۆ ئاشکرا کردنی دوو ڕوویەکی بە گومان لە ئیمانداریێکی دلنیا، وەك خودای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ۗ وَمَا جَعَلْنَا ٱلْقِبْلَةَ ٱلَّتِى كُنتَ عَلَيْهَآ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يَتَّبِعُ ٱلرَّسُولَ مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ ۚ وَإِن كَانَتْ لَكَبِيرَةً إِلَّا عَلَى ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُ ۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤٣﴾ ﴾ ( البقرة)، واتە: ئا بەوشێوەیە ئێمە ئێوەمان بەگەل و ئوممەتێکی میانڕەو گێڕاوە لەهەموو ڕوویەکەوە ( ئێوە باوەڕتان بەئاینە ئاسمانیەکانی پێش خۆتان هەیە ، ئەگەر چی لەنوێژدا ڕوو لەقیبلەی ئەوان ناکەن، بەڵام بەشوێنێکی پیرۆز و قیبلەو ڕوگەی یەکەمی خۆتانی دەزانن ، هەروەها لەوێوە پێغەمبەر بەرەو ئاسمانەکان لەشەوی میعراجدا بڵند کرایەوە ، هەروەها ئێوە میانڕەون لەڕوی مێژوو جوغرافیاوە ، لەڕوی عیبادەت و خواپەرستیەوە لەڕوی دنیا و قیامەتەوە لەڕوی داخوازیەکانی روح و نەفسەوە ...) تا

ببنه شایەت بەسەرخەڵکیەوە و بۆیان ڕون بێت ( کە ئەم ئاین و بەرنامەیە سەرتاپای خێرە بۆ تاك و کۆمەڵ بۆ گەل و نیشتمان ، بۆ دنیا و قیامەت ، هەروەها گشتگیرە و هەموو بوارەکانی ژیان ئاراستەی خێر دەکات ) هەروەها بۆ ئەوەش کە پێغەمبەر شایەتی بدات بۆ دڵسۆزانی ئوممەتی لەسەر ئەوەی کە بەئەرکی سەرشانی خۆیان هەستاون ، جا ئەو قیبلەیەی کە جاران ڕووت تێدەکرد گۆڕیمان بۆ کەعبە و ( بیت الحرام ) تا دەربکەوێت کێ بەڕاستی شوێنەکەوتەی پێغەمبەرە و کێش پاشگەز دەبێتەوە هەرچەندە ئەو بڕیارەمان بوو بە تاقیکردنەوەیەکی گەورە بۆ زوربەی ئیمانداران جگە لەوانەی کەخوای گەورە هیدایەتی دابون ، بێگومان خوای گەورە ئیمان و باوەڕداریی و نوێژ و خواپەرستیتان بەزایە نادات چ لەڕابردودا و چ لە ئێستەو داهاتوودا ، چونکە خوای گەورە بەنیسبەت خەڵکی ئیماندارەوە تەواو بەسۆز و بەبەزەیی و دلۆڤانە.

دوو ڕووەکان کاتێك کە قیبە گۆڕدرا وتیان: موحەمەد چی لێ قەوماوە جارێك ڕوومان پێ دەکاتە ئێرەو جارێکیش ڕوومان دەکاتە ئەوێ، هەندێکیش لە موسوڵمانەکان وتیان: ئەی حالی ئەو بۆایانەمان چۆن بێت ئەوانەی کە مردوون و کوژراون کە ڕوویان لە (بیت المقدس) کردووە لە نوێژەکانیاندا؟! موشریکەکانیش وتیان: هەرچۆنێك موحەمەد گەڕاوەتەوە ڕووی کردوەتە قیبلەکەمان بەهەمان شێوە دەگەڕێتەوە سەر دینەکەشمان، بەلام ئیماندارەکان ئەوانەی کە ئیمانێکی کامڵ و ڕاست و دامەزراویان هەبوو دەیانزانی کەئەوە ڕاستیەکە لەلایەن خوداوە، بۆیە گوێیان بۆگرت و گوێڕایەلیان لێ کرد و پێی ڕازی بوون و چاویان لەسەری دامەزرا، کەواتە گۆڕینی قیبلە یاسای خودایەو حیکمەت و گەورەیی تێدایە، لەوانە ئاشکراکردنی دۆی ئەوانەی کە شوێن پێغەمبەر دەکەون و گوێڕایەلی دەکەن و ڕوو لە هەرجێگایەك بکات ئەوانیش ڕووی تێدەکەن.

لەوانەی کەلە دینەکەیان پاشگەزدەبنەوە ، لەگەڵ ئەوەی کە ئەمە کارێکی قورس و گرانە لەسەر دەروونەکان ئەوانەیان نەبێت کە خودا هیدایەتی دڵەکانیانی داوە و دڵنیا

بوون بە ڕاستگۆیی پێغەمبەر، واتە هەموو ئەوانەی کە ئەو هێناویەتی ڕاستەو هیچ گومانی تێدانیە و خوداش هەرچیەکی بوێت ئەنجامی دەدات، بەو شێوازە فەرمانڕەوایی دەکات کە ویستی لەسەرەو دەفەرموێت: ﴿ وَإِن كَانَتْ لَكَبِيرَةً إِلَّا عَلَى ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُ ﴿١٤٣﴾ ﴾ ( البقرة).

بەلام ئەوانەی کە دلیان ناساغە هەرکاتێك هەرکارێك ڕوو بدات گومانیان لادروست دەبێت، بەلام ئیماندارەکان ڕاستی ودلنیایان لا دەچەسپێت لەگەڵ ئەو ئیمانەی کە هەیانە ئیمانی تریان بۆ زیاد دەبێت، هەروەك خودای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَإِذَا مَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ فَمِنْهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمْ زَادَتْهُ هَٰذِهِۦٓ إِيمَٰنًا ۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فَزَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَهُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿١٢٤﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَتْهُمْ رِجْسًا إِلَىٰ رِجْسِهِمْ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ كَٰفِرُونَ ﴿١٢٥﴾ ﴾ ( التوبة).

واتە: هەندێ لە دوو ڕووەکانی مەدینە هەرکاتێك سورەتێك لە قورئان نازڵ دەکرێت ، هەیانە ( بە گاڵتە پێکردنەوە دەڵێت: باشە ، کێتان بەمە ئیمان و باوەڕی زیادی کرد ؟! ( ئەو دوو ڕوانە بابزانن ) کە ئەوانەی ئیمان و باوەڕیان هێناوە بەردەوام ئیمان و باوەڕیان زیاتر و پتەوتر دەبێت و دڵخۆش دەبن و باوەڕەکەیان بەو ئایندە ڕۆشن و پڕ لە بەختەوەری و کامەرانیەی کە چاوەڕێیان دەکات زیاتر دەبێت .* بەلام ئەوانەی کەدڵ و دەروون و ناخیان نەخۆشی باوەڕ لاوازی و دوودڵی و دووڕوویی ڕوی تێکردووە ، ئەوە ، ئەو جۆرە کەسانە چەندە ناخیان پیس و پۆخڵە ، ئەوەندەی تر پیس و پۆخڵی ڕویان تێدەکات کاتێك گوێ بیستی باسی دین و ئایەتەکانی قورئان دەکرێت ، ئەوانە وابڕوا سەرئەنجام بە کافری دەمرن .

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَلَوْ جَعَلْنَٰهُ قُرْءَانًا أَعْجَمِيًّا لَّقَالُوا۟ لَوْلَا فُصِّلَتْ ءَايَٰتُهُۥٓ ۖ ءَا۬عْجَمِىٌّ وَعَرَبِىٌّ ۗ قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ هُدًى وَشِفَآءٌ ۖ وَٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ فِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرٌ وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمًى ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ

يُنَادَوْنَ مِن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ ﴿٤٤﴾ ﴾ ( فصلت)، واتــه: خوانەناسـان هـەر بـڕو بيـانو دەگـرن و هەندێكيان دەڵێن: چى دەبوو ئەگەر ئەم قورئانە بەزمانى گەلانى تر بوايە ) خواى گەورە دەفەرموێت: ئەگەر ئـەم قورئانـەم بـەزمانى گـەلانى تـر بناردايـە ، ئـەوە دەيـانوت: ئايـا نەدەبوو ئايات و فەرمان و داخوازييەكانى بەزمانى خۆمان بوايە و ڕوون و ئاشكرا بوايە ، چۆن ئەم قورئانە بەزمانى تر دەبێت لـە كاتێكدا كـە محمد بـەزمانى عـەرەبى ئاخـاوتن دەكات ؟ ! ئەى پێغەمبەر پێيان بڵێ: ئەم قورئانە بۆ ئەوانەى كە ئيمان و باوەڕ دەهێنن دەبێتە مايەى هيدايەت و بەرچاوڕونى و شيفايە بەتايبەتى بۆ نەخۆشى و دەردە دەرونى و كۆمەڵايەتى و ئابورى و ڕاميارى يەكان ، بگرە هەندێ جار نەخۆشيە جەستەييەكانيش ، بەڵام ئەوانەى كـە باوەڕيـان پێـى نيـە دەڵێـى سـەنگينىو قورقوشـم گـوێى ئـاخنيون ، چاويشيان كوێرە لە ئاستيدا و پيرۆزى و نـاوازەيى بـەدى ناكـەن ، ئـا ئەوانـە دەڵێـى لـە دورەوە بانگيان لێ دەكرێت ( نە دەنگەكە بە چاكى دەبيسـتن ، نـە ڕەنگـەكان بـە ڕونـى دەبينن ) ! !

وەدەفــــــــەرموێت: ﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ﴿٨٢﴾ ﴾ ( الإسراء)، واتە:ئێمە لە قورئان بەردەوام ئايات و سـورەت نـازڵ دەكـەين و(دەيكەينە هۆى شـيفا و چارەسـەر بـۆ نەخۆشـيەدەرونى و جەسـتەييەكان ، بـۆ دەردە كۆمەڵايەتى و پەروەردەييەكان ، بۆ كێشە سياسى و ئابورييەكان)هەموويشى ڕەحمەت و ميهرەبانيـە بـۆ ئيمانـداران ، بـەڵام بـۆ سـتەمكار و زۆرداران مايـەى خەسـارەتمەندى و زەرەرمەندى و ڕيسواييە لە هەردوو جيهاندا.

بەلام ئەوەى كەمردوو ڕوى لە نوێژدا كردوەتە (بيت المقدس) خودا ئاشكراى كـردووە كە پاداشتى نوێـژەكانى بـە فـيڕۆ نەچـو و خـوداش سـتەم لـە هـيچ كەسـێك ناكـات، وەك دەفــەرموێت: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ

شَهِيدًاۗ وَمَا جَعَلْنَا ٱلْقِبْلَةَ ٱلَّتِى كُنتَ عَلَيْهَآ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يَتَّبِعُ ٱلرَّسُولَ مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَىٰ عَقِبَيْهِۚ وَإِن كَانَتْ لَكَبِيرَةً إِلَّا عَلَى ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤٣﴾ ﴾ ( البقرة)، واته: ئا بەوشێوەیە ئێمە ئێوەمان بەگەل و ئوممەتێكی میانڕەو گێڕاوە لەهەموو ڕوویەكەوە ( ئێوە باوەڕتان بەئاینە ئاسمانیەكانی پـێش خۆتـان هەیـە ، ئەگـەر چـی لەنوێـژدا ڕوو لەقیبلـەی ئـەوان ناكـەن ، بـەلآم بەشـوێنێكی پـیرۆز و قیبلـەو ڕوگـەی یەكەمی خۆتانی دەزانن ، هەروەها لەوێوە پێغەمبەریەرەو ئاسمانەكان لەشەوی میعراجدا بڵند كرایەوە ، هەروەها ئێوە میانڕەون لـەڕوی مێـژوو جوغرافیـاوە ، لـەڕوی عیبـادەت و خواپەرستیەوە لەڕوی دنیا و قیامەتەوە لەڕوی داخوازیـەكانی روح و نەفسـەوە ...) تـا ببنە شایەت بەسەرخەڵكیەوە و بۆیان ڕون ببێـت ( كـە ئـەم ئـاین و بەرنامەیـە سـەرتاپای خێرە بۆ تاك و كۆمەڵ بۆ گەل و نیشتمان ، بـۆ دنیـا و قیامـەت ، هـەروەها گشـتگیرە و هەموو بوارەكانی ژیان ئاراستەی خێر دەكات ) هەروەها بۆ ئەوەش كە پێغەمبەر شایەتی بدات بۆ دڵسۆزانی ئوممەتی لەسەر ئەوەی كە بەئەركی سەرشانی خۆیان هەسـتاون ، جـا ئەو قیبلەیەی كە جاران ڕووت تێدەكرد گۆڕیمان بۆ كەعبە و (بیت الحرام) تا دەربكـەوێت كـێ بەڕاسـتی شـوێنەكەوتەی پێغەمبـەرە و كـێش پاشـگەز دەبێتـەوە هەرچـەندە ئـەو بڕیارەمان بوو بە تاقیكردنەوەیەكی گەورە بۆ زوربەی ئیمانداران جگـە لەوانـەی كـەخوای گـەورە هیدایـەتی دابـون ، بێگومـان خـوای گـەورە ئیمـان و بـاوەڕداریی و نوێـژ و خواپەرستیتان بەزایە نادات چ لەڕابردودا و چ لە ئێستەو داهاتوودا ، چونكە خوای گەورە بەنیسبەت خەڵكی ئیماندارەوە تەواو بەسۆز و بەبەزەیی و دلۆڤانە .[١٥٩]

١٥٩- في (الحكمة من تحويل القبلة) طالع: الوجه الثاني من الشبهة الرابعة،من الجزء الثالث عشر (العبادات و المعاملات الإقتصادية) والوجه الأول من الشبهة السادسة والثلاثين من الجزء الثالث، (العقيدة الإسلاميةو قضايا التوحيد).

**سێیەم: شاردنەوەی جولەکەکان بەهۆی ڕق وقین و نکۆڵی کردنیانەوە.**

یەکێکی تر لەوەلامەکانی قورئان بۆ جولەکە ئاشکرا کردنی ڕق وکین و شاردنەوەی ڕاستیەکانە —ئەمەش عادەت و ڕەفتاریانە بە هۆی بێ باوەڕی و نکولی کردنیانەوەیە، ئەوان لە ڕێگەی کتێبەکەیانەوە و لە پێغەمبەرەکانیانەوە دەیانزانی کە خودا قیبلەی پێغەمبەرکەی دەگەوڕێت بۆ (بيت الحرام)، بۆیە خودا هەڕەشەیان لێ دەکات و دەفەرموێت: ﴿ قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي السَّمَاءِ ۖ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَاهَا ۚ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ ۚ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ ۗ وَإِنَّ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ لَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ الْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ ۗ وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ (١٤٤) ﴾ ( البقرة)، واتە: ئەی محمد لەڕاستیدا ئێمە چاوگێڕان و هەڵسورانی روخسارتمان ڕوبە ئاسمان چاك دەبینی ( کەزۆر حەزت بەروگەیەکی تایبەت هەبوو ، ئێمە ئاگاداری نیازی دڵت بوین ) هەر بۆیە ئێمە بڕیارماندا کە ئیتر لەمەودوا ڕو بکەیتە ئەو روگەیەی کە دڵت پێی ئاسودەیە ، ئیتر ڕوبکەرە ( المسجد الحرام ) و کەعبەی پیرۆز هەروها ئێوەش ئەی گرۆی ئیمانداران لەهەرکوێیەکی زەویدا بوون ، ڕووی تێبکەن بێگومان ئەو جولەکە و دیانانەی کە کاتی خۆی کتێبی ئاسمانیان بۆ ڕەوانەکراوە ، چاك دەزانن کەئەم گۆڕانی ڕوگەیە لەسەردەمی پێغەمبەری ئاخر زەماندا ، حەقیقەتەو خوای گەورە فەرمانی پێدەدات ، و لە کتێبەکانیاندا باسکراوە ، بێگومان هەرگیز خوای گەورە بێئاگانیە لەو نەخشەو پیلان و ئاستەنگانەی کەئەوان دروستی دەکەن لەبەردەم شوێنکەوتوانی ئەم ئاینەداو لەدەستی پڕ قودرەتی هەرگیز قوتارنابن.

جولەکەکان ڕاستی ئەو شتە دەزانن کە بۆ پێغەمبەر "سەلات و سەلامی خودای لەسەربێت" هاتوە هەروەك چۆن منداڵەکانی خۆیان دەناسن، بەلام ڕاستیەکان دەشارنەوەبۆیە خودای گەورە وەلامیان دەداتەوەو دەفەرموێت : ﴿ الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَعْرِفُونَهُ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَاءَهُمْ ۖ وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنْهُمْ لَيَكْتُمُونَ الْحَقَّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ (١٤٦) ﴾ ( البقرة)، واتە

ئەوانەی کتێبی ئاسمانیمان پێبەخشیون ، چاك پێغەمبەر و قورئـان و ئیسـلام دەناسـن ، هەروەکو چۆن نەوەو کوڕەکانی خۆیان دەناسن ، لەڕاستیدا دەستەیەك لـەوان حەقیقـەت و ڕاستیەکان دەشارنەوە، لە کاتێکدا دڵنیان لەوەی محمد ئەو پێغەمبەرەیە که لەتەورات و ئینجیلدا مژدەی هاتنی دراوە .

یەکێکی تر لە وەلامەکانی قورئان بۆیان ئەوەی ڕوون کردوەتەوە کە ئەگەر بەلگـەش بهێنێت لەسەر ڕاستی ئەوەی کە بـۆ پێغەمبـەر "سـەلات و سـەلامی خـودای لەسـەربێت" هاتووە و بیانوشیان ببڕێـت نەشـوێنی دەکـەون و نـە ڕووش دەکەنـە قیبلەکـەی، بەلگـەو نیشانە سودی نیە بۆکەسێك کە خودا مۆری لـە دلـی دابێـت، بۆیـە دەفـەرموێت: ﴿ وَلَئِنْ أَتَيْتَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ بِكُلِّ ءَايَةٍ مَّا تَبِعُواْ قِبْلَتَكَۚ وَمَآ أَنتَ بِتَابِعٍ قِبْلَتَهُمْۚ وَمَا بَعْضُهُم بِتَابِعٍ قِبْلَةَ بَعْضٍۚ وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم مِّنۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ إِنَّكَ إِذًا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٤٥﴾ ﴾ ( البقـرة)، واتـە: لـە ڕاسـتیدا چـەندە تـۆ ئـەی محمـد هەوڵبـدەیت لەگـەڵ ئـەو گـاور و جولەکانـەدا تاشـوێنی ڕاسـتیی بکـەون و موسـڵمان بـبن و ڕووبکەنـە ڕوگـەی تـۆ ، ڕووی تێناکەن و بەقسەت ناکەن ، بێگومان تۆش هەرگیز ڕووناکەیتە ڕوگەی ئـەوان ، ئـەوانیش شوێنکەوتەی ڕوگەی هەندیکی تریان نابن ، لەڕاستیدا ئەگەر تـۆ شـوێنی هـەواو ئـارەزوی ئەوان بکەویت دوای ئەوەی زانیاری تـەواوت پێڕاگەیـەنرا لـەو بارەیـەوە ئـەوە دەچـیتە ڕیـزی سـتەمکارانەوە ( بێگومـان ئەسـتەمە ئـەی پێغەمبـەر لەفـەرمانی خـوای گـەورە دەربچیت و ستەمکاربیت) .(جا بەم ئایەتە و ئایەتـەکانی تـریش خـوای گـەورە دەیـەوێت گرنگی ( البیت الحرام ) لەناخی ئیمانداراندا بروێنێت ، چونکە لەهەموو نوێژەکانـدا دەبـی ڕووبکەینە ئەو ڕوگە پیرۆزە ، چونکە یەکەم مزگەوتە لـە سـەر زەویـدا بـۆ خـوا پـەرستی بڕیاری لەسەردرابێت ).

هەروەها دەفـەرموێت: ﴿ وَلَوْ جَآءَتْهُمْ كُلُّ ءَايَةٍ حَتَّىٰ يَرَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ ﴿٩٧﴾ ﴾ ( يـونس)، واتە: ئەی پێغەمبەر بڵێ: سەرەنج بدەن و تەماشا بکەن و بـزانن خـوای گـەورە چـی لـە ئاسمانەکان و زەویدا بەدی هێناوە ، بەڵام سەیرە ! ! بەڵگە و نیشانە و ئاگادارییـەکان بـێ سودن بۆ ئەو کەسانەی کە باوەڕ ناهێنن و ڕێبازی دینداری ناگرنە بەر .

وە هەروەها دەفـەرموێت: ﴿ قُلِ ٱنظُرُوا۟ مَاذَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَمَا تُغْنِى ٱلْـَٔايَـٰتُ وَٱلنُّذُرُ عَن قَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠١﴾ ﴾ ( یونس)، واتە: ئەی پێغەمبەر بڵێ: سەرەنج بدەن و تەماشا بکـەن و بزانن خوای گەورە چی لە ئاسمانەکان و زەویدا بەدی هێناوە ، بەڵام سـەیرە ! ! بەڵگـە و نیشانە و ئاگادارییەکان بێ سودن بۆ ئەو کەسانەی کە باوەڕ ناهێنن و ڕێبـازی دینـداری ناگرنە بەر.

ئەوانە گەلێکن بەلگەو نیشانە قایلیان ناکات و دەسـت لـە نکـۆلی کـردن هـەڵناگرن، ئەوانە کەللە ڕەق و دەمارگیرو کوێرن چاویان نیە ببینێـت و بەلگـەش کاریگـەری نیـە لـە سەریان.

**چوارەم: هەرنەتەوەیەک قیبلەیەکی خۆی هەیە.**

خودای گەورە ڕوونی کردوەتەوە کە هەر نەتـەوەو ئایین زاوەیەك ڕووگەو قیبلەیـەکیان هەیە کـە ڕووی تێدەکـەن، جولەکـە قیبلـەی خـۆی هەیـە گـاوریش قیبلـەی خـۆی هەیـە، ئێـوەش ئـەی موسـوڵمانان قیبلـی خۆتـان هەیـە کـە ڕووی تێدەکـەن، خـودای گـەورە دەفەرموێت: (ولکل وجهـة هـو مولیهـا) ﴿ وَلِكُلٍّ وِجْهَةٌ هُوَ مُوَلِّيهَا ۖ فَٱسْتَبِقُوا۟ ٱلْخَيْرَٰتِ ۚ أَيْنَ مَا تَكُونُوا۟ يَأْتِ بِكُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٤٨﴾ ﴾ ( البقرة)، واتە: بۆ هـەر گـەل و ئومـەتێك ڕوگەو قیبلە و ( مقدسات ) ێك هەیـە کـە ڕووی تێدەکـەن و گرنگـی پێـدەدەن ... بـەڵام ئێوەی موسڵمان هەوڵ بدەن پێشبڕکێ بکـەن بـۆ بەدەسـت هێنـان و ئەنجامـدانی چـاکەو چاکەکاریی ، کە گرنگترینی هەوڵدانە بۆ هیدایەتی خەڵکی و نیشـاندانی وێنەیـەکی جوانـە

له دینداری و خواناسی .. جا ئێوه لەهەر کوێ بن لەهەر شوێن و کاتێکدا بمرن خوای گەورە لەرۆژی قیامەتدا هەموتان کۆدەکاتەوە ( بۆ موحاسەبە و لێپرسینەوە ) چونکە ئەو خوایە بەڕاستی دەسەلاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە .

ئەمە وەك ئەو فەرمایشتەی خودایە: ﴿ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ﴿٤٨﴾ ﴾ (المائدة)، واتە: ، ئێمە بۆ هەرلایەکتان بەرنامە و پرۆگرامی تایبەتیمان دارشتووە. هەروەها دەفەرموێت: ﴿ لِّكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكًا هُمْ نَاسِكُوهُ ﴿٦٧﴾ ﴾ ( الحج)، واتە: بۆ پەیڕەوانی هەر ئاینێکی ئاسمانی ئێمە لە بواری پەرستشەکاندا هەندێ سروتمان بۆ دیاری کردون کە پێویستە ئەنجامی بدەن.

بەهەمان شێوە دەفەرموێت: ﴿ قُلْ كُلٌّ يَعْمَلُ عَلَىٰ شَاكِلَتِهِ ﴿٨٤﴾ ﴾ ( الأسراء)، واتە: هەروەها پێیان بڵێ: هەر کەس چی بۆ دەکرێت و چۆن دەکات و لاسایی کێ دەکاتەوە (ئازادە ، زۆر لە کەس ناکرێت).

ئەگەر کارەکە بەو شێوازەبێت و هەموو گەلێك قیبلەی خۆی هەبێت ئیتر چ گومانێك لە عەقلی ئەو ئاژاوە پێڕانەدایە و تانە لە پێغەمبەرایەتی و شەریعەت دەدەن!

**پێنجەم: بەڵگەی پێغەمبەرایەتی موحەمەد" سەلات و سەلامی خودای لەسەربێت.**

یەکێکی تر لە وەلامە یەکلاکەرەوەکانی قورئان کە گەورەترین بەلگەشە لەسەر پێغەمبەرێتی موحەمەد "سەلات و سەلامی خودای لەسەربێت" کە پەیوەندی بە گۆڕینی قیبلەوە هەیە، ئەوەیە کە خودا پێغەمبەرەکەی "سەلات و سەلامی خودای لەسەربێت" ئاگادار کردوەتەوە لە قسەی ئەو پیلانە پێش ئەوەی خۆیان دەری ببڕن، بێگومان ڕووداوەکە هەر بەو شێوازە ڕووی دا کەخودا هەوالی بە پێغەمبەرەکەی دابوو، ئەویش خەڵکی لێ ئاگادارکردبووەوە.

ئەمە بەلگەیەکە لەو بەلگانەی کە پێغەمبەرێتی ئەو "سەلات و سەلامی خودای لەسەربێت" دەسەلمێنێت و جۆرێکە لە موعجیزە بە ئاگادارکردنەوەی شتە نادیارەکان، لەتوانای جولەکەو موشریك و دوو ڕووەکاندا بوو کە وەلامی خودا بگۆڕن بەوەی واز لە قسەکردنی خۆیان بهێنن و قورئان بە درۆ بخەنەوە، بەلام نەیانتوانی چونکە هیچ دەستەلاتێکیان نیەو ئەوەش قەدەری خودایە و مولکیش مولکی خۆیەتی، هەمان شت لەگەڵ ( أبو لهب) ڕوویدا نەهات بۆ ئەوەی بلێت – تەنانەت بەدرۆو پڕوپاپەندەش بێت – موسوڵمان بووم و بەوەش ئەوەی کە بۆ موحەمەد هاتوە بە درۆی بخاتەوە.

لەوانەیە یەکێك لە سودەکانی هەوال دان بەقسەی گێل و گەمژەکان پێش ڕوودانی ئەوە بێت دەرونەکان دابمەزرێنێت و ئامادەیان بکات بۆ وەرگرتنی ئەوەی کە ئەو پێلانە دەیلێن، بۆ ئەوەی کاریگەری ئەو قسەیە کەم ببێتەوە و ئاسان ڕووبەڕووی ببنەوە ، لەگەڵ ئامارژەکردن بە پێلی قسەکەرو نەفامێتیەکەی پێش ئەوەی هیچی وتبێت.

**شەشەم: ناوڕۆکی دینداری لە گوێڕایەلی کردنی خودادایە.**

خودای گەورە لە هەندێك ئایەتی تردا ئاماژەی بەوە کردوە کە کرۆکی دین ئەوە نیە ڕووتان وەرپێڕن بەرەو ڕۆژهەڵات یاخود ڕۆژ ئاوا، بەلکو چاکە پێشبڕکێ کردنە لە ئیمان بە خودا و شوێن کەوتنی فەرمانەکانی و گوێڕایەلی کردنی وە ئەنجامدانی کردەوەی چاکە، خودای گەورە دەفەرموێت:

﴿ ۞ لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ وَءَاتَى ٱلْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ذَوِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَٱلسَّآئِلِينَ وَفِى ٱلرِّقَابِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَٰهَدُوا۟ۖ وَٱلصَّٰبِرِينَ فِى ٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلْبَأْسِۗ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾ ﴾ (البقرة)،

واتە: ئەی خەڵکینە! ئەی بڕوادران ! چاکەو چاکەخوازی ئەوەنیە ڕوخساری خۆتان بکەنە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و ، بەتەمابن وڵاتان و گەلانی خۆرهەڵات و خۆر ئاوا بەختیاری و کامەرانیتان بۆ دەستەبەر بکەن ، بەڵکو چاکەو چاکەخوازی لەناخەوە هەڵدەقوڵێ کە ئەویش بریتیە لەباوەڕی دامەزراو بەخوای گەورە ، بەزات و سیفاتی پاشان بەڕۆژی دوایی و قیامەت ، بەبەهەشت و دۆزەخ ، هەروەها بەفریشتەکان ، کە بەندەی ملکەچی خوای گەورەن و چرکەیەك نافەرمانی ناکەن ، هەروەها باوەڕ بەکتێبەکان کەلەلایەن خواوە ڕەوانەکراون بۆ پێغەمبەران ، وە باوەڕ بە پێغەمبەرانیش کە خوای گەورە لەنێو گرۆی ئادەمیزادا هەڵی بژاردوون .. دوای ئەم چەمکانەی باوەڕ: ڕەنگدانەوەی ئیمان لەڕەفتاردا دەبێ دەربکەوێت ، ئەویش بە بەخشینی ماڵ و سامان چەندە خۆشەویست و نازدارە بەخزمانی هەژارو خەڵکی نەدارو کەمدەست و ڕێبواری دابڕاو لەوڵات و سامانی ، هەروەها بۆ ئەو کەسانەی کە ئاتاجی هەن و داوای دەکەن ، هەروەها بۆ ڕزگار کردن و ئازادکردنی گەلان و میللەتان لەدیلی و دەستبەسەری ، پاشان ئەنجامدانی نوێژ بەچاکی وڕێك و پێکی ، بەخشینی زەکاتی ماڵ و سامان و زانست و دەسەڵات و تواناکان ، هەروەها لەچاکەکاری: وەفاکردنی ئەو کەسانەیە بە پەیمان و بەڵێنەکانیان کە هەرکات پەیمان و بەڵێنێکیان دا دەیبەنەسەر ، هەروەها خۆگری و دان بەخۆدا گرتنە لەکاتی تەنگانەو نەخۆشی و ناخۆشی و نەهامەتی ، هەروەها کاتی ڕووبەڕووبەنەوەی دوژمنانی مرۆڤایەتی ، ئائەوانەی کە ئەو سیفاتانەیان تێدایە ، ئائەوانە ئەوانەن کە لەگەڵ بەرنامەی خوادا ڕاستدەکەن و هەرئەوانیشن تەقوادار و دیندار و خواناس ( کە لە ئایندەدا ڕەزامەندی پەروەردگاریان دەستەبەر دەکەن ).

بەواتای حیکمەت لەم بابەتەدا گوێڕایەلی کردنی خوداو شوێن کەوتنی فەرمانەکانیەتی لەگەڵ گرتنە بەری ئەو ڕێگایەی کە ئەو داوای دەکات و گابەند بوون بەو شەریعەتەی کەئەو دایناوە، لە ڕووکردنە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا هیچ زەرورەت و چاکەو گوێڕایەلیەك

نابینرێت، ئەگەر بە فرەمانی خودا نەبێت و بەپێی شەریعەتەکەی ئەونەبێتهەروەك چۆن لەبارەی دیاری و قوربانیەوە دەفەرموێت:

﴿ لَن يَنَالَ ٱللَّهَ لُحُومُهَا وَلَا دِمَآؤُهَا وَلَٰكِن يَنَالُهُ ٱلتَّقْوَىٰ مِنكُمْ كَذَٰلِكَ سَخَّرَهَا لَكُمْ لِتُكَبِّرُوا۟ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمْ وَبَشِّرِ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٣٧﴾ ﴾ (الحج)

واتە: ئەی ئیمانداران ! دڵنیاش بن کە ئەو قوربانیەی دەیکەن ، نە گۆشتی ، نە خوێنی ، بە خوای گەورە ناگات ، بەڵکو ئەوەی کە دەگات و خوای گەورە پێی خۆشە و بۆ خۆشتان زۆر چاکو بەسودە ، تەقواو دینداری و پارێزکاری و خواناسی ئێوەیە ، ئا بەو شێوەیەی کە دەیبینن خوای گەورە ئەو ماڵاتانەی بۆ ڕام هێناون تا هەست بە گەورەیی و شکۆمەندی خوای گەورە بکەن و (سرودی "الله اکبر" لە جەژنەکاندا زۆر دوبارە بکەنەوە) جا مژدەش بدە بە چاکەخوازان .

**بەکورتی:**

- بونەوەر هەموی مولکی خودایە بە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواشەوە، پاك و بێگەردی بۆ خودا کە بە پێی ویستی خۆی چۆنی بوێت ئاراستەی دەکات، وە بۆ هەرکوێیەکی ڕۆژهەڵاتی زەوی بێت یاخود ڕۆژوئاوا.
- گۆڕینی قیبلە تاقی کردنەوەیە بۆ ئاشکرا کردنی دوو ڕووی بەگومان و ئیماندار.
- قسەکانی جولەکە لە ڕق و کینەوە سەرچاوەی گرتوە و ئەو ڕاستیە دەشارنەوە کە دان بە پێغەمبەرێتی موحەمەد "سەلات و سەلامی خودای لەسەربێت" دا بنێن وەك لە تەوراتدا ئاماژەی پێ کراوە.
- هەموو نەتەوەیەك قیبلەیەکی هەیە کە ڕووی تێدەکەن، ئیتر بۆچی قبولی ناکەن کە موسوڵمانەکان قیبلەی تایبەت بە خۆیان هەبێت.

- هەوالـدان بەقسـەی ئـەو پیلانـە پـێش ئـەوەی خۆیـان بیلـێن بەلگەیـە لەسـەر پێغەمبەرێتی موحەمەد"سەلات و سەلامی خودای لەسەربێت".
- حیکمەتی کۆتای لەگشت ئەحکامەکان و فەرمانەکان و و قەدەغەکراوەکان شوێن کەوتنی شەرع و جیّ بەجیّ کردنی فەرمانە لە ڕاستیدا ئەمە کرۆکی دینە.



## گومانی سی و دوو

## بەشداری نەکردن لە جیهاد بەگاساوی شەیدابوون بە ئافرەتان[160]

**ناوەرۆکی بابەتەکە:**

(الجد القیس) برای (بني سلمة) هۆکاری بەشداری نەکردنی لە جیهادی رۆمدا گەڕاندەوە بۆ ئەوەی کە گوایە دەترسێت لەوێ شەیدای ئافرەتەکانیان ببێت و سەرسامس کەنیزەکەکانیان ببێت ئەگەر لە گەڵ پێغەمبەردا جیهاد بکات، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ ائْذَن لِّي وَلَا تَفْتِنِّي ۚ أَلَا فِي الْفِتْنَةِ سَقَطُوا ۗ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌ بِالْكَافِرِينَ ﴿٤٩﴾﴾ (التوبة)، واتە: کەسانێك لەو دووڕووە ناپوختانە بێشەرمانە) دەیوت: مۆڵەتم بدە و توشی گوناهو سەرپێچیم مەکە !! ( بەبیانووی ئەوەی کە لە غەزادا لەوانەیە توشی گوناهو هەڵببێت !! ) لە حاڵێکدا ئەوانە بەردەوام لە گوناهو تاواندا چەقیون ، بێگومان دۆزەخیش گەمارۆی کافرانی داوە .

دەگێرنەوە وەك هەندێك لە دوو ڕووەکان کاتێك پێغەمبەری خودا "سەلات و سەلامی خودای لەسەربێت" بانگی کردن بۆ جەنگی (تبوك) وتیان وتیان شەیدای ئافرەتانیان دەبین.

**ڕێگاکانی پوچەڵ کردنەوەی گومانەکە:**

خاوەنی ئەم قسانە ویستیان بەو بەهانەیەوە بەشداری جیهاد نەکەن لەگەڵ پێغەمبەری خودا "سەلات و سەلامی خودای لەسەربێت" بەلام ئەوانە بەوتنی ئەو قسەیە کەوتنە فیتنەی ڕاستەقینەوە.

---

١٦٠- الآية التي وردت فيها الشبهة (التوبة/ ٤٩)، الآية التي وردت فيها الرد على الشبهة ( التوبة/٤٩).

**درێژەی بابەتەکە:**

خاوەنی ئەم وتەیە ویستی بەشداری جیها نەکات لەگەڵ پێغەمبەری خودا "سەلات وسەلامی خودای لەسەربێت" ئەمە گومانێکی پوچەڵەو خاوەنەکەی ویستی بەو پاساوە بەشداری جیهاد نەکات بەمەبەستی خۆ دزینەوە و خۆ قوتارکردن و ترسنۆکی ، کەسێکی هاوشێوەی ئەم دوو ڕووە لەبەر خودی دوو ڕووییەکەی ترسی ئەوەی نیە گوناهبار ببێت لە هۆی شەیدابوونی ئافرەتەوە، ئەگەر لە حالەتێکدا دینەکەی ڕێگر نەبێت لەوەی بە ڕێگەی حەڵاڵ چێژیان لێ وەربگرێت هەرکاتێك حەزی لێ بێت، بەلکو تەنها مەبەستەکەی خۆ دەرباز کردنە لە جیهاد.

خودای گەورە خودای گەورە وەلامی گومانی ئەو و ئەوانەشی کە هاوڕان لەگەڵی دەداتەوە بەم ئایەتە: ﴿أَلَا فِي الْفِتْنَةِ سَقَطُوا ﴿٤٩﴾﴾ (التوبة)، بە ئامرازی دەستپێکردنی (ألا) سەرەتای ئایەتەکەی دەستپێکردووکەمەبەست لێی ئاگادار کردنەوەو تێڕامانە لەوەی کە لە دوای ئامرازەکەوە دێت و ئاشکراکردنی ناوەڕۆکەکەیەتی ئەگەر هەوالێکی تیدابێت بەمەبەستی ئاراستەکردنی گوێ و دل بۆ لای خۆی، وە پەند لە شەیدابونیان لەکەوتنە فیتنەو بۆ موبالەغەیە، وە ئاوەلفەرمانەکەی، (في الفتنة) پێش خستوە بەسەر بکەرەکەدا (سقطوا) بۆئەوەی دەلالەت بێت بۆ تایبەت کردن، واتە بابزانن بەوتنی ئەم وتەیە ئەوان دووچاری فیتنە بوون و کەوتونەتە چالاوی فیتنەوە بە مانا فراوانەکەی، واتە نەکوتونەتە شتێکی تر کە هاوشێوەی فیتنە بێت چونکە بانگەشەی جۆرەکانی تری فیتنە دەکەن کە مەبەست لێی شەیدا بوونی ئافرەتانی ڕۆمە و سەرقال بوونیانە بە جوانیەکانیان بەمەش دوچاری خراپەیەکی گەورەتر بوون لەوەی کە بیانویان پێ دەهێنایەوە، وەك دولێن عوزر لە قەباعەت خراپترە.

مامۆستا (إبن عاشور) دەڵێت: هێنانی ئامرازی دەستپێکردن لە ڕستەکەدا (أَلَا فِي الْفِتْنَةِ سَقَطُوا ) بۆ ئاگادار کردنەوەیە بۆئەوەی کەلە دوواوە دێت لەسەیرو سەمەرەی حالیان، کەخودا بە پێچەوانەی مەبەستەکەیانەوە مامەڵەی لەگەڵ کردون لە گەڵ ئەوەی ئەوان خۆیان لە فیتنە گاراستوە بەلام کەوتونەتە ناوی.

(أل) تەعریف کەخراوەتە سەر وشەی فیتنە تەعرفی جنسی فیتنەیە کەمەبەست لێی کەوتنە ناو فیتنە گەورەکەیە، کاتێك یەکێك لەوان وتویانە (ولا تفتني) ئەم وشەیە مەبەست لێی چ جۆرێکی فیتنەیە بەو مانایەی ئەوەی کە تێی کەوتوە قورسترە لەوەی خۆی لیَ دەربازکردووە، ئەگەر مەبەستی فیتنەی دینە ئەوەتە کەوتوەتە گەورەترین فیتنە بە هۆی شیك و دوو ڕوویەوە، ئەگەر مەبەستیشی ناشرین بوونی ناوبانگەکەیەتی بەبەشداری نەکردنی ئەوە دووچاری فیتنەیەکی گەورەتر بووە کە ئەویش ئاشکرا بوونی دوڕوویەکەیەتی، یاخود ئەگەر مەبەستیشی فیتنەی سەرلیَ شێوانە بەدوور کەوتنەوە لە کەس وکارو سامانەکەی ئەوە کەوتوەتە گەورەترین ناخۆشی و سەرلێشێوان، بە هۆی نەفرین لیَ کردنی وبوغزاندنی لەلایەن خەڵکەوە، لێرەدا (السقوط) وەك مەجاز بەکارهاتووە لە ڕووی خێرایی تێکەوتن، ئەمە تێکەوتنە بە کەوتنە خوارەوە شوبهێنراوە لە ڕووی ئامادەنەبوون بۆی و کتوگڕیش لەڕووی ئەوەی تێکەوتنەکە لە خالەتێکدایە کەئەوان بیَ خەم بوون لە تێکەوتن، بۆیە نمونەی ئەوان وەك کەسێك وایە بەربێتەوە ناو دۆڵێك لە کاتێکدا کە خۆی وای داناوە لە ڕێگەیەکی تەختدا ڕێگا دەکات.

پاشان خودای گەورە بە لێنیان دەداتیَ لە بەرامبەر ئەو فیتنەیەی کە دوچاری بوون کە دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌ بِالْكَافِرِينَ ﴿٤٩﴾﴾ ( التوبة )، لێکدانەوەکە وێنای دیمەنێك دەکات وە بلێی فیتنە چالێکە فیتنە چیەکانی تێدەکەوێت، وەك ئەوەی دۆزەخ لە گشتیانەوە بێت و گەمارۆیان دەدات و سەرجەم دەلاقەو

ڕێڕەوەکانیان لێ دادەخات و توانای دەربازبونیان نیە، کە ئەوە دەگەیەنێت بە تەواوەتی لە گوناهەکە زیك بونەتەوە بە دلنیاییەوە چاوەڕێی سزان، لە بەرامبەر ئەو درۆو و بەشداری نەکردن و ودابەزین بۆ نزمترین ئاستی بیانو، هەروەها بەهۆی ئاشکرابوونی بێ باوەڕییەکەیان لە کاتێکدا خۆیان بە موسوڵمان نیان دەدەن و دوڕون لەو کارەدا.[١٦١]

**بەکورتی:**

فیتنەی ڕاستەقینە بەشداری نەکردن و بە جێ مانە لە لە ڕێڕەی پێغەمبەر "سەلات و سەلامی خودای لەسەر بێت" نەك چوون بۆ غەزاو شەیدابوون بە ئافرەتان ئەوانە بیانوی بێ بنەمان، ئەوان بە کرداری کەوتنە فیتنەوە کاتێك لە پێغەمبەری خودا دورکەوتنەوە.



١٦١- في ظلال القران، سيد قطب، مرجع سابق، ج:٣ص:١٦٦٤.

## گومانی سی و سێ

## نــاڕەزایی دەربــڕین بەرامبەر تەرازو بــازی و کەمکــردنەوەی نــرخ چــونکە ســامان موڵکی تاکەکانە و بە ویستی خۆیان کاری پێ دەکەن[162]:

**ناوەڕۆکی گومانەکە:**

گەلەکـەی (شـعیب) نارەزاییـان دەربـڕی کاتێـك تـەرازوو بازیـان لـێ قەدەغـەکردن لـە کێشانەو پێوانەدا و وتیان: سامانی خۆمانەو چۆنمان بوێـت بـەکاری دەهێـنین، ئێمـە لـە نێوان خۆماندا ڕازین بەو تالان فرۆشیە بـۆ ڕێگریمـان دەکـەیت لێـی؟! خـودای گـەورەش چیرۆکەکەیان دەپێرێتـەوەو دەفـەرموێت: ﴿ قَالُواْ يَٰشُعَيْبُ أَصَلَوٰتُكَ تَأْمُرُكَ أَن نَّتْرُكَ مَا يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَآ أَوْ أَن نَّفْعَلَ فِيٓ أَمْوَٰلِنَا مَا نَشَٰٓؤُاْۖ إِنَّكَ لَأَنتَ ٱلْحَلِيمُ ٱلرَّشِيدُ ﴿٨٧﴾ ﴾ ( هود)، واتـە: قەومی نالەبار لە وەڵامـی پێغەمبـەری دڵسـۆزیاندا وتیـان: باشـە ، ئـەی شـوعەیب ، ئایا نوێژەکانت فەرمانت پێ دەدات کە ئێمە واز لەو شتانە بێنین کـە سـاڵەهایە باوباپیرانمـان دەیانپەرستن ، یاخود بە ئـارەزووی خۆمـان و چـۆن لەبەرژەوەندیمانـە مـاڵ و سـامانمان زۆرنەکەین بە هەر شێوازێك بێت؟!ئینجا بە گاڵتە پێکردنـەوە و تیـان: خـۆ تـۆ کەسـێکی هێمن و دانا و تێگەیشتوویت؟!!

**ڕێگاکانی پوچەڵ کردنەوەی گومانەکە:**

یەکەم: چەسپاندنی دادگەروەری لە پێوانەو کێشانەدا بەرژەوەندی سەرجەم خەڵکانی تێدایە.

دووەهەم: تاڵانکاری مافەکانی خەڵك خراپەکاری لێ دەکەوێتەوە لەسەر زەووی.

---

١٦٢- الآية التي وردت فيها الشبهة (هود/٨٧)، الآيات التي وردت فيها الرد على الشبهة (هود/ ٨٤،٨٨) ، الشعراء (١٨١،١٨٤).

سێیەم: وتەی پێغەمبەران ڕاستە بۆیە عەقلیش هانی خەڵك دەدات کە شوێن ئەو شتانە بکەون کە ئەوان بانگەشەی بۆدەکەن.

**درێژەی بابەتەکە:**

خەڵکی (مدین) ئەم گومانە بێ بنەمایە دەوروژێنن بۆ وەلامدانەوەی (شعیب) پێغەمبەر کاتێك ڕێگری لێکردن لە کورت هێنان لە کێشانەو پێوانە و تەرازووبازی، هەروەها ڕێگری لێ دەکردن لە بەتالان بردنی کاڵای خەڵك، وپێیان دەوت: ئەگەر لە نێوان خۆماندا ڕازی بین بە تالان فرۆشی واتە فرۆشیار و کڕیار بەو کارە ڕازی بن ئیتر هیچ ڕێگایەك نامێنێتەوە بۆئەوەی ڕێگریمان لێ بکەیت.

وتراوە ئەوەی (شعیب) ڕێگری لێ کردوون پارچە پارچەکردنی درهەمەکان و شکاندنی و سڕینەوەی کەئەوە قسەی خۆیانە: (أَنْ نَفْعَلَ فِي أَمْوَالِنَا مَا نَشَاءُ)، واتە: ئەو سامان و دینارو درهەمەی خۆمان چی لێ دەکەین ئارەزووی خۆمانە، ئەگەر بمانەوێت پارچە پارچەی دەکەین، ئەگەر بمانەوێت دەیسڕینەوە، ئەگەر بمانەوێت فڕێی دەدەین. ئەوان کاتێك پارەیان وەرگرتوە — کەزیو یان زێڕبووە لێیان کەل کردووە و لێیان قرتاندوە و سودیان لە پارچە قرتاوەکان وەرگرتوە، بەلام کاتێك کە ئەو گارانەیان داوە بە قەرز بە ژمارە تەسلیمیان کردووە دواتر کەوەریان گرتوەتەوە بە کێشانە وەریانگرتوەتەوە.

**یەکەم: چەسپاندنی دادگەروەری لە پێوانەو کێشانەدا بەرژەوەندی خەڵکی تێدایە.**

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ۞ وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا ۚ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ ۖ وَلَا تَنقُصُوا۟ ٱلْمِكْيَالَ وَٱلْمِيزَانَ ۚ إِنِّىٓ أَرَىٰكُم بِخَيْرٍ وَإِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ مُّحِيطٍ ﴿٨٤﴾ وَيَٰقَوْمِ أَوْفُوا۟ ٱلْمِكْيَالَ وَٱلْمِيزَانَ بِٱلْقِسْطِ ۖ وَلَا تَبْخَسُوا۟ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٨٥﴾ بَقِيَّتُ ٱللَّهِ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ۚ وَمَآ أَنَا۠ عَلَيْكُم بِحَفِيظٍ ﴿٨٦﴾ ﴾ (هود).

واتە: بۆلای خەڵکی شاری مەدیەنیش شوعەیبی برایمان ڕەوانە کرد ، ئەویش پێی ووتن: خزمینە داواتان لێ دەکەم کە تەنها خوای گەورە بپەرستن ، چونکە جگە لەو زاتە خوایەکی تری بەحەق نیە کە شایستەی پەرستن بێت ، هەروەها داواکاریشم لێتان کەلە کێشان و پێواندا کەمفرۆشی و تەرازوو بازی مەکەن ، چونکە من بە ئاشکرا دەتانبینم لە خێر و خۆشیدان ، بەڵام ئەگەر لەسەر بتپەرستی و تەرازوو بازی بەردەوام بن و کۆڵ نەدەن ، دەترسم ڕۆژێك لە ڕۆژان سزایەکی خوایی گەمارۆتان بدات و هەمووتان لەناوبەرێت.. * خزمینە ، هەوڵبدەن کە کێشان و پێوانتان بە تەواوی ڕێکوپێك و دادپەروەرانە بێت ، شتومەکی خەڵکی کەم نرخ مەکەن و فێڵیان لێ مەکەن ، لە مەملەکەتی خۆتاندا تۆوی فەساد و گوناهو لادان مەچێنن.. * دڵنیاش بن کە ئەو بەشەی خوای گەورە پێیداون لە ڕزق و ڕۆزی حەڵاڵ چاکترە بۆتان ئەگەر باوەڕتان هەیە ، هەرچەندە من چاودێرنیم بەسەرتانەوە (بەڵام دڵنیابن کە خوای گەورە ئاگاداری هەموو شتێکتانە).

لێرەدا بابەتەکە بابەتی ئەمانەت و داد گەروەرییە پاشان بابەتی ئایین و باوەڕە یاخود بابەتی شەریعەت ومامەڵەیە کە لە باوەڕو ئاینەوە سەرچاوە دەگرێت، خەڵکی مەدیەن ولاتەکەیان دەکەوتە سەر ڕێگای حیجاز تا شام لەکێشانەو پێوانەدا کەمیان دەکێشا و شتی خەڵکیان بە تالان دەبرد، واتە نرخێکی کەمیان لەسەر کاڵا دادەنا لەکاتی مامەڵەکردندا،ئەوەش ڕەفتارێکی ناشرینە کەزیان بە دەست و دلپاکی دەگەیەنێت، هەروەك چۆن زیان بەشەرەف وپیاوەتی دەگەیەنێت، هەروەها بە هۆی شوێنی جوگرافی ولاتەکەیانەوە دەیانتوانی ڕێگە بگرن لەو کاروانانەی لەو ڕێگەیەوە هاتوچۆیان دەکرد لە نێوان سەرو خوارووی دورگەکەوە، بە ئارەزووی خۆیان دەستیان وەردەدا لە ڕێگەی کاروانەکانداو هەرشتێکیان بویستایە لەکاتی نامەلە ناگەسەندەکەیاندا کە قورئان ئاماژەی پێکردوە دەیان سەپاند بەسەر کاروانەکاندا، ئاشکرایە پەیوەندی یەکتا

گەرەستی و دینداری کردن بۆخودا بەستراوە بـە ئەمانـەت پـارێزی و خـاوێنی و مامەڵـەی دادپەروەرانە و وەرگرتن و بەخشینی رێزدارانە.

وەقەلاچۆ کردنی دزی نهێنی کە ئەگەر تـاك پێـی هەسـتێت یـاخود دەولـەتان، ئەوانـە گرێنتین بۆ ژیانێکی باشتر بۆ مرۆڤایەتی، هەروەها گرێنتین بۆ بۆ دادپەروەری و ئاسایش لە نێوان مرۆڤەکانی سەر زەوی، ئەوە تەنها گرێنتیە کـە گشـت دەبەسـتێت بـە تـرس لـە خوداو هەوڵدان بۆ رەزامەندی ئەو وە گشت دەبەسـتێت بـە سەرچـاوەیەکی چەسـگاو کـە گۆڕانکاری بەسەر دانایەت بە گۆڕانی بەرژەوەندی و حەزو ئارەزوو.

پێویستە ڕەوشت و مامەڵە پشت بەسەرچاوەیەکی چەسپاو ببەستن کە پەیوەنـدی بـە گۆڕانکارییەکانەوە نەبێت، ئەمە تێڕوانینی ئیسلامە، کـە لـە ڕەگ و ریشـەوە پێچـەوانەیە لەگەڵ سەرجەم تێڕوانینە کۆمەڵایەتی و ئەخلاقیەکان کـە پشـت بـە تێـڕوانین و بۆچـونی مرۆڤ دەبەستێت بە پێی بارو دۆخ و بەرژەوەندیەکانیان، تێڕوانینی ئیسـلام کاتێـك پشـت بە سەرچـاوەیەکی چەسـپاو دەبسـتێت ئـیتر کاریگـەری بەرژەوەندیـە مادیـەکانی لەسـەر نامێنێت، هەروەك چۆن کاریگەری ژینگەو کردارە باوەکانی لەسەر نامێنێت.

ژیـانی ئەوکەسـانەی کەلەسـەر کشـت وکـال دەژیـن یـا شـوانی دەکـەن یـاخود بـە پیشەسازیەوە سەرقالن ئەوە شێوازی ڕەفتاریان دیاری ناکـات چـونکە ئـەم هۆکارانـە لـە گۆڕاندان و شوێنەواری لەسەر ئەخلاق ویاساکانی مامەڵەی ئەخلاقی کەم دەبێتەوە کاتێك سەرچاوەی یاساکانی ژیان ئەبێتەوە بەشەریعەتی خودا.

ئەم گۆڕانکارییانە کاریگەریان لەدەست دەدەن لـە تێـڕوانینی ئـەخلاقی و بنـەماکانی مامەڵەی ئەخلاقی لەکاتێکدا سەرچاوەی یاسادانان بۆ ژیان دەگەرێتـەوە بۆخـودا، وەلـەو کاتەشی بنەمای ڕەفتار دەگۆردرێت بۆ بۆ رازیکردنی خودا و چاوەڕێ کردنی پاداشتی و خۆ بەدوورگرتن لە تۆلەی ئەو.

هەموو ئەوانەی خاوەن بیردۆزە دانراوەکان بانگەشەی بۆدەکەن لە تێکەڵ کردنی ئەخلاق بە مامەڵە بازرگانیەکان وچەسپاندنی پەیوەندی کۆمەڵایەتی بۆ گەڵ هەموو ئەمانە لە بەرامبەر تێڕوانینی ئیسلام بۆ ئەخلاق هەڵدەوەشێنەوە کە خودای گەورە ئاماژەی گی کردووە و دەفەرموێت: ﴿ ۞ وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا ۚ قَالَ يَـٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَـٰهٍ غَيْرُهُۥ ۖ وَلَا تَنقُصُوا۟ ٱلْمِكْيَالَ وَٱلْمِيزَانَ ۚ إِنِّىٓ أَرَىٰكُم بِخَيْرٍ وَإِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ مُّحِيطٍ ﴿٨٤﴾ ﴾ ( هود)، واتە: بۆلای خەڵکی شاری مەدیەنیش شوعەیبی برایمان ڕەوانە کرد ، ئەویش پێی ووتن: خزمینە داواتان لێ دەکەم کە تەنها خوای گەورە بپەرستن ، چونکە جگە لەو زاتە خوایەکی تری بەحەق نیە کە شایستەی پەرستن بێت ، هەروەها داواکاریشم لێتان کەلە کێشان و پێواندا کەمفرۆشی و تەرازوو بازی مەکەن ، چونکە من بە ئاشکرا دەتانبینم لە خێر و خۆشیدان ، بەڵام ئەگەر لەسەر بتپەرستی و تەرازوو بازی بەردەوام بن و کۆڵ نەدەن ، دەترسم ڕۆژێك لە ڕۆژان سزایەکی خوایی گەمارۆتان بدات و هەمووتان لەناوبەرێت..

خودای گەورە ڕۆزیەکی باشی پێداون پێویستیان بەو ڕیسواییە نیە بۆ ئەوەی دەولەمەندبن، وەبەکەم وکورتی لە کێشانەو پێوانەدا زیانتان پێ ناگات وهەژار ناکەون، بەلکو قازانجتا لە ژێر هەڕەشەدایە تا ئەوکاتەی کە بەردەوام بن لە فێل کردن لە مامەڵەدا، یاخود بزۆر بکڕن و بفرۆشن جگە لەوانەش دەفەرموێت:{ وَإِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ مُّحِيطٍ }( هود/٨٤). چ لەلای خودا بێت لە دوا ڕۆژدا چ لە دونیادا بێت ئەوکاتەی ئەو فێل و زۆرەملێ دەرئەنجامە تال و خراپەکانی لە کۆمەلگاو جولەی بازرگانی دا ڕەنگ دەداتەوە،لەکاتێکدا خەڵك بە دەست خراپەی یەکترەوە دەناڵێنن لەسەر جەم جولەی رۆژانە و مامەڵەو ڕوبەڕوبونەوەیەکدا.

جارێکی تر شعیب ئامۆژگاریەکانی دوکات دەکاتەوە لەگۆشە نیگای ئەرێنیەوە پاش ئاگادار کردنەوەیان لە گۆشە نیگای نەرێنی﴿ وَيَٰقَوۡمِ أَوۡفُواْ ٱلۡمِكۡيَالَ وَٱلۡمِيزَانَ بِٱلۡقِسۡطِۖ ﴾ (٨٥) ( هود). بێگومان تێرو تەسەلی لە پێوانەو کێشانەدا بەهێزترو چاکترە لە کورت هێنانی، چونکە مەیلی بەلای زیادەوە هەیە، دەستەواژەکان سێبەریان بەسەر هەستەوەهەیە، سێبەری کاملۆەك سێبەری بێ کەم و کورتی نیە، سێبەرە کاملەکە فراوانترو گەیەنەرترە.

**دووەم: بەتالان بردنی مافی خەلک خراپە کارییە لەسەر زەوییدا.**

خودای گەورە دەفەرموێت :{ وَلَا تَبۡخَسُواْ ٱلنَّاسَ أَشۡيَآءَهُمۡ }( هود/٨٥) .مەبەستی ئەم ئایەتە پیرۆزە زۆر فراوانترە لە کێشانەکان و پێوانەکان، واتە ڕاستکردنەوەی هەمو جۆرەکانی پێویستی خەلك دەگرێتەوە: ڕاست کردنەوەیان لە کێشانەو پێوانە یا خود لەنرخ و ئەندازە، هەروەها ڕاست کردنەوەیان لە ڕووی مادی ومەعنەویەوە، بێگومان کردارو ڕەفتاریش لە خۆ دەگرێت چونکە وشەی (شیء) هەندێ جار واتای شتەکان بە گشتی دەگەیەنێت و مەبەست لێی شتە هەست پێکراوەکان نیە.

بەتالان بردنی مالی خەلك جگە لەوەی کە ستەمێکە لە ناخی مرۆڤەکانیشدا هەستی خراپ و ئازارو ڕق وقین بلاو دەکاتەوە یا خود نائومید بوون لە دادگەری و چاکەو هەلسەنگاندنی باش سەرجەم ئەو هەستانە ژینگەی مرۆڤەکان تێك دەدات بە هەمان شێوە مامەلە کردن و پەیوەندییە کۆمەلایەتیەکان و ویژدان دەشێوێنێت هیچ بە هایەکی جوانی ژیان نامێنێت. ( ولا تعثوا في الارض مفسدين) ﴿ وَلَا تَعۡثَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُفۡسِدِينَ (٨٥) ﴾ ( هود).

العثوا، واتە: خرابە و ئاشوب، بەومانایەی بە ئەنقەست خراپە ئەنجام مەدەن بە نیازی خراپەکاری و نیازتان چەسپاندنی بێت، پاشان ویژدانیان بە ئاگا دەهێنێتەوە بۆ

چاکەیەکی هەمیشەیی لە بەرامبەر ئەو کەسابەتە قیزەونەی کە لە ڕێگەر تەرازو بازی و بەتالان بردنی کاڵای خەڵکەوە دەستیان دەکەوێت: ﴿بَقِيَّتُ ٱللَّهِ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَۚ ﴿٨٦﴾﴾ (هود)، ئەوەی لای خودایە باشترو مسۆگەرە، لەسەرەتای وتەکانیدا بانگیان دەکات بۆ خوداگەرەستی واتە: دینداری کردن بە بێ شیرك، ئەو لێرەدا دینداریان وە بیر دەهێنێتەوە لە گەڵ ئامـاژەکردن بە چاکەیەکی نەبڕاوە لەلایەن خوداوە بەو مەرجەی بەوشێوازە باوەڕی پێ بهێنن کە بانگی کردوون بۆی وە شوێن ئامۆژگارییەکانی بکەون لە مامەڵەکردندا کە ئەویش لقێکە لە باوەڕ.

﴿بَقِيَّتُ ٱللَّهِ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَۚ ﴿٨٦﴾﴾ (هود)، پاشان مەودایەك دەخاتە نێوان ئەوان و ئەو خودایەی کەبانگی کردوون بۆ لای، وە بۆیان ڕوون دەکاتەوە کەئەم هیچ شتێکی لە دەست نایە بۆیان، هەروەك چۆن ناتوانێت ببێتە بریکاریان بۆ پاراستنیان لە خراپەو سزا، بەهەمان شێوە بریکاریان لەوەی کە بیانپارێزێت لە گومرایی و بەرپرس نیە لە گومراییان، ئەو تەنها گەیاندنی لەسەرە﴿وَمَآ أَنَا۠ عَلَيۡكُم بِحَفِيظٖ ﴿٨٦﴾﴾ (هود)، ئەم شێوازە دەربڕینانە هەستێکی ترسناك لەلای کەسی دوێنراو (قسەلەگەڵ کراو) دروست دەکات، بە خستنە ڕووی دەرئەنجامێکی سەخت هەروەها ڕوبەڕویان دەکاتەوە لە گەڵ عاقیبەتی کارەکەیان بە بێ دەلال و پارێزەر.

بەلام ئەوان لەخۆبایی بوون و توشی لادان و خراپەو هەل پەرەستی بوون و پێغەمبەرەکەیان وت: ﴿قَالُواْ يَٰشُعَيۡبُ أَصَلَوٰتُكَ تَأۡمُرُكَ أَن نَّتۡرُكَ مَا يَعۡبُدُ ءَابَآؤُنَآ أَوۡ أَن نَّفۡعَلَ فِيٓ أَمۡوَٰلِنَا مَا نَشَٰٓؤُاْۖ إِنَّكَ لَأَنتَ ٱلۡحَلِيمُ ٱلرَّشِيدُ ﴿٨٧﴾﴾ (هود)، واتە: قەومی نالەبار لە وەڵامی پێغەمبەری دڵسۆزیاندا وتیان: باشە ، ئەی شوعەیب ، ئایا نوێژەکانت فەرمانت پێ دەدات کە ئێمە واز لەو شتانە بێنین کە ساڵەهایە باوباپیرانمان دەیانپەرستن ، یاخود بە ئارەزووی خۆمان و چۆن لەبەرژەوەندیمانە ماڵ و سامانمان زۆرنەکەین بە هەر

شێوازێك بێت؟! ئینجا بـه گاڵتـه پێکردنـەوه و تیـان: خـۆ تـۆ کەسـێکی هـێمن و دانـا و تێگەیشتوویت؟!!

ئەوە وەڵامێکی ڕوونی گاڵتەجاڕانە بوو، لـە هـەر برگەیـەك لـە برگەکانیـدا سـوکایەتی کردن بە ڕونی دیاربوو، ئەگەر چی سوکایەتی پێکردنـی دوو ڕوو ولـوت بـەرزو نەشـارەزاو ناحالیــە کــە دەلێــت: ﴿ قَالُواْ يَـٰشُعَيْبُ أَصَلَوٰتُكَ تَأْمُرُكَ أَن نَّتْرُكَ مَا يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَآ أَوْ أَن نَّفْعَلَ فِىٓ أَمْوَٰلِنَا مَا نَشَـٰٓؤُاْ ۖ إِنَّكَ لَأَنتَ ٱلْحَلِيمُ ٱلرَّشِيدُ ﴿٨٧﴾ ﴾ ( هود)، بێگومان ئـەوان دەرکـی پێ ناکەن و ناشیانەوێت دەرکی پێ بکەن کە نوێژ یەکێکـە لـە پێویسـتیەکانی عەقیـدە و یەکێکە لە سیماکانی دینداری و بەندایەتی باوەڕیشی دانامەزرێت بە بـێ یەکتاپـەرەسـتی، بێگومـان ئـەوان خۆشـیان و باوبـا پیرانیشـیان پـەرەسـتنی ئـەویان پشـتگوێی خسـتوە، بەهـەمان شـێوە بـاوەڕ دانامـەزرێت بـە جـێ بـەجێ کردنـی شـەریعەتی خـودا نـەبێت لـە بازرگـانی و ئـالوویرکردنی سـامان و لـە سـەرجەم کـارو بارەکـانی ژیـان و مامەڵەکردنـدا، هەموی یەك شتە لـە ڕووی بـاوەڕەوە نوێـژو یاسـاکانی ژیـان و بـارودۆخی ژیـان لەیـەکتر جیاناکرێنەوە.[١٦٣]

**سێیەم: ئەوەی پێغەمبەرەکەیا لێی داواکردون عەقلیش گشتگیری لێ دەکات.**

شعیب پێغەمبـەر وەلامـی دانـەوەو وفـەرموی: ﴿ قَالَ يَـٰقَوْمِ أَرَءَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّى وَرَزَقَنِى مِنْهُ رِزْقًا حَسَنًا ۚ وَمَآ أُرِيدُ أَنْ أُخَالِفَكُمْ إِلَىٰ مَآ أَنْهَىٰكُمْ عَنْهُ ۚ إِنْ أُرِيدُ إِلَّا ٱلْإِصْلَـٰحَ مَا ٱسْتَطَعْتُ ۚ وَمَا تَوْفِيقِىٓ إِلَّا بِٱللَّهِ ۚ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ ﴿٨٨﴾ ﴾ ( هود)، واتە: شـوعەیب وتـی: باشـە ، خزمینە ئەگەر من لە لایەن پەروەردگارمەوە بەڵگەی ڕونم پێدرا بێت و دڵنیابم ، هـەروەها بەرنامە و ڕێبازێکی چاکم گرتبێتە بەر و حەزیش بکەم ئێوەش وابکەن ، (ئایا من کارێکی

١٦٣ – في ظلال القران، سيد قطب، مرجع سابق، ج:١، ص: ١٩١٩،١٩١٨.

ناڕەوا دەکەم؟!) بە تایبەت ئەوەتە خۆتان دەزانن بە ڕێگەی حەڵاڵ خوای گەورە ڕزق و ڕۆزی چاکی داومەتێ و دەوڵەمەندی کردوم... دڵنیاش بن کە من داوای شتێکتان لێ ناکەم کە خۆم پێچەوانەکەی بکەم ، من چەندە بتوانم تەنها چاکسازیم دەوێت لە ئێوە(لە عەقیدە و بیروباوەڕتاندا ، لە پەرستن و هەڵسوکەوتاندا لە ژیانی ئابوری و کۆمەڵایەتیتاندا) پشت و پەناو سەرکەوتنم تەنها بە دەست خوایە ، داوای یارمەتی هەر لەو زاتە دەکەم و سەرئەنجام هەر بۆ لای ئەویش دەگەڕێمەوە.

. بەو مانایەی: ئەگەر من بەلگەیەکی ڕوونم لەلایەن پەروەردگارەوە پێ بێت چی پالتان پێوە دەنێت بە درۆم بخەنەوە، یاخود چی ڕزگارتان دەکات لە عاقیبەتی بە درۆخستنەوەم؟ ئەو هۆشیارکردنەوەیە بۆیان لەسەر ئەگەری ڕاستی قسەکانی واتە ئەگەر قسەکانم ڕاست بوو؟ یەکلا ببنەوە کە ئەم ئەگەرەیان وەربگرن ،هەروەها یەکلا ببنەوەو تەماشای ناوەڕۆکی ئەو شتانەبکەن کە لێم قەدەغە کردوون بۆئەوەی بزانن کە لە بەرژەوەندی و سود و قازانجی خۆتانە و کارەکانتان دامەزراو دەکات و چاکەو بەختەوەریتان بۆ دەستەبەر دەکات، دادپەروەری لەوەدایە کە لێم قەدەغە کردوون بەوەی مافەکانی خەڵك بپێڕنەوە لەوەی دەکێشرێت و دەپێورێت بەتێرو تەسەلی و بەبێ کەم و کورتی، من چاودێر نیم بەسەرتانەوە بەلکو خودا چاودێرو گاسەوانە بەسەرتان لە مامەڵەکانتاندا و لە هەموو بارو دۆخێکدا.

پاشان هۆکاری قەدەکردنەکەی بۆ ڕوون کردنەوە بەوەی کە ئەوان خاوەن خێرو بێر و نیعمەت و سامانێکی زۆرن،نیعمەتەکانی خودا لەسەر لەسەر پێچیکردنی ئەو و زیان گەیاندن بە بەندەکانی بە کار مەهێنن، ئەوەندە خێرو بێرتان لە بەردەستدایە کە پێویستیتان بە سامانی خەڵك نەبێت بە ناڕەوا، پاش ڕونکردنەوەی ئەم هۆکارە هۆکارێکی تر ڕوون دەکاتەوە ئەویش وەبیرهێنانەوەی سزای دوارۆژە لەسەریان، وەك چۆن هۆکاری یەکەم بیرخستنەوەی نیعمەتەکانی دونیا بوو کەفەرموی:

﴿ ۞ وَإِلَىٰ مَدۡيَنَ أَخَاهُمۡ شُعَيۡبٗاۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥۖ وَلَا تَنقُصُواْ ٱلۡمِكۡيَالَ وَٱلۡمِيزَانَۖ إِنِّيٓ أَرَىٰكُم بِخَيۡرٖ وَإِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٖ مُّحِيطٖ ﴿٨٤﴾ وَيَٰقَوۡمِ أَوۡفُواْ ٱلۡمِكۡيَالَ وَٱلۡمِيزَانَ بِٱلۡقِسۡطِۖ وَلَا تَبۡخَسُواْ ٱلنَّاسَ أَشۡيَآءَهُمۡ وَلَا تَعۡثَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُفۡسِدِينَ ﴿٨٥﴾ ﴾ (هود).

مەبەست لە (إيفاء) لەكێشانەو پێوانەدا بە جێ گەیاندنی دادپەروەرییە بە بێ زیاد وکەم ئەمەش وادەکات کە هەر کەسێك ماڤی خۆی وەربگرێت بە بێ ستەم لێکردن و سنور بەزاندن، بێگومان عەقڵە بێدارەکان و سروشتە پاکەکان هاوڕان لەگەڵ ئەم جۆرە مامەڵەیە.

شعیب لە قسەکانیدا پێی فەرمون: ﴿ وَرَزَقَنِي مِنۡهُ رِزۡقًا حَسَنٗاۚ ﴾ ( هود/ ٨٨)، ئاماژەیە بۆ ئاشناکردنیان بە شتێك کە خۆیان لێ پێل کردوە هەروەها ئاگادارکردنەوەیان لە کارێك کە بێ ئاگا بوون لێی، ئەویش ئەوەیە کە خودا ڕۆزی دەرە و ئەو سامانەشی کە گوایە بە ئازایەتی خۆیان زیادیام کردووە ڕۆزی خودایە، لە ڕاستیدا سامان سامانی خودایە و ئەوان کراونەتە جێنشین لە سەری بەمەش هەڵەو تاوانیان ئاشکرابوو کە دەیانوت: ﴿ أَوۡ أَن نَّفۡعَلَ فِيٓ أَمۡوَٰلِنَا مَا نَشَٰٓؤُاْۖ ﴿٨٧﴾ ﴾ ( هود). لە بەر ئەوە پێی فەرمون: ﴿ وَمَآ أَنَا۠ عَلَيۡكُم بِحَفِيظٖ ﴿٨٦﴾ ﴾ ( هود).

چونکە خودا خۆی پارێزەرو چاودێرە بەسەریانەوە لە ڕەفتارو کرداریان لە بەڕێوەبردنی سامانەکەیان، بۆیە بۆیان نیە بەئارەزووی خۆیان بەڕێوەی بەرن، دەبێت بە شێوازێکی ڕاست و دروست و بەو جۆرە بێت کەلە گەڵ ویستی ئەو خودا یەك بگرێتەوە وەك پێی بەخشیون.

**بەکورتی:**

- چەسپاندنی دادگەروەری لە کێشانەو پێوانەدا دەمانگەیەنێتە ئەوەی هەموو مرۆڤێك مافی خۆی وەربگرێت بە بێ ستەم لێکردن و سنور بەزاندن، بەلام بە تالان خواردنی مافی خەڵك هۆکارە بۆ خراپەکاری لەسەر زەوییدا.
- ئەوەی کە پێغەمبەرەکەیان فەرمانیان پێ دەکات ئەگەری هەیە ڕاست بێت، بۆیە عەقل و مەنتق داوایان لێ دەکات کە لێی تێبگەن، خۆ ئەگەر باشی و سودو قازانجەکەی ئاشکرابوو ئەوە ئەوان هیچ زەرەرێکیان نەکردووە بەلام ئەگەر دەرئەنجامێکی خراپی هەبوو دەتوانن بگەڕێنەوە بۆ بیرو باوەڕەکەی خۆین.
- خودا ڕۆزی دەرەوە مال و سامانیش بە ئەمانەت دەداتە دەست مرۆڤ، پاشان ئەگەر لە جێگەی خۆیدا واتە بە تەندروستانە بە کاری نەهێنا ئەوە سزا دەدرێت لەسەری و پاداشتیش وەردەگرێت ئەگەر بە شێوازێکی ڕاست و دروست بە کاری هێنا.

تەوەرەی دووەم: ئەو گومانانەی کە پەیوەندی دارن بە سەرپێچی فەرمانەکانی خوداوە:



## گومانی سی وچوار

## بانگەشەکردن بۆ ئەوەی کە (إبلیس) لە ڕووی دروستکردنەوە لە (ئادەم) باشترە بۆیە ڕێگری لێ دەکات کە سوجدەی بۆ ببات.[١٦٤]

**ناوەڕۆکی گومانەکە:**

ابلیس بەرهەڵستی کرد کە سوجدە بۆ ئادەم ببات بە بیانوی ئەوەی کە چاکتر سوجدە بۆ چاك نابات، وئەو خۆی وای دەزانی کە خۆی لە ئادەم چاکترە چونکە ئەو لە ئاگر دروستکراوەو ئادەمیش لە قوڕ دروستکراوە، لە بنەڕەتیشدا ڕەگەزی ئاگر باشترە لە قوڕ، ئیتر چۆن سوجدەی بۆ ببات ؟ خودای گەورەش دەفەرموێت: ﴿ قَالَ مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسْجُدَ إِذْ أَمَرْتُكَ قَالَ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِى مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ ﴿١٢﴾ ﴾ ( الاعـراف)، واتـە: ئەوسا خـوای گەورە فەرمووی: باشە ئەوە تۆ چی وای لێ کردی کە سوژدە نەبەیت و لـە فـەرمانی مـن یاخی بیت ؟! شەیتان ووتی: ئاخر ، من لەو چاکترم ، تۆ منت لە ئاگر دروست کردووە ، بەڵام ئەوت لە خاك بەدی هێناوە !!.

**ڕێگاکانی پوچەڵ کردنەوەی گومانەکە:**

یەکەم: قسەی إبلیس عوزری لە قەباعەت خراپتر بوو سەرچاوەکەشی لوت بەرزی و ڕق وقین بوو، وەلامەکەشی گڕاوگڕە لە نەزانی و پێلی، چونکە کەس بۆی نیە ڕەخنـە لـە خودا بگرێت لەبەرئەوەی خودا خۆی خاوەن بەلگەی بە هێزە.

دووەم پێوەری إبلیس پێوەرێکی ناڕێکە، ئێمە دان بەوەدا نانێین کە ئاگر باشـترە لـە قوڕ بەلکو پێچەوانەکەی ڕاسـترە.

---

١٦٤ – الآيات التي وردت فيها الشبهة: ( الاعراف/١٢، الحجر/٣٣، ص/ ٧٦، الاسراء/ ٦١،٦٢).
الآيات التي وردت فيها الرد على الشبهة: (الاعراف/١٣، الحجر/٣٤، ص/ ٧٥، البقرة/٣٤).

**دریژەی بابەتەکە:**

**یەکەم: عەزر لە قەباعەت خراپترە.**

گوزارشتەکەی إبلیس نەفرەتی خودای لیٚ بیٚت کە گەورەتر و ناشرین ترە لە تاوان، ریٚگری کرد لە گویٚڕایەلی کردن چونکە خۆی بە باشتر دەزانی لە ئادەم وەك بلیٚت: من لەو باشترم چۆن فەرمانم پیٚ دەکەیت سوجدەی بۆ بەرم چاکتر فەرمانی پیٚ ناکریٚت کە سوجدە بۆ چاك بەریٚت؟!

پاشان إبلیس –نەفرەتی خودای لیٚ بیٚت باسی بیانوەکانی کرد کە هۆکاری بەرهەڵست کردنی بوو بۆ سوجدە بردن بۆ ئادم، ئەویش ئەوە بوو کە ئەو لەو باشترە چونکە لە ئاگر دروستکراوە،ئاگریش پیرۆزترە لەوەی کە ئادەمی لیٚ دروستکراوەکە ئەویش قوڕە، نەفرەت لیٚکراوە تەماشای بنەڕەتی ڕەگەزەکەی کرد، بەلام تەماشای ئەو ڕیٚزو گەورەییەی نەکرد کە خودا (جل جلاله) بەدەستی خۆی ئادەمی دروستکرد و فی کرد بە ڕۆحیدا.

ئەو نەفرەت لیٚکراوە پیٚوەریٚکی نادروستی بەکار هیٚنا لە لە ڕوو بەڕوو بونەوەی ئەم دەقە: { فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ }( ص/٧٢)، واتە: وە فەرمانمدا ئیٚوەی فریشتە هەموتان سوژدەی (ڕیٚزو تەقدیری بە فەرمانی من) بۆ بەرن .

هەڵەی کرد خودا ڕیسوای بکات بۆخۆی و پیٚوەرەکەی . وەلامە پیٚشوەکانی إبلیس نەفاییەکی لە ڕادەبەدەری تیٚدا بەدی دەکرا، ئەو هۆکارەش کە پالی پیٚوەنا – نەفرەتی لیٚ بیٚت لوت بەرزی و ئیرەی بوو، ئەو دوانە کویٚرای بە سەر چاو دا دەهیٚنن و ئەم دەر ئەنجامەی لیٚ دەکەویٚتەوە:

یەکەم: بەرهەڵستی کردنی گەروەردگار و بەدیهیٚنەری وەك لە ناوەڕۆکی وەلامەکەیدایە، هەر کەسیٚك سەرپیٚچی کەلامی خودا بکات ئەگەر لەگەڵ حەزو ئارەزوییدا

ئەگونجا ئەوە هاوشێوەی ئەوە، ئەمەش بێ باوەڕییە کەسێك کە باوەڕی بە خوداو بە کتێبەکەی هەبێت ناکەوێتە ئەو هەڵەیەوە، بێگومان باوەڕدار ئەگەر ڕاستیەکی لا شاراوە بوو یا خود لە حیکمەتی خودا حالی نەدەبوو ئەوە دەگەڕێت بەدوایدا بە بیر لێکردنەوە لێکولینەوەو پرسیارکردن لە زانایان و ئارام دەگرێت تا ئەو کاتەی وەلامێکی قایل کەری دەست دەکەوێت، بەجۆرێك کە دلنیایی پێ ببەخشێت، پێش ئەوەش لەو سنورەدا وەستاوە کە خودا هەموو شتێك دەزانێت لە سەر دروستکراوەکانی کەئەم ئەو ڕاستیانە نازانێت . بە هەمان شێوە ئەکرێت هۆکارو سودی فەرمانەکان و قەدەغە لێکراوەکانی بە وردی شارەزا نەبێت: ﴿ أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ ﴿١٤﴾ ﴾ ( الملك)، واتە: مەگەر ئەو زاتە نازانێ کێی دروستکردووە و چۆنی دروستکردووە ، لە کاتێکدا ئەو خوایە ووردکار و بە سۆز و بە لوتف و ئاگایە. (بەنهێنی هەموو دروستکراوەکانی ). عاقلەکان بە هۆی عاقلیانەوە سەرپێچی لە فەرمانی خودا ناکەن وهیچ دروستکراوێك پرسیاری هۆکارەکانی لێ ناکات.

دووەم: دەربڕینی ناڕەزایی بەرامبەر خودا بە شتێك کە گشتگیری لە بیانوەکەی خۆی بکات، ئیمانداری گوێڕایەل ناڕازی نیە لە بەرامبەر خودا بەلکو باش دەزانێت کە خودا خاوەن بەلگەی بە هێزە: ﴿ قُلْ فَلِلَّهِ الْحُجَّةُ الْبَالِغَةُ فَلَوْ شَاءَ لَهَدَاكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿١٤٩﴾ ﴾ (الانعام)، واتە: ئەی پێغەمبەر پێیان بلێ: دڵنیا بن کە بەڵگە بەهێز و تیر و تەواوەکان هەر لای خوای گەورەیە ، خۆ ئەگەر بیویستایە هەر هەمووتانی ناچاری هیدایەت و دینداری ڕاستەقینە دەکرد ( بەلام ڕێزی لێ ناون و سەرپشکی کردوون ، زۆرتان لەسەر نیە تا ڕێبازی دینداری ، یان بێ دینی بگرنە بەر ).

سێیەم: گوێڕایەلی فەرمانی پەروەردگاری مەرجدار کراوە بە ڕازیبونی بەندە لە بڕیارەکانی خودا، بە جۆرێك کە لە گەڵ هەواو ئارەزوییدا یەك بگرێتەوە، ئەمە

ڕەتکردنـەوەی گوێڕایـەڵی گـەروەردپارە، دەرچـونە لـە گلـەی بەندایـەتی و خـۆ بلنـد کردنەوەیە بۆ ئاستێك کە خـۆی هاوتـای ئـەو دادەنێـت، ئەمـەش لـە حـوکمی دینـدا بـێ باوەڕییە وە لە ڕووی عەقلیشەوە پێلی و نەفامیە، ئەگەر بەرپرسی ولاتێك یـان سـوپایەك یان دامەزراوەیەك یان کۆمگانیایەك ئەگەر ژێر دەستەکانیان بەگوێیان نەکەن لـە شـتێکدا نەبێت لەگەڵ هەواو ئارەزویاندا دەگونجێت ئەوا ئەوەنـدە ناخایـەنێت دەسـتەلاتەکە تێـك دەچێت، حکومەتەکە دەڕوخێت، هەروەها سوپاکە تێك دەشکێ لە ناودەچێت، بەهـەمان شێوە کۆمگانیاکەش هەڵدەوەشێتەوە و مایە پوچ دەبێت، ئەگەر چاکسازی و ڕێکخستنی کارەکان لەسەر گوێڕایەلی بەرپرس وەستا بێت لە کاتێکدا ئـەو گلـەی خودایەتیشـی نیـە ئەوە پێویستە گوێڕایەلی لێ بکرێت لەبەر خودی خـۆی نـەك بـە هـۆی چاکەکانیەوە، لـە کاتێکدا پارێزراویش نیە لە هەڵەکردن لەو شتانەی کـە فـەرمانی پـێ دەکـات، ئـەی بڕیـار چـیە لەسـەر زەرورەتـی گوێڕایـەلی کردنـی خـودا لەلایـەن بەندەکانیـەوە؟! لـەو بارەیەوە(حسن) وتی: إبلیس پێوای و ئەو دەست پێشخەربوو لە پێوانـەدا، واتـە: کـەوتی :{ أَنَا خَيْرٌ مِنْهُ }( الاعراف ١٢).

**دووەم: بەڵگە هێنانەوەیەکی بێ بنەما.**

بەلگە هێنانەوەی إبلیس لەسەر چاکی خۆی بەو توخمەی کە لێی دروستکراوە بەلگـە هێنانەوەیەکی بێ بنەمایە لە چەند ڕوویەکەوە:

یەکـەم: چـاکی کەرەسـتەیەك بەسـەر کەرەسـتەیەکی تـردا ڕاسـتیەك نیـە بـە بەلگـە بچەسـپێنرێت، بـەلکو بۆچـوون و خەملاندنـە ڕای جیـاواز هەڵـدەگرێت، بنـەڕەتی دروستکراوەکان لە ڕووی پێك هاتەی جیـاوازەوە جیاوازیـەکی کـەم و سـادەیە کـە زیـاتر بەلای ئەوە دا دەچێت کە هەمویان لە هەمان سەرچاوەوە سەرچاوەیان گرتوە.

دووەم: شتە گران بە هاكان هەندێكیان سەرچاوەیەكی بیٚ نرخیان هەیە بۆ نمونە (مسك) لە خوێن دەردەهێنرێت، ئەلماس لە كابۆن دەردەهێنرێت كەسەرچاوەی خەلوزە،بە هەمان شێوە دەكرێت شتی بیٚ نرخ سەرچاوەی شتێكی بەهادار بێتن وەك هەندیٚ خواردن كەبەمانەوە و پیس بوون خۆش دەبێت،

سێیەم: فریشتەكان لە ڕوناكی دروستكراون ، إبلیس لە ئاگرێكی دوكەلاوی دروستكراوە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِۦٓ ۗ أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِى وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّۢ ۚ بِئْسَ لِلظَّٰلِمِينَ بَدَلًا ﴿٥٠﴾ ﴾ ( الكهف)، واتە: ئێمە پێشتر كاتی خۆی فەرمانماندا بە فریشتەكان و وتمان:ئادەی سوژدە ببەن بۆ ئادەم(مادەم ڕەخنە دەگرن لەوەی كە زەوی بەنەوەكانی ئاوەدان دەكەمەوە)! !ئەوانیش هەموویان دەست بەجیٚ ، بیٚ دواكەوتن سوژدەیان برد جگە لە ئبلیس نەبیٚ كەلە پێڕی جنۆكە بوو ، یاخی بوو لە فەرمانی پەروەردگاری ، باشە ئێوە ئیتر چۆن ئەو شەیتانە و نەوەكانی دەكەنە دۆستی خۆتان و لە جیاتی من فەرمانبەرداری ئەو دەبن و فەرمانی من دەشكێنن ، بەمەرجیٚ ئەوانە دوژمنی سوێنخواردوی ئێوەن ، بە ڕاستی ستەمكاران ناحەزێكی خراپیان كردۆتە مامۆستای خۆیان و بە فەرمانی دوژمنێكی ناپاك هەلسوكەوت دەكەن.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَخَلَقَ ٱلْجَآنَّ مِن مَّارِجٍ مِّن نَّارٍ ﴿١٥﴾ ﴾.(الرحمن)، واتە: جنۆكەشی لە بلێسەی ئاگر بەدیهێناوە.

(المارج من النار) ئاگرێكی هەلگیرساوی دوكەلاویە ، سەرەوەی دوكەلەو ژێرەوەی ئاگرێكی سافە، مادەی (المرج) واتە: تێكەلی و هەلچون و داچون، گومانیشی لەوەدا نیە كە ڕوناكی لە ئاگر باشترە، وە ئاگرێكی ساف باشترە لە ئاگرێكی دوكەلاوی، بێگومان ئەو فریشتانەی كەلە ڕوناكی دروستكراون سوجدەیان بردو گوێڕایەلی فەرمانی خودا

بوون، کەدەبوایە ئەو لە پێش ئەوانەوە سوجدەی ببردایە، چونکە بە پێوەرەکەی خۆی فریشتە لە پێشترن لەو، کەواتە پێشتر بوو ئەو پێش فریشتەکان سوجدە ببات.

چوارەم: ئەگەر وامان دانا کە چاکی شتەکان لە خودیشتەکەو ئەو سیفەتانەدا نیە کەلەوانی تری جودا دەکاتەوە لە ڕووی بەهاداری جۆرەکەی و ئەو سیفەتەی کە پێی دەناسرێتەوە بەلکو پەیوەندی بەو توخمەوەیە کە ڕەگەزەکەی لێ پێك هاتووە ئەوا بێگومان بڕیار نادەین کە ئاگر باشترە لەقوڕ.

چونکە سەرجەم گیانلەبەرە ئادەمی و ڕوەکی و ئاژەلیەکان لەسەر زەویدا لە خودی قوڕ یان لە ڕێگەی قوڕەوە دروستکراون، بەم پێیە هەرچی ئەو شتانەی کەلەسەر زەویدان بە هەمو پێوەرێك باشترینن.

بێگومان نە ئاگرو نە دوکەلەکەشی ئەم تایبەتمەندیەیان تێدانیە، پاشان قوڕ خاوەنی سیفەتی لەسەر خۆی و ئارامگرتن و جێگیر بوون و بەرەو دانە، قوڕ شوێنی نیشتەجێ بونی ڕووەك و گەشەو زیادبون و چاکبونە، بەلام ئاگر خاوەنی سیفەتی سوتاندن و هەڵشەی و پەلە کردنە بۆیە إبلیس بە ڕەگەزەکەی کە ئاگرە هەڵخەلەتا، ڕەگەزەکەی ئادەمیش سودی پێگەیاند لە ڕووی گەڕانەوەو تۆبەو گەشیمانی و دلنیایی و گوێڕایەلی و خۆ بەدەستەوەدان بۆ فەرمانی خودا(جل جلاله) و دان پێدانان و داوای تەوبەو لێ خۆش بوون.

پێنجەم: ئەو نەفرەت لێکراوە بێ ئاگابوو لەو هەوڵدان و گەورەکردن و ڕێزلێنانەی کە خودا تایبەتی کردبو بۆ ئادەم، کە بەڕاستی خۆی دروستی کردبوو، وە لە ڕۆحی خۆی فوی پێداکرد و ئامادەگی زانست و زانیاری پێ بەخشی کە لەسەرو توانای دروستکراوەکانی ترەوە بو، هۆکارێکی تری گەورە کرنی فەرمان کردن بو بە فریشتەکان کە سوجدەی بۆبەرن.

لەسەرەتاوە نەفمی و پێلی وای لە ئیبلیس کرد کە ئیرەی بە ئادەم ببات و لوت بەرزی بکات لە بەرامبەر خودا بەسوجدە بردن بۆی، سەرەتای تاوانەکە بە لوت بەرزی دەستی پێکرد وەك دەفەرموێت: ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ وَٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٣٤﴾ ﴾ ( البقرة)، واتە: واتە: پاشان باسی ئەوەش بکە کە ئێمە فەرمانمان دا بە سەرجەم فریشتەکان کە سوژدە ببەن بۆ ئادەم (سوژدەی ڕێز وە بە فەرمانی من) ئەوانیش هەموو فەرمانبەردار بوون و سوژدەیان برد جگە لە ئیبلیس کە سوژدەی نەبردو فیزی نواند و خۆی بە گەورە زانی ، وە خۆی خستە ڕیزی کافرو خوا نەناسانەوە

وە خودای گەورە پێی فەرمو: ﴿ قَالَ فَٱهْبِطْ مِنْهَا فَمَا يَكُونُ لَكَ أَن تَتَكَبَّرَ فِيهَا فَٱخْرُجْ إِنَّكَ مِنَ ٱلصَّٰغِرِينَ ﴿١٣﴾ ﴾ ( الاعراف)، واتە: خوای گەورەش فەرمووی: دەی کەواتە دەرچۆ لە بەهەشت ، دەرچۆ لە ڕیزی فریشتەکان و دابەزە ، چەنکە تۆ بۆت نیە لەوێدا فیز بکەیت و خۆت بە گەورە بزانیت ، جا تازووە دەرچۆ ، چونکە بەڕاستی تۆ لە ڕیسوا وبێ نرخ و نەفرین لێکراوانیت ...[١٦٥]

پاداشتەکەشی نەفرەت و وەدەرنانی بوو لە بەزەیی خودا، وەك دەفەرموێت: ﴿ إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى خَٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن طِينٍ ﴿٧١﴾ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٧٢﴾ فَسَجَدَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ ﴿٧٣﴾ إِلَّآ إِبْلِيسَ ٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٧٤﴾ قَالَ يَٰٓإِبْلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَىَّ أَسْتَكْبَرْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ ٱلْعَالِينَ ﴿٧٥﴾ قَالَ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِى مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ ﴿٧٦﴾ قَالَ فَٱخْرُجْ مِنْهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٌ ﴿٧٧﴾ ﴾ ( ص). واتە: ئەوە بوو کاتی خۆی پەروەردگارت بە فریشتەکانی فەرمو: من بڕیارم داوە کە بەشەرێك لە قوڕ دروست بکەم. (کارێکی گرنگم

---

١٦٥- تفسير المنار ، محمد رشيد رضا، مرجع سابق ، ج:٨، ص:٣٣٠-٣٣٢.

پێیەتی ، نیشتەجێی سەر زەوی دەکەم ، دەیکەمە هۆکاری ئاوەدانکردنەوەی). * جا هەر کە دروستم کردو لەو ڕۆحە تایبەتیەی کە من خاوەنی ئەوم و بە دەست منە فوم پێدا کردو گیان و ژیانم پێ بەخشی وە فەرمانمدا ئێوەی فریشتە هەموتان سوژدەی (ڕێزو تەقدیری بە فەرمانی من) بۆ بەرن .* ئەوسا یەکسەر هەموو فریشتەکان فەرمانی پەروەردگاری خۆیان و بەدیهێنەری مرۆڤیان بەجێ هێنا و سوژدە ، یان کڕنوشیان برد بۆ ئادەم (علیە السلام)...* جگە لە ئیبلیس کە لە ڕیزی فریشتەکاندا بوو ، بەڵام فریشتە نەبوو ، بەڵکو لە هۆزی جنۆکە بوو فەرمانی خوای گەورەی ئەنجام نەداو خۆی بە گەورە زانی و خۆی خستە ڕیزی کافرو بێ دینەکانەوە ....* خوای گەورەش فەرموی: ئەی ئیبلیس ئەوە چی بوو بەهۆی ئەوەی کە ڕێگریت لێ بکات و فەرمانی من بشکێنیت و سوژدە نەبەیت بۆ ئەو کەسەی کە بە دوو دەستی قودرەتم دروستم کردووە؟! ئایا خۆت بە گەورە دەزانیت ، یان خۆتت لابووە بە شت و لە ناخەوە بە بڵندو گرنگ حساب بۆ خۆت دەکەیت؟! * شەیتان جورئەتی دا بەخۆی و هاتە گفت و وتی: من لەو چاکترم ، چونکە تۆ منت لە ئاگر دروست کردوەو ئەوت لە قوڕ بەدیهێناوە (بەمەرجێ قوڕ سەرچاوەیەکی سەرەکی ژیانە بۆ ئادەمیزادەکان و زیندەوەران و ڕوەکەکان ، بەڵام ئاگر ئەگەر کۆنترۆڵ نەکرێت وێرانکەرو کاولکارە). * خوای گەورەش لە وەڵامی ڕونکردنەوە سەقەتەکەیدا فەرموی: مادەم وایە دەبێ ئیتر لە بەهەشت دەرچیت ، چونکە تۆ ئیتر نەفرین لێکراویت.

**بەکورتی:**

- ئیبلیس سوجدەی بۆ ئادەم نەبرد چونکە خۆی بە باشتر دەزانی لەو، پێوەرەکەشی جیاوازی ڕەگەزی هەریەکێکیان بوو کە لێی دروستکرابوو، کە ئەوەش پێوەرێکی ناپەسەندە، چونکە وای دەبینی ئەو توخمەی کە خۆی لێ دروستکراوە باشترە لەو توخمەی کە ئادەمی لێ دروستکراوە، ئەوەی لە یاد کردبو ئەوەی لە یاد کردبوو کە خودا چ ڕێزێکی لە ئادەم ناوە لەو ڕووەوە کە بە دەستەکانی خۆی دروستیکردوە، فەرمانیشی کرد بە فریشتەکان کە سوجدەی بۆ بەرن وەك هەڵدان و ڕێزلێنان.
- ڕق وقین و لوت بەرزی هۆکاری هاندانی ئیبلیس بوو کەوەلامی خودا بداتەوە کە ئەو لە ئادەم باشترە و ڕەوانیە سوجدەی بۆ ببات، ئەم وەلامە نەفامی و پێلی زۆر تێدا بەدی دەکرێت، سەرەڕای بەرهەڵستی کردنی فەرمانی خودا (جل جلاله) وە خەیال کردن بەوەی کە گوێڕایەلی کردنی فەرمانی خودا دەبێت لە شتێکدا بێت کەلەگەڵ حەزو ئارەزویدا بگونجێت.



## گومانی سی و پێنج

### نـاڕەزایی دەربـڕین لە بەرامبەر خەرجـی دان بە هەژار بە بیـانوی ئەوەی ئەگەر خودا ویستی لەسەر بێت خۆی خواردنیان دەداتێ.[166]

**ناوەڕۆکی گومانەکە:**

موشـریکە گیرودەسـت نوقاوەکـان نـاڕازی بـوون بـە خـەرجی کێشـانی – لـەو مـاڵ وسامانەی کە خودا پێی بەخشیون هەژارو نەدارەکانی موسوڵمانان دەیانوت گوایە ئەگـەر خودا بیەوێت ئـەو هەژارانـە دەولەمەنـد کـات، لـە ڕۆزی خـۆی خواردنیـان پـێ دەدات وە دەیـانوت: ئێمە ڕازین بــە ویستی خودا سەبارەت بــەوان، خـودای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ أَنفِقُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنُطْعِمُ مَن لَّوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ أَطْعَمَهُۥٓ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٤٧﴾ ﴾ ( یس)، واتە: هەرکاتیش داوایان لێ بکرێت کە ببەخشـن لـەو ماڵ و سامانەی کە خوای گەورە پێی بەخشیون ، کافران بە ئیمانداران دەڵێن: چۆن ئێمە ماڵ و سامان و خۆراکی خۆمان دەبەخشین بەو کەسانەی کە ئەگەر خوا بیویستایە بەشی ئەوانیشی دەدا ! ! (بیر ناکەنەوە کە جیاوازی ڕزق و ڕۆزی لە دنیادا بـۆ تاقیکردنەوەیـە ، بۆیە بە هەموو عەقڵیانەوە بەئیمانداران دەڵـێن) بـە ڕاسـتی ئێـوە لەسـەر لێشـێواوییەکی ئاشکرادا گیرتان خواردووە ! !.

**ڕێگاکانی پوچەڵ کردنەوەی گومانەکە:**

یەکەم: ئەمە قسەیەکی نەزانانەیە مەبەستیان گاڵتە پێکردنـە، هـیچ بەڵگەیـەکیان نیـە لەسەری چونکە ئیماندار ڕەخنە لە ویستی خودا ناگرێت.

دووەم: قسـەکەیان بەڵگەیـە لەسـەر ڕەزیلـی و دەسـت نوقـاوی و دەسـت گـرتن بـە دونیاوە، چونکە هەژاری و دەولەمەندی تاقی کردنەوەی خودایە بۆ بەندەکانی.

---

١٦٦- الآية التي وردت فيها الرد على الشبهة (يس/٤٧) .

**درێژەی بابەتەکە:**

**یەکەم: ئەمە قسەیەکی نەزانانەیەو هیچ بەڵگەیەکی نیە.**

خودای گەورە بەرهەڵستی کردنی بێ باوەڕەکان ڕوون دەکاتەوە کاتێك داوایان لێ دەکرێت کە هاوکاری هەژارو کەم دەست بکەن ئەوە بەر هەڵستی کردنێکی ناڕەوایە، وە بەلگەیەکی پوچەڵە کە دەڵێن: خودا هەژاریان دەکات و ئێمە خواردنیان پێ دەدەین، ئەگەر خودا ویستی لەسەربوایە دەولەمەندی دەکردن وەك چۆن ئێمەی دەولەمەند کردوە، ئەو قسەی ئەوان سەرلێشێوانێکی ئاشکرایە، وەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنْ أَنتُمْ إِلَّا فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٤٧﴾﴾ (یس)، ئەمەش وەك قسەی ئەهلی تەئویلە کە دەلێن: ئەو ڕستەی پێشو لە فەرمایشتی خودا وەلامێکە بۆ قسەکانیان، یا خود چیرۆکی قسەی ئیماندارانە بۆیان، چونکە ئەو بێ باوەڕانە لە ئیماندارەکانیان دەبیست کە ئەوان باوەڕیان بە ویستی خودا هەیەو دەلێن: ئەگەر خودا ویستی لەسەر بێت فلان کەس دەولەمەند دەکات، وە ئەگەر ویستی لەسەر بێت فلان ئازیز دەکات، بێ باوەڕەکان ئەو قسەیان هەڵبژاردوە بە شێوازی گاڵتە پێ کردن دەیدەنەوە بە ڕووی موسوڵمانەکاندا وەك ئەوەی بلێن: ئەگەر خودا ڕۆزی ئێمەی داوە خۆ دەتوانێت ڕۆزی ئەو هەژارانەش بدات ئیتر بۆچی دەست لە ئێمە گان دەکەنەوە؟[١٦٧]

لە ڕاستیدا ئەمە بیانو هێنانەوەیەکی پوچەڵە، چونکە ئەگەر خودا سامانی بەخشی بەبەندەیەك پاشان ئەگەر پێویستی کرد لەسەری کەدەبێت مافی خەڵکی لێ بدات وەك ئەوە وایە کەئەو بەشەی لێ پچڕیبێت ئیتر بەرهەڵستی کردن مانای نیە، قسەکەیان ڕاستە کە دەلێن: ئەگەر خودا بیوێت ڕۆزیان دەدات، بەلام لە بیانو هێنانەوەکەدا بە درۆ

---

١٦٧- الکشاف، الزمخشري، مرجع سابق،ج:٣، ص:٣٢٥ بتصرف. والتحریر و التنویر، الطاهر بن عاشور، مرجع سابق، مج:١١،ج:٢٣،ص:٣٢.

کەوتونەتەوە چونکە ئەوە هەڵەو لوت بەرزی و مشت ومڕێکی ناپەسەندە، قسەکەیان خۆی لە خۆیدا ڕاستە، بەلام کە مەبەستیان ڕەخنە گرتن بوو لە ویستی خودا یاخود ڕەخنەگرتن لە فەرمان کردن بە بەخشین لەگەڵ ویستی خودا، بیانوەکەیان لە ڕوانگەوە پوچەڵە، چونکە خودا خاوەنی ئیرادەیەکی کەونی و ئیرادەیەکی شەرعیە، و دروست نیە ناڕەزایی دەرببڕدرێت بەرامبەر ئیرادەی کەونی خودا بەسەر ئیرادەی شەرعیدا، ئەمە هەمان ئەوتەیە کە بێ باوەڕەکان دەیانوت: فەرمانکردن بە پێدانی خواردن فەرمانێکی شەرعیە، وەقسەکەی ئەوان ﴿ أَنُطۡعِمُ مَن لَّوۡ يَشَآءُ ٱللَّهُ أَطۡعَمَهُۥٓ ﴿٤٧﴾ ﴾ (یس)، ئامادەیە بۆ ئیرادەیەکی کەونی.

ئەگەر باوەڕیان بە ئیرادەی خودا هەبوایە ئە ئیرادەی کە ڕەخنەی لێ دەگرن ئەوا لەوەی کە خودا پێی داون دەیانبەخشی، ئیمانداران بە پێی فەرمانی خودا دەجولێتەوە، بەرهەڵستی ئیرادەو ویستی خودا نەکات، وە دەرك بە یاساکانی خودا دەکات لە ژیانی بەندەکانا، خودا ڕۆزی دەری هەموانە، و سەرجەم ڕۆزیەکانی سەرزەوی سەرزەوی کە پێیان دەگات خودا بەدی هێناوە، خۆیان هیچ شتێکیان لەوانە بەدی نەهێنێت لە بنەڕەتدا توانای بەدی هێنانیشیان نیە،[168] ئەمەوەك ئەو فەرمایشتەی خودا وایە کە دەفەرموێت: ﴿ سَيَقُولُ ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ لَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشۡرَكۡنَا ﴿١٤٨﴾ ﴾ ( الانعام). واتە: موشریك و هاوەڵگەر و بێدینەکان دەڵێن: ئەگەر خوای گەورە بیویستایە شەریك و هاوەڵمان بۆ بڕیار نەدەدا!!

دووەم: قسەکە ڕەزیلیە.

لەم ئایەت پیرۆزەدا گەورەترین سەرزەنشتی تێدایە بۆ تۆلەکردنەوە لەو دەست نوقاوانەی کە باسی چیرۆکەکەیان دەکرێت لە ڕووی بیانوەکەیانە کە هەمان بیانوە کە

١٦٨- في ظلال القران، سيد قطب، مرجع سابق، ج:٥،ص:٢٩٧٠-٢٩٧١.

موشریکەکانی پێ گومڕابوون واتە لەیەکەوە نزیکن لە ناپاکی و چروکی و سروشتی بۆگەنیان.[١٦٩]

گوفتاری ئەو موشریکانە هەڵەیە چونکە خودا کە هەندێك لە دروستکراوەکانی دەولەمەند کردووە و هەندێکی تریانی هەژار کردوە، بۆ ئەوەیە دەولەمەندەکان بە هەژارەکان تاقی بکاتەوە لەسەر ئەوەی کە پێویستی کردوە لەسەریان لە دەرکردنی زەکات، ئیماندار ڕەخنە لە ویستی خودا ناگرێت بەلکو ڕازییە بەو کارە بەلام قسەی ئەوانەی کە دەلێن: ئێمە بە ئیرادەی خودا ڕازین و ڕۆزی کەسێ نادەین کە خودا ڕۆزی پێ نەدابێت، ئەمە چروکەکان پێوەی پابەندن، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ قُل لَّوْ أَنتُمْ تَمْلِكُونَ خَزَآئِنَ رَحْمَةِ رَبِّيٓ إِذًا لَّأَمْسَكْتُمْ خَشْيَةَ ٱلْإِنفَاقِ ۚ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ قَتُورًا ﴿١٠٠﴾ ﴾ (الاسراء)، واتە: پێیان بلێ:ئەگەر گەنجینەکانی ڕەحمەت و بەخششی پەروەردگارم بە دەست ئێوە بوایە ، ئەوە دەستتان دەگرتەوە لە بەخشین و دەترسان لە تەواوبوون ، چونکەزۆربەی ئینسانەکان(بە تایبەت بێ دینەکان) بۆ کاری خێر زۆر ڕەزیل و دەست نوقاون.

خودای گەورە سامانی بەهەندێك بەخشیوەو لە هەندێکی تری گرتوەتەوە، تاقی کردنەوەی خودایە بۆیان هیچ کەس بۆی نیە ڕەخنە لە ویستی خوداو شێوازی بەڕێوەبردنی دروستکراوەکان بگرێت.[١٧٠]

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِي جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ ٱلْأَرْضِ وَرَفَعَ بَعْضَكُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ لِّيَبْلُوَكُمْ فِي مَآ ءَاتَىٰكُمْ ۗ إِنَّ رَبَّكَ سَرِيعُ ٱلْعِقَابِ وَإِنَّهُۥ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٦٥﴾ ﴾ (الانعام)، واتە: خەڵکینە دڵنیابن کە: هەر خوای گەورە خۆی ئێوەی کردووە بە جێ نشینی گەلانی پێشوو لەسەر زەویەکەیدا، وە بە پێوەری دینداری و خوا پەرستی و چاکە کاری پلە و

---

١٦٩- محاسن التاویل ، القاسمي، مرجع سابق، ج:٨،ص:٦٨.

١٧٠- الكشاف، الزمخشري، مرجع سابق، ج:٣، ٣٢٥. و التحریر التنویر،الطاهر بن عاشور، مرجع سابق، مج:١١، ج:٢٣، ص:٣٢.

پایەی هەندێکتانی بەرز کردۆتەوە بەسەر ئەوانی تردا ( لەڕووی دینداریی ، یان زانستی ، یان سامان ، یان پلە و پایە... هتد ) بۆ ئەوەی تاقیتان بکاتەوە لەو شتانەدا کە پێی بە خشیون ، بێگومان پەروەردگاری تۆ ئەی محمد ، ئەی ئیماندار ، زۆر بە خێرایی تۆڵە دەستێنێت ( لە تاوانباران و ستەمکاران ) وە تەواویش لێخۆشبوو میهرەبانە ( بەنیسبەت تەوبەکاران و ئیماندارانەوە ) .

**بە کورتی:**

- بانگەشەی موشریکەکان کە دەڵێن خەرجی نادەین بە هەژارەکان چونکە ئەگەر خودا ویستبای دەولەمەندی دەکردن ، بانگەشەیەکی پوچەڵە دەرك کردن بە یاساککانی خودا دەخاتە ڕوو لە گەڵ دەرك کردن بە جۆری ژیان و مەزنێتیەکەی، هەروەها گەورەیی ئەو مەبەستەی کە بەخشینە جۆراوجۆرەکانی و لە پێناودا دەبەخشێت.
- ئەم بانگەشەیە ئاماژەیە بەدەرك نەکردنیان بۆ ئیرادەی خودا لە ژیانی بەندەکاندا، خودا ڕەزاقەو ڕۆزی دەری هەموانە، ئەگەر ویستبای ڕۆزیەکەی لێ دەگرتنەوە ئەی ئەو کاتە چیان دەوت.
- ئەم بانگەشەیە ڕژوکی و ڕەزیلی و سروشتی پیسان ئاشکرا دەکات لەگەڵ پیسکەیی ناخیان هەروەها سنور بەزاندنیان بەرامبەر هەرکەسێك کە بانگیان بکات بۆ بەخشین و چاکەکردن.

## گومانی سی و شەش

### بانگەشە کردن بەوەی منداڵ هۆکاری هەژاری و نەداری باوانە.[171]

**ناوەڕۆکی گومانەکە:**

ئەهلی جاهیلی دەیانوت کە گوایە منداڵ هۆکاری ئەو هەژاری و نەداریەیە کە باوان تێیدا دەژین، ئەمەشش پالی پێوە دەنان بۆ خۆ رزگارکردن لەو منداڵانە ئیتر بە کوشتنی ڕاستەوخۆ یاخود زیندە بەچاڵ کردنی کچەکانیان لە ژێر خاکدا تا دەمرن، خودای گەورەش دەفەرموێت: ﴿ قُلْ تَعَالَوْاْ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ أَلَّا تُشْرِكُواْ بِهِۦ شَيْـًٔاۖ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًاۖ وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَوْلَٰدَكُم مِّنْ إِمْلَٰقٍۖ نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْۖ وَلَا تَقْرَبُواْ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَۖ وَلَا تَقْتُلُواْ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿١٥١﴾ ﴾ ( الانعام)، واتە: ( ئەی محمد ) پێیان بڵێ خەڵکینە وەرن با ئەو شتانەتان بۆ باس بکەم کە پەروەردگارتان لەسەری حەرام کردوون ( یەکەم ) بە هیچ شێوەیەك نابێت شەریك و هاوتا بۆ خوای گەورە بڕیار بدەن ( دوهەم) بەردەوام چاك ڕەفتار و جوان گوفتار بن لەگەڵ دایك و باوکتاندا ( سێیەم ) هەرگیز نەکەن لە ترسی گرانی و قات و قڕی منداڵانی خۆتان بکوژن ( چوارەم ) نزیکی هیچ جۆرە تاوان و گوناهێك مەکەون ، چ ئەوانەی بە ئاشکرا ئەنجام دەدرێن ، یان ئەوانەی کە لە پەنهانی و نهێنیدا ئەنجام دەدرێن، یاخود لە ناخ و دڵ و دەرونەکاندا دروست دەبێت ( پێنجەم ) کەسیش بە ناحەق مەکوژن ، مەگەر لەسەر حەق و شتێکی ڕەوا ، ئا ئەو شتانە سنورەکانی خوای گەورەن و هەر خۆی فەرمانی پێداوە بۆ ئەوەی ژیری و هۆشمەندی خۆتان بخەنەکار .

---

١٧١- الأيتان التي وردت فيهما الشبهة : (الاسراء/٣١، الانعام/١٥١). والآيات التي وردت فيها الرد على الشبهة: ( الاسراء/٣١، الانعام/ ١٥١،١٤٠، ١٣٧، التكوير/٨،٩).

پاشـــان دەفـــەرموێت: ﴿ وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَوْلَٰدَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلَٰقٍۖ نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْۚ إِنَّ قَتْلَهُمْ كَانَ خِطْـًٔا كَبِيرًا ﴿٣١﴾ ﴾ ( الاسـراء)، واتـە: نەكـەن هـەرگیز منداڵـەكانتان لـە ترسـی هـەژاری و نەداری بكوژن ، چونكە ئێمە پێش ئێوە ڕزق و ڕۆزی بەوان دەبەخشین ئینجا بـە ئێـوە ، بە ڕاستی كوشتنیان تاوانێكی زۆر گەورەیە.

**ڕێگاكانی پوچەڵ كردنەوەی گومانەكە:**

یەكـــەم: خـــودای گـــەورە (جـــل جلالـــە) خـــۆی بەڕێوەبـــەری ڕۆزی ســـەرجەم درروسـتكراوەكانیەتی، وە خۆشـی هۆكارەكـان دەڕەخسـێنێت كـە تـەنها بەگرتنـە بـەری هۆكارەكان ڕۆزی خـۆی دەسـتەبەردەكات، كەواتـە هـیچ بوارێـك نیـە كـە هـەژاری یـاخود ترسان لە هەژاری بكرێتە بیانو بۆ كوشتنی منداڵ.

دووەم : هۆكـاری ڕاسـتەقینە لـە پشـت كوشـتنی منداڵـەوە لەلایـەن ئـەو نەفامانـەوە شەیتانە كەهانی داون بەو كارە هەستن بـە بیـانویی هـەژاری ئەمـە جگـە لـە پێلـی و بـێ عەقلی خۆشیان.

**درێژەی بابەتەكە:**

**یەكەم: ڕۆزی دەر خودایە هەر ئەویش ڕەخسێنەری هۆكارەكانە بۆ پەیدا كردنی بژێوی.**

موشـریكەكان منداڵـەكانیان دەكوشـت بـەو شـێوازەی كەشـەیتان فریـوی دەدان، كچەكانیان زیندە بەچاڵ دەكرد لە ترسی لەكەداربوون لەوانەشە هەندێك لە نێرینـەكانیان دەكوشت لـە ترسـی هـەژاری و نـەداری وەك ئـەوەی قورئـان باسـی دەكـات، بـە بیـانوی ئەوەی هەژاریەكەیان پەرە نەستێنیت، خودای گەورەش ئەم كارەی لـێ قـەدەكردون، لـە بەرامبەر ئەم ڕەفتارەشدا شاعیر دەڵێت:

خودای گەورەش وەلامی نەداونەتەوەو بیانوەکەی پوچەڵ کردونەتەوە، چونکە ئەوان هەژاریان کروەتە بەهانە بۆ کوشتنی منداڵەکانیان، لەگەڵ بوونی هەژاریش دا ناکرێت مرۆڤ دەستی بچێتە کوشتنی کەسێك،خودای گەورە ئەوەی روون کردوەتەوە کاتێك منداڵی دروستکردوە بێگومان رۆزیشی بۆ دیاری کردووە، ئیتر پێلیە باوك وابزانێت هەرکات دەستەوسان بوو لە پەیداکردنی بژێوی بێت بە خەیالیداو بیانکوژێت، لە بری ئەوە هەوڵی کەسابەتیان بۆ بدات، بۆیە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ ﴿١٥١﴾ ﴾ (الانعام).

لە سورەتی (الاسراء) دا خودای گەورە باسی رۆزی ئەوان و باوانیشیانی کردووە وە لە سورەتی (الانعام) دا خودا ڕۆزی دانی باوانیشیانی پێش ئەوان خستوە بۆ ئەوەی ئاماژە بێت بەوەی کە چۆن باوان ڕۆزی دراون ونەمردون لە برسا بە هەمان شێوە منداڵەکانیش ڕۆزی دەدرێن، خودا (جل جلاله) ڕۆزی دەرە ئێوە ڕۆزی خۆشتان نادەن چ جای منداڵەکانتان، ڕۆزی ئێوەو ئەوانیش لە لای خودایە؟

لەنێوان ئایەتەکەی سورەتی (الانعام) و ئایەتەکەی سورەتی (الاسراء) دا جیاوازیەك هەیە لە ڕێکخستندا سەرەڕای ئەوەی لێکچونیش هەیە، ئەمەش بەم دوو خاڵە ڕوون دەبێتەوە:

یەکەم: خودای گەورە لە ئایەتی سورەتی (الاسراء) دا فەرمویەتی: (خشية إملاق){الاسراء/ ٣١}، وە لە ئایەتی سورەتی (الانعام) دا فەرمویەتی: (من إملاق) {الانعام /١٥١}، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەوانەی کوڕەکانیان یاخود کچەکانیان زیندە بە چاڵ کردووە دوو هۆکاری لە گشتەوە بووە: یانەوەتا هەژاربوون و نەیانتوانیوە خەرجیان بکێشن و چاوەڕێی ئەوە نەبوون تا کچەکانیان گەورە بوون و هاوکاریان بن لە پەیداکردنی بژێویدا بۆیە زیندە بە چاڵیان دەکردن، ئائەوە مەبەستی فەرمایشتەکەی

خودایه له سورەتی (الانعام) دا: (من إملاق)، چونکه (من) بۆ پاساودانه ئەوه دەگەیەنێت که هەژاری هۆکاری کوشتنەکەیانه، هەروەها ئەوەش دەگەیەنێت که لەکاتی کوشتنەکەدا هەژاریش هەبووه.

یاخود ئەوه بوبێت هۆکاری کوشتنەکه هەژاری باوکەکه نەبووه، بەلام ترساوه لـەوەی دوچاری هەژاری ببێت، یاترسـاوه لـەوەی کچـەکەی دووچـاری هـەژاری ببێـت بـه مردنـی باوکی ، چونکه له جاهیلیدا کچان میراتیان پێ نەدراوه که خـاوەنی پـارەی خۆیـان بـن، بۆیه پالنەر بۆ زینده بەچال کردن هەژاری بووه، ئەمەش مەبەستی فەرمایشتەکەی خـودا بووه له سورەتی (الاسراء) دا (خشية الاملاق).

دووەم: وامان دانا گریمانەی یەکەم جیاوازه له ڕووی ڕێکخستنەوه بۆیه لـەوێ دا ئـەم وەلامه گونجاوه بۆی: (نَحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ)، به پێش خستنی ڕاناوی باوك بەسەر ڕانـاوی مندالدا، چـونکه نـەداری پالنـەری زینـده بـه چـال کردنەکەیـه لـه سـورەتی (الانعـام) ،دا ئاماژەی پێکراوه که ئەویش نـەداری باوانـه، هەوالەکـەی پـێش خسـتوه کـه خـودا (جـل جلاله )، خۆی ڕۆزی دەریانـه و هەوالەکەشـی بـەوه کۆتـایی پـێ هێنـاوه کـه خـۆی ڕۆزی مندالەکانیشیان دەدات، بەلام ئەو نەدارییەی کەله سورەتی (الاسراء) دائاماژەی پێکـراوه ترسه له دوچار بوون به هەژاری، بۆیه خودای گەوره ڕایگەیاندوه که ڕۆزی دەری مندالەو ڕسـتەکەی بـەوه کۆتـایی پـێ هێنـاوه کـه ڕۆزی دەری باوانیشـه، ئەمـەش یەکێکـه لـه تایبەتمەندیـەکانی قورئـان لـه پـێش خسـتنی گـرنگترین لـه هـەموو جێگایەکـدا بـه پێـی شوێنەکه.[١٧٢]

١٧٢- التحرير و التنوير ، الطاهر بن عاشور،مرجع سابق ، مج:٧، ج:١٥، ص:٨٧،٨٨.

**دووەم: فریـو خـواردنی شـەیتان و نەفـامی خۆیـان هۆکـاری سـەرەکی بـووە بـۆ کوشـتنی منداڵەکانیان.**

وەلامەکانی قورئان بۆیانی ڕوون کردوەتەوە هۆکاری سەرەکی کە هاندەریان بوە بـۆ کوشتنی منداڵەکانیان دەگەڕێتەوە بۆ سێ خاڵ ئەوانیش:

یەکـەم: شـەیتان بـە بیـانوی هـەژاری و نـەداری فریـوی داون خـودای گـەورەش دەفـــــــــەرموێت: ﴿ وَكَذَٰلِكَ زَيَّنَ لِكَثِيرٍ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ قَتْلَ أَوْلَٰدِهِمْ شُرَكَآؤُهُمْ لِيُرْدُوهُمْ وَلِيَلْبِسُواْ عَلَيْهِمْ دِينَهُمْ ۖ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا فَعَلُوهُ ۖ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ ﴿١٣٧﴾ ﴾ (الانعام)، واتە: هەروەك ئـەو دابەشـکرنە ناڕەوایەیـە کـە زێوانـەکان فتوایـان بـۆ دەدان کە کوشتنی منداڵەکانیان کارێکی چاك و ڕەوایە ، واتە دایك و باوکان مافی ژیانیان هەبوو ( کەچی کچەکانیان زیندە بەچاڵ دەکرد ) وە ئـاینی یەکخواناسـیان لـە لاپەسـەند نەبوو دژایەتیان دەکرد ، کەچی بت پەرستی و ئارەزوو پەرستیان پێ ڕەوابوو خۆ ئەگـەر خوای گەورە بیویستایە جڵەو گیری لێ دەکـردن و نەیانـدەتوانی ئـەو کـارە ناپەسـەندانە بکەن، بەڵام وازیان لێ بهێنە بۆ خۆیان و ئەو درۆ و دەلەسـەیەی کـە دەیکـەن ، بـۆ کـوێ دەچن ، لە دەستی قودرەتمان دەرناچن.

شەیتانە هاوبەشـەکانیان ئـەو کارەیـان لا ئاسـای کردونەتـەوە، بۆئـەوەی لـە دینیـان وەربیپێڕن و لە ناویان بەرن، هەروەها بۆئەوەی چەواشەیان بکەن لە بەرامبەر دینەکەیان.

دووەم: خۆپاراستن لە لەکەداربوون، ئەوەش تایبـەت بـووە بـە زینـدە بەچـاڵ کردنـی کچان لەترسی لەکەدارنەبونیان لەکاتی گەورە بوونی کچەکان، ئەوان بـە شـێوازێك وێنـای کچیان دەکرد کە هۆکاری سەرشۆڕ کردنی خێزانەکەیەتی، یـاخود شـو بەکەسـێك دەکـات کە پلەو پایەی لە خێزانەکەی نزمترەو ئەمەش مایەی سوکایەتیە بۆیان، یاخود دەترسان لە جەنگدا کچەکانیان بە دیل بگیرێن کەئەمەش سوکایەتیەکی تر بوو بۆیان.

سێیەم: نەریتی قوربانیکردنی منداڵ بۆ خوداکانیان بە مەبەستی نزیك بونەوە لەو خودایانە بە نەزر بێت یاخود شتی تر، لە جاهلیەت دا گیاو نەزری دەکرد کە ئەگەر چەند کوڕێکی ببێت یەکێکیان دەکاتە نەزر ەك ئەوەی کە (عبدالمطلب) سوێندی خوارد کە ئەوکارە بکات، ڕووداوەکەشی ئاشکرایە لە چیرۆکی ژیاننامەی پێغەمبەردا "سەلات و سەلامی خودای لەسەر بێت" ئامـاژەی پێکراوە، ئەگەر ئەو شیرکە نەبوایە کەمێشکی داگیر کردبوون ئەم خەیالانەیان بۆ دروست نەدەبوو.[١٧٣]

وەلامێکی تری قورئان بۆیان بە گژداچونەوەو عەیبدار کردن و هەڕەشەکردنە لێیان کە دەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا ٱلْمَوْءُۥدَةُ سُئِلَتْ ۝٨ بِأَيِّ ذَنۢبٍ قُتِلَتْ ۝٩ ﴾ (التكوير)، واتە: ئەوسا پرسیار لەکچانی زیندە بەچاڵ کراو دەکرێت کە بەناحەق کاتی خۆی لەهەندێ کۆمەڵگەی ستەمکاردا زیندە بەچاڵ دەکران.

بێگومان زیندە بە چاڵ کراو لە ڕۆژی دواییدا پرسیار دەکات لەسەر چ تاوانێك زیندە بە چاڵ کراوە ؟ ئەم پرسیارە هەڕەشەیە لە لایەن خاوەنەکەیەوە، هەروەها ڕوونکردنەوەیەکە هیچ بەهانەیەك نەبووە بۆ کوشتنی، جگە لەوەش ئەو پرسیارە ترسێکی گەورە لە دلی ئەنجامدەری کارەکەدا دروست دەکات.

بە هەرحاڵ ئەمە تێڕوانینی سەردەمی جاهیلیەت بوو بۆ ئافرەت، تا ئیسلام هات و ئەم داب و نەریتانەی هەڵوەشاندەوەو ڕیسوای کردو زیندە بە چاڵ کردنی قەدەغە کرد و کردی بە بابەتێك لە بابەتەکانی لێپرسینەوە لە ڕۆژی دواییدا،وەك لە سورەتی (التكوير) دا ئاماژە بە بابەتی ترس و شەپۆلی تورەیی دەکات و وەك ڕوداوێکی گەردونی لەو ڕوداوە مەزنانە هەژماری دەکات و دەلێت: زیندە بە چاڵ کراو پرسیار لە زیندە بەچاڵ کردنەکەی دەکات. ئەی حاڵی ئەنجام دەرەکەی (زیندە بەچاڵ کەرەکەی) چۆن بێت؟!

هەرگیز کەرامەتی ئافرەت لە ژینگەیەکی گەشەی نەدەکرد، ئەگەر شەریعەتی خودا

---

١٧٣- تفسير المنار،محمد رشيد رضا،مرجع سابق،ج:٨، ص:١٢٥،١٢٤.

نەبوایە کە گەیرەوەکەی کەرامەتی سەرجەم مرۆڤایەتی پاراستوە لە ڕێزگرتن لە ئینسان: نێرو مێ، وەبەرزکردنەوەیان بۆ ئاستێکی شیاو بونەوەرێك کە خودای گەورە لە رۆحی بلندی خۆی فوی پێداکردوە و ژیانی پێ بەخشیوە.

کەرامەتی ئافرەت هەڵقولاوی ئەم سەرچاوەیە کە ئیسلام هێناویەتی، بەدەر لە هەر هۆکارێك لە هۆکارەکانی ژینگە کاتێك لە دایك بونەوەی مرۆڤەکان سەرلەنوێ بەردەوامی هەبوو لەگەڵ چەسپاندنی بەها بالاکان کەلە ئاسمانەوە فەرمانی پێدەکرێت نەك لە زەوی، ئەو کاتە کەرامەتی ئافرەت دەستەبەردەکرێت، ئیتر دەستەوسانی و بژێوی ژیانی هیچ کاریگەری و قورساییەکیان نیە لە تەرازوەکەیدا، بەلکو قورسای بۆ رۆحی مرۆڤە بەرێزەکانە کە پەیوەستە بەخوداوە، لەم تێڕوانینەسشدا نێرو مێ یەکسانن.[174]

**بە کورتی:**

- موشریکەکان مندالەکانیان لەبەر هەژاری یاخود لە ترسی هەژاری دەکوشت،لەگەڵ ئەوەی کە خودا بۆی ڕوون کردونەتەوە ڕۆزی دەری ئەوان و مندالەکانیان خودایە پاشان بیانوەکانسان هیچ بنەمایەکی نیە کە هانیان بدات بۆ کوشتنی مندالەکانیان.
- قورئان ڕوونی کردوەتەوە کە هۆکاری سەرەکی بۆ کوشتنی مندال هەژاری وترس لە هەژاری نیە بەلکو هۆکاری ئەم کردەوەیە شەیتانە کە گوناهەکەی لا ئاسای کردونەتەوە، یاخود ترسی لەکە دار بونیان هەبوە لە پەنا کچەکانیان، یاخود بۆ نزیکبونەوە لە خوداکانیان کردویانن بە نەزر.

---

١٧٤- في ظلال القران، سيد قطب، مرجع سابق، ج:٦،ص:٣٨٤٠.

## گومانی سی و حەوت

## بانگەشەکردن بەوەی کەئەوەی لە سکی ئاژەڵەکانـدایە تـایبەتە بە نێرینەکـان قەدەغەیە بۆ مێینەکان:[175]

### ناوەڕۆکی گومانەکە:

عەرەبـەکانی سـەردەمی جـاهیلیی وا خـەیالیان دەکـرد کـە ئـەو بێچـوەی لـە سـکی گیانلەبەردایە شوم و نەگبەتیە بۆ ئافرەتەکانیان، ئەگەر ئەو بێچوە بە زینـدووی لـە دایـك بوو ئەوە بۆ نێرینەکان حەڵاڵە کـە بیخـۆن و حەرامـە لەسـەر ژنـەکانیان وتـراوە حەرامـە لەسەر تێکڕای ئافرەتان، بەلام ئەگەر بە مردووی لە دایك بوو ئەوە شومیەکەی لە دەست دەات و ئـیتر بـۆ هـەر دوو ڕەگـەزی نێـر و مـێ حەڵاڵـە کـە بیخـۆن، خـودای گـەورەش دەفەرموێت: ﴿ وَقَالُوا۟ مَا فِى بُطُونِ هَـٰذِهِ ٱلْأَنْعَـٰمِ خَالِصَةٌ لِّذُكُورِنَا وَمُحَرَّمٌ عَلَىٰٓ أَزْوَٰجِنَا ۖ وَإِن يَكُن مَّيْتَةً فَهُمْ فِيهِ شُرَكَآءُ ۚ سَيَجْزِيهِمْ وَصْفَهُمْ ۚ إِنَّهُۥ حَكِيمٌ عَلِيمٌ ﴿١٣٩﴾ ﴾ (الانعـــام)، واتە: یەکێکی تر لە نەفامییان ئەوە بوو کە دەیانووت: هەرچـی لـە سـکی ئـەم ماڵاتانـەدا بێت ( لە بەچـکەکانیان ) تایبەتـە بـۆ نێرینـەکانمان و حەرامـە بـۆ هاوسـەرانمان ، بـەڵام ئەگەر مردارەوە بووبوایە ئەوە هەمووان تیایدا هاوبەشن ، بێگومان خوای گـەورە تۆڵـەی ئەم پێناسە سەقەتانەشـیان لێ دەسـێنێت، چـونکە ئـەو زاتـە تـەواو حـەکیم و دانایـە لـە مۆڵەت دانیاندا وە تەواویش زانایە بەوەی کەچی پێویستە حەرام بکرێت.

---

١٧٥- الآية التي وردت فيها الشبهةك (الانعام/١٣٩)، الآيات التي وردت فيها الردعلى الشبهة: (الانعام/١٤٠، ١٤٣). في(تفرد الله بالتشريع في تصور الاسلامي) طالع: الوجه الاول من الشـبهة السـابعة والعشـرين، مـن الجـزء السـابع : (الايمان و التدين).

**رێگاکانی پوچەڵ کردنەوەی گومانەکە:**

حەرام و حەڵاڵ کردن لە تایبەتمەندییەکانی یاسادانەرە کە خودایە، وەهیچ کەسێك ئەو تایبەتمەندیەی پێ نەدراوە، هەروەها خودای گەورە هیچ یەکێك لەو گیانلەبەرانەی حەرام نەکردوە بەو شێوازەی کە ئەوان باسی دەکەن.

**درێژەی بابەتەکە:**

حەڵاڵ کردن و حەرام کردن لە تایبەتمەندیەکانی خودایە و پەیوەندی بە هیچ کەسێکەوە نیە:

ئەمە نمونەیەکە لە بڕیارە ناماقولەکانی عەرەب لە سەردەمی جاهیلی دا سەبارەت بە حەڵاڵ و حەرام، کە تایبەتە بەو شتانەی ناو سکی هەندێك لە گیاندارانەدا هەیە لە شیرو بێچوو، دەڵێن لێرەدا مەبەست لە گیاندار تەنها (البحائر)ە وشترێك پێنج سکی کردبێت و پێنجەمی نێر بێت ئەوکاتە گوێچکەیان لەت دەکرد و بەرەلایان دەکرد، یاخود مەبەستیا ئەم جۆرە حوشترە بوە لەگەڵ (السرائب) وشترێك کە دە تا دوانزە سکی کردبێت و هەموشی مێینە بێت، جا ئەگەر ئەم وشتران بێچوی نێرینەیان ببوایە تایبەتیان دەکرد بۆ نێرینەکان واتە تەنها ئەوان لێیان دەخوارد و قەدەغەیان دەکرد لە مێینەکان، شیرەکەشی تەنها نێرینەکان دەیانخواردەوەو قەدەغەیان دەکرد لە مێینەکان، بەلام ئەگەر ئەو وشترانە بێچوی مردارەوە بویان ببوایە ئەوا نێرو مێ لە خواردنیدا بەشدار دەبوون، وە ئەگەر بێچوی مێیان ببوایە وازیان لێ دەهێناوبەخێویان دەکرد بۆ بەروبومەکەی، هەندێك لە موفەسیرینی پێشین ئەم گیاندارانەیان (مقید) تایبەت نەکردوە بە ئەو دوو جۆرە وشترە،(البحائر والسوائب)، دەکرێت حوکمی (مطلق) تێکرا بگوازینەوە بۆ لای (مقید) تایبەتەکە، کە لەوانەشە ئەوەیان بە هەندێك لە گیانلەبەر وتبێت کە خۆیان مەبەستیان بوە بەدەر لە وەسفی (البحیرة) کە گوێیان لەت کردووە، وە (السائبة) کە هەر مێینەی بەرهەم هێناوە و وازیان لێ هێناوە بۆ خواکانیان و کەس توخنی نەکەوتوە.[١٧٦]

---

١٧٦- تفسیر المنار، محمد رشید رضا، مرجع سابق،ج:٨، ص:١٢٨.

خودای گەورەش بەم ئایەتـە وەلامـی داونەتـەوە: ﴿ سَيَجْزِيهِمْ وَصْفَهُمْ إِنَّهُ حَكِيمٌ عَلِيمٌ ﴿١٣٩﴾ ﴾ (الانعـام). بـەواتای خـودای گـەورە سـزایان دەداتـەوە بـەو شـێوازەی کـە حیکمەتی حۆی دەیخوازێت، وە بەو پێیەی کە زانایە بـە کـارو کـردەوەی بەنـدەکانی وە لەو پێناسە نەفامانەی کەدەیکـەن، بێگومـان سزاکەشـیان دەبێـت لـە جـۆرو هاوشـێوەی پێناسەکەیان بێت.

وەلامێکی تری قورئان بۆیان ڕونکردنەوەی نەفامیەکەیانەلـە حـەرامکردنی هەنـدێکیان بەدەر لە هەندێکی تر بە بێ هۆکارێك، وە گارچە گارچەو جۆراو جۆریان کـردوون (بحـيرة وسـائبة ز وصـيلة و حامیـة)، (بحـيرة) (سـائبة) ئاماژەمـان بەماناکـەی کـرد، (وصـیلة) وشترێکە یەکەم و دووەم سکی مێینە بێت، (حام) وشترێکی نێرە کە لـە گشـتی ئـەوەوە دە سك گەیدا دەبێت، ئەمانەو چەندەها جۆری تر کە بە ئارەزووی خۆیـان دایـان دەهێنـا لە گیانلەبەر و زەراعەت و بەروبوم، خودای گەورە ڕوونی کردەوە کـە ەو باخـاتی پـڕ لـە کەپرو هەرزالی دروست کردوە لە گەڵ باخاتێك کە کەگرو هەرزالی تیانیە.

هەروەها گیانلەبەری خولقاندوە بۆ بار هەڵگرتن وهەندێکی تر کە خوریەکەیان فەرشی لێ دروست دەکرێت، پاشان جۆری مەڕو مالاتی ئاماژە پێ کردوە لە گیانلەبـەر کـە جـۆر سگی یە واتە مەڕەو جۆری ڕەش واتە بزن بە نێرو مێیەکانیانەوە، هەروەها وشتر بە نێرو مێ وە لەگەڵ مانگا نێرو مێ کەی، ئەوەشی ڕوون کردوەتەوە هیچ یەکێك لەمانەی حەرام نەکردوە نە خۆیان و نە بێچوەکانیشیان، بەلکو سەرجەمیان بۆ ئادەمیزاد بەدی هێنـراون بۆ خواردن و گواستنەوە و بارهەلگرتنیان و دۆشین و چەندەها سودی تر، خودای گـەورە دەفەرموێت: ( وأنزل لكم من الانعام ثمانية أزواج)

﴿ خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلْأَنْعَٰمِ ثَمَٰنِيَةَ أَزْوَٰجٍ يَخْلُقُكُمْ فِى بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْ خَلْقًا مِّنۢ بَعْدِ خَلْقٍ فِى ظُلُمَٰتٍ ثَلَٰثٍ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ ٱلْمُلْكُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَأَنَّىٰ تُصْرَفُونَ ﴿٦﴾ ﴾ ( الزمر)

واته: (خەڵكینە بیرتـان نەچێت) کـە خـوای گـەورە ئێـوەی لەتاکـە کەسێك و تاکـە نەفسێك دروسـت کـردووە ، پاشـان هـەر لـەو نەفسـە هاوسەرەکەشـی بـەدی هێنـاوە ، لەماڵاتیشدا هەشـت جـۆری دروسـتکردووە (لەئایـەتی ١٤٣ ، ١٤٤ الانعـام دا ئامـاژەی بـۆ فەرموون).. (ئێوە ئاگاتان لەخۆتان نەبوو) کاتێك کـە لـە سـکی دایکتانـدا بـوون ، چـۆن گۆڕانمان بەسـەردا دەهێنـان قۆنـاغ بـە قۆنـاغ لـەناو سـێ تاریکیـدا (مەبەسـت ئـەو سـێ پێستەیە کە کۆرپەلەی تێدا دەژی ، جا گەورەبون بەردەوامـە تـا ئەندامـەکان هـەموویان جێگەی خۆیان دەگرن ، هەندێك ئاسەواری نەوەکانی پێشوش سەرهەڵدەداتەوە لەڕەنگی چاو و شێوازی ڕوخسار و باڵا و قژ و...) ئـا ئەوەیـە خـوای پـەروەردگار و بەدیهێنـەرتان کـەخاوەنی هـەموو بەدیهێنراوەکانـە ، جگـە لـەو زاتـەش خوایـەکی تـری بـە حـەق نیـە کەشایستەی پەرستن بێت ، جا ئیتر ئێوە ئەو زاتە بۆ ناپەرستن ، بـەرەو کـوێ و بـەرەو کێ دەتانەوێت خۆتان وێڵ بکەن.

وە لە وەلامیان دا دەفەرموێت:

﴿ وَمِنَ ٱلْأَنْعَٰمِ حَمُولَةً وَفَرْشًا ۚ كُلُوا۟ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعُوا۟ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ ۚ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿١٤٢﴾ ثَمَٰنِيَةَ أَزْوَٰجٍ ۖ مِّنَ ٱلضَّأْنِ ٱثْنَيْنِ وَمِنَ ٱلْمَعْزِ ٱثْنَيْنِ ۗ قُلْ ءَآلذَّكَرَيْنِ حَرَّمَ أَمِ ٱلْأُنثَيَيْنِ أَمَّا ٱشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ أَرْحَامُ ٱلْأُنثَيَيْنِ ۖ نَبِّـُٔونِى بِعِلْمٍ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٤٣﴾ وَمِنَ ٱلْإِبِلِ ٱثْنَيْنِ وَمِنَ ٱلْبَقَرِ ٱثْنَيْنِ ۗ قُلْ ءَآلذَّكَرَيْنِ حَرَّمَ أَمِ ٱلْأُنثَيَيْنِ أَمَّا ٱشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ أَرْحَامُ ٱلْأُنثَيَيْنِ ۖ أَمْ كُنتُمْ شُهَدَآءَ إِذْ وَصَّىٰكُمُ ٱللَّهُ بِهَٰذَا ۚ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا لِّيُضِلَّ ٱلنَّاسَ بِغَيْرِ عِلْمٍ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٤٤﴾ قُل لَّآ أَجِدُ فِى مَآ أُوحِىَ إِلَىَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٍ يَطْعَمُهُۥٓ

إِلَّآ أَن يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَمًا مَّسْفُوحًا أَوْ لَحْمَ خِنزِيرٍ فَإِنَّهُۥ رِجْسٌ أَوْ فِسْقًا أُهِلَّ لِغَيْرِ ٱللَّهِ بِهِۦ ۚ فَمَنِ ٱضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَإِنَّ رَبَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤٥﴾ ﴾ ( الانعام)،

واته: هەروەها خوای گەورە هەندێ ماڵاتی بۆ ئێوە ڕام هێناوە بۆ سواری و باربردن ، لە خوری و مووی هەندێکیشیان فەرش و ڕایەخی هەمە جۆر دروست دەکەن ، دەبخۆن لەو ڕزق و ڕۆزیەیەی خوای گەورە پێی بە خشیون ( گوشتەکەیان ، شیرەکەیان ، کە جۆرەها خۆراکی خۆش و بەتامیان لێ دروست دەکرێت ) شوێنی هەنگاو و نەخشەو پیلانەکانی شەیتان مەکەون، چونکە بەڕاستی ئەو سەرکەشە دوژمنی ئاشکرای ئێوەیە (هەرچەندە شەیتان نادیارە بەڵام بەوەسوەسە و خەتەرە و خەیاڵە خراپەکانی کەبۆمان دروست دەکات و هانمان دەدات بۆ گوناهو سارد و سڕی لە خواپەرستیدا ، دیارە شەیتان دوژمنێکی ئاشکرایە هەرچەندە نادیارە، چونکە کارکردی ئاشکرایە لەسەرمان) .* خوای گەورە هەشت جۆر ماڵاتی تایبەتی بۆ خزمەتی ئادەمیزاد ڕەخساندووە، لە مەڕ جوتێك و لەبزن جوتێك، ئەی محمد بەو نەفامانە بڵێ کە هەر لە خۆیانەوە شت حەرام دەکەن، باشە ، ئایا خوای گەورە نێرەکانی حەرامکردووە یان مێیەکان ، یان ئەوەی کە لە سکی مێیەکاندا هەیە ؟! ئەگەر شتی وا ڕاستە ، بەڵگەیەکی زانستیمان بۆ بهێننەوە ؟! * هەروەها ئەو زاتە لەوشتر جوتێك و لە ڕەشەوڵاخیش جوتێکی بۆ ڕەخساندوون ، دوبارە پێیان بڵێ: باشە ، خوای گەورە خواردنی گۆشتی نێرەکانی حەرامکردووە ، یان مێینەکان ؟! یاخود ئەوەی کە لە سکی مێیەکاندا هەیە ؟! باشە بۆچی ئێوە شایەت بوون کاتێك خوای گەورە بڕیاری لەو شێوەیەیدا ؟! جا ئیتر کێ لەوە ستەمکارترە کە درۆ بەناوی خواوە هەڵدەبەستێت ، تا بەبێ هیچ بنەمایەکی زانستی سەرلە خەڵکی تێکبدات ، لە ڕاستیدا خوای گەورە هیدایەتی دەستە و تاقمی ستەمکار نادات .* ئەی محمد پێیان بڵێ: ئەوەی کە بەوەحی و نیگا بۆ من ڕەوانە کراوە لەو شتانەی کە

خـواردنی حەرامـە ، تـەنها گۆشـتی مـردارەوە بـووە ، یـان خـوێنی ڕژاوە ، یـان گۆشـتی بەرازە ، کە هەر خۆی پۆخڵی و پیسی یە ، یان ئەو ماڵاتانـەی کـە لـەکاتی سـەربڕینیاندا ناوی غەیری خوای لەسەربرا بێت ، هەتا ئەو شتانەش خـواردنی دروسـتە و قـەیناکات بـۆ کەسێکی ناچار ( کە بەهۆی گرانی، یان قات و قڕییەوە ناچار بێـت ) لـەو شـتە حەرامانـە بخوات بەمـەرجێك زۆری لێ نـەخوات و بـەردەوام نـەبێت و دوبـارەی نەکاتـەوە، بێگومـان پەروەردگاری تۆ بە تەواوی لێخۆشبووە لەو جۆرە کەسانەو تەواویش میهرەبانە، سـزایان نادات .

ئەمـە وەڵامـی ئـەو قسـەیە کـە دەڵـێن: ﴿ وَقَالُوا۟ مَا فِى بُطُونِ هَـٰذِهِ ٱلْأَنْعَـٰمِ خَالِصَةٌ لِّذُكُورِنَا وَمُحَرَّمٌ عَلَىٰٓ أَزْوَٰجِنَا ۖ وَإِن يَكُن مَّيْتَةً فَهُمْ فِيهِ شُرَكَآءُ ۚ سَيَجْزِيهِمْ وَصْفَهُمْ ۚ إِنَّهُۥ حَكِيمٌ عَلِيمٌ ﴿١٣٩﴾ ﴾ (الانعام)

لێرەدا وەڵامەکە سەرکۆنە کردن و بە نەفام لە قەڵەم دانی تێدایە، ئەو پێیان دەڵێـت: ئایا خودا تەنها نێرینەی ئەو جوتانەی حـەرام کـردوە، یـاخود ئـەو بێچـوەی کـە ڕەحمـی مێینەکەدایە و لە ئەنجامی جوت بوونی ئەو دوو جوتە دروست بووە ئیتر بێچـوەکەی نێـر بێت یان مێ؟ گرسیارەکە لێرەدا بۆ ڕەدکردنەوەیە، خودای گەورە هیچ یـەکێك لـەم سـێ جۆرەی حەرام نەکردوە، بێگومان بـەم گرسـیارە دورو درێـژە بـۆ ئەوانـەیان کـەبیری لـێ دەکەنەوە ڕوون دەبێتـەوە کـە لـە ڕووی عەقڵـەوە قسـەکەیان ڕێـی تـێ ناچێت، چونکە تەرتیبی حوکمە لەسەر وەسفی نێرینە و مێینە یا خود دووگیانی قسەیەکی بێ مانایـە یـا خود نەفامیەکی ئاشکرایە ئەگەر هۆکارێك نەبێت بۆ وەسـفەکەیان، گاسـاو هێنانـەوە بـەو وەسفانە هیچ بنەمایـەکی نیـەو وتنیشـی هـیچ پێویسـتی نـەدەکرد، بەنـەبونی هۆکـاریش خۆهەڵقورتاندنە لە حوکمی خودا، ئەمەش قسە هەڵبەستنێکی دور لە عەقل و نازانسـتیە، حـودای گـەورە دەفـەرموێت : ﴿ نَبِّـُٔونِى بِعِلْمٍ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿١٤٣﴾ ﴾(الانعـام)، بـەو

مانایـەی لەسـەر بنـەمای زانسـت و دلنیـایی قسـەبکەن کـە لـە پێغەمبـەرێکی خـوداوە وەرتانگرتبێت یاخود بەلگەیەکی زانستی کە عەقل گشت ڕاستی بکاتەوە، چۆن خودا ئـەو شـتانەی حـەرام کـردوە کـە ئێـوە دەیلـێن، ئـەگینا ئـەوەی کـە جیاتـان کردوەتـەوە و حەرامتان کردوە بـەدەر لـەوانیتر ئـەوە نەفامیـەکی ئاشـکرایە هـەروەك چـۆن درۆو قسـە هەڵبەستنە.

پاش ئەوەی دەستەوسان بوون لە هێنانی بەلگەیەکی زانستی کـە پێغەمبـەرێك گشـت ڕاستی بکاتەوە دەربارەی ئەوشتانەی کە حەرامیان کردووە بە قسـەی خۆیـان، وە خـودا پێداگری دەکات لەسەر ئەو بانگەشەی کە دەلـێن خـودا ئـەو شـتانەی حـەرام کـردوە بـە هێنانی بەلگەیەك سەبارەت بەو حەرام کردنە کە لە خوداوە گوێیان لێ بـووە و ئـەو پێـی وتوون، بۆیە پێیان دەفەرموێت: ﴿ وَمِنَ ٱلۡإِبِلِ ٱثۡنَيۡنِ وَمِنَ ٱلۡبَقَرِ ٱثۡنَيۡنِۗ قُلۡ ءَآلذَّكَرَيۡنِ حَرَّمَ أَمِ ٱلۡأُنثَيَيۡنِ أَمَّا ٱشۡتَمَلَتۡ عَلَيۡهِ أَرۡحَامُ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۖ أَمۡ كُنتُمۡ شُهَدَآءَ إِذۡ وَصَّىٰكُمُ ٱللَّهُ بِهَٰذَاۚ فَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبٗا لِّيُضِلَّ ٱلنَّاسَ بِغَيۡرِ عِلۡمٍۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٤٤﴾ ﴾ (الانعام)، زانیاری دەربارەی خودا، یان دەبێت لە ڕێگەی پێغەمبەرێکەوە بێـت کـە خـودا فەرمانی پێ کردبێت یاخود ئەو شتانەیان بە بێ ناوەندگیر(واسطة) دەست کـەوتوە، ئایـا ئێوە خوداتان بینیوە تا وەها فەمانێکتان پێ بکات بە بێ بوونی ناوەندگیرێك؟!

ئەوان نەئەمە ئەلێن و نەئەوەش، بەلکو درۆ بەدەم خوداوە هەڵدەبەستن و بانگەشەی حەرام دەکەن بە بێ بوونی بەلگەیەکی زانستی، گشت و گشت لاسایی یەکتر دەکەنەوە لە قسەکانیاندا: کـە خـودا ئـەو شـتانەی حـەرام کـردووە کـە ئـەمان حـەرامی دەکـەن و ئـە تاوانانـەی کـە ئـەنجامی دەدەن خـودا پێـی ئـەنجام داون، خـوداش لـە بارەیانـەوە دەفـــــــەرموێت: ﴿ وَإِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةٗ قَالُواْ وَجَدۡنَا عَلَيۡهَآ ءَابَآءَنَا وَٱللَّهُ أَمَرَنَا بِهَاۗ قُلۡ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَأۡمُرُ بِٱلۡفَحۡشَآءِۖ أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾ ( الاعراف). واتە: کاتێکیش ئـەو نـا پوختانـە گوناهو تاوانێك ئەنجام دەدەن دەڵێن: ئێمە باو باپیرانمان بینیوە کـە لـەم جـۆرە کـردارو ڕەفتارەیان کردووە ، خوای گەورەش خۆی فەرمانی پێداوین ( لە چارەی نوسیوین ! ! )

ئەی محمد ، ئەی ئیماندار بڵێ: نەخێر ، هەرگیز وانیە ، خوای گەورە چۆن فەرمان بە گوناهوتاوان و کاری نابەجێ دەدات ، چۆن جەسارەت دەکەن و لە خۆتانەوە بە دوور لە هەموو زانیاریەك شتی وا هەڵدەبەستن ؟!.

پرسیارەکە لە ئایەتەکە دا بۆ گاڵتە پێ کردنیانە، پاشان ئەگەر کارەکە بەو شێوازە بێت و بەڵگەتان چەسگا کە ڕاست ناکەن، ئیتر چی لەوە ترسناکترە کە درۆ بەدەم خوداوە بکەن بە حەرام کردنی شتێك کە خودا حەرامی نەکردووە، یان حەڵاڵ کردنی شتێك کە ئەو حەڵاڵی نەکردووە، بۆ گومڕا کردن و چەواشە کردنی مرۆڤ وبەو شتەو کۆکردنەوەی خەڵك لە دەوری و بە بێ ئەوەی بەڵگەی هەبێت بێ شەرمانە ئەو کارانە دەداتە پاڵ خودا.[177]

**بەکورتی:**

- موشریکەکان کەوتونەتە خەیالات و بۆچونێکی سەقەت کە لە شیرك و بت پەرەستیەوە سەرچاوە گرتوە سەبارەت بە کارو باری یاسادانان لە حەڵاڵ و حەرام کە لە گەورەکانیانەوە بۆیان ماوەتەوە، دەیانوت ئەو بێچوەی کەلەسکی هەندێ گیانداراندایە تایبەتە بە نێرینەکانیان ئەگەر زیندوو بوو بە مردویش لە دایك ببوایە بەشی مێینەکانیش لێ دەدا واتە هاوبەش بوون لە خواردنیدا، ئەمەش هیچ هۆکارو بەڵگەو پاساوێکی لە گشتەوە نەبووە جگە لە پیاوسالاری و هەواو هەوس نەبێت کە بە ئارەزوی خۆیان دینێکی تەم و مژاوی چەواشەکارییان لێ بەرهەم هێنابوو.
- خودای گەورە وەلامی ئەو جاهیلانەی داوەتەوە بە وەلامێکی سەرکۆنەکەرو بەنەفام لە قەلەم دەر کە پێیان دەفەرموێت: ئایا خودای گەورە نێرینەی ئەو دوو جوتەی حەرام کردووە یا خود مێینەی ئەو دوو جوتە یا خود بێچوی ئەو دوو جوتە، پرسیارەکە بۆ ڕەدکردنەوەیە، بیرو باوەڕەکەیان پوچەڵ دەکاتەوەو گاڵتە بە عەقلیان دەکات.

---

١٧٧- المرجع السابق، ص: ١٤٤.

## گومانی سی و هەشت

### دوو ڕووەکـــان بانگەشـــەی ئەوە دەکەن کە ئەو ئیمانـــدارانەی کە باوەڕیـــان بە پێغەمبەر سەلات و سەلامی خودای لەسەر بێت هێناوە گێل و نەفامن.[178]

**ناوەڕۆکی گومانەکە:**

دووڕووەکان وایان ڕاگەیاند کە هۆکاری باوەڕنەهێنانیان بەوەی کەپێغەمبەر "سـەلات و سەلامی خودای لەسەر بێت" هێناویەتی، وە پابەند نەبوون بـە فەرمانـەکانی ئەوەیـە کـە ئەوانەی باوەڕیان پێ هێناوە پێل و نەفامن، وە دەیانوت چۆن ئێمەو ئەوان لە ئاسـتێکدا بین و لـەسەر یەك ڕێگا بین لەگەڵ ئـەو پێل و نەفامانە؟! خودای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ ءَامِنُواْ كَمَآ ءَامَنَ ٱلنَّاسُ قَالُوٓاْ أَنُؤْمِنُ كَمَآ ءَامَنَ ٱلسُّفَهَآءُ ۗ أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلسُّفَهَآءُ وَلَٰكِن لَّا يَعْلَمُونَ ﴿١٣﴾ ﴾ ( البقرة)، واتە: کـاتێکیش پێیـان دەوترێـت: ئێـوە بـۆ هـەوڵ نـادەن بـیرو باوەڕتان بەهێزو دامەزراو بکەن و پابەندی بەرنامـەی خـوابن وەکـو ئـەو خەڵکـە دینـدارو ئیمانداره ، کەچی لە وەڵامی ئەو ئامۆژگاریە دڵسۆزانەیەدا دەڵێن: ئێمە چـۆن وەکـو ئـەو خەڵکە گێل و نەفامە بـاوەڕ دەهێـنین!! ، خەڵکینـە ئاگـادارین و بـزانن کـە هـەر ئەوانـە خۆیان گێل و نەفامن ، بەڵام بە خۆیان نازانن (تا ئەو کاتـەی مـردن یەخـەیان دەگرێـت و دواتریش کە لە گۆڕەپانی مەحشەردا گیر دەخۆن).

**ڕێگاکانی پوچەڵ کردنەوەی گومانەکە:**

یەکەم: هۆکاری ئەو قسەیە شەیتانە کە فریوی داون وا بلێن.

دووەم: ئـەوەی دووڕووەکـان لەسـەر پێلـی و نەفامیـە، بـەلام پێلـی و نەفامیەکـەی کەخۆیان هەست پێ ناکەن، چونکە بە هۆی تاوانەکانیانەوە دلیان داگۆشراوە.

---

١٧٨- الآية التي وردت فيها الشبهة : (البقرة/١٣)، الآية التي وردت فيها الرد على الشبهة :( البقرة /١٣).

**درێژەی بابەتەکە:**

**یەکەم: لەخۆبایی بوونی دووڕووەکان و فریو دانیان لە لایەن شەیتانەوە.**

ئەو لە خۆبایی بونەی کە دووڕووەکانی لەسەرە ئەو ناڕەواییەی بۆ ڕەخساندون و کردەوە خراپەکانیانی بۆ ڕازاندونەتەوە بە جۆرێك خۆیان بەباشی دەزانن، بەلکو لەخۆبایی بوون و یاخی بوونەکەیان سەرجەم ڕاستیەکانی شێواندوە لە ڕوانگەی ئەوانەوە ئەگەر سەرکردەو شوێن کەوتەکانیان ئەو شتەیان نەکردبێت، ئەوکات ئەوان بە ناشرین تەماشایان کردووە چیرۆکی لە خۆباییی بوون و قسە نابەجێ کانیان قورئان لە بارەیانەوە دەیگێڕێتەوە لەوکاتەی کە داوایان لێ کراوە کە باوەڕ بهێنن بەوەی کەپێغەمبەر " سەلات و سەلامی خودای لەسەربێت" هێناویەتی و باوەڕ بهێنن هاوشێوەی ئەو خەڵکانەی کە شوێن کەوتەی پێغەمبەرن" سەلات و سەلامی خودای لەسەر بێت" وەلامەکەیان ئەوە بوو: ﴿ أَنُؤْمِنُ كَمَآ ءَامَنَ ٱلسُّفَهَآءُ ﴿١٣﴾ ﴾ ( البقرة)، بە گێل و نەفام و هەڵەشەو بێ عەقل و هەڵس وکەوت ونابەجێ ولاوازی بیروڕا تەماشاین دەکردن.

**دووەم: گێلی و نەفامی سیمای خودی دووڕوەکانە.**

خودای گەورە وەلامی دانەوەو فەرموی: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ ءَامِنُوا۟ كَمَآ ءَامَنَ ٱلنَّاسُ قَالُوٓا۟ أَنُؤْمِنُ كَمَآ ءَامَنَ ٱلسُّفَهَآءُ ۗ أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلسُّفَهَآءُ وَلَٰكِن لَّا يَعْلَمُونَ ﴿١٣﴾ ﴾ ( البقرة).

ئەوان خۆیان گێل ونەفامن بەدەر لەوانەی کە ئەمان بەگێل و نەفامیان دادەنان، کام گروپە شایەنی نازناوی گێل و نەفامیە؟ ئەو بیرو باوەڕە خراپەی کە دووڕووەکانی لەسەرە لەگەڵ کردەوە ناشرینەکانیا و دانەمەزراندنیان لە بۆچونێکی دیاریکراو،یان ئەوەی ئیماندارەکانی لەسەرە لە بیرو باوەڕی ڕاست و دروست و کردەوەی چاکە و ئارامی و ئاسایشی دل ودەروون بە هۆی ئیمانەکەیانەوە کامیان باشترە؟! تۆمەت

دروستکردنی دووڕووەکان بۆ ئیمانداره‌کان بـه هەڵەشـەو گێـل و نـەفام و بـێ عـەقلی، وه پێناسەکردنیان بـەو پێناسـانه کارێکـه زیـان بـه ئیمانـداران ناگەیـەنێت تـا ڕۆژی دوایـی، هەروەك چۆن زیـانی بـۆ هـاوەڵانی پێغەمبـەر" سـەلات و سـەلامی خـودای لەسـەر بێـت" نەبووه .

دووڕووەکان ئەم قسـانەیان لـه پـاش ملـەوه دەکرد وەك گاڵتـه کـردن بـه ئیمانـداران، خودای گەوره پێغەمبەرو شوێن کەوتوانی لەو کاره ئاگادار کردەوه و ڕایگەیاند کـه پێلـی ونـەفامی و بەرچاوڕەشـی و بـێ عـەقلی و سـیفەتانێکی دابـڕاون بەسـەر دووڕووەکانـدا، بەڵگەش لەسەر ئەوه کردەوەکانیانه، بەلام نازانن که گەردەیەك دلی داگۆشیون.[١٧٩]

**بەکورتی:**

فریو دانی شەیتان پالی بەدووڕووەکانەوه ناوه بۆ تانەدان له موسوڵمانەکان بـه پێـل و نەفام و بێ ئاگا، بەلام له ڕاستیدا دووڕووەکان خۆیان گێـل و نـەفامن، بـەلام هەسـتی پـێ ناکەن چونکه خودای گەوره دل و گوێ و چاویانی کوێر کردوه به هۆی داگۆشەرێکەوه له ئەنجامی کردەوه ناشرین و ڕەفتاره نا بەجێ کانیان.

١٧٩– تفسير المنار، محمد رشيد رضا، مرجع سابق، ج:١، ص:١٦٠،١٥٩، بتصرف.

## گومانی سی و نۆ

### بێباوەڕەکانی مەککە دەیانوت گوایە باوەڕ هێنان بە موحەممەد" سەلات و سەلامی خودای لەسەربێت" نائارامی بە دواوەیە.[180]

**ناوەڕۆکی گومانەکە:**

هەندێك لە موشریکەکانی مەکە دەیانوت گوایە شوێن کەوتنی موحەمەد "سەلات و سەلامی خودای لەسەر بێت" و هەڵگەڕانەوە لەوانەی دەوروبەریان لە تیرە عەرەبە موشریکەکان دووچاری ڕووبەڕووبونەوە و دەرکردن و زیان و ئاژاوەیان دەکات، خەڵکی مەکەش توانای ئەوەیان نیە، ئەمەش دوری خستونەتەوە لە شوێن کەوتنی موحەمەد "سەلات و سەلامی خودای لەسەر بێت". خودای گەورەش دەفەرموێت: ﴿ وَقَالُوٓاْ إِن نَّتَّبِعِ ٱلْهُدَىٰ مَعَكَ نُتَخَطَّفْ مِنْ أَرْضِنَآ ۚ أَوَلَمْ نُمَكِّن لَّهُمْ حَرَمًا ءَامِنًا يُجْبَىٰٓ إِلَيْهِ ثَمَرَٰتُ كُلِّ شَىْءٍ رِّزْقًا مِّن لَّدُنَّا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٧﴾ ﴾ ( القصص)، واتە: هەندێ لەنەفامانی قورەیش) دەیانوت: ئێمە ئەگەر شوێن ئەم بەرنامە نوێیە بکەوین (تیادەچین) لە وڵات وشوێنی خۆمان نامان هێڵن ، دەمانفڕێنن ، باشە ئەوانە بۆ بیرناکەنەوە ،ئەوەتە بەئاشکرا ئەم حەرەم و ناوچەیەمان بۆ دابین کردوون کە هەمووجۆرە بەروبوم و کاڵایەکی بۆ دێت ، ئەگەر بیربکەنەوە هەموی بەخشش و ڕزق و ڕۆزی ئێمەیە ، بەڵام زۆربەیان بیر لەو ڕاستیانە ناکەنەوەو نایزانن و دەرکی ناکەن..

---

١٨٠- الآية التي وردت فيها الشبهة: (القصص/ ٥٧). الآيتان التان وردت فيهما الرد على الشبهة : (القصص/ ٥٧، ٥٨).

**ڕێگاکانی پوچەڵ کردنەوەی گومانەکە:**

یەکەم: سەرەڕای ئەوەی کە ئەم قسەی بیانویەکی پوچەڵە و گوتەیەکە هیچ بەڵگەیەکی نیە، لە هەمان کاتدا دان پێدانانە بەوەی کە بانگەوازەکەی موحەمەد " سەلات وسەلامی خودای لەسەر بێت" ڕاست و دروستە.

دووەم: خودای گەورە ئەمانی پێ بەخشیون کاتێك کە موشریك بوون ئیتر چۆن وەدەر دەخرێن کاتێك کە ئیمانیان هێناوە.

سێیەم: هۆکاری ڕاستەقینەی لەناو چوون بە درڕخستنەوەی پێغەمبەران و بێ نمەکی و لە خۆبایی بونە.

چوارەم: تەنانەت ئەگەر لەلایەن خەڵکیشەوە گەمارۆ بدرێن – بە هۆی ئیمانەکەیانەوە ئەوەی لە خوداوە دەستیا دەکەوێت زۆر باشترەو بۆیان دەمێنێتەوە.

**درێژەی بابەتەکە:**

***یەکەم: لەگەڵ ئەوەی کە بانگەشەکەیان بێ بنەمایە لە هەمان کاتدا دان پێدانانە بە ڕاستێتی ڕێبازەکەی موحەمەد "سەلات و سەلامی خوودای لەسەر بێت" .***

موشریکەکان ئەو قسەی کە بە پێغەمبەریان ووت و بیانویان بۆ دەهێنایەوە بۆ شوێن نەکەوتنی لە ترسی ئەوە بووە دەستەڵاتیان بەسەر تیرە عەرەبە دراوسێ کاندا نەمێنێت، ئەوانەی کە کەعبەیان بە پیرۆز دادەناو دەرگاوانی کەعبە بوون و بتەکانیان بە پیرۆز دەزانی، دەترسان لە لایەن ئەو تیرانەوە فڕێ بدرێنە دەرەوە، ئەم گومانە بیانویەکی موشریکەکانی مەکە بوو کە بیانویەکی پوچەڵەو پاساوێکی بێ بنەمایە، دەیانوت گوایە ئەگەر بێنە سەر دینی موحەمەد " سەلات و سەلامی خودای لەسەر بێت" ئەوا عەرەبەکانی تر لە خاك و ولاتی خۆیان وەدەریان دەنێن و ئەمانیش لە قەرەیان نایەن،

﴿ وَقَالُوٓاْ إِن نَّتَّبِعِ ٱلۡهُدَىٰ مَعَكَ نُتَخَطَّفۡ مِنۡ أَرۡضِنَآۚ ﴿٥٧﴾ ﴾ (القصص)

ئەوان نکۆلی لەوە ناکەن کە ئەوە ڕاستیە، بەلام لەوە دەترسن کە لەلایەن ئەو خەڵکانەوە فڕێ بدرێنە دەرەوە، ئەوان خودایان لە یاد کردووە، ئەوەشیان لە یاد کردووە کە خودا گارێزەرە، هەر ئەویش بەرگریکارە، هەرچی هێزی سەرزەویشە توانای وەدەنانی ئەوانی نیە تا لە ژێر پارێزگاری خودادابن، وە هەرچی هێزی سەرزەویشە توانای سەرخستنی ئەوانی نیە ئەگەر خودا بیەوێت ڕیسوایان بکات، ئەمەش بە هۆی ئەوەوەیە کە ئیمان لە دلیاندا چەسپاوە،ئەگەر بچەسپایا تێڕوانینیان بۆ دەستەلاتی خودا دەگۆڕا، وە پێوەریان بۆ کارو بارەکان جیاواز دەبوو،هەروەها بۆیان دەردەکەوت کە ئارامی لە پەنای خودادا نەبێت بەرقەرار نابێت، وە ترسیش لە دووری هیدایەتی خوداوە نەبێت دروست نابێت،وەئەم هیدایەتەش بەستراوەتەوە بەو هێزەی کە پەیوەندی بە شکۆو سەر بەرزیەوە هەیە، ئەمە تەنها خەیال وقسەیەك نیە بۆ ئارام کردنەوەی دلەکان بوترێت، بەلکو ڕاستیەکی قولە لە هیدایەتی خوداوە سەرچاوەی گرتوە، بە واتای ڕێك کەوتن و هاوئاهەنگ بوون لە گەڵ هێزو یاسای بونەوەر کە پەنای پێ بگرێت و بەگەڕ بخرێت لە ژیاندا. خودا ئەم بونەوەرەی خولقاندوە و بە پێی یاسایەك بەڕێوەی دەبات کە خۆی هەڵیبژاردوە بۆی، ئەوەی شوێن هیدایەتی خودا بکەوێت ئەوا هێزێکی فراوانی دەست دەکەوێت.[181]

هیدایەتی خودا ڕاسترین پرۆگرامی ژیانە لە سەر زەویدا، کاتێك ئەم پرۆگرامە کاری پێ بکرێت ئەوا سەربەرزی و شکۆمەندی لەسەر زەوییدا دەستەبەر دەکرێت جگە لە سەربەرزی و شکۆمەندی دوا ڕۆژ، جیاوازیەکەشی ئەوەیە لێك ترازانێك نیە لە نێوان دونیا و دوا ڕۆژدا، هەروەها پێویست ناکات ژیانی دونیا هەڵبوەشێنرێتەوە یاخود پەك بخرێت بۆ ئەوەی ئامانجەکانی دوارۆ بهێنرێتە دی ، بەلکو ئەو دوانە پێکەوە گرێ دراون بە پەیوەندیەك: کە چاکی دل و چاکی کۆمەلگاو چاکی ژیانە لەسەرزەوییدا، پاشان ڕێگاکە

---

١٨١– في ظلال القران، سيد قطب، مرجع سابق، ج:٥، ص:٢٧٠٣.

بەردەوامی هەیە بەرەو قیامەت، واتە دونیا کێڵگەی دوا ڕۆژە، وە بنیات نانی بەهەشتی ئەم سەرزەوییەو پاراستنی شکۆمەندییەکەی هۆکارە بۆ بنیات نانی بەهەشتی دوا ڕۆژو مانەوەی هەتاهەتایی تێیدا، بە مەرجێك شوێن هیدایەتی خودا بکەوین و بە کردەوەی چاکە بەرەو ڕووی بچین و لە هەوڵی ڕازیکردنی دابین.

ڕوینەداوە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا هەرکۆمەڵێك لەسەر هیدایەتی خودا بووبن ئیلا لە کۆتاییدا هێزو دەسەلات و شکۆمەندیان پێ بەخشراوە، پاشان ئامادەکردنیان بۆ هەڵگرتنی ئەم ئەمانەتە، ئەمانەتی جێنشینی لەسەر زەوییداو بەڕێوەبردنی ژیان تێیدا.

زۆرێك لە خەڵکی دەترسن لە شوێن کەوتنی شەریعەتی خودایی، دەترسن لە دژایەتی و مەکری دوژمنانی خودا، دەترسن لە گەلە کۆمەی نەیارەکان ، دەترسن لە تەنگەژە ئابوریی و جۆرەکانی تری تەنگەژە.

ئەمانە تەنها خەیالاتە وەك خەیالاتی قورەیش کاتێك دەیانوت بە پێغەمبەری خودا ئەگەر ئێمە شوێن بانگەوازەکەی تۆبکەوین ئەوە لە خاکی خۆمان دەربەدەردەبین، ﴿ وَقَالُوٓاْ إِن نَّتَّبِعِ ٱلۡهُدَىٰ مَعَكَ نُتَخَطَّفۡ مِنۡ أَرۡضِنَآۚ أَوَلَمۡ نُمَكِّن لَّهُمۡ حَرَمًا ءَامِنًا يُجۡبَىٰٓ إِلَيۡهِ ثَمَرَٰتُ كُلِّ شَيۡءٖ رِّزۡقًا مِّن لَّدُنَّا وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٥٧﴾ ﴾ (القصص)، ،بەلام کاتێك شوێن هیدایەتی خوایی کەوتن دەستیان گرت بەسەر ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا لە کەمتر لە چارەکە سەدەیەکدا.[182]

**دووەم: چۆن وەدەردەنرێن بە هۆی ئیمانداریانەوە لەکاتێکدا خودای گەورە بە موشریکیش ئاسایشی پێ بەخشیبون؟!**

بێگومان خودای گەورە وەلامی موشریکەکانی داوەتەوە بە وەلامێکی پرسیار ئامێزو گاڵتە پێکردن و داپلۆسێنەر، وەك دەفەرموێت: ﴿ وَقَالُوٓاْ إِن نَّتَّبِعِ ٱلۡهُدَىٰ مَعَكَ نُتَخَطَّفۡ مِنۡ

---

١٨٢- المرجع السابق، ص: ٢٧٠٤.

أَرۡضِنَآۚ أَوَلَمۡ نُمَكِّن لَّهُمۡ حَرَمًا ءَامِنٗا يُجۡبَىٰٓ إِلَيۡهِ ثَمَرَٰتُ كُلِّ شَيۡءٖ رِّزۡقٗا مِّن لَّدُنَّا وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٥٧﴾ ﴾ ( القصص)، بەومانایەی حەرەمێکی ئارام وئاسایشمان پێ بەخشیون ئەویش لەو ڕووەوە کە عەرەبی سەردەمی جاهیلی پەلاماری یەکتریان دەداو یەکتریان دەکوشت بەلام دانیشتوانی مەکە لە ژێر سایەی حەرەم دابوون، خودای گەورە وەلامی هۆکارەکەی دانەوە بەوەی کەئەوان بە هۆی کەعبەوە خودای گەورە ئارامی و ئاسایشی پێ بەخشیون، وە لە دوژمن پاراستونی ئیتر ترسی ئەوەیان نیە لە پەنایی حەرەمدا ئاسایی بێت کە عەرەبەکان پەلاماریان بدەن، وەك ئەوەی پێیان بلێت: لە حەرەمی مندا پەنا دراوبون و ڕۆزی منتان دەخوارد بەلام جگە لەمنتان دەپەرەست ئێستا دەترسن ئەگەر من بپەرەستن و ئیمانم پێ بهێنن ئەوا خەلك وەدەرتان بنێن؟!

هەروەها هەوالی پێداون کە حەرەم جێگەی ئارامیەوە لەسەر جەم شوێنە جیاوازەکانەوە بەروبومی جیاوازی بۆدێت، بەلام بێ ئاگان لەو ڕاستیەی ئەوەی کە ڕۆزی داون و ئارامی پێ بەخشیون لە ڕابردودا و لە کاتێکدا بێ باوەڕبوون، بەهەمان شێوە ڕۆزیان دەدات ئەگەرموسولمان ببن و ئیمان بهێنن، وە بێ باوەڕەکانیشیان لە کۆل دەکاتەوە کە موسولمان بوون، ئەم قسانەیان دەگەڕێتەوە بۆ بۆچونیان لە جەهل و زۆر بێ ئاگایی و نەزانین و بیرکردنەوە لەسەرئەنجام و گرتنەبەری ڕێگای ڕاست، بۆیە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَقَالُوٓاْ إِن نَّتَّبِعِ ٱلۡهُدَىٰ مَعَكَ نُتَخَطَّفۡ مِنۡ أَرۡضِنَآۚ أَوَلَمۡ نُمَكِّن لَّهُمۡ حَرَمًا ءَامِنٗا يُجۡبَىٰٓ إِلَيۡهِ ثَمَرَٰتُ كُلِّ شَيۡءٖ رِّزۡقٗا مِّن لَّدُنَّا وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٥٧﴾ ﴾ ( القصص).

خودای گەورە لە کاتی پێویستدا وەلامی ئەو بەهانە خەیالاوییەی دانەوە، کێ ئارامی پێ بەخشیون؟ کێ ئەو جێگەیەی بۆکردون بەحەرەم؟ کێ دلەکانی ئاراستە کردوە کە بێنە ئەو جێگاو سەرجەم بەروبومەکانی سەرزەوی لەگەل خۆیان بهێنن؟ لە هەموو جێگایەکەوە دێن بۆ حەرەم لە شوێنی جیاوازو لە وەرزی جیاوازدا: ﴿ وَقَالُوٓاْ إِن نَّتَّبِعِ ٱلۡهُدَىٰ

مَعَكَ نُتَخَطَّفْ مِنْ أَرْضِنَآ أَوَلَمْ نُمَكِّن لَّهُمْ حَرَمًا ءَامِنًا يُجْبَىٰٓ إِلَيْهِ ثَمَرَٰتُ كُلِّ شَىْءٍ رِّزْقًا مِّن لَّدُنَّا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٧﴾ ﴾ ( القصص).

ئیتر بۆچی لەوە دەترسن کە خەڵك وەدەریان بنێت بە هۆی ئیمانەکەیانەوە، لە کاتێکدا خودا ئەو حەرەمەی بۆکردونەتە ئارامگا هەر لەسەردەمی ئیبراهیمی باوکیانەوە؟ ئایا ئەوەی لە کاتی سەر پێچیاندا ئارامی پێداون واز لە خەڵك دێنێت لەوەی بە ئیمانداری وەدەریان بنێت؟ { وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ}( القصص/٥٧). نازانن ئارامیان لە کوێوە بۆهاتوە، نازانن هەمو کارەکان دەگەڕێنەوە بۆلای خودا.[١٨٣]

**سێیەم: هۆکاری لە ناوچونی ڕاستەقینە لە خۆ بایی بوون و پێ نەزانین و بە درۆ خستنەوەی پێغەمبەرانە:**

ئەگەر قسەی موشریکەکان بەڵگە بێت لەسەر ئەوەی کەئەوان لە ڕوکەشدا دانیا ناوە بە ڕاستیدا، بەوەی کە پێغەمبەر " سەلات وسەلامی خودای لەسە ربێت" بانگەواز بۆ هیدایەت دەکات ، بۆیە خودای گەورە ئەم ئایەتە بەدوای ئایەتەکەی پێشو دادێنێت بۆ ترساندنیان لە سزای گەلەکانی پێش خۆیان کە لوت بەرزو لە خۆ بایی بون، و بێ نمەك بوون بەرامبەر نیعمەتەکانی خودا، ڕۆزی ئەویان خواردوەو جگەڵەویان گەرەستوە، وەك دەفەرموێت: ﴿ وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَرْيَةٍۭ بَطِرَتْ مَعِيشَتَهَا ۖ فَتِلْكَ مَسَٰكِنُهُمْ لَمْ تُسْكَن مِّنۢ بَعْدِهِمْ إِلَّا قَلِيلًا ۖ وَكُنَّا نَحْنُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴿٥٨﴾ ﴾ ( القصص). واتە: ئێمە پێشتر چەندەها وڵات و شارمان کاول کردووە کاتێ کە خەڵکەکەی لە سنور دەرچون و ڕێبازی تاوان و ستەمیان گرتۆتەبەر ، ئەوەتە خانوبەرەو کۆشك و تەلاریان وێران و چۆڵەو زۆر کەم ئاوەدان بۆتەوە و خەڵکێکی کەمی تێدا نیشتەجێ بووە ، وە هەر ئێمە خاوەنی ڕاستەقینەی هەموو شتێکین.

---

١٨٣- المرجع السابق، ص: ٢٧٠٤.

ئەگەر ئەیانەوێت خۆیان لە تیاچوون بگارێزن و بێ خەم بن لەوەدەرنان ئائەمە هۆکاری تیاچونیانە با خۆیانی لێ بپارێزن: ﴿ وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَرْيَةٍ بَطِرَتْ مَعِيشَتَهَا فَتِلْكَ مَسَٰكِنُهُمْ لَمْ تُسْكَن مِّنۢ بَعْدِهِمْ إِلَّا قَلِيلًا وَكُنَّا نَحْنُ ٱلْوَٰرِثِينَ ۝٥٨ ﴾ (القصص).، یاخی بوون و سوپاس نەکردنی خودا لەسەر نیعمەتەکانی هۆکاری سەرەکی لەناوبردنی لادێ کان بوو،یەکێك لەو نیعمەتانەی کە خودا پێی دابوون ئەو حەرەمە ئارامە بوو، وە بائاگادارین لە یاخی بوون و سوپاس نەکردنی کە ببێتە هۆکاری لەناوچونیان وەك هۆکار بوو بۆ لەناوچونی ئەو لادێ و شارانەی کە بە چاوی خۆیان دەیانبینیو دەیانزانی،و ئەو مال و مەنزلە قەرەبالغانە چۆل و وێرانن: (لم تسكن من بعدهم الا قليلا) ﴿ لَمْ تُسْكَن مِّنۢ بَعْدِهِمْ إِلَّا قَلِيلًا ۝٥٨ ﴾ (القصص).

بە پێوە ماوەتەوە بۆ پێڕانەوەی دەرئەنجامی دانیشتوانەکەی ، چیرۆکی یاخی بوون دەپێرێتەوە، سەرجەم خەڵکەکەی تیاچوون کەسیان نەماوە، وە هیچ کەس میراتگریان نەبووە: ﴿ وَكُنَّا نَحْنُ ٱلْوَٰرِثِينَ ۝٥٨ ﴾ (القصص). خودای گەورە هیچ یەکێك لەو شارو شارۆچکە یاخی بوانەی وێران نەکردووە بە بێ ئەوەی پێغەمبەرێك ڕەوانە بکات بۆ شارە گەورە (پایتەختە)کەیان، ئەوە یاسای خودایە و لەسەر خۆی نوسیویەتی کە دەبێت ئەوە بکات وەك بەزەییەك بەرامبەر بەندەکانی: ﴿ وَمَا كَانَ رَبُّكَ مُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ حَتَّىٰ يَبْعَثَ فِىٓ أُمِّهَا رَسُولًا يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِنَا ۚ وَمَا كُنَّا مُهْلِكِى ٱلْقُرَىٰٓ إِلَّا وَأَهْلُهَا ظَٰلِمُونَ ۝٥٩ ﴾ (القصص)، واتە: جا ئیتر وە نەبێت (لە کۆتایی زەماندا) پەروەردگاری تۆ و وێرانکەری مەملەکەت و شارو ئاوەدانیەکان بێت هەتا پێغەمبەرێك بۆ دێرینترین و مامناوەندی ترینیان (لەهەموو ڕوویەکەوە) ڕەوانە نەکات (کە شاری مەککەیە) وە ئایەتەکانی ئێمە بەسەر ئەو خەڵکە و خەڵکانی هەموو زەمان و زەمینەکاندا نەخوێنێتەوە ( لەم سەردەمەدا لە ڕێگەی سایتەکانی ئینترنێت و هەندێ کەناڵی ئاسمانی و سی دی و شریت و کتێب وگۆڤار و

ڕۆژنامەو لایەنە ئیسلامیەکان و ڕێکخراوە جۆراو جۆرەکانەوە دەنگی ئەم قورئانە و تەفسیرەکانی بە دەها زمان دراوەودەدرێت بە گوێی خەڵکیدا لەگەڵ تەفسیرەکەیدا بە دەها زمان) جا خوای گەورە دەفەرموێت: ئێمە هەمیشە بە هۆی تاوان و گوناهو ستەمی خەڵکەوە مەملەکەت و شار و وڵاتان کاول دەکەین.(ئەگەر فریای خۆیان نەکەون).

وە حیکمەتی ناردنی پێغەمبەران "سەلامی خودایان لەسەر بێت" لە شارەگەورەکان یا خود پایتەختەکانیان بۆ ئەوە بووە کە ببێتە ناوەندێك بۆ بانگەوازو گەیاندنی گەیامەکە بۆ دەوروبەر بۆ ئەوەی کەس بەهانەو گاساوی نەمێنێت، بێگومان پێغەمبەری خودا " سەلات و سەلامی خودای لەسەر بێت" لە مەکە گەیامی بۆ هاتوە کە لە شارێکی گەورەی عەرەب بووە کە ئاگاداری کردونەتەوە لە دەرئەنجامی درۆزنانی پێش خۆیان پاش ئەوەی کە ترسێنەری بۆ ناردوون، ﴿ وَمَا كُنَّا مُهْلِكِي ٱلْقُرَىٰٓ إِلَّا وَأَهْلُهَا ظَٰلِمُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾ ( القصص). بە دلنیایەوە بەلگەکانی خودا بە درۆ دەخەنەوەو دەشزانن کە وانیە.

**چوارەم: ئەگەر بە هۆی ئیمانەکەیانەوە ومدمر بنرێن ئەوەی لای خودایە باشتر بۆیان.**

بەو مانایەی سەرجەم خۆشیەکانی دونیا بە پانتای هەموو ژیانی دونیا و ئەوەی خودا پێی داون لە سەر زەوییدا لەگەڵ هەموو ئەو بەروبومانەی کە پێی بەخشیون، وە ئەوەی کە مرۆڤ ئارەزوی دەکات لە ژیانی دونیا هیچ نیە جگە لە شتێکی کەم و بێ بایەخ نەبێت ئەگەر بەراورد بکرێت بەوەی لای خودایە: ﴿ وَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَيْءٍ فَمَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتُهَا ۚ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٦٠﴾ ﴾ ( القصص)، واتە: خەڵکینە هەر چیتان پێ بەخشراوە ، ئەوە ناز و نیعمەت و بە خششێکی کەمی دنیا و زینەت ، ڕازاوەییەکانیەتی ، بەلام دڵنیابن کە ئەوەی لەلای خوای گەورەیە ، وە لە بەهەشتی بە ریندا بۆی ئامادە کردوون زۆر چاکترە و بەردەوام و نەبڕاوەشە ( هەر بەراورد ناکرێت لەگەڵ دنیای تەمەن

سنورردراردا ، كه ئادەميزاديش چەند ساڵێكی كەم تیایدا دەژی) باشە ئاخۆ ئێوە عەقڵ و ژیری خۆتان ناخەنەكار؟! ( بەراوردیان ناكەن؟!).

ئەمە ڕاستكردنەوەی كۆتاییە نەك ئەوەی كەدەترسن لە دەستی بدەن لە ئاسایش و زەوی و بەرووبوم ، تەنانەت ئەوەش نا كە خودا منەتی خستوەتە سەرتان لە جێگیركردن و ئاسایش و بەخشینی نیعمەتەكانی بەتەنها، بەدەر لەوەی كە خودا لە شارەكاندا نیعمەتی خۆی بۆ هەڵڕشتون و پاشان بە هۆی یاخی بونەوە لێی گرتونەتەوە، بەڵكو ڕاستیەكە لەوەدایە ئەوەی لە ژیانی دونیادایە تەنانەت ئەگەر شیاوو بەردەوامیش بوو بە دوایدا وێرانكاری و لە ناوبردن ناهێنێت، هەموو ئەوشتانە ﴿ وَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَيْءٍ فَمَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتُهَا ۚ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٦٠﴾ ﴾ ( القصص)

چاكەيەكی كۆتای پێ نەهاتوی بەردەوامە جیاوازی كردن لە نێوان ئەمەو ئەوەدا پێویستی بە ژیرییە كە دەرك بە سروشتی ئەمەو ئەوە بكات، پاشان لێكۆڵینەوە بكات لەسەر ئەم یاسایە و ژیری بخاتە كار بۆ هەڵبژاردن!

لە كۆتایی ئەم گەشتەدا لاگەڕەی دونیاو دواڕۆژ دەخاتە ڕوو بۆ ئەوەی هەركەس هەرچی دەوێت هەڵیبژێرێت: ﴿ أَفَمَن وَعَدْنَٰهُ وَعْدًا حَسَنًا فَهُوَ لَٰقِيهِ كَمَن مَّتَّعْنَٰهُ مَتَٰعَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ثُمَّ هُوَ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ مِنَ ٱلْمُحْضَرِينَ ﴿٦١﴾ ﴾ ( القصص)، واتە: باشە ، ئایا ئەو كەسەی بەختەوەرەو بەڵێنی پاداشتی چاكمان داوەتێ و بەم زوانە پێی دەگات براوەو سەرفەرازە، یان ئەو كەسەی كە تەنها لەنازو نیعمەتی دنیا بەهرەمەندمان كردووە؟! پاشان ئەو جۆرە كەسانە لە قیامەتدا لە ئامادەكراوان دەبن بۆ لێپرسینەوەی سەخت و سزای نێو ئاگری دۆزەخ. (بۆ هەمیشە و هەتا هەتایی).

ئەم لاپەڕەشی ئەوەیە هەركەس خودا پەیمانی چاكی پێدابێت لە دواڕۆژدا دەستی دەكەوێتەوە، لاپەڕەكەی تریشی هەركەس خۆشیە كاتیە كەم و بێ نرخەكانی دونیای

چەشـت، پاشـان هەرئـەوەی بـۆ دەهێنرێـت لـە ڕۆژی دواییـدا و لێپرسـینەوەی لەسـەر دەکرێت، دەستەواژەکە ئاماژە بە ناڕەزایی دەکات (من المحضرين) کەبە زۆر ئەهێنرێن و بەترسـەوە کـە حـەزیان دەکـرد نەهێنرانایـە، لەبـەر ئـەو سـزایەی کـە بۆیـان ئامـادە کراوە،لەسەر ئەو خۆشیە کورتە بێ نرخەی دونیا!

ئەمـە خـالی کۆتاییـە لـە وەلمـی قسـەکانیاندا: ﴿ وَقَالُوٓا۟ إِن نَّتَّبِعِ ٱلْهُدَىٰ مَعَكَ نُتَخَطَّفْ مِنْ أَرْضِنَآ ۚ ﴿٥٧﴾ ﴾ ( القصص). ئەگەر ئەوە ڕوویدات باشترە لـە ڕۆژی دواییـدا بهێنـرێن بـۆ لـێ پرسینەوە! ئەی چۆن شوێن کـەوتنی هیدایـەتی خـودا جێگیرکـردن و ئاسایشـی دونیـای بەدواوەیە لەگەڵ پەنادان و پاداشتی دوارۆژ؟ کەواتە جگە لەو بێ ئاگایانەی کە دەرك بەو ڕاستیە بەهێزەی گەردوون ناکەن کەسـی تـر واز لـە هیدایـەتی خـودای گـەورە ناهێنێـت، تەنانەت نازانن لە کوێوە دوچاری ترسی دەبنەوە یاخود لە کوێوە ئارامیان بۆ دەستەبەر دەبێت، هەروەها ئەم خەسارۆمەندانەشی ناتوانن شتە چاکەکان بۆ خۆیان هەڵبژێرن و لـە تیاچوون ناترسن ئەوانەش بێ بەش دەبن لە هیدایەتی خودا.[١٨٤]

**بەکورتی:**

- بنگەشەی موشریکەکانی مەکـە کـە دەلـێن گوایـە ئەگـەر موسـوڵمان بـبن وەدەر دەنرێن بەهانەیەکی پوچەڵە و هیچ بنەمایەکی نیە.
- ئەم بانگەشە لەگەڵ ئەوەی بێ بنەمایە، لە هەمان کاتد دان پێدانانە بە ڕاستی و دروستی ئەوەی کە دابەزیوە بۆ موحەمەد " سەلات و سەلامی خودای لە سەر بێت".
- ئەگەر خودای گەورە پەنای دابن لە کاتێکدا بێ باوەڕ بوون و دورگەی عەرەبی و دەورو بەریان لە جەنپێکی وێرانکەری بەردەوامدا بووە، ئایا دەست بەرداریان دەبێـت بـۆ ئەوەی لە لایەن خەڵکەوە وەدەربنرێن بە ئیمانداری.؟!

---

١٨٤- المرجع السابق، ص: ٢٧٠٥.

## گومانی چل

### بانگەشەی ئەوەی کە هیدایەت لەوەدایە شوێن جولەکە و گاور بکەوی *[185]

**ناوەڕۆکی گومانەکە:**

جولەکەکان و گاورەکان بانگەشەی ئەوە ئەکەن کە ئەوان لەسەر هەقن، جولەکەکان بە پێغەمبەریان ووت: هیچ هیدایەتێك نیە لەدەرەوەی ئەوە بێت کە ئێمە لەسەری ئەڕۆین، دەی موحەممەد تۆش شوێن ئێمە بکەوە با بکەویتە سەر ڕێگەی هیدایەت، گاورەکانیش هەمان قسەیان کرد، خوای گەورەش فەرمووی: ﴿ وَقَالُواْ كُونُواْ هُودًا أَوْ نَصَـٰرَىٰ تَهْتَدُواْ ﴿١٣٥﴾ ﴾ (البقرة)، جوولەکەو گاورەکان وتیان: (بەموسڵمانەکان) ببن بە جوولەکە یان گاور تا بکەونە سەر ڕێی ڕاست.

**شێوازی پوچکردنەوەی ئەم گومانە:**

ئەبێ جولەکەو گاور بانگ بکرێن بۆ ئەوەی شوێن ئایینی ئیبراهیم بکەون(سەلامی خوای لێبێت) چونکە هەموویان یەك ڕان لەوەدا کە ئیبراهیم پێشەوایشە و لەسەر هیدایەتیشە.

**درێژەی وەڵامەکە:**

پێویستە جولەکەو گاور بانگ بکرێن بۆ ئەوەی شوێن ئایینی ئیبراهیم بکەون (سەلامی خوای لێبێت) چونکە هەموویان یەك ڕان لەوەدا کە ئیبراهیم پێشەوایشە و لەسەر هیدایەتیشە:

---

١٨٥- بڕوانە"ئایا هیدایەت لەوەدا شوێن جولەکە بکەوی"، هەروەها گومانی دووەم بخوێنەرەوە لە بەرگی هەشتەمدا لە بابەتی بەراوردی نێوان ئایینەکان.

*ئەو ئایەتەی ئەم گومانەی باسکردووە بریتیە لە ئایەتی(١٣٥)سوورەتی ئەلبەقەرە، ئەو ئایەتانەش وەڵامەکانی ئەم گومانەی تێدایە بریتین لە ئایەتەکانی(١٣٥و١٣٨)ی سورەتی ئەلبەقەرە.

ئەوە زانراوە کە چ جولەکە و چ گاور هەردوولایان دانیان بەوەدا ناوە کە ئیبراهیم (سەلامی خوای لێبێت) پێغەمبەر و دۆستی خوایە، بۆیە کاتێک کە بە موسڵمانەکان ئەڵێن: ببن بە گاور یان بە جولەکە تا هیدایەتان پێبدرێت و بچنە بەهەشت، لەو سۆنگەیەوە وەڵام ئەدرێنەوە کە خۆیان سەلماندوویانە، وەك ئەوە وایە پێیان بووترێت: نا، وەرن با هەموومان شوێن ئایینی ئیبراهیم بکەوین کە ئێمەش و ئێوەش دانمان ناوە بەوەدا کە ئەوەی ئەو ئایینی خوایە و خوا پێی رازیە و هەڵیبژاردووەو فەرمانی کردووە شوێنی بکەوین، ئێمەش و ئێوەش لەسەر ئەوە یەکدەنگین کە ئیبراهیم پێشەوای هیدایەت و خەڵکانی بەرچاورۆشنە، ئەم وەڵامە یەکێکە لەو وەڵامە بەهێزانەی کە خوای پەروەردگار پێغەمبەری شارەزاکردووە لێی، پێشەوا تەبەریبەرەحمەت بێت ئەڵێ: خوای گەورە موحەممەدی پێغەمبەری خۆیﷺ فێری کورتترین و بەهێزترین وەڵام ئەکات و پێی ئەڵێ: ئەی موحەممەد بڵێ بەو کەسانەی کە بە تۆ و شوێنکەوتەکانت ئەڵێن: ﴿ كُونُواْ هُودًا أَوْ نَصَـٰرَىٰ تَهْتَدُواْ ۝١٣٥ ﴾ (البقرة)، ببن بە جولەکە یان گاور ئەکەونە سەر رێگەی هیدایەت، پێیان بڵێ: نا، وەرن با هەموومان شوێن ئایینی ئیبراهیم بکەوین ئەو ئایینەی کە هەموومان یەکدەنگین لەوەدا کە ئەو ئایینەیە کە خوا پێی رازیەو فەرمانی پێ کردووە، دەی ئایینەکەی ئەو موسڵمانێتییە ودوورە لە لادان، دوای ئەوە واز لە هەموو ئایینەکانی تر بهێنین کە جیاوازیمان هەیە لەسەری، هەندێکمان بڕوای پێی هەیە و هەندێکمان نکولی لێ ئەکات، ئەوەی تریان رێگەیەك نیە بۆ ئەوەی لەسەری یەکدەنگ بین، بەڵام ئەمەی تریان هەموو یەك دەنگین لەسەری کە ئایینی ئیبراهیمە.

ئەمەی خوا کە ئەفەرموێ: ﴿ وَقَالُواْ كُونُواْ هُودًا أَوْ نَصَـٰرَىٰ تَهْتَدُواْ ۝١٣٥ ﴾ (البقرة)، جوولەکە و گاورەکان وتیان: (بە موسڵمانەکان) ببن بە جوولەکە یان گاوور تا بکەونە سەر ڕێ ی ڕاست. ئەم ئایەتە ئەوە ئەگەیەنێت کە بیروباوەڕی هەردوو لا جیاوازن، ڕاناوی (وَقَالُوا) بۆ ئەهلی کیتاب ئەگەڕێتەوە(أَوْ)یش بۆ بەشکردن و جۆراوجۆری

بەکاربراوە، یانی: جولەکەکان خەڵکی بۆ ئەوە بانگ ئەکەن کە خۆیان بڕوایان پێی هەیە و هیدایەت تەنیا لەوەدا ئەبینن، بە هەمان شێوە گاورەکانیش خەڵکی بۆ ئەوە بانگ ئەکەن کە خۆیان بڕوایان پێی هەیە و هیدایەتی تەنیا لەوەدا ئەبینن. ئەم شێوازەش لە زمانەوانیدا شتێکی کارپێکراوە و مەبەست ئەوەیە کە ئەگەر قسەی هەرکام لەم دوانە راست بێت ئەوە ئەبێتە بەڵگە بۆ ئەوەی ئیبراهیم لەسەر رێگەی هیدایەت نەبووە! چونکە ئیبراهیم نە یەهودی بووە و نە نەصرانی بووە، دەی ئیتر چۆن گاورو جولەکە هەردوولایان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە ئیبراهیم لەسەر هیدایەت بووە و پێشەوای هیدایەتدراوەکانە؟ بۆ ئەمەیە کە خوای گەورە پێغەمبەری خۆی شارەزا ئەکات تا بە بەهێزترین بەڵگە موناقەشەیان بکات و پێیان بڵێ: ﴿ قُلْ بَلْ مِلَّةَ إِبْرَٰهِـۧمَ حَنِيفًا ۖ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٣٥﴾ ﴾ (البقرة)، بڵێ: بەڵکو پەیرەویی ئایینی پاکی ئیبراهیم دەکەین کە لە هاوبەش پەیداکەران نەبووە. یانی:نا ، بەڵکو ئێمە شوێن ئایینی ئیبراهیم ئەکەوین ئەو ئایینەی کە مشتومڕمان نیە لەسەر ئەوەی کە هەم رێگەی هیدایەتە و هەم ئیبراهیم خۆشی بەرچاوروون بووە، کەواتە ئەوە ئەو ئایینەیە کە راست و رێکە و لادان و لێڵی تێدا نیە، ئایینێکی خاوێن و یەکخواپەرستی لە مێژینەیە و دوورە لە شیرك و بتپەرستی.[186]

پاشان خوای گەورە قسە لەگەڵ ئیماندارەکاندا ئەکات و پێیان ئەفەرموێ بەو گاور و جولەکانە بڵێن کە ئەڵێن: ﴿ كُونُوا۟ هُودًا أَوْ نَصَـٰرَىٰ تَهْتَدُوا۟ ﴿١٣٥﴾ ﴾ (البقرة)، پێیان بڵێن:

﴿ قُولُوٓا۟ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَـٰعِيلَ وَإِسْحَـٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطِ وَمَآ أُوتِىَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَمَآ أُوتِىَ ٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ ﴿١٣٦﴾ فَإِنْ ءَامَنُوا۟ بِمِثْلِ مَآ ءَامَنتُم بِهِۦ فَقَدِ ٱهْتَدَوا۟ ۖ وَّإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّمَا هُمْ فِى شِقَاقٍ ۖ ﴿١٣٧﴾ ﴾

بڵێن: (ئەی موسڵمانینە) بڕوامان هێنا بە خواو بەو قورئانەی کە بۆ خۆمان نێرراوەتە خوارەوە وە بەو پەیامەی کە نێرراوە بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و

---

١٨٦- تفسير المنار،محمد رشيد رضا، سەرچاوەی پێشتر،ج١،ص٤٨٠.

یەعقوب و کوڕەکانی یەعقوب وە بەوەی کە دراوە بە مووساو عیسا وە بەوەی کە دراوە بە هەموو پێغەمبەران لەلایەن پەروەدگاریانەوە جیاوازی ناکەین لە نێوان هیچ کامێکیاندا وە ئێمە فەرمانبەری خواین. ئینجا ئەگەر بڕوایان هێنا بەو شێوەیەی کە ئێوە بڕواتان پێ هێناوە ئەوا بێگومان ڕێی ڕاستیان دۆزیوەتەوە وە ئەگەر پشتیان هەڵکرد ئەوا ئەوان لە دوو بەرەکیی دان.

خوا فەرمان بە پێغەمبەر ئەکات کە خەڵکی بانگ بکات بۆ شوێنکەوتنی ئایینی ئیبراهیم(سەلامی خوای لێبێت)، پاشان فەرمان بە ئیماندارانیش ئەکات هەمان کار بکەن و بڵێن: ﴿ قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ ﴿١٣٦﴾ ﴾ (البقرة)، یانی با بانگەشەتان بۆ ئایینێکی تایبەت نەبێت بە خۆتان کە جیاتان بکاتەوە لە شوێنکەوتەی ئایینە ئاسمانیەکانی تر، بەڵکو چاوتان با لەو شتە هاوبەشە بێت کە هەمووتان کۆئەکاتەوە و ڕێکتان ئەخات، بانگەشە بۆ ڕۆحی ئایین و بنەرەتی ئایین بکەن، ئەو شتەی کە جیاوازیتان لەسەری نیە و کێشمەکێشی لەسەر ناکەن، ئەویش ئەوەیە خۆتان تەسلیم بەوە بکەن کە هەموو پێغەمبەران و پەیامبەرانی لەسەر بووە.[187]

ئەمەش کە خوا ئەفەرموێ: ﴿ قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَمَآ أُوتِيَ ٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمۡ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ﴿١٣٦﴾ ﴾ (البقرة)، بڵێن: (ئەی موسڵمانینە) بڕوامان هێنا بە خواو بەو قورئانەی کە بۆ خۆمان نێرراوەتە خوارەوە وە بەو پەیامەی کە نێرراوە بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و کوڕەکانی یەعقوب وە بەوەی کە دراوە بە مووساو عیسا وە بەوەی کە دراوە بە هەموو پێغەمبەران لەلایەن پەروەدگاریانەوە جیاوازی ناکەین لە نێوان هیچ کامێکیاندا وە ئێمە فەرمانبەری خواین.

---

١٨٧- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص٤٨٢.

ئەو ئایەتە لەبری﴿ قُلْ بَلْ مِلَّةَ ﴾ (البقرة)دا هاتووە، ئامانجی شەرحکردنی ئایینەکەیە کە ئەفەرموێ: ﴿ قُلْ بَلْ مِلَّةَ إِبْرَٰهِـۧمَ حَنِيفًاۖ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٣٥﴾ ﴾، بڵێ: بەڵکو پەیڕەویی ئایینی پاکی ئیبراهیم دەکەین کە لە هاوبەش پەیداکەران نەبووە.

کە فەرمان بە وتنی شتێك ئەکرێت ئیتر ئەوە فەرمانکردنە بە پێڕەویکردن لە ناوەڕۆکی ئەو شتە، چونکە قسەیەك نرخی نیە ئەگەر بڕوات بە ناوەڕۆکی قسەکە نەبێت! ئەم خۆبەستنەوە بە ئیبراهیمەوە بۆ راستییە، بۆ ئەوە نیە درۆیەك بکەی، مەبەست بەم قسەیە ئەوەیە کە ئەوە رابگەیەنیت و بانگەشە بۆ ئەوە بکەیت، چونکە ئەمە سەلماندنی ئەو چاکانەیە کە لە هەموو دینەکانی تردا هەن و ئەم ئایینە تازە شوێنیان کەوتووە و ویژدان و دڵپاکی خۆی دەرئەخات بۆیان، تا ئەوەی حەزی لە ئایینداریە دڵی بۆ بکاتەوەو ئەوەشی کەللە رەقە گوێی بئاخنێت، ئەمەش بۆ پاراستنی ئایینی راستەقینەیە وەك ئەفەرموێ: ﴿ قُلْ بَلْ مِلَّةَ إِبْرَٰهِـۧمَ حَنِيفًاۖ ﴿١٣٥﴾ ﴾ (البقرة).. بەڵکو پەیڕەویی ئایینی پاکی ئیبراهیم دەکەین کە لە هاوبەش پەیداکەران نەبووە.

ئەمەش هەموو یانی: ئێمە تانە نادەین لە شەریعەتی موسا و شەریعەتی عیسا و ئەو پەیامانەی کە لە لایەن خوا دراوە بە پێغەمبەران و بە درۆیان نازانین، بەڵکو ئێمە خۆمان سپاردووە بە ئایینی خوا کە ئیسلامە و لەسەر ئایینە بنەڕەتیەکەی ئیبراهیم دامەزراوە و ماوەتەوە، ئەم ئایینە شەرحێکی ئەو ئایینەی ئیبراهیمە و تەواوکەرێکە بۆی وەك خوا ویستوویەتی، ئەو ئایینانەی دوای ئیبراهیم هاتوون وەك وێستەگەی رێگە وان، دەستی میللەتانیان گرتووە بۆ ئەوەی روویان بکەنە بەرژەوەندیەکانیان کە بۆ ئەو سەردەم و شوێنانە گونجاو بوون، وەك چۆن رێبوارێك کە لە رێگەدا ماندوو ئەبێ یەکێك لە وێستگەیەك لائەدات تا پشوو بدات و توێشووی تازە هەڵبگرێتەوە و پاشان سەر لە نوێ بکەوێتەوە رێکردن، یەکێ لەو مانا گونجاوانە بۆ ئەم ئایەتە ئەوەیە کە ئایەتەکە بە

هـــموو پەيامـــە ئاسمانيـــەكان دەســـت پێئـــەكات(آمَنَّـــا بِاللَّـــهِ وَمَـــا أُنْـــزِلَ) و پاشـــان ئەفەرموێ(وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ) و ناوەراستی ئايەتەكەش درێژەی پەيامەكان باس ئەكات.

(رانـاوی كـۆ)ش بـەكار ئـەهێنێت تـا هـەم پێغەمبـەر و هـەم هـەموو ئيمانـدارانيش بگرێتەوە، چونكە هەموويان فەرمانيان پێكراوە كـە بـەو شـێوەيە بڵـێن رستـەی(بَـلْ مِلَّـةَ إِبْرَاهِيمَ) كردووە بە بەدەل تا پێغەمبەريش و ئوممەتەكەشی بگرێتەوە.

لە دوو شوێندا(راناوی تاك) بەكاردەهێنێت تا تايبەتييـەكی زيـاتری پێغەمبـەر پيشـان بدات كە راستەوخۆ ئەركی ئەوەی بخاتەسەرشان كە ئەو بابەتە روون بكاتـەوە بـۆ گـاورو جولەكـەكان، وەك ئەفـەرموێ: (قـل بَـلْ مِلَّـةَ إِبْـرَاهِيمَ) و ﴿ قُلْ أَتُحَآجُّونَنَا فِي ٱللَّهِ وَهُوَ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ وَلَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ وَنَحْنُ لَهُۥ مُخْلِصُونَ ﴿١٣٩﴾ ﴾ (البقرة)

(بڵێ: ئايا دەمەوەريمان لەگەڵ ئەكەن لەكاری خوا لەكاتێكدا ئەو پەروەردگاری ئێمەو ئێوەيە وە كـردەوەی خۆمـان بۆخۆمانـەو كـردەوەی خۆتـان بـۆ خۆتانـە وە ئێمـە تـەنها دڵسۆزی ئەو خوايەين).

قسەكردن بە كۆ وەك فەرمانێك بۆ ئوممـەت بـۆ ئەوەيـە بـزانن كـە كاريـان فێركردنـی خەڵكيە، مەبەستمان ئەم ئايەتەيە كە ئەفەرموێ:( قُولُوا آمَنَّا بِاللَّه)[188]..ئەم ئايەتەش كـە ئەفــــەرموێ: ﴿ فَإِنْ ءَامَنُوا۟ بِمِثْلِ مَآ ءَامَنتُم بِهِۦ فَقَدِ ٱهْتَدَوا۟ ۖ وَّإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّمَا هُمْ فِي شِقَاقٍ ۖ ﴿١٣٧﴾ ﴾ (البقرة)، ئينجا ئەگەر بڕوايان هێنـا بـەو شـێوەيەی كـە ئێـوە بڕواتـان پـێ هێنـاوە ئـەوا بێگومان ڕێی ڕاستيان دۆزيوەتەوە وە ئەگەر پشتيان هەڵكرد ئەوا ئەوان لە دوو بەرەكيی دان.

ئەمەش يانی: ئەگەر جولەكە و گاور بەراستی بڕوا بە خوا بهێنن و بڕوا بەوە بهێنن كە دابەزيوەتـــە ســـەر ئێـــوە و ئـــەوە دابەزيوەتـــە ســـەر ئيـــبراهيم و هـــەموو ئـــەو

188- التحرير و التنوير،الطاهر ابن عاشور، سەرچاوەی پێشوو،مج١،ج١،ص٧٣٨.

پێغەمبەرانە(سەلامی خوایان لێبێت)ئەوە سەرکەوتوو ئەبن و بەرچاو روون ئەبن و ئەکەونە سەر رێگەی راست و هیدایەت.

**کورتەی قسە:**

- هیدایەت ئەوەیە لە ئایینی ئیبراهیمدایە کە لادانی تێدا نیە، نەك ئەوەی کە جولەکەی لەسەرە، یان ئەوەی نەصرانییەت و بتپەرستەکانی عەرەبی لەسەرە، رێگەی هیدایەت تەنیا لە شوێنکەوتنی ئایینی ئیبراهیمدایە، ئەوەی کە ئیسلام هێناویەتی، کە بووەتە سەرەرەوەی هەموو ئایینەکای پێش خۆی.
- ئەگەر جولەکەو گاورەکان بەراستی رێگەی هیدایەتیان مەبەستە ئەوە ئەبێ بڕوا بە موحەممەد بهێننﷺ، چونکە ئەو لەسەر ئایینی ئیبراهیمە(سەلامی خوای لێبێت) و ئەوانیش بانگەشەی ئەوە ئەکەن کە شوێن ئیبراهیم کەوتوون.

**الحمد لله أولاً و أخيراً**

**تەواو بوو**

## سەرچاوەکان

* الإتقان في علوم القرآن، السيوطي، مكتبة نزار مصطفى الباز، مكة المكرمة، ١٤١٧هـ/١٩٩٦م.

*بحوث منهجية في علوم القرآن الكريم، موسى إبراهين الإبراهيمي، دار عمار، الأردن، ط٢، ١٩٩٦م.

* البرهان في علوم القرآن، الزركشي، تحقيق: محمد أبي الفضل إبراهيم، المكتبة العصرية، بيروت، د.ت.

* التحرير الإسلامي للمرأة، د. محمد عمارة، دار الشروق، ط٢١٤٢٣هـ/٢٠٠٢م.

* التحرير و التنوير، محمد الطاهر إبن عاشور، دار سحنون، تونس، د. ت.

* التشريع الجنائي الإسلامي مقارناً بالقانون الوضعي، عبدالقادر عودة، مؤسسة الرسالة، بيروت، ط٨، ١٤٠٦هـ/١٩٨٦م.

* تفسير الشعراوي، محمد متولي الشعراوي، أخبار اليوم، القاهرة، ط١، ١٩٩١م.

* تفسير القرآن العظيم، إبن كثير، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٩٨٥م.

* تفسير المنار، محمد رشيد رضا، دار المعرفة، بيروت، ط٢، د.ت.

* التفسير الوسيط، د. محمد سيد طنطاوي، مطبعة الرسالة، القاهرة، ط٣، ١٩٨٧م.

* جامع البيان عن تأويل آي القرآن، الطبري، تحقيق: أحمد محمد شاكر، مؤسسة الرسالة، بيروت، ط١، ١٤٢٠هـ/٢٠٠٠م.

* الجامع لأحكام القرآن، القرطبي، دار إحياء التراث العربي، بيروت، ١٤٠٥هـ/١٩٨٥م.

* الرسول(صلى اللهعليهوالهوسلم)في عيون غربية منصفة، الحسيني معدّي، دار الكتاب العربي، القاهرة، ط١، ٢٠٠٦م.

* ركائز الإيمان، محمد قطب، دار الشروق، القاهرة، ط١، ١٤٢٢هـ/٢٠٠١م.

* الطعن في القرآن الكريم و الرد على الطاعنين في القرن الرابع عشر الهجري، د. عبدالمحسن المطيري، رسالة دكتوراه مخطوطة بكلية دار العلوم بجامعة القاهرة.

* عقيدة أهل السنة و الجماعة، د. أحمد فريد، مكتبة فياض، القاهرة، ٢٠٠٥م.

* في الشريعة الإسلامية و فقهها و مصادرها، عبدالله ناصح علوان، دار السلام، القاهرة، ط١، ١٤٠٤هـ/١٩٨٤م.

* في ظلال القرآن، سيد قطب، دار الشروق، مصر، ط١٣، ١٤٠٧هـ/١٩٨٧م.

* القضاء و القدر، د. عمر سليمان الأشقر، دار النفائس، الأردن، دار السلام، القاهرة، ١٤٢٦هـ/٢٠٠٥م.

* القيامة الكبرى، د. عمر سليمان الأشقر، دار السلام، القاهرة، ١٤٢٦هـ/٢٠٠٥م.

* الكشاف، الزمخشري، الدار العالمية، بيروت، د.ت.

* مباحث في علوم القرآن، مناع القطان، مكتبة وهبة، القاهرة، ط١٣، ١٤٢٥هـ/٢٠٠٤م.

* محاسن التأويل، القاسمي، دار الحديث، القاهرة، ط١، ١٤٢٤هـ/٢٠٠٣م.

* مدخل لمعرفة الإسلام، د. يوسف القرضاوي، مكتبة وهبة، القاهرة، ط٣، ١٤٢٢هـ/٢٠٠٣م.

* المرأة المسلمة، وهبي سليمان غاوجي، دار القلم، دمشق، ط٨، ١٤٢٠هـ/١٩٩٩م.

* المرأة و الولاية، د. طه الدسوقي حبيشي، ط١، ١٤١٩هـ/١٩٩٨م.

* المناظرة الكبرى، علاء أبوبكر، مكتبة وهبة، القاهرة، ط١، ١٤٢٦هـ/٢٠٠٥م.

* الهجمات المغرضة على التأريخ الإسلامي، محمد ياسين مظهر صديقي، ترجمة د. سمير عبدالحميد إبراهيم، رابطة الجامعات الإسلامية، ط١، ١٤٠٨هـ/١٩٨٨م.

* وظيفة الدين في الحياة، د. محمد الزحيلي، جمعية الدعوة الإسلامية، ليبيا، ط٢، ١٩٩٩م.

* و نحن نقيم صرح الروح، فتح الله كولن، مجلة حراء، العدد ٦، السنة الثانية، ينايرمارس ٢٠٠٧م.

## مەوسوعەی(بیان الاسلام) بۆچی؟!

ئاینی ئیسلام( قورئان، پێغەمبەر، سوننەتی پێغەمبەر)توشی شاڵاوێکی فراوان لە تیربارانی تانەو گومان ئەبنەوە، تیرهاوێژەکانیش جۆراوجۆر و هەمە لایەنن، هەندێ کەناڵی ئاسمانیش تایبەتمەندیان لە بڵاوکردنەوەی ئەم گومانانەدا هێناوە، هەروەک چۆن چەندەها پێگەی ئەلەکترۆنیش لە سەرتۆڕە کۆمەڵایەتییەکان هەمان کار دەکەن، بڵاوکراوە لە پەڕاوو پۆستەرەکانیش کەمیان نەکردوە لەوبارەیەوە... لەئەنجامی ئەمانەوەیە چەندەها پرسیار لای گەنجان دروستبوە دەربارەی ئەو گومانانە ودەڵێن: بۆ؟ ئاخۆ ئەوانە ڕاستن؟ ئەی ڕاستییەکان کامانەن لەناو ئەم تەمومژەی کە ئەیانەوێ ڕووناکی خوای پێ خامۆش بکەن؟

ئێمە لە ڕێکخراوی عادیلە خانم -کە ڕێکخراوێکی سەربەخۆیە بۆ پەروەردە و گەشەپێدان- بە حوکمی ئەوەی لە کۆڕ و سیمینار و وتارەکانماندا ڕووبەڕووی زۆر پرسیار و گومان ئەبووینەوەو زۆر جار پێویستمان بە سەرچاوەیەکی دەوڵەمەند دەبوو تا وەڵامی زانستی زۆربەی ئەو گومانانەی تێدا بێت، ئەم (مەوسوعەی بەیان)ەش لە بابەتی خۆیدا دەوڵەمەندترین سەرچاوەیە و خوێنەر تا ڕادەیەکی زۆر بێ منەت ئەکات لە کتێب و سەرچاوەی تر، بۆیە بڕیارماندا کە تیمێکی بۆ دروست بکەین و ناوی خوای لێ بهێنین و دەست بە وەرگێڕانی بکەین.



۱۲۰۰۰ هەزار





07501269689
07701932749


hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com


سلێمانی - بازاڕی ئاویاریک- نهۆمی یەکەم
بەرامبەر کاسۆمۆڵ - دوکانی ژمارە (٦٦)